# بارزانی

## له مەهابادەوە... بۆ ئاراس

شەوکەت شێخ یەزدین

وەری گێڕاوە و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە

# بارزانی

## له مه‌هاباده‌وه... بۆ ئاراس

شه‌وكه‌ت شێخ یه‌زدین

وه‌ری گێڕاوه و پێشه‌كی و په‌ڕاوێزی بۆ نووسیوه

ناوی کتێب: "بارزانی"... لە مەهابادەوە بۆ ئاراس"
برێتییە لە سێ کتێب:
* لە مەهابادی خوێناوییەوە... هەتا لێوارەکانی ئاراس
نووسەر: نەجەف قولی پسیان. چاپی یەکەمی کوردی: ١٩٩٦
** بارزانی خۆی بەدەستی کەسەوە نادات
نووسەر: عەلی حەسەن تەفرشیان. چاپی یەکەمی کوردی: ١٩٩٧
*** لە کوردستانی عێراقەوە هەتا ئەوبەری چۆمی ئاراس
نووسەر: مورتەزا زەربەخت. چاپی یەکەمی کوردی: ١٩٩٩
وەرگێڕانی لە فارسییەوە و نووسینی پێشەکی و دانانی پەراوێز: شەوکەت شێخ یەزدین
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٨٣
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
نووسینی سەر بەرگ: خۆشنووس محەممەد زادە
سەرپەرشتیی چاپ: ئاورەحمان مەحمود
چاپی دووەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠١
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٣٢٧)ی ساڵی ٢٠٠١ی دراوەتێ

**بارزانی**

له مه‌هاباد، به جلوبه‌رگی جه‌نه‌راڵییه‌وه

بەیادی سەرۆکی نەمر

**مەلا مستەفای بارزان**

و

ئەو پێشمەرگە قارەمانانەی لە دوای ئەو دەڕۆیشتن و

سنوورەکانیان دەشکاند

پێشکێشە

*

بەیادی سەرکردەی هەرماو و هەر زیندوو

**کاک ئیدریس بارزانی**

پێشکێشە

# وشەیەکی کورت

خوێنەری بەڕێز:

ئەوەی لە نێوان دوو توێی ئەم کتێبەدا خراوەتە ڕوو، خۆی لە بنەڕەتدا سێ کتێبی جیایە و سێ نووسەری جیا و سەربەخۆ نووسیویانە. بەڵام هەر سێ کتێب لە بارەی یەک پرسە، ئەویش پرسی بەشداریی بارزانیی نەمر و هەڤاڵانی و خێڵی بارزانە لە دامەزراندن و فراژیبوون و بەرگرییەکانی کۆماری کوردستان (مەهاباد) لە نێوان ساڵانی ١٩٤٥-١٩٤٦دا. دوای ئەمەش ئەو بەرخوەدان و دەسوەکەرییانەی دوای کورتەتەمەن بوونی کۆمار، لەلایەن بارزانی و پێشمەرگە گیان لەسەر دەستییەکانیەوە کراوە. ئەوجا، ڕێ وەپێشدانەکەی بەرەو سۆڤیەت و ئەو تێکگیران و تێکسرەواندنانەی بەدەم ڕێگەوە لە نێوان پێشمەرگەکانی بارزانی و سوپای ئێراندا ڕوویان داوە.

ئێمە، هەرچەندە لەمەوپێش بەچاپی جیاجیا ئەم سێ کتێبەمان بڵاوکردبووەوە، بەڵام بەبۆنەی ساڵوەگەڕی (٥٥)ەمی دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان و ساڵوەگەڕی (٥٤)ەمی ڕێ وەپێشدانە مێژووییەنەکەی بەهاری ١٩٤٧و، پەڕینەوە لە ئاراس، بەباشمان زانی هەر سێ بەرهەم لەیەک کتێبدا کۆبکەینەوە بۆ ئەوەی خوێنەری کورد هەمووی بەسەریەکەوە لەبەردەستدابێ و سوودیان لێ وەربگرێ.

وەک ئاماژەمان پێ دا، هەر سێ نووسەر لەبابەت یەک پرس و یەک سەردەمەوە نووسیویانە، بەڵام هەریەکەیان تیشکی زیاتری خستووە سەر لایەنێکی ئەو پرسە و، لەویتریانی زیاتر ڕوون کردووەتەوە. بۆیە هەر سێ کتێب بەسەریەکەوە، دەتوانین بڵێین بەتەواوی تێنووەتیی خوێنەری کورد دەشکێنن و، ئاگەهداری و زانینەکی بەرهەڵدای لەبەر دەستدا دەنێن.

خۆم بەبەختەوەر دەزانم، وەک پێشمەرگەیەکی سەر ئەم ڕێبازە، دەرفەتی ئەوەم هەبێ لە بیرەوەری و بەیادکردنەوەی بارزانیی نەمر و هەڤاڵانیدا ئەم بەرهەمە وەک چەپکە کولیلکێکی دەشت و چیای وڵاتەکەمان، بکەم بەدیاری بۆ گیانی پاکی نەمران، سەروەریان: بارزانی و کاک ئیدریسی هەمیشە زیندوو.

**شەوکەت شێخ یەزدین**

٩ ئاب ٢٠٠١

## پێشەکی

شۆڕشی دووەمی بارزان «١٩٤٣ـ ٤٥» بەچوونی بارزانییەکان بۆ کوردستانی ئێران بەکۆتایی گەیشت. ئەوەبوو، بەگوێرەی وتووێژی نێوان بەرپرسانی بزووتنەوەی سیاسیی کورد لە ئێران و کاربەدەستانی سۆڤیەت، سەرکردەی نەمر مەلا مستەفای بارزان و هەڤالانی ئەو لە «لیژنەی ئازادی»دا(*) پاش پرس پێ کردنی خوا لێخۆشبوو شێخ ئەحمەدی بارزان، بڕیاری چوونە کوردستانی ئێرانیان دا. لە راستیدا، ئەو هەوای ئازادییەی کە گەلی کورد لەو کاتەدا لە بەشی ژوورووی کوردستانی ئێراندا بۆی هەڵکەوتبوو هەموو کوردێکی ئازادیخوازی بۆ خۆی بەکێش دەکرد، لە لایەکی تریشەوە بزووتنەوەی رزگاریی کورد لەوێ لە پێناو پاراستنی ئەم ئازادییەدا چاوی بڕیبووە هێزی بارزانییەکان کە هێزێکی خاوەن تاقیکردنەوە بوون لە شەڕدا و کۆڵنەدانی خۆیان لە بەربەرەکانیی داگیرکەراندا بۆ هەموو لایەک راگەیاندبوو.

ئەو سەرکەوتنەی مەلا مستەفای بارزان لە دژی هێزگەلی عێراق و بەریتانیا لە ساڵی ١٩٤٣دا هێنابوویە دی، ببووە مایەی ئەوەی وەک سەرکردەیەکی بەتوانا و لێهاتوو نەک هەر لە کوردستانی عێراق بگرە لە سەرتاسەری کوردستانی گەورەشدا بێتە ناسین و گەلی کورد ئامانجی گەورەی خۆی پێوە گرێ بدا. ئەم راستییەی پێشەوەش بەچاکی لەو نامەیەدا دەردەکەوێ کە «کۆمەڵەی ژ .ک» بۆ بارزانیی نووسیبوو و بە«زەعیمی ئازادی مەلا مستەفای بارزان» ناویانی هێنابوو، هەروەها نووسینێکی گۆڤاری «نیشتمان»ی بڵاوکەرەوەی بیری کۆمەڵەش کە وەک «سەرۆکی گەورەی کورد» باسی کردبوون.

گەلەکۆچی بارزانییەکان لە ١١ تشرین (١) ١٩٤٥ لە ڕێگەی کێلەشین ـ مەرگەوەڕەوە لە سنوور ئاوابوو و پێی نایە ناو زەویی ئازادی کوردستانی ئێرانەوە، بەڵام هەتا ئاوابوون باڵەفڕەکانی عێراق و بەریتانیا دەستیان لە بۆمبابارانی ماڵ و منداڵیان هەڵنەگرت. دوای گەیشتنیشیان بەو دیوی سنوور، بەوپەڕی گەرمییەوە هاتنە پێشوازییان و برایانی کوردی

(*) لیژنەی ئازادی یا هەیئەتی ئازادی لیژنەیەک بوو لە ١ ئایار ١٩٤٥دا دامەزرا، ئەو لیژنەیە بەسەرۆکایەتیی بارزانیی نەمر لە ئەفسەرانی ئازادیخواز پێک هاتبوو و پرۆگرامێکی تێروتەسەلی هەبوو، بۆ زانیاریی تەواو بڕوانە کتێبی سەرۆک مەسعوود بارزانی: البارزاني والحركة التحررية الكردية ثورة بارزان ١٩٤٣ ـ ٤٥، کوردستان آب ١٩٨٦، لاپەڕە ٥٣ و پاشتر.

ئێران هەرچییەکیان لە دەست هات بۆ دابینکردنی بژێوی و حەوانەوەی ماڵە بارزانییەکان کردیان. تەنانەت پێشەوای نەمر قازی محەمەد فەرمانێکی بۆ هەموو ڕێکخراوەکانی حیزبی دێموکرات بڵاو کردەوە و فەرمانی پێ کردن بۆ ئەوەی هەموو هاوکارییەکی بارزانییەکان بکەن. دوا بەدوای نیشتەجێ بوونی بارزانییەکان لە شوێنە جۆربەجۆرەکانی کوردستاندا، خەڵک یارمەتییەکی زۆریان دان و ڕێز و حورمەتێکی زۆریان لێ گرتن. هەرکاتێکیش کە سەرۆکانی بارزانی دەچوونە مەهاباد، لەلایەن دەستەیەکی پایەبەرزی حزبییەوە پێشوازییان لێ دەکرا، ئەم هەڵسوکەوتە شوێنەوارێکی باشی لەسەر ئەوان هەبوو و بەدڵ و بەگیان یارمەتیی کوردی کوردستانی ئێرانیان دا.

چوونی بارزانیی نەمر و هێزی شەڕکەری بارزانییەکان وێڕای ئەفسەر و ڕووناکبیرانی تر بۆ دیوی کوردستانی ئێران سەرنجی ئاژانسەکانی دەنگوباسی دنیای ڕاکێشا. ڕۆژنامەی «ڕۆژا نوو» کە ئەو کاتە لە شام بڵاو دەبووەوە، لەم بارەیەوە نووسیویەتی دەڵێ: «ڕۆژنامە و ئاژانسەکانی دنیا باسی داخوازییەکانی کوردیان کردووە و، بەگوێرەی هەواڵەکانی دوایی مەلا مستەفا پاشا، مقەدەم عیزەت عەبدولعەزیز، رائید میرحاج، مقەدەم مستەفا خۆشناو، پارێزەر هەمزە عەبدوڵڵا، رائید عەزیز عەبدوڵڵا، رائید جەلال ئەمین، ئەندازیار نووری ئەحمەد تەها، رائید خەیروڵڵا عەبدولکەریم، رائید بەکر عەبدولکەریم، پارێزەر محەمەد قودسی و پەنجا دەمڕاست و نوێنەر و ڕووناکبیری کوردی عێراق لەگەڵ دوو هەزار پیادەدا خۆیان گەیاندووەتە کوردی ئێران و دۆز و داوای سەربەخۆییی کوردستانیان کردووە.»

ئەو کاتەی بارزانی گەیشتە کوردستانی ئێران، وەک سەرۆکی بزووتنەوی کورد لە کوردستانی عێراق و هەروەها وەک سەرکردەیەکی ئازا و شەڕکەر پێشوازیی لێ کرا نەک وەک سەرۆکی خێڵی بارزان لەبەرئەوەی ئەو کاتە شێخ ئەحمەد ـ برا گەورەی مەلا مستەفا، سەرۆکی خێڵ بوو و «خودانی بارزان»یان پێ دەگوت.

سەرەتا، بەهۆی سەرکۆنەی بەردەوام و پاڵەپەستۆی نەپساوەی ئینگلیز و حکوومەتی عێراق، سۆڤیەتەکان داوایان لە بارزانی کرد بەشێوەیەکی تاکتیکی هەتا ماوەیەک، زۆر لەبەر چاوان دیارنەبێ، بۆیە ماوەیەک بارزانی و هەندێک لە چەکدارەکانی ئەو، لە ناوچەی سەردەشت لە گوندی میراوا نیشتەجێ بوون بەڵام شێخ ئەحمەد هەر لە مەهاباد مایەوە. کۆمەڵەی ژ.ک «واتە ژیانەوەی کورد» ـ کە ئەو کاتە ناوەکەی گۆڕابوو بۆ حیزبی

دێموکراتی کوردستان، هەروەها ناودارانی مەهاباد داوایان لە بارزانی کرد بۆ ئەوەی گەشت و گەڕانێک بەناو خێڵاندا بکات و لە بارەی دانانی حکوومەتێکی کوردییەوە بۆچوونیان وەربگرێ، ئەوەبوو بارزانی ئەو گەشتەی بە ورمێ، نەغەدە، خانە، میاندواو و شنۆدا کرد، ئینجا گەڕایەوە مەهاباد بۆ ئەوەی ئەنجامی گەشت و گەڕانە سەرکەوتووەکەی خۆی بەبەرپرسیاران رابگەیەنێتەوە. پاشان لە مەهاباد، وتووێژ لەو بارەیەوە لە نێوان قازی محەمەد و حیزبی دێموکرات و ناودارانی مەهاباد و بارزانیدا هاتە گۆڕێ.

لە ٢٢ کانوون (٢) ١٩٤٦دا، واتە ئەو ڕۆژەی کۆماری کوردستانی تێدا جاڕ درا مەلا مستەفای بارزان بۆ ئامادەبوون لە کۆبوونەوە و ئاهەنگی دامەزراندنی کۆماردا، بۆ مەهاباد بانگهێشتن کرا. قازی محەمەد بوو بەسەرۆکی کۆمار و کابینەی وەزیرانی راگەیاند، بارزانی پلەی جەنەرالی وەرگرت و بوو بەسەرپەرشتیاری سوپای کوردستان. لە سەرەتای مانگی نیسانیشەوە، دەست بەدابەشکردنی چەک بەسەر بارزانییەکاندا کرا. ژمارەی ١٥٠٠ مرۆڤی بارزانی، هەر لە تەمەنی ١٥ ساڵییەوە هەتا ٦٠ ساڵی بە بڕنۆ و ڕەشاش و نارنجۆک چەکدار کران و لە سێ فەوجدا لەسەر شێوەی سوپایەکی نوێ دەست کرا بەمەشق پێ کردنیان. بۆ هەر یەکێک لەم سێ فەوجەش یەکێک لەو ئەفسەرە کوردانەی لە عێراقەوە پێوەندییان بەکۆماری کوردستانەوە کردبوو و پێشتریش لە شۆڕشی بارزاندا بەشدار بووبون، کرا بەئامیری فەوج. هەروەها ٧٠٠ کەسی تریش لە بارزانییەکان وەک هێزێکی سپێر لە مەهاباد مانەوە.

هێزی بارزانییەکان وەک پاشتر بەتاقیکردنەوە دەرکەوت ناوکەی سوپای شۆڕشگێڕی کوردستان بوو. لە سەردەمی ژیانی کۆماری کوردستانیشدا یەکەمین شەڕێک کە تیایدا بارزانییەکان ڕووبەڕووی سوپای ئێران بوونەوە شەڕی «قاراوا» بوو کە سەرکەوتنێکی مێژووینی کرد بەبەشی سوپای کۆماری نوێ. لەو شەڕەدا فەوجی یەکەمی سوپای بارزانییەکان لە بەرەودواهاتنی مانگی نیساندا توانیی هێرشێکی گەورەی سوپای ئێران کە بە یاریدەی باڵەفڕە و تانک و تۆپخانە و هێزی پیادەوە بۆ گرتنی گردی قاراوا لە بەرەی سەقزدا کردبووی، تێک بشکێنێ. ئەنجامی ئەو شەڕە بوو بەکارەساتێک بۆ سوپای ئێران، ٨٠ کەسیان کوژرا و لاشەکانیان لە گۆڕەپانی شەڕدا بەجێ مان، هەروەها ١٢٠ کەسی تریان بەدیلی کەوتنە دەستی بارزانییەکان. کاتێک خەڵکی کوردستان هەواڵی ئەم سەرکەوتنەیان بیست، لە هەموو شوێنێکدا بوو بەزم و شایی و ورە گەیشتە دوا پلەی

بەرزی و دڵی هەموان پڕ بوو لە هەستی بەرزی نەتەوایەتی. ئەو سەرکەوتنە کە نۆبەرەی سەرکەوتن بوو وای لە دانیشتوانی کۆماری کوردستان کرد متمانە بەباشەڕۆژی خۆیان بکەن. کاتێکیش دیلەکان گوازرانەوە مەهاباد، بەدرێژاییی ڕێگە دانیشتوانی گوندەکان بۆ سەیرکردن و خۆشی وەرگرتن لەو سەرکەوتنە هاتبوون و لەمبەر و لەوبەری ڕێگەدا وەستابوون. جەماوەری کوردستانی ئێران لێهاتوویی و ئازایەتیی پێشمەرگەکانی بارزانییان لە شەڕدا بەچاوی خۆیان بینی. بۆ بەیانیش قازی و بارزانی بەیەکەوە چوونە سەردانی بەرەی شەڕ و، پێشەوا سوپاس و خەڵاتی شەڕکەرانی کرد. ئامری فەوج عەقید بەکر عەبدولکەریم لە بەردەم هەردوو سەرکردەدا گوتی: «من بۆ مێژوو دەڵێم ئەم قارەمانانە لە مردن ناترسن و لە پێناو پاراستنی ئەو ئەرکەی پێیان سپێردراوە ژیانی خۆیان نایەتە پێش چاو، دەبێ نەتەوەی کورد شانازی بکات ڕۆڵەی ئاوهای هەیە کە هەرگیز بێ هیوای ناکەن.»

حیزبی دێموکراتی کوردستان و پێشەوا قازی محەمەد هەر لە سەرەتاوە بەچوونی بارزانییەکان بۆ کوردستانی ئێران زۆر پشت ئەستوور بوون، ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی هەوای سەربەخۆیی زیاتر بکەوێتە سەریان و وا بیر بکەنەوە ئەگەر هیچ هێزێکی دەرەکیش پشتیوانی لە کۆمار نەکات ئەوا بەو هێزەی خۆیان هەیانە دەتوانن خۆیان رابگرن، تەنانەت ئارچی ڕۆزڤێلت کە یەکێک بوو لە کاربەدەستانی باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە تاران و ئەو دەمە خۆی سەردانی کۆماری کوردستانی کردبوو، دەڵێ: «لەوانەبوو بەرهەڵستیی هەندێ لە سەرۆک خێلان کاری لە پایە و کەسایەتیی قازی محەمەد بکردایە ئەگەر بەو دەمودەستە مەلا مستەفا و چەکدارە بارزانییەکان لە عێراقەوە نەگەیشتنایەتە کوردستانی ئێران». هەر بۆیەش بەردەوام لەلایەن بەرپرسانی کۆماری کوردستان و حیزبی دێموکراتەوە زۆر بەرێزەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ «بارزانی»دا دەکرا و لەکاتی هاتنیدا بۆ شاری مەهاباد کۆڕی حیزب و کاربەدەستانی کۆمار پێشوازیی گەرم و رەسمییان لێی دەکرد. لە راستیدا بارزانییەکانیش تەنیا هیوایەکی هەیانبوو کۆماری کوردستان بوو بۆیە بڕیاری یەکجارەکییان لەسەر ئەوەبوو پارێزگارییەکی تەواو لە کۆمار بکەن و هەتا دوا پشوو پشتی بەر نەدەن. هەر واش بوو.

دەبێ ئەوەش بزانرێ کە هەرچەندە دانیشتوانی کوردستانی ئێران لە پێشکێش کردنی هاوکاری بۆ بارزانییەکاندا هیچ درێغییەکیان نەدەکرد بەڵام ژیانی بارزانییەکان لە ڕووی

ئابوورییەوە زۆر نالەبار بوو، کۆماری ساوا ئەو توانایەی نەبوو بژیوییەکی تەواویان بۆ دابین بکات، بەڵام بارزانییەکان وەک بەژیانی «نەمر و نەژی» راهاتبوون، بەهەموو شت رازی بوون. هەرچەندە ئەو جۆرە ژیانەش نەدەهاتە دی و، بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی تیفۆئید لە ناویاندا ببوو بەهۆی فەوتانی ٢ هەزار کەس لە ئافرەت و منداڵ و لاو و پیر، کە ئەمە لەو کاتە زۆر ناسکەدا زەبرێکی گەور بوو پێیان دەکەوت.

وێڕای ئەو بارودۆخەش ئەرکی سەرەکیی بەرگری لە کۆماری کوردستان بەبارزانییەکان سپێردرا و بوون بەبازووی بەهێزی پاراستنی کۆمار، بەتایبەتیش لەو کاتەدا کە خێڵانی خۆوڵاتی زۆربەیان یەک لە دوای یەک خۆیان لە بەجێ هێنانی ئەرکی سەر شانیان بەپاش دا و کەوتنە خۆ دزینەوە و بەستنی پێوەندی لەگەڵ رژێمی شادا.

شەڕێکی تری بارزانییەکان لە سەردەمی کۆماری مەهاباددا، شەڕی «ملی قەرەنی» بوو کە لەوێشدا سوپای شا شکانێکی گەورە شکا، ئیتر کاربەدەستانی سوپای ئێران بۆیان دەرکەوت لە شەڕ لەگەڵ بارزانییەکاندا سەرکەوتن کارێکی هێندە ئاسان نییە و زوو بەزوو نایەتە دی.

بەداخەوە، هەرەسی کۆماری ئازربایجان و هەڵاتنی جافەر پیشەوەری و هاوەڵەکانی، هەروەها بڵاوبوونەوەی خێڵانی کورد لە دەسوەکەری و بەرگری کردن لە کۆماری کوردستاندا بوون بەهۆی ئەوەی پێشەوا بڕیاری شەڕنەکردن و خۆ بەدەستەودان وەربگرێ. لە راستیشدا هەڵسوکەوتی سۆڤیەتەکان ببووە هۆی لاوازبوونی متمانەی خەڵک و لە ئەنجامدا لە گەلێک لاوە خێڵان کەوتبوونە بەستنی پێوەندی لەگەڵ حکوومەتی شادا. هەرچەندە لەو سەروبەندەدا سەرۆکی نەمر بارزانی بەشێوەیەکی تایبەتی دەچێتە مەهاباد بۆ دیمانەی پێشەوا و داوایەکی زۆری لێ دەکا بۆ ئەوەی بڕیاری بەربەرەکانی بدات. ئاخیر داوای ئەوە دەبێ کە قازی محەمەد خۆی نەداتە دەست هێزەکانی دەوڵەت و، بەڵێنی گوێڕایەڵی و بەجێ هێنانی هەموو جۆرە فەرمان و دەستورێکی پێ دەدات بەڵام پێشەوا قەبووڵ ناکات و دەڵێ من لێرە دەمێنمەوە و هەتاسەر لەگەڵ خەڵکەکەدا دەبم.

بەهەرحاڵ، داخیل بوونی سوپای ئێران بۆ ناو شاری مەهاباد و بەکۆتاهاتنی تەمەنی کۆمار لە ١٥ کانوون (١) ١٩٤٦دا شەڕ و بەربەرەکانێیەکی خەست و خۆڵی لەنێوان هێزی لێهاتووی بارزانییەکان و سوپای شاهەنشاهیدا هێنایە گۆڕێ کە هەموو سەرچاوەکان هەتا ئێستە زۆر بەسەرسڕماوی باسی قارەمانیەتیی بارزانییەکان و تاکتیک

و هونەری شەڕوانیی بارزانیی نەمر دەکەن. هەرچەندە بارزانییەکان بەدرێژاییی کاتی ئەو شەڕانە ژمارەیەکی یەکجار گەورە خێزان و ماڵ و منداڵیان بەملەوە بوو، لەلایەکەوە دەبوو لە پەلاماری بەردەوامی باڵەفڕەی دوژمن بیانپارێزن و نان و بژێوییان بۆ دابین بکەن، لەلایەکی ترەوە بەرەودوا پاشەکشەیان پێ بکەن و، بەردەوامیش ئاگەدار بن نەکەونە ناو داوی پیلان و فێڵی دوژمنانەوە.

وەک لەم کتێبەدا بەدوور و درێژی باس کراوە و پێویست بەدووبارەکردنەوە ناکات، چۆن سەرەتا بەرپرسانی ئێرانی دەیانویست بارزانییەکان هەڵبخەڵەتێنن و بەسەریاندا زاڵ ببن بەڵام سەرۆکی نەمر مەلا مستەفا و خوالێخۆشبوو شێخ ئەحمەدی برای نەیاندەویست بەبەڵێنی زارەکی فریو بخۆن و خۆیان حەواڵەی ئێران بدەن و بکەونە بن دەستیانەوە، یا بەبێ مەرج و مسۆگەر بگەڕێنەوە بن دەستی عێراقییەکان. ئەوان ڕێگەی سێیەمیان لەبەرچاوی خۆیان گرتبوو کە هەڵکشان بەرەو باکور و پەنابردن بۆ سۆڤیەت بوو. بەڵام ئەو نەخشەیەش بەهۆی سەرما و بەفر و زریان و بێ بژێوی لە لایەک و پەلاماری بێ وچانی هێزی ئاسمانی و بەژەکیی ئێران بۆ سەر خۆیان و خاووخێزانیاز لە لایەکی ترەوە، نەدەهاتە دی.

بەیەکدادانی بارزانییەکان و سوپای ئێران لە حەفتەی یەکەمی مانگی ئاداری ١٩٤٧ەوە هەتا ناوەڕاستی نیسانی هەر ئەو ساڵە درێژەی کێشا، واتە لە شەڕی بەناوبانگی «نەلۆس»ەوە هەتا پەڕینەوەی ماڵ و منداڵی بارزانییەکان لە چۆمی گادەر بۆ دیوی عێراق. جارێکی تریش ئەو رووبەڕوو بوونەوەیە لە کاتی ڕۆشتنە مێژووییەکە «المسيرة التأريخية»دا سەری هەڵدایەوە کە پاشان بەدرێژی باسی دەکەین. فەرمانی راستەوخۆی شای ئێران لەو شەڕانەدا بۆ کاربەدەستانی سوپا ئەوەبوو: «نەهێڵن بارزانییەکان دەربازبن و کاروانی کۆچی خاووخێزانیان بۆمباباران بکەن بۆ ئەوەی چیتر ئابرووی (ئەرتەش) نەچێ و بارزانییەکانیش دەرسێکی وا وەربگرن بیرای ببڕ بیری وا نەکەوێتەوە سەریان.» بەڵام لە راستیدا وەک د. قاسملو لەم بارەیەوە دەڵێ:

«فەرمانەکەی شای ئێران نەهاتەجێ، بارزانییەکان دەربازبوون و، ئەویش ئابرووی خۆی و ئەرتەشەکەی بۆ هەتا هەتایە چوو.» بارزانییەکان لەم شەڕانەدا لاپەڕەیەکی پڕ لە شانازییان لە بەرخوەدانی گەلی کورددا تۆمار کرد و، سوپای شای ئێرانیش لاپەڕەیەکی شەرمەزار و پڕ لە زوڵم و سەرکوتینەوە.

ڕۆژی ١٥ نیسان ١٩٤٧ شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا لەسەر چۆمی گادەردا ماڵئاواییان لە یەکتر کرد، خوالێخۆشبوو شێخ ئەحمەد خۆی و ماڵە بارزانییەکان گەڕانەوە عێراق، لەوبەری چۆمدا عەلی حیجازیی بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیسی عێراق لە پێشوازیی ماڵە بارزانییەکاندا وەستابوو کە پێشتر شێخ ئەحمەد لەو بارەیەوە لەگەڵیدا کەوتبووە وتووێژەوە. مەلا مستەفاش لەگەڵ ٥٦٠ چەکداری دەسبژێری خۆیدا بڕیاری ڕۆیشتن بەرەو چارەنووسێکی نادیاری هەڵبژارد. ئەوەبوو لە ڕۆژی ١٩ نیساندا لە ڕێگەی «نازداری داغی»یەوە هاتەوە خواکورک لەناو سنووری کوردستانی عێراق. سوپای عێراق و ئینگلیز بەهێزێکی گەورەوە چوونە پێشوازییان و کەوتنە تەنگ پێ هەڵچنین و سەرکوتینەوەیان. بارزانی، لە ڕۆژی ٦ ئایاردا هێزەکانی خۆی کۆکردەوە و بڕیاری یەکجارەکیی چوونە سۆڤیەتی پێ ڕاگەیاندن، بۆ هەندێکیان بەدیهاتنی ئەم خەونە زۆر دوورە دەست بوو بەڵام هەلی مانەوەش لە کوردستان هەرگیز لەبەردەستدا نەبوو. لە ڕاستیدا، بڕیاری چوون بۆ سۆڤیەت بڕیارێکی یەکجار قارەمانانە بوو، نیشانەی ئەوپەڕی دووربینی و لێهاتوویی بوو کە تەنیا لە سەرکردەیەکی مێژوویی وەک بارزانیی نەمر دەوەشایەوە. هەر تەنیا ئەم ڕێگەیەش لەبەردەمدا مابوو کە لە کاروانی ڕێگەی تێکۆشاندا بیگرێتە بەر.

قسە لە بارەی «ڕۆیشتنە مێژووییەکەی بەرەو سۆڤیەت» لەم پێشەکییە کورتەدا جێی نابێتەوە و خوێنەری بەڕێز دەتوانێ بۆ وەرگرتنی زانیاریی ورد و تەواو بگەڕێتەوە سەر کتێبەکەی سەرۆکی هێژا بەڕێز مەسعوود بارزانی لە بارەی «شۆڕشی بارزان ١٩٤٥ـ ١٩٥٨» و نامیلکەیەکی تر کە لە پەڕاوێزی ئەم نووسینەدا ئاماژەی پێ دراوە.

بەپێی ئەو سەرچاوانەی سەرەوە، ڕۆیشتنە مێژووییەکە لە ناوچەی «هەرکی بنەجێ» لە ڕۆژی ٢٢ ئایار ١٩٤٧دا «واتە ٢ جۆزەردان ١٣٢٦» دەستی پێ کرد و ڕۆژی ٢٥ی مانگ لە گوندی «بێداف»ی عێراقەوە پەڕینەوە بۆ گوندی «بای» لەناو ئاخی تورکیا. سوپای تورکیا زوو هەستی بەم جموجووڵەی بارزانییەکان کرد و باڵەفڕەکانیان کەوتنە سەراسۆ و پشکنینی ناوچەکانی سەر سنوور. بارزانی بۆ ئەوەی ناچاری ڕووبەڕوو وەستانی سوپای تورک نەبێتەوە کەوتە خافڵاندن و دەسخەڵەتدانی هێزەکانیان، هەتا ئەوەی بەرەبەیانی ٢٧ی مانگ هێزی بارزانییەکان لە ڕێگەی «زینیا ئاسینگەرا»وە بەچیای «سپیرێز»دا هەڵگەڕا، باڵەفڕەیەکی تورکی کەوتە شوێنیان بەڵام ئەوان دەرباز

ببوون و چووبوونه ناو زەویی ئێران. ئێوارەی ئەو ڕۆژە بارزانییەکان گەیشتنە گوندی «جیرمی»ی ئێران و، ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە کەوتنە بڕینی ڕێگەی باکور و هەتا ڕۆژی ٨ ئایار بەرەوژوور بەناوچە کوردەوارییەکانی کوردستانی ئێراندا هەڵکشان. بەڕێگەوە لە هەندێ شوێندا دەستی یارمەتییان لە لایەنی دڵسۆزان و لە هەندێ شوێنی تردا دەستی ناپاکییان لە لایەن ناحەزانەوە بۆ درێژ دەکرا. سوپای ئێرانیش بەدرێژاییی ئەو ماوەیە پێوەبوو هەلێکی بۆ هەڵکەوێ هەتاکو زەبرێکی گورچکبڕیان تێ بسرەوێنێ، ئەوەبوو لە ماکۆ هێزێکی مشەیان بەپشتەوانیی تانک و زرێدار و تۆپ، بۆ گەیشتن بەو مەبەستەی پێشوویان گل دابووەوە کە شوێنێکی لەبار بوو بۆ بەدیهاتنی ئەو خەونە ئاڵاوە. بێگومان چارەنووسی بارزانییەکان لەو کاتەدا کەوتبووە دووڕیانی هات و نەهاتەوە. بارزانی کەوتە دانانی نەخشەی شەڕێک و، خۆی وەک شەڕکەر تیایدا بەشدار بوو، هێرش بۆ سەر «ئەرتەش»ی ئێران لە لایەنی بارزانییەکانەوە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لە ٩- ١١ ئایار بەخەست و خۆڵی درێژەی کێشا. بارزانییەکان جگە لەوەی زیانی بەسەتان کوژراو و بریندار یان لە سوپای ئێران دا و، تانکێک و تۆپێکیان شکاند و باڵەفڕەیەکیان بەردایەوە و، و ژمارەی ٢٧١ دیلیان کەوتە دەست کە پاش تەواو بوونی شەڕ بەرەڵلایان کردن و بڕێکی یەکجار زۆر چەک و تەقەمەنییان کەوتە دەست، هەروەها شەوی ١١/١٢ی مانگی حوزەیران پردی «ماکۆ»یشیان کۆنترۆل کرد و لەوێوە لە چۆمی زەنگی دەرباز بوون و گەیشتنە گوندی «هامسوون» و لە «ئاوی ئاراس» نیزیک بوونەوە، لە ڕۆژی ١٧ حوزەیراندا بەشی یەکەمی بارزانییەکان لەگەڵ شێخ سلێمانی بارزانیدا لە چۆمی ئاراس پەڕینەوە و پەنایان بۆ سۆڤیەت برد. ڕۆژی پاشتریش واتە لە ١٨ی مانگدا بارزانی خۆی و پاشماوەی هەڤاڵەکانی پەڕینەوە و کۆتاییيان بەرێپێوانی بەناوبانگی ٣٥٠ کیلۆمەتری هێنا. بەمەش جوانترین لاپەڕەی قارەمانیەتییان نەک هەر لە مێژووی گەلی کورد بگرە لە مێژووی تێکڕای گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا تۆمار کرد. لەو ڕۆژە بەپاشەوە وشەی «ئاراس» و «ئاوی ئاراس» بوون بەوشەی سەر زاری هەموو دانیشتووانی کوردستان و، «ئاراس» بەهەزاران ناوی لێ کەوتەوە.

ئاژانسەکانی دەنگوباسی دنیا هەواڵی ئەو شەڕانە و ڕۆیشتنی بارزانی و هەڤاڵەکانیانی بۆ یەکەتیی سۆڤیەت بڵاوکردەوە و رادیۆی لەندەن لە بەلاوۆکی دەنگوباسی ڕۆژی ١٩ی حوزەیراندا گوتی: «چوار ئەفسەرە کوردەکە لە بەغدا لەدار دران بەڵام مەلا مستەفا لە تەڵە رزگار بوو و بەشێوەیەکی زۆر سەرسڕهێن و بەساغی لەگەڵ

پێشمەرگەکانیدا گەیشتە رووسیا». ئیتر بەو شێوەیە رای گشتیی دنیا کەسایەتییەکی شۆڕشگێڕی کەم وێنەی ناسی کە هەتا ماوەیەکی دوور و درێژ و تەنانەت ئەمڕۆش ناوی کورد بەیاریدەی ناوی مەلا مستەفای بارزان دەناسرایەوە.

پاشەکشە و دەربازبوونی بارزانییەکان و پەڕینەوەیان لە رووباری ئاراس، سەرەڕای هێرش و بۆسە دانان و پیلانی ئێران و تورکیا و عێراق، وەک لاپەڕەیەکی زێڕینە لە مێژووی خەباتی نەتەوەی کورددا. تاکتیکی دەربازبوونی ئەوان دواتر وەک دەرس لە «دانشگای جەنگ» لە تاران گوتراوەتەوە.

زیانی گیانیی بارزانییەکان لە «ڕۆیشتنە مێژووییەکە»دا بەپێی ئەو ناوانەی بەڕێز سەرۆک مەسعود بارزانی لە کتێبە بەنرخەکەی «بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریی کورد، شۆڕشی بارزان ١٩٤٥ ـ ٥٨»دا تۆماری کردوون لە ژمارەی پەنجەکانی هەردوو دەست تێ ناپەڕێ لە کاتێکدا کە هەڤالانی بارزانی لەو ڕۆیشتنەدا دەڵێن ئەگەر لێهاتوویی و هونەری شەڕوانیی بارزانیی نەمر نەبوایە ئەوا «نەک پێنسەت کەس بگرە پێنج هەزاریش بوایەین کەسێکمان بەزیندوویی نەدەگەیشتە سۆڤیەت.»

هەواڵی پەڕینەوەی بارزانییەکان لە چۆمی ئاراس و ئەو قارەمانیەتییانەی بەڕێگەوە پێشانیان دابوو، دڵ و دەروونی هەموو کوردێکی پڕ کرد لە هەستی شانازی. عەبدوڕەحمان قاسملوو دەڵێ: «شەڕی بارزانییەکان هەتا رادەیەک تۆڵەی رووخانی کۆماری کوردستانی کردەوە و ورەی تێکشکاوی خەڵکی بردەوە سەرێ». شاعیری گەورەی کورد پیرەمێردیش هەر ئەو دەمە، شیوەنێکی بەسۆزی بۆ کۆچی بارزانییەکان و لە وڵات دەرچوونیان لە هەڵبەستێکدا دەربڕی و گوتی:

عەشرەت هاوارە، عەشرەت هاوارە
کەوتوومە ئاراس ئاو بێ بوارە
ڕێم نییە منیش شوێن ئەوان کەوم
پیرم هەنگاوێک بنێم ئەکەوم
لێرەش وا کەوتووم بەدەم دەردەوە
لە ئێشی دووری و ئاهی سەردەوە
دکتۆر دەوای تۆم ناوێ لێم گەڕێ

بەڵکم بەئاهم دەوران وەرگــــەڕێ
یا وا وەرگــەڕێ ئێـلـم ســەرکــەوێ
یا زرمــەی تۆپی زەڕڕەی بەرکــەوێ
ئەوسـاکـە دووعـای من وا گـیـرابێ
لە خــانەی خــاکــا ئاواتم نابێ
ئینجــا تەڵقــینم بدەن بەکــوردی
بڵــێن ئاواتت هاتەجێ و مــردی

***

لەکاتی هێرشەکەی سوپای حەمە رەزا شا بۆ سەر ئازربایجان و کۆماری کوردستان، نەجەف قولی پسیان وەک تاکە پەیامنێری رۆژنامەی «اطلاعات»، پێ بەپێی هێرشەکە بە چاوی خۆی رووداوەکانی دەبینی و تۆماری کردن. پاشان ئەم دیتنانەی خۆی لە کتێبێکدا بە ناوی «مردن هەبوو، گەرانەوەیش هەبوو» بڵاوکردەوە. نووسەری کتێب کە بە «شایەدی نیو سەدەی مێژووی ئێران» دەناسرێ، لەبارەی هەڵبژاردنی ناوی کتێبەکەیەوە دەڵێ: "لە کاتی راپەڕینی فیرقەی دێموکراتی ئازربایجاندا، لایەنگرانی ئەو فیرقەیە بۆ دەربڕینی بیر و بۆچوونیان، لە بڵاوکراوەکانی خۆیاندا دروشمی «ئۆلمەک وار، دنمەک یوخدور ـ واتە: مردن هەیە، گەڕانەوە نییە»یان دەنووسی، بەڵام لەبەرئەوەی رووداوەکانی مانگی سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٤ و هەڵاتنی سەرکردەکانی فیرقە پێچەوانەی ئەم لاف لێدانەی ئەوانی ئیسپات کرد بۆیە کتێبەکەم بەناوی «مردن هەبوو، گەڕانەوەیش هەبوو» ناو نا.

لە راستیدا ئەو کتێبە دوو بەرگە:

بەرگی یەکەم ـ بە ناوی پێشووە، واتە «مردن هەبوو، گەڕانەوەیش هەبوو» و لە ژێر دێری "مێژووی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان و حیزبی کۆمەڵەی کوردستان لەکاتی لە دەسچوونی بنکە سەربازییە مەزنەکان لە ئازەربایجان هەتا چەسپانی هێزی حکوومەت"، ئەم بەرگە لە سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٦دا واتە تشرین(٢) ـ کانوون(٢) ١٩٤٦ بڵاوبووەتەوە.

بەرگی دووەم ـ بەناوی «لە مەهابادی خوێناوییەوە...هەتا لێوارەکانی ئاراس» و لە ژێر دێری: «مێژوی پێکدادانی هێزەکانی سوپایی لەگەڵ کوردە بارزانییەکاندا هەر لە شەڕی

شنۆوە هەتا دەربازبوونی بارزانییەکان بۆ ناو زەویی سۆڤیەت»ە، ئەم بەرگەشیان لە مانگی سەرماوەزی ساڵی ۱۳۲۷دا واتە لە ساڵی ۱۹٤۷چاپ و بڵاوبووەتەوە.

لە پێناو دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی، بە پێویستمان زانی جارێ لە پێشەوە بەرگی دووەمی کتێبەکە پێشکێش بەخوێنەرانی ئازیزی کورد بکەین، هیوادارین لە داهاتوودا ئەو بابەتانەی لەبارەی کۆماری کودستان و پەلاماری هێزەکانی دەوڵەت بۆ سەر ئەو کۆمارە کە لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەدا هاتووە، ئەویشیان پێشکێش بکەین.

ئەوەی لە ئێستە بەدواوە دەبیندرێ بریتییە لە شەڕ و بەربەرەکانیی بارزانییەکان لەگەڵ سوپای حەمەرەزا شا و بەسەرهاتی ڕۆیشتنە مێژووینەکەی بارزانیی نەمر و هەڤاڵانی ئەو، بەرەو یەکەتیی سۆڤیەت کە لە زمانی نەجەف قولی پسیان ـ ەوەی دەبیستین.

نووسەر لەبەرئەوەی بۆی هەڵکەوتووە شان بەشانی ڕووداوەکان بژی دەیتوانی بەدروستی تۆماریان بکات بەڵام وا دیارە ڕەچاوی سیاسەتی دەوڵەتی کردووە بۆیە هەندێک جار دەبینین بۆچوونی چەوتی لەبارەی ئەو ڕووداوانە یان بەگشتی لەبارەی بزووتنەوەی سیاسی و چەکداریی گەلی کوردەوە دەربڕیوە، یا هەندێک جاری تر وا دیارە بەبێ مەبەست کەوتووەتە هەڵەوە. ئێمە لەو شوێنانەی بەپێویستمان زانیبێ لە داوێنی کتێبەکەدا هەندێک لەو چەوتییانەمان ڕاست کردووەتەوە، لە هەندێک شوێنی تریشدا ڕاستکردنەوەمان بۆ بیر و هزری خوێنەری بەڕێزی کورد بەجێ هێشتووە.

**شەوکەت شێخ یەزدین**

۹ ئایار ۱۹۹٦

## ئەو سەرچاوانەی بۆ نووسینی

## ئەم پێشەکییە سوودیان لێ وەرگیراوە:

بەشێوەیەکی سەرەکی سوود لە کتێبی بەڕێز مەسعود بارزانی:
البارزاني والحركة التحررية الكردية، ثورة بارزان ١٩٤٥ـ ١٩٥٨، كوردستان ـ كانون الأول ١٩٨٧، وەرگیراوە. هەروەها ئەم سەرچاوانەی خوارەوەش:

(١) من مآثر البارزاني التأريخية ١٩٤٥ـ ١٩٥٨، المسيرة التأريخية الى الاتحاد السوفيتي، من منشورات قسم الاعلام في المكتب السياسي للحزب الديمقراطي الكوردستاني ـ العراق، تقديم السيد مسعود البارزاني.

(٢) د. عەبدوڕەحمان قاسملو، چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی، کورتەیەک لە مێژووی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، ١٩٨٨.

(٣) جەلیل گادانی، ٥٠ ساڵ خەبات: کورتە مێژوویەکی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بەرگی یەکەم.

(٤) عەبدوڵڵا ڕەسووڵ پشدەری، یادداشتەکانم، بەشی یەکەم، بەغدا ١٩٩٢.

(٥) آرچي روزفلت، جمهورية مهاباد الكوردية، ترجمة: ظاهر حمد طاهر، ١٩٨٨.

(٦) ڕۆژنامەی ڕۆژا نوو، ژمارە ٦٣، دووشەم ٢٦، تشرینی دووەم ١٩٤٥، خاوەن و بەڕێوەبەری میر د. کامەران ئالی بەدرخان.

(٧) محەمەد ڕەسوول هاوار، پیرەمێردی نەمر، بەغدا، ١٩٧٠.

***

پاش رابردوویکی پڕ لە ڕووداو، لە مانگی سەرماوەزی ١٣٢٥دا (واتە ٢١ مانگی تشرین١ ـ ٢٢ کانوون٢ی ١٩٤٦)[١] هاوڕێیەتیمان لەگەڵ هێزی نێردراوی حکوومەت بۆ ئازربایجان هاتە پێش. هێشتا کێشەی پێکدادانی نێوان سوپای تاران و، هێزی چەکداری فیرقەی دێموکراتی ئازربایجان و لایەنگرانی حیزبی کۆمەڵەی کوردستان[٢] لە بیر نەچوو بوو کە لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای سنووری ئێراندا، شان بەشانی زنجیرە شاخەکانی سنووری ئێران و عێراق کە کوردستانی ژوورووی بەکرماشان و ماکۆ دەبەستێتەوە، گۆڕەپانێکی تازە بۆ خوێنڕێژی هاتە کایە. لەو ناوچە ناسکەدا پێکدادانی نێوان هێزی سوپا و کوردانی بارزانی ڕووی دا کە هەتا ئەو ساتە لە خەستی و گرینگیدا لەوێنەیان نەبووبوو.

ئەو ڕۆژانە، نەک تەنێ لە تاران بگرە لە تەورێز و ورمێ و خۆی و مەراغە و شاپووریشدا کەسێک نەبوو ئاگاداری کێشەیەک بێ بەناوی «پرسی بارزانییەکان» کە بوویێتە کۆسپ لە سەر ڕێگەی چەسپانی تەناهیدا. ئەو سەرکەوتنانەیش کە لەشەڕ و شۆڕەکانی ئازربایجان و کوردستاندا لە بەرامبەر هێزی سەرپێچی کەردا ببوونە بەشی سوپا، ڕێگەیان لەوە گرتبوو خەڵک بایەخی شوێن و دژوارییی بارودۆخ لەو ئەرکە سەختەدا لەبەرچاو بگرن کە سوپا بەرەوڕوویان دەبووەوە، بەجۆرێک کە بەرادەی پێویست لێی ئاگادار نەبوون.

ئەوانەی لە ڕۆژانی بەرەودواهاتنی مانگی سەرماوەزی ١٣٢٥دا لە شارەکانی

(١) لەو شوێنانەی بەپێویستمان زانیبێ مێژووی زایینیمان لەبەرامبەر مێژووە ئێرانییەکە نووسیوە، لەو شوێنانەش کە نەماننووسیوە خوێنەری بەڕێز دەتوانێ بەپێیی ئەم خشتەیەی خوارەوە مێژووە زایینییەکە بۆ خۆی دیاری بکات:
ئاخەلێوە:(٢١ ئادار ـ ٢٠ نیسان)، گوڵان: (٢١ نیسان ـ٢١ ئایار)، جۆزەردان: (٢٢ ئایار ـ ٢٢ حوزەیران)، پووشپەڕ: (٢٢ حوزەیران ـ ٢٢ تەمووز) خەرمانان: (٢٣ تەمووز ـ ٢٢ ئاب)، گەلاوێژ: (٢٣ ئاب ـ ٢٢ ئەیلوول)، ڕەزبەر: (٢٣ ئەیلوول ـ ٢١ تشرین١)، گەڵاڕێزان: (٢٢ تشرین١ ـ ٢٠ تشرین٢)، سەرماوەز: (٢١ تشرین٢ـ ٢٠ کانوون١)، بەفرانبار: (٢١ کانوون١ـ ١٩ کانوون٢)، ڕێبەندان: (٢٠ کانوون٢ ـ ١٨ شوبات)، ڕەشەمێ: (١٩ شوبات ـ ٢٠ ئایار).

(٢) ڕێکخراوێک بەناوی «حیزبی کۆمەڵەی کوردستان» نەبووە کە نووسەر بەدرێژاییی ئەم نووسراوە وا دەڵێ، ئەوەی هەبووە کۆمەڵەی ژ.ک «واتە کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد» بووە کە لە ١٦ ئەیلوول ١٩٤٣ لە مەهاباد دامەزراوە و بەنهێنییەوە خەباتی کردووە هەتا دروست بوونی هەلومەرجی ئازادی، پاشان لە ١٥ ئاب ١٩٤٥دا حیزبی دێموکراتی کوردستان لە شوێنی ئەودا دامەزراوە.

ئازربایجاندا ئامادە و نیشتەجێ بوونە و لە نێزیکەوە سەرنجیان لە چۆنیەتیی گەڕانەوەی سوپا بۆ ئەو شوێنانە داوە، چاک لە بیریانە خەڵکی وڵاتپارێز و ئێرانپەروەری ئازربایجان چۆن پێشوازییەکی گەرمیان لە سەرباز و ئەفسەران دەکرد، چییان لە بەرامبەر سەرۆکانی فیرقەی سەرپێچیکەری دیموکراتدا دەکرد، چۆن لە پێش سەرباز و ئەفسەراندا گیانیان دەکرد بەقوربان و لە دژی سەرپێچیکەراندا تۆڵەیان وەردەگرتەوە.

ئەو هەست و سۆزانە بەکارترین پشتەوان و چاترین هاریکاری بوون بۆ هێزی سوپا لە کار و کردەوەی دژ بەکوردانی بارزانیدا. بەتایبەتیی لەبەرئەوەی دانیشتوانی ئەو ناوچانەی کەوتبوونە بەر دەسدرێژیی بارزانییەکان ئەم تایەفەیەیان بەنائێرانی و بیانی دەزانی بۆیە یارمەتییەکی لە دڵەوەتریان دەدا بەهێزی دەوڵەت(٣).

بۆ ئەوەی پێوەندیی هێزی دەوڵەت و کوردانی بارزانی لە دەسپێکی ئۆپەراسیۆنەکانی سوپاوە روون ببێتەوە، هەروەهاش بۆ ئەوەی هاووڵاتیانی ئازیز باشتر لە چۆنیەتیی ئەو هۆیانەی بوونە مایەی پێکدادانی تیژ لە نێوان هەردووڵادا ئاگەداربن، ئێمە بارودۆخی بارزانییەکان و چۆنیەتیی جێ نیشتەبوونیان لە کوردستاندا(٤) دوابەدوای دەست بەسەرداگرتنی ئازربایجان لە لایەن دەوڵەتەوە دەخەینە ڕوو.

لە مانگی سەرماوەزی ١٣٢٥دا کە هێزی سوپای ئێران بەتوانستێکی جووت لەگەڵ خۆشەویستیدا، ئاڵای «شمشێر و رۆژ»ی سێ ڕەنگی ئێرانیان دوای ساڵێک لە هەوڵ و تێکۆشان لەسەر بەرزایی و سنوورەکانی ئازربایجاندا لەراندەوە و ڕێکخراوی فشۆڵ و لایەنگرانی پیشەوەری(٥) و قازی محەمەد لێک هەڵوەشان، کوردانی بارزانی بەسەرۆکایەتیی سیاسەتوانی ناودار بەناوی «شێخ ئەحمەد» کە ناسراوە بە«خودانی بارزان»(٦) و سەرکردایەتیی ئازایەکی وەک مەلا مستەفا کە لە مەهابادەوە بۆ شنۆ و نەغەدە بەرەو زەویی عێراق کۆچیان کرد یان بەناچاری لە ناو زەویی ئێراندا بۆ خۆپارێزی

(٣) ئەو دانیشتووانەی نووسەر باسیان دەکات بریتی بوون لە هەندێ لەو خێڵانەی بێ بەڵێنییان لەگەڵ بارزانییەکاندا کرد و لە خەبات هەڵگەڕانە و بوون بەجاش و نۆکەری ڕێژیمی شای ئێران، پێشتریش هەمان بێ بەڵێنییان لەگەڵ کۆماری کوردستاندا کردبوو و، پێشەوا قازی محەمەد هیچ کاتێک متمانەی پێیان نەبوو.

(٤) مەبەستی نووسەر لێرەدا کوردستانی ژێر سایەی کۆماری کوردستانە نەک شوێنانی تر.

(٥) واتە جافەر پیشەوەریی سەرۆکی فیرقەی دێموکرات و سەرکۆماری ئازربایجان.

(٦) خودانی بارزان: خاوەنی بارزان، صاحب بارزان.

له پێکدادان لەگەڵ هێزی دەوڵەتیدا، له ناوچه سنوورییەکاندا جێ نیشته بوون.

ئەوکاته، سەرۆکایەتیی سوپای نێردراو بۆ کوردستان و لەشکری چوارەم، به لیوا روکن هومایوونی سپێردرا بوو. گەڕانەوەی هێزی سوپا له ژێر سەرکردایەتیی ئەواندا بۆ کوردستانی ژووروو بەتایبەتیش بۆ مەهاباد، له هەلومەرجێکی تایبەتدا بوو. بۆ ئاگادارییەکی ورد لەوەی رووی دا، وا باشتره پاشەکشەی بارزانییەکان و چۆنیەتیی ئەو پاشەکشەیه له رۆژی بیست و یەکی مانگی سەرماوەزدا، که هاوکاتی کەوتنی تەورێز و هەڵاتنی سەرکردەکانی فیرقەی دێموکرات بوو، بخرێته ژێر لێکۆڵینەوە.

## گەڕانەوەی هێزی دەوڵەت بۆ مەهاباد

سەعات ٧ی سەر لەبەیانیی رۆژی بیست و یەکەمی سەرماوەز، زرێپۆشی شەڕکەری دەوڵەتی که پێشەوانی هێزی هێرشبەر بوون، بەرەو ناوچەی «سەرا» بەڕێ کەوتن و بۆ رووکاری مەهاباد واته پایەتەختی کۆماری قازی محەمەد هێرشیان برد. رۆژێک بەر له دەسپێکی کاروان، بارزانییەکان ئەو بەرزاییانەی دەڕواننه سەر سەقزیان چۆڵ کردبوو و بەرەو بۆکان پاشەکشەیان کردبوو.

بەرەوپێش چوونی کاروان هەتا «سەرا» بەگرتنی بڕێک دیل و چەک، له رۆژی ٢١ی سەرماوەزدا بەکۆتا گەیشت، رۆژی بیست و دووەمی مانگی سەرماوەز رۆیشتنی سوپا بەرەو بۆکان بەردەوام بوو. له بۆکاندا ژمارەیەکی تری چەک و دیل و کۆگەیەکی ئازووخه کەوته ژێر چەنگی هێزی دەوڵەت. نیوەڕۆی بیست و دووەمی مانگی سەرماوەز پاشماوەی سوپا گەیشته بۆکان و، بەئەمری عەمید بەگلەریی جێگری سەرکردەی فیرقه و بەمەبەستی بەدوادا گەڕان و پشکنین بەدوای بارزانییەکاندا که رووەو «بورهان ـ مەهەباد» پاشەکشەیان کردبوو، کاروانێکی تێکەڵ له ئەسپ سوارانی خێڵەکیی موکریانی و عەباسی و ئەسپ سوارانی تر که ئەوانیش هەر خۆیان گەیاندبووه کاروان، لەگەڵ زرێپۆشێکی مامناوەندیدا له دوای نیوەڕۆی بیست و دووەمی سەرماوەز بەسەرکردایەتیی عەقید عەلی ئەکبەر غەففاری بەرەو بورهان ـ مەهاباد پەلاماریان برد. ئەم کاروانه، شەوێک له تازەقەڵا و شەوی دوا تر له بورهان گیربوون و، رۆژی بیست و چوارەمی سەرماوەز به «ئیندەرقاش»ی شەشه کیلۆمەتری دووری مەهاباد گەیشتن. لەو شوێنەدا، هەواڵێک بیسترا گوایه قازی محەمەد دوو شەو لەمەوبەر لایەنگرانی خۆی له مەهاباد

کۆکردووەتەوە و چی چەک و ئازووخەی لە مەهابادا هەیە هەمووی بەسەر مەهابادی و لایەنگرە دڵسۆزەکانی خۆیدا دابەشیوە و بڕێک لەو چەکانە بەتایبەتیش ژمارەیەکی زۆری نارنجۆکی دەستی و دەمانچەی خۆبزوێن کەوتوونەتە دەستی مەلا مستەفا و بارزانییەکان.

بەر لەوەی سوپا بگاتە ناو مەهاباد، لە رۆژی بیست و سێیەمی سەرماوەزدا، دەمراستانی خەڵکی ئەو شارە لە پێناو پێشگیری لە پێشهاتی دڵتەزێن و هەڵگرتنی ترس و لەرزی شارنشینان، هاتنە دیمانەی لیوا ڕوکن هومایوونیی سەرکردەی سوپای نێردراوی دەوڵەت. دەمراستانی ئەو دەستەیە بریتی بوون لە بەڕێزان سەید عەلی حوسێنی و میرزا رەحمەت شافیعی کە لە بازرگانان بوون، شێخ حەسەن شەمسی بورهانی لە پێشەوایانی ئایینی، کەریم ئاغای قوم قەڵای دێبوکری، عەلی ئاغای کوڕی قەرەنی و، سلێمان ـ کوڕی ناوداری ئاغا مامەش لە عەشایەری باکور، مام حەسەن لە مەنگوڕ و سەیفی قازی دەمراستی تایبەتی قازی محەمەد، ئەمانە لە کارگەی شەکری میاندووئاو لە نەسیرکەندی چاویان بەلیوا ڕوکن هومایوونی کەوت. سەرکردەی هێزی کوردستان لەم دیمانەیەدا، دەمراستانی کوردی دڵنیا کرد کەوا کوردانی شارستان و عەشایەر دڵنیا بن لەوەی دەوڵەت هیچ نیازێکی خراپی لە ئاست کورداندا نییە و هێزی دەوڵەت بەبێ کوشتار و تاڵانکاری و کردەوەی بەرەواژ بەئاسایش، دێتە ناو شارەوە.

دوای چەندانێک، قازی محەمەد خۆی، تەبای حاجی بابە شێخ و بایەزید ئاغای گەورک لە میاندووئاو دیمانەی سەرکردەی سوپایان کرد و دوای نواندنی ڕێز و گوێ بەفەرمانیی خۆیان، بەرەو مەهاباد بوونەوە. هەر لەوێدا بیسترا کە قازی محەمەد بووەتە لەمپەر لە پێش مەلا مستەفای بارزانیدا لەوەی دەمراستێک بنێرێتە لای سەرکردەی سوپای دەوڵەت، هەروەها بەهەڕەشە نەیهێشتووە دیمانەیەک لە نێوان ئەو و هێزی دەوڵەتدا بکرێ. ئەم هەڵسوکەوتەی قازی محەمەد و ئەو مەترسییەی مەلا مستەفا هەیبوو، بوون بەهۆی ئەوەی بارزانییەکان تەبای خاوخێزانیان رووەو نەغەدە و شنۆ کۆچ بکەن.

عەقید عەلی ئەکبەر غەففاری نیازی وابوو هەمان رۆژی بیست و چوارەمی سەرماوەز بەچەپاوی عەشایەری ژێر سەرکردایەتیی خۆی، مەهاباد بگرێ. لەلایەکی تر، سەرۆکی عەشایەری ئەو ناوانە بڕیاریان دابوو کە بەگەیشتنیان بۆ مەهاباد قازی محەمەد و سەیفی قازی لە بریتی ئەو کردارانەی لە دژی دەوڵەتدا کردبوویان، بەسزا بگەیەن. سەرکردەی هێرشیش پێی ناخۆش نەبوو قازی محەمەد بەدەستی هەمان ئەو کەسانە بچێ کە هەر خۆی

دژ بەسەروەریی دەوڵەت هانی دابوون. بەبۆچوونی ئەو، ئەمە شایەنترین سزابوو بۆ قازی محەمەد. بەڵام لەو شوێنەدا ئەمرێک لەلایەن فەرماندەی فیرقەوە هات کە هێرشی عەشایەر لە «ئیندەرقاش»دا بووەستێ هەتا ئەو کاتەی یەکەکانی سوپا پێشتر دەچنە ناو مەهابادەوە. بەم شێوە هێرشی عەشایەر دوو رۆژی دواتر واتە بیست و چوار و بیست پێنجەم لە ئیندەرقاش راگیرا. باری سەرنجی سەرکردایەتی لەم بارەیەوە ئەوەبوو نەوەکا پێش چوونی سوپا بۆ ناو مەهاباد، لەلایەن سوارەی عەشایەرەوە بێ یاسایی و تاڵان و دەستێوەردەری بکرێ. هەڵبەتە ئەم بۆچوونە بۆچوونێکی بەجێ بوو، لەبارەی قازی محەمەدیش ئەوە بوو کەوا بەداوودەزگای دادوەری بسپێردرێ هەتا بەپێی یاسا سزای کردەوەکانی خۆی وەربگرێ.

هەرچۆنێک بێت، هێزی کاروانی هاتوو لە سەقزەوە لەگەڵ فەوجی سوارەی لوڕستان کە لە میاندواوەوە هاتبوون و، برێتی بوون لە دوو فەوجی پیادە و دوو فەوجی سوارە و یەک دەستەی تۆپخانەی ٧٥ی و دوو زرێپۆشی شەڕکەر، هەموو لەسەر یەک ٦٠٠ سەرەنێزە و شمشێر و ١٢ برێنی گران، دوو زرێپۆش، دوو تۆپ و کادیری سەرکردەیی، لە رۆژی بیست و شەشەمی مانگی سەرماوەزدا (واتە ١٦ کانوون١ ١٩٤٦) گەیشتنە مەهابادی پایەتەختی کۆماری کوردستان.

## بارودۆخی گشتی

ئەو کات، بارودۆخی گشتی لە مەهاباد و دەوروبەریدا بەشێوەی خوارەوە بوو:

(١) شاری مەهاباد سەبارەت بەبزووتنەوەی بەنهێنیی قازی محەمەد و ئەوچەکانەی بەناو دانیشتوانی شاردا بڵاوی کردبوونەوە، بارودۆخێکی نادیاری هەبوو.

(٢) خێڵانی کورد، بەگشتی چەکدار بوون و هەتا ئەو کاتە یەک پارچە چەک چییە لێیان وەرنەگیرابووەوە، «پێشهاتی دواتر پیشانی دا چۆن لاوازی و دووڕوویی و ترسنۆکیی ئەو خێڵانە هەرچەندە خۆیان وەک پاکار دەنوواند چ زەبرێکی لە سوپا سرەواند.»

(٣) بارزانییەکان بەخۆیان و سێ هەزار پارچە چەک و دوو تۆپ و ١٢٠ تەماتیک و، بەگشتی چەکدار بەنارنجۆکی دەستییەوە، لە نەغەدە بنەجێ و ئامادەی بەرگری لە خۆکردن بوون.

## بارودۆخی سوپایی

لەو هەلومەرج و هەڵکەوتەدا، بارودۆخی گشتیی سوپای دەوڵەت بەشێوەی ژێرەوە بوو:

(١) هێزی سوپا کە بەپێی بەسەرهاتەکەی سەرەوە گەیشتبووە مەهاباد و، بەهۆی ڕێپێوانی دوور و درێژ لە سەهۆڵبەندانی دە پلە ژێر سفر و بەفر و باراندا، بەگشتی ماندوو بووبوون و پشوودانیان پێویست بوو.

(٢) لە مەهاباد، مۆڵگە بەفەرمانی قازی محەمەد کاول کرابوو، بۆیە بەوپەڕی سەختی و دژواری و گرفتەوە لەو سەرمایەدا پەناگەیەک بۆ سەربازان پەیدا دەکرا.

(٣) سەربازان لەوپەڕی ماندووەتییاندا، لە بارودۆخی تاریکی مەهاباد و لەژێر بەفر و سەرمای توند و تیژدا خەریکی دامەزراندنی بنە و سەنگەر بوون بۆ پاراستنی شار، لەبەرئەوەی بەباری شاراوەییی قازی محەمەدەوە دیاربوو دەسبەرداری پیلانی خۆی نەبووە «هەر بەم بۆنەیەشەوە سەرکردایەتی بەنەرمی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکرد».

(٤) بەهۆی قوڕ و لیتە و بارانەوە زرێپۆشانی شەڕ نەیاندەتوانی بەکارایی کار بکەن، باڵەفڕەش دوور بوون لە ناوچەی کردەوە، لەبەرئەوەی نێزیکترین باڵەفڕگە لە سەقز و میاندواودا بوون، هێشتاش باڵەفڕگەی تەورێز ئامادە نەببوو.

(٥) کاروانی سوپای هاتوو بۆ کوردستان و ئازربایجان، لە گەلێک شوێندا بێ خوڵک ببوو و لە هەموو جێگەیەکیشدا خەریکی پاکوەکەریی ناوچەکان و مژوولی کاری خۆیان بوون، هێزێکی ئامادە و تەیار کە لە کاتی پێویستدا بتوانێ دەمودەست بەفریای سوپا لە مەهاباد و نەغەدەوە بچێ، لە بەردەستدا نەبوو.

(٦) ئامێری بار و گواستنەوە سەبارەت بەزۆریی ڕێگەگیران بەقوڕ و لیتە و بەهۆی ڕێگەوبانی نالەبارەوە، نێزیکەی یەک لە سێ کەم بووبووەوە.

(٧) بەهۆی جێگۆڕکێ و هاتوچوونی خێرا و کەمیی ئامێری بار و گواستنەوە، تەقەمەنیی یەکە سوپاییەکان تەنیا برێتی بوو لەو پاشەکەوتەی چەکی ئاگری، کە لەگەڵ خۆیاندا هەڵیان گرتبوو، بۆ گواستنەوەی تەقەمەنییەکی زیادە لەو هەلومەرجە تایبەتەی بار و گواستنەوەدا، هەندێک کات پێویست بوو.

(٨) ئازووخەی یەکە سوپایی و بەنزینی ئۆتۆمۆبێل و زرێپۆشەکان نەمابوون. هەرچەندە بەڕادەی پێویست گەنم لە مەهاباد و میاندواو هەبوو بەڵام ئازووخە و بەتایبەتیش

بەنزین کە فاکتەری بەکار بوو لە بار و گواستنەوەدا بەهیچ جۆرێک لەبەردەستدا نەبوون.

## بارودۆخی تایبەتیی بارزانییەکان

لەو بارودۆخەدا، مەلا مستەفا توانیبووی بەوپەڕی ڕێکوپێکی، هێز و خێزانەکانی خۆیان بەرەو نەغەدە پاشەکشە پێ بکات. هێلێکی بەرگریی لە شەش سەت کەس لە چاکترین تفەنگدارانی خۆی لە نەغەدەدا دامەزراند بوو و، خێزانەکانیشی ڕەوانەی شنۆ کردبوو. تایەفەکانی کورد تەنیا قەرەپاپاخ نەبێ، تێکڕا گیانی هاوکارییان بۆ ئەوان هەبوو، چ بەخۆشی بێ و چ بەناخۆشی لەڕووی ترسەوە ئازووخەیان دەگەیاندە مەلا مستەفا، ئیتر بارزانییەکان بەم شێوەیە لە ناوچەی پڕ بەپیتی نەغەدە و شنۆدا بژیوییان بەچاکی مسۆگەر دەکرد. بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو بارودۆخە، سەرکردایەتیی سوپای کوردستان ئەم پرسانەی هاتەپێش کە پێویستییان بە چارەسەر هەبوو:

(١) وەدەرنانی بارزانییەکان و پێکهێنانی پەرژینێک لە ئاستی نەغەدەدا بۆ ئەوەی دەوروپشتی مەهاباد بپارێزرێ.

(٢) مسۆگەرکردنی دەوروپشتی شاری مەهاباد لە بەرامبەر ئەو هێزانەی لە ناوەوە و لە دەرەوەیدا هەبوون؛ ئەمەش بەگوێرەی ئەو هەڵکەوتە گونجاوەی مەهاباد هەیەتی.

(٣) بەکارهێنانی کاری توندوتیژ بۆ ئەوەی خێڵانی چەکداری کورد بترسێن و بەتەواوی چەک دابنێن.

(٤) گرتن و لە دادگەدان و بەسزا گەیاندنی سەرکێش و ئاژاوەگێڕان لە سەرووی هەمووشیانەوە قازی محەمەد و سەیفی قازی کە دەستیان لە پیلانگێڕی و دنەدان و تەنانەت پێوەندیی بەدزیی خۆیان لەگەڵ بارزانییەکاندا هەڵنەگرتبوو.

(٥) مسۆگەرکردنی پاشەبەرەی هێزەکان و چەسپاندنی یەکە سەربازییەکانی ناو شاری مەهاباد و، گەیاندنی تەقەمەنی و کەلوپەل و باروبوو و، گەیاندنی هێزی پشتیوان بۆ کردەوەی هەڵکوتانەسەر بارزانییەکان.

(٦) بەهێزکردنی توانای لەشی سەربازان و زیادکردنی وڵاخ بۆ یەکە سەربازییەکان.

(٧) ڕێکوپێک کردنی هێمنی و ئاسایش و، چەککردنی تەواوی ناوچەکانی کوردستان بەتایبەتیش ناوچەی سەردەشت و بانە «گەورگ و سوێسنی و کەلاسی» کە هێشتا

دەستیان لە کاری سەربەخۆ هەڵنەگرتبوو.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو قۆناغانەی سەرەوە، سبەینەی ڕۆژی بیست و حەوتەمی مانگی سەرماوەز، دوو کاروان یەکێکیان لەژێر سەرکردایەتیی عەقید ئەنساری کە پێک هاتبوو لە سوارەی لورستان، ئەویتر پێک هاتبوو لە تێکڕای سوارانی خێڵانی نێزیک مەهاباد، هەمووی هەزار و پێنسەت کەس دەبوون و لە ژێر سەرکردایەتیی عەقید غەفاریدا لە دوو تەوەرە «مەهاباد ـ ئاخ تەوێڵە ـ نەغەدە»، ئەویتر «مەهاباد ـ کاریز ـ نەغەدە» بەنیازی سەرانسۆیی و پێوەندی و کۆنترۆلی دەوروپشتی مەهاباد چوونە دەر. هەروەها ئەرکی ئەوەش بە عەقید غەفاری سپاردرا بوو کە زەوینەی دیمانەیەک لەگەڵ مەلا مستەفادا بڕەخسێنێ.

لەو دوو کاروانەی ناردرابوون، خولیای سوارانی عەشایەر وەک دواتریش سەرنج دەدەین تەنیا بریتی بوو لە زیاد کردنی ژمارەی سوپا، وێڕای ئەمەش لەبەرئەوەی هیچ ماف و کرێیەکیان پێ نەدەدرا بۆیە لە راستیدا ڕۆڵی نۆکەری بێ کرێیان دەگێڕا و، لەم بارەیەشەوە گۆتەیەکی کۆن هەیە زۆر بەدروستی لە سەریان جێبەجێ دەبێ. ئەوشتەی سەرکردایەتیی هان دابوو هەتا ئەمانە بەکار بێنن بەپلەی یەکەم بەدەردانەوەی گیانی گوێڕایەڵی بوو تیایاندا و بەپلەی دووەمیش خەریک کردن و دوورەپارێزکردنیان بوو لە ڕاگەیاندنی هاندەرانەی ناپاکان. ئەگینا ئەم خەڵکانە هیچ بایەخێکیان لەڕووی سەربازییەوە نەبوو، هەروەها بەدرێژاییی کاتی ئەو کردەوانەیش کە ئەوان تیایدا بەشدار بوون بچووکترین کاری گرینگیان ئەنجام نەدا، نەک هەر ئەمە بگرە بەهەڵاتن و پاشەکشەی نابەجێی خۆیان گورزی گەورەیان بەسوپا دەگەیاند.

کاروانی خێڵانی ژێر سەرکردایەتیی عەقید عەلی ئەکبەر غەفاری درێژەی بەبزاوتی خۆی دا و شەوی ٢٨ی سەرماوەز لە «کۆسەی کاریز»دا وەستا. لەو شوێنەدا پاشای ئەمیر فەلاح، سەرۆکی تایەفەی قەرەپاپاغ لە نەغەدەوە گەیشتە کۆسەی کاریز. ئەو، پەیامێکی لەلایەنی مەلا مستەفاوە بۆ عەقید غەفاری هێنابوو، لەو پەیامەدا مەلا مستەفا ئامادەییی خۆی بۆ کردنەوەی دەرگەی وتوویژ ڕاگەیاند بوو. سەرۆکی کاروان لە ڕێگەی هەمان کەسەوە پەیامی دا کە مەلا مستەفا یەکێک لە سەرکردەکانی خۆی بۆ وتوویژ بنێرێتە کۆسەی کاریز. بەپێی ئەمە، پاشاخان بەئۆتۆمۆبیل چووە نەغەدە و دوای سێ سەعات لەگەڵ میرحاجی ئەفسەری عێراق کە یەکێک بوو لە سەرکردەکانی مەلا مستەفا، گەڕایەوە.

عەقید غەفاری بەپێی ئەو شارەزاییەی لە بارەی بارودۆخەکەوە هەیبوو و، بەگوێرەی ئەو فەرمان و دەسەڵاتەی لە لایەن سەرۆکایەتییەوە پێی درابوو، بەئامادەبوونی تێکڕای سەرۆک خێڵان لەیەک کە هۆڵدا پێشتر کۆکرابوونەوە و ئامادە بووبوون، چاوی بەمیرحاج کەوت هەتا پێشانی بدا تەواوی سەرۆک خێڵان ئەمرۆ لە بەر دەست و گوێ بەفەرمانی دەوڵەتن، پاشان عەقید غەفاری تەبای میرحاج بەرەو نەغەدە بەڕێ کەوتن بۆ دیمانەی مەلا مستەفا. پاش گەیشتنی عەقید غەفاری بەنەغەدە، داوای لە مەلا مستەفا کرد بۆ ئەوەی خۆی بۆ دیمانەی سەرۆکی فیرقە ڕوو بکاتە مەهاباد. سەرەتا، مەلا مستەفا بەو داخوازە رازی نەبوو و بەپاشی دایەوە. ئیتر ئەو کاتە شێخ ئەحمەد، سەرۆکی ئایینی و برا گەورەی مەلا مستەفا لە شنۆوە هاتە نەغەدە و دوای زنجیرەیەک وتووێژی دوور و درێژ شێخ ئەحمەد فەرمانی بەمەلا مستەفا کرد بۆ ئەوەی بەرەو مەهاباد بکەوێتە ڕێ. ئیتر، مەلا مستەفا تەبای میرحاج، عیزەت عەبدولعەزیز و نووری کە هەرسێکیان لە ئەفسەرانی عێراق بوون لەگەڵ سێ کەسی تر لە لایەنگرانی خۆی، شان بەشانی عەقید غەفاری بەرەو مەهاباد بەڕێ کەوتن.

ئەو کاتەی سوپا لە مەهاباد رووبەڕووی ئەو گیروگرفت و پرسانە بووبووەوە کە لە پێشەوە باسمان کردن، گەیشتنی مەلا مستەفا بۆ مەهاباد کارێکی سەرسرمێنی کرد و بەگەورەترین سەرکەوتن هاتە ژماردن، هەروەها ئەرکانی سوپاش لە بروسکەیەکی خۆیدا ئەو سەرکەوتنەی بەگەورەترین سەرکەوتنی سوپا لە قەڵەم دا. ئەو ئەنجامانەی هاتنی مەلا مستەفا بۆ مەهاباد بەدەستی هێنا بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

(١) هەموو ئەو کەسە گێرەشێوێنانەی چاوەڕێی هەلی نوێ بوون بۆ خۆنواندن، لە جێی خۆیان دانیشتنەوە.

(٢) پلانەکانی قازی محەمەد کە دیسان بەتەمابوو مەلا مستەفا و بارزانییەکان وەک کارتێک لە دەستی خۆیدا بپارێزێ یا بەلای کەمەوە لەبەرچاوی خەڵکدا واپێشان بدات گوایە لاسەنگی بەلای ئەودایە، بوون بەبلقی سەرئاو.

(٣) هەموو خێڵانی کورد کە لە بەدەستەوەدانی چەکی خۆیاندا بیرەبیر بوون و بەرەنگێ بیریان دەکردەوە کە لەوانەیە دەوڵەت بەبۆنەی بارزانییەکانەوە ئاتاجی ئەوان بێ، بیریان گۆڕی و دەسبەجێ هەموو چەوتییەکیان لە هزری خۆیان بەدوور کرد.

(٤) بەشێوەیەکی گشتی، دەسەڵاتی سوپا چەسپا و بارودۆخی لێڵ و وێڵ و نادیار وا

دەهاتە بەرچاو کە بەسوودی سوپا گۆڕابێ. گرینگترین کارتێکەریی ئەمەش ئەوەبوو سەرکردایەتیی فیرقە پاشنیوەڕۆی ڕۆژی دوای هاتنی مەلا مستەفا بۆ مەهاباد، بەبێ هیچ تێبینی و دڵەڕاوکەیەک قازی محەمەد و سەیفی قازی و سەرجەم گێرەشێوێنانی مەهابادی گرت و، دانی بەدادگە هەتا بەسزای کردەوەی خۆیان بگەن. لە کاتێکدا هەتا دوێنێ، بە ڕێزداری هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرا. مەلا مستەفا لە ڕۆژی سێیەمی مانگی سەرماوەزدا (واتە ٢٠ کانوون١ ١٩٤٦) هاتە مەهاباد و لە نووسینگەی سەرکردایەتیی سوپادا ئامادە بوو، بەنووسین بەڵێنی دا پاش ئەوەی دەچێتە تاران و پاش هەڵگرتنی ئەو یاساغییەی بارزانییەکان لە عێراقدا هەیانە یان ئەگەر داڵدە بەخۆیان و هاوخێڵەکانیان بدرێ ئەوا خۆیان بەدەستەوە دەدەن و چەکی خۆیان دەدەنەوە، بەنهێنی بەڵێنی دا کە دوو تۆپی ٧٥ی کە لەگەڵ خۆیدا بردبوونی دەمودەست بداتەوە. وەکات، ئەم ڕاگەیاندنەی ژێرەوە لە مەهاباد بڵاوبووەوە.

## ڕاگەیاندن

«پێویستە تێکڕای سەرۆک خێڵ و تایەفەکانی کوردستان ئاگادار بن لەوەی کە لە مێژووی ٢٩ سەرماوەز ١٣٢٥دا ڕێزدار مەلا مستەفای بارزان تەبای هەندێک لەسەرکردەکانی خۆی، لە مەهاباد ئامادە بوو. گوێڕایەڵی و فەرمانباریی خۆی و تایەفەکەی بەنووسین ڕاگەیاند و پەنای لە دەوڵەتی شاهەنشاییی ئێران خواست. ناوبراو خۆی و تێکڕای تایەفەکەی لە ژێر ئاسایشی دەوڵەتی شاهەنشاییدا دەبن و سوپاش خەریکی زنجیرەیەک کاری پێویست دەبێ بەنیازی ئاسایش و ژیانی داهاتووی ئەوان، بۆیە لە هەموو دەسدرێژییەک دەپارێزرێن.»

سەرکردایەتیی سوپای کوردستان(٧)

## چوونی لیوا هومایوونی لە مەهابادەوە بۆ ورمێ

دوای پێنج ڕۆژ وەستان لە ورمێدا، ئەو کاتەی نووسەر دەیویست ورمێ بەجێ بهێڵێ و بەرەو مەهاباد بەڕێ بکەوێ، لیوا هومایوونیی سەرکردەی فیرقەی چوار و سوپای نێردراو بۆ کوردستان، لە پێناو دۆزینی پێوەندی لە نێوان مەهاباد و ورمێ و لە ڕاستیشدا

(٧) واتە سوپای ئێران کە بۆ پەلاماردانی کۆماری کوردستان و شەڕی بارزانییەکان هاتبوو.

دامەزراندنی پێوەندی لە نێوان یەکەکانی فیرقەی سێ و چوار و بتەوکردنی سەربازگەی ئەو شارەدا تەبای بەتالیۆنێک سەرباز هاتە ورمێ. هاتنی لیوا هومایوونی و ئەو بەتالیۆنە بۆ ورمێ، پێشهاتێکی دڵتەزێنی بەدوا هات. ئەم کاروانە لە «باڵانش» لە نێزیکی ورمێ کە ناوچەیەکی کێواوی و لە ڕووی سەربازییەوە شایەنی بایەخە، کەوتە بەر دەسڕێژی توندی کوردانی سەر بە (زێرۆ) و لەناکاودا دوو سەرباز کوژران.

پێشهاتەکە بەم جۆرە ڕووی دا: کاتێک لیوا هومایوونی خەریکی وتووێژ بوو لەگەڵ برا و دایکی زێرۆ لە بارەی مەرجی خۆ بەدەستەوەدانیان، لە ناکاو بەشێوەیەکی ناجوامێرانە لە لایەن پیاوانی زێرۆوە ـ کە لەپشت تەڕاش و تاشەبەردەکاندا خۆیان حەشار دابوو، دەسڕێژ کرا و لە ئەنجامدا ئەو سەربازانەی لە ناوەندی ڕێگە لە ناو لۆریدا بوون کتوپڕ بەرکەوتن. ئەو دەسڕێژە بوو بەمایەی کوژرانی دوو سەرباز و بریندار بوونی سێی تر. شایەنی سەرنجە ئەو کاتە قائیدی فیرقە لە ناوەندی ڕێگەدا وەستا بوو و بەر لە هەمووان کەوتبووە بەر مەترسییەوە و ئەگەر دان بەخۆداگریی خۆی لە دەست بدایە ئەوا هەموو ئەفسەر و سەربازانی ئەو کاروانە دەفەوتان. لیوا هومایوونی دەماری خۆی بەرزەوت کرد و، نەیهێشت پێکدادان روو بدا بۆ ئەوەی ئەم پێشهاتە چاوەڕوان نەکراوە نەبێتە مایەی فەوتانی یەک بەتالیۆن سەرباز و زەبرێکی گەورە لەم کات و ساتە گرینگەدا بەسوپا نەکەوێ. ڕەفتاری بەجێی قائید فیرقە «کە ئێستە خانەنیشە» بوو بە مایەی ئەوەی ئەو پێکدادانە کە تەنیا بەشکانی سوپای دەوڵەت تەواو دەبوو، رابگیرێ و، بتوانێ برا و دایکی زێرۆ وەک بارمتە لەگەڵ خۆیدا بۆ ورمێ ببات.

هاتنی لیوا هومایوونی بۆ ورمێ، جۆش و خرۆشێکی پتری لەناو دانیشتوانی شاردا کە لە کوردەکان دڵپڕبوون، هێنایە کایە، ئەم هەست و سۆزەش لە چۆنیەتیی بەڕێ خستنی بێ وێنەی تەرمی دوو سەربازە کوژراوەکە و ئەو گوتانەدا دەرکەوت کە لە ڕێوڕەسمی ناشتنی ئەو دوو سەربازەدا پێشکێش کران. لەماوەی ئەو دوو ڕۆژەی لیوا هومایوونی لە ورمێدا بوو، لەلایەن قائید فیرقە و عەمید زەنگەنەوە کارێکی زۆر کرا هەتا یا بەزۆرداری یا بەفێڵبازی زێرۆ بکەوێتە بەر دەست و تەنانەت چەند پێکدادانێکی دەستەویەخش لە دەرەوەی شاردا ڕوویان دا، بەڵام بەداخەوە هەوڵەکان ئەنجامیان نەبوو لەبەرئەوەی زێرۆ قاچاخچییەکی کارا و شارەزا بەبارودۆخ و حاڵوباڵی ناوچەکە بوو، لە بچووکترین هەلدا سوودی دەبینی و بەجێگۆڕکێ و، جووڵە و بزاوت بەدرێژاییی ناوچە سنوورییەکاندا خۆی

له چەمبەری هێزی دەوڵەت دەرباز دەکرد.

لەلایەکی ترەوە، کەمبوونی ژمارەی سەربازانی سەربازگەی ورمێ و چەکدار بوونی ئەو تایەفە کوردانەی لە نێوان مەهاباد هەتا ورمێ و ماکۆ و سنووری سۆڤیەت جێ نیشتە بوون، بووبوونە لەمپەر لە رێگەی ئەوەدا دەوڵەت بتوانێ دەست بەکردەوەیەکی توند بکات بەتایبەتیش کە بەکرێگیراوانی دەرەوە بەهۆی تەتەر و دەزگای بێتەلەوە فەرمانیان دەگەیاندە سەرۆک تایەفەکان و، لە رێگەی بتەوکردنی ورەیان و هاندانی بارزانییەکانەوە، بووبوونە کۆسپ لە پێش چەسپانی هێمنی لەو ناوچەیەدا.

لە ئەنجامی ئەو هەلومەرجانەدا، دوای ئەو وتووێژەی لە ورمێ لە نێوان لیوا هومایوونی و عەمید زەنگەنەدا کرا، قائید فیرقەی چوار شەوی حەوتەمی مانگی پاشتر بڕیاری دا بگەڕێتەوە مەهاباد و لە نێزیکەوە ئاگەداری حاڵوباڵی بارزانییەکان بێ.

نووسەر لە بەرەبەیانی رۆژی دواتردا، دوای ماڵئاوایی لە هاوەڵانی رۆژنامەنووس، بۆ ئەوەی چاکتر بتوانم رۆژنامەی «اطلاعات» و رای گشتی لە هەقیقەتی ئەو گیروگرفتانەی سوپا لە کوردستان بەرەوروویان ببووەوە ئاگەدار بکەم، ئیتر تەبای لیوا هومایوونی و عەقید «حاجی ئەنساری» بەرەو مەهاباد بوومەوە. ئەو دوورییە کە لە ١٨ فرسەخ زیاتر بوو، بەناڕەحەتی و پەژارەوە بەرێ کرا. لەبەرئەوەی نالەباریی رێگە و بارینی بەفری ئەستوور و نەبوونی هێمنی و پاسەوانی بەپێی پێویست، هەموویان بەیەکەوە بارودۆخێکیان هێنابووە کایە، هاتوچۆیان بەئاڵۆزی خستبوو.

دوای دەربازبوون لە بالانش و بەرزاییەکانی شیرین بۆلاغ، لەپاڵ بەرزاییەکدا تەها هەرکیی سەرۆک خێڵی هەرکی کە یەکێک بوو لە پیاوخراپانی ناوچە، هاتە دیمانەی قائید فیرقە و خۆی ناساند. لیوا هومایوونی فەرمانی دا کە بەپێچەوانەی رابردوو، هاوکاریی سوپا بکات و بەڵێنیشی دا ئەگەر دەسبەجێ چەکەکانی خۆی بدا بەمۆڵگەی ورمێ ئەوا دەوڵەت چاو لە کردەوەکانی پێشووی دەپۆشێ.

شاری مەهاباد و حاڵی سوپا لەوێ، لەبەر چاوی نووسەردا تەواو بێ پێشینە بوو، لەبەرئەوەی بەپێچەوانەی تەورێز و ورمێ و مەراغە و خوی و ئەردەویل و شوێنانی تر، لەم شوێنەدا نە لەلایەن دانیشتووانەوە ئەو هەستە پڕ لە گەرم و گوڕییە لەبەرامبەر سوپادا دەبینرا، نە سەرباز و ئەفسەران وەک یەکە سەربازییەکانی تر خەیاڵیان هێمن و راحەت بوو. بەڵام بێ زیادەڕۆیی، هەڵسوکەوتی سەرکردایەتی و ئەفسەران لە مەهاباد لەگەڵ

دانیشتواندا گەلێک چاکتر بوو لە شوێنانی تری ئازربایجان. کورد بەسەرنجی شاراوە و شێواو لە سەربازانیان دەڕوانی و، سەربازانیش بەگومانەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دانیشتواندا دەکرد. لەبەرئەوەی کوردی ناو شار و دەوروپشتی شار بەگشتی چەکدار بوون و لە ٨ فرسەخی دووری شاریشدا بارزانییەکان سەنگەریان گرتبوو، هەموو دەم باس لە هێرشی بارزانییەکان و ڕاپەڕینی دانیشتوانی ناو شار دەکرا.

لەو کاتەدا قازی محەمەدی سەرۆکی حیزبی کۆمەڵەی کوردستان خۆی لە گرتووخانە و برایەکەشی لە تاران بوو، بەرهەڵستکارانی دەوڵەت هیوادار بوون زوو گۆڕانکارییەک بێتە گۆڕێ و بەسوودی کوردانی ڕاپەڕیو بشکێتەوە. لە لایەکی ترەوە قازی محەمەد پیاوێکی ئاگەدار و دنیادیتە و زانا بوو، لە ماوەی یەک ساڵەی حوکمڕانیی خۆیدا دەسەڵاتێکی بەرفرەی بەدەست هێنابوو، بەپێچەوانەی پیشەوەری و سەرکردەکانی فیرقەی دێموکراتی ئازربایجان، سەبارەت بەوەی لە بنەماڵەیەکی ماڵدار و چاوناس بوو لەو ماوە کەمەیدا کە سەرۆک کۆمارەتیی بەدەستەوە بوو لە بەرامبەر دانیشتوانی شاردا کارێکی نالەباری نەکردبوو، بۆیە نەبووبووە جێگەی ڕکی تیژی خەڵک و لە هەمان کاتدا نە ئەو لە مەهاباد چووبووە دەر و نە بۆ دەوڵەتیش کارێکی ژیرانە بوو لەو هەلومەرجە نالەبارەدا قازی محەمەد لەناو ببات کە جگە لە پایەی سیاسی، خاوەن شوێنی ئایینی و مەزەبیش بوو.

بابەتێکی تر کە لەم ناوچەیەدا دەوڵەتی دەخستە بن باندۆری خۆیەوە سیاسەتی سۆڤیەت بوو لە کوردستاندا. لەبەرئەوەی بەپێچەوانەی ئازربایجان کە بنچینەی سیاسەتی دەوڵەتی رووس لەوێ برێتی بوو لە پشتەوانیی هەژاران لە ئاست دەسمایەداراندا، لەم ناوچەیەدا دەوڵەتی رووس بۆ ئەوەی بتوانێ بەڕادەیەکی گەورە دەسەڵاتدار بێ و نەبادا دڵی دانیشتوانی ئایین پەروەر و بەدەماری کوردستان بڕەنجێنێ، بەهیچ جۆر لە بەلشەفیزم و یەکسانیی داهات و دابەشینی سامان نەدەدوا، بگرە سەرۆک خێڵانی لە دژی دەوڵەت ڕاست دەکردەوە و بەبزواندنی سۆزی سەرخۆبوونی ئەوان کەوا کوردستان پێویستی بەکۆمارێکی سەرفراز هەیە، توانیبووی هەستی کەسانی خۆپەرست و دنیاپەروەر بەلای خۆیدا بەکێش بکات.

بارودۆخی نالەباری هێزی دەوڵەت لەناو شاردا کە لە نیوچە گەمارۆیەکدا بوون و ئەو پەلەپەلییەی لە دامەزراندنی کەلوو و سەنگەر و قایمکاریدا بەکاردەهات، هەستی

ئاژاوەچیەتی یا چاتر بڵێم ڕۆژنامەنووسیی لەلا بزواندنم بۆ ئەوەی یەکڕاست بکەومە سۆراغی مەکۆی هەڕەشە و ئاژاوەنانەوە و خۆم لەگەڵ بارزانییەکاندا بکەومە وتوویژ هەتا بتوانین زانیاریی بەکەڵک لە بارەی بارودۆخەکەوە وەربگرین و هەنگاوێک بەرەوپێش باوێژین لە چاککردنەوەی پێوەندیی نێوان هێزی دەوڵەت و بارزانییەکان کە بێ رادە خراپ بووبوو و هەموو دەم چاوەڕوانی ئەوە دەکرا پێکدادان رووبدات.

دوای گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتیی هێزی کوردستان و عەقید فەیووزیی سەرۆکی ئەرکانی هێزی دەوڵەت لەو ناوچەیەدا و تێگەیاندنی ئەو نیازەی هەمبوو، بەری ئێوارەی ڕۆژی دووشەم ملی ڕێگەی نەغەدە و دەهنە و شنۆم گرت و، بەسواریی لۆرییەکی سوپا کە ئازووخەی بارکردبوو بەرەو جێگەی مەبەست بەڕێ کەوتم. بارانێکی بەرەهێڵە دایدابوو و ئەو بەفرە ئەستوورەی رووی زەویی داپۆشیبوو، دەتواندەوە. ڕێبازی ئێمە ڕێگەیەک بوو بەناو کێڵگەی چەوەندەردا تێ دەپەڕی، وەک زەریایەک قوڕ و لیتە خۆی دەنواند. ئۆتۆمۆبێلە شەق و پەقەکەی سوپا وەک ئەوەی بەهۆی نێزیک بوونەوەمان لە بارزانییەکان ترسی پێ گەیشتبێ یا ماوەی خزمەتی بەکۆتا هاتبێ، جار لە دوای جار دەوەستا و ئێمەش بەو سەرماوسۆڵەیە ناچاردەبووین دابەزین و، بەهاوکاری و هیمەتی سەربازان و خەڵکی ترەوە دەمانتوانی لۆرییەکە لە قوڕ دەربهێنین. بەم گیروگرفتانەوە، لۆرییەکە سەعات شەشی پاش نیوەڕۆ گەیشتە دەهنە. لێرە فەوجی سوارەی لوڕستان بەسەرکردایەتیی عەقید حاجی ئەنساری سەنگەریان لێ دابوو، لە راستیدا ئەم سەربازانە هێزی پێشەوە یا ئەو هێزە بوون کە ئەرکی داپۆشینی مەهاباد و هێلی پێشەوەیان پێ سپاردرا بوو. سەبارەت بەخراپیی ڕێگەوبان، شەو لە دەهنەماینەوە، سەعات دەی ڕۆژی سێ شەم بەرەو نەغەدە بەڕێ کەوتین. شایەنی ئاماژەیە لێرە بەولاوە هیچ شوێنەوارێکی سەربازان نەدەبینرا، بگرە پاراستنی بەشێکی کورت لەو ڕێگەیە کەوتبووە ئەستۆی خێڵی قەرەپاپاخ.

خێڵی قەرەپاپاخ لەو خێڵانەیە دوای شکانی ئێران لەبەرامبەر رووسیای تزاری و بەستنی پەیمانی «تورکمان چای» هاتوونەتە ئێران . لەبەرئەوەیش بەقەرەپاپاخ ناسراوە چونکە کڵاوێکی چەرمینی رەش لەسەر دەنێن. ئەم خێڵە، پیاوی بوێر و نەترسیان لێ هەڵکەوتووە و تەنیا تایەفەیەکیشە لە ناوەندی کوردستاندا جێ نیشتە بووە و خەڵکەکەی بەزمانی تورکی دەدوێن. قەرەپاپاخییەکان نێزیکەی پەنجا و سێ گوندیان لە گوندانی

کوردستان بەدەستەوەیە.

سەعات دوازدە گەیشتمە نەغەدە و، لەبەرئەوەی پیاوانی ئەو خێڵە بەهۆی تەلەفۆنی مەیدانییەوە لە هاتنی من ئاگادار بوون، بۆیە لە هەردوو بەری ڕێگەدا سوارئەسپ و چەکدار لە پێشوازیدا وەستا بوون. ئەو دەمە برا گەورەیی و سەرۆکایەتیی ئەو خێڵە لەو شارە بچووکەدا بەدەستی «قولیخان بزچەلوو»ەوە بوو کە پیاوێکی خۆشمێر و شاپەروەر و مێوان پارێز بوو. ناوبراو بەگەیشتنی من بۆ بەخێرهێنان هەندێک قسەی کرد کە بۆ خۆ لادان لە درێژدادڕیی قسە، لێرەدا نەیانمنووسی، چەندین سەر گا و مەڕیان سەربڕی و لەبەر ئەوەیش نووسەر یەکەمین ڕۆژنامەنووسێک بووە گەیشتبووە ئەو خێڵە بۆیە بەخۆشەویستییەکی بێگەرد و بەگەرمی پێشوازیم لێ کرا. منیش لە بەرسڤی بەخێرهێنانەکەی ئەواندا لە بەزەییی شایانە و هاوکاریی هێزەکانی ئەواندا ئاگەدارم کردن و گوتم دەوڵەت بۆ پارێزگاریی ئەوان لە بارزانییەکان و بەدەرنانی ئەو خێڵە لەسەر زەویی ئێراندا، کۆششی پێویست بەکار دەخا و، ئەنجامی ئەو دەست پێشکەرییانەی سوپاش بەزوویی دەکەونە بەرچاوان.

ڕاستی ئەوە بوو لەو ڕۆژانەدا حاڵی خێڵی ناوبراو زۆر شڕ بوو، بارزانییەکان لە سەری ساڵی ١٣٢٥وە (واتە لە بەهاری ١٩٤٦ەوە) نیزیکەی ١٦٠ ماڵی خۆیان کە دەگەیشتە ١٧٠٠ کەس لە دێهاتی قەرەپاپاخ دامەزراندبوو و خێڵی قەرەپاپاخیش ناچار بوون بۆ ژیاندنی ئەمانە بۆ هەر سەر مرۆڤێک مانگانە سێ پووت گەنم و سی ڕیاڵ بدەن. وێڕای ئەمە، دەبوو ئالیکی ولاخ و، نشینگەی بارزانییەکانیش هەر قەرەپاپاخی دابینی بکەن. شایەنی بەبیرهێنانەوەیش نییە کە بەهۆی توانای شەڕوانیی بارزانییەکان و نەبوونی هێزی دەوڵەت لەو شوێنانەدا، قەرەپاپاخ لە خۆبەدەستەوەدان بەولاوە چ چارەسەرێکی تریان نەبوو.

سەعات ٣ی نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ بەنیازی دیمانەی شێخ ئەحمەدی بارزانی کە ناسراوە بە«خودانی بارزان» و، براگەورە و سەرۆکی ئایینی و واتایەکیی ئەو تیرەیە بوو، نەغەدەم بەجێ هێڵا و ڕووەو شنۆ بەڕێ کەوتم. بەدەم ڕێگەوە، چەندین جار بارزانییەکان دەبوونە ڕێگەگر لەپێش ڕۆیشتنی لۆرییەکەدا و دوای وردبوونەوەیەکی زۆر و دڵنیا بوون لەوەی سەربازمان لەگەڵدا نییە و بۆ دیمانە هاتووین، ئینجا مۆڵەتی ڕۆیشتنیان دەداین. جێی داخ ئەوە بوو تەنیا مۆڵەتی بارزانییەکان پێویست نەبوو بگرە سروشتیش بەردەوام دژبەری

ڕۆیشتنمان بوو.

بەفر بەتوندی دەباری و ئۆتۆمۆبێل لە ڕێگە کۆنە سنووریەکەی ئێران عێراقدا بەردەوام لە ناو قوڕ و لیتەدا دەچەقی. دواجار سەعات پێنج و نیو، پاش ئەوەی ئۆتۆمۆبێلەکە لە قوڕ چەقییەوە و لە جوولە وەستا، ناچار بووین بۆ هەلاتن لە دەست سەرما و، نەمانەوە لە دەشت و دەردا، خۆمان بەیەکێک لە ئاواییەکانی ئەو نێزیکانە بگەیەنین. پێویستە ئەوەش بگوترێ هەر لە نەغەدەوە بەپێشنیاری قولیخان قەرەپاپاخ، دوو کەس لە خێڵی قەرەپاپاخ و حەوتیش لە چەکدارانی بارزانی بۆ ڕێنوێنی و دڵنیایی بەگەڵ نووسەر کەوتبوون.

بارزانییەکان دەیانگوت دەبێ شەو لەناو لۆرییەکەدا بمێنینەوە و سبەینێ بەرەو شنۆ ببزوین، بەڵام نووسەر سوور بوو لەسەر ئەوەی بەهەر کڵوەجێ بێ دەبێ شەو بەدیمانەی شێخ ئەحمەدی بارزانی بگەم، لەبەرئەوەی نەبوونی خواردن و شوێنی رازان و دڵنیایی، ڕێگەیان پێ نەدەداین لەو سەرماوسۆڵەیەدا شەو لە لۆرییەکی ناو دەشت و دەردا بمێنینەوە. دواجار بۆ رزگاری لە دەستی سەرما چووینە ئاواییەکی تەنیشتەوە کە ناوی «گورگ ئاوا» بوو. نەکا ناوی «ئاوایی» خوێنەرەوە فریو بدا و وای تێ بگەینێ ئاوەدانییەک لەو شوێنەدا پەیدا دەبوو، بگرە ئەو گورگ ئاوایە کاولگەیەک بوو بۆ خۆی، تەنیا بنمیچێکی بەپێوە مابوو کە دەیتوانی لە باران و سەرمای تیژ بمانپارێزێ. دووریی نێوان گورگ ئاوا و شوێنی وەستانی لۆرییەکەمان بەماندووبوونێکی زیادە و بێ وێنە بڕی لەبەر ئەوەی زەوییە داچێندراوەکە لە ئەنجامی بارینی بەفر و بارانەوە بووبوو بەزەنەکێکی سەرسڕمێن.

سەعات شەش و نیوی پاش نیوەڕۆ بەشەکەتی و ماندووەتییەکی لەرادە بەدەرەوە بەگوندی گورگ ئاوا گەیشتین. باران هێشتا هەر دەباری و، دووری هەتا شنۆ هێشتا دە کیلۆمەتری تری مابوو. دوای تاوێک پشوودان، لەبەرئەوەی بارانەکە لێی کردبووەوە، هاوەڵان بەرەو شنۆ خۆیان ساز دایەوە و بۆ دیمانەی شێخ ئەحمەدی بارزانی بەرێ کەوتینەوە. بەشێک لە ڕێگەی نێوان گورگ ئاوا و شنۆ هەمان جادەی چەوڕێژی سنووری بوو بۆیە توانیمان بەخێراییەکی زیاتر لە ژێر بەفردا بڕۆین. سەعات هەشت و چارەکی دوای نیوەڕۆ، رووناکییەکی کزی چرا لەو تاریکییە پڕ لە مەترسییەدا کە شاخ و دەشتی روون کردبووەوە، سەرنجی بۆ خۆی بەکێش دەکرد. هەستی نێزیک بوونەوە لە شنۆ کە هاودەمی بەدیهێنانی مەبەست و ئامانجی دواییمان بوو هێشتا ئێمەی تەواو هیوادار و

دڵخۆش نەکردبوو، کتوپڕ لەو تاریکە ئەنگوستەچاوەدا دەنگی سەگوەڕ و دەسڕێژی توند و بێ پێشەکی بەرەورووومان بووەوە و ئێمەی لە شوێنی خۆماندا تاساند. گوللەبارانەکە زۆر لە نێزیکەوە بوو. کەمیی ماوەکە و تاریکیی شەو بەجۆرێک بوون رووناکیی ئاگری گوللە جێگەیەکی بچووکی رووناک دەکردەوە. دوو کەسەکەی خێڵی قەرەپاپاخ ویستیان بەتەقە وەڵامی دەسڕێژەکە بدەنەوە بەڵام من و ئەو بارزانییانەی لەگەڵماندا بوون رێگەمان پێ نەدان و بووینە کۆسپ لە رێگەی پێکداداندا.

پیلاو و بەرگمان بەقوڕ و لیتە پیس بووبوون و، ئاو هەتا ئانیشکمان هاتبوو. لە سەرمانە و لەبەر ترسی پێشهاتی نادیار هەڵدەلەرزیین. یەکێک لەو بارزانییانەی لەگەڵماندا بوو و پلەی ملازم دووەمی لە سوپای عێراقدا هەبوو چەند هەنگاوێک چووە پێش و بەزمانی کوردی و بەو نیشانانەی لە نێوان بارزانییەکاندا هەبوو هەندێ شتی بەدەسرێژکەران گوت، دواجار تەقەی تفەنگهاوێژانی بارزانی وەستا، پاش تاوێک پازدە کەسی تەماتیک بەدەست و دوو چرای فانۆس بەدیار کەوتن. وتووێژێکی کورتخایەن لە نێوان بارزانییەکانی هاوەڵمان و ئەوانیتردا کرا، پاشان بەڕووێکی گرژ و نادڵنیایی کە بەچاوانیانەوە دیار بوو، رێگەی شنۆیان پێ پێشان داین.

لەناو دڵی ئەو شەوەدا، ئەگەرچی تاریکی ئەم شارە گرینگە سنوورییەی پێچابووەوە و، بارانی توند بووبووە بەرگری ئەوەی کەس بۆ کارێکی تەنانەت زۆر گرینگیش سەر لە ماڵ دەربهێنێ، بەڵام وێڕای ئەمە ئەفسەر و سەربازانی بارزانی تیپ تیپ لە جووڵەدا بوون و هەموو رێگە و بانی هاتنە ناو ئەم شارۆچکەیە و بەرزاییەکانی ئەو دەوروبەرەیان گرتبوو هەتا ئەگەر لە ناخافڵ هێرشێک رووی تێ کردن بتوانن بەرتەکی بدەنەوە. هەرچەندە لە لاپەڕەکانی داهاتووشدا باس لە گیانی سەربازیی بارزانییەکان دەکەین بەڵام خراپ نییە ئەگەر لێرەدا بڵێین: بارزانییەکان بەپێچەوانەی خێڵانی ئێرانی، لەش سست و تەنبەڵ نین. پاسەوانانی بارزانی، هەموو شەو لەژێر بەفر و باران و سەرما و سۆڵەدا رۆژیان دەکردەوە بێ ئەوەی سەنگەرەکانی خۆیان بەجێ بهێڵن و رۆژانیش دەحەسانەوە بۆ ئەوەی لە ناکاو نەگیرێن. بەڵام رێورەسم لە عەشایەری ئێراندا ئەوەیە شەو لە ژێر میچ و ناو ماڵدا بەسەر ببەن و بەرۆژ پاسەوانەتی بگرن، بۆیە زۆرینەی خێڵانی ئێرانی توانای شەڕی شەوانیان نییە و بەرۆژیش خافڵگیر دەکرێن.

## بۆچی بارزانییەکان هاتن بۆ ئێران؟
## بەسەرهاتی بارزانییەکان و
## پێکدادانی ئەم تایەفەیە لەگەڵ وڵاتانی دراوسێی ئێراندا

هەر بەگەیشتنم بەژوورەوەی هۆڵێک کە بەدەوران دەوریەوە ئەفسەرانی چەکداری بارزانی پاسەوانییان لێ گرتبوو، پیاوێکی کەڵەگەتی چوارشانە بەخۆی و پاڵتۆی درێژ و ردێنی ماش و برنجییەوە، هەروەها بەسەر و سیمایەک کە خۆی وەک فەرمانڕەوایەکی واتایی و سەرۆکی بنەماڵەیەک لەبەرچاومدا دەنواند، لە دەرگەی بەرامبەرەوە هات بەژووردا. ئەو کوردەی بەهاوەڵیی من هاتبووە ژوور و نیو هەنگاو بەدوامەوە وەستابوو، سەر بەخێڵی قەرەپاپاخ بوو، بەدیمانەی ئەو پیاوە، بەدەنگێکی چپەدوو بەجۆرێک هەر تەنیا خۆم بیبیستم، گوتی: «شێخ ئەحمەد، خودانی بارزان!» نازانم لە بینینی ئەو پیاوە بەژن بڵند و بەسیمایەدا چ هەستێک لە ناخمدا هاتە کایە کە بەبێ ئاگا و بەپێچەوانەی نەریت، سڵاوم نەکرد. ئەویش وشەی لەزار دەرنەهات. چەند وردکەیەک بەشێنەیی و بەبێدەنگی لە سەرتاپێی یەکترمان ڕووانی، پاشان وەک ئەوەی هەردووکمان چاک یەکتر بناسین، بەرەوڕووی یەکتر، هەریەکە و لەسەر کورسییەک ڕۆنیشتین. جلوبەرگی من بەهۆی بارینی بەفر و بارانەوە تەڕ بووبوون، پێڵاو و شەرواڵم قوڕاوی بووبوون.

شێخ ئەحمەد، پاش ئەوەی لە دەورپشتی خۆی ڕووانی، خۆی وەک براگەورەی مەلا مستەفا و سەرۆک خێڵی بارزان و تەمەن پەنجا ساڵ پێ ناساندم و نیازی خواست منیش خۆمی پێشکێش بکەم. نووسەر بەوپەڕی ڕێزەوە خۆی دایە ناسین و هیوام خواست بارزانییەکان لەم هەلومەرجە ناجۆرەی تیایدان دەرباز بن، هەروەها بەو هیوایەی لە ڕێگەی ناوبژیی دەوڵەتی ئێرانەوە بەرپرسیارانی عێراق لێبوردن رابگەیێن و ئەمانیش بگەڕێنەوە نیشتمانی خۆیان و لە ئاوارەیی و پەرێشانی دەربچن. بەرلەوەی شێخ ئەحمەد وەڵامی ئەم قسانە بداتەوە، ئەوەیشم گوت کەوا بۆ هەڵگرتنی هەر جۆرە بۆندژییەک، پێویستە بارزانییەکان دڵسۆزی بەڵێنی خۆیان بن وەک چۆن مەلا مستەفا لە مەهاباد بەڵێنی داوە دوو تۆپی چیایی بەزووترین کات بدەنەوە دەستی بەرپرسیارانی سوپا و، نەغەدەش چۆڵ بکەن.

شێخ ئەحمەد بەشی یەکەمی قبووڵ کرد و گوتی تۆپەکان وان لە گوندی «نەڵۆس» و

بەزوویی دەدرێنەوە بەڵام چۆڵکردنی نەغەدە لەم ساتەدا لە توانا بەدەرە، لەبەرئەوەی ناکرێ پازدە هەزار ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتە لە شنۆ کۆچ بکرێن و، بژیویشیان لەو شوێنەدا بۆ مسۆگەر بکرێ. شێخ ئەحمەد لە وەڵامی قسەی مندا کە لە بارەی ئامانجی هێزی سوپاوە دوام و گوتم هێزی دەوڵەت نیازی شەڕی لەگەڵ بارزانییەکاندا نییە، بەرلەوەی وەڵام بداتەوە هەستا و قورئانێکی لە گیرفان دەرهێنا، لە نێزیک منەوەی دانا و داوای کرد سوێند بخۆم کە جگە لە سوودی گەلی ئێران چ ئامانج و ئاواتێکی ترم نییە. منیش ئەو سوێندەم بەهەموو دڵ و ڕوونەرمییەک ـ کە ئەو سوور بوو لەسەری، بەهێمنی و دڵنیاییەوە خوارد.

شێخ ئەحمەد دوای دڵنیابوون لە قسەکانی من، گوتی: بەدەوڵەتی ئێران و بەرپرسیارانی سوپا بڵێ سوێند بەخوا ئێمە نیازی شەڕی ئێوەمان نییە و لە بیری دژایەتیدا نین، هەمان شتیشمان بەدەوڵەتی عێراق گوت و گوێی شل نەکرد، بەئێوەش دەڵێین ئێمە کارمان بەسەر ئێرانەوە نییە و تەنیا لەبەرئەوەی کوردین خۆمان بەئێرانی دەزانین، ئەگەر دەوڵەتی عێراق مۆڵەت نەدا بگەڕێینەوە وڵات ئەوا لە دەوروبەری تاران یان هەر شوێنێکی تردا کە دەوڵەت دەستنیشانی بکات نیشتەجێ دەبین و دەبین بەهاووڵاتیی ئێرانی.

شایەنی بەبیر هێنانەوەیە، ئەو کاتە مەلا مستەفا بۆ وتوویژ چوو بوو بۆ تاران و درێژەکێشانی ماوەی مانەوەی ئەو لەوێ بووبووە مایەی دڵەڕاوکەی بارزانییەکان، لەبەرئەوەی ئەو بەر لە ڕۆیشتنی خۆی بۆ تاران گوتبووی ئەگەرهاتوو هەتا دە ڕۆژی تر نەهاتمە دواوە ئەوا بۆ شەڕی هێزی دەوڵەت خۆتان ساز بدەن. ئیتر ئەوکاتەش، ئەو ماوەیەی ئەو دیاریی کردبوو بەکۆتا هاتبوو.

شێخ ئەحمەد، لەوەی خێڵی بارزانی لە ساڵی ١٣٢٤(١٩٤٥)دا واتە ئەوکاتەی هێزی دەوڵەت لە کوردستان نەمابوو، هاتبوونە ئەو ناوچەیە و، سەبارەت بەو کێشانەی سەریان هەڵدابوو، داخی دڵی خۆی هەڵڕشت و هیوای خواست بۆندژی لەو ناوەدا نەمێنێ. برایانی شێخ ئەحمەد، شێخ محەمەد سدیق و شێخ بابۆ کە هەردووکیان لەو بچووکتر و لە مەلا مستەفا گەورەتر بوون، لەو دانیشتنەدا بەڕاشکاوی گوتیان قازی محەمەد زستانی ساڵی رابردوو ڕێزدار شێخ ئەحمەدی لەلای سۆڤیەتییەکان وا تاوانبار کردبوو کە پێوەندیی بەئینگلیزەوە هەیە، لە ئەنجامدا سۆڤیەتییەکان ئەویان لە مەهاباد بەدەرنا و لە «شەیتان

ئاوای دۆڵ»یان نیشتەجێ کرد. ئەو دوو برایە بەراشکاوییەکی زیاترەوە ئاخاوتن و سوێندیان خوارد دوکتۆر مەلکوومیی ئاشووری کەوا یەکێکە لە تاوانبارانی ناسراوی ورمێ، هەروەها ئەفسەرانی ئێرانی یان سۆڤیەتی، کەسێک لەناو ئەواندا نییە و ئەگەر تالان و بڕۆیەک لەم دەوروبەرەدا ڕووی دابێ ئەوا بەدەستی زێرۆ و نووری بەگ ڕوویان داوە(٨). سالی رابردوو، قازی محەمەد پێدا پێدا فەرمانی بەئێمە دەدا خێلانی مامەش و قەرەپاپاخ تالان بکەین بەلام ئێمە لەبەرئەوەی کوردمان خۆش دەوێ کاری ئاوهامان نەکردووە.

هەمان شەو سەعات دە، دوای ئەوەی لیستەیەکم لە پێویستییەکانی ئازووخەی خێلی بارزان لە شێخ ئەحمەد وەرگرت، شنۆم بەجێ هێشت و بەرەو مەهاباد جوولام. هەمان ڕێگەی پێشووم بەدژوارییەکانی پێشترەوە بەلام بەماوەیەکی کەمتر، تەی کردەوە لەبەرئەوەی لە گەڕانەوەدا زەوی شەختە بەستبووی و بۆ تێپەڕینی لۆری لەبارتر بووبوو.

پێش ئەوەی لەگەڵ خوێنەرانی ئازیزدا بێینە تاران و لە وتوویژی دەوڵەت لەگەڵ مەلا مستەفادا ئاگەدار بین، مێژووی خێلی بارزان و چۆنیەتیی هاتنیان بۆ ئێران باس دەکەین:

بارزانییەکان یەکێکن لەو تایەفە گەڕناس و بوێرانەی عێراق کە لە ناوچەی هەولێر لە کێوەکانی عێراق نێزیک سنووری ئێران دادەنیشن و هەتا پێش شەڕی دووەمی دنیا و لەسەردەمی ئاشتیدا، ڕووبەڕووی بوویەری ئەوتۆ گرینگ نەبووبوون کە سەرنجی کۆڕ و کۆمەلانی سیاسی و کۆمەلایەتی بۆ خۆی بەکێش بکات، بەئاوایەکی ئاشتیخوازی درێژەیان بەژیانی خێلایەتیی خۆیان دەدا. لەهەمان ئەو ڕۆژان و سالانەی پێشوودا سەرۆکانی ئەم تایەفەیە لە دوورە هەوارگەی سلێمانی، ناسریە، حیللە، دیوانیە و کەرکووک لەبن سانسۆردا چاوەڕوانی ڕووداوێکیان دەکرد. پاش دوازدە سال لە دوورە هەواری، سالی ١٣٢٠ (١٩٤١) کە شۆڕشی ڕەشید عالی گەیلانی ڕووی دا هەلێک بۆ ئەو دوور لە هەوارانە هەلکەوت و، خۆیان لە کۆت و بەند و چاودێریی پۆلیس ڕاپسکاند و بۆ زێدی بنەڕەتی خۆیان گەڕانەوە.

دوای گەیشتنەجێ، بێ وچان دەستیان کرد بەکۆکردنەوەی کەسانی پەرت و بلاوی خۆیان و پەیداکردنی چەک و تەقەمەنی. لە هەلومەرجی ناپەڕژای عێراق سوودیان بینی،

(٨) شاعیری بەناوبانگ هێمنی موکریانیش لە «لە کوێوە بۆ کوێ»یەکەیدا زێرۆ بەهادووریی بەتالانچی و شڕەخۆر ناوبردووە، بڕوانە: پێشەکیی دیوانی «تاریک و ڕوون»ی شاعیر.

بەهاندانی کەسانی دەرەکی و کاربەدەستانی دەوڵەت، بەڕاشکاوی دەستیان کرد بەداوای ئۆتۆنۆمی بۆکوردستانی عێراق. ئەم کردەوەیە بوو بەمایەی لەشکرکێشی و، لە ئەنجامدا شکانی سوپای عێراق و، دەوڵەت ناچار بوو ئەندازەیەک لە داوایەکانیان پەسند بکات، بەڵام پاش ماوەیەکی کورت جارێکی تر راپەڕیوان داوای ئۆتۆنۆمییان کردەوە، مەلا مستەفا بارزانیش کە لە هەموان خۆشەویستتر و بەتواناتر بوو، لەلایەن سەرۆک تایەفانەوە بەناوی سەرۆکی بزووتنەوە هەڵبژاردرا و چووە ناو وتوویژ لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا، لە هەموو کۆڕێکدا بەگەرمی و خۆشەویستییەوە پێشوازیی کرا و بەڵێنی هەموو یارمەتییەکی لێ وەرگرتن و کەسێک بەدژی ئەوان نەدەوەستا، بەم شێوەیە سەرکەوتنێکی شایەن بوو بە بەشی بزووتنەوەکە.

ساڵی ١٣٢٤ (١٩٤٥) کابینەی وەزیرانی عێراق لە کار کەوت، تێکڕای ئەو وەزیرانەی لایەنگرییان بۆ بزووتنەوەکە هەبوو هەموویان گۆڕان و ناحەزانی ئەوان جێگەی گرینگیان لە داوودەزگای دەوڵەتدا گرت. کاربەدەستانی دەرەکیش کە هیچ دژبەرییەکیان بۆ ئۆتۆنۆمیی کوردی نەدەکرد، ئەوانیش گۆڕان و هەندێکی تر کە تەواو بەرەواژی ئەوانی پێشوو بوون هاتنە شوێنیان. لەو ئاڵوگۆڕەدا، بارودۆخی دەوڵەتی عێراق و بیانییەکان بەپێچەوانەی رابردوو، برێتی بوو لە بەرهەڵستیی ئەم بیرە و سەرکوتینەوەی راپەڕیوان، لە ئەنجامدا لەشکرکێشیی عێراق دەستی پێ کرد و دوای ئەو پێکدادانانەی بەشکانی بارزانییەکان بەکۆتا هاتن، مەلا مستەفا داوای دیمانەی بەرپرسیارانی دەوڵەتی کرد. لەو دیمانەیەدا داوای لێ کرا لە عێراق دەربچێ و بەگوێرەی قسەی مەلا مستەفا خۆی، تکای ئەو بەهیچ کوێیەک نەگەیشت و لەبەرئەوەیش کە بارودۆخی ئێران شێوا بوو و حکوومەتی ناوەندییش لە ناوچەی کوردەواریدا وزەی نەما بوو بۆیە بارزانییەکان لە مانگی رەزبەری ساڵی ١٣٢٤دا بە زەویی ئێران گەیشتن(٩).

پاش گەیشتن بەئێران، لەبەرئەوەی بەشی کوردنیشینی مەهاباد و دەوروپشتی ورمێ لەژێر دەسەڵاتی هێزی دەوڵەتی ئێراندا نەمابوون، بۆیە دەوڵەتی ئێران نەیتوانی بارزانییەکان بەپێی مەرج و پرۆگرامێکی تایبەت وەربگرێ. ئەوانیش لەبەرئەوەی سنوورەکانی ئێرانیان بەبێ لەمپەر و بەرگر و، هەروەها توانای دەوڵەتیان کەموکورت دەبینی، بۆیە بەپێی پێویستیی بارودۆخی ناوچە و فەرمانی قازی محەمەد کە داوای

(٩) بارزانییەکان لە ١١ تشرین١ ١٩٤٥ گەیشتنە کوردستانی دیوی ئێران.

ئۆتۆنۆمیی بۆ کوردستانی ئێران دەکرد، دەجووڵانەوە و لە هیچ ئەرکێکی سەرشانیان سستیان نەدەنواند و، لە پێناو بەرەوپێش بردنی ئامانجە مەترسیدارەکانی حیزبی کۆمەڵەدا بەدڵسۆزییەوە تێ دەکۆشان، لە هەندێک چالاکیی ناوچەیی لە دەوروپشتی سەقزیشدا پشکدارییان کرد و لە دژی هێزی دەوڵەتی ئێراندا شەڕیان کرد. ئیتر ئەم دۆخە هەتا ئەو دەمەی ئۆتۆنۆمییەکەی ئازربایجان «ناوێک» بوو، بەڕێوە دەچوو. ئەم تایەفەیەش لەبەر تیشکی خواستەکانی قازی محەمەد و دوور لە توانای ناوەندیی ئێران دەسەڵاتێکیان دەنواند.

ئەم تایەفەیە لە ڕێگەی مێگەلدارییەوە بژیوی خۆیان بەدەست دێنن و لەبەرئەوەی بەردەوام بەدوای مەڕومالاتی خۆیاندا بەکێوانەوە لە جووڵەدان بۆیە ئاساییە پیاوی لێهاتوو و بەهێز و بەگشتی بوێر و چەکدارن و، هەر لە منداڵییەوەش خوو بەتفەنگەوە دەگرن، هەر بەم بۆنەیەوەش لە نیشان ئەنگێوی و سوارچاکی و ڕێڕۆیشتنی دوور و درێژ لە کەژ و کێواندا تەواو بەتوانا و چوستن.

سەرۆکایەتیی ئەم تایەفەیە بەدەستی شێخ ئەحمەدی بارزان و مەلا مستەفای برایەتی، مەزەبی ئەوان «سوننی»یە و لە بارەی ئایین و نەریتی خۆیانەوە دەمارگرژ و توندن، بەتایبەتیش بەچاوی پڕ لە متمانەوە سەیری سەرۆک خێڵ و ڕێنوێنانی مەزەب و ئایین پەروەرانیان دەکەن، بەم پێیە شێخ ئەحمەد کە پێشەوای مەزەبیی ئەوانە یەکێکە لە گەورەترین پێشەوایانی مەزەبی سوننە و «خودانی بارزان»ی پێ دەڵێن.

شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ محەمەدی بارزانی و خاوەنی سێ برا بەناوی ـ مەلا مستەفا، شێخ بابۆ و شێخ محەمەد سدیق ـ ە. لە ناو ئەم سێ برایەدا بایەخی مەلا مستەفا لە پێش هەموویانەوەیە، دوای مەلا مستەفاش شێخ محەمەد سدیق بایەخدارە. شێخ ئەحمەد لە نێوان هەموو مێرانی بارزانیدا تاکە کەسێکە چەک بەدەستەوە ناگرێ و لایەنی واتاییی گرتووە، لە کاتێکدا پیاوانی تری بارزانی بەشێوەی گشتی خاوەن چەکن.

مەلا مستەفا پیاوێکی بەژن ناوەندی و ڕێک ئەندام و گەنم ڕەنگە، ئەنیەی کراوە و چاوانی درشت و برۆی ڕێکن، هەموو مەرجێکی بوێری و لاوچاکی و کارایی بەنێوچاوانیەوە دیارە. لە زمانی ئینگلیزی، عەرەبی، تورکی و فارسی باش شارەزایە. لە ماوەی ١٧ ساڵ زیاتر لەگەڵ دەوڵەتانی ئینگلیز و عێراق و ئێراندا پێکدادانی کردووە و، بینەر و بەشداری شەڕوشۆڕی خوێناوی بووە.

## تیرەکانی بارزانی

دەکرێ بارزانییەکان بەسەر چوار تیرەدا دابەش بکرێن:

(١) تیرەی بەڕۆژی لە دەوروپشتی بارزاندا جێ نیشتەن و لە خزم و کەسانی مەلا مستەفان.

(٢) تیرەی شێروانی خاوەنی گەلێک نەریتی لاوچاکی و ئازایین، سەرۆکی ئەوان محەمەد ئاغای مێرگەسۆری و سەعدوڵلا بەگە، جێ نیشینگەی ئەمانە لە ناوچەی رۆژهەڵاتی بارزان و ژوورووی زێی گەورەیە.

(٣) تیرەی مزووری لە رۆژئاوای بارزان و سەرۆکی ئەوان ئەسعەد خۆشەوییە کە برایەکی ئەو بە ناوی مستەفا خۆشەوی لە شەڕی مامەشا لە ناوچەی سەقز لە رۆژی ٢٥ جۆزەرداندا کوژرا(١٠).

(٤) تیرەی دۆڵەمەری سەرۆکی ئەوان محەمەدەمین میرخانە و مەڵبەندی دانیشتنی ئەم تیرەیە لە باشووری رۆژئاوای بارزانە، واتە لە باشووری جێ نیشنگەی مزووری و رۆژئاوای رەواندوز.

کەسانی ئەم تیرانەی سەرەوە جگە لەوەی خاوەنی گورج وگۆڵییەکی زۆری چیایی و گیانی ئازایەتین، هەروەها بەهۆی ژیری و هۆشیاریی سەرۆکانی خۆیان و بیری رووبەڕووبوونەوەی سوپای عێراق خزمەتی بن ئاڵایان بەتەواوی خواست و خولیاوە پەسند کردووە(١١) و، زۆرینەی کەسانیان فێری هونەری جۆراوجۆری ئەندازیاری، تۆپخانە، تانک و زریپۆشی شەڕ و چۆنیەتیی رووبەڕووبوونەوە و بەرگری لە خۆکردنن لە بەرامبەریاندا. ئەمانەی خوارەوە پوختەیەکن لە کردەوە سەربازییەکانی بارزانییەکان لە بەرامبەر سوپای عێراق و تورکیا و ئینگلیز کە باسیان دەکەین:

(١٠) ئەو کەسەی لەم شەڕەدا شەهید بوو خۆشەوی کوڕی خەلیل خۆشەوی بوو کە خۆرتێکی تەمەن نۆزدە ساڵی و لاوێکی ئازا و نەترس بوو، بارزانییەکان بەشەهیدبوونی ئەو زۆر خەمباربوون. بڕوانە: بەڕێز مەسعود بارزانی، شۆڕشی بارزان ١٩٤٥ ـ ١٩٥٨، لاپەڕە ٢٣-٢٤.

(١١) راست ئەوەیە کە خزمەتی بن ئاڵا «واتە سەربازی»یان پەسند نەکردووە.

## پێکدادانی بارزانییەکان لەگەڵ سوپای عێراق و ئینگلیز و چوونی مەلا مستەفا بۆ تورکیا

(١) لە ساڵی ١٩٣٠ی زاینیدا «واتە ١٣١٠ی هەتاوی» ئەو کاتەی تورک ئاشوورییەکانیان لە تورکیا بەدەر نا، دەوڵەتی بەریتانیا چاوی لەوە بڕیبوو ئاشوورییە دەرکراوەکانی تورکیا لە ناوچەی بارزان جێ نیشتە بکاتەوە. ئەم چاوتێ بڕینە بەلای بارزانییەکانەوە نالەبار بوو و بەهیچ ڕوویێک ئامادەی قەبووڵکردنی نەبوون لەبەرئەوەی دەیانزانی ئەگەر بێو ئەم خەڵکانە لە ناوچەی بارزان دابمەزرێن ئەوا لەرێگەی هاوژیانی و تێکەڵیی خۆیان لەگەڵ ئەمانەدا بایەخ و پایەیان کەم دەبێتەوە. سەبارەت بەم هۆیە شەڕی نێوان ئاشووری و بارزانییەکان یا چاتر بلێین بارزانییەکان و دەوڵەتی عێراق بەپشکداریی هێزی ئینگلیز دەستی پێ کرد بەڵام پاشان بەهۆی نەبوونی تفاقی شەڕەوە شێخانی بارزان بەرەو دیوی تورکیا کشانەوە.

لە ئەنجامدا سوپای عێراق و ئینگلیز لێبوردنی گشتییان بۆ بارزانییەکان دەرکرد و، بەم پێیە تورکەکان گەڕانەوەی بارزانییەکانیان بۆ عێراق پەسند کرد، بەڵام هەر کە گەیشتنەوە مووسڵ عێراقییەکان مەلا مستەفا و هەندێک لە شێخان و ژمارەیەک لە کەسانی سەر بەخێڵی بارزانیان دەسبەسەر کرد و پاشان بۆ ناسریەیان دوور خستنەوە. ماوەی دوورخرانەوەی ئەوان ١١ ساڵی خایاند، چوار ساڵیان لە شاری ناسریە، حیللە، دیوانیە و کەرکووک و ٧ ساڵ تریشیان لە سلێمانی بردە سەر. ژمارەی دوورخراوەکان بە ژن و پیاوەوە ٨٦ کەس بوون و شێخ ئەحمەدی برا گەورەی مەلا مستەفاش لەناو ئەواندا بوو. مەلا مستەفا لە کاتی نیشتەجێ بوونی لە سلێمانی لەگەڵ کوردە بەرهەڵستکارەکانی ئەوێدا پێوەندیی بەست و بڕیاری داهاتووی شۆڕشی خۆی لەگەڵ ئەواندا دارشت و لە ئەنجامدا بە هاوکاریی ئەوان لە ڕۆژی ١١ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٢دا، توانیی تەبای دوو مرۆڤی تری بارزانی لە ڕێگەی پێنجوینەوە ڕابکات و لە ڕێی سەردەشتەوە بێتە بانە و لاهیجان و مەهاباد و لەوێشەوە خۆی بگەیێنێتەوە بارزان(١٢).

(١٢) بارزانیی نەمر ڕۆژی ١٢ تەمموز ١٩٤٣ لەگەڵ دوو لە هەڤاڵانی خۆیدا بەناوی مستەفا عەبدوڵڵا و سلێمان سوورە لە شاری سلێمانی دەرکەوتن و لە ڕێگەی کوردستانی ئێرانەوە بەرەو بارزان گەڕانەوە، لەم دەرچوونەشدا خوا لێخۆشبوو شێخ لەتیف بەرێنوێنیی باوکی ـ واتە شێخ مەحمموودی نەمر و خەباتکارانی حزبی هیوا هاوکارییان کردن.

## دەربازبوونی مەلا مستەفا لە دووره هەوارگەیی و پێکدادانی سەرلەنوێی لەگەڵ هێزی عێراقدا

(٢) ساڵی ١٩٣٣ی زایینی «بەرامبەر ١٣١٣ی هەتاوی» ئەو کاتەی مەلا مستەفا لە دووره هەوارگەییدا دەژیا ، سوپای عێراق تێکڕای تایەفەکانی بارزانیی چەکچن کرد بوو. ئەو دەمەی مەلا مستەفا لە دووره هەوارگەوە تەبای دوو کەسی تر بەناوی مامەند مەسیح و میرزا ئاغای رەشۆ هەڵاتن، سێ پارچە چەکی ماهوزەڕی ئینگلیزیی پێ بوو، بێ وچان دوای گەیشتنی بەبارزان بەهەمان ئەو سێ پارچە تفەنگە بنکەی پۆلیسی «شانەدەر»ی چەک کرد و ١٣ تفەنگی کەوتە دەست، پاشان کەوتە نامە نووسین بۆ حکوومەتی عێراقی جێ نیشتە لە بارزاندا، بەتایبەتیش لە نامەیەکدا گوتی هاتنەوەم بۆ بارزان بەنیازی سەرپێچی و پیاوکوژی و رێگری نییە بگرە نیازم دابینکردنی ژیانێکی ئارامە لە ناوچەی بارزاندا.

بەڵام لە هەمان ئەو کاتەدا دەستی کرد بەڕاپەڕین و سەرپێچی لە دژی دەوڵەتی عێراق و هەر یەکراست دوای چەککردنی بنکە پۆلیسەکەی شانەدەر، فەوجێک پۆلیسی عێراق کە بریتی بوو لە ٥٠٠ کەس بەمەبەستی بتەوکردنی بنکەی شانەدەر و شوون هەڵگرتنی مەلا مستەفا بەرەو رووی بارزان چوو، بەڵام بەر لە گەیشتنی ئەوان، مەلا مستەفا بەهاوکاریی ١٣ کەسی چەکداری خۆی، توانیی بنکەی خێرەزووکیش بەشێوەیەکی سەرسڕهێن و دەسوەکەرییەکی تایبەتەوە چەک بکات کە لە ژێرەوە باسی دەکەین.

## ڕووداوی چەککردنی بنکەی خێرەزووک یان شاکارێکی گرینگی مەلا مستەفا

مەلا مستەفا خۆی و ٧ کەسی تر لە چەکدارانی، هاتنە ناو بنکەکەوە و لەبەرئەوەی هەمان کات ئاگەدار بوو کە بەو نزیکانە ٥٠٠ پۆلیس بەفریای بنکەکەوە دەگەن، شەشەکەی تری «لە ١٣ کەسەکەی خۆی» لە گەروویێکی نزیک بنکەکەدا بەجێ کرد هەتاکو بێ ئەوەی شوێنی خۆیان ئاشکرا بکەن مەلا مستەفا لە هاتنی پۆلیسە بەفریاهاتووەکان وریادار بکەنەوە. مەلا مستەفا ٣٠ کەسی بنکە پۆلیسەکەی بەر لە هاتنی فەوجە پۆلیسە بەفریاهاتووەکە چەک کرد و جلوبەرگی خۆی و پیاوەکانی بەجلوبەرگی پۆلیسەکان گۆڕی.

هەمان رۆژ لە نیوەی شەودا فەوجە بەفریاهاتووەکە گەیشتەجێ و شەش کەسە چاودێرەکە بێ ئەوەی شوێنی خۆیان ئاشکرا بکەن، هاتنی ئەوانیان بەمەلا مستەفا راگەیاند و ئەمانیش لە بنکەکەدا خۆیان بەکەیس کرد. دەمودەست سەرۆکی فەوجەکە چووە بەر دەرگەی بنکەکە و بەزمانی عەرەبی هاواری کرد: «سەرۆکی بنکە دەرگە بکەوە!» مەلا مستەفا زمانی عەرەبیی باش دەزانی و وەلامی دایەوە کەوا سەرۆکی بنکە مۆڵەتی کردنەوەی دەرگەی پێ نەداوم، هەرکاتێک سەرۆکی بنکە هات ئەوا بەمۆڵەتی ئەو دەرگەتان بۆ دەکەمەوە. ئیتر بەو شێوەیە ٥٠٠ پۆلیسەکە، شەو لەدەرەوەی بنکەکەدا لە شوێنێکی نالەبار دامەزران، بەرەبەیان بارزانییەکان لە دوو لاوە واتە لەلای بنکەکەوە و لەلای گەرووەکەوە ئاگرێکی خەست و خۆڵیان بەسەردا باراندن، بەشێوەیەک ژمارەیەکی کەمیان توانییان دەرباز بن، بەم جۆرە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا مەلا مستەفا بوو بەخاوەنی برێکی زۆر لە چەک.

ئەم کردەوە و ئازایەتییەی مەلا مستەفا، سەرنجی کۆمەلانی سیاسی و سوپاییی عێراقی بەرەو ناوچەی بارزان بەکێش کرد بەتایبەتیش ئەندامانی حزبێک کە تازە بەناوی «هیوا» لە عێراق دامەزرابوو و، خاوەنی بیر و بۆچوونی ئاژاوەگێری یا بەزاراوی خۆیان «ئازادیخوازی» بوون، پشتەوانییان لەم کردەوانەی مەلا مستەفا دەکرد و، کەوتنە بەستنی پێوەندی لەگەڵ ئەودا و هەروەها هەندێک لە ئەفسەرانی سوپای عێراق کە لە نێو ئەم حزبەدا بوون و لەبەرئەوەی جێی متمانەی سوپا و دەوڵەتی عێراق نەبوون، بۆ نیازی ناڕەوا کەڵکیان لەم هەلە وەرگرت و کەوتنە نواندنی پێوەندی لەگەڵ بارزانییەکان و بەپشتەوانیی بیر و بۆچوونی حزبی ناوبراو سێ کەسیان لە کاربەدەستانی گرینگی خۆیان بە ناوی رائید روکن عیزەت عەبدولعەزیز «کە لە ساڵی ٢٤ ـ ٢٥(٤٥ ـ ٤٦)دا لە ریزی هێزی بەرهەڵستکارانی کوردستاندا هاوکاریی بارزانییەکان و قازی محەممەدی دەکرد» و نەقیب عەزیز سەید عەبدوڵلا و عەقید ئەمین رەواندوزی بەنیازی وتوویژ و بەستنی پێوەندی، نارده لای مەلا مستەفا.

مەلا مستەفا لەگەڵ ئەم ئەفسەرانی پێوەندییەدا پرۆژەیەکی لە بارزان گەڵاڵە کرد و بەشێوەی داوخواز پێشکێشی دەوڵەتی عێراقیان کرد کە گرینگترین داواکاریی ئەوان برێتی بوو لەمانەی خوارەوە:

(١) دامەزراندنی هەرێمی کوردستان، برێتی بێ لە شارەکانی کەرکوک، سلێمانی،

هەولێر، دهۆک و خانەقین.

(٢) هەبوونی وەزیرێک لە کابینەدا بەناوی وەزیری کوردستان.

(٣) هەبوونی بریکار وەزیرێکی کورد لەهەر وەزارەتێکدا.

(٤) دابینکردنی سەربەخۆیی رووناکبیری، ئابووری، کشتوکاڵی و هەموو کاروبارێکی تر تەنیا سوپا و پۆلیس نەبێ.

مەلا مستەفا ئەو داوخوازانەی بەئیمزای هەموو سەرکردەکانی تری کورد گەیاند و پشتگیریی لێ ستاندن و بەدەوڵەتی عێراق و ئینگلیزی راگەیاند. جگە لەمەیش بۆ ئەوەی زیاتر خۆی لە حزبی هیوا نێزیک بکاتەوە ژمارەی ئەفسەرانی پێوەندیی کردە حەوت کەس، ناوەکانیان ئەمانەی خوارەوەیە:

(١) عەقید ئەمین رەواندوزی، ئەفسەری پێوەندی لە ناوچەی رەواندز و بارزان.

(٢) رائد عیزەت عەبدولعەزیز، ئەفسەری پێوەندی لە ناوچەی بلە.

(٣) مستەفا خۆشناو، ئەفسەری پێوەندی لە بارزان.

(٤) میرحاج ئەحمەد، ئەفسەری پێوەندی لە ناوچەی ئاکرێ.

(٥) مەجید عەلی، ئەفسەری پێوەندی لە ئامێدی.

(٦) سەید عەزیز سەید عەبدوڵڵا ئەفسەری پێوەندی لە ناوچەی مێرگەسۆر و برادۆست.

(٧) فوئاد عارف، ئەفسەری پێوەندی لە ناوچەی پشدەر(١٣).

مەلا مستەفا بەرواڵەت دەیویست سیاسەتی دەوڵەت لە ناوچەی بارزان بپارێزێ و پێوەندیی نێوان دەوڵەت و سەرۆک خێڵەکان بەم شێوەیە خۆش بکاتەوە. بۆیە لەم رووەوە سەرەتا سەرنجی سەرۆک خێڵ و بەرپرسیارانی حزبی ناوبراوی بۆ کردەوەکانی خۆی بەکێش کرد. بەڵام نیازی شاراوەی ئەو شتێکی تر بوو و سیاسەتی خۆی لە بەرامبەر عێراقدا دەبردە پێش، بەجۆرێ هەندێک لە سەرکردە تێگەیشتووەکانی حزب پاشان بۆیان دەرکەوت مەلا مستەفا تەنیا گەمەیەکی سیاسی دەکات و، چ مەبەستێکی تری نییە بەڵام بەرەبەرە گەورە کاربەدەستان و سوپای عێراق متمانەیان بەئەفسەرانی ناوبراوی پێوەندی نەما و لەسەر ئەو ئەرکەی پێیان سپاردرابوو لادران و، پێوە بوون بیانگرن. ئەوکاتە میرحاج و مستەفا خۆشناو بەکاری نهێنی و بەجێ گەیاندنی بیری خۆیانەوە سەرگەرمی نواندنی چالاکی بوون و دوو مانگ مۆڵەتیان وەرگرتبوو، کاتێک لە نیازی خراپی دەوڵەت ئاگەدار

(١٣) هەروەها: لیوا بەهائەدین شێخ نووری، ئەفسەری پێوەندیی ناوچەی سلێمانی.

بوونەوە بەیەکەوە بڕیاریان دا میرحاج بگەڕێتەوە سەر کار بەڵام مستەفا خۆشناو لە بارزان بمێنێتەوە. ئیتر میرحاج گەڕایەوە سەر کار و سەرەتا سوپا بەشێوەیەکی ئاسایی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کرد، ئەویش بەنامەیەک بانگهێشتنی مستەفا خۆشناوی بۆ سوپا کردەوە بەڵام هەر بەگەیشتنی ئەم، هەردووکیان لە سوپا وەدەرنران و میرحاج دەمودەست لە بەغدا گیرا و پاشان نێردرایە عیمارە، بەڵام مستەفا خۆشناو لە ڕێگەی هەولێر و کۆیەوە بەرەو بێتواتەی زاگەی خۆی، هەڵات. عیزەت عەبدولعەزیزیش هەر بەئاگەداربوونەوە لە چۆنیەتیی بارودۆخەکە بەغدای بەجێ هێشت و لەڕێی کەرکووک ـ هەولێر و شەقڵاوەوە رووی کردە بارزان و بەنامە داوای لە مستەفا خۆشناو کرد هەتا ئەویش لە بێتواتەوە بچێتە بارزان.

مستەفا خۆشناو دوای ٤٥ رۆژ مانەوە لە بێتواتە، بەگەیشتنی نامەکەی عیزەت عەبدولعەزیز چوو بۆ بارزان. بەم شێوەیە، سەرەڕای رائید روکن عیزەت عەبدولعەزیز و، میرحاج ئەحمەد نەقیبی تانک و، مستەفا خۆشناو رائیدی پیادە، ئەفسەرانی تری عێراقی کە لە سوپای عێراقەوە بۆ بارزان هەڵاتبوون، بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

(١) بەکر عەبدولکەریم، نەقیبی تۆپخانە.

(٢) نووری شێروانی، ملازم یەکەمی تۆپخانە.

(٣) جەلال ئەمین، ملازم یەکەمی پیادە «لە شنۆ لە لایەن کاروانی سوپای نێردراوەوە بەدیلی گیرا و دوای ناردنی ناوبراو بۆ ئەرکانی هێزەکان و لێتۆژینەوەی پێویست ناردرایە تاران».

(٤) ساڵح عەبدولعەزیز، ملازم یەکەمی ئەندازیار، برای عیزەت عەبدولعەزیز.

(٥) محەمەد مەحموود قودسی، ملازم دووەمی موکەللەف.

(٦) خەیروڵڵا عەبدولکەریم، ملازم یەکەمی تانک.

(٧) شەریف نەعمان، نایب زابتی یەکەم.

تەنیا بەکر عەبدولکەریم ـ یان نەبێ ئەوانیتر هەموویان لەلایەن سوپای عێراقەوە سزای لە سێدارەدانیان بۆ دەرچوو بوو.

## گرینگترین پێکدادان لەگەڵ سوپای عێراقدا

دەسوەکەریی بارزانییەکان لە چەککردنی بنکەکانی بارزان و مێرگەسۆر و فەوجەکەی پۆلیس بووە مایەی دڵەڕاوکەیەکی زۆر لە ناو کاربەدەستانی عێراقدا و هێزێک کە برێتی بوو لە لیوایەک بەسەرۆکایەتیی جەنەراڵ مستەفا عارف بەنیازی سەرکوتینەوەی ئەوان لە ڕەواندز و ئاکرێدا کۆکرایەوە.

سەرەڕای ئەوەی چەند ئەفسەرێکی عێراقی لەگەڵ بارزانییەکاندا بوون، هەروەها شێخ و سەرۆک تیرەی زۆربەی خێڵەکانیش بەهۆی پێکدادانی جۆربەجۆر و ئەو تێکەڵییە فرەوانەی لەگەڵ گەورە کاربەدەستانی سوپای عێراق و داوودەزگاکانی تری سوپادا هەیانبوو، لەناوەخۆیاندا بووبوونە خاوەن ڕێکخستن و ڕێکوپێکییەکی تایبەت. لە ڕێگەی ئەو دەست تێکەڵی و دەسەڵاتەی لە زۆربەی داوودەزگاکانی میری و سوپاشدا هەیانبوو زوو بەزوو زانیارییان پێ دەگەیشت، بۆیە ئەو فەرمان و بڕیارانەی دەریان دەکردن لە هەموو ڕوویەکەوە شایەنی سەرنج و لێ وردبوونەوەن.

بۆ نموونە یەکێک لەو فەرمانانەی مەلا مستەفای سەرۆکی خێڵی بارزان وەک سەرۆکی هەموو هێزەکان لە ڕۆژی ١٩٤٥/٣/٣دا بۆ بەرپەرچدانەوە و پێشگیری لە کردەوەی یەکە سوپاییەکانی سوپای عێراق دەری کردووە بەشێوەی خوارەوە دەخەینە بەرچاوتان:

### فەرمانی نهێنی

ژمارە: ١

مێژوو: ١٩٤٥/٣/٣

ئەلیف ـ زانیاری:

(١) سوپای دەوڵەتی عێراق بەبیانووی مناوەرەیەک کە ڕۆژی ١٩٤٥/٣/٥ دەستی پێ دەکات، دەیەوێ بەنیازی گرتنی خاڵە گرینگ و ستراتیجییەکان بگاتە ناوچەی بارزان و بارزانییەکان گەمارۆ بدات.

(٢) فەوجی ٤ی سوپای عێراقیی مۆڵگەی سنووری ڕەواندز، لە سێ بەتالیۆن و دەستەیەکی تۆپخانەی چیایی و سریەیەک تۆپی ٣٧ «خاوەنی ٧ تۆپن چواریان لە کار کەوتوون» و بەتالیۆنێکی ئەندازە و دەستەیەک بارهەڵگر و دەستەیەک کۆکەرەوە پێک هاتووە.

(٣) لەوانەیە یەکەکانی پۆلیس لە رەواندز کۆبکرێنەوە و وەک هێزی سپێر لە چاوەڕوانیدا بن.

(٤) کەتیبەیەکی زرێپۆش بۆ پاسەوانیی رێگەی گواستنەوە و هاتوچۆی هەولێر ـ رەواندز ـ مێرگەسۆر بەکار دەهێندرێ.

### بێ ـ هێزی خۆمان:

(١) هێزی بارزان برێتییە لە چەکدارانی بارزانی.

(٢) خێڵە کوردەکانی دۆستی خۆمان.

(٣) ئەو ئەفسەرانەی سوپا کە پێوەندییان بەئێمەوە کردووە.

(٤) هێزە نەتەوەییەکانی تر کە لەوانەیە پاشان پێوەندیان پێوە بکەن.

### جیم ـ فەرمانێک بۆ سەرکردایەتی بۆ بەجێ گەیاندن:

(١) مستەفا خۆشناو بەسەرۆکی هێزی شێتنە دادەمەزرێ.

نەقیب محەمەد مەحموود دەبێ بە سەرۆکی ئەرکانی فەرماندەییی هێزی شێتنە.

ئەحمەد ئیسماعیل بەسەرپەرشتیاری کاروباری کارگێریی ئەو دادەمەزرێ.

(٢) مستەفا خۆشناو دەبێ زانیاری لە بارەی ناوچەکەوە کۆبکاتەوە و هێزی خۆی بەپێی ئەو زانیارییانەی بەدەستی هێناون و هەروەها بەپێی رووکاری کردەوەی دوژمن، دابەش و ئامادە بکات.

(٣) فەرمانی پێویست بۆ بەرپرسیاری بەشە پێوەندارەکان دەربکات بەنیازی سەنگەرگری و رێکوپێکی و خۆراک.

(٤) بۆ زاڵبوون بەسەر پتریی هێزی دوژمندا لە رووی تۆپخانە، تانک و باڵەفڕەوە پێویستە خافڵگیرکردنی دوژمن تاکە تەکتیک بێ.

(٥) ئەگەربێو زانیاریی تەواو لە بارەی نیازی یەکجارەکیی پەلاماری دوژمنەوە بەدەست بکەوێ ئەوا پێویستە دەمودەست مێرگەسۆر بگیرێ.

(٦) بۆ پاراستنی دانیشتوانی دێ و مێرەدێیەکان لە کاتی پەلاماری باڵەفڕەدا پێویستە هەر هەموویان بزانن هەر کاتێک باڵەفڕە بەدەرکەوتن دەبێ ئەوانیش بێ دواکەوتن لە ماڵ دەرکەون و لە دەرەوەدا بڵاوە بکەن و مەڕوماڵات و وڵساتی خۆیان لە کەند و لەندەکاندا لە پەنای دار و دەوەن بشارنەوە.

(٧) گوللەباران کردنی باڵەفڕە دەبێ ئەو کاتە بێ کە لە حوکمی گوللەدا بێ.

(٨) بۆ ئەوەی هەلێکی پتر لە بەردەمدا بێ بۆ ڕێکوپێک کردنی جووڵە و بزاوت لە هەموو بەرەکاندا پێویستە چەندی زیاتر بلوێ بزاوتی دوژمن دوا بخرێ.

(٩) ئەفسەرێک بچێتە ناوچەی باڵەک و برادۆست بۆ ئەوەی بزاوتی خێڵان لەگەڵ هێزی بارزانیدا هاودەم بکات.

(١٠) بۆ کۆکردنی دیل و دەسکەوت پێویستە بەرپرسیار هەبن. دەبێ ئەفسەرانی دیل و خوێندەواران بنێردرێنە بارەگای سەرۆکایەتیی هێزی بارزان.

(١١) راپۆرتی رۆژ بەرۆژ بۆ سەرۆکایەتی بنێردرێ.

(١٢) لە گەیشتنی ئەم فەرمانە ئاگەدارمان بکەنەوە.

## سەرۆکی هێزەکان: مستەفا بارزانی

هەرچۆنێک بێ، لەبەرئەوەی لە ڕێگەی کەسانی پێوەندیی حزبی هیواوە پاشنیوەڕۆی رۆژی سێیەمی ئاداری ١٩٤٥ هەواڵ گەیشتە مەلا مستەفا کە فەوجی ٤ی سنووری بەسەرکردایەتیی عەقید رەفیق عارف لە ناوچەی رەواندز لە باپشتیان و، فەوجی ٥ بەسەرکردایەتیی عەقید عەزیز لە ئاکرێ دامەزراون و فەوجی ٤ لە رۆژی ٥ی مانگدا هێرش بۆ رەواندز دەکا، بۆیە مەلا مستەفا هێزی بارزانی گردوکۆ کرد:

مستەفا خۆشناو بەو شێوەی لە سەرەوە دیارمان کرد بوو بەسەرکردەی بەرەی رۆژهەڵات واتە لە شێتنە و مێرگەسۆر و ناوچەی برادۆست.

عیزەت عەبدولعەزیز بۆ بەرەی رۆژئاوا بۆ سەرکردایەتیی ناوچەی ئامێدی.

عەبدولحەمید باقر بۆ هەمان بەرە بۆ سەرکردایەتیی ناوچەی ڕێکانی.

شێخ سلێمان بۆ باشوور بۆ سەرۆکایەتیی ناوچەی ئاکرێ.

هەر بۆ نموونە ئەو فەرمانەی بەیەکێک لە سەرکردەکان «سەرکردەی بەرەی رۆژهەڵات مستەفا خۆشناو» درا بوو و لە سەرەوەدا باسمان کرد، سەرکردەی ناوبراو لەگەڵ ئەرکان و سەرۆکی پێوەندیدار بەکاروباری کارداری، پاشنیوەڕۆی رۆژی سێیەم تەبای هێزێکی چەکدار بەرەو شوێنی راسپاردەی خۆی بەڕێ کەوت و لە ڕێگەی کەسانی پێناوەوە هەواڵی دایە هێزی خێڵانی ناوچەی مێرگەسۆر، دۆڵەمەری و شێروان بۆ ئەوەی لەبەرەی شێتنەدا ئامادەبن.

ئەو لەگەڵ ئەرکانی خۆیدا شەوی چوارەم گەیشتە بەرە و دەستی بەسەرانسۆبی کرد. وەکات، فەرمانێک لەلایەن مەلا مستەفاوە گەیشت کەوا هەتا بتوانێ بەشێوەی ئاشتی ئاسا هێرشی دوژمن بخاتە تەنگژەوە. سەرکردەی بەرە لە جێبەجێ کردنی ئەو فەرمانەدا نامەیەکی بەشێوەی خوارەوە بۆ سەرکردەی فەوجی ٤ عەقید ڕوکن رەفیق عارف نووسی:

بەڕێز رەفیق عارف

دوای سلاو

لە ڕێگەی چاودێرانی خۆمانەوە پێم گەیشتووە کە ئێوە نیازتان وایە ڕۆژی ٥ ئادار بەبیانووی مناوەرەوە هێرش بکەن، بۆیە لەم بارەیەوە ئەگەر هەر پێشهاتێک ڕوو بدا ئەوا بەرپرسیارەتی ناکەویتە ئەستۆی ئێمە.

*ئیمزا: مستەفا خۆشناو*

پاشنیوەڕۆی ڕۆژی ٤ی مانگ وەڵام لە سەرکردەی فەوجەوە هات کە نیازی هێرش لە کایەدا نییە. ئەم دەست پێشخەرییەی بارزانییەکان و خۆدامەزراندنیان لەبەرەدا بووە هۆی ئەوەی نەخشەی سەرکردەی فەوج بەتەنگانە بکەوێ، بەڵام لەو مێژووەوە هەتا ماوەی ٤ مانگ بارزان بوو بەبنکەی چالاکی و هاتن و چوون و دیمانەی سیـــسی. چالاکیی بارزانییەکان ڕۆژ بەڕۆژ بەناونیشانی بزووتنەوەی نەتەوەییەوە بەبرەوتر و گرینگتر و، هێزدارییان پتر دەبوو. هەر ئەم پرسەش لەرزەیەکی زیاتری دەخستە، ناو کۆمەڵانی پێوەندیدار لە عێراق. بەتایبەتیش، دەرکەوتنی مەلا مستەفا لەگەڵ دوو لە ئەفسەرانی خۆی لە ناوچەی بارزان بۆ سەردانی ناوچە کوردنشینەکان بووە مایەی ئەوەی دەوڵەتی عێراق سوود لە هەل وەربگرێ و هێزی سوپای خۆی بەرەو ناوچەی بارزان راپێچ بکات و بەبروسکە فەرمانی دایە هەموو داوودەزگای میری لە بارزان بۆ ئەوەی هەر بارزانییەکی بۆ کارێک سەردانی داوودەزگای میری دەکات دەمودەست بگیرێ، بەو شێوەیە دەسپێکی راپەڕینی دووەمی بارزان هاتە کایەوە.

## شۆڕشی دووەمی بارزان لە عێراق

## کردەوەکانی فەوجی (٤) و (٥)ی سوپای عێراق

ئەو دەمەی مەلا مستەفا لە مەڵبەندی بارزان نەبوو، بەهۆی گەیشتنی فەرمانێک بە بروسکە، ئەسعەد خۆشەویی سەرۆکی تیرەی مزووری کە سەردانی یەکێک لە دەزگاکانی میریی لە بارزان کرد بوو، گیرا. دەسبەجێ بەگورجی خۆی دەرباز کرد، هەندێکی تر لە بارزانییەکان کە کاریان بەداوودەزگای میری کەوتبوو لەبەرئەوەی فەرمانی گرتنیان گەیشتبوو، دەمودەست کەوتنە بەرگری و لە ئەنجامدا چەند داوودەزگای میری لە ناوچەی بارزاندا هەبوون هەموویان لەلایەن بارزانییەکانەوە گیران.

لە مێرگەسۆریشدا، ئولی بەگی سەرۆکی تیرەی شێروان کە لەگەڵ دوو کەسی تری بارزانیدا بۆ وەرگرتنی قەند و شەکری تیرەکەی چووبووە بنکەی پۆلیسی مێرگەسۆر، لەبەرئەوەی ویستیان بیگرن، دەستی کردەوە و لەناو بنکەکەدا پێکدادان بەرپا بوو و لە ئەنجامدا ئولی بەگ خۆی و سەرۆکی بنکەی پۆلیس تەبای چوار پۆلیس کوژران بەڵام بنکەکە لەلایەن دوو مرۆڤی بارزانییەوە گیرا. هەمان کات، شێخ ئەحمەد نامەیەکی بۆ مەلا مستەفا نووسی و داوای لێ کرد بگەڕێتەوە بارزان.

مەلا مستەفا، دەسبەجێ دوای گەڕانەوەی لە ڕۆژی ١٦ ئەیلوولدا لەگەڵ سەرکردە و شێخانی بارزاندا کۆبووەوە، لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیار درا دەسبەجێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دەوڵەت هێزێک پێک بهێندرێ و ڕەوانەی ئەم شوێنانەی خوارەوە بکرێ:

بەرەی ڕۆژهەڵات بەسەرکردەییی شێخ محەمەد سدیق - براگەورەی مەلا مستەفا و جێگریەتیی رائد عیزەت عەبدولعەزیز.

بەرەی باشوور یا بەرەی ئاکرێ بەسەرکردەییی مەلا مستەفا خۆی و یاریدەریی جەلال ئەمین و محەمەد مەحموود.

بەرەی ڕۆژئاوا واتە بەرەی باڵندە بەسەرکردەییی ساڵح عەبدولعەزیز.

هەمان ڕۆژ، لە کۆتاییی کۆبوونەوەکەدا، ئەو سەرکردانە تەبای هێزی چەکداری خۆیان، بەرەو شوێنی ڕاسپێرییان کەوتنەڕێ و ڕۆژی بیستەم مەلا مستەفا یاداوەرییەکی لە بارەی ڕووداوەکانی ئەو دواییە و مامڵەتی عێراق لەگەڵ ئەودا، بەرەوڕووی دەمڕاستی وڵاتانی بەریتانیا، سۆڤیەت، ئەمەریکا، فرەنسا، چین و سەرۆک وەزیرانی عێراق کردەوە.

## چۆنیەتیی کردەوە

ڕۆژی ٢١ ئەیلوول مەلا مستەفا لەگەڵ شێست مرۆڤی بژاردەی خۆیدا بەرەو ئاکرێ بەڕێ کەوت و ڕۆژی ٢٢ لە زێی گەورە پەڕینەوە. لە کاتی پەڕینەوە لە زێدا کەوتنە بەر پەلاماری بۆمبارانی باڵەفڕە. دوای پەڕینەوەی مەلا مستەفا لە زێ بەدوو ڕۆژ، واتە ڕۆژی ٢٤ ئەیلوول، محەمەد ئاغای زێباری تەبای ٤٠ مرۆڤی چەکداری خۆی گەیشتە مەلا مستەفا، هەموو بەیەکەوە بوون بەسەت کەس و بەرەو ڕووکاری چیای پیرس کەوتنە ڕێ. چیای پیرس یەکێکە لە بەرزییە ڕژد و تووشەکان و پڕە لە لێڕەوار، لە ڕووی زەریاوە ٢٥٠٠ پێ بڵندە، دووریی لە بارزانەوە نزیکەی ٢٤ کیلۆمەترە و شوێنێکی چاکی بەرگرییە لە باشووری بارزاندا.

ڕۆژی ٢٥ ئەیلوول مەلا مستەفا لەگەڵ هاوەڵەکانیدا گەیشتە گوندی «گریش»ی نێوان چیای ئاکرێ و چیای پیرس لە ٣٥ کیلۆمەتری باشووری بارزاندا، لەوێ زانیی فەوجی ٥ لە ئاکرێ و فەوجی ٤ لە ڕەواندزەوە بەیەکەوە دەست بەپێشکەوتن دەکەن.

مەلا مستەفا دەسبەجێ بەگەیشتنی ئەم زانیارییە لەبەرئەوەی بیری کردەوە ئەگەریێو لە هەردوو بەرەی باشوور و ڕۆژهەلاتەوە دەست بەهێرش بکرێ ئەوا هێزی چەکداری ئەو ناچار دەبێ لە هەردوو بەرەدا بەرپەرچی هێزی دەوڵەت بداتەوە و لەم بارەدا لە هەردوو بەرەدا دووچاری لاوازی دەبن و ژێرکەوتن دەبێ بەبەشیان، بۆیە بۆ دانانی چارەسەر و، هەڵوەشاندنەوەی پیلانی ناحەزان ڕێگەچارەیەکی هات بەبیردا و بڕیاری دا چل کەسی بژاردە لە پیاوانی خۆی دابەشی سەر چوار دەستە بکات و، شەوی ٢٧ی مانگ بەشەو بەرەو چیای ئاکرێ کە فەوجی ٥ داگیری کردبوو، لە چوار دەستی جیاجیاوە بەشێوەی خوارەوە بەڕێ کردن:

دەستەی یەکەم بەسەرکردایەتیی محەمەدئەمین میرخان.

دەستەی دووەم بەسەرکردایەتیی عەزیز ئاغای زێباری.

دەستەی سێیەم بەسەرکردایەتیی ڕەشید زێباری.

دەستەی چوارەم بەسەرکردایەتیی قورتاس کریابی.

دوای دانانی ئەو چوار دەستەیە، فەرمانی پێ دان لە سەعات ٢٤دا هەر کەسە و ٤ گوللە ئاگر بدات، ئەوجا تەقە ڕابگیرێ و پاش نیو سەعات لە نوێوە ٤ گوللەی تر ئاگر

بدرێ. ئەوجا دوای ئاگربڕ، شوێنەکانی خۆیان بەر بدەن و بەرەو گوندی گربیش پاشەکشە بکەن.

بەجێهێنانی ئەو فەرمانە بووە مایەی ئەوەی هێرشی فەوجی چوار لە ڕۆژی دیاریکراوی خۆیدا نەیەتە دی و ئەو حسێبەی سەرکردەی فەوج کردبووی بگۆڕێ. بەڵام فەوجی ٥ لە بەری ڕەواندزەوە ڕۆژی ٥ بەتاکی تەنیا دەستی کرد بەپێشکەوتن و لەبەرئەوەی لەم بەرەیەدا وەک لە پێشەوە گوترا بارزانییەکان بەسەرکردایەتیی شێخ محەمەد سدیق پێشتر خاڵی گرینگیان گرتبوو، هەتا دەمی ئێوارە زیانی گەورە بەفەوجی ٥ گەیشت. سەرۆکی فەوج کوژرا و فەوج ناچاری پاشەکشە بوو، پەنجا پارچە چەک، سێ بریێنی سووک، یەک بریێنی گران، بیست سندووق فیشەک، یەک دەزگای بێتەل، دوو هاوەن و برێک نارنجۆکی دەستی لە فەوجەکە بەدەسکەوت گیران.

بەو پێیەی شێخ محەمەد سدیق بە مەلا مستەفای ڕاگەیاند: لە بارزانییەکان تەنیا دوو مرۆڤ بریندار بوون و خۆیشی بەهۆی تۆپبارانەوە بەسووکی بریندار بوو و، سەرکردەییی هێزەکەی بە محەمەد ئاغای مێرگەسۆری راسپارد. بەو شێوەیە، پێشبینییەکەی مەلا مستەفا هاتەجێ و هێزی دەوڵەت دابەشی سەر دوو بەش بوون، بەو شێوەیەی دایبنابوو، جیاجیا لەگەڵیاندا کەوتە شەڕەوە و دەسپێشکەریی لە دەستی هێزی دەوڵەت ڕاپسکاند. هەر بەوەستاندنی پێشکەوتنی فەوجی ٥یش بەخۆی و هەموو هێزی چەکداریەوە کەوتە بەرەی فەوجی ٤ لە ئاکرێ. مەلا مستەفا شەڕگەی خۆی لەگەڵ فەوجی ٤ لە دەشتی نەهلەدا دامەزراند کە دەکەوێتە نێوان چیای ئاکرێ لە باشوور و چیای پیرس لە باکورەوە، لەبەری ڕۆژهەڵات تایەفەی سوورچی و لە ڕۆژئاوای ئەواندا تایەفەی زێبار هەڵکەوتووە و دەشتە. بەوشێوەیە هێزی خۆی وەک خوارەوە دابەش کرد:

هێزێکی ٢٠ کەسیی لە ژێر سەرپەرشتیی محەمەدئەمین میرخان و عەزیز ئاغادا بەرەو بناری چیای ئاکرێ ڕەوان کرد. دەبوو ئەم بیست کەسە بەسەر دوو گرووپی ١٠ کەسیدا دابەش ببن و ١٠ کەسیان لە داوێنی ڕۆژئاوای بەرەو باکور جێگر ببن و تەواو خۆیان مەڵاس بدەن. مەلا مستەفاش خۆی لەگەڵ ٢٠ کەسی تردا لە داوێنی چیای پیرس لە ژووانی هاتنی هێزی دەوڵەتدا چاوەڕوان بن. پاشماوەی تری هێزەکەی لە گربیش کۆکردەوە و فەرمانی بەهێزی محەمەدئەمین خان دا مافی ئاگربارانیان نەبێ تەنانەت دەبێ ڕێگەیش بەهێزی دەوڵەتی عێراق بدەن هەتا بەتەواوی بەوێدا تێ پەڕن و بەرەو باکور بڕۆن.

سەرلەبەیانیی رۆژی پێنجەم، فەوجی ٤ سەرەتا کەوتە تۆپهاوێژی و پاشان پیادە دەستی بە پێشکەوتن کرد، بەڵام بارزانییەکان بەهیچ جۆر ئاگریان نەباراند، فەوجیش بەدڵنیاییەکی وا کە هیچ کەس لەسەر رێگەی ئەواندا نییە، دەوامیان بە پێشکەوتنیان دا. هەر بەتێپەڕینی پاشکۆی فەوج بەبەردەم گرووپەکەی محەمەدئەمین میرخاندا، مەلا مستەفا دەستی بەدەسرێژ کرد، بەڵام فەوج بەرزاییەکانی پشت خۆی لە دەست چووبوو، ئیتر بۆ وەرگرتنی هەلوویستی بەرگریش رووی لە دواوە کرد، گرووپەکەی محەمەدئەمین میرخانیش دەستی کرد بەئاگر باراندن و، ئیتر فەوج رووی لە رۆژئاوا کرد، لەو شوێنەیشدا دەستەیەک لە بارزانییەکان لە گربیش بەهۆی مانۆڕێکی بەپەلەوە رێگەیان پێ گرتن و فەوج ناچار بوو روو لە رۆژئاوا بکات، لەوێش دوچاری ئاگرباران بووەوە و لە ئەنجامی ئەو بارە نالەبارەی فەوج بەسەری هاتبوو هەتا دەمی رۆژئاوابوون کەوتبووە بەر ئاگربارانێکی خەستوخۆڵەوە، ئیتر زیانێکی زۆر و زەوەندی پێ کەوت و لەم هەلومەرجەدا سێ رۆژ لەو شوێنەدا گەمارۆ درا. شەوی چوارەم، شیمانەی خۆبەدەستەوەدانی هێزە عێراقییەکە هەبوو، لەبەرئەوەی خواردنیان بەکۆتا هاتبوو. بەڵام بەپێی زانیاریی دروست، خێڵانی سوورچی باری سێ سەت وڵاخ خواردنیان بەشەو گەیاندبووە فەوجە عێراقییەکە و پاشان سێ سەت مرۆڤی چەکداری سوورچیش بەفریای فەوجەکە گەیشتن و لە گەمارۆ دەربازیان کردن.

مەفرەزەکانی بارزانی بەرەو چیای پیرس پاشەکشەیان کرد بەڵام زیانی فەوج زۆر و زەوەندە بوو. بەڕادەی ٢٨ تفەنگ، دوو برێنی سووک، سەت و شێست و هەشت گوللەتۆپ و رادەیەکی گەورە لە سندووقی فیشەک بە وڵاخەوە کەوتنە دەستی بارزانییەکان.

دواتر مەلا مستەفا چووە چیای پیرس و لەگەڵ تفەنگهاوێژانی خۆیدا ئەوێیان هاوێشتە بن دەست و کەوتنە خۆشکردنی سەنگەرەکانیان. بەڵام لەو شوێنە، چیای پیرس لە هەرلاوە بەفەوجی ٤ و خێڵانی سوورچی و نزیکەی ٣٠٠ کەس لە خێڵی بەرواریی باڵا و شەرەفانی و دۆسکیی عێراقی و نزیکەی ٥٠٠ کەس لە خێڵانی زێبار کە پێشتر لەگەڵ مەلا مستەفادا بوون، لەگەڵ نێزیکەی ٤٠٠ کەسی تر لە هێزی سوپای عێراق یارمەتییان دەدان، هەموو بەیەکەوە لە دژی بارزانییەکاندا دەستیان بە هێرشبەری کرد. بەچەپاوی یەک لەسەر یەک و توندوتیژ، بەتایبەتیش پەلاماری ئاسمانی و بۆردمانی ٢٥ باڵەفڕە و

تۆپخانە توانیان بارزانییەکان بەرەودوا ببەن. ئەوە بوو مەلا مستەفا و پێڕەوکارانی خۆی، بەشەو لە چیای پیرسەوە بەرەوپاش کشانەوە و دوای پەڕینەوە لە زێی گەورە و گرِ تێبەردانی هەموو کەڵەکەکان، لەوبەری زێ لە چیای شیرین شوێنی بەرگرییان گرت و بەدزی هەواڵی دایە شێخ ئەحمەد کەوا بۆ ئەوەی بارزانییەکان لە مەترسیی باڵەفڕە بپارێزرێن پێویستە بەشەو گوند بەجێ بهێڵن و بەتەواوی خاوخێزانەوە رووەو ئێران بەڕێ بکەون. لە «کانی رەش» مەلا مستەفا لەگەڵ نێزیکەی ۲۰۰ کەسدا پاشکۆی هێزی بارزانییەکانی پێک هێنا بۆ ئەوەی تێکڕای خێزانەکان لە کێلەشین کە دوا خاڵی سنووری ئێران و عێراق بوو بپەڕنەوە، لە بارێکدا کە باڵەفڕە بەردەوام بۆمبابارانی دەکردن. ئیتر لەو کاتەی بەهۆی زنجیرەی رووداوە سیاسییەکانەوە هێزی پاسەوانیی سنوور لە ناوچەی ئازربایجاندا نەبوو، ئەو کوردە باسکراوانە بەپێچەوانەی بڕیاری وڵات لە زەویی عێراقەوە ئاوای وڵاتی شاهەنشایی بوون.

وەک پێشتر گوتمان، بارزانییەکان پیاوی شەڕوان و ئازا و گیان لەسەردەستن و لە بەرامبەر سەرۆکانی خۆیاندا گوێ بەفەرمانن. فەرمانی گەورەی خۆیان وەک بڕیاری ئاسمان دەژمێرن و بێ چەند و چۆن جێبەجێیان دەکەن، هەروەها گوێڕایەڵی و ڕێزپارێزیی واتایەکیی ڕێکوپێکیان هەیە، هەر ئەم رەوشتانەشە ئەوانی بۆ ماوەیەکی درێژ لە دژی دەوڵەتی عێراقدا بەسەرپێچیکەر راگرتووە و هەتا ئەم دواییەش حکوومەتە کاتییەکان نەیانتوانیبوو چۆکیان پێ دابدەن.

خاڵێک شایەنی سەرنج بێ ئەوەیە شەڕکەرانی بارزانی یەک گوللەی خۆیان بەفیرۆ نادەن و پێیان وایە ئەو دەمە گوللە دەهاوێژرێ کە لە بەرامبەردا گیانێکی پێ بێ گیان ببێ و بکەوێتە خوار. بەتایبەتیش لە کاتی شەڕدا بەلەتێک نانی وشک ژیان دەکەن و لە وەرزی زستانان و لەوپەڕی سەرماوسۆڵەدا سەرەڕای نەبوونی جلکی پێویست ماوەیەکی زۆر لە لوتکە چیای بەفرگرتوودا لە سەنگەری خۆیان بەرگری و خۆڕاگری دەکەن، ئەوەندەش رەقەکاری و سەرسەختی پێشان دەدەن کەوا یان دەبێ دوژمن لەبەرامبەریاندا بەچۆکدا بکەوێ یان ئەوەتا خۆیان دەکوژرێن.

پیاوانی بارزانی، بێ رادە نەترس و بێباکن. لە پێکدادان و رووبەڕووبوونەوەی خوێناویی نێوان هێزی سوپا و پیاوانی ئەم خێڵەدا، ئەو بابەتە بەتەواوی ئیسپات بووە. خێڵانی بارزان هەتا چەند هەنگاوێک لە زرێپۆشی شەڕکەر نێزیک دەبوونەوە و بەوپەڕی

خەست و خۆڵی ئاگرباران دەکران، پاشەکشێیان نەدەکرد. بەئازایی درێژەیان بەپێشکەوتنی خۆیان دەدا هەتا ئەوەی زرێپۆشە شەڕکەرەکە ئەوانی بەبن دەدا و دەیپلیشاندنەوە.

لەوەی سەرەوەڕا ئەوە دەردەکەوێ کە خێڵی بارزان یەکێکە لە چاکترین خێڵانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لەوانەیە لە رووی ورەی بەرز و چەکداری و تەقەمەنییەوە هاوتای ئەوان نەبووبێ و نییە، ئەمەش یەکەمجار بوو سوپای ئێران لە شەڕی خێڵاندا رووبەڕووی هێزێکی وەک بارزانییەکان ـ کە لە هەموو روویێکەوە رێک و تەیار بوون، دەستەویەخە ببێتەوە و بتوانێ بەڵای ئەوان لەکۆڵ بکاتەوە و لە زەویی ئێرانیان بەدەر بنێ.

نەخشە ١:     زۆربەی کوردستانی ئێران و عێراق
(شوێنی نیشتەجێ بوونی خێڵان)

سەرچاوە: ئیگلتن

لە تاران، لەو رۆژانەی کوردستان بەشێوەی زەریایەکی شەپۆلاوی خۆی دەنواند و مەترسیی ئەوە هەبوو بچووکترین کەمتەرخەمی لەلایەن بەرپرسیارانی سیاسی و سوپاوە زەبرێکی گەورە لە رەوتی گشتی بسرەوێنێ، ئەو کاتە دەوڵەت لە بارودۆخی بارزانییەکان و هێزی سوپا لەو ناوچانە تەواو ئاگەدار بوو و وەک هەموو جارێکیش نەیدەویست گیروگرفتێکی بەئاشتی رێگەچارەی هەبێ، ئەو بەگولله و شمشێر لە ناوی ببات. ئیتر بەپەسندی زانی مەلا مستەفای بارزان و دوو لە هاوەڵانی ئەو بۆ وتوویژ لە تاران گاس بکات هەتا ئەگەر داوایەکی بەجێیان هەبێ ئەوا بەچاوی بایەخەوە سەرنجی لێ بدرێ و خۆ لە خوێنرشتنی بەخۆڕایی و خەرجیی لابەلا بپارێزرێ.

دوای ئەم بڕیارە، لەلایەن ئەرکانی سوپاوە فەرمان درایە سەرکردەی فیرقەی چواری هێزەکانی کوردستان هەتا مەلا مستەفای بارزان بەنیازی وتوویژ بانگ بکەن بۆ تاران. لە جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانەدا، سەرکردایەتیی فیرقەی چوار، مەلا مستەفای بارزان و میرحاج و عیزەت عەبدولعەزیزی بەهاوەڵەتیی عەقید عەلی ئەکبەر غەففاری رەوانەی تاران کرد. مەلا مستەفا کە تەواو ئاگەداری توانای سوپای ئێران بوو، سوودی لەم هەلە وەرگرت و ئامادەیی خۆی بۆ دەست پێ کردنی وتوویژ راگەیاند و ئامادە بوو ڕا و بۆچوونەکانی خۆی لەگەڵ بەرپرسیارانی سوپادا باس بکات، بەهەمان شێوەیش نیازی دەوڵەت ئەوە بوو پرسی بارزانییەکان بەبێ خوێنرێژی چارەسەر ببێ.

لە تاران، بەفەرمانی ئەرکانی سوپا، دەمڕاستانی بارزانی لە یانەی سەربازگەی فیرقەی یەک لە ناوەندی «باخی شا»دا حەواندرانەوە و بەوپەڕی گەرمییەوە پێشوازی لە مەلا مستەفا و هاوەڵانی کرا. ئەم سێ پێشنیازەی ژێرەوە، لەلایەن ئەرکانی سوپا و بەرپرسیارانی سەرپشک ـ ەوە پێشکێشی ناوبراوان کرا هەتاکو هەر کیهەیان بەباش زانی پەسندی بکەن:

(١) ئەگەربێتو خێڵی بارزانی بیانەوێ لە ئێران بمێنن، دەبێ سەرجەم چەکی خۆیان بەدەستەوە بدەن و، لە کوردستانەوە بەرەو شوێنێک کۆچ بکەن کە دەوڵەت بۆیانی دەستنیشان بکات. ژمارەیەک لەو گوندانەی ساف هی دەوڵەتن لەژێر دەسەڵاتی ئەوان دابندرێ و بۆ ماوەی شەش مانگیش دەوڵەت بەشێوەی یارمەتی هاوکارییان بکات و خەرجییان بۆ دابین بکات هەتا بەوپەڕی دڵنیایی خەریکی ژیانی رەنجبەریی خۆیان بن و لە بەزەییی دەوڵەت خاترجەم بن.

(٢) دەوڵەتی ئێران پارێزگاری لەو کەسانەی ناو تایەفەکانی بارزانی دەکات کە پێشینەی مەحکوومییەتیان هەیە و ڕێگەیان پێ دەدا لە ئێران بمێنن، بەڵام ئەوانیتر دەبێ دەمودەست لە زەویی ئێران بچنە دەرەوە.

(٣) لە بارێکدا ئەگەر هەردوو مەرجی سەرەوە بەپەسند نەزانن، ئەوا دەبێ بارزانییەکان دەسبەجێ بەخۆیان و خاوخێزانیان لە زەویی ئێران دەربچن و لەو ڕێگەیەی لێوەی هاتوون بگەڕێنەوە وڵاتی عێراق.

لەبەرئەوەی مەلامستەفا نەیتوانی لە ئاست ئەو مەرجانەی سەرەوەدا بڕیارێک بدات رایگەیاند کەوا ئەو خاڵی پێشنیازانەی دەوڵەتی ئێران شایەنی ئەوەن لەگەڵ بەرپرسانی تری خێڵدا راوێژیان لەسەر بکرێ و ئەنجامەکەشی دوای گەڕانەوەی بۆ ناوچەکە دەخاتە بەردەمی دەوڵەت.

مەلامستەفا لە مێژووی نۆیەمی مانگی ڕێبەنداندا (٢٨ کانوون ٢) لە تاران وەدەرکەوت و گەیشتەوە مەهاباد، پاش گەیشتنی بە ئەوێ، ئەو مەرجانەی دەوڵەت پێی راگەیاند بوو لەگەڵ بەرپرسانی تری خێڵدا باس کرد. گفتوگۆی مەلا مستەفا و بەرپرسانی بارزانی لە بارەی پێشنیازەکانی دەوڵەتەوە گەیشتە ئەو ئەنجامەی کەوا دوو پێشنیازی یەکەم و دووەم بەهیچ جۆر ڕێی پەسندکردنیان نییە بەڵام بەشی سێیەمی پێشنیازەکە واتە گەڕانەوەی تێکڕای بارزانییەکان بۆ خاکی عێراق دەشێ پەسند بکرێ. بۆ چوونەوە بۆ زەویی عێراقیش، بەگوێرەی فەرمانی دەوڵەتی ئێران دەبێ بارزانییەکان سەرەتا لە شنۆ کۆببنەوە و پاشان بڕۆنەوە عێراق. ئەو مۆڵەتەی دەوڵەت بۆ بارزانییەکانی دەستنیشان کردبوو پازدەی مانگی ڕێبەندان بوو.

لێرەدا، شایەنی بەبیرهاتنەوەیە کە بارزانییەکان بەهۆی رابردووی پڕ لە گێژاو و گۆڕانی خۆیان و ئەو بێ بەڵێنییەی لە فەرمانبەرانی سیاسیی دەوڵەتە جۆراوجۆرەکانەوە بینیبوویان، لە هەڵسوکەوت لەگەڵ دەرەوەی خۆیاندا بزێوترین مرۆڤیان لێ هەڵکەوتبوو. بۆ بەبیرهێنانی ئەمە هێندە بەسە بگوترێ کەوا لەو دیمانەیەی بەندە لەگەڵ شێخ ئەحمەددا کردم، وەک چۆن باس کرا، پێیان گوتم کە لە نێوان بارزانییەکاندا ئەفسەری ئێرانی، بیانی یا ئاسووری نییە، لە کاتێکدا پاش گەڕانەوەیان بۆ عێراق و دوای کشانەوەیان لە پێش هێرشی سوپای ئێران، ژمارەیەک لە ئەفسەرانی ئێران و ئاسووری لە ناو زەویی وڵات و لە ناو زەویی عێراقدا بەدیلی کەوتنە دەستی هێزی ئێران. لە لایەکی ترەوە ئەوان

بەڵێنیـان دا لە بریتی وەرگرتنی گەنم لە سوپای ئێـران دوو تۆپی چیـاییی ٧٥ی، کـە لە هێزی دێموکراتی ئازربایجانەوە بەجێ مابوو، بدەنەوە بە بەرپرسیارانی سوپا. لە بەرامبەر ئەمەشـدا ئەوان گەنم و قـەند و شـەکری خۆیان وەرگـرت بەڵام لە دانەوەی ئەو دوو تۆپە چیـاییـیـەدا خۆیان نەدایە دەست. جگە لە بارزانیـیـەکـان خۆیان، سەرۆکـانی ئەم خێڵـە راوێژکـاری ئەوتۆیـان هەبوو کـە بەهیچ شـێـوە نەیاندەویست ئاشـتـەوایی لە نێـوان خـێـڵی بارزان و دەوڵەتی ئێراندا بێتە ئاراوە.

لەلایەکی تر، پێـشـنیـازی بارزانیـیـەکـان بەلای دەوڵـەتەوە شـایەنی پەسندکـردن نەبوو، لەبەرئەوەی دەیانگوت ئێـمـە ئێـرانمان خـۆش دەوێ و دەمـانەوێ سـەربازی دەوڵـەت بین و شـایەنی ئەوەین دەوڵەت ئێـمـە بەچەکـداری بۆ یەکێ لـە ناوچەکـانی نـاو وڵات کـۆچ پێ بکات. بەڵـگەنەویسـتـە ئەم پێـشـنیـازە بۆ ئێـران لە پەسندکـردن نەدەهات و دەوڵەت نەیدەتوانی خێڵی بارزانی بێ چەک لێکردنەوە لەناو زەویی ئێراندا نیشتەجێ بکات.

بابەتێـک شایەنی سەرنج لـێ دان بێ ئەوەیە دەوڵەت پاش ئەوەی بارزانیـیـەکـانی ناسی بۆچی رێگەی دا مەلا مستـەفا تـاران بەجێ بهێڵێ و بچێـتەوە ناو خێڵی خۆی و ئەم سەر ئێشـەیە بنێـتـەوە؟ سـەرەتا پێـویسـتـە بزانـدرێ کـوردانی دانیـشـتـووی ناوچەی شنۆ هەتا سنووری ئاراس کە بریتین لە تایەفەکانی زەرزا و برێک لە مامەشی قادری خاوەنی ٣٠٠ پارچە چەک و، هەرکـیـیـەکـانی «رەشـیـد بەگ و نووری بەگ کـە شـەڕاویتـرین تایەفـەی دەوروبەری مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕن، خوالێـخۆشبوو موقـەددەم مافی بەدەسـتی ئەمانە هاتە کوشتن» خـاوەنی شەشسـەت پارچە چەک و شکاکـەکان بەسەرکـردایەتیی سمایـل ئاغـای سـمکۆ بە ١٥٠٠ پارچە چەک و، دواجـاریش جەلالیـیـەکـان بەدوو هەزار پارچە چەکـەوە بەسەرکردایەتیی عـومـەر ئاغای کوڕی خالید ئاغـای بەناوبانگ، هەموویان بەسـەریەکەوە نێزیکەی چوار هەزار و سێسەت پارچە چەکیـان بەدەستەوە بوو. چەکداربوونی هەمـوو ئەم تایەفـانە کـە هەمـوویان هەریەکـە و پێـشـتـر لە ڕاستـی خـۆیەوە گـۆنگەرێکـی نابووەوە و، مەترسیی ئەو کارەی لێیان دەوەشایەوە شایەنی تێبینی بوو، بۆیە ئەگەر مەلا مستـەفا لە تاران دەسبـەسـەر بکرایە ئەوا تێکڕای ئەم لایەنانە تەواو شـێـرگـیـر دەبوون و مـتـمـانەیان نەدەمـا و لـەگـەڵ بارزانیـیـەکـاندا بەرەیەکی یەکگرتوویان لە بەرامـبـەر هێـزی سـوپا لە سـەرانسـەری ئەم ناوچەیەدا پێـک دەهێنا. کـپکردنی ئەم هێزەش لەگەڵ ئەو پشتـەوانییـەی لەوانە بوو لە دەرەوە بۆیان بێ، دیـار نەبوو بە چ نرخـێـک بۆ سـوپا تەواو دەبـوو. ئەمـە بوو

ئەنجامی چاوەڕوانکراوی گرتنی مەلا مستەفا و سێ کەسە هاوەڵەکەی لە تاران کە دەبووە مایەی ئەوەی سوپا بەبۆنەی سێ چوار کەسەوە مرۆڤگەلێکی گەورەی بەڕوودا ڕاست ببێتەوە. جگە لەمانە، ئەنجامێکی رەوشتەکی کە لە سەرینیی ئەم کارەوە بەرۆکی بەرپرسانی سوپای شاهەنشاییی دەگرتەوە، ئەوە بوو لە بەرچاوی سەرتاسەری تایەفە و خێڵەساتی ئێراندا هەتا هەتایە بەدەردانەوەیەکی نالەباری دەبوو و ئیتر کەسێک باوەڕی بەزار و کاری دەوڵەت نەدەهات.

بەتایبەتیش دوای ئەوەی دەفتەری بیرەوەریی میرحاج لە قەرەقۆین کەوتە دەست، لەو دەفتەرەدا نووسرابوو مەلا مستەفا لە دواین جاردا پاش ئەوەی لە شێخ ئەحمەد جودا دەبێتەوە و دەچێتە بارزان لە دەوڵەتی عێراق داوا دەکات بەڵکو بەدەرکردنی لێبوردنێکی گشتی لە کەمتەرخەمییەکانی ئەوان خۆش ببێ هەتا ئەمانیش چەک دابنێن، بەڵام دەوڵەتی عێراق بەمە رازی نابێ و خۆ بەدەستەوەدانی بێ مەرج و ئەملا و ئەولای دەوێ. بەواتەیەکی تر، دەوڵەتی عێراق لەبەرئەوەی نەیدەویست لە کەموکورتییەکانی مەلا مستەفا چاو بپۆشێ بۆیە رازی نەبوو بەڵێنێکی پێ بدات پاشان لێی پاشگەز ببێتەوە.

ئەم کارە بۆ سوپای شاهەنشایی و دەوڵەتی ئێرانیش بەهیچ شێوەیەک کاری کردەنی و شایەن نەبوو. لەبەرئەوەی لە وڵاتێکدا سێ یەکی دانیشتوانی بریتی بن لە خێڵات و، دەوڵەت بەردەوام بەرەوڕووی ئەم جۆرە پرسانە ببێتەوە پێویستە قسە و کردەوەی کاردارانی دەوڵەت ڕێزیان لێ بگیرێ. وێڕای ئەمە ئێران لەم پەیمان شکێنییانەوە هیچ ئەنجامێکی چاکی بەدەست نەکەوتبوو. هەروەکو بینیمان، لە ئەنجامی کردەوەی فێڵبازیی عەمیدی پێشوو عەباس ئەلبورز لە ئاست خێڵاتی «کۆهەک»دا کە سوێندی بەقورئان بۆ خواردبوون، پاشانیش گرتنی و بەو شێوە جەرگبڕە گوللەبارانی کردن، ئیتر سێزدە ساڵی سەرلەبەر تێکڕای بلووچستان ڕواڵەتی هێمنیی بەخۆیەوە نەبینی و دەوڵەت هەموو مەساریفی ئەو لەشکرکێشییانەی لەپێناو دامرکاندنی خێڵانی بلووچ و دابینکردنی ئاسایش لەو ناوچەیەدا کێشا.

هەر بەم هۆیانەی سەرەوە بوو کاتێ مەلا مستەفا لە تاران ڕاشکاویی لە پەسندکردنی مەرجەکان پێشان نەدا، رۆژێکیان سەرۆکایەتیی ئەرکانی سوپا لە بارەگای خۆیدا پێی گوت: «مەلا مستەفا ئێوە مەرجەکانی ئێمە پەسند بکەن یا نەکەن، ئێمە بەساغی دەتانگەڕێنینەوە ناو تایەفەی خۆتان. ئینجا ئەگەر پەسندتان کرد ئەوا باشە، ئەگەرنا ئێمە

شەڕتان لەگەڵدا دەکەین و لەناوتان دەبەین».

وەک سەرنج دەدرێ، تەواوی ئەو بڕیارانەی وەزارەتی شەڕ وەری گرتبوون بەبەڵگەی هێزدار پشت ئەستوور بوون. بەم پێودانگە و بەو راشکاوییەی دەوڵەت لەگەڵ مەلا مستەفادا نواندبووی، وا چاوەڕوان دەکرا بارزانییەکان پێشنیازی سێیەم بەپەسند بزانن، بەپێی ئەو بەڵێنانەی دابوویان و ئەو پەیمانەی لە تاران و مەهاباددا بەستبوویان، دەبوو بێ پێکدادان زەویی ئێران چۆڵ بکەن. بەڵام سیاسەتێکی تریش لە کایەدا هەبوو نەیدەویست بارزانییەکان بەبێ هەیهاو لە ئێران بڕۆن، ئەو سیاسەتەش سیاسەتی قازی محەمەدی سەرۆکی کۆمەڵەی کوردستان و سەرکۆماری کوردستان بوو.

لایەنگرانی قازی محەمەد لەو رۆژانەی ئەو لەگرتووخانەدا بوو، بەندیواریی خۆیان لەگەڵ بارزانییەکاندا هێشتبووەوە و بەهیوای رزگارکردنی قازی محەمەد هانی بارزانییەکانیان بۆ بەرگری و دەسوەکەری دەدا. لە ئاست هەموو ئەم کەسە بەرهەڵستانەدا کاردارانی سوپایی لە تاران و نەغەدە، بەتایبەتیش عەقید غەفاری لە شنۆ ناچاری ململانەیەکی توند بووبوون.

چالاکیی لایەنگرانی قازی محەمەد و بەندیواریی ئەوان لەگەڵ بارزانییەکان و هەبوونی کەسانی دژ بەئاشتیی نێوان دەوڵەت و بارزانییەکان، بووبوونە مایەی ئەوەی هەر بڕیارێکی چ نووسەکی چ زارەکی لە شنۆ لەگەڵ شێخانی بارزانیدا بدرێ، شەوی دواتر ببێ بەبڵقی سەر ئاو. دوای دیمانە جار لە دوای جارەکان لەگەڵ شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا و، پاش ئەوەی بۆ دەسەڵاتدارانی سوپایی لە کوردستان و تاران بەدیارکەوت کەوا بارزانییەکان بەهیچ جۆر نیازی ئەوەیان نییە بڕیارەکانی دەوڵەتی ئێران جێبەجێ بکەن، جارێکی تریش لەلایەن ئەرکانی سوپاوە گەف لە سەرۆکانی خێڵی بارزان کرایەوە کە دەست هەڵگرن و بەهەمان شێوەی لە تاران گوترابوو، بەچەک دانان یا رۆیشتن لە ئێران ئامادەبن.

هەمان کات، ئەرکانی سوپا فەرمانی بەسەرکردەی هێزی کوردستان دا کەوا شەڕ لەگەڵ بارزانییەکاندا بێ چەند و چۆن و نێزیکەپەرێزە و، سەرۆکانی خێڵی ناوبراو دەیانەوێ سوپای ئێران بەرەو ناوچە کێواوییە دژوارەکان رابکێشن و لە رۆژانی زۆر سەرما و سۆڵەدا دەستی لێ بوەشێنن، بۆیە وا چاترە هەر لە ئێستەوە بڕیاری پێویست بۆ گەمارۆدانی بارزانییەکان وەربگیرێ و هەتا بکرێ ئەڵقەی گەمارۆیەکە بێ پێکدادان و خوێنڕێژی

بەرتەسک بکرێتەوە، هەتا، یەکەم: لە کاتی ڕوودانی پێکداداندا کەمتر زیانی گیانی و ماڵی بەدانیشتووانی بێ وەی بکەوێ، دووەم: کاری هێزی سوپا بەهۆی کورتبوونەوەی هێلی بەرەوە ئاسانتر ببێ.

ڕۆژی پازدەیەمی مانگی ڕێبەندان(واتە ٣ شوبات) مۆڵەتی دیاریکراوی ئەرکانی سوپا بۆ بارزانییەکان بەکۆتا دەهات، ئەرکانی سوپا فەرمانی دایە فیرقەی چواری کوردستان هەتا گەف لە سەرۆک تایەفەکانی بارزانی بکات یا هەرچی زووترە ئاخی ئێران بەجێ بهێڵن یا ئەوەتا خۆیان بۆ شەڕ تەیار بکەن. بارزانییەکان لە وەڵامی گەفی سەرۆکی فیرقەدا پەنایان بۆ هەمان تاکتیک بردەوە. بەم شێوەیە، خێزان و ماڵەکانیان کە لە نەغەدە، قەڵای پەسوێ، سۆفیان، جلدیان و سنووری خانە جێ نیشتە بووبوون بەرەو لای شنۆ بزواند و جووڵەیەکی گرینگ بەنیازی ڕۆیشتن بۆ سنووری عێراق و بەجێ هێڵانی خاکی ئێران لە نێوان مرۆڤگەلی ئەم خێڵەدا کەوتە بەرچاو.

سەرنجی کاردارانی سوپا و ئەو ڕاپۆرتانەی لە بارەی بزاوتی بارزانییەکانەوە بەسەرکردایەتیی فیرقەی چوار دەگەیشتن، پێدا پێدا بوونە هۆی پەیدابوونی گومانێکی گەورە. لەبەرئەوەی کاردارانی هەواڵگریی فیرقە ڕاپۆرتیان دا کەوا بەپێچەوانەی چاوەڕوانی، یەکەم: کۆچی بارزانییەکان گەلێک هێواش و سەبرۆکە دەچێتە ڕێوە، دووەم: سەرۆکانی خێڵی بارزان دەستیان داوەتە کارێکی سەیر و سەمەرە، لە بنەوە کەوتوونەتە بەستنی پێوەندی لەگەڵ سەرۆکانی خێڵی هەرکی و شکاک و کەسانی وەک زێرۆ و تەها و تایەفەکانی دەشتەبێڵ کە هێشتە چەکیان دانەناوە و، ناچاریان کردوون هەتا لە هەموو شوێنێکدا لە دژی هێزی دەوڵەت دەست بە کار و دەسوەکەری بکەن.

ئەرکانی سوپا لە ناو ئەم ڕووداوانەدا بوو، بەهۆی کارسازی و دوورەزەینییەکی تایبەت کە لەلایەن سەرۆکایەتیی هێزی کوردستانەوە دەهاتە نواندن، لە بچکۆلەترین گۆڕانکارییەک کە لە بارودۆخی سەرۆکانی ئەم خێڵەدا ڕووی دەدا، ئاگەداریی هەبوو. ڕۆژی بیست و چواری مانگی ڕێبەندان فەرمانێکی ناوکۆیی بەسەرۆکانی فیرقەی ٣ و ٤ و لیوای ورمێ «قائید فیرقە زەرابی، قائید فیرقە هومایوونی، عەمید زەنگەنە» دا بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی دەوڵەت لە بارەی دەسپێشخەریی پێویست بەنیازی چەککردنی تایەفەکانی کورد لە باکور و باشووری ورمێ و کۆچباری بارزانییەکان بەرەو ناو ئاخی عێراق. بۆ ئەوەی فیرقە ناوبراوەکان ئامادەی بەڕووداهاتنی هەر پێشهاتێکی

نالەبار بن، چەند کاروانێکی لە هێزگەلی کوردستان بۆ چەک لێ سەندنی تایەفە دەستنیشان کراوەکان بەسەرۆکایەتیی ئەفسەرانی ناوهاتوو لە خوارەوە و پێکهاتوو لەم یەکە پێکەوەنراوانە دیاری کرد و فەرمانی پێ دان هەتا رۆژی بیست و هەشتەمی ریبەندان لەگەڵ کاروانی ناوبراودا، لەو خاڵانەی ئەرکانی سوپا دەستنیشانی کردبوون جێگیر بن.

لە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا لە بارەی ناوی یەکە و توانای کاروانە سوپاییەکان هیچ باسێک نەکرا، بەڵام ئەمرۆ سێ ساڵ بەسەر ئەو رووداوەدا ڕادەبوورێ، ناوهێنان و تۆمارکردنی ناوی یەکەکان لەڕووی سوپایی و سیاسییەوە چ زیانێکی نییە. بۆ ئەوەی یادێک لە خۆبەختکەریی ئەفسەر و سەربازان بکرێتەوە و ناوی ئەو یەکانەی لە ئۆپەراسیۆن (کردەوە)ەکاندا پشکدارییان هەبوو هەتا هەتایە زیندووبێ وا بەدرێژی باسیان دەکەین.

کاروانگەلی کردەوەکان لە سەرەتای رووداوەکاندا بەشێوەی خوارەوە رێک خرابوون و ئەرکی هەریەکەیانیش بەم پێیە بوو:

(١) کاروانێک لە ژێر سەرۆکایەتیی عەمید زەنگەنە لە باڵانش، پێک هاتبوو لە بەتالیۆنی ١ و ٢ی فەوجی بەهادر، جگە لە سریەیەکی فەوجی ئاهەن، بەطرییەیەکی ٧٥ی، سریەیەکی هاوەن، تیپێکی سوارە لە فەوجی فەوزیە، دوو زریپۆشی شەڕ لە فیرقەی یەک و بێتەلێک، بەنیازی چوونە ناو گەلیی قاسملو و گرتنی ئاقبلاغ و لەناوبردنی زێرۆ و تەها. هەروەها ئەم کاروانە ئەرکی ئەوەیشی پێ سپاردرابوو رێگە لە پێوەندیکردنی پیاوانی بارزانی بەپیاوانی زێرۆ و تەهاوە ببەستێ.

(٢) کاروانێک لە ژێر سەرۆکایەتیی عەقید ئەنساری لە مەهاباد، پێک هاتبوو لە دوو بەتالیۆنی پیادە، بەطرییەیەکی ٧٥ی، تیپێکی هاوەن، بەتالیۆنی سوارەی لورستان، دوو زریپۆشی شەڕ «لە حەسەنلو»، بۆ مەبەستی گرتنی نەغەدە و بۆ کۆچ پێ کردنی خێڵی بارزانی لە ناوچەی نەغەدە و ئاواییەکانی دەوروپشتی شنۆ و سەر سنووری عێراق.

(٣) کاروانێکی تر لە مەهاباد لە ژێر سەرۆکایەتیی رائید کلاشیدا، پێک هاتبوو لە بەتالیۆنی یەکی پیادەی فەوجی هەمەدان، تیپێکی تۆپخانەی ٧٥، دوو هاوەن، بۆ مەبەستی قەڵای پەسوێ و کۆچ پێ کردنی تایەفەکانی بارزانی لە ناوچەی

گردەسپیانەوە بەرەو شنۆ و سنوور و سووککردنی کاری کاروانی عەقید ئەنساری.

(٤) کاروانی خێڵات لە سنووری خانە «پێک هاتبوو و لە خێڵاتی مەنگوڕ و مامەش» بەسەرۆکایەتیی ملازم دووەم نوبەهار لە ناوچەی پیران «بادین ئاوا»، بۆ مەبەستی پاشەکشە پێ کردنی خێڵانی بارزانی بەرەو ڕووکاری ژوورووی خانە و شنۆ و سنووری ئێران - عێراق.

(٥) کاروانێکی تر لە مەهاباد، پێک هاتبوو لە سێ بەتالیۆنی پیادە، بەطریەیەکی ٧٥ و یەکەیەکی سوارە و دەستەیەک تەماتیک و دوو زریپۆشی مامناوەندی، چوار زریپۆشی سووک و فەوجی سوارەی فەوزیە «لە کۆسەی کاریز»، بۆ مەبەستی پێکهێنانی هێزی سپێری سەرکردایەتی.

(٦) تیپێکی ئاسمانی، پێک هاتبوو لە حەوت باڵەفڕەی هاینە و دوو باڵەفرەی «تایگەر مەوس» لە ژێر دەسەلاتی سەرۆکی هێزدا بوو. دوای دیاریکردنی کاروان و سەرۆکەکانیان، بۆ ئەم ئۆپەراسیۆنە، ئەم فەرمانەی خوارەوە لەلایەن ئەرکانی سوپاوە بەمەبەستی یەکخستنی هەوڵی یەکەکان، بۆ سەرۆکی هێزگەلی کوردستان دەرچوو:

یەکەم: هەموو کاری کاروانەکان لە ژێر چاودێریی لیوا هومایوونیدا ڕێنوێنی دەکرێ و بەڕێوە دەبرێ.

دووەم: جاری یەکەم پێویستە کاروانی عەمید زەنگەنە زووتر لەوانیتر بێتە ناو کار پێش ئەوەی بارزانییەکان خۆیان بگەیننە زێڕۆ و تەها و هەرکییەکان، ئەوان سەرکوت و تەفروتوونا بکەن هەتاکو بارزانییەکان نەتوانن بەپیاوانی زێڕۆ و تەها و هەرکییەکان رابگەن و هاوکارییان بکەن و مەیدانی پێکدادان بکێشنە ناوچەکانی سەروو و نێزیکی ورمێ.

ڕۆژی دووەمی مانگی ڕەشەمە، ئەرکانی سوپا فەرمانی دایە سەرۆکایەتیی فیرقەی چوار و هێزی کوردستان کە بەپێی ئەو ئاگادارییانەی کەوتوونەتە دەست، بارزانییەکان بڕیاریان داوە بەپێچەوانەی ئەو بەڵێنەی درابوو، لە بەرامبەر هێزی ئێراندا بووەستنەوە و بەهەر فێڵێکی بۆیان بلوێ سوپای ئێران بۆ ناوچە کێواوییە رژد و تووشەکان رابکێشن. دوای گەیشتنی ئەم فەرمانە، لیوا هومایوونی تەبای عەقید غەفاری لە نەغەدەدا دیمانەی شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفایان کرد و لە بارەی ئەو پەیمانەی دابوویان کەوتنە وتوویژەوە.

ئەو دیمانەیە بەسەرکەوتنێکی گرینگ بەکۆتا گەیشت. لەبەرئەوەی وێڕای باردۆخی پڕ

مەترسی و هەبوونی ماکەی گێرەشێوێنی، بەتایبەتیش ئەفسەرانی بارزانی کە لە سوپای عێراقدا خزمەتیان کردبوو و سزای لە سێدارەدانیان بۆ دەرچوو بوو و، زۆر دژی ئەوە بوون بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان، نەیاندەویست ئەم وتوێژانە بگەنە هیچ ئەنجامێک، تەنانەت هێندەیشی نەمابوو ئەم هاندانانە ببنە مایەی ڕووداوێکی دڵتەزێن، بەڵام بەدان بەخۆداگری و بڕوا پتەوییەک کە لە لایەنی سەرۆکی فیرقەوە بەکارهات، ئەنجامی گەش بەدی هاتن و بارزانییەکان قایل بوون نەغەدە و گردەسپیان و ناوچەکانی خێڵی پیران و مامەش چۆڵ بکەن و هەرچی زووترە بەرەو ناوچەی سەلدووز و شنۆ بڕۆن.

لەم دیمانەیەدا بارزانییەکان چییان گوتبوو ئاوهایان کرد بۆیە ڕۆژی دواتر هێزی سوپا لە نەغەدە بەکەیس بوو کە شوێنێکی پڕ گرینگە، هەروەها سەرتاسەری ناوچەی لاهیجان لەلایەن سەربازانەوە گیرا و ڕێگەی چەوڕێژی عێراق (خانە)یش ڕزگار کرا. هۆی ئەوەی بارزانییەکان ئەم جارە قسەیان هێنایە جێ ئەوەبوو لە نێزیکەوە کاروانی سوپای بۆ شەڕ ئامادەیان دەبینی و دەیانزانی لە باری بچووکترین کاری بەرەواژدا دەستیان لێ دەوەشێندرێ.

ئەو خاڵەی نابێ لەبیر بکرێ ئەوەیە دەمڕاستی فیرقەی چوار بەدرێژاییی ماوەی مانەوەی خۆی لە شنۆ تەواوی توانای خۆی وەگەڕ خستبوو بەڵکو بارزانییەکان لەباتی ئەوەی ڕوو لە مەرگەوەڕ بکەن و بچنە ناو تایەفەکانی هەرکی و کوردی ناوچەکانی ژووروو، ڕوویان بەرەو لاهیجان وەربگێڕن. سەرەتا هەتا ڕادەیەک کاریان لە مەلا مستەفا کرد و بەرەو رووکاری لاهیجان ڕۆیشت بەڵام فاکتەری دەرەکی لەناو بارزانییەکاندا هەبوو و بووە بەرهەڵست لە پێش سەرکەوتنی ئەم کارەدا، لەبەرئەوەی ئەگەر بارزانییەکان لەباتی ڕۆیشتن ڕووەو باکور، ڕووەو باشوور بڕۆیشتنایە ئەوا تایەفەکانی باشوور واتە مامەشی ئەمیر عەشایەری و مەنگوڕ بەهیچ ڕووەتێک دانوویان لەگەڵ ئەواندا نەدەکولا، ئیتر لەسەر سنووری ئێران و عێراق لە شوێنێکی نالەباردا بارزانییەکان دەکەوتنە تەڵەیەکەوە هەرگیز لێی ڕزگار نەدەبوون، بەڵام دنەدانی دەرەکی لە دواجاردا بووە هۆی ئەوەی چەند کەسێک لە سەرۆکانی مامەش کتوپڕ بەدەستی بارزانییەکان بێنە کوشتن، ئیتر ئەم خێڵە بەیەکجاری ڕووی خۆی بەرەو باکور وەرگێڕا. ڕووداوەکە بەو شێوەیە ڕووی دا، لەکاتی کۆچ کردنی تایەفەکانی بارزانی لە ناوچەی پیراندا کێشەوبەرەیەک لە قەڵای پەسوێ کەوتە نێوان سەرۆکانی مامەش و بارزانییەکان، بارزانییەکان بۆیان هەڵکەوت دوو مرۆڤ

له بەگزادانی مامەش بەچەک و هەموو ئەسپاب و ئەسپەوە بەدیل بگرن و بەرەو قەلای پەسوێیان بەپێش بدەن.

لە ئەنجامی ئەو وتووێژەی عەقید غەفاری وەک دەمڕاستی فیرقە لەگەڵ بارزانییەکاندا کردی بۆی لوا کەلوپەلە چووەکان وەربگرێتەوە. مەلامستەفا دەسپێکی ئەم وتووێژەی بەهەل زانی و بەو بیانووەی ماڵە بارزانییەکان لەڕووی خواردنەوە لە تەنگژەدان و ڕێگەی پەڕینەوە لە خاکی ئێرانەوە بۆ دیوی عێراقیش بەستراوە بۆیە وا دەخوازێ دەولەت ڕادەیەک خواردنیان پێ بدات و، بۆ چوونەوەیش بۆ عێراق هەلێکی زیاتریان بۆ بڕەخسێنێ.

مەلا مستەفا بۆ دەرچوون لە زەویی ئێران و ڕۆیشتن بۆ ولاتی عێراق دوو ڕێگەی لەبەر چاوان گرتبوو:

(١) ڕێگەی بێنار دەکەوێتە ئاخی تورکیاوە و هەمان ڕێگەیە بارزانییەکان لەدەمی هاتنیان بۆ ناو ئاخی ئێران کەڵکیان لێی وەرگرتبوو.

(٢) ڕێگەی چەوڕێژی خانە کە بە «پیر ئۆمەران» (١٤) بەکۆتا دێ.

ڕێگەی بێنار بەهۆی ئەو نالەباری و مەترسییەی بارزانییەکان لە تورکەکان چاوەڕوانی بوون، مایەی سەرنج ڕاکێشانیان نەبوو بەتایبەتیش کە لەم ڕێگەیەدا بەفرێکی ئەستوور ڕێگەوبانی داپۆشیبوو، پیاوانی بارزانی بۆ پەڕاندنەوەی خاوخێزانیان ناچار دەبوون خۆیان بەفرەکە بشکێنن و ڕێگە بکەنەوە هەتا پاشان خێزانەکانیان بەڕێ بخەن. بۆیە بارزانییەکان ئەم ڕێگەیەیان لەبەر چاو نەدەگرت.

ڕێگەی چەوڕێژی خانەیش بەبیانووی ئەوەی زۆر دووری دەخستنەوە و لە ئەنجامدا دەیخستنە بەر دەستدرێژی و دەسبڕی و گێچەڵی پاسەوانانی بنکەکانی سوپای عێراقەوە، بۆیەش ئەم ڕێگەیەیان بۆ چوونەوە ڕەچاو نەدەکرد، ئیتر ڕوویان کردە دۆڵی بەناوبانگی گادەر هەتا لەوێوە بەرەو عێراق بچنەوە.

لەم نێوانەدا، بارزانییەکان لەلایەک باسی وتووێژیان دەکرد و پێوەندیی خۆیان بەبەرپرسانی سوپاوە نەدەبڕی، لەلایەکی ترەوە خۆیان بۆ بەربەرەکانەی هێزی دەولەت دەسازاند. سەربازانی یەکەکانی کوردستان لەم ناوچەیەدا توانییان هەتا ڕۆژی شەشی

(١٤) دەبێ «حاجی ئۆمەران» بێ.

مانگی ڕەشەمێ لە نەغەدەدا خۆیان جێگیر بکەن و، کاروانی «ڕائید کلاشی»ش بێ پێکدادان لەگەڵ بارزانییەکان لە گردەسپیاندا سەنگەر بگرێ. هەرچەندە ئەو ڕۆژانە لە ناوچەکانی باشوور هێشتە پێکدادان ڕووی نەدابوو بەڵام لە باکور کاری کاروانی عەمید زەنگەنە لە بارت خێڵانی دژ بەدەوڵەتدا دەستی پێ کردبوو. ئەگەرچی لەم کردەوە سەرەتاییەدا هێزی دەوڵەت لەگەڵ بارزانییەکاندا ڕووبەڕوو نەدەبووەوە بەڵام لەبەرئەوەی کردەوەی هێزی دەوڵەت ڕاستەوڕاست پێوەندیی بەنەخشەی ئەرکانی سوپا بۆ گەمارۆدانی بارزانییەکان و بڕینی پێوەندیی خێڵانی گێرەشێوین بەم تایەفەیەوە هەبوو بۆیە بەشێوەیەکی کورتەبڕی ئاماژە بەو کردەوەیە دەدەین کە لە دۆڵی قاسملودا بۆ پێشگری لە خۆگەیاندنی ئەم خێڵانە بەبارزانییەکان ڕووی دا:

لە ڕۆژی بیست و هەشتی ڕێبەندان هەتا دووی ڕەشەمێ کاروانی عەقید زەنگەنە لە ورمێوە بەسواریی لۆری دەستی بەجووڵە کرد و توانیی لە بالانش کە دەرچەی دۆڵی بەراندێزە و هەروەها لە شەعبان کەندی و دزێ، جێگیر ببێ. پەنجا کەس لە خێڵانی ئەو شوێنە و پیاوانی ولاتپارێز[١٥] بەهاوەڵیی ئەم کاروانە هاتن هەتا وەک خۆبەختکەر لە پێکداداندا پشکداری بکەن.

لە سەعات ٧ی سەر لەسبەینەی ڕۆژی دووەمی مانگی ڕەشەمێ ئەم کاروانە ڕازانەوەی شەڕی بەخۆیەوە گرت و لە کاتێکدا فەوجێکی پیادە و دوو زرێپۆشی شەڕ لە پێشەوانیی ئەوانەوە تەکانیان دەدا، لە بالانشەوە بەمەبەستی گرتنی گوندی کۆکێ کە دەکەوێتە دووریی دوو کیلۆمەتر لە خوارووی سەرەتاگەی هەنگاوهەڵێنان، بەرەو پێش بزوان. لەم گوندەدا پێشی چەند ڕۆژێک پیاوانی زێرۆ و تەها هەرکی خۆیان حەشار دابوو.

بەنزیکبوونەوەی هێزی دەوڵەت لەم گوندە، کەوتە بەر دەسرێژی خەستی چەکداران و لە ئەنجامدا پێکدادانێکی چڕ هاتە کایە. لەم کردەوەیەدا کە هەتا پێش نیوەڕۆ درێژەی کێشا، ژمارەیەک لە چەکداران هاتنە کوشتن و هێزی سوپاش دوای بریندار بوونی شەش سەرباز و یەک غەیرە نیزانی[١٦] گوندی کۆکی و ئەوزان و تومانبە و قەڵاچەم و مەحموودئاوا گیران و کاروان ڕووی لە ناوجەرگەی گەلیی قاسملو کرد.

هەرچەندە پیاوانی زێرۆ و تەها هەرکی لە دووریی هەر چەند کیلۆمەترێکدا بنەگەیەکیان

(١٥) ئەو «ولاتپارێزە خۆبەختکەرانە!»ی نووسەری کتێب باسیان دەکات جاشەکان بوون.

(١٦) نیزامی واتە «سەرباز» غەیرە نیزامی واتە «جاش».

بۆ بەرگری دامەزراند بوو، بەدەسوەکەرییەکی چڕ و بەرخودانێکی چالاکانە لە ئاست هێزی دەوڵەتدا خۆیان ڕادەگرت بەڵام وێڕای ئەوەش عەقید زەنگەنە پێی کرا بە لەدەستدانی ٢٧ کەس «١٥ کوژراو و ١٢ بریندار» هەموو ئەو بەرزاییانە بگرێ، بەسەر گەلیی قاسملوویاندا دەڕوانی. شایەنی زانینە لە قۆناغی دووەمی ئەم کردەوەیەدا پتر لە دوو نیزامی و سێ غەیرە نیزامی شەهید بوون و دە کەسیش بریندار بوون.

ڕۆژی چوارەمی مانگی ڕەشەمە بەنیازی پێ کەوتن بەشوێنی چەکداران ـ یان بەزاراوە، سەرانسوێکردنی سەنگەرەکانی ئەوان، فەوجێکی پیادە بەکەرەستە و ئامێرەوە بەرەو بنەبانی دۆڵی قاسملو هێرشی برد. پێشەوانانی ئەم فەوجە هەتا گوندی سیلوانا چوونە پێش، سەرەڕای ئەو بەرگرییە خەست و خۆڵەی خێلان دەیانکرد ئەم فەوجە دێیەکانی شیرین کەندی و محەمەد ڕەحیم کەندیی داگیر کرد. بەڵام لەبەرئەوەی دۆڵی ناوبراو بێ ڕادە کوور و پڕ مەترسی بوو و چەکدارانیش لە شوێنی ئاسێ و بڵندا سەنگەریان گرتبوو، فەرمان گەیشتە ئەم فەوجە کە بەرەوپێش چوونی خۆی بووەستێنێ هەتا بەجووڵاندنی باڵەکانی بتواندرێ خێلان لە شوێنە بەرزەکان هەڵبکەندرێن. فەرمان گەیشتە ئەم کاروانە بەرزاییەکانی خۆیان لە دەست نەدەن و سەرەتاتکەی جووڵە و بزاوتی زێڕۆ و تەها بکەن. لەم کردەوەیدا دەرکەوت زێڕۆ و پیاوانی ئەو لەگەڵ بارزانییەکاندا هاوکارن و دەیانەوێ بەیارمەتیی ئەوان هەتا دوا پشوو لە بەرامبەر هێزی دەوڵەتدا بەرگری بکەن.

بەهەر حاڵ، ئەو کارەی کاروان لە دۆڵی قاسملودا کردی و ئەو شکانەی زێڕۆ و تەها لە ناوچەی ورمێدا خواردیان کارێکی گەورەیان کرد، بەجۆرێ زۆربەی ئەو کوردانەی هەتا چەندانێک پێشتر خەریکی دەست تێکەڵ کردن بوون و خولیای ڕکابەری و پێشمەرگایەتییان لە سەردابوو، ترس و سامیان لێ نیشت و سەرۆکانی ئەوان لە وێنەی محەمەد حوسێن حاتەمی، قادر بەگی ڕەسووڵی، سەید فەهیم و ڕەشید بەگی جیهانگیری، خۆیان بەسەرۆکی کاروان ناساند و گوێ بەفەرمانیی خۆیان بەدەوڵەت ڕاگەیاند و ئەو چەکانەی لاشیان هەبوو بەدەستەوەیاندان.

لە هەمان ئەو ڕۆژانەدا بەنیازی ڕاکێشانی ئەو خێلانەی هێشتا لە دڵەڕاوکەدا بوون و، لەترسی ئەوەی نەبادا سزا بدرێن لەوانەبوو بچنە پاڵ چەکدارانەوە، ئەم ئاگەدارییەی خوارەوە لە ناوچەکانی کوردستاندا بەهۆی باڵەفڕەوە بەردرایەوە:

## ئاگاداری

«بەگشت دانیشتوان و خێلانی کوردستان رادەگەینین:

لەم کاتەدا سوپا بەمەبەستی چەسپاندنی هێمنی و ئاشتی لە سەرتاپێی ناوچەی کوردستاندا، دەستی بەکاری دابینکردنی دڵنیایی و رێکوپێکی کردووە، تایەفە و خێلانی کوردستان وریادار دەکەینەوە هەرچی چەک و تەقەمەنی و کەلوپەل و شتی تریان لە دێموکراتی کوردستان وەرگرتووە یان بەدەستیان کەوتووە، لە شاراندا لە ماوەی سێ رۆژ و لە دەرەوەی شاراندا لە مۆڵەتی یەک حەفتەدا بیدەنەوە بەسەرۆکی سوپای شاری مەهاباد و ورمێ. بەگوێرەی تاقیکردنەوە و ئەو لێکۆڵینەوانەی کراون، دەرکەوتووە کەوا خێلانی ولاتپەروەری سنوور بەمەبەستی پاراستنی رێکوپێکی و هێمنیی سنوور، هۆکار و کەسانی گرینگن و ئەگەر بێو بەپێی ئاتاج و پێویستیی ناوچە چەکیان هەبێ ئەوا بەچاکی دەتوانن ئەم کار و ئەرکە رابپەڕێنن و سنووروانیی خۆیان لە ناوچەکانیاندا جێبەجێ بکەن، بەلام هەموو تایەفەکان بەتێکڕایی دەبێ ئەو چەکانەی هەتا ئێستە لە دێموکراتی کوردستانیان وەرگرتووە بەژمارە و بەپێی پێویست لەلای خێلانی مەنگوڕ و مامەش و گەورک و تایەفەکانی تری سنووری بمێنێ بەمەرجێک پاس و پسووڵە لە ئەرکانی هێزی کوردستان لە مەهاباد وەربگرن هەتا بەکاری پاراستنی سنوور رابن و، دەستە پاسەوانە ناوچەییەکان لەوان پێک بێت. دەبێ سەرۆکی ئەم تایەفانە ناو و پاشناوی خاوەن چەک، باوک، جۆر و ژمارەی فیشەکەکانی، لە ماوەی یەک حەفتەدا پێشکێش بکەن بۆ ئەوەی پسووڵە و پاسی پێویستیان بۆ دەربکرێ.

لە بارەی تایەفە نێزیکەکانی وەک دێبوکری و فەیزوڵلا بەگی و تایەفەکانی شارویران و ئەوانیتر، هەروەها ئەوانەی لە شاران دادەنیشن دەبێ چی چەکی هەیانە لە ماوەی سێ رۆژدا بەدەستەوەی بدەن، ئەوانەیش لە دەرەوەی شاراندا دەژین پێویستە سەر لە ئەرکانی هێز بدەن و ئەو ژمارە چەکەی بۆ خۆپارێزی لە چەپاوی دز و جەردان پێویستیانە بۆیان تەرخان بکرێ و، ئەوانیش لە مۆڵەتی یەک حەفتەدا ناوی خاوەن چەکەکان بەو شێوەیەی لە سەرەوە گوترا پێشکێش بکەن و پاشماوەی چەکەکان بەدەستەوە بدەن. سەرۆکی ئەم جۆرە تایەفانە، هەموو چەکی تایەفەکانیان هەر بەپەلە بەئەرکانی هێز پێشکێش بکەن کە لایەنی بڕیاردەرە.

لە کۆتاییدا دڵنیایی دەدەین ئەگەربێتو لەو مێژووەی کاروانی هاتووی هێزی کوردستان

بەر بەئامانجی جۆراوجۆر بەرێ کەوتووە، چەکێک یا فیشەکێک مامڵەتی لەسەر کرابێ، دەبێ ئەو مامڵەتانە هەڵبوەشێن و چەکە مامڵەت پێ کراوەکان بدرێنەوە. لەو مێژووە بەپاشەوە، ئەم جۆرە مامڵەتانە لەهەر کوێیەک و بەهۆی هەر کەسێکەوە بکرێن یا چەک بەرەو دەرەوەی سنوور بنێردرێ ئەوا کەتنکەر دەدرێ بەدادگەی مەیدانیی سەردەمی شەڕ. بەپێی ئەوەی گوترا، ئەگەر هاتوو پاش تێپەڕینی ماوەی دیاریکراو کەسێک چەکی خۆی نەدابێتەوە یا پاسی وەرنەگرتبێ، ئەوا خۆ بەپاشدەر لە دادگەی سەردەمی شەڕدا دەکەوێتە بەر لێپێچینەوە.»

***

لەو رۆژانەدا، بەلای بەرپرسیارانی سوپاوە روون بوو کەوا بارزانییەکان دەیانەوێ پەنا بۆ خاپاندن و خافڵاندن ببەن و لەناکاو بەسەر سوپای ئێران دابدەن. ئیتر، لە دەمی وتووێژ لەگەڵ سەرۆکی فیرقەی چواردا لە لایەک باسی گەڕانەوەی خۆیانیان بۆ عێراق دەکرد و خواردن و قەند و شەکریان دەخواست، خێزانەکانی خۆیشیان بۆ ئیسپاتی ئەم بابەتە گوایە نیازی لە ئێران دەرچوونیان هەیە بەملا و بەولادا دەهێنا و دەبرد، بەڵام لە بنەوە خەریکی کەین و بەین بوون لەگەڵ تایەفەکانی مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ و دەشتەبێلدا و دەیانویست لە ڕێگەی سازدانی ئەوان لەگەڵ خۆیاندا، ئەو خێڵانە لە دژی هێزی سوپا راست بکەنەوە. خێزانەکانی خۆیشیان بەرەو ناوچەی بەپیت و بژوێنی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ بنێرن کە لە رووی زۆریی بژیوی و هەبوونی پێویستییەکانی ژیانەوە لە هەموو شوێنێکی تر چاکتر بوو. ئەم پێشبینییەش بەکردەوە دەرکەوت لەبەرئەوەی رۆژی دووەمی رەشەمە کاروانی هەواڵگریی سوپا راپۆرتیان دا کەوا ماڵە بارزانییەکان بەرەو لای تەرگەوەڕ رۆیشتوون، هەندێ لە کەسانی خێڵانی ناوبراویش بەچوونی بارزانییەکان دڵخۆش نەبوون، خۆیان گەیاندە بنکەکانی سوپا و هەواڵی بزاوتی بارزانییەکان و دڵەڕاوکەی خۆیانیان پێ راگەیاندن.

ئەرکانی سوپا ئاگەی تەواوی لەم کار و کردەوانە هەبوو، لە مێژووی یازدەمی رەشەمەدا فەرمانی بەسەرۆکی فیرقە دا کەوا نامەیەک بەشێوەی خوارەوە بەرەورووی مەلا مستەفا بکاتەوە:

«مەلا مستەفای بارزان!

ئێوە بەرەواژی ئەو قسەیەی لە تاران کرابوو، هەڵسوکەوتتان کرد. جگە لەوەی لە

زەویی ئێران دەرنەکەوتن و ئەفسەرانی هەڵاتوو و تۆپەکانی ئێرانتان نەدایەوە، ڕووتان کردووەتە ناوچەی بەپیت و پیێزی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ و دەشتەبێڵ. پێویستە هەتا زووە زەویی ئێران چۆڵ بکەن.»

لەلایەکی تر، فەرمان درایە سەرۆکی فیرقە کەوا لەبەرئەوەی بارزانییەکان بەم هەڵسوکەوتەیان بیری لە ئێران دەرچوونیان نییە و، بەبیانووی گیرانی ڕێگەی دەربازبوون بۆ دیوی عێراق و تورکیا بەهۆی بەفرەوە، لەوانەیە ڕوو بکەنە ناوچەی دەوروپشتی ورمێ، بۆیە وا چاترە ئەرکانی سوپای کوردستان بگوازرێتەوە بۆ ورمێ و لە نێزیکی کردەوەی کاروانەکانی باکوردا کە شوێنێکی گرینگتریان هەیە، جێگیر ببێ. لەلایەکی تر، لەبەرئەوەی نەبوونی باڵەفڕگەیەک ببووە لەمپەر لە پێش باڵەفڕەکانی سوپا «کە دوورفڕ نەبوون» لەوەی بتوانن یارمەتیی هێزی پیادە بدەن، بۆیە بیری لێدانی باڵەفڕگەیەک کە بتوانێ ببێ بەمایەی سوود پێ گەیاندن، بیرێکی بەهێز بوو.

ڕۆژی چواردەی ڕەشەمە، بزووتنەوەی بارزانییەکان بەرەو باکور بەلای دەسەڵاتدارانی سوپاوە بوو بەباوەڕێکی یەکجارەکی و ڕووناک، لەبەرئەوەی ڕاپۆرتی ورد لەو ناوچانەوە هاتبوو، دەیگێڕایەوە چۆن مەلا مستەفا ئێوارەی ڕۆژی ١٣ی ڕەشەمە گەیشتووەتە «مەوانا» کە میرەدێیەکی ڕۆژئاوای ورمێیە و لە ڕووی سوپاییەوە شوێنێکی یەکجار گرینگە. لەو شوێنەدا مەلا مستەفا لەگەڵ سەرۆک خێڵانی هەرکی ـ شکاک، زێرۆ بەهادوری و تەها بەگ و، سەرۆک بنەماڵەکانی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ و دەشتەبێڵدا کەوتووەتە وتوویێژ و کۆبوونەوەیەکی گرینگی لەماڵی ڕەشید بەگ نووریدا کردووە. لەو دانیشتنەدا مەلا مستەفای بارزان بەسەرۆکانی خێڵانی ناوبراوی گوتبوو: «ڕێگەی دەرچوون لە زەویی ئێرانەوە بۆ عێراق بەبەفر گیراوە و بە لەمپەر بەستراوە، لەلایەکی ترەوە خواردن و بژیویمان بەکۆتا گەیشتووە و دەوڵەت چ یارمەتییەک نادات، بۆیە هاتووینەتە لاتان هەتا هەم ئازووخە و هەم خواردن بەدەست بێنین و هەتا دەمی گەیشتنی بەوەرزی بەهار و بەسەرچوونی زستانیش میوانی ئێوە بین.»

پاش ئەوەی بڕیاری بارزانییەکان و خێڵانی سەرپێچیکەر بەعەقید زەنگەنە گەیشتەوە، دەسبەجێ کەوتە خۆئامادەکاری لە پێناو پێشگری لە ڕوودانی هەر ڕووداوێکی ناهەموار. هەمان کات، سەرۆکی کاروان داوای لە عەقید زەنگەنە کرد کەوا لەبەرئەوەی بارزانییەکان ڕوویان کردووەتە باکور، بۆیە دوور نییە لەناکاو بۆ دۆڵی بەراندێز وەرگەڕێن و بەگرتنی

ئەم ناوچەیە کاروانی کردەوەی دۆڵی قاسملو و شاری ورمێ توشاری مەترسی بکەن. بەم جۆرە سەرۆکی کاروان داوای کرد باڵی ڕاستی کاروان بەهێز بکرێ و بەهەر شێوەیەکی بلوێ هەندێک هێز لە پێناو بتەوکردنی ئەم کاروانەدا لە ژێر دەستی ئەودا دابندرێ .

ڕۆژی پازدەی مانگی ڕەشەمە کاروانێکی پێکهاتوو لە بەتالیۆنێکی پیادەی سەر بەفەوجی ٦ی بەهرامی، بەطرییەیەکی تۆپی ٧٥ و بەطرییەیەکی هاوەن لە یەکەکانی فیرقەی تەورێز لە ژێر سەرکردایەتیی عەقید «سەردادوەر»دا گەیشتە ورمێ بۆ ئەوەی هێزی سوپای ئەم ناوچەیە بتەو بکات.

لە ماوەی ئەو پازدە ڕۆژەدا بۆ ئەرکانی سوپای کوردستان بوو بەشتێکی روون کەوا بارزانییەکان روویان بەرەو باکورە و نایانەوێ بەهیچ کلۆجێ دەست لە خاکی ئێران هەڵگرن و برۆن. سەرۆکی فیرقەی چوار پاش ئەوەی فەرمانی پێویستی لەم بارەیە لە تارانەوە بۆ هات، بۆی دەرکەوت بارزانییەکان چییان نیازە، ئیتر ڕۆژی شازدەی رەشەمێ رووی کردە ورمێ هەتاکو بەهەر نرخێک بێ پێوەندیی بارزانییەکان بەخێلانی دەوروپشتی ورمێوە بپسێنێ و، زیاتر هەلی هەڵگیرساندنی بەربەرەکانێیان پێ نەدا. لە پێناو گەیشتن بەم مەبەستەدا، ڕۆژی هەژدەی مانگ ئەرکانی هێزی کوردستان لە مەهابادەوە گواستیەوە بۆ ورمێ و، عەقید فەیووزیی سەرۆکی ئەرکانی پێوەندار لە ورمێ جێگیر بوو بۆ ئەوەی بتوانرێ فەرمانەکانی سەرۆکی فیرقە و ئەرکانی سوپا چاکتر جێبەجێ بکرێن. ئەرکانی هێزی کوردستان بۆ پێشگرتن لە هەڵکشانی بارزانییەکان بەرەو باکور، بەپێی هەلومەرجی سروشتی زەویی دەوروپشتی ورمێ(١٧) ئەم بڕیارەی ژێرەوەی دا:

لە دوا دۆڵی باکوری ورمێ «دۆڵی بەناوبانگی ئەنهور چای»ەوە ڕێگە لە هەڵکشانی بارزانییەکان بەرەو باکور بگیرێ، بۆ ئەم مەبەستەش کاروانێکی پێکهاتوو لە دوو بەتالیۆنی پیادە «بەتالیۆنی ٢ی فەوجی ئاهەن و بەتالیۆنی ٦ی ئازەر پاد» ، یەک تۆپی

(١٧) سروشتی زەویی دەوروپشتی ورمێ بەجۆرێکە لە بەری ڕۆژهەڵات پاڵی داوە بەزەریاچەی ورمێ و لە دیوی ڕۆژئاوایشدا زنجیرەیەک چیای دژوار و هەزار بەهەزار هەڵکەوتوون کە چوار ڕێبازگەی پێدارۆیشتنیان تیدایە، یەکێکیان باکور ـ باشوورە و ناسراوە بەدۆڵی قاسملو، سێیەکەی تر ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوان بەناوی: دۆڵی ئەنهور چای، دۆڵی دەربەند، دۆڵی باراندێز و دەشێ بگوترێ ئەم چوار نەواڵەی پێشوو برێتین لە ڕێبازگەی ناچاری کە پێویستە یەکێک ئەمانە ببرێ ئینجا بگات بەو بەرزاییانەی کە بەسەر سنووردا دەڕوانن. «ئەم تێبینییە لە ئەسڵی کتێبەکەدا هەبوو واتە لە لایەن نووسەر خۆیەوەیە» .

٧٥، دەستەیەک هاوەن، زریپۆشێک و دەستەیەک سوارە لە ژێر سەرکردایەتیی عەقید «نیساری»دا رۆژی بیست و یەکی رەشەمێ لە ورمێوە بەرەو دۆڵی ئەنهور چای و بانەکانی «لەرنێ» بەئامانجی گرتنی «مەوانا» دەستی بەجووڵە کرد.

کاروانی دۆڵی قاسملو ئەرکی ئەوە بوو لە بەرزاییەکانی دەوروپشتی دۆڵی ناوبراودا جێگیر ببێ و هەندێک کەس بەمەبەستی سەرانسۆیی بۆ دەوروپشت بنێرێ. لە رۆژی نۆزدەیەمدا، چەند تفەنگدارێکی ناوچەکەی تەبای دوو کەس لە جەندرمە بۆ سەرانسوێ لە رێگەی «شەعبان کەندی»یەوە بەرەو حەساری ئاقبلاخ «کە دەکەوێتە ناو دۆڵی بەراندێز» هەنارد. ئەو کەسانە لە بەرزاییەکانی باکوری رۆژئاوا و باشووری رۆژهەلاتی شەعبان کەندییەوە بەرەو رووی دەسڕێژێکی خەست و خوێنی چەکدارانن بوونەوە و لە ئەنجامی پێکدادانیدا نایب زابت دووی جەندرمە «فەخری ئازەری» بریندار بوو و دوو لە تفەنگدارانی ناوچەکەش کوژران، نێزیکەی ٥ کەسیش لە چەکداران بەر کەوتن. دەسبەجێ، هەندێکی تر بەئۆتۆمۆبێل بەفریای ئەوانەوە ناردران، چەکدارەکانیش پاشەکشێیان کرد و لە چاوان ون بوون.

پاشان دەرکەوت ئەو چەکدارانە سەر بە محەمەد حوسێن و محەمەد ئەمین هەرکی بوونە و بەپێی فەرمانی بارزانییەکان لە مەرگەوەڕەوە بەرەوڕووی هێزی سوپا هاتوون. لەم رووداوەوە تێ گەیشترا بارزانییەکان تایەفەکانی ئەو ناوچەیەیان ناچار کردووە بۆ ئەوەی دەستەویەخەی هێزی سوپا ببنەوە. بۆیە فەرمان درایە کاروانەکانی باشوور واتە ئەو هێزانەی لە نەغەدە و سۆفیان و جلدیاندا بوون، بەرەو شنۆ ببزوێن و هەتا زووە شنۆ و ئاقبلاخ بگرن و لە ئەنجامدا بتوانرێ کاروانی دۆڵی قاسملو کە لە بەرزاییەکانی «کۆکی»دا هەواری گرتبوو، لە دۆڵی قاسملووەوە بەرەو خوار شۆڕ ببێتەوە و بەفریای ئەو یەکانەوە بچێ کە لە شنۆوە دەهاتن و، بتوانن ئاقبلاخ بخەنە ژێر دەستەوە.

## لە ڕۆژی بیست و یەکی ڕەشەمەوە
## هەتا دەسپێکی پێکدادانی سەرەکی

بۆ ئەوەی چۆنیـەتیی ئەو پێکدادانە گـەرمـانەی هێـزی سـوپا و بارزانیـیـەکـان کـە لە بەرەودواهاتنی ڕەشـەمـەدا ڕوویان دا ڕوون ببێـتـەوە، شـێـوەی جـێگیـربوونی یەکـە سوپاییەکان لەو مێژووە لە ناوچە جۆیجۆییەکاندا وەک ژێرەوە بوو:

ئەلیف: کاروانەکانی باکور

(١) کاروانی دۆڵی قاسملو، پێک هاتبوو لە فەوجی یەک و دووی بەهادر و بطریەیەکی تۆپ و زرێپـۆشێک و دوو دەستە جەندرمە. فەوجی یەکەمیـان لە بڵندایییەکـانی کۆکیدا هەڵی دابوو و فەوجەکەی تریان وێڕای دەستەیەک تۆپخانە و زرێپۆشێک و ١٢٠ کەس لە هێزی خیلانی ناوچەیی بەنیازی گرتنی گەلیی باراندێز، لە زارگەلیدا هەواریان گرتبوو. «لە ژێر سەرکردایەتیی ڕاستەوخۆی عەقید فولادوەندا».

(٢) بەنیـازی سەرانسـۆکردنی دۆڵی دەربەند «دۆڵی باکوری باراندێز کە بەشاری ورمێ دواییی دێ» فـەوجـێـک و دەسـتـەیەک برێن و ژمـارەیەک چەکـداری ناوچەیی و زرێپۆشێکی جەندرمە نێردرابوونە ئەم ناوچەیە و لە زارگەلیدا جێ نیشتە بووبوون.

(٣) کاروانی عەقید نیساری، پێک هاتبوو لە دوو فەوجی پیادە، بطریەیەکی ٧٥، دوو زرێپۆش، دەستەیەک هاوەن، بەتالیۆنێک لە سوارانی فەوزیە و دەستەیەک برێن لە ورمێوە بەنیازی گرتنی مەوانا «ناوجەرگەی ناوچەی تەرگەوەڕ» بەرەو مەوانا کەوتنە ڕێگە.

(٤) فەوجێکی پیادە، دوو بەتالیۆن، دوو دەستە برێنی سەر بەفەوجی سوارەی «فەوزیە»، دوو زرێپـۆش و یەک سریەی تۆپی ٣٧ وەک سـپـێـر بۆ کـاروانی باکـور داندران و لە ورمێ مانەوە.

## بارودۆخی ئەو یەکانەی لە باشوور بوون

(١) لە تازەکەند: فەوجێکی پیادە و بطریەیەکی تۆپ و زرێپۆشێک.

(٢) لە قەڵاجۆق: فەوجی سوارەی لوڕستان و هاوەنێک.

(٣) لە سۆفیـان: سریەیەک لە فـەوجی هەمەدان و دەسـتـەیەک تەماتیـک و ١٠٠ کەسی

سوارەی ناوچەیی «مامەش و مەنگوڕ».

(٤) لە قۆرچی: ٣٠٠ کەسی سوارەی ناوچەیی «مامەش و مەنگوڕ».

(٥) لە شین ئاوا: سریەیەک لە فەوجی هەمەدان و دەستەیەک بڕێن.

(٦) لە گردەسپیان: سریەیەک لە پیادەی هەمەدان و دەستەیەک بڕێن.

(٧) لە نەغەدە: فەوجێک و، لە سریەیەک کەمتری سەر بەلیوای کرماشان، دەستەیەک ٧٥، (بطریە)یەک ١٠٥ی کورت و سێ زرێپۆشی شەڕ.

(٨) لە مەهاباد: دوو بەتالیۆنی پیادە، فەوجی ٤ی سوارەی لوڕستان، کەمتر لە بەتالیۆنێکی سوارە، بطریەیەکی ٧٥، جگە لە دەستەیەک ٧٥ و دوو زرێپۆش وەک هێزێکی بزێوی سپێر بۆ کاروانەکانی باشوور جێگیر کرابوون.

وەک چۆن پێشتر بیری لێ کرابووەوە، پێویست بوو بەهەر نرخێک بێ کردەوەی باڵەفڕە تەبا و شان بەشانی یەکەکانی بەژەکی بێ و بەهاوکاریی ئەوان راپەڕێ بۆیە هەموو ئەو باڵەفڕانەی لە تەورێز بوون «٧ هاینە و ٢ تایگەرمەوس» لە بن دەستی سەرۆکی فیرقەی چواردا داندران بەڵام سەبارەت بەدووریی ڕێگە ئەم کارە زۆر بەهێواشی جێبەجێ دەبوو، هەروەها ئەو بەرکەوتانەی بەدەستەوەی دەدان جێگەی دڵخۆشی نەبوون بۆیە سەرکردایەتی ویستی دەمودەست باڵەفڕگەیەک لەورمێ دامەزرێنێ. لەبەرئەوەی بە لێدانی باڵەفڕگەیەکی نوێ، باڵەفڕەکان دەیانتوانی پاش ١٥ وردکە فڕین سەرتاپێی گۆڕەپانی شەڕ سەرانسۆ بکەن و بەپەلە زانیاریی پێویست ڕابگەیێن.

ئەم بڕیار و پێشنیارە دەمودەست راپەڕا و، بەدووریی ٨ کیلۆمەتر لە باکوری ڕۆژهەڵاتی ورمێ، لە نێوان گوندەکانی «لالو، تاج عەلی، جارچی لو»دا باڵەفڕگەیەک تەیار کرا و ڕۆژی بیست و سێی ڕەشەمە باڵەفڕە بەورمێ گەیشتن.

وەکات لەگەڵ بزووتنەوەی کاروانی عەقید نیساری بەرەو مەواناداا، بڵاوکراوەی جۆراوجۆر لەلایەنی فیرقەی ٤ەوە بەسەر هەموو تایەفەکانی سنووریدا بڵاوکرایەوە و، بانگهێشتنی ئەوان کرا بۆ ئەوەی لە بارت بزووتنەوەی کاروانی ناوبراودا گوێڕایەڵی دەوڵەت بن. مەلا مستەفاش لەلای خۆیەوە بەهەموو وزە و تواناوە کەوتبووە دنەدانی هەرکی و شکاک بۆ ئەوەی لە بەرامبەر بزاوتی ئەو کاروانەدا بەرگری و دەسوەکەری بکەن و نەیەڵن هێزی دەوڵەت بگاتە مەوانا. ئیتر هەندێک لە چەکدارانی خێڵەکی لەسەرینیی

هاندانی بارزانییەکانەوە رەوانەی بەرزاییەکانی «قزلّبەند ـ لەرنیّ» کران کە سەرە ڕێگەی کاروانی بەرەو مەوانا بوو.

## دوا نامەی سەرۆکی فیرقە بۆ بارزانییەکان

سەرۆکی فیرقەی چوار تەواو ئاگەداری بابەتی سەرەوە بوو، لە ڕۆژی بیست و سێیەمی رەشەمەدا نامەیەکی بەناونیشانی شێخ ئەحمەد و سەرۆکانی تری بارزانی بەم ناوەڕۆکەی ژێرەوە نووسی:

«هەرچەندە بڕیار وابوو مەلا مستەفا لە ناوچەی مەرگەوەڕەوە بۆ وتوویژ بێتە نەغەدە، بەلاّم هەتا ئێستە نەهاتووە، بەمەش ئێوە بەپێچەوانەی بەلّێن کارتان کردووە و لە بڕێتیی ئەوەی بەرە بەرە خێزان و مالّی خۆتان بەرەو سنوور کۆچ پێ بکەن، بەرەو لای مەحالّ دەشت، تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ هاتوون. ئیتر ئێمە بەگوێتانیدا دەچرپێنین کەوا درێژەکێشانی ئەم دۆخە ئەنجامی تالّی بۆ ئێوە لێ دەکەوێتەوە. وا چاکە دەست لە درێژەپێدانی ئەم کارە هەلّبگرن و هەتا زووە بەپێی فەرمانی پێشوومان شنۆ چۆلّ بکەن.»

ئێوارەی هەمان ڕۆژ بەنامەیەکی رەوانەکراو، شێخ ئەحمەد ئەم وەلاّمەی دایەوە:

«چۆلّکردنی شنۆ هەتا چەند ڕۆژی تر بەئەنجام دەگات، هەروەها کارێک بەپێچەوانەی بەلّێن نەکراوە و ئەم بانگەواشەیە نادروستە و بڕێتییە لە هاندانی خێلاّنی ناوچەیی کە لە بارودۆخی ئێستە ناڕازین.»

مەبەستی بنەڕەتیی بارزانییەکان کە بەهۆک و بیانووی هەمووجۆرە کاتیان بەسەر دەبرد ئەوە بوو هەرچی زووتره خۆیان بەکوردانی شاپوور بگەیەنن کە چەکدار بوون، بۆ ئەوەی بەدەستەوای ئەوان خۆیان بگەیەننە کوردانی دانیشتووی ناوچەی باکوری ڕۆژئاوای سنووری تورکیا وەک خێلاّنی جەلالی و میلان، هەتا بەیەکەوە و هەموو لەهەموو لەو شوێنانەدا لە پێش هێزی دەولّەت بووەستنەوە و ئاژاوە و کێشەیەکی نوێ لەو سنوورەدا بنێنەوە، هەروەها لەگەلّ هەندێ لە دێموکراتە هەلاّتووەکانی کە لەو دیووی سنووری سۆڤیەتدا بوون، پێوەندییان بەستبوو و ئاوازێکی نوێیان لە بەری باکوردا دەژەنی.

لەبەرئەوەی لە ناو بارزانییەکاندا ژمارەیەک ئەفسەری راکردووی سوپای ئێران و هەندێکی تر لە ئەفسەرانی خوێندەواری عێراق و چەندێکی تر لە ئەفسەرانی ئاشوور و ئەرمەن هەبوون پێوەندیی راستەوخۆیان بەبەرپرسیارانی دەرەکییەوە هەبوو، سەرەڕای

ئەمەش تەواو شارەزا و بەڵەدی هەڵکەوتی جوگرافیاییی ئەو شوێنانە و حاڵوباڵ و داوونەریت و خووی هەموو خێڵانی چەکداری ئێرانی بوون ئەوانەی لە سنووری رۆژئاوادا دەژیان، دەیانویست لە رێگەی ئەم کەسانەوە پیلانی دمۆر و نالەباری خۆیان لەسەر بنگەی دابەش و دابڕ دابڕکردنی رۆژئاوای ئێران ببەنە سەر و، دەوڵەتێکی خۆبەڕێوەبەری «خودموختاری» لەو ناوچانە دابمەزرێنن و خۆیانی بەسەردا بسەپێنن.

هۆی بنەڕەتیی رۆیشتنی بارزانییەکان ڕووەو باکور ئەوە بوو خۆیان بەکردەوە بینییان چییتر ناتوانن لە ناوچەکانی باشوور «شنۆ، خانە و مەهاباد»دا دەسەڵاتداری و کارداری بکەن، ناچار بەرەو باکور هەڵکشان هەتا شان بەشانی تایەفە چەکدارەکانی جەلالی، میلان، هەرکی، شکاک، زێڕۆ و تەها بەگ بتوانن مرازی خۆیان بهێننە دێ و ئەگەریش سەرکەوتنیان پێ بەدی نەهات ئەوا لە سنووری باکورەوە ئاوابن و، پەنا بۆ سۆڤیەت ببەن و لە دەستی سزا و تۆڵە رزگاریان ببێ.

# شەهیدبوونی رائید کلاشی

ئەو کاتەی مەلا مستەفا لە دۆڵی قاسملودا سەرگەرمی نواندنی چالاکی بوو، فیرقەی چواری کوردستان بۆ ئەوەی پاڵەپەستۆی بارزانییەکان لەسەر کاروانەکانی باکور کەم بکاتەوە و ورمێ لە مەترسی رزگار بکات، بڕیاری دا بەپەلامارێکی گورجوگۆڵ لەم ناوچەیەدا، بارزانییەکان بەرەو ناوچەکانی باشوور پاڵ بنێ و لە فرەوانبوونی رووبەری گۆنگەر لە باکوردا پێشگیری بکات. ئەم ئەرکە سپێردرایە عەمید بیگلەری کە بریکارەتیی فیرقە و سەرۆکایەتیی کاروانەکانی باشووری لە ئەستۆدا بوو و لەسەرجەم کردەوەکانی کوردستاندا لێهاتوویی خۆی خستبووە ڕوو.

سەعات ٩ی پاشنیوەڕۆی رۆژی بیست و سێی رەشەمە فەرمانی دەست پێ کردنی کردەوەی پەلامار گەیشتە نەغەدە. پێشتر، لەم ناوچەیەدا سەرانسۆیی کرابوو و، بەنیازی کەڵک وەرگرتن لە خافڵەکی کە لە سەرەتای کردەوەکاندا بارزانییەکان پێیان وا نەبوو دەوڵەت پەنا بۆ هیچ کارێک ببات، نەخشەیەکی بوێرانە لەلایەن عەمید بێگلەرییەوە بەشێوەی خوارەوە داندرا بوو:

لە پێنگاوی یەکەمدا «وەزنە» و «خان تاوس» بەیەک چەپاوی کتوپڕ داگیر بکرێن و باڵی راست و هێڵی پشتەوانیی دواوە لە هەڕەشە بەدوور بگیرێن.

دووەم، بەدەست بەسەرداگرتنی بەرزاییەکانی باشووری چۆمی گادەر، تیپێکی چەکدار لە بەری قەڵای «سینگان»ەوە بۆ سەرانسۆیی بچن هەتا ئەگەر قەڵای ناوبراو بەچاکی نەگیرابێ ئەوا قەڵایەکە بەسوارانی مەنگوڕ داگیر بکرێ و بخرێتە ژێر دەستەوە. تفەنگدارانی خێڵی زەرزای شنۆیش بچنە پاڵ ئەوان و لەگەڵ لێدانی یەکەمدا کارەکە یەکلا بکەنەوە.

سێیەم، لە زارکەی نەغەدەشدا بەهۆی فەوجی سوارە و سوارانی خێڵانەوە هەڵمەتێک ببرێ و هەتا هێڵی دەربەند پاشەکشێ بەدوژمن بکەن. لەبەرئەوەی کردەوەی ئەم ناوچەیە بایەخێکی گەورەی هەبوو بۆیە چۆنیەتییەکەی بەدرێژی باس دەکەین.

هەرچەندە بەئەنجام گەیاندنی نەخشەی بەرپرسانی سوپا بەو هێندە هێزەی لە بن دەستی عەمید بێگلەریدا هەبوو وەک کارێکی دژوار دەهاتە بەرچاو، بەڵام هیوا دەکرا لەبەرئەوەی دوژمن چاوەڕوانی کارێکی کتوپڕ نەبوو بەڵکو بکرێ بەم کارە خێرایە سەرکەوتنێکی تەواو

بەدەست بێ و کاروانەکانی باکوریش بەپیریانەوە بێن و کارەکە تەواو بکەن و دەستی بارزانییەکان لەو گوندانەی خۆراک و بژیوییان لێیان بەدەست دەکەوت، ببڕێ. ئەوەیشمان لە بیر نەچێ راگەیاندنەکانی ئەرکانی سوپا دووپاتی دەکرد گوایە پتری هێزی بارزانییەکان چووەتە مەرگەوەڕ بەڵام ڕووداوەکانی پاشتر ئیسپاتیان کرد، راستی شتێکی تر بووە و جەماوەری ئەوان وەک بەکردەوە دەرکەوت و لەسەرەوە دیارکرا، لە شنۆ و سەلدوز مابوونەوە و تەنیا ژمارەیەکی کەمیان لەگەڵ مەلا مستەفا خۆیدا چووبوونە مەرگەوەڕ.

بۆ بەجی هێنانی ئەو نەخشەیە، هەمان شەو ئەم فەرمانانەی خوارە دەرچوون:

بەتالیۆنی یەکی فەوجی ١٢ی کرماشان، بەدوو زرێپۆشی شەڕ بەهێز بکرێ و کاروانێک لەژێر سەرکردایەتیی عەقید غەفاریدا لەلای وەزنە و خان تاوسەوە دەست بەهێرش بکات. فەرمان درایە فەوجی هەمەدان هەتا شوێنی خۆی بگوازێتەوە نەلۆس و سێسەت کەس لە سوارانی مەنگوڕ بەنیازی سەرەتاتکە یا هەندێ جار گرتنی قەڵای سینگان بنێرێ.

فەرمان درایە عەقید ئەنساری کەوا بەفەوجی سوارە و سوارەی خێڵانی ـ خۆیەوە وێڕای بطریەیەکی تۆپخانە و بطریەیەکی ١٠٥یی کورت و دوو زرێپۆشی شەڕ هێرش بکاتە سەر زارکی نەغەدە.

عەقید غەفاری بڕیاری دا سوود لە خافڵەکی وەربگرێ و هەمان شەو کە باران بەرێژنە دەباری و بارزانییەکان چاوەڕوانی کارێک نەبوون، شەو لوتکەی بەرزی خان تاوسی ـ کە دڵنیا بوو لەو شەوەدا بەتاڵە، داگیر کرد و سەعات حەوتی بەیانی بەرەو وەزنە کەوتە رێ.

بەرزاییی خان تاوس لە سەعات ٣ی رۆژی بیست و چواری رەشەمێ بەبێ ئاگای دوژمن گیرا و لە سەعات حەوتی بەیانیدا هێرش بە تۆپبارانی تۆپخانە و تەکاندانی زرێپۆش کە بەوپەڕی دژوارییەوە لەناو قوڕ و لیتەدا هەڵمەتی دەبرد، دەستی پێ کرد.

لە سەعات یازدەی بەیانیدا پاش ئەوەی زیانی گیانی بەدوژمن گەیشت، وەزنە کەوتە دەست. هەمان کات هەندێ لە بارزانییەکان کە لە دەربەندی شەیتان ئاوادا بوون بەبیستنی دەنگی تەقە بەرەو وەزنە هاتن و، لە رێگەی بڵندایییەکانی سەرووی وەزنەوە بەرەو خان تاوس چەپاویان هێنا. هەرچەندە ئەو بڵنداییانە بەدەستی هێزە ناوچەییەکانەوە بوون بەڵام وێڕای ئەوە لەو رێکخستنەی بۆ ئەم پەلامارە ئامادەکرابوو قەڵای تاوس کرابوو بەئامانجی سریەی سێیەمی فەوج و فەرمانی پێ درابوو کەوا بەبڕینی گرانەوە بەرە ئاواییی وەزنە «هەرچەندە پێشتر داگیر کرابوو» رێگە بگرێ و لوتکەی وزەنە

قایم و موکم بکات. هەر ئەو کاتەی هێزی سریە و تۆپخانە پێی نایە وەزنەوە ئیتر لە ناکاو دەنگی تەقە و دەسرێژی خەست لە لای خان تاوسەوە بلّند بووەوە و دەرکەوت ئەو هێزانەی دەوڵەت کە لەوێدا بوون لە تەنکێشەوە کەوتوونەتە بەر پەلامار «ئەمانە هەمان ئەو هێزانە بوون لە دەربەندەوە خۆیان گەیاندبووە ئەوێ و ژمارەیەکیش لە بەرگریکەرانی وەزنە چووبوونە پالّیان» ، ئیتر لەو شوێنەدا نایب زابتێک کە سەرکردەی هێزەکەی لوتکە بوو شەهید کرا و هێزەکەشی لەلایەن بارزانییەکانەوە هەڵەتەی خوارەوە کرا.

هێندەی نەمابوو زۆربەی هێزی فەوج لە وەزنە توشاری هەلومەرجێکی نالەبار ببێ بەلاّم سریەی سێیەم ملی رێگەی خۆی گرتبووە بەر و لە کاتی پێویستدا گەیشتە شەرگە و رووی ئاگری تۆپخانەی لە دووریی ١٥٠٠ مەترەوە کردە دوژمن و، زرێپۆشێکی مامناوەندیش بۆ بەهێزکردنی سریەی سێ لە بن سەرکردایەتیی نەقیب «رەجەبیون»دا نێردرایە ئەوێ.

سریە توانیی بەوپەڕی لێوەشاوەیی و خۆبەختکەری و خێراییەوە، وێڕای خستنی زیانی گیانی لە دوژمن، بەرەو دواوەی بگێڕێتەوە و بەپەلاماری خۆی بۆ قەلاّ ، بیگرێ و موکمی بکات. ئیتر بەم شێوەیە سەرکەوتنی یەکجارەکی بەدی هات. لە ناوەندی بەرەی شەڕدا، فەوجی سوارە و سوارانی خێلاّنیش کەوتنە هێرشبەری و هەتا دەمی رۆژئاوای بیست و چواری مانگ ئەم هێرشە بەرەوپێش تەکانی دا و هەتا دەربەند پەرەی گرت. دوژمن بەرەو بلّندایییەکانی پیرناسر و ئاواییی دەربەند کشایەوە و قەلاّی «چوار بت»یش کەوتە دەستی سوارانی خێلاّن، لە ڕاستیدا نەخشەی سەرکردایەتی لە ناوەند و لەبالّی چەپدا لە کات و ساتی خۆیدا جێبەجێ کرا.

لە بالّی چەپەوە یەک سریە و نیو لە فەوجی هەمەدان، دەستەیەک تۆپی ٧٥ی و دەستەیەک هاوەن، شەو چوونە نەلۆس و سوارانی مەنگوڕ بەرەو سینگان دەستیان بەهێرش کرد.

هێرشی ئەو سوارانە بەوپەڕی بێ پەروایی و بێ ئەوەی هیچ ئاگایان لە هەردوو بالّ و پاشکۆی خۆیان هەبێ دەستی پێ کرد، هەموو سوارەکان بەرۆژ لە چۆمی گادەر پەڕینەوە و بەگەلەکۆیی ڕوویان لە سینگان کرد. بارزانییەکان لە قەلاّی سینگانەوە چاویان لەم کارەی ئەوان بوو، بەهیچ جۆر تەقەیان نەکرد و بەدزییەوە هەندێک هێزی خۆیان بەرەو بالّی ڕاست و پاشکۆی ئەوان نارد. پاش ئەوەی سوارەکان بەمەودای حوکمی گوللە نێزیک کەوتنەوە ئیتر لە خافلّەکی لە ناو قەلاّوە درانە بەر دەسرێژ و چەند کەس و چەند ئەسپێک

کوژران. سوارەکان بەپەلەپرووزێ و بەنارێکی بەرەو زێ گەڕانەوە. پاش ئەوەی گەیشتنە زێش بارزانییەکان لە تەنکێش و لە پاشکۆوە دایانگرتنەوە بەر تەقە. ئەو سێسەت سوارە بەوپەڕی نارێکی لە بەرزاییەکانی باشووردا کردیانە هەڵات هەڵات و بارزانییەکان هەلیان بۆ هەڵکەوت هەتا بەهێزێکی نێزیکەی ٨٠٠ کەسییەوە ڕوو بکەنە فەوجی هەمەدان لە نەڵۆس.

خوالێخۆشبوو رائید کلاشی کە بارودۆخی سوارەکان بەو ئاوایە دەبینێ، ئاواییی نەڵۆس بەجێ دەهێڵێ و لە گردێکی باشووری ئەو ئاواییەدا سەنگەری بەرگری دەگرێ. بارزانییەکان وردە وردە هەتا سبەینەی رۆژی ٢٥ گەمارۆی هێزی خوالێخۆشبوو رائید کلاشی بەتەواوی دەدەن و، بەرزاییەکانی «دۆڵ» کە بەسەر سەنگەرەکانی ئەواندا دەڕوانی دەکەوێتە بەردەستی دوژمن. شکان و هەڵاتنی سوارانی مەنگوڕ کارێکی سەیر و سەرنج ڕاکێشی لە ورەی سوارانی تری خێڵان کرد. بەجۆرێک بەر لەوەی بکەونە بەر پەلامار و هێرش، دەستیان کردە پاشەکشێ. لە ئەنجامی ئەوەی هەتا رۆژئاوای رۆژی بیست و چوار ڕووی دا، شەوی ٢٥ بەرزاییەکان لە لایەن خێڵانەوە بەجێ هێشتران، تەنانەت بەرزاییی «چوار بت»یش کە بایەخێکی گرینگی لە پاراستنی هێلی چەوڕێژی نەغەدە ـ سۆفیان ـ خانەدا هەبوو ئەویش بەبێ بەرگەگرتن چۆڵ کرا و ئەو خێڵانەی ئەوێیان لە بن دەستدا بوو بەرەو گەزنە پاشەکشێیان کرد. لە ئەنجامدا سەعات ٢٠ی رۆژی بیست و چواری رەشەمێ بارودۆخی بەرە وەک دۆخی سەعاتێک پێش دەسپێکی هێرشی لێ هاتەوە و کەتیبەی سوارانیش بۆ قەڵاجوق پاشەکشێیان کرد. لە سەعات ١٨دا رائید کلاشی بەهۆی بێتەلەکەی خۆیەوە پێوەندیی بەورمێوە کرد و یارمەتیی خواست. لە سەعات بیستدا لە سەرۆکایەتیی فیرقەوە لە ورمێ فەرمان درا کەتیبەیەک لە فەوجی ٣٢ کە لە نەغەدە مابووەوە بەشەو بەهۆی لۆرییەوە بۆ بەهاناوەچوونی رائید کلاشی بنێردرێ.

ئەم فەرمانە ئەوکاتەی گەیشت، بەرزاییەکانی چواربت کەوتبوونە بەردەستی دوژمن و ڕێگەی چەوڕێژ لەمەترسیدا بوو. بۆیە ناردنی کەتیبەیەک بەشەو بەهۆی لۆری و بەڕێگەی چەوڕێژدا ـ کە لە مەترسییەکی راستەقینەدا بوو، کارێک بوو لەوپەڕی مەترسیدا و دەبووە مایەی کەوتنەوەی زیانی گیانی و لەناوچوونی کەتیبەکە. لەبەرئەوەی هەر لەوکاتەی لۆرییەکان لە نەغەدەوە دەکەوتنە ڕێگە یەکڕاست ڕووناکیی لایتەکانیان لە قەڵای چوار بتەوە دەبیندرا، چەکداران دەسبەجێ بۆسەیان لە تەنیشتنی ڕێگە دادەنا و بەهیوای

گەیشتنی لۆرییەکان دەبوون هەتا لە تاریکیدا بیاندەنە بەر گوللە. دیار نەبوو لەو خافڵەکییەدا چارەنووسی ئەم کەتیبەیە بەچی دەگەیشت، بۆیە ئەم پرسە بەتەلەفۆن لەلایەن عەمید بیگلەرییەوە گەیەندرایە سەرۆکایەتیی فیرقە و دواجار بەپەسند زاندرا کەتیبەی پیادە بەشەو بچێتە جێگەی کەتیبەی سوارە «قەڵاجۆق» و «هەن هەنە» و کەتیبەی سوارە لە سبەینەی بیست و پێنجدا بەهانای رائید کلاشییەوە بچێ. بەهەمان شێوە فەرمان بەکەتیبەیەکی تری فەوجی ۱۲یش درا کە لە مەهاباد بوو بۆ ئەوەی دەمودەست بەفریای بەرەی نەغەدەوە بچێ.

لە سەعات ۲۱دا، کە لە ورمێوە پرسیاری بارودۆخی رائید کلاشی کرا «ئەودەم بێتەلی نەغەدە لەکار کەوتبوو و نەیدەتوانی یەکراست پێوەندی بەنەڵۆسەوە بکات» وەڵام هاتەوە بارودۆخ هەتارادەیەک هێور بووەتەوە.

کەتیبەی سوارە بەشەو جێگۆرکەی پێ کرا و بەهەندێک دواکەوتنەوە بۆ پشتەوانی بەڕێ کەوت، بەڵام لەبەرئەوەی هەردوو بەری رێگە بەدەستی بارزانییەکانەوە بوو، عەقید ئەنساری بەنیازی خۆپاراستن لە رێ پێ گیران و پەککەوتن، بەپێچدانەوەیەکی فرەوان لەلای گردەسپیانەوە توانیی پاشنیوەڕۆی رۆژی ۲۵ بگاتە سۆفیان. ئەوکاتە بەسەرهاتی رائید کلاشی بەشەهیدبوونی خۆی و بەدیلگیرانی پیاوەکانی لە سەعات ۱٦ی رۆژی بیست و پێنجدا بەکۆتا گەیشتبوو و چەکداران هێرشیان دەکردە سەر بەرزاییەکانی باکوری سۆفیان.

فەوجی سوارە، بەرزاییەکانی سۆفیانی بندەستە کرد و کەوتە باری بەرگرییەوە، هەروەها دەستی کرد بەکۆکردنەوە و رێکدانەوەی سوارە هەڵاتووەکانی مەنگوڕ و، سریەیەکی فەوجی هەمەدان کە لە سنووری خانەدا بوو بانگهێشتن کرد بۆ سۆفیان و دوژمنیان لە هێلی سۆفیان راگرت. هەروەها لاوازیی هێزی خۆیان لە بەرامبەر هێزی دەسدرێژیکەری دوژمندا بەسەرۆکایەتیی بەرە راگەیاند.

بۆ ئەوەی لە چۆنیەتیی رووداوی شەهیدبوونی رائید کلاشی تێ بگەین پێویستە ئەو هێزەی بۆ کردەوە لە ژێر سەرکردایەتیی ئەودا بوو لە رۆژی بیست و چواردا، بخەینە بەرچاو.

هەتا رۆژی بیست و چواری رەشەمە کاروانی رائید کلاشی کە پێک هاتبوو لە سریەیەکی پیادە و دوو دەستە برێنی گران و دەستەیەک تۆپخانە و یەک هاوەن، گەیشتە

نەلۆس و تیایدا جێگیر بوو. خێلانی مامەش و مەنگوریش نێزیکەی ١٥٠ کەسێک دەبوون لە بن سەرپەرشتیی ملازم دوو نەوبەهاردا گەیشتنە «دەقورچی».

رائید کلاشی سەعات ٥ی پاشنیوەڕۆی ڕۆژی بیست و چوار پاش ئەوەی خێڵەکانی ئەو لە مەیدان بەزین، لە نەلۆسەوە کردەوەی خێڵە ناوبراوەکانی دەسبەجێ بەبێتەل گەیاندە سەرۆکی فیرقەی چوار کە لە ورمێدا بوو. فەرماندەی فیرقەی چوار بێ وچان بڕیاری دا کەتیبەیەک بەنیازی پشتەوانیکردنی رائید کلاشی لە مەهابادەوە بۆ نەغەدە و لەوێوە بۆ نەلۆس بکەوێتە ڕێ. هەروەها راپۆرتی دایە ئەرکانی سوپا کەوا ئەو کەتیبەیەی دەبوو لە فیرقەی ٣ەوە بێ هێشتا نەگەیشتووەتە ورمێ و پێویستە پەلە لە هاتنی خۆیدا بکات. وێڕای ئەمە ٤ کەس لە باڵەفڕوانانی لێهاتوو و ٤ باڵەفڕە و بڕێک بۆمبای ٥٠ کیلۆیی لە ناوەندەوە بنێردرێن.

بارزانییەکان دوای شکاندنی خێلانی ناوبراو، سوودیان لەو هەلومەرجە وەرگرت و، درێژەیان بەبزاوتی خۆیان دا و هەتا ئێوارەی ئەو ڕۆژە گەیشتنە نەلۆس. سبەینەی ڕۆژی بیست و پێنج بارزانییەکان لە ئاواییی نەلۆس دەرکەوتن و بەرەو بەرزاییەکانی باشوور کەوتنە ڕێ، شەڕ لەو بەرزاییانەدا هەڵگیرسا و بارزانییەکان لە دوو لاوە گەمارۆی ئەو ئاوایییەیان دا. هێرشی گەرمی بارزانییەکان تەبای ئاگری تۆپخانە کە شوێنەکەی لە باکوری چۆمی گادەر بوو، تاو بەتاو گەرمتر دەبوو. بەشێوەیەک، ساچمەی گوللەیەکی دوژمن راست بەیەکێک لە تۆپەکانی رائید کلاشی کەوتبوو و تۆپەکەی لەکار خستبوو. نۆ لە سەربازان، حەوتیان تۆپهاوێژ بوون شەهید بووبوون و شەش سەرباز بریندار و هەشت هێستریش تۆپی بوون. لە بارزانییەکان ٢٠ کەس کوژران. بەپێی ئەو دەستهاوێژانەی لە دەستدان دەردەکەوێ رائید کلاشی پەرەگرتنی رووداوی ڕۆژی بیست و پێنجی بەرێکوپێکی هەتا سەعات ١٦ بەبێتەل گەیاندووەتە جێی مەبەست.

بارزانییەکان لەلایەکەوە دەستیان بەسەر ئاواییی نەلۆسدا گرتبوو و لەلایەکی ترەوە چاوگەی ژیانەکیی کاروانیان بەتالان بردبوو، بەورەیەکی بەهێز و دارماڵەوە تاو بەتاو پاڵەپەستۆی خۆیان بەسەر کاروانی رائید کلاشییەوە توندتر دەکرد، تەنانەت سەنگەری تۆپخانەکەی خۆشییان دەهێنایە پێشتر و ئەڵقەی گەمارۆیان زیاتر دەهێنایەوە یەک.

ئەم پێکدادانە هەتا سەعات چواری پاشنیوەڕۆی ڕۆژی بیست و پێنجەم درێژە دەکێشێ هەتا ئەوەی رائید کلاشی خۆیشی لە شانیەوە بریندار دەبێ، هەمان کات بەهۆی

ئەنگاوتنی ساچمەی گوللەیەکی تۆپخانەی دوژمن هەموو چاو و بەشێکی ڕوومەتی لەناو دەچێ، ئەو خوالێخۆشبووە هەست دەکا هێزی لەشی ڕوو لە دابەزینە، ئیتر بەقسەی یەکێک لەو سەربازانەی لە نێزیکیەوە دەبن، ڕائیدی کۆچکردوو بەشێوەیەکی خەمبار دەڵێ: «لەبەرئەوەی درێژەدانی ژیان بەم شێوەیە بۆ من دژوار و نالەبارە، واچاترە خۆم ئاسوودە بکەم» و بەدەمانچەکەی بەرپشتی، خۆی دەکوژێ.

ساچمەی گوللەتۆپەکەی دوایی جگە لەوەی ڕائید کلاشیی لەناوبردبوو، هەروەها دوو سەربازی تریش کە لەتەک ئەودا دەبن بریندار بووبوون. دوای کوژرانی سەرۆکی کاروان و پاڵەپەستۆی توندی خراپەکاران و بەکۆتا گەیشتنی تەقەمەنی و برسیەتیی بێ رادە، ئیتر پیاوە بەرگریکەرەکانی گردی نەڵۆس لە سەعات هەژدەی ڕۆژی بیست و پێنجەمدا ناچاری خۆ بەدەستەودان بوون، لە ئەنجامدا ٦٨ سەرباز و ئەم پێنج ئەفسەرەی خوارەوە:

(١) نەقیبی پزیشک خودادۆست،

(٢) ملازم یەکەم یەعقووبی،

(٣) ملازم یەکەم بەسیرەت،

(٤) ملازم یەکەم کەمالی،

(٥) ملازم دووەم فاتمی،

خۆیان بەدەست بارزانییەکانەوە دا و، گرووپێک لەگەڵ ملازم سێیەمی پزیشک «دلێری» و ملازم سێیەمێکی پزیشکی (بیطری)دا بەیارمەتیی هەلومەرجی لەباری زەوی و تاریکیی شەو هەڵدێن و خۆیان دەگەیننەوە سەربازگەی نەغەدە. لە سەعات شازدەی ڕۆژی بیست و پێنجدا بێتەلی ڕائید کلاشی پەکی کەوت، هیچ پێوەندییەک بەکاروانی ناوبراوەوە نەما و ئیتر هەواڵێک لە بارەی بارودۆخی کاروانەوە بەدەست نەگەیشت.

## کردەوەکانی کەتیبەی سوارەی لورستان کە بۆ مەبەستی بەهێزکردنی سەربازگەی نەڵۆس ناردرا بوو

کەتیبەی سوارەی لورستان کە لە سەربازگەی نەغەدەدا بوو، ئەرکی پێ درا هەتاکو بەجادەی دەربەندا بکەوێتە ڕێ و هەرچی زووە خۆی بەبەرزاییەکانی نەڵۆس بگەینێ. سەعات شەشی ڕۆژی بیست و پێنج کەتیبەی پێشوو بەسەرکردایەتیی عەقید ئەنساری لە

نەغەدەوە کەوتە ڕێ و هەر بەڕێوە کاتێ گەیشتە ئاوایی دەربەند، بارزانییەکان خێڵانی دێبوکرییان «کە لەگەڵ ملازمی یەکەم زیائیدا لە ڕۆژی بیست و چواری ڕەشەمەوە لە گوندی پیاچیک وەستا بوون و دەیانویست ڕۆژی بیست و پێنج بەرەو دەربەند بکەونە ڕێ» بۆ دواوە پاڵ دابوو و گوندی دەربەندیان گرتبوو.

کاروانی پێشوو بەناچاری بۆ ئەوەی زووتر بەهانای ڕائید کلاشی بگا ڕێگەی خۆی گۆڕی و لە بەرزاییەکانی باشووری دەربەند « لە تەوەری نەغەدە ـ گەرنە»وە دوای ٩ سەعات بەپێ ڕۆیشتن لە سەعات نۆزدە و نیوی هەمان ڕۆژدا بەسۆفیان گەیشتن. بارزانییەکان وەک نەریتی لە مێژینەی خۆیان کە بەردەوام تێ دەکۆشن بۆ ئەوەی خاڵی لاوازیان چنگ بکەوێ، بەپەلامارێکی خەست بەرگریکەرانی ئەو شوێنەیان بەتەواوی لەناوبرد، ئەوکاتە ئەوان هەم سەرکەوتنیان وەگیر هێنابوو و بەورەیەکی بەرز و بەرزەفڕەوە تەکانی بەرەو پێشیان دەدا، هەمیش زانیارییان هەبوو کەوا بەشێک لە هێزی سوپا «سریەیەک و دەستەیەک تەماتیک» کە هیچ دەسوەکەریشیان پێ ناکرێ، لە گوندی سۆفیانی دە کیلۆمەتر بەرەوخواری نەلۆسدا خۆیان پەنا داوە. بۆیە بڕیاریان دا درێژە بەبزووتنەوەی خۆیان بدەن و بەدەسوەشاندنێکی گورجوگۆڵ سەربازگەکەی ئەوێندەریش تەفروتونا بکەن، بەهەمان ئامانجیش هەر ئەو شەوە خۆیان بەدەوروپشتی سۆفیان بگەیەن.

سەرکردەی فیرقەی ٤ لە ڕووداوەکانی سەرەوەڕا بۆی دەرکەوت پاڵەپەستۆی بارزانییەکان لەبەری باشووردا ڕوو لە پەرەگرییە و پێویستە ڕووەتی یەکەکانی باشوور بێتە گۆڕین و، هەر بەپەلە هاوکاری بەهانای سۆفیان و نەلۆسەوە بنێردرێ و پاشانیش داوای یارمەتی لە تاران بکرێ. لە ڕێگەی ئەرکانی سوپاوە فەرمان درایە سەرکردەی هێز(١٨) کەوا لەبەرئەوەی تایەفەکانی مەنگوڕ و مامەش بەهۆی شکانیانەوە لە بارزانییەکان تۆقیون و ورەیان سفرە، بۆیە پێویستە دڵخۆشییان بدرێتەوە و چیتریش خێڵانی ناوچەیی سەربەخۆ لە ئۆپەراسیۆنی سەربازیدا بەشداری نەکەن.

بارزانییەکان پاش ئەوەی نەلۆسیان گرت، لە سەعات ٧ی سبەینەی ڕۆژی بیست و شەشدا کەوتە پەلاماری ئەو سریەیەی سۆفیانی پێ سپێردرا بوو. سریەی ناوبراو بەرتەکی پەلامارەکانی دایەوە هەتا ئەو دەمەی پەلامار لە باڵی بێ بەرگریی سریەوە ـ کە خێڵانی ڕاکردووی مامەش و مەنگوڕ پێشتر ئەرکی پاراستنی ئەوێیان لە ئەستۆدا بوو و ئەوێ

(١٨) واتە سەرکردەی هێزی بەژەکی ( بری ).

دەمێ شکابوون و هەڵاتبوون، پەلامار گوڕی ستاند و بارزانییەکان گەیشتنە یەکێک لە چەپەرەکان و توانییان سەربازێک شەهید بکەن و ١١ کەسیش لە بەرگریکەرانی چەپەرەکە دیل بکەن.

ئەوکاتە، کەتیبەی سوارەی لورستان گەیشتە جێ و بەسوودی سریەی ناوبراو تێکەڵی شەڕەکە بوو، لە بەرزاییەکانی سۆفیانەوە کە هێشتە بەدەستی سریەوە مابوو سەرشاری بزاوتی خۆی دامەزراند و کەوتە هێرش، لە ئەنجامی پەلاماری گورجوگۆڵ لە بەرامبەر بارزانییەکاندا، توانیی جارێکی تر بەرزاییەکانی باکوری سۆفیان لە دەستی بارزانییەکان وەربگرێتەوە و هێزێکی سوارە لەوێ جێ نیشتە بکات. بارزانییەکان لەم کێبەرکێیەدا زیانی گیانیی زۆریان پێ گەیشت بەجۆرێ چەندین لاشەیان لێ بەجێ مابوو و لەگەڵ خۆیانیان نەبردبوو.

وەک پێشتر ئاماژەی پێ درا، ڕۆژی بیست و چواری ڕەشەمە دوای شکانی خێڵانی مامەش و مەنگوڕ، سەرکردەی فیرقە بڕیاری دا بەنیازی بەهێزکردنی کاروانی رائید کلاشی کەتیبەیەکی پیادە لە مەهابادەوە بنێردرێتە نەغەدە و پاشان نەڵۆس. ئەم کەتیبەی بەهێزکردنە پێک هاتبوو لە کەتیبەی ٢ی فەوجی ١٢ی کرماشان و دەستەیەک تۆپخانە و دوو زرێپۆش لە بن سەرکردایەتیی موقەددەم غەفاریدا بوو و بەیانیی ڕۆژی بیست و شەش ئەرکی پێ درا هەتا لە بەرزاییەکانی باشووری ڕێگەی دەربەندەوە «کە ڕێبازگەی ناچاریی کاروان بوو» بجووڵێ و خۆی بگەیەنێتە بەرزاییەکانی باشووری نەڵۆس. کردەوەکانی کاروانی پێشوو لەم بەشەی ژێرەوەدا شرۆڤە دەکەین:

## چۆنیەتیی کردەوەی کاروانی مقەددەم غەفاری و هێزپێدانی سەربازگەی نەڵۆس

نیوەڕۆی ڕۆژی ٢٥ی ڕەشەمە، مقەددەم غەفاری لە وەزنەوە بەهۆی تەلەفۆن بانگهێشتنی نەغەدە کرا. هەتا ئەو دەمە بڕێک لەو یەکانەی کەتیبەی هێزپێدەر کە لە مەهابادەوە کەوتبووە ڕێ، بەنەغەدە گەیشتبوو. عەمید بیگلەری فەرمانی پێویستی بەمقەددەم غەفاری دا و، وتووێژێکی چڕوپڕ لە نێوان ئەو دوو ئەفسەرەدا بەمەبەستی گەیاندنی هاوکاری بەسەربازگەی نەڵۆس کرا.

سەعات دووی پشتی نیوەڕۆ، دوا یەکەی کەتیبەی هێزپێدەری مەهاباد بەسەرکردایەتیی

رائید مساوات گەیشتە نەغەدە و، فەرمان گەیشتە مقەددەم عەلی ئەکبەر غەفاری هەتا زووە وێڕای ئەم کەتیبەیە بەرەو سۆفیان بجوولێ و هێز بەبەرەی ئەویێ بدا و رائید کلاشی لە چەمبەر دەربێنێ.

سەعات دوو و نیوی پشتی نیوەڕۆ، کاروانی پێشوو کە سێ «ناقیلەی حەربی» و زرێپۆشێکیان لە ژێر دەسەلاتدا بوو لە نەغەدە دەرکەوت و نیو سەعات پاشتر ناقیلەکانی پێشەوانی کاروان بەگەرووی «دووئاو» گەیشتن. هێشتا لەم لایەنەدا تەقە ڕووی نەدا بوو زرێپۆش و تانک لە ناوەندی تەنگەلانەکەدا بەرەوڕووی تەقەیەکی خەست و خۆڵ بوونەوە و لە بەرزاییەکانی سەرووی جادەکەدا گەلەیەک لە پیاوانی هێزی دوژمن کەوتنە پێش چاوان. بەم شێوەیە، بۆ سەرکردەی کاروان بوو بەشتێکی بەڵگەنەویست کەوا تێپەڕینی کاروانی ئۆتۆمۆبیل لەم ڕێگەیەدا بەبێ پاکوەکەریی بلندایییەکان کارێکی بێ ئەنجامە و زیانێکی گەورەی لێ دەکەوێتەوە. بێجگە لەمە، بردنی ئەم هێزە بۆ سۆفیان پێش ئەوەی ڕێگەی هانا و هاتوچۆی پشتەوە پاگژ بکرێتەوە بەهەر شێوەیەک بێ ئەنجامی نییە، بەتایبەتیش ئەو دەمە لە ڕێگەی فەوجی سوارەوە زانیاری گەیشتبووە سەرکردەی ئەم کاروانە کەوا ژیانی رائید کلاشی بەو شێوە دڵتەزێنە بەکۆتا هاتووە.

ئەو کاتە، سەرکردەی کاروان دەسبەجێ بڕیاری دا هێرش بباتە سەر بەرزاییەکانی «چوار بت» و ئەوێندەر بەیەکجاری لە هێزی دوژمن خاوێن بکاتەوە و هەتا هەتایە مەحکەمی بکات و بۆ دەسپێکی کردەوەی داهاتوو لە دەستیدا بێ. ئەو دەمە سەعات لە دەوروبەری چواری پاشنیوەڕۆدا بوو و بەگوێرەی وەرز شتێکی ئەوتۆ لە ڕووناکیی رۆژ نەمابوو، هێرشیش بەشەو و لە زەوییەکی نەناس و بێ ئامادەکاری و هاوکاریی ناقیلەدا بەهیچ ڕوویێک لەگەڵ لێوەشاوەیی و ئازایەتییەکی لە دوژمندا هەبوو، ڕێک نەدەهاتەوە. فەرمان درا کاروان بەشەو لە گەرووەکەدا راگیر ببێ و تەواو وشیار بێ. سەرکردەی کاروان هەتا ئەو دەمەی ڕووناکایی مابوو لەگەڵ ئەفسەرانی کارواندا سەرانسۆبییەکی تەواوی کرد و فەرمانی بۆ هێرشی بەیانی دەرکرد.

سەعات ۷ی سبەینەی رۆژی بیست و شەشی رەشەمە، هێرشی کەتیبە بۆ بەرزاییەکانی چوار بت بەم شێوەیەی ژێرەوە دەستی پێ کرد:

(۱) ملازم یەکەم قەرەباغی، سوود لە تاریکیی گەردوگوڵی بەیانی وەربگرێ و بەرزاییەکانی باشووری زارکەی تەنگەبەر کە لە دوژمن چۆڵ ببوو، بەدەستەیەک

برێنی گران بگرێ و، باڵی چەپی هێرش بەئاگربارانی برێنەکانی خۆی داپۆشێ.

(۲) سەت کەس لە سوارانی «شاروێران» کە لە گەرووەکەدا بوون، بەرەوڕووی نەقیب[۱۹] قەرەباغی، دەست بەمانۆر و خۆپێشاندان بکەن. لە دیوی زنجیرە بەرزاییەکانی باشووری تەنگەبەرەوە بەتیرێژێکی بچووک بەرەو گەرووی دووئاو بچنە پێش یان ئەگەر هەر جۆرە پێدرێژییەکی دوژمن لەم دیوەدا هەبێ دایبپۆشن.

(۳) دەستەیەک پیادە بەزرێپۆشێک و برێنێکی گرانەوە و لەبەر رووناکاییی رۆژدا کە بەتەواوی دیار بن، لە باڵی راستەوە بەرەو باکوری رۆژئاوا بچنە پێش و وا خۆ بنوێنن نیازیان پەلاماردانی باڵی راستە و زرێپۆشەکەیش وەک تانک پێشان بدەن.

پاشماوەی کەتیبەکە و کەمتر لە دەستەیەکی پیادە کە لە سپێری دووەمدا دەمانەوە برێتی بوون لە چوار دەستەی پیادە و سێ برێنی گران، لە تاریکیی بەربەیان سوودیان دەبینی و بێ ئەوەی سەرنجی دوژمن بۆ خۆیان بەکێش بکەن دەچوونە بەر زارکی تەنگەڵانەکە واتە شوێنی سەرەتاگە، دوو ناقیلەی شەڕیش بێ وچان بەرەو بەرزاییەکانی باکور هەڵدەکشان و بەرووکاری قەڵای چوار بتدا دەچوونە پێش و بەرگرییان لەناو دەبرد. هێرشیش بەدوو باز دەکرا:

بازی یەکەم: ئەو بەرزاییانەی بێ ناوبڕ دەڕواننە سەر جادە و، بازی دووەم: قەڵای چوار بت. ناقیلەکان دوای هەر بازێک هەتا کاتی گەیشتنەجێ و خۆدامەزراندنی پیادە راگیر دەبوون پاشان بەبازی دووەم دەچوونە پێش.

تۆپی کورتی ۱۰۵یش سەنگەرەکانی دوژمنی ـ کە بەدەرەوە بوون، بەگوللەی راستەوخۆ دەخستە بن ئاگربارانەوە و دەیکوتانەوە. ئەم نەخشەیە بەوپەڕی وردی و چاودێرییەوە جێبەجێ دەکرا.

دوژمن بەپێشوەچوونی لاباڵی راست بەکێش کرابوو، کاتێ بەخۆی هاتەوە ناقیلەکان بازی یەکەمیان گرتبوو و لە بەرزاییی سێسەت مەتری سەرووی سەنگەرەکانی ئەوانەوە دیارکەوتن، پیادەش بێ پشوو گەیشتنە جێ و لە ملەی کێوەکەدا بەسەر کەوتن، بەشی دژواری کارەکە برێتی بوو لە پێشوەچوون بەنێو نشێوی بنی بنەوەی دۆڵەکەدا، بەبێ ئەوەی

(۱۹) پاش ئەوەی ئەفسەری سوپا دەکوژرێ پلەیەکی بۆ زیاد دەکرێ بۆیە لێرەدا ملازم یەکەم قەرەباغی کراوە بەنەقیب قەرەباغی.

دوژمن هیچ تەنگاسییەک پەیدا بکات جێبەجێ کرا بەڵام ئاگربارانی خەستی دوژمن دوای ئەوە دەستی پێ کرد.

ئەو کاتە، سەرکردەی کاروان هەنگاو هەنگاو پێشوەچوونی ناقیلەکانی گرتبووە بن چاوان. ناقیلەکان بەزەوییەکی گونجاودا دەخشێن و دەم بەدەم لە سەنگەری دوژمن نێزیک دەکەوتنەوە. بەڵام بەرگری نەدەپسایەوە و ئاگری برێن و تفەنگ بەخەستی بەسەر ناقیلەکاندا دەبارێ بەجۆرێ ناقیلەکان سەت پێ، پەنجا پێ، دە پێ لە سەنگەری دوژمن نێزیک دەبوونەوە بەڵام هێشتا ئاگری یەکێک لە سەنگەرەکان نەبڕابووەوە هەتا ئەوەی ناقیلەیەک بەسەر سەنگەرەکەی دوژمندا ئاوا بوو، ئاگر بڕا و فەرمانی گرتنی زەوی بەپیادە درا.

سەعات یازدەی تەواو، ئامانجەکە گیرا و بەرزاییەکان لە دوژمن پاک کرانەوە. دیمەنێکی سەرسڕهێن دوای گرتنی سەنگەرەکەی دوژمن کەوتە بەرچاو ئەوە بوو یەک مرۆڤی بارزانی لە سەنگەردا مابووەوە و تەقەی کردبوو هەتا ناقیلەکە بەزنجیر بەسەری کەوتبوو. هەر ئاگری ئەم کەسەش بوو هەتا دوا دەقیقە نەپسایەوە و، پتر لە دووسەت گوللە بەو ناقیلە ناوەندییەی کە نەقیب ڕەجەبیوونی تێدابوو کەوتبوو و هەردوو لایتەکەی وردوهەڕا و چاملغەکانی کون کون بووبوون، دەوروپشتی برێنە گرانەکەش ئەنگاوترا بوو و لوولەتۆپە ٣٧ەکەش بەگوللەیەکی بڕەک هەتا ناو لوولەکەی کون بووبوو و لەکار کەوتبوو. ئەمە بوو ورەی ئەو دوژمنەی سوپای ئێران ڕووبەڕووی بووبووەوە.

زیانی گیانیی کاروان لەم هێرشەدا تەنیا سەربازێک بوو. دوای گرتنی ئامانج، رائید مساوات بەخۆی و دەستەیەک برێنی گران، چوار دەستە پیادە و ناقیلەیەکی سووک لە چواربتەوە بۆ پاراستنی شوێنە گیراوەکە، هەروەها پاشماوەی کاروانەکەش لە سەعات ١٣دا بەرەو سۆفیان کەوتنە ڕێ و لە سەعات سێی پاشنیوەڕۆدا هێزەکان بەسۆفیان گەیشتن و چوونە ژێر دەسەڵاتی عەقید ئەنسارییەوە. لێرەدا، پێنگاوی یەکەمی کردەوەکانی ڕۆژی بیست و چوار و بیست و پێنج و بیست و شەش تەواو بوو.

ئەو ئەنجامانەی لەم پێنگاوەی ئۆپەراسیۆندا وەردەگیرێ و، لێکۆڵینەوەی بێ لایەنانەی ئەم ڕووداوە پێشانی دەدا:

(١) سەرکردایەتیی کاروانەکانی باشوور هێزێکی سپێری ئەوتۆی لە بەردەستدا نەبوو بتوانێ بەخێرایی سوودێکی باشتر لەو سەرکەوتنەی هەتا ئێوارەی ڕۆژی ٢٤ بەدی

هاتبوو وەربگرێ. ئەو چوار کەتیبە و کەسە هێزپێدەرانەی پاشان لە ژێر دەسەڵاتی ئەو داندران ئەگەر لە سەرەتاوە لە ژێر دەسەڵاتیدا بوونایە ئەوا کردەوەکان زۆر زووتر و بەپەلەتر بەکۆتا دەهاتن. ئەو نەخشەیەی لەلای «سینگان»ەوە بۆ بەدیهێنانی جووڵەیەکی فرەوانی تەنیشتەکی هەڵبژاردرا، بەسەرکەوتوویی جێبەجێ کرا و لەوانەیە گرتنی شنۆ کە هەتا ڕۆژی پازدەی ئاخەلیوە درێژەی کێشا، هەر لە هەمان ڕۆژانی کۆتای ڕەشەمەدا بکرایە.

(٢) بەجارێک و بۆ هەتا هەتایە چەسپا کەوا ناشێ کاری هێزی خێڵان ـ لە شان بەشانی هێزی سوپادا متمانەی پێ بکرێ. هەڵسوکەوتی لاسار و نابەجێی سوارانی خێڵان و شکان و ڕەوکردنیان، زللەیەکی گرانی وەشاند کە ئەنجامی یەکڕاستی ئەوە، بەسەرهاتی خوالێخۆشبوو رائید کلاشی بوو.

(٣) ڕەوانشاد خوالێخۆشبوو رائید کلاشی بوێرانە و بەنواندنی ئەوپەڕی خۆبەختکارییەوە شەهید بوو و ناوی پڕ لە شانازیی ئەو بۆ هەتا هەتایە لە مێژووی سوپای ئێران و لە دڵی یەکە یەکەی ئێرانییەکاندا نەمر دەبێ، بەڵام ئەو چارەنووسە لە ئەنجامی هەڵەیەکی سوپایی بوو کە شەهیدی کۆچکردوو کردبووی، ئەویش ئەوە بوو پاش ڕووبەڕووهاتنی ئەو هەلومەرجەی باس کرا دوو ڕێگە کەوتبوونە بەردەمی ئەو:

ئەلیف: دەسوەکەری و گرتنی پارێزێکی باش.

بێ: پاشەکشێ بۆ سۆفیان و گرتنی ئەو هێڵەی لەوێ ئامادەکرابوو، واتە لە برجەکانی سەر بەرزاییەکانی باکوری سۆفیاندا و لەگەڵ سریەیەکی تر لە کەتیبەکەی خۆی کە لە سۆفیاندا بوو، دەتوانرا ئەم پاشەکشێیە لە ڕۆژی بیست و چواری ڕەشەمە و شەوی بیست و پێنجدا جێبەجێ بکرێ.

یەکەم : ئەگەر بڕیار لەسەر بەرگری بوایە هەڵبەتە لە ڕووی سوپاییەوە ئەمە بەهێزتر و یەکەمینتر بوو ئەوا نەدەبوو ئاواییی نەڵۆس لە دەست بدا کە دێیەکی گەورە و پڕ لە خانووبەرەی جۆربەجۆر بوو و، پاڵ بدا بەگردێکی ڕووتەنەوە کە ئەو بەرزاییانەی بەسەریشیاندا دەڕوانی هەر بەدەستی دوژمنەوە بوون. لە ئەنجامدا دوژمن پێی کرا لە شەوی ٢٥دا ئەو بەرزاییانە بگرێ و گەمارۆیەکە تەواو بکات. وێڕای ئەمە تۆپێکی ٧٥یش بباتە شوێنێکی نێزیک و، تۆپخانەکەش بەئاشکرا بەڕووی گردەکەوە ببیندرێ بۆ ئەوەی لەو نێزیکانەوە لە شوێنێکی نەدیوی لێڕەوارێکەوە بخرێتە ژێر ئاگرەوە و لەکار

بخرێ و رائید کلاشیش خۆی بەخەستی بە پرووشکی گوللەتۆپ بریندار ببێ و لە نێو بچێ. بەڵام ئەگەر بەرگری لەناو گوند بوایە ئەوا ماڵ و باڵەخانەکانی ئاوایی دەبوونە چاترین پەنا و پارێزی مرۆڤ و مالآت و ئامێرەکانی ئەو، هەروەها ئەگەر ئاوایی لە بن دەسەڵاتی ئەودا بوایە ئەوا دەیتوانی هەتا هێزی بەهاناوەهاتووی دەگەیشتێ بەرگری بکات. بەتایبەتیش کە تۆپی دوژمن نەیدەتوانی بەو شێوە کارایی و بەچاوی پەتییەوە، چەکدارە بێ نوایەکانی ئەو تۆپباران بکات. ئەمەیە ئەنجامی نەبوونی تاقیکردنەوە و لێوەشاوەیی کە هەندێک لە ئەفسەرانی ئێمە تووشی هاتوون.

هەرچەندە نابێ کاری ئەفسەرێکی بەسەربەرزی و بەوپەڕی خۆبەختکەرییەوە خۆی لە پێناوی نیشتماندا پێشکێش کردووە بخرێتە بەر رەخنەوە بەڵام پێویستە راستی بگوترێ بۆ ئەوەی لەمەوپاش ببێ بەدەرس و تاقیکردنەوە بۆ ئەفسەرانی تر.

(٤) بەلای دوژمنەوە، کەسانی سوپا لێوەشاوە و چاوشکێن نەبوون بۆیە دەبوو سوودیان لە چاکتریی ئامێر و ئامرازەکانی خۆیان وەربگرتایە وەک چۆن لە کردەوەی چواربتدا هەرچەندە دوژمن چەلەنگی و ئازایەتییەکی بێ وێنەی هەبوو بەڵام ئاگری تۆپخانە و کاری ناقیلە ئەوانی شڕ کرد بێ ئەوەی بتوانن لە کەسێکی سوپا زیاتر بەفیڕۆ بدەن. دەبێ بزاندرێ کەوا ئەم چاکترییەی ئامێر بەردەوام و لە ئاست هەموو دوژمنێکدا لەبەر دەستدا نییە و، دەبێ سوپا مشووری مەشقدانی سەرباز و کادیرانی خۆی بخوات.

(٥) دەسوەشێنی و هەڵمەتی شەوان بەمەرجێک بۆ مەبەستی کارێکی دیاریکراو و ئامانجێکی بچووک بێ بەتایبەتیش ئەگەر خافڵەکی وکتوپڕیی لەگەڵدا بێ، کارێکە سەرکەوتن دەهێنێ. بەردەوامیش گرتنی خاڵی گرینگی کێوان لە شەواندا ئاسان دەبێ و کاری هێزەکانی رۆژ سووک دەکات. بۆ نموونە شەوگیرکردنی قەڵای خان تاوس ئەم جیاوازییانەی تێدا بوو و، رائید «کەبیری» توانیی لە ئەنجامی ئەم سەرکەوتنەی شەویدا هێرشەکەی خۆی بەهاسانی لە رۆژدا جیبەجێ بکات.

## فەرمانە نوێیەکانی وەزارەتی شەڕ بۆ یەکەکانی ناوچەی کوردستان

لە بەرەودواهاتنی دوا سەعاتی ڕۆژی بیست و پێنجی ڕەشەمەدا کە ڕووداوی ناخۆش لە نەڵۆس و ناوچەکانی باشووریدا هاتبوونە پێش، وەزارەتی شەڕ دوای بەدەست گەیشتنی دوا ڕاپۆرت، فەرمانێکی گشتیی بۆ سەرکردەکانی ئەم ناوچەیە دەرکرد و، بۆ پێشگری لە ڕوودانی ڕووداوی ئاوها فەرمانی دا خۆ لە ڕووبەڕووبوونەوەی یەکە بچووکەکانی سوپایی لەگەڵ بارزانییەکاندا، بپارێزرێ. لەبەرئەوەی تاقیکردنەوە دەری خستووە کە بارزانییەکان پیاوی ئازا و مێرخاس و گیان لەسەردەستن، بەبێ ترس دەکەونە ناو کار و خاڵی لاواز دەکەنە نیشانەی پەلاماری خۆیان، بەمەش ڕووداوی ناخۆش دەهێننە پێشەوە.

بۆ ئەوەی پێشهاتە ناخۆشەکەی نەڵۆس سارێژ ببێ پێویستە هەرچی زووترە کاروانەکانی ژێر سەرکردایەتیی عەقید ئەنساری و عەقید غەفاری بەرەو سۆفیان و نەڵۆس بکەونە ڕێ و بەهەر ئاوایەک بێ نەغەدە بگرن.

پێویستە ژمارەی باڵەفڕە لە پێناو پێشوەچوونی کاروانەکانی سوپا و تۆقاندنی دوژمندا زیاتر بکرێ، هەروەها بۆ لە سنوور دەرکردنی یەکەکانی پێشوو دەبێ بڕیاری پێویست وەربگیرێ.

پاش گەیشتنی ئەو فەرمانانەی سەرەوە و چوونی کاروانی عەقید غەفاری بۆ پاڵ یەکەکانی سۆفیان، شەو بڕیاردرا بەرەبەیانی ڕۆژی بیست و حەوتی ڕەشەمە هێرش بۆسەر کوردە بارزانییەکان دەست پێ بکات و، بەرەو نەڵۆس درێژە بەپێشکەوتن بدرێ. بەڵام بارزانییەکان سبەینەی ئەو ڕۆژە پێش ئەوەی کاروانی ناوبراو دەست بەهێرشی خۆی بکات، ئەوان سەرلەنوێ لە سێ لاوە دەستیان بەهێرشێکی خەست و خۆڵ کرد، بەجۆرێک هەر لە سەرەتای هێرشدا ١٨ گوللە تۆپیان هاوێشت بەڵام ئەو هێرشە بەباشی بەرتەک درایەوە و، هێرش لەلایەنی ئەوانەوە هەتا سەعات ١٢ درێژەی کێشا.

لە سەعات ١٢ی پێشوو بەدواوە، کەتیبەی سوارەی لوڕستان و دوو کەتیبەی پیادە و تۆپخانە دەستیان بەدژەهێرش کرد و هەرچەندە بارانێکی بەتاو دەباری و زەوی بووبوو بەقوڕ و لیتە بەجۆرێک خێراییی هێرشی کاروانی کەم دەکردەوە بەڵام وێڕای ئەمەش پێشکەوتن هەر بەردەوام بوو. بارزانییەکان بەوپەڕی گورجوگۆڵییەک کە لە شەڕی خێڵاندا وێنەی کەمە، بەرگرییان لە حەشارگەکانی خۆیان دەکرد و بەرخودانێکی سەختیان پێشان دەدا و تەنانەت ئەو دەمەی زرێپۆشی شەڕکەریش پانی دەکردنەوە هێشتا بەنارنجۆکی

دەستییەوە هەڵمەتیان دەهێنا و، ئامادە نەبوون بەهیچ ئاوایەک دەست لە پارێزەکانی خۆیان هەڵگرن.

رۆژی بیست و حەوتەم، باڵەفڕ بۆ سوودی کاروانەکانی باشوور، نەڵۆس و شنۆیان بۆمباران کرد بەجۆرێک کاروانی ئەرک پێدراوی نەڵۆس توانیی بەنارنجۆکی دەستیی خۆیەوە هێرش بباتە سەر سەنگەری بارزانییەکان و، بەتەواوی لە ئاوایی و بەرزاییەکانی ئەو ناوەیان هەڵتە بکات. کاروانی ناوبراو بۆ جێبەجێ کردنی هێرشی خۆی، ئەوپەڕی گیان لەسەر دەستی و پشت ئەستووریی نیشان دا. لە سەعات ١٨ی رۆژی بیست و حەوتەمدا توانیی بەرزاییەکانی باکور بگرێ و بارزانییەکان بەرەودوا بگێڕێتەوە.

لەو بەگژیەکداچوونەدا ملازم یەکەمی پیادە رەزا قەرەباغی سەرکردەی سریەی برێنی کەتیبەی ٢ی فەوجی ١٢ی لیوای کرماشان و دوو سەربازی لەگەڵدا شەهید بوون و چوار کەسی تریش بریندار بوون. زیانی بارزانییەکان ١٦ کوژرا(٢٠) و نێزیکەی ٢٠ بریندار بوون کە لەگەڵ خۆیاندا بۆ شنۆیان بردنەوە، دوای سەرلەنوێ گرتنەوەی نەڵۆس لە رۆژی بیست و هەشتی رەشەمەدا، ئەو سریەیەی لە شێن ئاوا باری خستبوو گوازرایەوە سۆفیان و پاراستنی گوندی ناوبراو خرایە ئەستۆی دەستەیەک جەندرمە.

(٢٠) لە دیاریکردنی زیانی گیانیی بارزانییەکان لەو شەڕانەدا نووسەر زۆری پێوە ناوە و بەردەوام زیانی بارزانییەکانی بەزۆر و، زیانی سوپای ئێرانی بەکەم پێشان داوە. خوێنەری بەڕێز دەتوانێ بۆ وەرگرتنی زانیاریی ورد و راست لەبارەی ئەمە بگەڕێتەوە سەر کتێبی ئاماژە پێدراوی سەرۆک بارزانی لە بارەی شۆڕشی بارزان ١٩٤٥ ـ ١٩٥٨ کە ناوی شەهیدانی بارزانیی بەدروستی تۆمار کردووە.

نەخشە ٢: کورد لە ئێران سەرچاوە: حەسەن ئەرفەع

ئێستە پێکدادانەکانی کاروانگەلی باشوور لە دژی بارزانییەکان لە نەلۆس و چواربت و سۆفیاندا بەشێوەی پێشەوە شرۆڤە کران، شایەنی ئەوەیە روو بدەینە کاروانگەلی باکور و، کردەوەی بارزانییەکان کە لە بن چاوەدێریی مەلا مستەفا لە خوارووی ورمێ، دۆڵی قاسملوو و باراندێز و مەواناداا هاتنە روودان، بخەینە بەر لێکۆڵینەوە.

کاروانی عەقید نیساری سەعات ٥ی رۆژی بیست و یەکی رەشەمە لە ورمێوە بەر بە مەوانا کەوتە بزووت، پێنگاوی یەکەم و دووەمیان هەتا سەعات ١٠ی هەمان رۆژ بەبێ پێکدادان بڕی و هەتا نیو سەعاتی پاشنیوەڕۆ توانییان دێهاتی قزلبەند و فتوولان بگرن. ئەو دەمەی کاروان بەر بە«لەرنێ»وە دەچوو، لە هەورازەکانی لەرنێدا لەگەڵ کوردانی رەشید بەگدا بوون بەتووشی یەکەوە و لە ئەنجامی بەگژیەکداچووندا سەربازێکی سەر بەکەتیبەی ٢ی فەوجی ئاهەن شەهید بوو و لە چەکدارانیش یەکێک کوژرا و یەکێکی تر بریندار بوو. بەم ئاوایە، کاروان درێژەی بەڕەوتی خۆی دا و تەبای کەتیبەی ٢ی فەوجی ئاهەن و دەستەیەک لە هاوەن، بۆیان لوا هەتا دەمەوئێوارەی ئەو رۆژە بەشێک لە زینووەکانی لەرنێ و قزلبەند و فتوولان بگرن و خۆیانی تێدا بنەجێ بکەن، پاشماوەی هێزەکەیش لە زینووەکانی «قزکەند»دا خۆی گیرساندەوە.

بەپێی ئەو زانیارییانەی هاتبوون و ئەوانەیش لە کردەوەی رۆژی بیست و یەکدا دەرکەوتبوون، تێ گەیشترا بارزانییەکان هاتوونەتە ناوچەی تەرگەوەڕ و خێڵانی جێ نیشتەی مەرگەوەڕ و دەشتی تەرگەوەڕیان لەگەڵ خۆیاندا رێک داوەتەوە و هێناویاننەتە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی لە بەرامبەر هێزی دەوڵەتدا دەست راست بکەنەوە.

ئەم پێشوەچوونە بەلەز و بەپەلەیەی کاروان شوێنەوارێکی واتاییی زۆرچاکی خستە سەر خێڵانی هەرکی و شکاک، بە جۆرێ رەشیدبەگی جیهانگیریی سەرۆک تایەفەی هەرکی بۆ سەرکردەی کاروانی نووسی و ٤٨ سەعات مۆڵەتی لێ خواست هەتا خۆی بەدەستەوە بدا، هەروەها نووری بەگ کە یەکێکە لە دەسڕۆیشتووانی تەرگەوەڕ باسێکی لەبارەی خزمانی خۆیەوە بۆ ئەرکانی فیرقەی چوار نووسی و داوای پەنادانی کرد. لە لایەنی فیرقەی ٤ەوە وەڵام بۆ سەرجەم خانان و سەرۆک تایەفانەوە چوو کە دەبێ بەوپەڕی خێرایی هەموو خێڵان بەخۆیان و بەچەکیانەوە خۆیان بەسەرکردەی کاروان بناسێنن و چەکی خۆیان بدەنەوە. بەپێچەوانەی ئەمە، بەبێ لەدەستدانی گچکەترین هەل و مۆڵەت بەتوندی سەرکوت دەکرێن.

رۆژی پاشتر کاروان درێژەی بەڕەوتی خۆی دا و، هەر بەدەرکەوتن لە سەرگەدا

پێکدادانێکی خەست و گران لە بانەکانی لەرنێدا هاتە پێش. بەدەسوەکەرییەکی چاپووک و گورجوگۆڵ کە خێلان دەیانکرد هێزی دەوڵەت توانیی بەرگریی ئەوان تێک بشکێنێ و پاش گەیاندنی ٨ کوژراو و ٩ بریندار لە بانووەکانی پێشوویان هەڵەتە بکا و بەرەو پاشیان راو بنێ، کاروانیش پێی کرا بانەکانی لەرنێ بگرێ و لەم بانانەدا خۆی بچەسپێنێ. زیانی دەوڵەت لەم شەڕەدا تەنیا دوو سەربازی بریندار بوو، ئەم بردنەوە نوێیە کارتێکردنێکی واتایەکیی لەناو خێلانی هەرکیدا نواند. لە ئەنجامدا رەشید بەگ لە سبەینەی رۆژی بیست و دووی رەشەمەدا بۆ خۆ بەدەستەوەدان ئامادە بوو و خۆی بەسەرکردەی فیرقە لە ورمێ ناساند. خۆ بەدەستەوەدانی رەشید بەگ بێکۆتایی کاری کردە سەر ورەی تایەفە و خێلانی دەوروپشتی ورمێ بەجۆرێ زۆرینەی خێلان سەری خۆبەدەستەودانیان دانواند و ئامادەی خزمەت بەسوپا بوون.

دوای بەدەستهێنانی ئەم سەرکەوتنە، کاروان لە پاشنیوەڕۆی بیست و دوودا بەڕێ کەوتەوە و هەتا سەعات پێنجی پاشنیوەڕۆ توانیی مەوانا بگرێ و لەوێ دابمەزرێ. بەگەیشتنەجێی سەربازان، دانیشتوانی تەرگەوەڕ پێشوازییەکی گەرم و گوڕیان لە کاروانی سوپا کرد و، دابەستییان لەبەر پێی هێزی سوپادا کرد بەقوربانی. مەلا مستەفا کە لە پێشهاتی کردەوە و پێشوەچوونی خێرای کاروانی نێردراودا بەئاگا بوو، فەرمانی دایە سەرۆک خێلانی خۆی ـ وەک عەمەر بەگ و شێخ محەمەد میرزا ئاغا و وەجدی بەگ و «یەراد»ی ئاشووری کە دەسبەجێ بەخۆیان و ٢٠٠ سوارەوە بەفریای رەشید بەگەوە بچن و بین بەناوبڕ لە پێش گەیشتنی هێزی دەوڵەت بە«مەوانا»دا.

خێلانی پێشوو، رۆژی بیست و دووەم بەڕێ کەوتبوون بەڵام هەر بەگەیشتنیان بەدووریی ١٢ کیلۆمەتری باشووری مەوانا، هەواڵی گرتنی مەوانا لە لایەن هێزی سوپاوە گەیشتە ئەوان و لە ئەنجامدا بەوپەڕی بێ هیوایی و پەژارەوە لەوێ هەڵوەستەیان کرد. لەبەرئەوەی دوور نەبوو هێزی دەوڵەت پێشوەچوونی پتریشی هەبێ بۆیە مەلا مستەفا فەرمانی دایە سوارانی پێشوو بۆ ئەوەی لە هەمان شوێندا بگیرسێنەوە و لە پەلهاویشتنی هێزی دەوڵەت بەرووکاری باشووردا پێشگیری بکەن و هەل نەدەنە هێزی سوپا بەم شێوەیە بارزانییەکان لە گەمارۆ بنێ.

کاروانی عەقید نیساری پاش گەیشتن بەمەوانا و زانینی ئەوەی بارزانییەکان لە ١٢ کیلۆمەتری باشووری مەوانادا گیرساونەتەوە، بەبێ وچان ژمارەیەکی لە سوارانی هەرکی و

ڕەشید بەگ کە ئامادەی ئالیکاری بەسوپا بوون، ڕەوانەی باشووری مەوانا «شێخ شیرین ـ زەنگولان» کرد بۆ ئەوەی هەتا زووە لەگەڵ بارزانییەکاندا دەستەویەخە بېن.

سەرکردەی فیرقەی چوار سەعات (دە)ی پاشنیوەڕۆی ڕۆژی بیست و دوو چۆنیەتیی ڕووداوەکەی تەرگەوەڕی ـ کە لە لایەنی خێلانی هەرکی و شکاکەوە ڕووی دابوو و بارزانییەکانیش تیایدا بەشدار ببوون، بەتەلەفۆن لە شێخ ئەحمەد گەیاند و پرسیاری کرد ئاخۆ بیانوو لە هاوکاریکردنی پیاوانی بارزانی بەخێلانی تر لە دژی کاروانی نێردراودا چییە و بۆچی بارزانییەکان ئاوها هەڵسوکەوت دەکەن. شێخ ئەحمەد وەک جاران وەڵامی دایەوە کەوا سەرۆک خیلانی بارزان نیازێکی ئەوتۆیان نییە، خۆیشی لە دەستهەڵێنانی پیاوانی بارزانی بەڕووی هێزی دەوڵەتدا بەخەمبار پێشان دا و گوتی هیوادارم فیرقە چاوپۆشییان لێ بکات. هەروەها وێڕای نکوولی لەوەی بارزانییەکان نیازێکی خراپیان هەبێ، لە وەڵامی خۆیدا داوای ئەوەیشی کرد لەبەرئەوەی ماڵباتە بارزانییەکان لە رووی خواردن ـ ەوە لە تەنگژەدان بەڵکو قائید فیرقە فەرمان بدات هەندێ خواردن بۆ ئافرەت و منداڵانی بارزانی بنێردرێ.

لە شەوی بیست و سێی ڕەشەمەدا کاروانی عەقید نیساری توانیی یەکە سوپاییەکان لە مەواناداد جێگیر بکا و بۆ ئەوەی زانیاری لە بارەی بارزانییەکانەوە بەچنگ بێنێ هەندێ کەسی لە سوارانی ناوچەیی ڕەشید بەگ و نووری بەگ بەرەو باشووری مەوانا بۆ ئەو خالانەی بە«شێخ شیرین، زەنگولان، توولەگی و ئامینە» ناسراون، هەنارد. ئەو زانیارییانەی گەیشتبوون وایان دەگەیاند کە مەلا مستەفا بەخۆی و ٦٠٠ مرۆڤی سوارەوە لە ١٢ کیلۆمەتری باشووری «مەوانا»دا هەڵوەستەی کردووە و ژمارەیەکی لە سوارانی خۆی لە بانەکانی کەسریک، تووی، گولی و بەردەسوودا دامەزراندووە و هەندێکیشی بەرەو مەوانا بەڕێ کردووە هەتا لەگەڵ یەکە سوپاییەکاندا بەرەوڕوو ببنەوە.

ئەو زانیارییانە نیشاندەری ئەوە بوون کە بارزانییەکان بەیەکجارەکی خۆیان خستووەتە ناو کارەوە و بەخەیاڵی خۆیان پێوەن یەکەکانی سوپا بخافڵێنن و زەبرێکی گەورەیان تێ بسرەوێنن. دەسبەجێ لە ڕێگەی ئەرکانی سوپاوە فەرمان درایە سەرکردەی فیرقەی چوار کە نابێ چیتر هەل و دەرفەت بەبارزانییەکان بدرێ و پێویستە کاروانگەلی باکور و باشوور وێڕای پاراستنی پێوەندی لەگەڵ یەکتردا بەوپەڕی وزە و هێزەوە درێژە بەبزاوت بدەن و هەتا زووە بەشەڕێکی خەست و خۆڵ لە سنووریان دەربپەڕێنن و، لێرەش بەدواوە بەهیچ

شێوه وتووێژیان لەگەڵدا نەکرێ.

بەنیازی راپەڕاندنی فەرمانی ئەرکانی سوپا، سەرکردەی هێز فەرمانی دایە تێکڕای کاروانگەلی باکور و باشوور، هەروەها لەبەرئەوەیش کە بارزانییەکان هەتا ئەو دەمە بەیەکجاری ناوچەی سەلدووز و نەغەدەیان بەجێ نەهێشتووە، ئەرکی بەکاروانگەلی تازەکەند، نەغەدە و سۆفیان راسپارد کە بەلێدان بارزانییەکان لە ناوچەکانی پێشوو دەربکەن. ئێستەیش چۆنیەتیی کردەوەی هەریەک لە کاروانەکان بەشێوەی جیاواز دەخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

## کردەوەی کاروانی عەقید نیساری

## لە باشووری مەواناوا

بەیان بەردانی رۆژی بیست و سێیەمی مانگی رەشەمە، کوردانی تفەنگداری رەشید بەگ و نووری بەگ لە سەرگە «بەرزاییەکانی توولەگی و شێخ شیرین»ەوە دەستیان بەرەوتی خۆیان کرد و کاروانی سوپا بەڕازاوەیی لە مەواناوە بەرەو بانەکانی کەسریک «کە بەپێی ئاگەداری لەلایەن چەکدارانەوە گیرابوو» کەوتە رێگە و، بێ وچان تێکسرەواندنێکی گەرم لە نێوان بارزانییەکان و خێڵانی خۆڵاتیدا دەستی پێ کرد و بارزانییەکان وێڕای پێ کەوتنی زیانێکی گیانیی مەیلەو زۆر، کەوتنە پاشەکشێ. لە خێڵانی خۆڵاتیش دوو کەس شەهید و ٤یش بریندار بوون. مەلا مستەفا بەسایەی گەیشتنی بڕێک هێزی هاوکاری پاش چەند سەعاتێک توانیی خێڵانی نووری بەگ و رەشید بەگ بەرەو دوا رابدا و، بێ پشوو یەکەکانی سوپا کە شان بەشانی باڵەفڕە و زرێپۆشی شەڕکەر دەبزوان درێژە بەپێشوەچوونی خۆی بەرەو باشووری مەوانا بدا و پاش بڕینی ٤ کیلۆمەتر بۆ پێشەوە، ناچار بوون بەهۆی قوڕ و بارانی زۆرەوە کە کۆسپی پێشوەچوونی زرێپۆش بوون، هەڵوەستە بکەن.

دوای وەستانی کاروان، سەرکردە فەرمانی دایە کەسانی سەر بەخێڵانی خۆڵاتی هەتا بەئارمانجی پشکنین و سەرانسۆیی بچنە بانەکانی کەسریک. بەپێی ئەو ئاگەدارییانەی بەدەست هاتبوون پیاوانی بارزانی لە دێیەکانی خوارەوەدا دامەزرابوون:

(١) مەلا مستەفا خۆی و ٢٠٠ سواری بژاردە لە بانەکانی کەسریکدا.

(٢) ٢٥٠ مرۆڤی بارزانی لە بانەکانی بەردەسوودا.

(٣) ٢٠٠ مرۆڤ لە ئاواییی «تووی»دا.

(٤) ٢٠٠ مرۆڤ لە بانەکانی «کۆکی»دا.

پیاوانی پشکنێری پێشوو بەیارمەتیی یەکە سوپاییییەکان درێژەیان بەبزاوتی خۆیان دا، لە بەراییی بانەکانی کەسریکدا جارێکی تر بوون بەتووشی بارزانییەکانەوە و توانییان بەکوشتنی ١٠ کەس و بریندارکردنی ١٥ی تر هەتا بانەکانی کەسریکیان بەرەو دوا بگێڕنەوە. لەم پێکدادانەدا ٤ کەس لە پیاوانی خۆولاتی شەهید و ٦ کەسیش بریندار بوون. بارزانییەکان ناچاربوون لە سەرەتاگەی ناوچەی دەشتدا سەنگەری نوێ بگرنەوە.

ئەو زیانەی لە پێکدادانی بەراییدا بەخێلانی خۆولاتی کەوتبوو ببووە مایەی پەرەگرتنی مەترسی و دڵەڕاوکەیەکی گەورە لەناویاندا بۆیە فەرمان درا بەپارە یارمەتی بدرێن. سەرو ٥٠٠ ریاڵ خەلات بکرێن و، ئەوپەڕی دڵنەوایی و بەزەییییان بۆ بنوێندرێ و بەهیوای دەساندەی دەوڵەت بکرێن.

هەروەها لە ڕۆژی بیست و سێیەمی مانگی رەشەمەدا لە دەربەندی قاسملو هەروەها لە دەربەندی بەراندێزدا هەندێ هێرش لەلایەن بارزانییەکانەوە بەنیازی خافلاندنی کاروانی دەربەندی قاسملو کرا، بەلام لەبەرئەوەی هێرشەکان یەک لەسەر یەک نەبوون و لە لایەکی تریشەوە هێزی دەوڵەت دەستی کرد بەهێرشی پێچەوانە بۆیە بارزانییەکان ئامانجێکیان لە کردەوەکانی خۆیاندا نەپێکا.

لە ڕۆژی بیست و چواری رەشەمەدا کە ئەو پێکدادانە گەرمانە لە نەڵۆس روویان دەدا، هەندێ لە چەکداران هەلیان لە تاریکیی شەو وەرگرت و هەڵمەتیان بردە سەر ئەو سەنگەرە بەرگرییانەی لە بانەکانی کۆکی «دەربەندی قاسملو»دا جێگەیان گرتبوو. لە ئەنجامدا بڕێک جەندرمە کە لە بەرەوەی سەنگەرەکە لەناو هەندێک برجدا بوون، لە پێش ئەم هەڵمەتە شەوانەیەدا هەلاتن و پاشەکشێیان کرد و خۆیان بەسەرکردەی مۆڵگەی کۆکی ناساند. ئەم جەندرمانە بەهۆی بەجێ هێشتنی سەنگەرەوە کەوتنە بەر لێپێچینەوە و گرتووخانە. هەمان کات سریەیەک و دەستەیەک هاوەن نێردرانە سەنگەری بەرگریی کۆکی و چەکداران هەلاتن.

لەبەرئەوەی لەو دوو ڕۆژەدا لە سەرانسەری بەرەکانی باکور و باشوور پێکدادان لە نێوان هێزی دەوڵەت و بارزانییەکاندا رووی دا بۆیە لە ڕێگەی ئەرکانی سوپاوە چەند فەرمانێک بەم ناوەڕۆکانەی خوارەوە بۆ سەرکردەی فیرقەی چوار دەرچوون:

(١) پێویستە زۆر وریا بن بۆ ئەوەی ئەو کاروانانەی ئامادەییان لاوازە لەگەڵ بارزانییەکاندا تووشاری یەکتر نەبن و پێکدادان لە نێوان ئەواندا روو نەدا، لەبەرئەوەی ئەگەر ئەو یەکانەی لە کەتیبەیەک بچووکترن لەگەڵ ئەواندا بکەونە شەڕەوە ئەوا زیانی گەورەیان پێ دەگات، ئەم کارەش دەبێتە هۆی ئەوەی بارزانییەکان لە کاری خۆیاندا ئازاتر و وێراتر بن.

(٢) پێویستە هەوڵ بدرێ بەوپەڕی تواناوە خاڵە گرینگەکان لەلایەن کاروانگەلی سوپاوە بگیرێن و، بالادەستیی ئاگر لە هەموو شوێنێکدا یەکجارەکی بێت.

(٣) پێویستە پاسەوانی لە شەودا زۆر بەچاکی لەبەرچاو بگیرێ و چاوەدێریی تەواو هەبێ، هەتاوەکو چ لە ڕۆژ و چ لە شەودا هێزەکان لە بێ خەمیدا بن.

(٤) لەو باڵەفڕانەی لە بن دەستی هێزدان ئەوپەڕی کەڵک وەربگیرێ و بەفڕینی پشکنێری و بۆمبابارانکردنی لەجێوە، ورەی دوژمن ببەزێندرێ و هەتا زووە چۆکیان پێ دابدرێ، لەبەرئەوەی وەک سەرنج دراوە چەکداران بێ رادە لە بۆمبابارانی ئاسمانی ترساون و تەنیا ڕێگە بۆ وێرانکردنی ورە و بەزاندنی ئەوان ئەوەیە کەڵک لە بۆمبابارانی ورد و دروست وەربگیرێ. هەروەها ئەفسەرانی ئاسمانی وریادار کرانەوە کەوا لە راپۆرتی خۆیاندا ئەوپەڕی وردی بەکار بێنن بۆ ئەوەی بزووتنەوەی هێزەکانی بارزانی بەچاکی دەسنیشان بکەن و لە دیاریکردنی شوێن و رووکاری بزووتنەوەیاندا سەرکردەی فیرقە ئاگەدار بکەنەوە بۆ ئەوەی هێزی سوپا لە ناکاو بەسەریدا نەدرێ.

لە ڕۆژی بیست و چواردا کاروانی عەقید نیساری کە لە دووریی ٤ کیلۆمەتری باشووری مەواناوە گیرسابووەوە کەوتە نواندنی کردەوەی ناوچەیی و لە ئەنجامدا لە خێڵی رەشید بەگ دوو کەس شەهید بوون و سێ کەسی تر بریندار بوون. لە خێڵی نوری بەگیش یەکێک شەهید و ٤یش برین‌دا بوون.

زیانی زۆر و زەوەندی خێلانی خۆولاتی لە ڕۆژی بیست و سێ و بیست و چواردا وای پێویست کرد، بەئامانجی دەسەلات رەواندن بەسەر ناوچەی مەحاڵ دەشتدا، لە زارکی دەربەندەوە کاروانێک رەوانە بکرێ بۆ ئەوەی بزاوتی کاروانی عەقید نیساری سووک بکرێ. بۆیە بەنیازی پشتەوانی و ئاسانکردنی بزاوتی کاروانی عەقید نیساری و بەنیازی گرتنی بانەکانی کەسریک، سەرکردایەتی بڕیاری دا کاروانێکی پێکهاتوو لە فەوجی

سوارەی فەوزییە و سریەیەکی پیادە و دەستەیەک برێن بەسەرکردایەتیی عەقید پەرتەوی لە ڕۆژی بیست و پێنجدا بەرەو دەربەند باژوا بۆ ئەوەی هەردوو کاروانی پێشوو لە سایەی تێکەڵکردنی هەوڵ و پێوەندی لەگەڵ یەکتردا، بەرەو ئامانجی خۆیان بکەونە ڕێگە. هەروەها شێوەی بزووتنەوەی هەردوو کاروان بەم ئاوایە ڕێک درابووەوە:

کاروانی عەقید نیساری لە باکورەوە بۆ باشوور واتە لە مەواناوە بەرەو کەسریک و، کاروانی دەربەند لە زارکی دۆڵی ناوبراوەوە «لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا» بەرەو بانەکانی کەسریک بکەوێتە جووڵە و لە «سیلوانا»دا پێوەندی بەیەکەوە بکەن. هەروەها لە پشکنینی کاروانی پێشووەوە دەرکەوت ئەو یەکانەی لە ورمێدان زۆر کەمن و سەرکردەی فیرقە پێویستییەکی گەورەی بەسپێری جێگۆڕکەر هەیە، بۆیە هەر ئەو کاتە سەرکردایەتی بڕیاری دا کەتیبەیەکی پیادە و بطریەیەکی ١٠٥ی لە یەکەکانی فیرقەی ٣ی تەورێز بەباروبو بخوازێ و بیخاتە سەر یەکەکانی کاروانی باشووریەوە. هەروەها بڕیار درا فەوجی سوارەی کوردستان بۆ پشتەوانی لە یەکەکانی باکور بەناوەی هێزی سپێر لە ورمێدا نیشتەجێ ببێ و ئەم دۆخەش دەسبەجێ بەبنکە گەیەندرا بۆ ئەوەی فیرقەی ٣ یەکە خواستراوەکان بۆ ورمێ بنێرێ.

سەرکردەی هێز بۆ ئەوەی هەتا زووە پرسی بارزانییەکان بنەبڕ ببێ بڕیاری دا لە یەکەمین هەلدا هێزی بەردەستی خۆی لەگەڵ مەلا مستەفادا بەرەوڕوو بکاتەوە و سەرکوتی بکات. بۆیە شەو کاروانی عەقید نیساری راسپاردرا کەوا بەرەو بنکەی مەلا مستەفا و ناوچەی کەسریک بکەوێتە جووڵە.

گەردوگۆڵی بەیانیەی ڕۆژی بیست و پێنج کاروانی ناوبراو بەرازانەوەی پێویستەوە بەرەو ئامانجی خۆی کەوتە جووله و پێنگاوی یەکەم و دووەمی بەبێ پێکدادان لەگەڵ دوژمندا جێبەجێ کرد. هەر بەدەرکەوتن لە پێنگاوی دووەم بەدواوە لە بانەکانی باکوری «کونجار»دا پێکدادانێکی گەرم لەگەڵ بارزانییەکاندا ڕووی دا و، هەرچەندەیش دوژمن بەرگرییەکی چاپووکانەی لە خۆی دەکرد بەڵام لە ئەنجامی پاڵەپەستۆی کاروان و، پاش لە دەستدانی چەند سەر مرۆڤێک ناچاری پاشەکشێ بوون و هێزی سوپا پێی کرا ئاواییی کونجار بگرێ و بەشی هەرە گەورەی کاروان بنێرێتە ئاواییی ناوبراو کە بەسەر بانەکانی «کەسریک»یدا دەڕوانی و، لەوێی نیشتەجێ کردن.

ئەم کاروانە پاش گیربوونێکی کەم و گۆڕینی رازانەوە ، درێژەی بەبزووتنەوەی خۆی

دایەوە، بەجۆرێ سەعات ١٨ی ئەو ڕۆژە گوندی کەسریکی گرت و بانەکانی باشووری ڕۆژئاوای ئاواییی ناوبراوی «کە بەرگریکەرانی بارزانی سەنگەری چاکیان بۆ خۆیان لەوێ ئامادە کردبوو» خستە بن دەستەوە. سریەی ٣ی فەوجی ئازەرپاد و سوارانی خێڵانی ڕەشید بەگ و هەرکییەکان لەم ڕووبەڕووبوونەوەیەدا خۆبەختکەرییەکی بێ ڕادەیان لە خۆیاندا نواند، لە ئەنجامدا مەلا مستەفا و پێڕەوکارانی ئەو ناچار بوون بۆ هەڵدێرەکانی «گولی» پاشەکشێ بکەن کە یەکجار زۆر دژوار و هەزار بەهەزارن.

لەم پێکدادانەدا بارزانییەکان زیانی زۆر و زەوەندیان لێ کەوت، بەجۆرێک ١٢ تەرمیان لە سەنگەری کاروانگرتوودا بەجێ مابوو. ڕۆژی بیست و شەشی ڕەشەمێ سەرلەنوێ فەرمان بەکاروانی عەقید نیساری درایەوە هەتا درێژە بەپێشوەچوونی خۆی بەرەو مەوانا بدات و وەک چۆن پێشتر پەنجەمان بۆی ڕاکێشا بوو، لە سیلوانا لەگەڵ کاروانی عەقید پەرتەویدا یەک بگرنەوە. ئەوەبوو کاروانی ناوبراو لە سەعات ٥ی سبەینەی ڕۆژی بیست و شەشەمدا دەستی بەدەستوەشێنی کرد و لە پێنگاوی یەکەمدا بانەکانی بەردەسووی گرت و دەمودەست ڕووی لە سیلوانا کرد. بەبێ پێکدادان سیلوانای گرت و لەوێ گیرسایەوە.

بەپێی بڕیاری لیوا هومایوونیی سەرکردەی هێزگەل، فەرمان درایە کاروانی عەقید «پەرتەوی»یش بۆ ئەوەی بەڕووکاری سیلوانادا ببزوێ و پێوەندی لەگەڵ کاروانی عەقید نیساریدا بکاتەوە. کاروانی ناوبراویش لە سەعات ٥ی هەر ئەو ڕۆژەدا بەرەو ئامانجی خۆی بزوا و لە بەرزاییەکانی پیرهادی و ناشاندا بەرەوڕووی چەکداران بووەوە و پاش پێکدادانێکی بەرفرە لە ئاوایی «خلووری»دا توانیی بەرزاییەکانی پیرهادی بگرێ و باڵی ڕاستی خۆی بگەینێتە بەرزاییەکانی نۆشان و، بارزانییەکان لە ژێر پاڵەپەستۆی کارواندا ئەمجارەش ناچاری پاشەکشێ بوون و کاروان توانیی بەبریندار‌بوونی دوو سەرباز لە سەعات دوو و نیوی هەر ئەو ڕۆژەدا بگاتە ناو سیلوانا و لە سەعات ١٦ی هەمان ڕۆژدا هەردووک کاروان یەکیان گرتەوە و پێوەندییان دامەزراندەوە.

سەرکردەی هێز لە سەعات ١٨ی ئەو ڕۆژەدا گەیشتە سیلوانا و لە نێزیکەوە سەرانسۆی بارودۆخی کاروانگەلی کرد، گەڕایەوە ورمێ و بەبێ گیربوون چووە نەغەدە و، مۆڵگە و بارودۆخی بەشەکانی ئەوێندەری بەسەرکردەوە و فەرمانی پێویستی لە بارەوە دەرکردن. لەگەڵ ئەم کردەوەیەدا دوو باڵەفڕە کاری پێشوەچوونی کاروانیان خۆش دەکرد و بەمەترەلۆز

و بۆمبا بەرببوونە وێزەی چەکداران کە لە بانووەکانی کەسریکدا خۆیان مەڵاس دابوو، ئەم کارە ئەنجامی دڵنیاییدەری بەدی دەهێنا. لەم مێژووەوە هەردووک کاروان لە بن سەرکردایەتیی عەقید نیساریدا، بوون بەیەک کاروان.

هەروەها لە سەرکردایەتیی هێزەوە فەرمانێک بەکاروانی مەرگەوەڕ «کاروانی عەقید نیساری ـ پەرتەوی» گەیشت و دەیویست هەتا زووە کاروان بەرەو نێرەگی ـ کە دەڕوانێتە سەر دۆڵی بەرانددێز و لە رووی سوپاییەوە هەڵکەوتێکی گرینگی هەیە و سەر بەناوچەی تەرگەوەڕە، بکەوێتە ڕێ و ناوچەی دەشت و پاشانیش ناوچەی مەرگەوەڕ بەتەواوەتی لە تێدابوونی بارزانییەکان پاگژ بکاتەوە.

ئەو پێشوەچوون و سەرکەوتنانەی لە ماوەی دوو ڕۆژدا بوون بەبەشی ئەم کاروانە، ترس و لەرزێکی گەورەیان هاوێشتە ناو خێلانی خۆلاتی ـ ئەوانی هەتا ئەو دەمە خۆیان بەدەستەوە نەدابوو، بەجۆرێک قوبادی کوڕی سمایلاغای سمکۆ هاتە ورمێ و لە ڕێگەی عومەر خانی شکاکەوە داوای کرد بەرپرسانی سوپا بوار بدەن خێڵی شکاک چەکدار ببێ و لە هەمبەر بارزانییەکاندا بکەوێتە شەڕەوە. لیوا هومایوونی بەخۆشەویستی و دڵنەوازییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ ناوبراودا کرد و فەرمانی پێ دا ٥٠٠ کەس لە خێڵەکەی ئامادە بکا هەتا ئەگەر پێویست هەبوو بنێردرێنە بەرەی شەڕ. هەروەها سێ کەس لە بەگزادانی مەرگەوەڕ لە ڕێگەی نێوان کەسریک و سیلوانادا خۆیان بەعەقید نیساری ناساند و ئامادەییان پێشان دا کەوا بە ٣٠٠ مرۆڤی چەکدارەوە خۆیان لە بارزانییەکان دابڕن و لە پاڵ هێزی سوپادا دژی بارزانییەکان درێژە بەشەڕ بدەن .

هەرکە راپۆرتی سەرکردەی فیرقە لەبارەی یەکگرتنەوەی هەردووک کاروانی عەقید نیساری و عەقید پرتەوی و، هەروەها هەواڵی خۆبەدەستەوەدانی خانانی شکاک بەمەڵبەند گەیشتەوە، فەرمانێک بەناوەڕۆکی وەک ئەمەی خوارەوە لە ڕێگەی ئەرکانی سوپاوە بەناونیشانی لیوا هومایوونیی سەرکردەی فیرقەی چوار دەرچوو:

(١) هەرچەندە کاروانگەلی باکوری «کاروانی عەقید نیساری و عەقید پەرتەوی» بەسەرکەوتوویی دەچنە پێش بەڵام پاشکۆیان لەبەر مەترسیدایە و دەبێ بەردەوام لە بن سەرانسۆدا بن لەبەرئەوەی هیچ دوور نییە کارێکی نالەبار لەلایەن شکاکەکانەوە روو بدات.

(٢) بەمەبەستی خۆپاراستن لە کاری بەسەرددانی بارزانییەکان کە نەوەکا تەڵەیەکیان

نابێتەوە، پێویستە لە پێشوەچووندا ئەوپەڕی پارێز وەربگیرێ بۆ ئەوەی کاروان بەکتوپڕی نەکەوێتە بەر پەلامارەوە.

(٣) پێویستە لە تێکەڵکردنی خێڵانی شکاک لەگەڵ کاروانگەلی سوپاییدا خۆ بپارێزرێ لەبەرئەوەی پیاوانی ئەم خێڵە بەینێک لەگەڵ مەلا مستەفادا بوونە و، بەهیچ جۆر لە بەرژەوەندیدا نییە تێکەڵی هێزی سوپایی بن، دوور نییە فێڵێک بنێنەوە و ئاوازێکی نوێ بۆ سوپا بژەنن. بەتایبەتیش پێویستە سەرۆکانی ئەوان لە ورمێ لەبەر چاوەدێری و دڵڕاگرتندا بن.

(٤) سوود لە خانانی تەرگەوەڕی و مەرگەوەڕی وەربگیرێ بەڵام نابێ تێکەڵی نەخشەی گشتیی ئۆپەراسیۆن یا ئۆپەراسیۆنی کاروان ببن یا سوودیان لێ وەربگیرێ.

(٥) مۆڵگە جیاجیایەکان بەهێز بکرێن بەجۆرێک هەر مۆڵگەیەک کەمتر لە کەتیبەیەکی لەبەر دەستدا نەبێ و هەموو کەتیبەیەکی نێردراویش لە ناوەندەوە[٢١] پێویستە بۆ بتەوکردنی یەکەکانی باشوور تەرخان بکرێ.

(٦) درێژاییی ئەو بەرانەی بەکاروانگەل دەسپێردرێن، بۆ بەهێزکردنی ورەی ئەوان کورت بکرێنەوە، بەڵام ئەم کارە هەتا ئەو رادەیە دەشێ کە پێوەندیی کاروانگەل لە تواناداهەبێ.

(٧) ئەو شتەی لە هەموو راپۆرتەکانی فیرقەدا ناوکۆیە ئەوەیە بەشێوەی شایەن سوود لە باڵەفڕە وەرنەگیراوە.

(٨) لە کاتی هێرشی کاروان بۆ سەر سەنگەرەکانی بارزانیدا، پێویستە هێرش بەئالیکاریی زرێپۆش و باڵەفڕە بەئەنجام بدرێ لەبەرئەوەی مەزنترین ئامێری سەرکەوتن ئەم دوو ئامێرەن.

سەرکردەی فیرقە لە ڕۆژانی بیست و شەش و بیست و حەوتدا هەلومەرجی یەکەکانی باشووری بەسەر کردەوە و، دوای دەرکردنی فەرمانی پێویست لە سەعات ١٥ی ڕۆژی بیست و حەوتدا سەری لە ورمێ دایەوە.

لیوا هومایوونی لە وەڵامی ئەو فەرمانە سوپاییيانەی لە تارانەوە بۆ بەڕێوەبردنی کردەوەی سوپایی گەیشتبوون، سەرنجی خۆی لەبارەی دەست پێکردنی داهاتوو بەم

(٢١) لە ناوەندەوە واتە لە تارانەوە.

شێوەیەی خوارەوە بۆ تاران نووسی:

«لەبەرئەوەی هەتا گەیشتنەجێی یەکە بەفریاهاتووەکان، کاروانگەلی باشووری نەیاندەتوانی درێژە بەپێشوەچوونی خۆیان بدەن، بڕیار درا یەکەکانی باشوور شوێنەکانی خۆیان بپارێزن و بکەونە باری بەرگرییەوە و دەست بەدامەزراندنی برج بکەن.

کاروانگەلی باکور (کاروانی عەقید نیساری و کاروانی دزێ) دەست بە هێرشبەری بکەن.»

پلانە پێشنیازکراوکەی لیوا هومایوونیی سەرکردەی فیرقە بۆ کردەوە داهاتووەکانی سوپا، لەلایەن ئەرکانی سوپاوە پەسند کرا و فەرمان گەیشت کە کاروانگەلی باشوور لە سەنگەری بەرگریکەرانەی خۆیدا دابمەزرێ. کاروانی عەقید نیساریش راسپاردرا کە هەموو بارزانییەکان لە زەویی تەرگەوەڕ و دەشت، بەدەر بنێ و باڵی راستیشی بەسەرەتای دۆڵی باراندێز بگات بۆ ئەوەی بتوانێ هەموو ئەم دۆڵە بپارێزێ. هەروەها کاروانێک بەسەرکردایەتیی عەقیدی سوار «عەلی قولی مزەفەری» کە پێشینەی گەشاوەی لە کردەوەکانی ئازربایجاندا هەبوو، لە ورمێوە بەر بە دزێ کەوتە رێ و چاوەڕوانی فەرمان بوو هەتا بتوانێ پاشان بەرەو سیلوانا جوولە بکات بۆ ئەوەی لە ئەنجامدا باڵی راستی دۆڵی قاسملو بپارێزێ و مسۆگەری بکات. هەر سەبارەت بەمە فەرمانی پێشوەچوون بەکاروانی عەقید نیساری درا و سەربازانی سەرگەلەی ئەو گەیشتنە هێڵی نێرەگی و رۆژی بیست و هەشت نێرەگی و زەرکا بەبێ پێکدادان گیران.

دوای ئەوەی هەواڵی گرتنی زەرکا و نێرەگی بەئەرکانی سوپا گەیشت، دەسبەجێ بروسکەیەک لە تارانەوە بەم ناوەڕۆکەی خوارەوە بۆ ناونیشانی سەرکردەی فیرقەی ٤ و هێزگەلی کوردستان دەرچوو:

دەبێ داوودەزگای هەواڵگریی ئەم فیرقەیە هەردەم لە بارودۆخی بارزانییەکان بەئاگا بێ و، ئەو ئاگەدارییانەی کۆشیان دەکاتەوە دەبێ دوا هەواڵی هەموولایەنە و ورد و دروست بن لەبەرئەوەی هێم و بناخەی ئەو بڕیارانەی لەم ناوچەیەدا دەدرێن لەسەر ئەم زانیارییانە دامەزراون. بۆیە ئەم زانیارییانەی خوارەوە کە بۆ کردەوە پێویستن دەبێ داوودەزگا پێوەندیدارەکانی فیرقە کۆیان بکاتەوە و هەر بەپەلە بەدەستی سەرکردایەتیی فیرقەی بگەیەنن:

(١) هێزی بارزانییەکان.

(٢) چەک و تەقەمەنییان.
(٣) ئەو ئازووخەیەی لە بن دەستیاندا هەیە و، ئەوەیش کە بۆیان دەلوێ لە دەرەوە یان لە ناوەوە پەیدای بکەن.
(٤) هەلومەرج و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ خێڵاندا و، جۆری پێوەندییان بەتایەفەکانی شکاک و هەرکییەوە.
(٥) پێوەندییان لەگەڵ خەڵکانی سنوورنشینی عێراق و تورکیا و سۆڤیەت.
ئەم فەرمانە هەموولایەنی و ناوکۆیەی ئەرکانی سوپا کە بۆ بەڕێوەبردنی ئۆپەراسیۆن زۆر پێویست بوو و فیرقەش خۆی پێشتر هەستی پێ کردبوو، لە لایەن لیوا هومایوونییەوە بەم شێوەیەی خوارەوە وەڵام درایەوە:
(١) هێزی بارزانییەکان لە دەوروبەری ١٥٠٠ مرۆڤی تفەنگداری بارزانییە و جۆری ئەو تفەنگانەی بەدەستی زۆربەیانەوەیە برێتییە لە برنۆ. بارزانییەکان لەگەڵ ٣٠٠ هەتا ٥٠٠ مرۆڤی سوارەی زێڕۆ و تەها هەرکی هەروەها ٥٠٠ مرۆڤی ئاشوور و ئەرمەن و پیاوانی هەڵاتووی فیرقەی دێموکراتی ئازربایجان و ورمێ تێکەڵاون و هێزێکی ٢٥٠٠ کەسییان پێکەوە ناوە. جگە لە تفەنگ ٥٠ برێنی سووک و گران و ١٥٠ تەماتیک و برێک نارنجۆکی دەستی و، تەنانەت گوللەی کونکەرەی دژە زرێپۆش و بۆمبای ئاگرزێ و تۆپخانەیشیان هەیە.
(٢) بارزانییەکان لەبارەی خواردن ـ ەوە لە تەنگانەدان و بەشێوەی ڕۆژ بەڕۆژ لە دێیەکانی شنۆ و دەشتەبێڵ و تەرگەوەڕ خواردن کۆ دەکەنەوە.
(٣) هەڵسوکەوتیان لەگەڵ خێڵاندا بەگشتی نالەبار نییە بەڵام لە بەدەستهێنانی ئازووخەدا پاڵەپەستۆیان دەخەنە سەر.
(٤) پێوەندییان لەگەڵ تایەفەکانی شکاک و هەرکیدا بەرووالەت خراپ نییە. پێوەندییان لەگەڵ کۆنسوڵی بیانیی نیشتەجێ لە ورمێدا، بەپێناوی ئەو ئەرمەن و ئاشوورانەی لەناو بارزانییەکاندان، بەڕێوە دەچێ.
ئەم زانیارییانەی پێشەوەی سەرکردەی هێز هەتا ڕادەیەک گۆڕەپانی ئۆپەراسیۆنیان بۆ ئەرکانی سوپا ڕووناک کردەوە بۆیە بڕیار درا ڕازانەوەی یەکەکانی باشوور کە لەگەڵ بارودۆخی ئەم دەمەدا نەدەگونجا، بگۆڕدرێ. وێڕای ئەمە، کاروانگەلی پێشوو بەیاریدەی ئەو یەکانەی لە تارانەوە دەناردران، تەواو بەهێز بکرێن.

## له پێناو چارەسەری بنەبڕی

## پرسی بارزانییەکان و هاوکاریی واتایەکی

ئەو ڕۆژانە، هەرچەندە دوا ڕۆژانی مانگی ڕەشەمە بەسەر دەچوون و تەمەنی ساڵی ١٣٢٥ بەکۆتا دەهات بەڵام هێشتایش زستان لە کوێستانەکانی ڕۆژئاوای ئازربایجان و کوردستانی باکوردا کە لەگوێن گۆڕەپانێکی خوێناویدا خۆی دەنواند، بەکۆتا نەهاتبوو و، لە هەڕەتی سەرما و زریانی بەفر و باران، شتێک کەمی نەکردبوو.

بۆ ئێمە، خوێندنەوەی باری دەروونیی ئەو سەرباز و پلەدار و ئەفسەرانەی ئەو دەمە لەو ناوچەیەدا ئەرکی سەرشانیان بەجێ دەهێنا، زۆر پێویست و ناچارییە. ئەم پیاوە خۆبەختکەر و گیان لەسەردەستانە بەفیداکارییەکی بێ هاوتاوە لەم شوێنەدا سەرگەرمی گیان بەختکەری بوون. مرۆڤی وایان تێدا دەبیندرا ساڵانی ساڵ بوو لە ماڵ و شار و زێدی خۆیان هەڵەتە بووبوون و چاوەڕوانی تەواوبوونی ماوەی خزمەتیان بوون. سەتان کەس لە ئەفسەر و سەربازان بەتەلەفۆن و بروسکە و بێتەل و نامە و راسپێری، بەڵێنیان بەماڵی خۆیان دابوو پێش هاتنی نەورۆز ئەم گۆڕەپانی خزمەتە دژوار و نالەبارە بەسەر دەچێ و سەر لە کەس و کاریان دەدەنەوە و، جەژنی نەورۆز لە پاڵ خزم و کەس و منداڵ و خوشک و دایکیاندا دەکەن. لەو لاشەوە ڕۆژ بەڕۆژ باری شەڕ گرانتر و کوشتار زۆرتر دەبوو. لەوانەیە زۆر ئەفسەر و سەرباز و لاوی بەروومەت کە بەتەمای بەسەرچوونی زستان و بەسەرداهاتنی نەورۆز بوون، خۆشاوی شەهیدبوونیان فڕ کرد و بۆ هەتا هەتایە ماڵی خۆیانیان ئازیەتبار و سەرفراز و شاناز کرد.

ئەو کاتانە هەموو لایەک چاوەڕوانی بەکۆتاهاتنی شەڕ بوون. پێکداداان ڕۆژ بەڕۆژ گەرمتر و پڕ مەترسیتر دەبوو. بارزانییەکان کە خۆیان لەناو ئەڵقەی تەنگەبەری گەمارۆدا دەبینی یەکجار نەترسانەتر خۆیان لە ڕیزی سەربازان دەدا و، لەگەڵ خۆیاندا هەندێکیان لەناو دەبردن. باری دەروونیی سەربازان لەناو ئەم گێژەنگەیەدا یەکجار باش بوو. بەبێ پێوەنان، زۆربەیان خاوەن هەستێک بوون شایەنی ڕێز و رووممەت بێ. ئەگەر ئەوە ڕەچاو بکرێ هێزی دەوڵەت لە پێش هەندێ کەسی ئەوتۆدا وەستابوو کە دەستیان لە گیانی خۆیان شوشتبوو و لە ماڵی دنیا بێبەش بوون و جگە لە شەڕ و مردن چ ڕێگەی تریان لە پێشدا نەبوو ئەوا گرینگیی ئەو خۆبەختکەرە گیان لەسەر دەستانە بەچاکی بەدەر دەکەوێ.

هەرچەندە هەڵسوکەوتی بەرپرسانی کاروباری سوپایی لە تاران و سەرکردەی فیرقە و سەرۆکی ئەرکانی سوپا بەجۆرێک بوون، پتری داخوازی ئەو ئەفسەر و سەربازانە لە روانگەی کەسایەتی و گشتییەوە سەرنجی لێ دەدرا و وەردەگیرا، بەڵام پشکنینی باری گشتیی سوپا و دیمانەی هەندێک لە ئەفسەران دەری دەخست کە لەو رۆژە تووشانەشدا هەرچەندە هەموو لا بۆ خۆبەختکەری و خزمەتی نیشتمان رێک و تەبابوون بەڵام بیری هەندێک کەس هەر بەکینەوەری و پێپەستکردنی مافانەوە بەند بوو و، گیانی پاکانیان سەغڵەت دەکرد، سەبارەت بەوەی هەندێک ئەفسەر چ جاران لە تاران وەدەر نەکوتبوون و پلەی نێوان سەربازی و «فەریق»ییان لە شەقامەکانی تاراندا بڕیبوو و، ئەوانی تریش هەمووده‌م هەڵەتەی بیابانان بوون و وەڕس بووبوون.

ئەگەر زیادەوێژی نەبێ پێویستە بڵێم هەر ئەم خوولک بەرزی و خۆبەکەمگری و جوامێرییەیە کە بووەتە نهێنیی مانەوەی ئێران. هەر ئەم دەروون پاکییەیە لە نێوان ئەفسەر و پلەدار و سەربازاندا بینراوە و دەبیندرێ سەرەڕای ئەوەی کە لە هەموو ناجوامێری و پێشێل کردنێکی مافانیش بەئاگان. جۆرێک چاونەترسانە خۆیان بەخت دەکەن چاودێر ناچار دەبێ لە پێش ئەم پیاوە بوێر و وڵاتپەروەرانەدا سەری رێز و شانازی دابنوێنێ.

هەرچۆن بێ، هەندێک لە بابەت بەدوور کەوتین بەڵام مەبەستی ئەم لادانە لەلایەکەوە پێویست بوو بۆ بیرەوەری و لەلایەکی تریشەوە ئەم بەشە رووی رەسمی و سوپاییی خۆی هەیە. لەوانەیشە لە روانگەی مێژووی وڵاتەوە بایەخی هەبێ و هەندێک کەس پێوەی ماندوو بن.

لەو رۆژانەی بنەتای رەشەمە و سەرەتای ئاخەلێوەدا ئەڵقەی گەمارۆداتی بارزانییەکان پتر دەهاتەوە یەک و هێزی سوپا زیاتر لە سنوور نزیک دەبووەوە. لیوا فەزلوڵڵا هومایوونیی سەرکردەی هێزگەلی ئۆپەراسیۆن بڕیاری دا لەسەر داوخوازی عێراقییەکان هەندێ کاری سیاسی بێنێتە دی و پێش ئەوەی ئاڵۆزییەک سەر هەڵبدات لە ئەنجامی ئەو پێدرێژییانەی رەنگە لە ناوچەی سنووردا رووبدەن، دەوڵەتی عێراق لە چۆنیەتیی پرسەکان ئاگەدار بکاتەوە. بەم نیازەوە لیوا فەزلوڵڵا هومایوونیی سەرکردەی هێزگەلی کوردستان پاش سەردانی کاروانی باکور، نیو سەعاتی دوای نیوەڕۆی رۆژی بیست و نۆی رەشەمەی ١٣٢٥، واتە دوو شەو بەر لە جەژنی نەورۆز لە رێگەی ورمێوە چووە نەغەدە و سۆفییان هەتا بەدیمانەی سەرکردەی هێزی عێراقی عەمید سەید عەلی حیجازی لە حاجی ئۆمەرانی

ناو زەویی عێراق، بگات. ئەو دیمانەیە لەسەر داوای بەرپرسانی سوپای عێراق ئەنجام درا و بڕیار بوو لە ڕۆژی بیست و پێنجی ڕەشەمەدا جێبەجێ ببێ، بەڵام لەبەرئەوەی ئەوکاتە سەرکردەی فیرقە کاری لەپێشتری بۆ هاتە پێش، دیمانەکە چوار ڕۆژ بەپاش خرا. بابەتی دیمانەکە لەبارەی بەشداریکردنی هەوڵی واتاییی هێزی سوپای عێراق بوو لەگەڵ دەوڵەتی ئێراندا ـ وەک عەمید حیجازی لەکاتی دیمانەکەدا رایگەیاندبوو. دوو ڕۆژ پێشتر ڕێزداری مەزن «وحیبی» لەگەڵ سەرۆک وەزیران نووری سەعید پاشا و وەزیری بەرگری و وەزیری کاروانی ئەم وڵاتەدا هاتبوونە حاجی ئۆمەران و فەرمانیان دابوو هاوکاریی سەرکردەی هێزی کوردستانی ئێران بکرێ.

لەبەرئەوەی بارزانییەکان لە کۆنەوە سەرئێشەیان بۆ دەوڵەتی عێراق نابووەوە و دەوڵەتی عێراق هەموو ساڵ بۆ سەرکوتینەوەی ئەوان پارەیەکی ئەستووری بۆ خێڵانی خۆوڵاتی تەرخان کردبوو، بۆ نموونە بۆ دژایەتیی بارزانییەکان حەفتا هەزار تومانی تەنیا بە شێخ ڕەشید دەدا و، دەیویست کۆتایی بەم ململانەیە بێنێ. لێرەدا پێویستە بەبیر بێتەوە کە دەوڵەتی عێراق ناوچەی بارزانی لەگەڵ زەویدا تەخت کردبوو، لێرەواری ئەوێندەری لەناو بردبوو و ناوچەکەی لە دانیشتووان چۆڵ کردبوو، بەڵام هێشتا بەگەڕانەوەی بارزانییەکان سەغڵەت بوو و، بۆ لادانی بەڵای ئەوان هەموو ئالیکارییەکی پێشکێشی هێزگەلی ئێران دەکرد. بەشێوەیەکی گشتی لە وتووێژی درێژەکێش لەگەڵ هێزی سوپای عێراقدا ئەوە بەدەست کەوت کەوا هەموو داوخوازی بەرپرسیارانی عێراق ئەوەیە مەلا مستەفا و پێرەوکارانی ئەو لە لایەن هێزی سوپای ئێرانەوە لە ڕەگەوە دەربهێندرێن و لە بەڵای دوژمنێکی کۆن و پێشینەدار رزگاریان ببێ.

هەر بەم بۆنەیەوە، سەرکردەی هێزی عێراق شوێنی مۆڵگەکانی خۆیانی کە بریتی بوو لە دوو تیپ لە باپشتیان و مێرگەسۆر «باپشتیان ٥٥ کیلۆمەتر و مێرگەسۆر ٩٠ کیلۆمەتر لە خانەوە دوورن» پێشانی سەرکردەی هێزی کوردستانی ئێران دا و گوتی ١٢ باڵەفڕەی «ئان سەن» کە باڵەفڕگەیان لە نێزیکی کەرکوک و مووسڵە، لەبەر دەستدانە. هەردەمێک پێویست بەهاوکاری هەبێ ئەوا لە وچانی ٢٤ سەعاتدا هێزی ویستراو لە سنووری خانەدا ئامادە دەبێ. هەروەها ئاماژەی دا کە ئەو دوو لیوایەی پێشوو لە ١٥ کەتیبە و بەگشتی ٦ فەوج پێک هاتوون. بنکەکانی سنوورییان یەکێکیان لە خرێنەیە و ئەویتری لە بانەکانی بەرامبەر «بەزسینا»ی زەویی ئێرانە لە جێیەک بەناوی «چیای بێرا سپی»دا.

سەرکردەی هێزی عێراق لە پێناو هاوکاریی دڵسۆزانەدا درێژەی شەپۆلی دەزگایەکانی بێتەل و سەعاتی کارکردنی ئەوانی بەنیازی پاراستنی پێوەندی، دا بەسەرکردەی هێزگەلی کوردستان و بڕیاردرا لە کاتە دیاریکراوەکاندا پێوەندی بگیرێ و بەشێوەی ڕۆژانە زانیاری بگۆڕدرێتەوە. هەروەها لەبەرئەوەی لەوانەبوو چەکدارانی بارزانی لە ڕێگەی دۆڵی بێنارەوە بچنە ناو ئاخی تورکیا، بەرپرسیارانی سوپاییی تورکیا لە تاران پێوەندییان بە ئەرکانی سوپاوە کردبوو. لە نێزیکی سنووریش سێ بنکەی سوپایی یەکێکیان لە خاڵی پێک گەیشتنی هەر سێ سنووری ئێران و عێراق و تورکیا «بەرزاییەکانی دالامپەر» و یەکێکی تریان لە درێژەی دۆڵی بێنار و سێیەمیان بەرامبەری «زەرکا و نێرەگی»ی سنووری ئێران لە دەوروپشتی گوندی «کوتانا» لە ناو ئاخی تورکیادا بەگەڕ کەوتبوون و، فەرمانبەری سوپاییی جێ نیشتەی تورکیاش لە تاراندا ئەرکانی سوپای ئاگەدار کردبوو کەوا هێزی سوپای تورکیا بۆ هاوکاریی سوپای ئێران لە بنەبڕکردن و سەرکوتینەوەی بارزانییەکاندا ئامادەن و ئەگەربێو خێڵانی بارزانی بیانەوێ روو لە دۆڵی بێنار بکەن یان پێ بنێنە سنووری تورکیاوە ئەوا سەرکوت دەکرێن. لەگەڵ ئەم بارودۆخەشدا دەوڵەتی ئێران سوودی لە هێزی سوپای دەرەکی نەکرد و بەسەربەرزی و سەرکەوتنەوە ئەم شەڕە گەرمەی بەکۆتا هێنا.

سەرکردەی هێز هەر ئەو ڕۆژە بڕێک تەقەمەنیی لە وێنەی بۆمبی ۱۲ کیلۆ و ٥٠ کیلۆ و هەروەها گوللەی تۆپ و هاوەن و فیشەکی رووناککەرەوە و بەنزین و رۆنی باڵەفڕەی لە تاران داوا کرد کە چوار ڕۆژ پاشتر گەیشتن.

لەم بارەدا، لە ئەنجامی ئەو پاڵەپەستۆیەی کاروانی عەقید نیساری لە نێرەگی خستبوویە سەر بارزانییەکان، بارزانییەکان بەو نیازەی ڕێگەی گەلیی بێنار «کە دەشێ بگوترێ لە سنووری هەر سێ وڵاتدا هەڵکەوتووە» بخەنە بن دەستی خۆیان و لە کاتی پێویستدا سەرەودەری دەربازبوونێکیان هەبێ، ژمارەی چەکدارانی بەرگریکەری خۆیان لە گوندەکانی ڕۆستەم ئاوا، شێرگان و سەهل ئاوا بە ١٥٠ مرۆڤی بارزانی و تۆپێکی ٧٥ی بەهێز کرد و مەلا مستەفاش خۆی لە ٥ کیلۆمەتری باشووری ڕۆژئاوای نێرەگی لە گوندی شێرگاندا وێستا بوو. لەبەرئەوەی دوو ڕۆژ بوو لێزمەی باران لێی نەکردبووەوە و فڕینی باڵەفڕە لە تواناداا نەبوو بۆیە کاروانی عەقید نیساری هەمووی لە نێرەگی گیر بوو و هەندێک ڕێ بەدیکەری هەنارده پێشێ و، جموجووڵی ئەمانە هەتا ڕۆژی ٢ی ئاخەلێوەی

١٣٢٦ نەخشەیەکی تەواوی ئۆپەراسیۆنی لێ پەیدا بوو.

هەروەها هێزی سەرگەلەی کاروانی عەقید نیساری هەواڵی دا کە بارزانییەکان بەردەوام لە بانەکانی نێوان شێرگان و نێرەگیدا خەریکی خۆ بەهێزکردنن بەتایبەتیش لە بانەکانی «قولقولە»دا گوجوگۆلیان لە پەرەگرتندایە. پاشنیوەڕۆی هەر ئەو ڕۆژە دوو باڵەفڕە بۆ بۆردمانی بانەکانی قولقولە نێردران و کەوتنە بۆردمانی ئەوێ و هەروەها بۆردمانی سەنگەری بارزانییەکان لە ڕۆستەم ئاوا و، زیانی گیانییان پێ گەیاندن.

## کردەوە عەسکەرییەکانی عەقید

## مزەفەری لە دزێ

بەرەبەیانی ڕۆژی بیست و حەوتی ڕەشەمە هەواڵ بەئەرکانی هێزی کوردستان گەیشت گوایە سەید تەهای هەرکی کە لە خێلانی ناوچەی «دۆڵ»ە تەبای هەندێ لە تفەنگدارانی خۆی پەلاماری بنکەی جەندرمەی دزێی داوە و، جەندرمەیەک و تفەنگدارێک بریندار بوونە و یەکێکیش لە پیاوانی تەها کوژراوە. چەکداران لە دەمی پەلاماردانی ئەو بنکەیەدا، تێلی تەلەگرافی پێوەندیی نەغەدە و ورمێیان پساندبوو و، دەریش کەوت ئەو کارەی سەید تەها بەپێی هاندان و فەرمانی بارزانییەکان بووە.

هەروەها ئەو زانیارییانەی گەیشتبوون وایان ڕادەگەیاند کە مەلا مستەفا نیازیەتی بەهۆی هەرکییەکانەوە هێرش بکاتە سەر شەیتان ئاوا و تەنانەت هێزێکی سەت کەسیشی لە پیاوانی بارزانی ناردووەتە بانەکانی وەزنە و خان تاوس و چیچلیک ویونسلی و، هەتا نێزیکی «قەلبی» هاتوونەتە پێش و دەیانەوێ بەم هۆیەوە کەلەبەرێک بخەنە بارودۆخی بەرگریکەرانەی ئەو کەتیبەیەی لە بانەکانی وەزنە و خان تاوسدا هەواری گرتووە. دەسبەجێ لە ڕێگەی فیرقەی ٤ەوە فەرمان درا دوو لۆری جەندرمە بنێردرێنە ئەو شوێنە و هەتا زووە پێوەندیی نێوان نەغەدە و ورمێ گرێ بدەنەوە لەبەرئەوەی فەرامۆشی لەم کارەدا دەبێتە هۆی ئەوەی بارودۆخی هێزی سوپا بەتەواوەتی بگۆڕێ.

لە ڕۆژ بیست و هەشتەمی مانگی ڕەشەمەدا سەرکردەی فیرقە بڕیاری دا کاروانێکی پێکهاتوو لە فەوجی سوارەی کوردستان کە چوار ڕۆژ پێشتر لە نەغەدەوە بەنیازی پێکهێنانی هێزی سپێری سەرکردایەتی هاتبووە ورمێ، تەبای بطریەیەکی ٧٥ی و زرێپۆشێکی شەڕ و دەستەیەک هاوەن لە ورمێوە بەسەرکردایەتیی عەلی قولی مزەفەری

زەنگنە بەرەو دزێ بکەونە ڕێگە و پاش دابینکردنی هێڵی هاتوچۆی نێوان نەغەدە و ورمێ، لە تەوەرەی جادەی دزێ و سیاوانەوە بکەونە پەلاماردان هەتا لەم ڕێگەیەوە باڵی ڕاستی کاروانی دۆڵی قاسملو دەستەبەر بکەن و بزاوتی ئەو کاروانە ئاسان بکەن.

سەعات حەوتی ڕۆژ بیست و نۆ کاروانی پێشوو لە ورمێوە بەرەو دزێ کەوتە ڕێگە و هەر بەگەیشتنی بەو شوێنە سەیری کرد ئەو جەندرمانەی پێشتر بە لۆری ناردرابوون لە بانەکانی باشووری شەیتان ئاوا لەگەڵ چەکدارانڈا بەرەوڕووی یەکتر وەستاون، هەر ئەو کاتە لیوا هومایوونیی سەرکردەی هێز لە گەڕانەوەی خۆی لە نەغەدەوە بۆ ورمێ و دیمانەکردنی سەرکردەی هێزی عێراقدا، گەیشتە دزێ و فەرمانی دا بەعەقید عەلی قولی مزەفەری زەنگنەی سەرکردەی کاروان هەتا لەو شوێنە لە بانەکانەوە هەموو زانیارییەک وەربگرێ و پێوەندی بپارێزێ. سەرکردەی کاروان دەسبەجێ سوودی لە خێڵانی خۆڵاتی وەرگرت کە لەگەڵ کارواندا بوون و، بەشەو بانە ناوبراوەکانی گرت و، بەم شێوە لە زۆربەی شوێنەکاندا بارودۆخ چەسپا.

## فەرمانە عەسکەرییەکانی
## مەزن ڕێزداری پیرۆز شاهەنشا

لە ڕۆژی سێیەمی مانگی ڕەشەمەی ١٣٢٥دا، واتە لە دوایین ڕۆژی ساڵدا ئەو دەمەی ڕاپۆرتی کارە سوپاییەکان لە هەمبەر بارزانییەکاندا کەوتنە پێش چاوی مەزن ڕێزداری پیرۆز شاهەنشا کە پلەی سەرکردایەتیی هەموو هێزگەلی هەیە، بۆ ئەوەی بەربەستی لە ڕوودانی پێشهاتی وەک پێشهاتەکەی نەڵۆس بکرێ و هەتا زوویشە بارزانییەکان لە زەویی ئێران بکرێنە دەرەوە، فەرمانی یەکڕاستی لە ڕێگەی ئەرکانی سوپاوە دا بەسەرکردەی فیرقەی چوار و هێزگەلی کوردستان. فەرمانی دا بەهەر نرخێک بێ پێویستە هێزی کوردستان ئەنجامی ئەم فەرمانە ڕابگەیێنێ.

ئەو خاڵە گرینگانەی لە فەرمانەکەی مەزن ڕێزداری پیرۆز شاهەنشادا بەرچاو دەکەون، بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

«هەرچەندە ئێوە خاوەن هێزی تەواون بەڵام لە ئۆپەراسیۆندا بیرەبیرن و، بەو جۆرەی هیوا دەکرا کردەوەی پوخت لە لایەن هێزەوە بۆ هەڵکەندن و سەرکوتی بارزانییەکان نەکراوە.

دەستکەوتنی زانیاری لە لایەن بارزانییەکان لەبارەی ئێوەوە زۆر باش بووە و لە هەر

کوتییەک یەکەکانی ئێوەیان بەلاواز زانیبێ هێرشیان کردووە و ئەنجامی چاکیان بەدەست کەوتووە. لەو خالانەش کەوا کاروانگەلی ئێوەی تێدا بەهێز بووە، ئەوان لە پێش پەلاماری یەکەکاندا پاشەکشێیان کردووە.

بارزانییەکان بەهەبوونی دوو تۆپ توانیویانە جارێک لە نەلۆس و جارێکی تر لە دەوروپشتی نەغەدەدا یەکەکانی ئێوە بۆمباباران بکەن تەنانەت تۆپێکی ئێوەش لە کار بخەن.

بەپێی ئەمانەی سەرەوە دەبێ دەرس لەم بابەتانە وەربگیرێ و، ئەو چەوتییانەی لە رووداوی نەلۆس و ئەرەنەدا بەسەرتاندا هاتن سارێژ بکەن و ئەم فەرمانانەی خوارەوە بەوردی جێبەجێ بکەن:

«ئەلیف: لە هیچ کوتییەک مۆلگە بەکەمتر لە کەتیبەیەک دانەنێن.

«بێ: بەهۆی بالەفڕەوە هەموو بنکە و ڕێبازی کۆچ و باری مالە بارزانییەکان[22] و هەروەها شوێنی تۆپخانەکانیان بۆمباباران بکەن.

«جیم: بەهۆی خێلانی جێ متمانەوە هەموو ڕۆژ زانیاری لەبارەی بارودۆخ و چۆنیەتیی مالە بارزانییەکان وەربگیرێ.

«دال: پێویستە ئۆپەراسیۆن هەتا ١٥ ئاخەلێوەی ١٣٢٦ (واتە ٤ نیسان ١٩٤٧) بەکۆتا بێ و بەجۆرێک جێبەجێ بکرێ بارزانییەکان فریای هەلاتن نەکەون و، دەبێ کۆتاییی بەم کاری ئابرووچوونەی سوپا بێ.

«هێ: خانانی مەنگوڕ، مامەش و دێبوکری زیانی گیانییان پێ کەوتووە، دلیان بدرێتەوە و ڕێزیان لێ بگیرێ و نەهێلرێ بەهۆی ئەم زیانانەوە دلسارد ببن و، دلهێوری لەدەست بدەن.

«واو: سێ سەرکردەی کاروان بۆ کردەوەکانی خۆتان دیاری بکەن، یەکیان لە باکور لە ناوچەی مەرگەوەڕ، یەکی تریان لە دۆلی قاسملو و هەردوو بالی ئەم دۆلە، سێیەمیان لە ناوچەی نەغەدە و سۆفیان، بۆ ئەوەی ئەم سەرکردانە کردەوەی کاروانەکانتان ڕێک بخەن و ڕێنوێنییان بکەن و ئەو فەرمانانەی دراون جێبەجێیان بکەن.

(٢٢) واتە شاهەنشای ئێران فەرمانی دابوو ئافرەت و پیر و مندالانی بارزانی بدرێنە بەر بۆردمانی بالەفڕە.

«زێ: لە بوواری پێوەندی لەگەڵ کاروانگەلدا، ئەوپەڕی وردایەتی بنوێنن و هەوڵ بدەن هەمووده‌م لەگەڵ تێکڕای کاروانەکاندا پێوەندیتان هەبێ.

«حێ: پارێزگاریی کاروانەکان شایەنی ئەوپەڕی وردەکارییە و دەبێ بەتایبەتی لە شەواندا زۆر وریای خۆتان بن، نەخاسمەش لە زارگەلی و دۆڵ و ڕێبازگەکاندا چاوەدێری زۆر پێویستە لەبەرئەوەی بارزانییەکان لە سوودوەرگری لە باری زەویدا زۆر کارزانن و گەورەترین کەڵک لە پەنا و پەسیوی خۆزایی وەردەگرن.»

نەخشە ٣:   سنووری کۆماری کوردستان، شوێنی شەڕەکان و ڕێگەی
کشانەوەی بارزانیەکان بۆ سۆڤیەت

فەسڵی هەشتەم

# دەسپێکی ساڵی ١٣٢٦ و شەڕی گەرمی نێوان هێزی هەردوو لا

## بەدیلگیرانی هەندێ
## لە پیاوانی سوپا بەدەستی بارزانییەکان

ساڵی ۱۳۲۵، بەبێ ئەوەی ئەنجامێکی یەکجارەکی لە کردەوەی هێزگەلی سوپا لە بەرامبەر بارزانییەکاندا بەدی بێ، بەسەر چوو. لێکۆڵینەوە لە چالاکیی هێزگەلی دەوڵەت لە ساڵی رابردوو لە کوردستاندا پێشانی دەدا کەوا هەرچەندە سەرکەوتنی گرینگ هاتوونەتە دی بەڵام هێشتایش بەرکەوتی ئەم کردەوانە ناتوانێ لەگەڵ ئەو خۆبەختکاریانەی کراون، هاوسان بووەستێ. بەو واتایەی «ئەنجام» بەبەراورد لەگەڵ چالاکییەکانی سوپادا، کەمێکی لێ بەدیار کەوت. لە لێکۆڵینەوەی گورجوگۆڵییەکانی سوپادا ئەو ئەنجامە وەردەگیرا کە زۆرینەی کردەوەکانی ساڵی ۱۳۲۵ بریتی بوونە لە چەسپاندنی هێز لە کوردستان و گەمارۆدانی بارزانییەکان و دەرپەڕاندنی ئەوان بەرەو سنوور، هەروەها پێشگیری لە تێکەڵاوییان لەگەڵ تایەفانی تر و دەربازبوونیان لە سنووری باکوردا.

لە ساڵی ۱۳۲۶دا کردەوەی شەڕکەریی ڕێکوپێک کە بوونە مایەی شکانی یەکجارەکیی بارزانییەکان، روویان دا. لە ئەنجامدا هێزی دەوڵەت لە ماوەیەکی کورتدا توانیی ئەوان سەرکوت بکا و راوەدوویان بنێ. کردەوەی سوپایی لە ساڵی ۱۳۲۶دا بەپێشهاتێکی چاکی وەک ئەمەی خوارەوە دەستی پێ کرد:

کۆمەڵێک لە سەربازانی بەدیلگیراوی رووداوی نەڵۆس لەو دەمەی باژێڕی شنۆ بۆمباباران دەکرا، سوودیان لە هەل وەرگرت و لە مێژووی یەکی ئاخەلێوەدا لە ڕێگەی دۆڵ و نەواڵەکانەوە خۆیان بەنەغەدە گەیاند و ئەم زانیارییانەی خوارەوەیان خستە بەردەمی سەرکردەی مۆڵگە:

چەکدارانی بارزانی سوودیان لەو دەسرۆکی ناسینەوەیە وەردەگرت کە تایبەت بوو بەسەربازان بۆ ئەوەی ئیشارەتی «خۆمانین!» بەباڵەفڕە بدەن، لەم ڕێگەیەوە ئەو باڵەفڕانەیان دەخاپاند کە بۆ بۆمبابارانی ئەوان ڕاسپاردرابوون. پیاوانی بارزانی لەبەر نەبوونی ئازووخە و خواردن لە تەنگانەدان.

سەرکردەی سوپا دەسبەجێ فەرمانی دا بۆ ئەوەی «دەسرۆکی ناسینەوە»ی هەر هەموو یەکەکان بگۆڕدرێن. ئەو زانیارییانەی لە ڕۆژی دووەمی جێژندا بەدی هاتبوون پێشانیان دا کەوا:

بەرەواژی هەندێ بانگەواشە، دژبەری لە نێوانی تایەفەکانی بارزانیدا نییە. لەبەرئەوەی بارزانییەکان لە رووی مەزەبییەوە بەشێخ ئەحمەد و لە رووی سەرکردایەتیی سوپاییشەوە هەر هەموو بنەماڵەکانیان بەمەلا مستەفا تەواو متمانەدارن، بەشێوەیەکی گشتی بارزانییەکان بێ چەند و چۆن پێڕەوی لە دیتنی ئەم دوو پێشەوایە دەکەن[٢٣]. بەتایبەتیش لە کاتی ئێستەدا کەسانی پیس و ناپاک لە بابەتی ئاشووری و ئەرمەنیی ئاژاوەگێڕ لەناویاندا هەن و بەردەوام ئاگری گۆنگەران خۆش دەکەن. ئیتر بیری رووبەڕووبوونەوەی دەوڵەت لەناو ئەواندا لە جاران پتر گوڕی ستاندووە. ئەم زانیارییانە پێشانی دەدەن کەوا لە ڕووی تەقەمەنییەوە لەو کاتەوەی کەسانی سەر بە زێڕۆ و تەها هەرکی و هەندێ ئاشووری و ئەرمەن چوونەتە پاڵیان، بەسەر یەکەوە هێزێکی بریتی لە ٢٥٠٠ تفەنگدار و، پەنجا برێنی سووک و گران و ١٥٠ هەتا ٢٠٠ پارچە چەکی تەماتیک و چوار تۆپی ٧٥یان پێک هێناوە. وێڕای ئەمە برێکی گەورە لە نارنجۆکی دەستی و گوللەی کونکەرە و دەوروبەری چوارسەت هەزار فیشەکیش لەبەر دەستی بارزانییەکاندا هەیە. لە رووی خۆراکیشەوە وەک سەربازەکان زانیارییان دابوو، بارزانییەکان بێ کۆتایی لە تەنگژە و پەرێشانیدان و بەردەوام بوونەتە سەربار بەسەر خێلانی خۆلاتیی ئێرانی و دانیشتووانەوە. لە رووی پێوەندیدارییەوە خاوەن چەند دەزگایەکی تەلەفۆنن و پتری پێوەندیی خۆیان بەهۆی تەتەری پیادەوە جێبەجێ دەکەن.

لە ڕۆژی دووی مانگی ئاخەلێوەدا ئەرکانی هێز بەنیازی هاوکاری و گۆڕینەوەی پێوەندیی پێویست، پێوەندیی خۆی لە ڕێبازگەی «گۆکچە»ی عێراقیدا دامەزراند و، هەموو ڕۆژێ لە سەعاتی دیاریکراودا زانیاریی پێویستیان دەگۆڕییەوە، هەتا هەم عێراقییەکان لە هاتنی هێزی دەوڵەت ئاگەدار بن و بەیەکدادانی نالەبار روو نەدا و هەمیش هەردوولا لە بزووتنەوەی بارزانییەکان ئاگەدار بن.

ئەو باڵەفڕانەی لەبەر دەستی هێزدا بوون، لە هەموو ڕۆژانی کۆتای ساڵی ٢٥ و سەرەتای ساڵی ٢٦دا[٢٤] بەبۆمبا و نارنجۆک هێرشیان دەبردە سەر بانەکانی قولقولە،

(٢٣) پێشەوایانی بارزانی جگە لەوەی کە بەدڵسۆزی سەرکردایەتیی بزووتنەوەی رزگاریی کوردیان کردووە و گەل متمانەی خۆی پێیان داوە هەروەها خاوەن پلەیەکی گرینگی ئایینیشن بۆیە بارزانییەکان تەواوی پشتەوانی لە بۆچوون و رێنوێنییەکانی ئەوان دەکەن.

(٢٤) واتە لە ڕۆژانی پێش ٢١ ئادار و ڕۆژانی دووای ئەو لە ساڵی ١٩٤٧ .

مـەمکان، بەردەزەرد و شنۆ و مـەکـۆی بارزانیـیـەکـان و، بەبۆمـبـابارانکردنی چەکـداران ئەنجامی پێویستیان دەهێنایە دەست.

ئەو کـاتە کـاروانی پشـتـەوانیی لە تارانەوە هاتوو، لە ژێر سـەرکـردایەتیی عـەقـیـد «مەجیدی»دا کە پێک هاتبوو لە کەتیبەی پیادە، دەستەیەکی ٧٥ و دەستەیەکی هاوەن ڕۆژی دووەمی ئاخەڵێوە لە تەورێزەوە گەیشتە مەهاباد و لە ڕۆژی سێیەمی جێژندا هاتنە ناو نەغـەدەوە و ئەرکـیـان پێ درا دوای دوو ڕۆژ حـەسـانەوە، ئاواییی ئەرەنە و دەربەند بگرن.

## کردەوکانی کاروانی عەقید نیساری

## لە ڕۆژی یەکەمی ئاخەڵێوەوە هەتا دەمی ڕۆژئاوای ڕۆژی چوارەم

دوای ئەوەی ئەم کاروانە وەک چۆن لە پێشەوە گوترا بانەکانی زەرکا و نێرەگیی گرت و خۆی تیـایـانـدا گیـرسـانـدەوە، دەمـەو ئێـوارەی ڕۆژی بیـست و نۆی ڕەشـەمـە لە بـانەکـانی خوارووی ڕۆژهەڵاتی سینگان و چیای قولقوڵەدا لە لایەن بارزانییـەکـانەوە پەلامـاری درا بەڵام ئەو پەلامارانە بەرپەرچ درانەوە. بەڵام بارزانییـەکـان لە سەعـات پێنجی پاشنیوەڕۆی هەر ئەو ڕۆژەدا لە لای بسـتـووی «قـەڵاسی»یەوە[٢٥] برەویان بەکـاری خـۆیـان دایەوە بەجۆرێ سوارانی خۆوڵاتیی نووری بەگ کە ناردرابوونە «تووی» لە بەرامبەر پاڵەپەستۆی بارزانییەکاندا پاشەوپاش کشانەوە. بارزانییەکانیش درێژەیان بەپێشوەچوونی خۆیان دا و لە سەعات دەی پاشنیوەڕۆی هەر ئەو ڕۆژە لە بانەکانی «هەڤرس»دا بەپارێزە بەرگرییەکانی فەوجی سوارەی فەوزیە گەیشتن، بەڵام لە بەرامبەر وەستانەوە و بەرتەکی بەرگریکەرانی هەڤرسدا لە جووڵە کەوتن. هەروەها بۆ ئەوەی بتوانن دەست بەسەر بانەکانی بەردەزەرد و قولقوڵەدا بگرن، سەرکردایەتی ئەم کردەوانەی خوارەوەی بەجێ هێنا:

فەرمـانی دایە سەرکـردەی کـاروانی دۆڵی باراندێز «عـەقـیـد فـولادوەند» هەتاوەکو خۆی پێـوەندی بەسەرکـردەی کـاروانی مـەرگەوەڕەوە بکـات و بەیاریدەی ئەو، بانەکـانی پێـشـوو

(٢٥) نووسەری ئەم کـتـێبە ناوی شـوێنە کـوردییـەکانی زۆر بەچەوت و چەوێڵی نووسیـوە، هەندێک جار ناوی یەک شوێنی بە دوو سێ شێوە تۆمار کردووە. ئێمە زۆر هەوڵمان داوە ناوە کـوردییەکان ڕاست بکەینەوە بەڵام لەوانەیە لە هەندێکیاندا سەرنەکەوتبین.

بگرێ. لە مێژووی دووی ئاخەلێوەدا فەوجی سوارەی فەوزیە لە بانەکانی هەڤرسەوە رووی کـردە ئاوایی قـەلاسی و بۆی کـرا ئەو شـوێنە بگرێ بەلام بارزانیـیـەکـان بەردەوام بەرگریکەرانی خۆیان لە بانەکانی هەڤرس و لە بەری دیوی شیرگان، قولقولە، چیای ئاق و بەرزاییەکانی سەرووی دژگوون «ناوچەی دەشتەبێل» و هەروەها لە بانەکانی ڕۆژهەلاتی ئاوایی قەلاسیدا زیاد دەکرد. بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی هاتبوونە دەست چەکداران دەیانویست لە ڕێگەی کۆنترۆلکردنی ڕێگەی مەرگەوەڕ ـ دۆلی قاسملووەوە یارمەتیی ئالیگرانی زێڕۆ و تەها بەهادوری بدەن و، لە پێشوەچوونی یەکە سوپاییەکان لە دۆلی قاسملو و هەروەها لە پێشوەچوونی کاروانگەلی باشوور پێشبڕی بکەن.

## ڕووداوی نالەباری هەلەج و بەدیلگیرانی هەندێ لە سەربازان

دوای ئەوەی ئاوایی قەلاسی گیرا، سەرکردەی فەوجی سوارەی فەوزیە بەداهێنانێکی تایبەت بەخۆی و لە ئەنجامی پێڕەوکاری لە هەستێکی گرژ و لەبار کە بەهۆی گرتنی قەلاسی لە لایەن هێزی دەولەتەوە هاتبووە دی، بڕیاری دا ئاوایی هەلەج کە لە سێ کیلۆمەتری باشووری قەلاسییەوە هەلکەوتووە، داگیر بکات. بۆ بەدیهێنانی ئەم نیازە، لە ڕۆژی سێیەمی جێژندا هێزێک لە سواران و دەستەیەک برێن بەرووکاری ئەو بانانەی بەسەر هەلەجیاندا دەڕوانی، ڕەوانە کران. شان بەشانی پێشوەچوونی ئەو سوارکارانە، سەرکردەی فەوج و هەروەها سەرکردەی کاروانیش لە روانگەی هەڤرسەوە لە کارەکانی ئەوانیان دەڕوانی.

دوو تیپ لە سوارکارانی یەکەم بەرازانەوەی پێویستەوە ڕووەو ئامانج هەلمەتیان برد و هەتا سەعات دە و نیو بە سەرکەوتنەوە ڕێگەیان بڕی، بەلام کتوپڕ لە یەکێک لە کەلەبەرەکانی چیاوە کەوتنە بەر ئاگربارانی خەستی بارزانییەکان و، ناچار مان لە یەکێک لەم کەلەبەرانەدا وەستان و خۆیان شاردەوە. بارزانییەکان کە رابردوویەکی بێ پسانەوەیان لە سوودوەرگری لە زەویدا هەیە، بەناسینی تەواوی هەلومەرجی زەوییەوە دەسبەجێ «گەلی»یەکەیان کۆنترۆل کرد و لە پێش و لە پاشەوە هەلمەتی خەست و خۆلیان بردنەسەر. ئەم پێکدادانە زۆر خوێناوی و بێ پێشینە بوو و هەتا سەعات ٢٠ی هەر ئەو ڕۆژە درێژەی کێشا. دواجار ملازمی یەکەم سەید محەمەدی ئیمامی و ١٣ کەس لە

سەربازان شەهید و ون بوون، ٩ کەسیش بریندار بوون و ملازمی دووەم حەمید جیهانبانی بە ١٥ مرۆڤی خۆیەوە بەدیلی کەوتە دەست چەکداران، لە کوردانی خۆمانییش(٢٦) دوو کەس شەهید و یەکێک بریندار بوون. چوار پارچە چەک و سێ برێنی گرانیش کەوتنە دەستی چەکداران. لە راستیشدا چەکداران توانییان هەردوو تیپی ناوبراو بەتەواوەتی لەناو ببەن و، مەلا مستەفاش وێرای ژمارەیەکی گەورە لە بارزانییەکان خۆی لە بانەکانی هەلەجدا قایم کرد.

روونکردنەوەی پێویست ئەوەیە تەرمی نەقیبی جوانەمەرگ شەهید سەید محەمەد ئیمامی لە رۆژی شازدەی ئاخەلێوەدا دوای گرتنەوەی سەرلەنوێی بانەکانی هەلەج، هەرچەندە ئەوەی چوار گوللەی پێ کەوتبوو و بەساغی بەسەر بەفرەوە مابوو، کەوتەوە دەست. تەرمی جوانەمەرگی ناوبراو، دەسبەجێ گواسترایەوە ورمێ و بەرێورەسمی سوپاییەوە نێژرا.

ئەم کارە بێ وردبوونەوەیە تەنیا بەهۆی هەستی هارووژاوەوە رووی دابوو، ببووە مایەی لەناوچوونی دوو تیپی سوارکارە، بۆیە ئەرکانی سوپا پاش فەرمانی پێشووی لەبارەی نەناردنی یەکەگەلی بچووکەوە بۆ بەروودا وەستانی چەکدارانی لێهاتووی بارزانی بەتایبەتی لەو بەرزاییانەی زۆر کوورِ و بەیەکەوە بەستراون و پێچ و پلووچیان تێدا زۆرە، فەرمانێکی تری بەشێوەی خوارەوە دەرکرد:

«ئەم رووداوانە بەچاکی پێشانی دەدەن کەوا لەم بەشەدا هیچ پلان و پێشنیازێک لەگۆڕێدا نییە، لەبەرئەوەی ئەگەر پلانێکی دیار و تایبەتی هەبوایە ئەوا سەرکردەکان دەستی خۆیان نەدەخستە ئەم جۆرە کارە نالەبارانە و رووداوی ئاوهاش روویان نەدەدا، داوێنی ئەم پێکدادانەش هێندە درێژەی نەدەکێشا و رۆژ بەرۆژ ورەی دوژمن بەگورتر و، ئازایەتیی بارزانییەکان چاکتر نەدەبوو.

گەورەترین و گرینگترین ئەرکی ئێوە لە باری ئێستەدا ئەوەیە تێکرای بانەکانی رۆژئاوای قاسملو بگرن و ئەم ناوچەیە هەتا شنۆ پاکژ بکەنەوە، بەمە ئێوە دەتوانن پێدەشتی مەرگەوەڕ بخەنە ژێر پێوە. دەبێ ئەوەش بزانن پێشوەچوونتان لە پێدەشتی مەرگەوەڕدا ئەگەرێتو بانەکانی نێوان قاسملو و مەرگەوەڕتان بندەست نەکردبێ ئەوا هیچ

(٢٦) «کوردانی خۆمانی» و «خێلانی خۆولاتی» ئەو خێلە کوردانەن کە پاش لەدەست چوونی کۆماری کوردستان ـ هەندێکیشیان هەر لەسەردەمی کۆمارەوە، خۆیان فرۆشتبوو و بووبوون بەجاش.

سوودێکی نابێ.»

بارزانییەکان دوای خۆ قایمکردن لە بانەکانی هەلەجدا، لەسعات ١٩ی ڕۆژی سێیەمی مانگی ئاخەلێوە لە ڕێگەی بانەکانی باشووری قەڵاسی و ڕۆستەم ئاواوە بەرەو سەنگەرەکانی فەوجی سوارەی فەویە ـ کە لە هەڤرسدا خۆی لە پارێز نابوو، بەگوللەبارانێکی خەستی تۆپ و برێنی گران و سووک پەلاماریان برد. ئەم پەلامارە بەیاریدەی ٥٠ مرۆڤی ئالیگری زێڕۆ بەهادوورییەوە جێبەجێ کرا. سەرەتا، چەند هەسپێک لە فەوجی سوارەی فەوزیە گلان و بریندار بوون و ئاگرباران هەتا نیوەی شەو درێژەی کێشا. بارزانییەکان و هەندێ لە یاریدەرانیان توانییان سوود لە تاریکیی شەو وەربگرن و بگەنە ناو یەکێک لە سەنگەرانی سوارە «سوارەی دووەم» و شەڕێکی دەستەویەخە لە سەنگەرەکانی سوارانی ناوبراودا هاتە کایەوە.

سەرکردەی فەوج دەسبەجێ فەرمانی دا بەسوودوەرگری لە تاریکی، یەکەگەلی خۆیان بەرەوپاش بکێشنەوە و خۆیان بەگوندی هەڤرس بگەیێن. لەم پەلامارە شەوییەدا ملازمی دووەمی سوارە «مستەفا هاتیفی» لە پەڕگەی گوندی «نارێ» لەگەڵ حەوت سەربازدا شەهید بوون و چواری تریش بریندار بوون، بەم ئاوایە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ چەکداراندا بەکۆتا گەیشت.

سبەینی ڕۆژی چوارەم فەرمان بەباڵەفڕە درا ئاواییی هەڤرس و بانەکانی ڕۆژئاوای ئەوێ بۆمباباران بکەن. باڵەفڕە توانییان هەتا دەمەو ئێوارەی ئەو ڕۆژە پتر لە ٦ جار مەکۆی چەکدارانی بارزانی و زێڕۆ بەهادوری لە دیوی هەلەجەوە بۆمباباران بکەن و لە دوایین جاری بۆمبابارانی ئاسمانیدا، فەرمان بەبەشی سوارە درا سوود لە تاریکیی شەو وەربگرن و بەرەوپاش بگەڕێنەوە. لە دەمەو ئێوارەی ڕۆژی چوارەمدا فەوجی سوارەی فەوزیە کەوتە پاشەکشێ و، وەکات لەگەڵ ئەو پێکدادانە خەست و خۆڵەی لە بانەکانی نێرەگی و زەرکادا روویان دا، بارزانییەکان لەبەر پاڵەپەستۆی بۆمبابارانی ئاسمانی و تۆپخانەدا شکان و بەرەو هەڤرس پاشەکشێیان کرد و، کاروان لە زەرکادا مۆڵی خوارد. شایەنی زانینە لە ئۆپەراسیۆنی ڕۆژی چواری ئاخەلێوەدا باڵەفڕەکان جموجۆڵی بەرچاویان لە خۆدا نواند و بوونە مایەی هەستانی ورەی پیاوانی خۆمانی و ڕماندنی ورەی تفەنگدارانی بارزانی. هەرچەندە سێ باڵەفڕەش بەگوللە ئەنگاوتران بەڵام توانییان بگەنەوە بەباڵەفڕگە. هەرەها بۆ پاسەوانی لە پاشکۆی بەشی پێشوو ـ کە جێگەی مەترسی بوو، فەرمان درایە فەوجی

ئەسفەهان کە لە ورمێدا بوو بۆ ئەوەی دەسبەجێ بەرەو سیلوانا بکەوێتە ڕێگە. لەو دەمەیدا ئەو ڕووداوە نالەبارە لە هەڤرسدا بەسەر فەوجی فەوزیەدا هاتبوو و ئەرکانی سوپای تێدا ئاگەدار کرابووەوە، فەرمانی نوێ گەیشتبووە سەرکردەی فیرقە و سەرکردەی ئەرکانی سوپا فەرمانێکی بەشێوەی ژێرەوە دا بەسەرکردەی هێزگەلی کوردستان:

«ئێوە باش ئاگەدارن ،خێڵان بەتایبەتیش تایەفەگەلی بارزانی لە سایەی بەدیهێنانی گچکەترین سەرکەوتندا گەورترین ورەیان تێدا بەدی دێ، ئەم کارەی بارزانییەکان لە ئەنجامی سەرکەوتنی چەند ڕۆژ لەمەوپێشیانە کە لە هەلەجدا بەدییان هێنابوو. سەرهەڵدانی ئەم ڕووداوانەش بەبۆنەی هەڵەی ئەفسەرانەوەیە و هەتا زەبرێکی گەورە و بەکار لە خێڵان نەسرەوێنن ئەم شێوە پەلامارانە بۆ ئێوە زۆر دەبن.

لەم دوو ڕووداوەی دواییدا ئەوە خوێندرایەوە بارزانییەکان لە نوختەیەکدا بەهەموو تواناوە هێرش دەکەن، پاش تێشکانیش جارێکی تر لە نوختەیەکی تردا خۆیان کۆ دەکەنەوە و لەوێ دەست بەهێرش و هەڵمەت دەکەنەوە. ئەگەر هەل و دەرفەتیان هەبێ و لە بارێکدا باڵادەستی و دەستپێشکەری بەدەستی ئەوان بێ ئەوا بێ ڕادە بۆ کاروانگەلی ئێوە مەترسیدار دەبن.

پێویستە لە هەموو نوختەکاندا پاڵەپەستۆیان بخەنە سەر، لەبەرئەوەی ئەوان هەر دەمێ خۆیان لەبەرامبەر هەڕەشەی ورد و دروستدا ببیننەوە ئەوا ورەیان یەکجار دادەبەزێ و بەدیهاتنی سەرکەوتن بۆ ئێوە لە سەتی سەت دەستەبەر دەبێ. لەلایەکی ترەوە لە هەڵمەتی شەوانەی بارزانییەکاندا ئەوە بەدەر دەکەوێ کە کردەوەی باڵەفڕە و بۆمبابارانکردن لە دژی بارزانییەکاندا بووەتە مایەی تەنگوچەڵەمەیەکی گەورە بۆیان بۆیە بەشەو هێرش دەکەن. پێویستە سوود لەم بابەتە وەربگیرێ و نەخشەیەکی ئاگرینی چاک بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پەلاماری بارزانییەکان دابنێن.»

## چۆنیەتیی کردەوەی

## کاروانی دزێ و کاروانی باراندێز

کاروانی دزێ بەسەرکردایەتیی عەلی قولی مزەفەری، بەر لە گزنگ دانی ڕۆژی دووەمی ئاخەلێوە ، بەهۆی چەکدارانی سەرگەلەی خۆی توانیی بانەکانی باشووری دزێ و هەروەها بانەکانی باشووری ڕۆژئاوای شەیتان ئاوا، زێوە، نەسرئاوا و بانەکانی دەربەند و نازناز

داگیر بکات و لەوێوە درێژە بەپێشوەچوونی خۆی بدات و، بەماوەی نیو سەعات بانەکانی باشووری دزێ و، هەتا دوو سەعاتی تر بانەکانی باشووری شەیتان ئاوا، زێوە و نەسرئاوا و، هەتا سەعات ٨ی سبەینەش بانەکانی باکوری دەربەند و تازاس داگیر بکات. لە هەموو ئەو شوێنانەی پێشوودا بەرگرییەک لە چەکدارانەوە سەری هەڵنەدا. بەڵام ئەو کاتەی هێزی سوپا بەرەو باکوری دەربەند دەچوو، کتوپڕ ٦٠ کەس لە چەکدارانی بارزانی بەرەو ئەو بەرزاییانە چوون و شەڕێکی گران وێڕای هەڵمەتی پێدا پێدای چەکداران دەستی پێ کرد. لە ئەنجامدا لە بانەکانی نەسرئاوا دوو کەس لە پیاوانی جەندرمە شەهید بوون و سێ کەسیش لە پیاوانی فەوجی سوارەی کوردستان بریندار بوون.

زیانی بارزانییەکانیش لەم شەڕەدا گەلێک بوو بەجۆرێ ٤ تەرمی خۆیان لە بانەکانی نەسرئاوادا بەجێ هێشتبوو، هەروەها ژمارەیەکیان لە کوژراوەکانی خۆیان لە بانەکانی تازاسدا ناشتبوو. دواجار کاروانی ناوبراو توانیی لە شوێنە گرتووەکانیدا برج لێ بدا و بناوانی کاری گونجاو بۆ پێشوەچوونی کاروان بەرەو سیاوان دابمەزرێنێ. ئەم کاروانە لە ڕۆژی سێیەمی ئاخەلێوەدا دەربەندیشی گرت و لە نوختە گرینگەکانی ناوچەدا کەوتە لێدانی برج و سەنگەر.

ئەودەمەی ئۆپەراسیۆنی کاروانی دزێ و هەروەها چۆنیەتیی ئۆپەراسیۆنی کاروانی عەقید نیساری «واتە گرتنی سەرلەنوێی قەڵاسی بەهۆی فەوجی سوارەی فەوزیەوە» بەئەرکانی سوپا گەیشتن، فەرمانێکی نوێ لە تارانەوە بەم ناوڕۆکەی خوارەوە گەیشتە سەرکردەی فیرقە:

«لە تێکڕای ڕووداوەکانی چوار ڕۆژی یەکەکانی ئەم فیرقەیەدا ئەوە دەخوێندرێتەوە کە بەڕاستی بارزانییەکان و پیرەوکارانی زێڕۆ دەیانەوێ بانە ناوەندییەکان «واتە بانەکانی نێوان دەشت، مەرگەوەڕ، دۆڵی قاسملو و شنۆ» بگرنە خۆیان و بەم ئاوایە لە لایەکەوە ڕێگەی ئازووخە بۆ خۆیان دابین بکەن و لەلایەکی ترەوە بەگرتنی ئەم بانانە تەنگ بەهەموو هێزەکانی سوپا هەڵبچنن. بەم پێیە، دەبێ زۆر وریای دۆخەکە بن و بەهەر شێوەیەکی بۆتان بلوێ بانەکانی پێشوو بگرنە دەست. لەبەرئەوەی بەم کارە، یەکەم: چەکداران لە ناوچەی ئاوەدانی و ئەو شوێنانەی دەشێ ئازووخەیان تێدا پەیدا ببێ، بکرێنە دەرەوە. دووەم: چێوەی جێ نیشتەبوونیان کەمتر و گچکەتر دەبێتەوە. سێیەم: ئامانجێکی چێتر لەم کۆجێ بوونەی ئەوان بۆ ئێوە دێتە دی و، کاری بۆمبابارانی بۆ ئێوە ساناتر و وردتر

دەبێ، چوارەم: هێزەکانی ئێوە کۆچێ دەبن.

لەلایەکەوە لەبەرئەوەی بانەکانی ڕۆژئاوای «دەشت ـ مەرگەوەڕ» بەرزن و ئێستە بەفر دایپۆشیون و ڕێبازگە چیاییەکان یەکجار کەمن. واچاترە کاروانی ئێوە لە قەڵاسییەوە بەولاوەتر نەچێ و هەر لەو شوێنەدا باری پارێز وەربگرێ، بەڵام لەبەری ڕۆژهەڵاتدا پێویستە بەهاریکاریی کاروانی دۆڵی قاسملو تێکڕای بانەکانی نێوان قاسملو و مەرگەوەڕ داگیر بکەن.

کاروانی دزێ پێویستە پاش گرتنی بانەکانی ڕۆژهەڵاتی دۆڵی قاسملو بەرەو سیاوان بەڕێ بکەوێ و ئەگەربێو بەم شێوەیە هێزی سوپا بتوانێ بارزانییەکان لە ناوچە شاخاوییەکەی نێوان مەرگەوەڕ و سنووردا لە گەمارۆ بنێ، وەک چۆن لە پێشەوە ئاماژەمان پێی دا، لەبەرئەوەی ڕێبازگەی هاتن و چوون لە ناوچەی بندەستی بارزانییەکاندا کەمە و ناوچەکە بەرزەلان و داخراو و دژوارە، ئەوا گومان لەوەدا نییە زیانی گەورەیان پێ دەکەوێ و باڵەفڕە باشتر دەتوانن تەنگاویان بکەن». لەبەرئەوەی ئەرکانی سوپا لە فەرمانەکەی خۆیدا فیرقەی ڕاسپاردبوو لە بارەی ئەم تیۆرییەوە لێکۆڵینەوەی تێروتەسەل بکرێ و لە بەرئەنجامەکەیشی ئاگەدار بکرێنەوە بۆیە سەرکردەی فیرقەی کوردستانیش دوای موتالایەکی سەرلەبەر، لە هەمان مێژوو واتە لە سێیەمی مانگی ئاخەلێوەدا بیر و بۆچوونی خۆی بەم شێوەیەی خوارەوە بەتاران گەیاندەوە:

«بۆ دەسوەشێنی لە نێوانی دۆڵی قاسملو و مەرگەوەڕدا لەبەرئەوەی بارزانییەکان بانەکانی نێوان ئەو دۆڵەیان لە بن دەستدایە و بەرگرییەکی شایەن دەکەن، هەروەها لەبەرئەوەی قووڵاییی ئەو بانانە زۆر و کێوەڵانێکی دژوار و بەیەکترەوە گرێدراوە ناکرێ پۆلی گچکە بەناوی هێزی لاوەکییەوە بنێردرێ، بۆیە بڕیار درا کاروانی دۆڵی قاسملو ڕابووەستێ بەڵام کەتیبەیەکی پیادە و دەستەیەک زرێدار و دەستەیەک هاوەن و دەستەیەکی تری تۆپخانە بەڕووکاری باراندێزدا بچن و وێڕای پێوەندی کرنەوە بەکاروانی مەرگەوەڕ هەروەها لە پێناو وەدەرنانی چەکداران لەو ناوچە کێوەڵانییەدا دەست بەکردەوە بکەن و کاروانی مەرگەوەڕ مادامەکی باڵی چەپی خۆی لەدەست نەداوە، لەباری بەرگریدا بمێنێ و بەرەوپێش هەنگاو نەنێ.

لە تاراندا ئەرکانی سوپا ناردنی کاروانی دۆڵی باراندێزی پەسند کرد، هەروەها بیرەوەرییەکی دایە سەرکردەی فیرقە کەوا گرتنی ئەو بانانە بایەخێکی ژینەوەریی بۆ ئێوە

هەیە و ئەگەر بێتو ئەو بانانە بگیرێن ئەوا گەورەترین چەپەڵۆک بەبارزانییەکان و هاوکارانی زێرۆ و تەها دەکەوێ، هێزگەلی راسپێریش بۆ گرتنی ئەو بانانە پێویستە زۆر مەشقدار بن و لە رووی ژمارەوە بەس بن و، بەلایەنی کەمەوە دەبێ دوو کەتیبە بنێردرێن.

لە رۆژی چوارەمی ئاخەلێوەدا سەرکردەی فیرقە بڕیاری خۆی بەجێ هێنا و، کاروانی باراندێز ـ لە بن سەرکردایەتیی ئاغای عەقید فولادوەند و بەو خۆئامادەکارییەی پێشتر ئامـاژەم پێی دا، راسپارد بەرەو دۆڵی باراندێز بەرەوپێش بچێ و بەرزاییەکانی باشووری نێوان «نەرەلەر ـ سەدیق» بگرێ و لەگەڵ کاروانی عەقید نیساریدا پێوەندی بکاتەوە.

کاروانی پێشوو توانیی پاش لێدانی زیانی ٥ کەس لە دوژمن و گرتنی سێ پارچە چەکی برنۆ، ئەو بانانە لە هەمان رۆژدا بگرێ. ئەم کردەوەیە بەدەستەوای باڵەفڕە بوو و پێدا پێدا هەتا کۆتاییی رۆژی پێنجی ئاخەلێوە فڕینی باڵەفڕە درێژەی کێشا و بەری بەرزاییەکانی بەردەزەرد، قولقولە و هەڤرسی بۆمباباران کرد و بەرئەنجامەکەیشی زۆر باش بوو. بەجۆرێ پۆلێ لە چەکداران لە رێگەبڕینێکی ناوچەی مەرگەوەڕدا بەئاوایەک کەوتنە بەر ئاگرباران و بۆمبابارانەوە هەر بەجارێک تەفروتونا بوون.

ئەو کاتە، لەبەرئەوەی کردەوە لە دزێ بەکۆتا هاتبوو و چەکدارانی ئەو دەوروبەرە ون بووبوون، فەرمان درایە فەوجی سوارەی کوردستان هەتا بچێتە ورمێ و بەئامانجی پاراستنی پاشکۆی کاروانی عەقید نیساری بەرەو سیلوانا ببزوێ. فەوجی ناوبراویش هێزێکی سوارەی خۆی لە شەیتان ئاوا بەجێ هێلا و پاشماوەی فەوجەکە بەرەو ورمێ رۆیشتن و لە رۆژی شەشەمدا چوونە ناو دەشتی مەرگەوەڕەوە. هەروەها کەتیبەی ئەسفەهان کە لە سیلوانادا وەستا بوو، هەر هەمان رۆژ ناردرایە نێرەگی و خۆی بەسەرکردەی کاروانی مەرگەوەڕ ناساند.

## کردەوەی کاروانێکی نوێ کە بۆ تەواوکردنی چالاکییەکانی کاروانگەلی باشوور پێک هاتبوو

هەروەک لەناو توێی ئەو زانیارییە گشتییانەی رۆژانی سەرەتای مانگی ئاخەلێوەدا ئامـاژەمان پێی دا، کاروانی پشتەوانیی عەقید مەجیدی بەتەواوی ئامێری خۆیەوە پاش گەیشتنی بەنەغەدە راسپاردرا بەرەو ئەرەنە و دەربەند ببزوێ. ئەم کاروانە بەرازانەوەی پێویست و شان بەشانی باڵەفڕە لە سەعات حەوتی سەر لە سبەینەی رۆژی پێنجەمدا

بەرەو ئامانجی خۆی کەوتە ڕەوت و هەتا دوو سەعات و نیوی دوای نیوەڕۆ توانیی بەبێ پێکدادان ئەرەنە و میراوە داگیر بکات.

ئەرکی لاوەکی کە بەسەرکردەی ئەم کاروانە سپاردرا بوو بریتی بوو لە گرتنی بانەکانی پیرناسر. بۆ بەجێهێنانی ئەم راسپێرییە، سەعات ٧ی سبەینەی ڕۆژی شەشەمی مانگی ئاخەلێوە کاروان بەرەو بانەکانی پێشوو کەوتە ڕێگە، بەیاریدەی باڵەفڕەوە دەستی کرد بەپێشوەچوونی خۆی و لە سەعات دوو و نیوی پاشنیوەڕۆ قەڵاتانی گرت و درێژەی بەپێشوەچوونی خۆی بەرەو بانەکان دا.

لەو پێشوەچوونەدا چەکداران ڕەقەکارییەکی زۆریان پێشان دا بەڵام لەبەر پاڵەپەستۆی کاروان و ئاگربارانی تۆپخانەدا، ئەو برجەی لە قەڵای پیرناسردایە و بەدەستی چەکدارانەوە بوو کەوتە بن دەستی هێزی خۆمانی و زیانێکی زەوەندی گیانی بەچەکدارانی بارزانی گەیشت بەجۆرێ بواری ناشتنی کوژراوەکانی خۆیان نەبوو و شەش تەرمیان لە گۆڕەپاندا بەجێ هێشت، جگە لەمە سێ دیل و سێ پارچە چەک و پارابلوومێک کەوتە دەستی سەربازان.

زیانی سوپا لەم بەیەکدادانەدا شەهیدبوونی عەریفی دووەم محەمەد عەلی پوور قاسمی و دوو سەرباز بوو. مولازمی یەکەم (ڕەئووفی)یش لەلای پێیەوە ئەنگاوترا و پێنج سەربازی تریش بریندار بوون.

## داڕشتنی پلانی دوا ئۆپەراسیۆن لە دژی بارزانییەکاندا
## چوونی سەرۆکی ئەرکانی سوپا بۆ ورمێ و
## ڕاگەیاندنی فەرمانگەلی نوێ

ئەو ڕاپۆرتانەی لە سەرکردەی هێزگەلی کوردستانەوە لەم ڕۆژانەی دواییدا دەگەیشتنە تاران پێشانیان دەدا کەوا هەرچەندە لە هەموو خاڵەکاندا کاروانگەلی ئۆپەراسیۆن توانیبوویان پێش لە دەسوەشاندنی بارزانییەکان بگرن، بەڵام پێشوەچوونی کاروانگەل لە زۆربەی خاڵەکاندا بەیەکجاری وەستا بوو و، بەهۆی ڕوودانی پێشهاتە نالەبارەکانی پێشوو لە نەڵۆس و هەلەج و هەڤرس کە لە ڕۆژانی سەرەتای ساڵی نوێ واتە لە یەکەم و دووەم و سێیەمی مانگی ئاخەلێوەدا ڕوویاندابوو، سوپا دەستپێشکەریی کردەوەی لە دەست دابوو، «ئەگەر بمانەوێ ڕووناکتر بڵێین» لە هەمبەر بارزانییەکاندا باری بەرگریی

گرتبووە خۆی.

تاران لە لێکۆڵینەوەی راپۆرتەکاندا چاک لەم هەلومەرجە تێ گەیشتبوو و دەیزانی هەندێ لەو هەڵکەوتانە کارێکی نالەباری «رەوانی»یان کردووەتە سەر برێک لە پیاوانی سوپا و، تەنانەت خێڵانی میریخوازیش تەواو ترساو و بێ هیوا بووبوون و خۆیان بەناوچە بندەستەکانی خۆیانەوە گیر کردبوو، بۆیە بریاری دا دۆخی فیرقە چاک بکاتەوە و ورەی پیاوانی سوپا و، غەیرە سوپاییەکانی میریخوزا بتەو بکاتەوە.

بۆ گەیشتن بەو نیازە، بەفەرمانی مەزن رێزداری پیرۆز شاهەنشا فەرمان بەفەریق رەزم ئارای سەرۆک ئەرکانی سوپا درا کە بەموتالاّ و لێکۆڵینەوە لە ناوچەکە و سەیرکردنی هەلومەرج و هەڵکەوتی هەموو هێزگەل لە نێزیکەوە، نەخشەیەکی تێکڕایی بۆ کردەوەگەل هەر لەوێ دابرێژێ و بەرئەنجامی بینینەکانی خۆی بەبەرێزیان بگەیێنێتەوە.

بۆ بەجێهێنانی ئەم فەرمانە شاهانەیە، سبەینەی رۆژی چوارەمی ئاخەلێوە فەریق رەزم ئارا بەخۆی و ٣٠٠ پارچە زێڕی نیو پەهلەوی کە لەلایەن مەزن رێزداری پیرۆز شاهەنشاوە بەناوی جێژنانە بۆ ئەفسەرانی دیاری کردبوو، هەروەها ١٩٨ نیشانی ئازەر ئابادگان و ٢٠٠ مێدالیەی بوێری، بەباڵەفڕە بەرەو تەورێز بەرێ کەوت. بەڵام لەبەرئەوەی هەوا لەزنجان نالەبار بوو، ناچار گەڕایەوە تاران و رۆژی پاشتر گەیشتە تەورێز. پاش هەڵوەستەیەکی کەم لەم شارەدا چووە ورمێ، لە سەعات سێی پاش نیوەڕۆی هەر ئەو رۆژەدا لە ئەرکانی فیرقەی ٣دا خەریکی لێکۆڵینەوەی بارودۆخی سوپایی بوو و لە رۆژی شەشەمی مانگی ئاخەلێوەدا بۆ ئەوەی زانیاریی چاتری دەست بکەوێ خۆی سەردانی هەموو کاروانگەلی باکور و باشووری کرد و فەرمانی شاهانەی بەئەفسەرانی هەموو کاروانەکان گەیاند و بەپێدانی جێژنانە و نیشانە ئەفسەرانی بەدەستاندەی مەزن رێزداری پیرۆز هیوادار کرد و پێی راگەیاندن کەوا زاتی شاهانە خۆی بەردەوام ئاگەداری شێوەی کار و خۆبەختکاریی ئەفسەرانە و، مێدالیەی بوێریی بەبەرۆکی سەرۆک خێڵان و، ئەوانەوە هەڵواسی کە گیان لەسەر دەستییان نواندبوو.

ئەم بەرزکردنەوەی ورە و دەست و دیارییە لە رێگەی دەمڕاستی مەزن رێزداری پیرۆزەوە لە رۆژانی سەری ساڵی نوێدا بەشێوەیەکی گەلێک تازە و نایاب و بەرێوڕەسمێکی تایبەتەوە جێبەجێ کرا. ورەی بەرز و هەستی خۆبەکەمگری و خۆبەختکاریی لە ناو هەموو ئەفسەران و پیاوانی خێڵانی کاروانگەلدا هێنایە کایە. بەرادەیەک هەر هەموویان

ئامادەیی خۆیان بۆ راپەڕاندنی هەموو ئەرکێک بەگوێی سەرۆکایەتیی ئەرکانی سوپا گەیاند و دڵنیایان کرد کە بەپێشکێش کردنی گیانی خۆیان لە پێناوی نیشتمان و شاهەنشادا ناهێڵن چ جاری تر بەسەرهاتی لە گوێن رووداوی نەلۆس و هەلەج و هەڤرس لە ناوچەی فیرقەی چواردا بێتەوە پێش و، ئەم هەڵکەوتەی پێشوو بووە بەمایەی دەرس و پەند بۆیان و، لە ئێستە بەدواوە بەچاوی کراوە و ئاگای تەواوەوە بەئەرکە سەربازییەکان رادەپەڕن.

هەمان رۆژ، سەرۆکی ئەرکانی سوپا ئەنجامی موتاڵای خۆی و نەخشەی ئۆپەراسیۆنی ـ بەرەچاوکردنی باری زەوی و هێزی دوژمن، بەتەلیگراف خستە بەردەمی مەزن رێداری پیرۆز. رۆژی حەوتی مانگی ئاخەلێوەش سەرۆکی ئەرکانی سوپا گەڕایەوە تاران و بۆچوونی خۆی لەبارەی ئۆپەراسیۆنی سوپاوە بەزارەکی پێشکێشی مەزن رێداری پیرۆز کرد.

بەکورتی، سەرۆکی ئەرکانی سوپا لە لێکۆڵینەوەی بارودۆخی زەوی و هێزی هەردوو لادا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کاراونگەلی باکور «جگە لە کاروانی عەقید فولادوەند» پێویستە بەهۆی دۆخی نالەباری زەوی، بکەوێتە باری بەرگری لە خۆ و، کاروانی عەقید فولادوەند کە لە دۆڵی باراندێزدا کاری دەکرد، بەرەو بانەکانی «بەردەزەرد ـ قەلا» هێرش بکات و ئەو شوێنانە بەهەر نرخێک بێ داگیر بکات.

لەبارەی کاروانگەلی باشووریشەوە، بۆ ئەوەی هێزی خۆیی لە پێگەیشتنی زیانی گیانی پارێزراو بن و، پێشیش لە دەستدرێژیی بارزانییەکان بگیرێ، بڕیار درا هێرشی یەکراست بەرەو شنۆ نەکرێ کە مەڵبەندی بارزانییەکان بوو. لەبەرئەوەی ئەم خاڵە گرینگە سنوورییە لە داوێنی هەڵەت و بانی بەرز و سەربەرز هەڵکەوتووە و، مادام ئەو بانانە لە بن دەستی بارزانییەکاندان ئەوا گرتنی شنۆ کاری کردەنی نییە و زیانی زەوەندی گیانی بەهێزی دەوڵەت دەکەوێ و وا باشترە بۆ گرتنی شنۆ هێرشی باڵەکی بکرێ. واتە سەرەتا بانەکانی پادار بەهۆی هێزگەلی سوپاوە بگرن و پاشانیش خاڵی بەرزی «راندۆلە» کۆنترۆل بکرێ هەتا لە خۆوە دەسڕۆیشتنی هێزی سوپا بەسەر دەشتی شنۆدا دەستەبەر بکرێ. ئەوجا، پاش گەیشتن بەئامانج لە باشوور، کاروانگەلی باکور لە دۆڵی قاسملو و بەرزاییەکانی ئاق بلاق «کانی سپی»ەوە دەست بەپەلامار بکەن.

هەروەها بۆ ئەوەی رووداوی ناخۆش نەیێتە پێش و یەکە گچکەکان کاری لە خۆوە

نەکەن، یەکەم: هەموو کردەوەکان لەبن چاوەدێریی لیوا هومایوونیدا بن. دووەم: یەکەگەلی باشوور هەموویان لە بن سەرکردەییی عەمید بێگلەری و یاریدەریی عەقید غەفاریدا بن، یەکەگەلی باکوریش لە بن سەرکردەییی راستەوەخۆی عەقید زەنگنە و بەرپرسایەتیی عەقید نیساری، عەقید فولادوەند و عەقید پەرتەویدا کاریان جێبەجێ بکەن.

ئەم بابەتانە لەلایەن مەزن ڕێزداری پیرۆز شاهەنشاوە بڕیاردران و، نەخشەی پێشنیازکراوی ئەرکان بەهەندێک گۆڕانکارییەوە کە شاهەنشا لە هەندێک پرسی تەکتیکیدا کردبووی، بەشێوەی ژێرەوە بڕیار درا و بۆ جێبەجێ کردن حەواڵەی سەرکردەی هێزگەلی کوردستان کرا:

ئەلیف ـ لە باکور:

(١) لە ناوچەی مەرگەوەڕ(نێرەگی ـ زەرکا) پێویستە یەکەکان لە بن سەرکردایەتیی عەقید سەردادوەردا باری بەرگری لە خۆ وەربگرن و، لە بەرزاییییە سنوورییەکاندا کەلو دابمەزرێنن هەتا دوژمن نەتوانێ لە باڵی ڕۆژئاوای ئەوانەوە پێدرێژی بکات. یەکەکانی سوارە لە نێرەگی و سیلوانا بگیرسێنەوە و بۆ ئۆپەراسیۆنی داهاتوو تەیار بن.

(٢) لە ناوچەی باراندێزدا، پێویستە کاروانی عەقید فولادوەند لە یەکەمین جاردا بانەکانی گەرگل و دەشتەبێڵ و هەروەها بانەکانی قولقولە و بەردەزەرد(بەری زەر) بگرێ و لەگەڵ کاروانی مەرگەوەڕدا پێوەندی دابمەزرێنێ.

(٣) کاروانی دۆڵی قاسملو بەسەرکردایەتیی عەقید نیساری هەمان دۆخی بەرگری لە خۆیدا بپارێزێ.

(٤) کاروان عەقید مزەفەری لە شەیتان ئاوادا پاش گرتنی دەربەند و تازاس بارێکی بەرگری لە خۆی وەربگرێ.

بێ ـ لە باشوور:

(١) لە پێنگاوی یەکەمدا کاروانی عەقید مەجیدی چیای پادار بگرێ.

(٢) لە پێنگاوی دووەمدا کاروانی عەقید ئەنساری بانەکانی چوار بت و، کاروانی عەقید غەفاری «دارەشمان، سۆفیان و نەڵۆس» بگرێ و بەگرتنی ئەو بانانە بەرەو بانەکانی راندۆڵە بکەوێتە جوولە و، پێشەکیی هێرش بەرووکاری شنۆدا دەستەبەر

بکات.

ئێستـــه بۆ ڕووناککردنی بیـری خـوێنەران، شێـوەی بڵاوبوونەوەی یەکەگەلی باکـور و باشــوور لە چوارەمین ڕۆژی مــانگی ئاخــەلێــوەدا شــرۆڤـە دەکـەین، پاشــان دەکـەوینە ڕوونکردنەوی ئەو کردەوانەی کە سوپا لە ڕۆژی حەوتی ئاخەلێوەدا دەستی پێ کرد.

## ڕازانەوەی هەموو یەکەکان لە ڕۆژی شەشەمی ئاخەلێوەی ١٣٢٦دا

(١) سریەیەک لە کەتیبەی ئەسفەهان لە سیلواناندا.

(٢) فـەوجی سـوارەی فـەوزیە و دوو زرێپـۆش لە زەرکـا «بەسـەرکـردایەتیی عـەقـیـد پەرتەوی».

(٣) دوو کەتیبەی پیادە، بطریەیەکی تۆپخانە، سریەیەک هاوەن و زرێپۆشێک لە نێرەگی «بەسەرکردایەتیی مقەدەم سەردادوەر».

هەر سێ کاروانی سەرەوە لە بن چاوەدێریی ڕاستەوخۆی عەقید نیساریدا.

(٤) کـەتیبـەیەکی پیادە، دەسـتـەیەکی تۆپخـانە، دەسـتـەیەکی هاوەن «بەسـەرکردایەتیی عەقید فولادوەند» لە بانەکانی سەدیق و نەرەلەردا.

(٥) کـەتیـبـەیەکی پیـادە، دەسـتـەیەک تۆپخـانە و دەسـتـەیەک هاوەن و زرێپـۆشـێک لە زارگەلیی قاسملودا «بەسەرکردایەتیی نەقیب قاشائی».

(٦) فەوجی سوارەی کوردستان، بطریەیەکی تۆپخانە، دەستەیەک هاوەن و زرێپۆشێک لە شەیتان ئاوا «بەسەرکردایەتیی عەقید مزەفەری».

سێ کاروانی پێشوو لە بن چاوەدێریی زەعیم عەمید زەنگنەدا.

(٧) کەتیبەیەکی پیادە، دەستـەیەک تۆپخانە لە وەزنە و خان تاوسدا «بەسەرکردایەتیی ڕائید کەبیری».

(٨) کەتیبەیەکی پیـادە و دەستەیەک تۆپخـانە لە قەڵاجۆق و هەنهەنەدا «بەسەرکردایەتیی ڕائید زرێپۆش».

(٩) دوو کـەتیـبـەی پیـادە، دەسـتـەیەک هاوەن و دەسـتـەیەک تۆپخـانە لە نەغـەدەدا «بەسەرکردایەتیی عەقید مەجیدی».

(١٠) دوو سریەی پیادە و برێن لە نەغەدەدا «بەسەرکردایەتیی ڕائید موحسینی».

(١١) بطریەیەکی ١٠٥ی بەرز و بطریەیەکی ١٠٥ی کــورت و دوو زرێپــۆش لە

نەغەدەدا.

(١٢) سریەیەکی پیادە لە گەرنەدا.

(١٣) دوو سریەی پیادە ، دوو دەستە برێن و دوو زرێپۆش لە بانەکانی چوار بتدا «بەسەرکردایەتیی رائید مساوات».

(١٤) کەتیبەیەکی پیادە، کەمتر لە سریەیەک، دوو هێزی سوارکارە، دوو زرێپۆش و دەستەیەک تۆپخانەی ١٠٥یی کورت لە سۆفیاندا «بەسەرکردایەتیی عەقید ئەنساری».

(١٥) ٢٥٠ کەس لە تفەنگدارانی مەنگوڕ بەسەرپەرشتیی ملازمی دووەم (...) لە جلدیاندا.

نۆ کاروانی سەرەوە لە بن سەرکردایەتیی راستەوخۆی عەمید بێگلەری و بریکارەتیی مقەدەم غەفاریدا.

(١٦) دوو سریەی پیادە و سریەیەکی تۆپی ٣٧ لە ورمێدا «بەسەرکردایەتیی رائید دلو».

هەندێ لە تفەنگهاوێژانیش لە دەوروبەری کاروانگەلی پێشوودا بەنیازی یارمەتی کۆ بووبوونەوە. حەوت باڵەفڕەی «هاینە» و «تایگەرمۆس»یش لە بندەستی هێزدا بوون و لە رۆژی سێیی ئاخەلێوە لە باڵەفڕگەی تەورێزەوە بۆ باڵەفڕگەی ورمێ «کە بۆ نیشتنەوەی باڵەفڕە پتر لەبار بوو»گوازرانەوە. بەم شێوەیە باڵەفڕەکان پاش چاریەکە سەعاتێک فڕین بەسەر تەواوی هەرێمی کاری فیرقەدا دەیانتوانی سەرانسۆیی بکەن و ئەو ئەرکانەی پێشیان سپاردرابوو جێبەجێ بکەن.

## چۆنیەتیی ئۆپەراسیۆنی عەقید نیساری

پاش ئەوەی یەکەگەلی پێوەندیدار بەکاروانی مەرگەوەڕ و زەرکا و نێرەگی و بانەکانی سەدیق و نەرەلەر «بەگوێرەی ئەو بلاوەیەی لە پێشەوە ئاماژەمان پێ دا» گیرسانەوە، بارزانییەکان درێژەیان بەپێشوەچوونی خۆیان لە بانەکانی «هەڤرس»ەوە بەرەو باکور دا و بانەکانی رۆژئاوای دەزگر و «ڕاژان»یان گرت و لە ئەنجامدا لەگەڵ خێلانی نووری بەگ کە لە گوندی دەزگر و راژاندا بوون بەرەورووی یەکتر هاتنەوە و پاش تێکسرەواندێکی کورتەبڕ تفەنگهاوێژانی نووری بەگ پاشەکشێیان کرد. لەم تێکسرەواندنەدا دوو کەس لە تفەنگهاوێژانی ناوبراو شەهید بوون و چواریش بریندار بوون. هەروەها لەبەرئەوەی

خاڵەکانی پێشوو کەوتبوونە پاشکۆی بەرەی بەرگریی کاروانەوە و لەوانەبوو مەترسی بخەنە سەر پاشکۆی هێڵی بەرگری بڕیاردرا فەوجی سوارەی فەوزیە و کەتیبەی ئەسفەهان بەرەو دەزگر و ڕاژان بەڕێ بکەون و بارزانییەکان لە بانەکانی ئەو دوو گوندە وەدەربنێن.

لە ئەنجامی کۆبوونەوەی کەلوپەل لە سیلوانا، بارزانییەکان لە ڕۆژی هەشتەمدا ئاگەداری گۆڕانکارییەکان بوونەوە و لە ڕۆژی نۆیەمدا گوندی دەزگریان چۆڵ کرد و بەرەو هەڵەتەکانی سنوور پایدۆزیان کرد. لە ڕۆژی نۆیەمدا باران و تەمێکی ئەستوور دەستیان پێ کرد، ئەو کاتە بارزانییەکان لە پایینی بەرزاییەکانی هەلەجەوە و بەسوودوەرگری لە تەمتومان چەند تۆپێکیان حەواڵەی بارەگای نێرەگی کرد بەڵام هیچ ئامانجێکیان نەپێکا.

هەڵمەتی ئاسمانیی ڕۆژی نۆیەم بەگورجوگۆڵییەکی بێ رادە لە هەموو بەرەکاندا رووی لە زێدەبوون کرد بەجۆرێ شێخ محەمەد سەدیقی برای مەلا مستەفا نووسراوێکی بۆ سەرکردەی کاروانی مەرگەوەڕ نووسی و داوای سێ ڕۆژ ئاگربڕی کرد هەتا بتوانێ لەو سێ ڕۆژەدا لەگەڵ شێخ ئەحمەدی برایدا بڕیارێک بۆ بەجێ هێنانی فەرمان و بەڵێنەکانی پێشووی خۆیان بدەن. سەرکردەی کاروان کە تاکتیکی بارزانییەکانی زانیبوو وەڵامی دایەوە کەوا هەتا بڕیارەکانی پێشوویان بەجێ نەهێنن هیچ وتووێژێک لەگۆڕێدا نییە.

بەرەبەیانی ڕۆژی سێزدەی ئاخەلێوە باران لێی کردەوە. سەرکردەی کاروانی مەرگەوەڕ، ملازم یەکەمی سوارە «حیشمەتی»ی راسپارد هەتا بەدەستەیەکی سوارە و پاڵپشتیی دەستەیەک هاوەن و ئاگری دەستەیەک تۆپخانە و سەت کەس لە خێڵانی ناوەخۆ لە ڕێگەی هەڵەتەکانی ڕۆژئاوای سیلواناوە بەرەو دەزگر هەڵمەت ببات. ئەفسەری ناوبراو بەڕازانەوی پێویستەوە بەرەو رووکاری ئامانجی خۆی کەوتە ڕێگە و بەبێ پێکدادان توانیی دەمەو ئێوارەی هەر ئەو ڕۆژە گوندی ڕاژان و، دوو سەعات پاشتر گوندی دەزگر داگیر بکات.

پاش ئەوەی کاروانگەلی باشوور «کاروانی عەقید مەجیدی و عەقید غەفاری» هەتا دوا دەمی ڕۆژی سێزدە هەندێ سەرکەوتنی لە بانەکانی پادار و بانەکانی دۆڵدا بەدی هێنا و هەروەها کاروانی «باراندێز»ی عەقید فولادوەند توانیی بانەکانی قولقولە و بەردەزەرد بگرێ و هەتا رادەیەک دەسڕۆیشتنی بارزانییەکان بەرتەنگ بکاتەوە و لە ئەنجامدا دەستیان لە گوندەکان بەکۆتا بهێنێ، فەرمان بەکاروانی عەقید نیساری درا کەوا بەرووکاری هەڤرس و قەڵاسیدا هێرش ببات. کاروانی ناوبراو هەتا سەعات شەشی ڕۆژی

پازده بەرەو ئامانجی داواکراو ڕۆیشت و، بەبێ بەیەکدادان لەگەڵ دوژمندا توانیی بەیاریدەی خێڵانی ناوەخۆ بانەکان و گوندەکانی هەڤرس و قەڵاسی بگرێ.

لە ڕۆژی شازدەیەمدا کاروانی عەقید نیساری بەهۆی گرتنی «شیرکان» و بانەکانی باشووری ئەوێ، پێوەندیی خۆی لەگەڵ کاروانی باراندێزدا گرێ دایەوە و دۆخی هێزگەلی سوپا بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش چاک بووەوە. لەم دۆخ و بارانەدا، هەموو ڕۆژ ڕاپۆرت دەگەیشتنە سەرکردەی هێزگەلی کوردستان، ئەو زانیارییانە دەیانگوت کەوا بارزانییەکان پاڵەپەستۆیەکی بێ ڕادەیان خستووەتە سەر مولکدارانی شنۆ هەتا چەندی زووترە لەسەر چۆمی گادەر و لە هنداڤی دۆڵی گێلاسدا نێزیکەی کیلۆمەترێکی باکوری ڕۆژئاوای بانەکانی «لوپارسو»ی ناو زەویی ئێران و بەرامبەر گوندی خرێنەی ناو زەویی عێراق، پردێک دابمەزرێنن هەتا لە کاتی پێویستدا خاوخێزانیان لە ئاو بپەڕێننەوە و بچنەوە ناو زەویی عێراق.

لەلایەکی تر، بەکاربردنی دوو تۆپی ٧٥ییان داوەتە دەست ئەفسەرانی هەڵاتووی تاران. بەجۆرێ یەکێکیان بەسەرکردایەتیی ملازم دووەمی هەڵاتوو «رەئیس دانا»یە لە بەرەی سۆفیان و نەغەدە، ئەویتریان بەسەرکردایەتیی ملازمی یەکەمی هەڵاتوو «تەفرشیان»ە و، لە ناوچەی مەرگەوەڕدا سوودی لێ وەرگیراوە. ئەفسەرانی هەڵاتووی لای بارزانییەکان لە کردەوە و هەڵاتنی خۆیان پەشیمانن و چاوەڕوانی لێبوردنی گشتین.

لەم هەرایەدا لەبەرئەوەی پاڵەپەستۆی هێزگەلی سوپایی پتر بووبوو، بارزانییەکان ترس و لەرزێکی بێ ئامان گرتبوونی و، دوو ڕۆژ بەتەواوی خەریکی پەلاماردانی شنۆ بوون. دانیشتووان ناچاربوون پارە و پوولیان بشێرنەوە. لە ئەنجامی هەڵسوکەوتی نالەباری بارزانییەکان نێزیکەی ٦٠ سەر مرۆڤ لە خەڵکی زەرزای دانیشتووی گوندانی دەوروپشتی شنۆ ناچار بوون سەری خۆیان هەڵبگرن. لە مێژووی دەیەمی ئاخەلێوەدا خۆیان بەهێزی میری ناساند و ٦ پارچە تفەنگ کە لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان دایانەوە. ئەوانی تریش گوتیان کەوا چەکی ئەوان بەزۆردارەکی لە لایەن بارزانییەکانەوە بردراوە.

ڕۆژی پاشتر، واتە ڕۆژی یازدەیەم زانیاری گەیشت کەوا بارزانییەکان تێکڕای خاوخێزانی خۆیان لە دۆڵی گادەردا کۆکردووەتەوە و مەلا مستەفا لە دۆڵی گێلاس بووە و خۆی گەیاندووەتە گوندی کەندۆڵە هەتا بتوانێ لەوێ تفەنگهاوێژان کۆ بکاتەوە بەڵام هەوڵەکانی سەرنەکەوتوون. لە لایکی ترەوە بارزانییەکان بۆ ئەوەی نەکەونە بۆسەوە

گوندەکانی باشووری چۆمی گادەریان هەتا دەگاتە هنداقی گوندی نەڵۆس بەتەواوەتی چۆڵ کردبوو، هەروەها گوندی دەزگریشیان لە ناو زەویی مەرگەوەڕدا بەجێ هێشتبوو.

لەم هەلەدا باڵەفڕە بەشێوەیەکی ڕێکوپێک خاڵەکانی باشووری شنۆ و بانەکانی قولقوڵە و کانی ڕەش و میراوە و سینگانیان بۆمباباران دەکرد، ئەفسەران و عەریفانی کاروانگەلی باکور و باشوور سوودیان لە هەڵوەستەی ئۆپەراسیۆن وەرگرت و، بۆ ئەوەی لە هەڵمەتی داهاتوودا سەربکەون، سەردەکەوتنە سەر بستووەکان و سەراسۆییبیان دەکرد.

بەداخەوە لە ڕۆژی چواردەی مانگی ئاخەلێوەدا ڕووداوێکی ناهەموار هاتە پێش، یەکێک لەو بارهەڵگرانەی چوار ئۆتۆمۆبێلی بەسەر پشتەوە بوو و گوایە بەناوی یارمەتییەوە دەنێردرێتە فیرقەی چوار، لە وێستگەی «یام»ی ڕێگەی نێوان تەورێز- ورمێ وەرگەڕا و لە ئەنجامدا عەریفی یەکەم عەلی ئیفتیخاری شەهید بوو و سێ کەسیش لە سەربازان بریندار بوون.

سەعات ٨ی بەیانیەی ڕۆژی چواردەی مانگی ئاخەلێوە سەرکردەی فیرقەی چوار هەڵپەتەکانی گەرگل و بەردەزەردی بەسەر کردەوە، پاشان چووە نێرەگی و لە گەڕانەوەیدا بۆ ورمێ ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەی خۆی لەمەڕ ئۆپەراسیۆنەوە بەشێوەی خوارەوە لە ئەفسەرانی ئەرکانی خۆی گەیاند:

دەبێ لە پێنگاوی یەکەمدا چیای ئاق بگیرێ، لەبەر ئەوەی ئەو چیایە دەڕوانێتە سەر هەردوو زارکی دەشتی مەرگەوەڕ و دۆڵی قاسملو و، لە بەری چیای ئاقەوە دەڕوانێتە سەر دۆڵە ناسراوەکانی شێخ دەرەسی و خان دەرەسی، هەروەها ئەم چیایە سەرجەم ڕێگەوبانی بەیەکەوە بەستنی دەشتەبێڵ و مەرگەوەڕی لەبەرچاودایە.

لە پێنگاوی دووەمدا پاش گرتنی چیای ئاق دەبێ بۆ گرتنی گەوەی ناسراو بە«مەندیل پێچ»دا هەنگاو بهاوێژرێ لەبەرئەوەی چیای ناوبراو لە ناوەڕاستی بەرپاڵی چیای ئاق هەڵکەوتووە و ئەگەر نەگیرێ ئەوا لەوێوە سەنگەرە گیراوەکانی چیای ئاق دەکەونە بەر مەترسییەوە.

بەو پێودانگە، بڕیار درا کەتیبەی بەهادر و کەتیبەی ئەسفەهان لە سەنگەرەکانی بەردەزەرد، بگۆڕدرێن و کەتیبەی ئاهەن لە کاروانی نێرەگی بچێتە بەردەزەرد هەتاکو بەهۆی هەردوو فەوجی ناوبراو و ئامێری پشتەوانی و تفەنگهاوێژانی خۆماڵییەوە بتوانرێ بانەکانی ئاق و مەندیل پێچ لە ڕۆژی شازدەیەمدا بگیرێن. لە تاریک و ڕوونی ڕۆژی

شازدەدا هەڵمەتی توندوتۆڵی ئاسمانی دەستی پێ کرد و هەتا سەعات ٥ی پاشنیوەڕۆ درێژەی کێشا. هێزی ئاسمانی پێدا پێدا پاشکۆی بارزانییەکانی دەخستە بەر هەڕەشە و بۆمبابارانەوە.

لە ئەنجامدا، مەلا مستەفا و شێخ ئەحمەد و میرحاج کە لە هەڵمەتی ئاسمانی پەست بووبوون، بەپێناوی شێخ عەبدوڵڵای گەیلانیی مەرگەوەڕی نامەیەکیان بەرەوڕووی سەرکردەی مەرگەوەڕ کردەوە و داوایان کرد کەوا ئێمە ئامادەین هەموو ئەفسەران و تۆپەکان بەدەستەوە بدەین بەمەرجێ دەست لە هەڵمەتی ئاسمانی هەڵبگیرێ و هەروەها هێزی سوپا هەڵمەتی پێشوەچوونی خۆی رابگرێ. لە رووێکی ترەوە ئەفسەرانی هەڵاتووی دەوڵەتی عێراقیش بەهۆی «میرحاج»ەوە داوایان کرد کەوا ئامادەن پەنابەریی ئێران قەبووڵ بکەن و لە ئێران نیشتەجێ ببن.

لە وەڵامی داواکاریی سەرۆکانی بارزانیدا نامە ناردرایەوە کەوا هەتا ئەو دەمەی ئەفسەران و تۆپان و هەڵاتووان بەدەستەوە نەدەن ئەوا بۆردمانی باڵەفرە و پێشوەچوونی سوپا هەر بەردەوام دەبن.

## چۆنیەتیی کردەوەی کاروانی دزێ و کاروانی وەزنێ و خان تاوس

هەروەکو پێشتر شرۆڤەم کردبوو کاروانی دزێ لە ڕۆژی سێیەمی ئاخەلێوەدا گوندی دەربەند و بانەکانی تازاسی داگیر کرد و زەوینەیەکی کاری لەباری بۆ پێشوەچوونی خۆی بەرووکاری سیاواندا بەدەست هێنا و، هەتا دوا دەمی ڕۆژی دوازدەی ئاخەلێوە لەو سەنگەر و برجانەی ئامادەکرابوون شوێنی خۆیان پاراست. لە ڕۆژی سێزدەدا توانییان لە دەوروبەری سەعات دوو و نیوی نیوەڕۆ بەبێ بەیەکدادان گوندی دلێ و هەروەها بانەکانی باکوری ئەوێندەر بگرن و، بپەڕژێنە سەر پتەوکردنی شوێنەکەیان. هەروەها کاروانی وەزنە و خان تاوسیش لە هەمان ڕۆژدا روویان کردە یونسلی و جگە لە پاراستنی شوێنی خۆیان، لەگەڵ کاروانی عەقید مەجیدی و کاروانی دزێدا پێوەندییان کرد و خۆپێشاندانێکیشیان بەرەو باکور لە دژی بارزانییەکان بەئەنجام گەیاند.

کاروانی دزێ بەسەرکردایەتیی عەقید عەلی قولی مزەفەری زەنگنە لە ڕۆژی دواتردا، واتە لە چواردەی ئاخەلێوەشدا درێژەی بەپێشوەچوونی خۆی بەرەو سیاوان دا و ئاواییەکانی نارنار و تازاسی یەک لە دوای یەک بەبێ پێکدادان گرت. ئالیگرانی زێڕۆ و

تەها لە پێش پێشوەچوونی کارواندا، بەرەو بانەکانی سیاوان پاشەکشێیان کرد.

ئەم کاروانە لە ڕۆژی هەژدەدا بەپێی فەرمانی پێدراو جارێکی تر درێژەی بەپێشوەچوونی خۆی بەرەو سیاوان دایەوە و لە سەعات ١٠ی بەیانیدا گەرووی سیاوان و سەعاتێک پاشتر گوندی (سەکان)ی چوار کیلۆمەتر باشووری ئاقبلاغی بەبێ پێکدادان گرت. هەروەها کاروانی دزێ لە سەعات ١١ی هەمان ڕۆژدا خۆی گەیاندە کاروانی عەقید مەجیدی لە سەکان، کاروانی دۆڵی قاسملویش لە هەمان ڕۆژدا گەیشتە (سەنگەر) و بەپێی بڕیاری سەرکردایەتی بیر لەوە کرایەوە سبەی هەر سێ کاروانی پێشوو بەرەو ئاقبلاغ بکەونە ڕێ. هەر ئەم بڕیارەش جێبەجێ کرا و لە سەعات سێی پاشنیوەڕۆی ڕۆژی نۆزدەی ئاخەلێوەدا کاروانگەلی پێشوو گەیشتنە ئاقبلاغ و لەوێ مۆڵ بوون و سەرکەوتنی گرینگیان هێنایە دی.

## کردەوەکانی کاروانی عەقید مەجیدی

ئەرکی دووەمی کاروانی عەقید مەجیدی، هێرشی بانەکانی پادار و گرتنی ئەو چیایە بوو. ئەم کاروانە تەبای هەندێ لە خێلانی خۆلاتی لە ڕۆژی حەوتی ئاخەلێوەدا بەرەو ئامانجی خۆی بزوا و بەنیازی سەراسۆیی و کۆکردنی زانیاری هەندێ لە خێلانی بۆ پێشەوە ڕەوان کرد و بەبێ پێکدادان لەگەڵ دوژمندا گەیشتە چیای ناوبراو، لەبەرئەوەی شەوی بەسەردا هات لە هەمان شوێندا مایەوە.

کاروانی سوپا سبەینەی ڕۆژی هەشتەم بەرەو لوتکەی پادار کەوتە بزووت. ئەم پێشوەچوونە بەهاوکاریی دوو زرێدار یەکێکیان سووک و ئەویتریان مامناوەندی بوو. هەرەوها لێدانی باڵەفڕە و تۆپخانەی ٧٥یی لەگەڵدا بوو و بەتێکۆشینی بێ ڕادەی پیاوان توانرا لوتکەکانی ئەو چیایە «کە لە لایەن سەرکردەی کاروانەوە سەرژمێری کرا بوون» بگرن و، هەتا ئێوارەی ئەو ڕۆژە هەتا کیلۆمەترێکی بمێنێ بۆ لوتکەی پادار بەرەوپێش بچن و، بەهۆی داهاتنی شەو و لە کارکەوتنی یەکێک لە زرێدارەکان، بەشەکان ناچار بوون ڕابووەستن. سەرکردەی کاروان فەرمانی دا کەوا یەکەکان دەسبەجێ باری بەرگری بگرنە خۆ و بۆ هێرشی سبەی ساز و ئامادە بن. هەروەها سەرکردەی ئەم کاروانە بەیاریدەی بێتەل پێوەندیی بەسەرکردەی هەموو کاروان «عەمید بێگلەری» و سەرکردەی هێزەوە کرد و داوای ناردنی زرێداری کرد، ئەوەبوو بەبێ وچان زرێدارە داواکراوەکان خرانە بەردەستی کاروانەوە.

کاریگەریی زەبری ئەم کاروانە کە لە بانەکانی «پیرناسر» و «ئەرەنە»دا لە چەکدارانی وەشاندبوو، بوو بەمایەی سەرهەڵدانی ترس و لەرزێکی بێ ئامان لە ناویاندا. لەبەرئەوەی هێرش هاوکاتی تەواوبوونی فیشەکی ئەوان بوو و لەلایەکی ترەوە دەیانبینی وا کاروان بەورەیەکی باش و پاڵەپەستۆیەکی بێ رادە و هاوکارییەکی تەواوەوە بەرەوپێش مل دەنێ، بەچاوی خۆیشیان بینییان ژمارەی بریندارانیان روو لە زیادبوونە، ئیتر شێخ ئەحمەد ناچار بوو نامەیەکی دوور و درێژ کە پوختەی ناوەڕۆکەکەی ئەمەی خوارەوە بوو بەناونیشانی سەرکردەی هێز نووسی «پێویستە ئەوە بزانرێ کە ئەم کارەی شێخ ئەحمەد پێشەکییەک بوو لە پێناو ئەوەی بۆ دەربازکردنی ماڵ و منداڵیان وچانێک لە دەوڵەت بخوازن»:

«بەهۆی نەمانی بژیوی و مایەی حەوانەوە، من خۆم بڕیارم داوە هەموو سەربازە دیلەکان بدەمەوە و، ئەم سەرئێشەیە لەکۆڵ بکەمەوە، داوا دەکەم یەکێک بنێرن بۆ وەرگرتنەوەی ئەوان ـ ئیمزا: شێخ ئەحمەد».

دوا بەدوای ناردنی ئەو نامەیە تەواوی ئەو دیلانەی (تەنیا ئەفسەران نەبێ) کە لە ئۆپەراسیۆنی نەڵۆس و هەلەجدا کەوتبوونە دەست، هەموویان بەردران.

هەمان کات فەرمان درایە کاروانێکی تر کە پێک هاتبوو لە دەستەیەکی بژاردە لە سەربازانی ئەو سریەیەی لە وەزنە جێگیر بووبوون و، هەروەها هەندێ لە خێڵانی خۆوڵاتی لە ژێر سەرکردەییی ملازم قوربانیدا، بۆ ئەوەی لە بەری وەزنەوە بەرەو بانەکانی پادار هێرش بکەن. ئەم کاروانە لە بناری بانەکاندا بوێرانە بەرەوپێش رۆیشت و سێ بانی یەک لە دوای یەک خستە بن دەستی خۆیەوە. بەڵام لەبەرئەوەی بارزانییەکان بەرگرییەکی گەرمیان لە بەرزاییەکان دەکرد و شوێنەکیشیان لە هەموو رووێکەوە لەبار و سەرکوتکەر بوو، لە ئەنجامی گوللەبارانێکی خەستدا عەریفی سێیەم ئیسماعیل بەیات کە سەر بەکەتیبەی یەکی فەوجی ١٢ی کرماشان بوو هەروەها سەربازێک و شەش تفەنگدار لە پیاوانی قەرەپاپاغ لەو هێرشەدا شەهید بوون. لەبەرئەوەی شوێنەکە لەبار نەبوو فەرمان درا پاشەوپاش بکشێنەوە.

بەرەواژی پێشبینیی بارزانییەکان کە چاوەروان بوون سەر لە سبەینەی رۆژی دەیەم هەڵمەتی هێرشبەران بەرەو لوتکەی چیای پادار دەست پێ بکات، هەڵمەت کتوپڕ لە سەعات ٢ی پاشنیوەڕۆی ئەو رۆژە بەهاوکاریی تۆپخانەی ١٠٥ یی بڵند و کورت و، فڕینی باڵەفڕەوە دەستی پێ کرد. کاروان پێی کرا دوا لوتکەی چیای پادار لە سەعات ٦ و

نیوی دەمەو ئێوارەدا بگرێ. زیانی بارزانییەکان لەو شەڕەدا ١٢ کوژراو و ٨ بریندار بوو، ژمارەیەکیش تفەنگ کەوتنە دەستی کاروان. لە هێزی خۆمانیش تەنیا سەربازێک شەهید کەوت.

کەوتنی پادار و بۆمبابارانی ئاسمانی لە هەموو ناوچەکاندا، بوو بەمایەی لاوازبوونی ورەی بارزانییەکان بەجۆرێ وەک لە پێشەوە ئاماژەمان پێی دا، ویستیان بەڵکو بتوانن دەوڵەت رازی بکەن و وچانێک وەربگرن بۆ چوونەدەر لە زەویی ئێران. بەهەمان بیانگەوە بوو کەوا محەمەد سەدیقی برای مەلا مستەفا کە لە بۆمبابارانی ئاسمانی وەڕس بووبوو، محەمەدئەمین مەرگەوەڕیی نارده لای سەرکردەی هێز و بەڵێنی بەجێ هێنانی ئەمانەی خوارەوەی دا:

(١) هەموو ئەفسەرانی هەڵاتوو بەنهێنی بەدەستەوە بدەن.

(٢) هەموو ئاشوورییەکان بەدەستی سوپاوە بدەن و ناوی ئەو کەسانەیش بدەن کە کۆچیان کردووە.

(٣) هەموو ئەو کەلوپەلانەی هەتا ئێستە لە جۆری تەقەمەنی و چەک بەدەستی بارزانییەکان کەوتوون وەکو خۆی بەدەستەوە بدەن.

(٤) تۆپە ٧٥ییەکان بگەڕێننەوە.

لە بریتیی ئەو بەڵێنانەی سەرەوەدا داوایان کرد:

یەکەم: بۆ ماوەی چل ڕۆژ بژیوی بەخێزانە بارزانییەکان بدرێ،

دووەم: سوپا مۆڵەت بدا بارزانییەکان لە هەرێمی دەشتەبێڵ کۆببنەوە و پاشی چل ڕۆژ لە مێژووی مۆڵەت زەویی ئێران بەجێ بهێڵن،

سێیەم: لە زارکی دۆڵی بێناردا «سەر ڕێگەی ڕۆستەم ئاوا و تووی» لە ناو زەویی مەرگەوەڕدا هەتا چل ڕۆژان مۆڵەت بدرێ بارزانییەکان بنکەیەک بکەنەوە.

وەڵام بەمحەمەد ئەمین مەنگوڕی درایەوە کە بەمحەمەد سەدیق رابگەینێ هەر کاتێ گرینگترین بەڵێنەکانی خۆی هێنایەجێ ئەوا کاری ئەوان جێبەجێ دەکرێ.

یەکەکانی ئەم کاروانە و کەتیبەیەکی رائید زرێپۆش پاش گرتنی پادار، لە بنکە گیراوەکانی گەوەی پادار و بانەکانی پیرناسر و قەڵاتان و ئەرەنە و دەربەندا گیرسانەوە. ئەو کاتە کە ئۆپەراسیۆن لە بانەکانی پادارا بەردەوام بوو و هێشتا هەواڵی کەوتنی

لوتکەی ناوبراو نەگەیشتبووە تاران ، ئەم فەرمانانەی خوارەوە بۆ کردنی پەلەپەلی لە سەرکەوتنی هێزدا، لە لایەنی ئەرکانی سوپاوە بۆ سەرکردەی فیرقەی چوار لێ دران:

«لە چۆنیەتیی ئۆپەراسیۆنی چیای پاداردا ئەوە خوێندرایەوە کە هەموو کاروانگەلی ئێوە بەو جۆرەی چاوەڕوانی دەکرا پالەپەستۆیان نەخستووەتە سەر بارزانییەکان، تەنیا کاروانی پادار نەبێ. لە هەموو بەرەکاندا هەوڵ و پالەپەستۆی کاروانگەل بەتەواوەتی سست و وەستاوە. هەر ئەم دۆخەشە هەلی بەبارزانییەکان داوە هێزی خۆیان لەو خالە بێدەنگانەی چ جار چالاکییان تێدا بەرپا نەبووە بەرەو ئەو شوێنانەی خەریکی چالاکین بگوازنەوە و، هەتا لە ئەنجامدا زیانی پتر و گرفتی گرینگتر بنێنەوە، کەچی پێویستە کاروانگەل بەیەک جار و لە یەک گاڤدا لە سەرتاسەری بەرەکاندا دەست بەهێرشبەری بکەن و لەو شوێنانەشدا کە هێرش ناکرێ پێویستە خۆنوێنی بەئەنجام بدرێ.

بۆ نموونە کاروانی مەرگەوەڕ بەتۆپبارانی تۆپخانە بۆ ئامانجێکی دیاریکراو کە شیمانەی ئەوە هەیە ژمارەیەکی پتری چەکدارانی تیدابێ، مژوولیان بکات و هەلیان پێ نەدا خۆیان کۆ بکەنەوە. لە بەرامبەریشدا ئەو کاروانەی خەریکی ئۆپەراسیۆنە دەست بەکار بکاتەوە. بەهەر جۆرێک بێ، جێبەجێ کردنی ئەم کارە لە پێشوەچوونی کاری ئێوە و گەیشتنتان بەسەرکەوتنی یەکجارەکیدا زۆر کاریگەر دەبێ.»

پاش ئەوەی راپۆرتی گرتنی لوتکەی پادار بەئەرکانی سوپا گەیشت، ڕۆژی پاشتر واتە لە ڕۆژی یازدەی ئاخەلێوەدا فەرمان بەسەرکردەی هێز درا هەتا زووە کاروانگەلی باشوور هەلمەت ببەنە سەر نەلۆس و کاروانگەلی باکور دەست بەپەلاماردانی بانەکانی قولقولە و بەردەزەرد بکەن، هەروەها ئاگەداری هات کەوا چوار زرێدار بەنیازی یارمەتی لە مەلبەندەوە ناردراون و بەراستیش وا لە تەورێزدان.

هەروەها لە ڕۆژی سێزدەی مانگی ئاخەلێوەدا لە ڕێگەی ئەرکانی سوپاوە راستەوخۆ فەرمان بەکاروانی عەقید مەجیدی درا هەتا لە پاراستنی پێگەی خۆیدا زۆر شێلگیر بێ و هەوڵ بدات داوێنی بانەکانی باکوری چیای پادار و ڕۆژئاوای ئەوێ داگیر بکات و، لەبارەی قایمکاری و پاراستنی ئەو شوێنانەوە بایەخ و گرینگییەکی بێ رادە بەکار بێنێ.

بۆ جێبەجێ کردنی ئەو مەبەستە، سەرکردەی کاروان فەرمانی دایە کەتیبەی نەقیب لەشکری هەتا لەگەڵ دوو سریەدا سەعات ٨ی سبەینەی ڕۆژی سێزدە لە بانەکانی پیرناسرەوە بەرەو حەسەن نووران هێرش ببات. نەقیبی ناوبراو لە سەعاتی دیاریکراودا

بەیارمەتیی تۆپخانە و فڕینی باڵەفڕەوە دەستی بەپێشوەچوون کرد و توانیی بەبێ پێکدادان و ئاگرباران بانەکانی پێشوو بگرێ و، ئەو کاتەی کاروانی ناوبراو بەحەسەن نووران گەیشت سەرکردایەتیی هێز «لیوا هومایوونی» و سەرکردەی کاروانگەلی باشوور «عەمید بێگلەری» لەوێ بوون. تەواو لەو کاتەدا زایەڵەی دەسرێژی توندی کەتیبەی رائید حەمیدی کە ئەرکی پێ سپاردرا بوو لە بانی ژمارە دووی چیای پادارەوە خۆی بەلوتکەی بەردەزەرد بگەیەنێ، بەرز بووەوە.

## چۆنیەتیی تێکسرەواندنی کاروانی رائید حەمیدی و بارزانییەکان

کەتیبەی دووی فەوجی «نادری»یش بەوێنەی کەتیبەی نەقیب لەشکری فەرمانی پێ درا کەوا لە سەعات ٨ی سبەینەی ڕۆژی سێزدەیەمی جێژن دەست بەهێرشی خۆی بکات. بەر لە داهاتنی سەعاتی ناوبراو فەرمان بەباڵەفڕە و تۆپخانەی ١٠٥ی و هەروەها تۆپخانەی ٧٥ی درا بۆ ئەوەی بانەکانی پێشوو ئاگرباران بکەن. سریەی ملازمی یەکەم «شیدفەر» کە بۆ چوونەپێش راسپاردرا بوو لە کاتی چوونە پێشەکەیدا لە باڵی راستەوە کەوتە بەر پەلاماری گەرمی چەکداران. بەڵام پاش گەیشتنی زرێدارێک و هەندێ هاوکاری لە مەڵبەندەوە، سریە بۆی لوا بانەکانی بەردەزەرد داگیر بکات. لەو پێکدادانەدا سێ سەرباز شەهید بوون و شەش کەسی تر بریندار بوون. زیانی چەکدارانیش ٦ کوژراو و ٢٠ بریندار بوو. لە ئەنجامی ئەو هێرشەی دواییدا، شوێنەواری شکان و هەڵوەشان لەناو تێکڕای بارزانییەکاندا بەچاو بینرا، بەجۆرێ باڵەفڕەی سەرانسۆکەر بینیبووی لە سەعات ١١ی ئەو ڕۆژە بەپاشەوە کۆچ و جێگۆزی ماڵە بارزانییەکان بۆ ناو دۆڵی گێلاس دەستی پێ کردبوو.

لە ئاقبلاغیش زانیاری گەیشت کەوا بەهۆی پاڵەپەستۆی کاروانگەلی باکورەوە دەمراستی ئاواییەکانی زەرکون، سوورەکان و لۆرکان پەیکێکیان ناردووەتە لای سەرکردەی دۆڵی قاسملو و داوایان کردووە بەخۆیان و ١٧ چەکدار و ٤٠٠ سەر مەروماڵاتیانەوە پاس وەربگرن بۆ ئەوەی بۆ کاری شوانکارەییی خۆیان بچنە ناوچەی کۆکی.

دواجار لە ئەنجامی ئەو لێدانە گورچکبڕەی لە لایەنی کاروانگەلی باکور و باشوور و کاروانی ناردراو لە مەڵبەندەوە، بەتایبەتیش لە بانەکانی پادار و بەردەزەرددا بەچەکدارانی بارزانی کەوت، بارزانییەکان بەخێرایی شنۆ و گوندەکانی سەر بەناوچەی شنۆیان بەتاڵ

کرد و سوارانی مووساخانی زەرزا لە سەعات چواری پاشنیوەڕۆی ڕۆژی چواردەدا چووە ناو شنۆوە. لە بەر ئاواییدا لەگەڵ بارزانییەکاندا تێک گیران و لە سەعات ١٥دا پێکدادانێکی گەرم رووی دا و تفەنگهاوێژانی مووساخان جگە لە گرتنی دوو برێنی سووک لە چەکدارانی بارزانی، تەفروتوناشیان کردن. هەر ئەو کاتەش بەهۆی پیاوانی خێڵان لە کاروانی عەقید غەفاریدا، گوندەکانی سینگان، کانی رەش و خالید ئاوا گیران.

هەواڵی گرتنی ئەو خاڵانە لە لایەن لیوا هومایوونییەوە بەئەرکانی سوپا گەیشت و ئەم فەرمانانەش لە لایەن ئەرکانەوە بەشێوەی خوارەوە دەرچوون:

«ئێستە یەکەکانی ئێوە لە شنۆ نێزیک بوونەتەوە، پێویستە زۆر وریا بن و هێزەکانتان لە بانەکانی پادار، چوار بت و بانەکانی نەلۆسدا چاک خۆیان قایم و مکوم بکەن پاشان بچنە ناو شنۆوە.

پێویستە زانیاریی ورد هەبێ ئاخۆ بارزانییەکان شنۆیان چۆڵ کردووە یان نا؟ لەبەرئەوەی لەوانەیە بەم ڕێگەیە تەڵەیەکیان بۆ یەکەکانی ئێوە نابێتەوە و هەر بەچوونتان بۆ ناو شنۆ هەڵمەتێکی گەورەتان بکەنە سەر. وێڕای ئەمە، پێویستە یەکجارزۆر هۆشیار و وریادار بن.

لە لایەکی ترەوە پێویستە بەهۆی باڵەفڕەوە ئاگەدارییەک لە نێوان تایەفەگەلی بارزانیدا بڵاو بکەنەوە و پێیان بڵێن: (شێخانی ئێوە خراپەیان لەگەڵتاندا کردووە، لەبەرئەوەی دەوڵەتی عێراق بۆ گەڕانەوەی دانیشتوانی بارزان گچکەترین دژبەریی پێشان نەداوە، تەنێ ئەوە نەبێ شێخانی ئێوە بەهۆی مەحکوومییەتی خۆیانەوە ئەم بێ بەختییەیان بەسەر ئێوەدا هێناوە و بەڕژاندنی خوێنی ئێوە و ژن و منداڵتان دەیانەوێ لەو سزایەی لە عێراق چاوەڕوانیانە خۆیان دەرباز بکەن). پێویستە بەهەر جۆرێ بێ بارزانییەکان بۆ چەک دانان و دەست هەڵگرتن لە دژایەتی رابکێشن.»

لەبەرئەوەی هەموو ئەو بەرزاییانەی بەسەر دەشتی شنۆیاندا دەڕوانی نەگیرابوون، بۆیە سەرکردەی فیرقە بۆ بەجێهێنانی ئەو فەرمانانەی لە مەڵبەندەوە هاتبوون، هەروەها بۆ چەسپاندنی هێز و گوڕی یەکەکان لەو بەرزاییانەی بەسەر دەشتەکەیاندا دەڕوانی، بڕیاری دا دەستی بارزانییەکان لە دوا لوتکە بەکۆتا بهێندرێ کە ئەوان لەپێناو بەرگری لەو شوێنەدا بێ رادە بەرگرییان پێشان دەدا. ئەو لوتکەیە بەناوی لوتکەی «گردکەشان»ەوە دەهاتە ناسین و، بەهۆی ١٥٠ مرۆڤی چەکدار بەسەرۆکایەتیی ئەحمەد مەرگەوەڕی

بەرگریی لێ دەکرا. بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە ڕۆژی یازدەی مانگی ئاخەلێوە هەڵمەتێکی باکوری و باشووری بەهۆی کەتیبەی رائید حەمیدی و، هەڵمەتێکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بەهۆی کەتیبەی رائید لەشکری بەهاوکاریی زرێدار و تۆپی ۱۰٥یی کورت و ۷٥ی و هەروەها فرینی باڵەفڕە دەستی پێ کرد و لە بانەکانی بەردەزەردەوە کە شوێنی تۆپخانە بوو بەرەورووی سەنگەرە خۆکرد و دەسکردەکانی بارزانییەکان کە لە لوتکەی گردکەشاندا دایانمەزراندبوو دەستی پێ کرد و لە ئەنجامی پاڵپەستۆی ئەو کاروانگەلەدا ئەحمەد مەرگەوەڕی باری خۆی بەبارێکی پڕ مەترسی زانی و بێ ئەوەی بەرگرییەک لە پێش کارواندا پێشان بدات تەنانەت یەک گوللەش بهاوێ ئەو بانانەی بەجێ هێلا و بەرەو گوندی گردکەشان تێی تەقاند. بەگرتنی ئەو بەرزایییە دەشتی شنۆ سەرتاسەر کەوتە بەر چاوی راستەوخۆی کاروانەوە . خاڵی ناوبراو زیاتر لە ٤ کیلۆمەتر لە شنۆوە بەدوور نییە.

لە لایەن سەرکردەی کاروانەوە دەسبەجێ فەرمان درایە یەکەکانی سوپا بۆ ئەوەی لەو بەرزییانەدا قایمکاری ئامادە بکرێن.

بەهۆی گرتنی بانەکانی گردکەشانەوە، لە سەعات ٥ی پاشنیوەڕۆی پازدەیەمی ئاخەلێوەدا هەندێ لە خێڵانی میریخواز کە لە بن سەرکردایەتیی رائید زرێپۆشدا بوون گەیشتنە ناو شنۆ. لەکاتی پێشوەچوونیان بەناو ئاواییدا بڕێکی گەورە چەک و گوللە و تۆپێکی بێ لوولەیان بەدەست کەوت. بەو ئاوایە و بەئۆپەراسیۆنێکی بچکۆلەی تر ٥٠ ئاواییی تری شنۆ لە بن دەستی چەکدارانی بارزانی دەرهاتن و، بەدیهاتنی بژیوی و پێداویستیی تر بۆ بارزانییەکان زۆر بەتەنگانە کەوت.

## گردەوەی نەڵۆس و چەلەنگییەکانی عەقید عەلی ئەکبەر غەفاری

هەر بەگەیشتنی فەرمانی هێرش کردنە سەر نەڵۆس، سەعات ٦ی سبەینەی ڕۆژی سێزدە کاروانێکی پێکهاتوو لە دوو کەتیبەی پیادە، دەستەیەک هاوەن، دەستەیەک تۆپی ۷٥ و دوو زرێدار و هاوکاریی ئاگری تۆپخانەی ۱۰٥ لە بن سەرکردایەتیی عەقید غەفاریدا، لە سەرگەی خۆیەوە بەرەو نەڵۆس کەوتە بزووتن. هەروەها بڕێک لە خێڵانی مەنگوڕ بەناوی خۆنوێنی و سەرنج بەکێش کردنی بارزانییەکانەوە بەرەوپێش ڕۆیشتن و هەتا سەعات ٩ی چێشتانێ پێشوەچوونی سەرەتایی جێبەجێ کرا و لە سەعات یازدەدا قۆناغی دووەم دەستی پێ کرد.

لە قۆناغی دووەمدا کاروانی پێشوو بەرەورووی بەرگریی دژوار و گورجی بارزانییەکان بووەوە، بەتێکۆشینی بێ رادە و ئاگری تۆپخانەی ١٠٥ و فڕینی باڵەفڕە لە سەعات سێزدەی هەمان ئەو ڕۆژەدا توانیی چەکداران لە بانەکانی نەڵۆس وەدەر بنێ و لوتکەی چیای دۆڵ و بانەکانی ڕۆژئاوای ئەوێ لە هەبوونی بارزانییەکان پاگژ بکاتەوە. هەتا سەعات ١٤ ئاواییەکانی «دەقۆرچی، چراوانە، نەڵۆس، قلوول» لە لایەن کاروانەوە گیران، زیانی خۆمانی لە پێکدادانی پێشوودا ئەوەبوو دوو تفەنگاوێژی خۆلاتی شەهید بوون و دوانیش بریندار بوون.

پاش ئەوەی لە ڕۆژی پازدەیەمدا بانەکانی پادار و گردکەشان بەهۆی کاروانی تەنیشتەوە داگیرکران، دوو سەت کەس لە خێلانی مەنگوڕ لە کاروانی عەقید غەفارییەوە بۆ پتەوکردنی قەڵای سینگان ناردران. عەقید غەفاری خۆیشی بەهێزێکی سوارکارە لە فەوجی لورستان و سێ زرێداری شەڕکەرەوە چووە ناو شنۆوە. بەو شێوەیە بەگەیشتنی ئەو یەکەیە کە یەکەمین کاروانی سوپا بوو بۆ شنۆ، بەشی گرینگ لە ئۆپەراسیۆن بەکۆتا گەیشت و هەتا ڕۆژئاوای پازدەمین، ناوچەی شنۆ بەتەواوەتی لە بارزانییەکان پاگژ کرایەوە.

## کردەوەکانی کاروانی باراندێز لە بن چاوەدێریی عەقید فولادوەندا

کاروانی دۆڵی باراندێز بەڕازانەوەی پێویست و بەو کەسانەی لە بن دەستی خۆیدا بوون، بەسەرکردایەتیی عەقید فولادوەند لە سەعات ١٤ی ڕۆژی هەشتەمی ئاخەلێوەدا توانیی بەهاوکاریی باڵەفڕە بەرەو بانەکانی گەرگل بەڕێ بکەوێ و هەتا سەعات ١٤.٥ ئەو بانانە بەبێ پێکدادان لەگەڵ دوژمندا، بگرێ و لەوێ کۆببێتەوە.

نیو سەعات پاشی نیوەشەوی ئەو ڕۆژە پێکدادانێک لە شوێنە بندەست کراوەکەی کاروانی پێشوودا لەچیای گەرگل، ڕووی دا. لە ئەنجامدا سەربازێک شەهید بوو و ملازم یەکەم تاجفەر و دوو سەرباز بریندار بوون. زیانی بارزانییەکان لەو شالاوە شەوییەدا ٥ کەس بوو، ٣ کوژراویان لەگەڵ خۆیاندا برد و دوو تەرمیشیان لە گۆڕەپاندا بەجێ هێشت.

پاش گرتنی تەواوی بانەکانی گەرگل، کاروانی پێشوو راسپاردرا بانەکانی قولقوڵە و بەردەزەرد داگیر بکات و لەگەڵ کاروانی مەرگەوەڕدا پێوەندی بکاتەوە. کاروانی پێشوو کە سەرکردایەتییەکەی لە ئەستۆی مقەدەم فولادوەندا بوو برێتی بوو لە دوو کەتیبەی

پیادە، سریەیەک هاوەن، دەستەیەک تۆپخانەی ٧٥ و دوو زرێپۆش. لە سەعات ٧ی سبەینەی ڕۆژی سێزدەدا بەرەو ئامانجی خۆی بەرازانەوەی پێویستەوە کەوتە ڕێگە و لە پێنگاوی یەکەمدا کەتیبەی دووەمی بەهادر تەبای فڕینی باڵەفڕەوە هێرشی بردە سەر بانەکانی بەردەزەرد و قولقولە. ئەو پەلامارە کە بەیاریدەی کەتیبەی ئەسفەهان بوو، بەبوێرییەکی بێ رادە و کاری دەستەواییەوە بەئەنجام گەیشت. لەبەرئەوەی ناوچەی کاری ئەو کەتیبانەی پێشوو پڕبوون لە کەندولەند و رەوەزە بەرد و، سەنگەرە سروشتییەکانیش کەوتبوونە بن دەستی چەکدارانەوە و سەربازان بەچەلەنگییەکی شایەن بەسەرنج، پێگەی بارزانییەکانیان یەک لەپاش ئەویتر گرت و بەگەیاندنی زیانی ١١ کوژراو بەئەوان و لێسەندنی دوو تفەنگ توانییان هەتا سەعات ١٤ سەرجەم بان و بانیژەکانی پێشوو بگرن و هەتا سەعات ١٩سەنگەری چاک و لەبار بۆ خۆیان ئامادە بکەن. تێکڕای زیانی بارزانییەکان لە پێکدادانی دواییدا چ لە کاروانگەلی باکور و چ لە باشوور پتر لە ٧٠ کوژراو و ١٥٠ بریندار بوو.

پێشنیوەڕۆی ڕۆژی پازدەی ئاخەلێوە کەتیبەی دووی فەوجی بەهادر بەرەو بانەکانی قەلقەلەی باشووری بەردەزەرد هێرشی برد و لە سەعات ٩دا بەبێ پێکدادان ئەو بانانەی گرت. سەر لە ئێوارەی ڕۆژی پازدەیەم فەرمان بەخێڵانی کاروانی باراندێز درا بەرەو کێوی ئاق ببزوێن. خێڵانی پێشوو بەشەو پاش پێکدادانێکی کورتەبڕ خۆیان بەگۆپکەی ناوبراو گەیاند.

سبەینەی ڕۆژی شازدەی مانگی ئاخەلێوە کەتیبەی دووی ئاهەن بەرەو کێوی ئاق بەپێش کەوت و لە سەعات ٩دا گەیشتە کێوی ئاق و درێژەی بەپێشکەوتنی خۆی دا و هەتا سەعات ١٢ی هەر ئەو ڕۆژە مەندیل پێچیشی گرت بەجۆرێ لە ئۆپەراسیۆنی تایبەت بەکاروانی نیساریدا ئامازەی پێ درا. کاروانی ناوبراو بەگرتنی ئاواییی شیرگان و بانەکانی باشووری ئەوێ، توانیی تێکەڵیی خۆی لەگەڵ کاروانی باراندێزدا گرێ بداتەوە.

پاش گرتنی کێوی ئاق و مەندیل پێچ، دانیشتوانی سەرجەم دێ و میرەدێیەکانی دەوروپشتی دۆڵی قاسملو ئەو هەڵکەوتەیان بەنالەبار کەوتە بەرچاو، لە پێناوی پاراستنی سەر و ماڵی خۆیان هەروەها بۆ داپۆشینی چەوت و چەوێڵیی کاری پێشوویان، بۆ خۆبەدەستەوەدان بەهێزی دەوڵەت ئامادەبوون و سەرۆکانی ئەوان لە کۆکیدا گوێ بەفەرمانیی خۆیان ڕاگەیاند و، پەژیوانیی خۆیان بەوە دەربڕی کە هەندێک تفەنگی برنۆ و

سێ تیر و پێنج تیری رووسییان بەکردەوە دایەوە بەسەرکردەی کاروان.

لە ڕۆژی هەژدەیەمدا، کاروانی باراندیز بەکەتیبەیەک درێژەی بەپێشوەچوونی خۆی بەرەو بانەکانی (تان) دا و هەتا سەعات ١٠ توانیی ئەو بانانە بگرێ. بەو شێوەیە کەتیبەیەک لە بانەکانی تاندا «کە دەڕوانێتە سەر ئاوایی لوورانی ٧ کیلۆمەتری سەرووی ئاقبلاغ» مۆڵ بوو و، کەتیبەیەکی تری کاروان لە هەمان کێوی ئاقدا مایەوە و، بەفەرمانی سەرکردایەتی ڕۆژی نۆزدەیەم بەشێک لە کاروانی باراندیز توانیی گۆپکەی ناسراو بە ٩١٩ کە بەسەر ئاوایی سوورکان و دەشتی مەرگەوەڕیدا دەڕوانی، بگرێ.

ئەو کاتە لە لایەن ئەرکانی سوپاوە لە تاران فەرمان بەسەرکردەی کاروانگەل درا وریابن نەوەکا لە خافڵەتی بەسەریان دابدرێ. بەتایبەتیش عەقید مەجیدی کە لە بانەکانی پاداردا بوو، ئاگەدار کرایەوە کەوا دوور نییە بارزانییەکان لە لای ئاقبلاغ و دۆڵی قاسملووەوە هێرش بهێنن و ئەو کاروانە تووشی مەترسی بکەن، بۆیە پێویستە لەوانیتر زیاتر وریای بارودۆخ بێ. کاروانگەلی تری ڕۆژئاوایش پێویستە ئاگەداربن کە بارزانییەکان بۆ ڕۆیشتنیان بەرەو باکور لە بانە سنوورییەکان کەڵک وەرنەگرن. لە لایەکی ترەوە فەرمان بەسەرکردەی فیرقە درا کەوا ئەڵقەی گەمارۆی بارزانییەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تەنگتر بکەنەوە و لەو کاتەدا کە بارزانییەکان کۆوەبووبوون بەبۆمبابارانی ئاسمانی لە رەگەوە دەریان بێنن.

ئەو ئاگەدارییانەی لەو کاتەدا بەعەقید فەیووزیی سەرۆکی ئەرکانی هێزگەلی کوردستان دەگەیشت پێشانی دەدا کەوا بارزانییەکان لە دۆڵی گێلاسدا کۆبوونەتەوە و تۆپەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بردووە بۆ ئەوەی باڵەفڕە بۆمبابارانیان نەکات. ملازمی یەکەم «حەمید جیهابانی»یشیان کە لە ڕووداوی هەلەجدا بەدیل گیرابوو لەگەڵ خۆیاندا بردووە بەڵام پێنج کەسیان لە ئەفسەرانی دیل داوەتەوە بەسەرگەلەدارانی هێزی میری.

ئەو ڕاپۆرتانە، سەرژمێری هەموو بارزانییەکانیان بەدەوروبەری نۆ هەزار کەس کە دوو هەزاریان چەکداربوون، پێشان دەدا. ڕۆژی نۆزدەیەم ئەرکانی سوپا فەرمانی دا کەوا بۆ سەرکوتینەوەی بارزانییەکان پێویستە زیاتر پەلە بکرێ بەڵام لیوا هومایوونی بەو بیانووەی ئەو ناوچە تایبەتەی لە بن دەستی بارزانییەکاندایە بێ ڕادە کێوەڵان و کەندەڵانە و، پێچ و پەنای زۆر و دۆڵ و نەواڵی پڕ و، شوێنی خۆشاردنەوەی گەلێکە بۆیە خۆی لە پەلەپرووزێ پاراست.

## بەدەستەوەدانی ملازم جیهانبانی و
## دیلەکانی سوپا بە بەرپرسانی ئێرانی

لە ڕۆژی حەڤدەی ئاخەلێوەدا بەیەکدادانی گەرمی نێوان هەردوو لا بەبۆنەی پاشەکشێی بەپەلەی بارزانییەکان و پێشوەچوونی لەسەرەخۆ و بەپارێزەوەی هێزی دەوڵەتی ئێران بەکردەوە وەستابوو. ئەو کاتە کە هێزی ئاسمانی گورجوگۆڵییەکی پتری پێشان دەدا و بارزانییەکان مەبەستیان بوو لەو هەلە و لە وەستانی ئۆپەراسیۆن سوود وەربگرن و لە خاڵە تایبەتەکاندا کۆببنەوە، باڵەفڕە بەگەرمی بۆمبابارانی دەکردن.

تەبای ئەو هێرشە گەرمانەی باڵەفڕە هەتا دەمەو ئێوارەی ڕۆژی نۆزدەی مانگی ئاخەلێوە دەیهێنایە کایە و لەگەڵ بۆمبابارانکردنی بارزانییەکاندا زانیاریی تەواویش لەبارەی ڕەوت و بزاوتیان بەدەست دەکەوت. بەلای ئەرکانی هێزی کوردستانەوە روون بووەوە کەوا نێزیکەی سێسەت مرۆڤی بارزانی پێوەن لە زەویی ئێران دەربچن و لە سنوور دەربازی ئەودیو ببن.

سەعاتێک دواتر، ڕاپۆرت هات کەوا کەسانی سەرگەلەی ئەوان لە بنکەی لۆلان کە مۆڵگەیەکی دەوڵەتی عێراقە بەچاو بینراون. لە لایەکی ترەوە خێڵانی وڵاتپەروەری سنوور ئەو کاتە سەرکردەی هێزیان ئاگەدار کردەوە کەوا بەپێی ئەو زانیارییانەی هاتوونەتە دەست، بارزانییەکان لەگەڵ بەرپرسانی عێراقیدا کەوتوونەتە وتووێژ و بڕیاریان وایە بڕێک لە چەکی خۆیان لە شوێنێکی ترەوە لەگەڵ خۆیاندا ببەنەوە عێراق. لە هەمان کاتدا شێخ ئەحمەدی بارزانی نامەیەکی تری بەشێوەی خوارەوە بۆ سەرکردەی کاروانی مەرگەوەڕ «عەقید نیساری» هەنارد:

«ئێمە ئەفسەرەکانمان دایەوە و تۆپەکانیش وەک بەڵێنمان داوە دەدەینەوە، بەڵام باڵەفڕانی ئێوە بەپێچەوانەی یاسای ناووڵاتان و مرۆڤایەتی و ئایین، هەموو ڕۆژ هێرش دەکەنە سەر خێزان و خێڵان و ئافرەت و منداڵمان و، ئێمە هەموو ڕۆژ لێمان دەکوژرێ. داوا دەکەین باڵەفڕە بۆمبابارانمان نەکەن.»

لە لایەنی سەرکردەی فیرقەوە وەڵام هاتەوە کە هەتا ئەو کاتەی مەلا مستەفای براتان کردەوەی دژانەی لە بەرامبەر هێزگەلی سوپادا دەست پێ نەکردبوو هەموو جۆرە خۆشەویستی و دڵنەوایییەک بۆ خێڵی بارزانی دەکرا، هەروەکو بەردەوامیش دووپاتەمان

کردووه، ئەگەر بهاتایەو چەک و تۆپ و ئەفسەرانی هەلاتووتان بەدەستەوە بدایە ئەوا دوور نەبوو چاوگێڕانەوەیەک بەدۆخی ئێستەی بارزانییەکاندا بکرایە و هەندێک ئالیکاریتان پێ بدرایە بەڵام لە باری ئێستەدا هێرش بەگەرمی بەردەوام دەبێ.

ڕۆژی هەژدەی مانگی ئاخەلێوە سەرکردەی فیرقە راپۆرتی دا بەتاران کەوا تانکیی بەنزینی یەکێک لەو باڵەفڕانەی بۆ ئالیکاریی کاروانی عەقید نیساری راسپاردرا بوو لە کاتی فڕینی لە ناوچەی مەرگەوەڕدا بەهۆی لێدانی چەکدارانەوە کون بووە، ئیتر بێ پشوو بەرەو باڵەفڕگە گەراوەتەوە بەڵام لە ڕێگەدا بەهۆی ئاگرگرتنی باڵەفڕەکەوە، باڵەفڕوان: ملازم یەکەمی ئاسمانی غولام حوسێن نەجمی نەیتوانیوە خۆی دەرباز بکا و شەهید بووە. بەڵام چاوداری باڵەفڕی پێشوو ملازم یەکەم تاهماسبی توانیویەتی بەپەڕەشووت خۆی بەبنکە بگەیەنێتەوە.

پاش گرتنی شنۆ، ئەرکانی سوپا لە ڕێگەی فیرقەی چوارەوە زانیاریی بۆ هات کەوا بارزانییەکان بەرەو دۆڵی گێلاس پاشەکشێیان کردووە و زێڕۆ و تەها هەرکیش لەگەڵ ئەواندا چوونەتە ئەو دۆڵە، بەڵام شابان بەگ ناوێک کە لەگەڵ ئەواندا بووە تەبای هەندێ لە هاوەڵانی، خۆی لە چوونە دۆڵی گێلاس بەپاش داوە و پەنادانی لە سەرکردەی کاروان خواستووە. لەبارەی ئەو ئەفسەر و عەریفانەیش کە لە ماڵی سەید عەبدوڵڵا گەیلانیدا بوون، بارزانییەکان بەڵێنی بەدەستەوەدانی ئەوانیان بەهێزی دەوڵەت دا. لەبەرئەوەی بەرپرسانی سوپا زانیاریی وردیان هەبوو کە ورەی بارزانییەکان یەکجار نالەبارە و نیازیان وایە لە زنجیرە کێوی گەرگلدا کۆببنەوە و بەرەو دۆڵی گادەر بڕۆن. فەرمان بەهێزی ئاسمانی درا بارزانییەکان لە هەر کوێ و بەهەر شێوەیێ ببینێ بەگەرمی بۆمبابارانیان بکەن. بۆ ئەوەی بارزانییەکان بانەکانی ڕۆژئاوا و باکوری شنۆ نەگرن و، ئاوها باڵی چەپی کاروانی عەقید غەفاری نەخەنە بەر مەترسییەوە، فەرمان درا هەرچی زووە هێزی دەوڵەت ئەو بانانە داگیر بکەن.

لەبەرئەوەی دوور نەبوو بارزانییەکان لە دوا هەلدا بەهۆی بێ هیوایی و بێ چارەییی خۆیانەوە دەست بۆ کاری سەرسڕهێن ببەن، دوو کەتیبەی تری پیادە لەگەڵ بطریەیەکی ٧٥ و بێتەلێک لە تارانەوە ناردرانە ئازەربایجان بەڵام دەبێ ئەوە بزاندرێ کە پێش ئەوەی ئەو یەکانە بگەنە تەورێز، لە (میانە) ئاگەدار کرانەوە بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە تاران.

لە ڕۆژی حەڤدەی مانگی ئاخەلێوەدا فەرمانی شوون هەڵگرتنی بارزانییەکان بەهەموو

کـاروانـگەلی ئۆپەراسـیـۆنی مـەرگـەوەڕ و دزێ و بەراندێز درابوو، جـارێکی تر دووپاتە کـرایەوە کـە سـەرکـردەی کـاروان پـتـر سـوود لە یەکـەگـەلی سـوارە وەربگرێ بۆ ئەوەی بارزانییەکان مۆڵەتی هەڵوەستەکردن و پەیداکردنی هێڵی بەرگرییان نەبێ و، لە راستیدا بەوپەڕی بەلەنگازی و ترس و لەرزەوە ئێران بەجێ بهێڵن و لە داهاتوویشدا جارێکی تر بیری وا نەچێتەوە بن کلێشەیان. لەو ئۆپەراسیۆنەدا باڵەفڕەش رۆڵێکی گرینگیان گێڕا و چەکدارانیان لە بن هێنا لەبەرئەوەی بارزانییەکان بەهۆی گیرخواردنیان بەدەستی ژن و منداڵەوە زۆر لەسەرەخۆ دەکشانەوە و لە ئەنجامیشدا دەبوون بەئامانجێکی یەکجار خۆش بۆ باڵەفڕە.

لە رووی گرتنی خاڵی گرینگەوە فەوجی سوارەی فەوزیە واتە کاروانی مەرگەوەڕ توانیی هەتا دوو سـەعـاتی پاشنیـوەڕۆی حـەڤـدەی ئاخـەلێـوە خـۆی بگەیەنێـتـە زێوە و تیـایدا بگیرسێتەوە. لەوێ لە کارونی عەقید نیسـاری کەتیبەیەک لە یەکەگەلی ئەسفەهان و سریەیەک لە فـەوجی ئازەرپاد لەگەڵ دوو زرێپۆشدا، لە زێوە مـانەوە. هەروەها ئاوایی و بانەکانی هەلەج بەهۆی تفـەنگهـاوێژانی رەشید بەگەوە گیـران و کـەتیـبەی ٦ی فـەوجی ئازەرپادیش گـەیشـتـە حەوت ئاوا. کـەتیبـەی ئەسـفـەهانیش لە نێـرەگی سـەنگلایەوە و کەتیبـەیەک لە فەوجی ٤ی کوردسـتـان وێڕای سریەیەکی پیـادە لە کەتیـبەی ئازەرپاد لە سیلوانا کـۆجێ بوو. کـەتیـبـەیەک لە فـەوجی ئاهەن لەگـەڵ دەسـتـەیەک هاوەن «ی سـەر بەکـاروانی بەراندێز»یش لە بانەکـانی مـەندیل پێچ و کـێـوی ئاقدا گـیـرسـانەوە، هەروەها کـەتیبـەی بەهادر و دەسـتـەیەک هاوەن و کـەتیـبـەیەکی تۆپخـانەیش لە هەمـان کـارواندا بانەکانی بەردەزەردیان کۆنترۆڵ کرد.

لە کاروانگەلی باشوور کەتیبەی رائید مساوات و کەتیبەی رائید یەمینی لە بانەکانی دۆڵ، کـەتیـبـەی رائیـد زەرپۆش لە شنۆ، کـەتیـبـەی سـوارەی لورسـتـانیش لە نەڵۆس گیرسـانەوە. بەهەمـان شێـوەی، لە پێشەوە گوترا بارزانییەکان ١٨ کـەسی نایب زابت و عـەریف و ئەفسـەرانی تر کـە لە دیلەتیـدا بوون ـ جگە لە مـلازم ٢ی سـوارە حـەمـیـد جیـهـانبـانی، هەمـوویان لە رێگەی سـەید عـەبدوڵڵای گـەیلانیـیـەوە دایەوە بەبەرپرسـانی سوپا.

کـاروانی دۆڵی قـاسـملو و کـاروانی دزێ و کـاروانی پاداریش نیـوەڕۆی رۆژی پازدەی ئاخەلێوە لە ئاقبلاغدا یەکتریان گرتەوە. چەکداران بەهۆی پێشوەچوونی خێرای یەکەکانی

ئەم کاروانەوە نێزیکەی دوو برێنی گران و دە برێنی سووک و پازدە برێنی ئەڵمانی و ئەسپابی تریان بەجێ هێشتبوو و، کەوتنە بەر دەستی هێزگەلی میری.

ڕۆژی بیست و یەکی ئاخەلیوە فەرمانی گشتیی نوێ لە ئەرکانی سوپاوە گەیشتە کاروانگەلی ئۆپەراسیۆن. ئەرکانی سوپا لەو فەرمانەیدا بەسەرکردەی فیرقەی ڕاگەیاند کەوا ئێستە کاروانگەلی سوپا گەیشتوونەتە شنۆ و هەموو کاروانەکان بەپانی یەکتریان گرتووەتەوە، پێویستە هەموو پێکەوە بەرەو سنوور ببزوێن و سەیر بکەن ئەگەر تیپەکانی بارزانی بیانەوێ لە پێش هێزی دەوڵەتدا بوەستنەوە ئەوا بەیاریدەی یەکەگەلی تۆپخانە و سوارە و زرێدار و پیادە بەرگریی ئەوان تێک و پێک بدەن. بۆ ئەم کردەوەیە لە هێزی ئاسمانییش سوودێکی پتر وەربگیرێ و بەپێچەوانەی دۆخی ئێستە کە تێکەڵاویی هێزی دەوڵەت و بارزانییەکان پساوە و، ئاشکرا نییە ئەوان لە کوێن و ئاخۆ چوونەتە عێراق یان نا؟ پێویستە هەتا زووە لە ڕێبازگەی جووڵان و نیاز و ژمارەیان زانیاریی پێویست وەربگیرێ، بزانرێ چوونەتە کوێ و چییان نیازە. بەتایبەتیش پێویستە ئەوە بزانرێ ئێستە بارزانییەکان لە ناوچەیەکدا گیرساونەتەوە درێژی و پانییەکەی لە ٣٠ کیلۆمەتر تێ ناپەڕێ و پێویستە یەکەکان بەرازانەوەی قووڵ و چاوەدێرییەکی پترەوە بەرەوپیش برۆن.

سەرکردەی فیرقە ڕۆژی بیستەمی مانگی ئاخەلیوە لە وەڵامی فەرمانگەلی ئەرکانی سوپادا ئەو ئاگەدارییانەی لە ڕێگەی پیاوانی خێڵانی نیشتمانپەروەر و ئەفسەرانی ئازادکراوەوە بەدەستی هێنابوو خستە بەردەمی ئەرکانی سوپا و ڕاپۆرتی دا کەوا «مەلا مستەفا بەخۆی و ٤٠٠ مرۆڤی خێڵەکیی بژاردەوە لە بانەکانی «مەرگ زیارەت»دایە، هەتا ئێستە بەرەو سنوور نەڕۆیشتووە و ئەرکی ئەوەی هەیە هەتا کاروانی خاووخێزانی بارزانییان لە سنوور دەرباز دەبن، ئەو هەر لە بانەکانی پێشوودا بمێنێ.

ملازم دووەمی سوارە جیهانبانی کە دەمەو ئێوارەی ڕۆژی بیستەم لە ڕێگەی سەید کەمالەوە درایەوە بەکاروانی مەرگەوەڕ، وا باس دەکات «بارزانییەکان ٣٥٠٠ تفەنگی برنۆ و ٢٠٠ تفەنگی ئینگلیزییان هەیە، لەمانە ٢٥٠٠ تفەنگیان بەدەستی بارزانییەکان خۆیانەوەیە. سەرەڕای ئەمە هەر ٣٠ کەسیش تەماتیکێکیان هەیە. برێنی سووکیشیان لە دەوروبەری ٤٠ و برێنی گرانیان ١٧ دانە هەیە، هەر سێ کەسیش نارنجۆکێکی دەستییان هەیە و هەمووی بەسەر یەکەوە ٧٠٠ نارنجۆک دەکات. هەر مرۆڤێکیش لە تفەنگدارانی بارزانی نێزیکەی ١٠٠ گوللەی هەیە، جگە لەمە دوو شانەیش گوللەی کونکەرەیان هەیە.

تەقەمەنیی تۆپەکانیان زۆر کەمە و بەلای زۆرەوە هەر تۆپەی بیست گوللە پتری نییە. لە رووی بژیوییەوەش زۆر لە تەنگانەدان و حەفتەیەک زیاترە گەنمیان بۆ نان نییە.

ورەی بارزانییەکان لە ئەنجامی زیانی زۆر و زەوەندیان باش نییە، بەتایبەتیش زۆر لە باڵەفڕە دەترسن. لە لایەکی ترەوە بەفر و سەرماوسۆڵە زەبری گەورەیان پێ گەیاندوون بەتایبەتیش بەشی هەرە زۆری ماڵات و وڵساتی ئەوان لە سەرینیی سەرماوە لەنێو چووە.

ئەفسەرانی هەڵاتوو لەناو بارزانییەکاندا ئەمانەن: تەفرشیان، رەئیس دانا، ئیحسانی، زێڕبەخت، تەوەکولی و، ئەرتێش یار، بەگشتی لە هەڵاتنی خۆیان پەژیوانن بەتایبەتیش رەئیس دانا لە هەموویان زیاتر لە کردەوەی خۆی پەژیوانە.»

لە بارەی رووداوی باڵەفڕەکەوە، ئەفسەری ناوبراو گوتی باڵەفڕەی ملازم یەکەمی ئاسمانی «نەجمی» لە ناوچەی ناسراو بە«قەڵاسنگی» کە بەسەر چۆمی گادەردا دەڕوانێ، دەستەیەک لە چەکداران خۆیان لەوێ وەشاردبوو و تەقەیان لە باڵەفڕەکە کردبوو، ئەو باڵەفڕەیە زیانی پێ گەیشتبوو و لە ئەنجامدا ئاگری تێ بەربووبوو و لەنێو چووبوو. هەروەها ملازم یەکەم جیهانبانی لە لایەنی شێخ ئەحمەدەوە نامەیەکی بەشێوەی خوارەوە بۆ سەرکردەی فیرقە هێنابوو:

«بەڕێز لیوا هومایوونی:

دوای سڵاو

لەبارەی ئەو بۆندژییەی لە نێوانی ئێمە و حکوومەتی ئێراندا هاتە کایە، پێویستە بڵێم سەرهەڵدانی ئەو بۆندژییە سەبارەت بەوە بوو کە هێزگەلی ئێران و خێڵانی ئێوە لە سینگان پەلاماری ئێمەیان دا، لە لایەنی ئێمەوە هیچ هێرشێک نەکرابوو بەڵام ناچاربووین بەرتەکی خێڵان بدەینەوە و بیانشکێنین.

لەبارەی تۆپەکانەوە ، ئێوە لە شنۆ تۆپێکتان بەهەموو کەرەستەوە کەوتەوە بەردەست. تۆپێکی تر لە زەویی ئێراندا ماوەتەوە بەهۆی شێخ عەبدلڵاوە سۆراغی بکەن و بیدۆزنەوە و بیبەنەوە. لەبەرئەوەی ئێمە دەوارمان پێ نەبوو رایبکێشێ بۆیە نەمانبرد.

باڵەفڕەکانی ئێوە هەموو ڕۆژ زیانی گیانیی نێزیکەی ٢٠ ئافرەت و زارۆکمان لێ دەدەن. لەبارەی دیلەکانەوە هەموو ئەفسەران و دیلەکانمان داوەتە لای شێخ عەبدوڵڵا و «جیهانبانی»مان داوەتە دەستی سەید کەمال.

لەبارەی تەبایی و پاراستنی پێوەندیی باش لەگەڵ دەوڵەتی ئێراندا، ئێمە زۆر تێ کۆشاین بەتایبەتیش لەم بارەیەوە: قازی محەمەد، مەحموود ئاغای دێبوکری، مام عەزیز و محەمەد سەعید هەرکی شایەدی ئێمەن، بەڵام بەهاندانی هەندێک لە خێڵان ئەم گۆنگەرە بەرپابوو.

ئاواتەخوازم ئەم ناتەباییە لەنێواندا هەڵستێ، بەرژەوەندییش لەوەدایە هەردوو لا بۆ ئەمە تێ بکۆشن. لەبارەی تەقەکردنی باڵەفڕان لە ئافرەت و منداڵانی ئێمە، ئەمە دژی مرۆڤایەتی و یاسای ناوولاتانە، دەستی لێ هەڵگرن.

ئیمزا: شێخ ئەحمەد.»

نامەی پێشوو وا وەڵامی درایەوە: لەبەرئەوەی هەتا ئێستە ئەوەی گوتووتانە نەتانهێناوەتە دی، بۆیە هەتا ئەو دەمەی ئەفسەرانی هەڵاتوو بەدەستەوە نەدەن هیچ کارێکی لەبار، لەبارەی ئێوەوە نایەتە کردن، بەتایبەتیش کە ئێستە بەشێکی ماڵات و منداڵ و ئافرەتی خۆتان رەوانەی عێراق کردووەتەوە.

لە ڕۆژی نۆزدەی ئاخەلێوەدا سەرکردەی فیرقە راپۆرتی دا کەوا بەگوێرەی دوا زانیارییەکی بەدەست هاتوو، دەوڵەتی عێراق رێکەوتنێکی لەگەڵ شێخ ئەحمەدی بارزانیدا گرێ داوە و بەپێناوی سێ پۆلیس (جەندرمە)ی عێراقی نامەیەکی دڵنیاییدەری بۆ شێخ ئەحمەد ناردووە. بەو پێیە شێخ ئەحمەد و پێڕەوکارانی ئەو لە هەموو رووێکەوە پارێزراو دەبن و بۆیان دەشێ بچنەوە ناو زەویی عێراق. تەنانەت بۆ رێگەخۆشکردن بۆ پەڕینەوەی ئەوان بۆ ئەودیوی سنوور و دەربازبوون لە چۆمی گادەردا، عێراقییەکان بڕێک دار و تەختەیان داونەتێ بۆ ئەوەی پردێک لەسەر ئەو چۆمەدا دابنێن و، هەتا زووە بگەنەوە ناو ئاخی عێراق. لەبارەی چەکیشەوە هەندێک نەرمییان لەگەڵدا نواندوون و مۆڵەتیان پێ داون سەرۆک خێڵان و خزمان و دەست و پێوەندانی شێخ ئەحمەد بەچەکداری بمێنن، پاشماوەی چەکەکانیش بەبەرپرسانی عێراقی بدەنەوە.

## پاشماوەی کردەوەی کاروانی باشووریی عەقید مەجیدی

پاش ئەوەی کاروانی عەقید مەجیدی سەعات ١٣ی ڕۆژی نۆزدەی ئاخەلێوە گەیشتە ئاقبلاغ، ماوەی سێ ڕۆژان بەهۆی بارینی بەفر و بارانەوە لەوێ گیربوون. دواجار فەرمان درا، یەکەگەل هەتا زووە بەرەو سنوور بکەونە رێگە. بۆیە لە مێژووی بیست و دووەمدا

٦٠ مرۆڤی خێڵان کە لەگەڵ کارواندا بوون فەرمانیان پێ درا بەرەو دۆڵی گێلاس بڕۆن. ئەو خێڵانە لە دۆڵی گێلاس و گوندی گێلاس خۆیشیدا کەوتنە سەراسۆییی پێویست بەڵام شوێنەوارێک لە چەکداران بەدیار نەکەوت.

هەروەها لە گوندی ناوبراودا ٣٨ شانە فیشەکی برێن و ٣ هەگبە فیشەکی تر و لوولەیەکی سپێری برێنی سووک بەدەست کەوتن. هەروەها لە بەرزاییی ڕۆژئاوای چیای «کورکو»دا تۆپێکی ٧٥ییان بەدەست هێنا. «تۆپی ناوبراو هەمان ئەو تۆپە بوو شێخ ئەحمەد لە نامەکەیدا ئاماژەی پێ دابوو».

لە ڕۆژی بیست و سێدا کاروانی پێشوو لە ئاقبلاغەوە بەرەو بانەکانی باکور بزوا و ئەوێی گرت. خێڵانی ناوبراویش هەتا ڕاستی بانەکانی چیای (کورکو) چوونە پێش. هەرچەندە کاروانی ناوبراو لە ڕووی پاڵپشتییەوە لە تەنگانەدا بوو و، وێڕای هەموو ئەو تەنگوچەڵەمانە و ئەو مەترسییانەی لە ڕێگەشدا بوون بەڵام بەردەوام پاشکۆی بارزانییەکانی دەخستە بەر مەترسییەوە، بەجۆرێ بارزانییەکان بەوپەڕی بێ سەرەودەری و تەواوی شپرزەییەوە ناچاربوون بەرەو سنوور بڕۆن.

بەهۆی ئەو پێوەچوونەی ئەرکانی سوپا لەبارەی بزووتنەوەی کاروانگەلەوە بەرەو سنوور کردی، لە ڕۆژی بیست و چواردا فەرمانی بەکاروانی پێشوو دا هەتا دەسبەجێ بەرەو سنوور بجووڵێ. ئەم کاروانە هەتا سێ سەعاتی پاشنیوەڕۆی ڕۆژی بیست و چوار توانیی بەرزاییە گرینگەکان بگرێ بەڵام بەپێی ڕاپۆرتی کارادارانی ئەم کاروانە هیچ شوێنەوارێکی چەکداران لە بانەکانی پێشوودا نەدۆزرایەوە و، دەرکەوت بارزانییەکان لە دەورپشتی چیای «گەرگەر»دان.

## زانیاری و فەرمانەکانی ئەرکانی سوپا و کارەکانی هێزگەلی کوردستان

بەو جۆرەی دەستهاوێژی فیرقەی چواری هێزگەلی کوردستان پێشانی دەدا، لە سەعات ٦ی بەیانیەی ڕۆژی بیست و دووی ئاخەلێوەدا ١٥٠ کەس لە خێڵانی زەرزا و مامەش و مەنگوڕ بۆ بەگژداچوون و لێدانی بارزانییەکان کە لە دۆڵی «تاڵجار»دا کۆبووبوونەوە، ڕەوانە کران. ئەم هێزە لەگەڵ پاشەبەرەی هێزی بارزانییەکان لە بانی تاڵجاردا بەگژ یەکتردا چوون و، تێکسرەواندن لە نێوانی هەردوو لادا هاتە کایە. ئەو تێکسرەواندنە هەتا سەعات دوو و نیوی پاشنیوەڕۆ درێژەی دایێ و لە ئەنجامدا ٣ کەس لە چەکداران کوژران

و هەر هەمووشیان لە تالّجارەوە بەرەو سنوور ڕۆیشتن.

راسپێری تەها هەرکیش، هەر هەمان ڕۆژ هاتە لای سەرکردەی کاروان «عەقید نیساری» و داوای پەنادانی کرد. ئەمجارەش وەڵامی ناوبراو بەوە درایەوە کەوا ئەگەربێو دەمودەست خۆی و خزمانی بێن و خۆیان بەدەستەوە بدەن ئەوا پارێزراو دەبن، هەروەها لەبارەی بارودۆخی بارزانییەکانەوە تۆژینەوەیەک لەگەڵ راسپێرییەکەی تەها هەرکیدا کرا. ناوبراو گوتی بارزانییەکان پێوەندییان لەگەڵ عێراقییەکاندا بەستووە و ئەسپابی دانانی پردێکیان لەسەر چۆمی گادەر لێ وەرگرتوون و بڕیارە هەتا ئێوارەی ئەمڕۆ کەلوپەلی خۆیان دەربازی ئەولا بکەن. ئەو دەیگوت ورەی بارزانییەکان هەتا بڵێی بەزیوە و بژیویشیان نییە، کەلوپەلی گرانی خۆیان بەجێ هێشتووە و بەرەوپاش دەڕۆنەوە.

دەمەوئێوارەی ڕۆژی بیست و دووی ئاخەلێوە سەرکردەی فیرقە بەبێتەل پێوەندیی بەبنکەی عێراقی لە خرێنە کرد. سەرکردەی هێزی عێراقی دووپاتەی کردەوە کە محەمەد ئاغای مەرگەوەڕی بۆ ناوبژی و پەناخواستن هاتووەتە بنکەی خرێنە و سبەیش ماڵ و منداڵەکەی لە رووبار دەپەڕنەوە و دێنە ناو سنووری عێراق. زانیاریی تریش پێشانیان دەدا کە مەلا مستەفا بەژمارەیەکی گەورە لە ئالیکارانی خۆیەوە رووی لە بانەکانی «مەرگ» کردووە هەتا لەوێوە سنوور ببڕێ و بچێتە بارزان.

ڕۆژی بیست و چواری مانگی ئاخەلێوە، دوا کەسانی بارزانی لە پردی گادەر پەڕینەوە بەڵام ئەو دەمەی لە بارەی پەڕینەوەی بارزانییەکان بەبێتەل پرسیار لە بنکە عێراقییەکە کرا، عێراقییەکان وەڵامێکی رەوانیان نەدایەوە. هەروەها لەبەئەوەی ئەو ڕۆژە لە سۆنگەی تەپوتۆزەوە باڵەفڕە نەیتوانی بفڕێ، بۆیە زانیارییەکی تر نەهاتە دەست.

ئەرکانی سوپا لە ڕۆژی بیست و دووی ئاخەلێوە بەپاشەوە چەند فەرمانێکی جیاجیای بۆ سەرکردەی فیرقەی کوردستان هەنارد. ناوەڕۆکی ئەو فەرمانانەی ئەرکانی سوپا ئەم بابەتانەی ژێرەوە بوون:

«بۆچی کاروانگەلی ئێوە بەرەو سنوور نەچوونەتە پێش؟ لەبەرئەوەی هەتا ئەو دەمەی کاروانگەل بەرەو سنوور نەڕۆن سەرئێشەی بارزانییەکان بەکۆتا نایەت. هەتا ئێستە ئەرکانی سوپا نازانێ بیانووی بەرەوپێش نەچوونی کاروانگەل چییە و، چییە هۆی ئەوەی بەشەکانی ئێوە چوار ڕۆژە راوەستاون؟ پێویستە، بەتایبەتیش لە کاتی ئێستەدا کە بارزانییەکان بژیوییان نییە هەتا زووە کاریان لە کار بترازێنن. لەبەرئەوەی مانەوەی بەم

شێوەیەیان لە نێزیکی سنووردا بێ رادە مایەی شەرمە و، زەبرێکی لە ئابڕووی سوپای ئێران داوە. بۆیە بڕیاری بەپەلە وەربگرن و هێزگەلی خۆتان بەرازانەوەی تەواو و پێویستەوە بەرەو سنوور بنێرن. لە رووێکی ترەوە هێشتا روون نەبووەتەوە ئایە بارزانییەکان چوونەتە ناو زەویی عێراق یان نا؟ ئەگەر هەندێکیان رۆیشتوون ئەوا چەند مرۆڤی تریان لە ناو زەویی ئێراندا ماون. ئایە زێڕۆ و محەمەد مەرگەوەڕی و هەرکیش چوونەتە عێراق یان نا؟»

سەرکردەی فیرقە لە ڕۆژی بیست و سێیەمی ئاخەلێوەدا وەڵامی دایەوە کە:

شێخ ئەحمەد لەگەڵ برێک لە بارزانییەکاندا چووەتە ناو زەویی عێراق و بەشێکی تر لە بارزانییەکان نێزیکی پردێک وەستاون کە بەدرێژیی ٦ مەتر و پانیی ٣ مەتر لەسەر رووبار دامەزراوە. محەمەد ئاغای مەرگەوەڕییش لەگەڵ خێزانەکەیدا چوونەتە عێراق. زێڕۆ بەهادوری و تەها هەرکی لەگەڵ مەلا مستەفا و ٣٠٠ مرۆڤی تر لە لایەنگرانی بژاردەی خۆیان هێشتا نەچوونەتە عێراق. هەروەها بەپێی ئەو پلانەی داندراوە هەتا پێنج ڕۆژی تر هەموو کاروانەکان دەوروبەری سنوور بەجۆرێک پاگژ دەکەنەوە کەوا هیچ یەکێک لە بارزانییەکان نەتوانن لەناو زەویی ئێراندا بمێنن.

شێوەی خۆبەدەستەوەدانی بارزانییەکانیش بەکاردارانی عێراقی وا بووە سەرەتا بارزانییەکان چەکی خۆیان داوەتە بەرپرسانی عێراق و پاشان چوونەتە ناو زەویی عێراق. شێخ ئەحمەد خۆی چووەتە خرێنە و، دیمانەی عەمید حیجازیی سەرکردەی هێزی عێراقیی کردووە.

لە ئەنجامی دووپاتەی یەک لە دوای یەکی ئەرکانی سوپادا، ڕۆژی بیست و سێی مانگ سەرەڕای ئەوەی ناوچەی کردەوەی کاروانگەل هەتا ئەوپەڕی رادە دژوار و بەفرگرتوو بوو بەڵام هەندێ کاروانی سەر بەفیرقەی کوردستان بەشێوەی خوارەوە بەرەو سنوور رەوانە کران.

کاروانی مەرگەوەڕ کە پێک هاتبوو لە کەتیبەی دووی ئازەرپاد و دەستەیەک هاوەن، بانە گرینگەکانی باشووری گوندی تووی داگیر کرد و پاشماوەی کاروان «فەوجی سوارەی فەوزیە، کەتیبەی ٧٥ و ئەوانیتر» لە زێوە مانەوە. تفەنگدارانی رەشید بەگ، بانی مەرگ زیارەت و بەزسینایان بەشەڕ لە هێزی پشتەبەرەی بارزانییەکان گرت و برێنێکی سووکیشیان کەوتە دەست. خێڵانی مەرگەوەڕیش بانەکانی باشووری چرگ ئاوایان

داگیرکرد. هەروەها فەرمان بەکاروانگەلی عەقید نیساری درا بۆ ئەوەی بەرەوپێش مل بنێ. هەرچەندە بەو شێوەیەی عەقیدی ناوبراو زانیاریی دەدا باهۆز و باران و کەرەسیسەی بەفر بوو، بەڵام سەرەڕای ئەمەش هێزگەل هەر بەرەوپێش تەکانیان دا. کاروانی عەقید فولادوەندیش خاڵێکی گرینگی گرت کە بایەخێکی سوپاییی هەبوو، هەروەها کاروانی عەقید مەجیدییش ئەو بانانەی گرت کە بۆ دەسەڵات شکان بەسەر بارزانییەکاندا پێویست بوون.

لە ناوەڕۆکی راپۆرتی سەرکردەی فیرقە لە بارەی ئۆپەراسیۆنی کاروانگەلەوە، ئەرکانی سوپا هەستی کرد هێزگەل بەو شێوەیەی شایەنە بەشوونهەڵگرتنی چەکدارانەوە خەریک نین بۆیە بروسکەیەکی تری بەنیازی سەرکۆنە و گلەیی بۆ هێزگەلی کوردستان لێ دا. ئەرکانی سوپا لەو بروسکەیەدا پرسیاری کرد:

«لە پێنگاوی یەکەمدا ئۆپەراسیۆنی هێزگەلی کوردستان بەوپەڕی تواناوە ملی رێگەی پێشوەچوونی گرتبووە بەر و، پێی کرا بەتەواوی بوێری و نەترسییەوە چەکداران بتۆقێنێ و تەنانەت زیانی گیانیشیان پێ بگەینێ، بەڵام ئەمڕۆ وا ١٠ رۆژە ئۆپەراسیۆنی هێزگەل بەجارێک لە شوێنی خۆیدا وەستاوە، تەنانەت دەشێ بڵێین بەدوایشیاندا نەکەوتوون و لێیان دابڕاون، هەتا لە ئەنجامدا چەکداران کە تەواو بێ حاڵ بووبوون و گەلێک برینداریان هەبوو و هەلومەرجیان نالەبار بوو توانییان بەدڵێکی نیاوە لەسەر سنوور بوەستن و لەگەڵ وڵاتانی دەوروپشتدا بکەونە وتووێژەوە.

ئەم پێشهات و ئەم جۆرە شێوە کارە بەهیچ رووەتێک بۆ سوپا ناشێ. چاوەڕوانی و هەڵوەستەی فیرقە لە پێناوی چیدایە؟ کاروانگەلی ئۆپەراسیۆن دەبێ بێ هیچ گیربوون و دۆشدامانێک سەرتاسەری ناوچە هەتا بەهێڵی سنووردا دەگات بپشکنێ و، هەتا چەکداران نەگرێ یا لە بنیان نەهێنێ وچان نەدا، ئەگینا رۆنیشتن لە سەری چیایان و سەیرکردنی بارودۆخی ئەوان و راپۆرت ناردن لەبارەی شێوەی کاری ئەوانەوە بەکاری چی دێت؟ درێژەکێشانی ئەم دۆخە هەموو رەنج و ماندووبوونێکی ئەو ماوەیە بەفیڕۆ و بەبا دەدات. پاش ئەوە دەبێ، بێ لە دەستدانی کات بکەونە سەرلەدوونانی ئەوان و ئیتر بەو ئاوایە کات بەفیڕۆ مەدەن.»

سەرکردەی فیرقەی چوار پاش گەیشتنی ئەو بروسکەیەی ئەرکانی سوپا، ئەو گرفتانەی بەرۆکی ئەویان گرتبوو لەم وەڵامەی ژێرەوەدا خستە بەردەمی ئەرکان:

«بیانووی بنەڕەتی لە پێشوەنەچوونی بەپەلەی کاروانگەلدا بارودۆخی کەش بووە. ئەو کرێوە توند و بەفرە ئەستوورەی لەم چەند ڕۆژەدا باریوە بووەتە کۆسپ لە پێش ئەوەی کاروانگەل بەرەوپێش برۆن. وێڕای ئەمە بارزانییەکان سەرجەم بەرپاڵ و دۆڵەکانیان بەچەکدارە بژاردەکانی خۆیان گرتووە. بۆیە دەربازبوون لەو شوێنانەدا بێ گیروگرفت نابێ و ناشێ کاروانگەل بەبێ مسۆگەرکاری بەرەوپێش بنێردرێن. سەرەڕای ئەمەش، هێز لە کاری خۆیدا شێلگیر بووە و بەبۆمبابارانی ئاسمانی زیانی زەوەندی لێیان داوە و کاروانگەلیش گرووپی بژاردەی داناوە و، بۆ سەرلەدوونانی ئەوانی ناردووە. هەروەها کاروانی عەقید غەفارییش لە ڕۆژی بیست و شەشەمەوە گەیشتووەتە تاڵجارِ و سبەی بەرەو سنوور دەکەوێتە خۆ.

گرووپێک لە کاروانی عەقید نیساری گەیشتوونەتە ملەی بەزسینا و سبەینێ بەرەو سنوور دەرۆن. هەروەها چەککردنی ناوچەی دەشتەبێڵ، مەرگەوەڕ، شنۆ، دۆڵی قاسملو و دۆڵ لە ڕێکەوتی بیست و شەشەوە دەستی پێ کردووە و کاروانگەل خەریکی ئەم کارە بوونە. لە لایەکی ترەوە شێخ ئەحمەد و شێخ سدیق و محەمەد ئاغای مەرگەوەڕی لەگەڵ ماڵ و منداڵیان خۆیان بەدەستی عێراق داوەتەوە بەڵام مەلا مستەفا لەگەڵ ئالیگرانی خۆیدا هێشتا خۆی بەدەستەوە نەداوە و بەگوێرەی ئەو زانیارییەی هەیە لە بانەکانی «کێلەشین»ی سەر سنووری عێراقدا بەسەری دەبات.

ڕۆژی پاشتر، واتە لە ڕۆژی بیست و حەوتی ئاخەلێوەدا ئەرکانی سوپا فەرمانی دا بۆ ئەوەی فیرقە زانیاریی ورد لە بارەی مەلا مستەفا و زێڕۆ و تەهاوە بەدەست بێنێ و شوێنیان بدۆزێتەوە، لەبەرئەوەی رادیۆی تورکیا لە دوا پرۆگرامی شەوی پێشوویدا گۆتبووی مەلا مستەفای بارزان بریندار بووە و چووەتەوە ناو خاکی عێراق. بەڵام ئەم بابەتە راست نییە و لەوانەیە ناوبراو لەگەڵ زێڕۆ و تەهادا لە هەمان خاڵی سنووریدا خۆیان مەڵاس دابێ. پێویستە سەرکردەگەلی کاروان فەرمانی پێویست و گشتی دەربچوێنن لەبەرئەوەی ئەم بابەتە بێ رادە گرینگە و، دەبێ راست و رەوان بارودۆخی مەلا مستەفا و هاوەڵانی ئەو روون ببێتەوە.»

بەو ئامانجەی ئەم فەرمانەی دواییی ئەرکانی سوپا دەسبەجێ جێبەجێ بکرێ، لە هەمان ڕۆژدا واتە لە بیست و حەوتی مانگدا کاروانێک لە یەکەگەلی باشوور کە پێک هاتبوو لە کەتیبەی پیادەی لیوای کرماشان و کەتیبەیەکی ٧٥ی و ٤٠٠ مرۆڤی سوارەی مامەش و

مەنگوڕ لە بن سەرکردایەتیی عەقید غەفاریدا لە بانەکانی کێوی تاڵجارەوە بەرەو پردی گادەر و ناوچەی سنوور کەوتنە ڕێگە.

کاروانی پێشوو سەرەڕای ئەو کرێوە و بەفرە ئەستوورەی سەرتاسەر ئەو ناوچە سەخت و کێوەڵانەی گرتبوو، کەوتە سەراسۆ و پاکوەکەری. هەروەها لەگەڵ ئالیگرانی زێرۆ و تەهادا بەگژ یەکتردا هاتنەوە و تێکسرەواندنێکی گەرم لە نێوان هەردوو لا لە بانە سنوورییەکاندا هاتە گۆڕێ و لە ئەنجامدا ٤ کەس لە ئالیگرانی تەها کوژران و چەکەکانیان کەوتە دەستی هێزی دەوڵەت و سێ کەسیشیان لێ گیرا.

ئەم بەشە لە هێڵی سنووردا درێژەی بەپێشوەچوونی خۆی دا و لە بانە سنوورییەکاندا ئاڵای سێ ڕەنگیی شاهەنشاهیی لە دوا لوتکەدا هێنایە لەرە و، ڕێوڕەسمی سوپاییی گەرموگوڕ و بەهەیبەتی لە هێڵی سنووردا جێبەجێ کرد. لەبەرئەوەی هەوا زۆر سەرما بوو و کرێوەیەکی چڕ دەباری، کاروانی پێشوو لە بەرودواهاتنی ئەو ڕۆژەدا بەرەو سەرگەی خۆی واتە هەمان بانەکانی تاڵجار گەڕایەوە، هەروەها زانیاریی ئەوەی کەوتە دەست کە مەلا مستەفا لەگەڵ ئالیگرانی خۆیدا «دەوروبەری ٥٠٠ مرۆڤ دەبن» بەچوونەوە زەویی عێراق و خۆبەدەستەوەدان بەبەرپرسانی عێراقی ڕازی نەبووە و بەرەو بانەکانی لکی باکوری گادەر کشاوەتەوە و وا لەو ناوانەیە.

بۆ وەدەرنانی چەکداران فەرمان درا هەندێ هێز لە کاروانی مەرگەوەڕ و کاروانی عەقید مەجیدی بەرەو بانەکانی پێشوو بنێردرێن. بۆ جێبەجێ کردنی ئەو نیازە ڕۆژی بیست و نۆی ئاخەلێوە دوو سریەی پیادە لە کەتیبەی ئەسفەهان لە بانەکانی هەلەجەوە بەرەو دۆڵی بێنار و، دوو سریە لە فەوجی ٦ ی ئازەرپاد بۆ سەراسۆیی بەرەو بانەکانی داڵانپەرداغ ناردران و، بەبێ بەیەکدادان گەیشتنە بانەکانی سنووری بێنار و داڵانپەرداغ و ئەوێیان گرت، بەڵام سۆراغێک لە بارزانییەکان نەکەوتە دەست.

هەروەها لە ڕۆژی بیست و نۆدا کاروانی عەقید مەجیدی بە ٤ سریەی پیادە و دەستەیەک هاوەنەوە بۆ سەراسۆی بانەکانی تەنیشتی رووبار بەڕێ کەوت. هەرچەندە بەهۆی خراپیی کەشەوە بۆی نەکرا خۆی بەپردی گادەر بگەینێ و، شەو لە کێوی بەزسینادا مایەوە بەڵام سەرگەلەدارانی چاودێریی ئەوان کە برێتی بوون لە پیاوانی خێڵان و پیاوانی بژاردە هەتا ئێوارەی ئەو ڕۆژە خۆیان گەیاندە رووباری گادەر و تێ گەیشتن کەوا سەرلەبەر خاووخێزانی تەها هەرکی لە رووبار پەڕیونەتەوە و لە بەری ڕۆژئاوای رووباردا خۆیان

شاردووەتەوە. ئەو مرۆڤە چاودێریکەرانە بەهۆی داهاتنی شەو گەڕانەوە پاش و، چوونەوە پاڵ هێزی سەرەکی.

لە سبەینەی ڕۆژی سێیەمی ئاخەلێوەدا کاروانی پێشوو کەوتە شوێن ئەرکی پێ سپێردراوی خۆی و خۆی گەیاندە بانە سنوورییەکانی ڕۆخی ڕووبار و لەگەڵ سنووروانانی عێراقیدا پێوەندیی گرت. بەبۆنەی گەڕانەوەی یەکەگەلی سوپایی کە پاشی چەندان ساڵ جارێکی تر توانییانەوە ئالای «شمشێر و ڕۆژ»ی جاران لە هێڵی سنووردا بخەنە لەرزە، ڕێورەسمی سوپایی لەسەر هێڵی سنووردا هاتە کایە و بۆ گیانی شەهیدانی رزگارکردنی ئازربایجان و قوربانییانی پێناو ئازادیی وڵاتی خۆشەویست، سڵاویان هەنارد. هەروەها کاروانی پێشوو زانیی کەوا عێراقییەکان پردەکەی سەر رووبارەکەیان تێک داوە.

لەو دیمانەیەی لەگەڵ سەرکردەی هێزی سنووروانی عێراقیدا کرا، ناوبراو رایگەیاند کەوا تەها هەرکی چووەتە خرێنە و منداڵەکانیشی لەناو زەویی عێراقدان. ئەم زانیارییانە پاش ئەوەی گەیشتنە ئەرکانی سوپا، فەرمان بەسەرکردەی فیرقە درا هەتا لێکۆڵینەوەیەکی ورد بکات و بزانێ ژمارەی ئەو هەرکی و بارزانییانەی چوونەتە عێراق چەند بوونە و چەندی تریان لە ئێران ماونەتەوە. لەبەرئەوەی هەندێ لە بارزانییەکان لە عێراق سزای لە سێدارەدانیان بەدواوەیە، پێ ناچێ لە زەویی ئێران دەرچووبن. بەتایبەتیش پێویستە بەهەر شێوەیەک بێ ئالیگرانی زێرۆ بگیرێن.

ئەو کاتە سەرکردەی ئەو کاروانەی لە لێواری رووباری گادەردا ئەرکی خۆی بەجێ دەهێنا ئەرکانی سوپای ئاگەدار کرد کەوا عێراقییەکان رووباری گادەر بەسنووری نێوان هەردوو وڵات لە قەڵەم دەدەن لە کاتێکدا ئەمە دروست نییە. ئەرکانی سوپا دەسبەجێ وەڵامی دایەوە کەوا پێویستە هێزگەلی عێراقی بەری ڕۆژهەڵاتی رووبار بەجێ بهێڵن. بۆ بەجێهێنانی ئەم فەرمانە عەقید مەجیدی بیرەوەرییەکی توندی دا بەسنووروانانی عێراقی و وریای کردنەوە کەوا سنووری ئێران هێڵی سەرووی ڕۆژئاوای رووباری گادەرە، ئیتر لە ئەنجامی ئەم پێشبڕییە لەجێیەدا پاسەوانانی عێراقی بەری رووبارەکەیان بەر دا و چوونەوە ناو زەویی عێراق.

## کاری کاروانگەلی عەقید فولادوەند و عەقید غەفاری

ئەو ڕاپۆرتەی لە کاروانی عەقید فولادوەندەوە هاتبوو دەیگوت لە ڕۆژی بیست و هەشتی ئاخەلێوەدا پاش باشبوونەوەی باری هەوا و لێکردنەوەی باران و زریان،

سەرگەلەدارانی کاروانی پێشوو گەییونەتە پردی گادەر و بانەکانی تەنیشت رووبارەکەیان گرتووە بەڵام هیچ هەواڵێک لەبارەی شوێنی پیاوخراپانەوە دەرنەکەوتووە. هەروەها ئەو زانیارییە گەیشت کە شێخ ئەحمەد و سەرجەم خاووخێزانی بارزانییەکان لە سێ ڕۆژی لەمەوپێشەوە بەخۆیان و دوو تۆپی ٧٥ی و ١٠٠ تفەنگەوە خۆیان بەدەستی عێراق داوەتەوە و لە سنوور تێ پەڕیون، پاشانیش عێراقییەکان پردەکەیان تێک داوە. لە لایەکی ترەوە مەلا مستەفا بەخۆی و ٤٠٠ ـ ٥٠٠ مرۆڤی تفەنگهاوێژەوە لە ڕێگەی لکی باکوری رووباری گادەر و بانەکانی باشووری داڵانپەرداغەوە بەرەو بارزان رۆیشتووە.

دوو مرۆڤی دیل کەوتبوونە دەست کاروانی عەقید غەفاری و سەرو تفەنگێکی برنۆیان پێ بوو ئەوانیش لێکۆڵینەویان لەگەڵدا کرا. یەکێکیان «جەلالە فەندی»ی ناو بوو کە پێشتر لە سوپای عێراقدا نەقیب بووە و، ئەویتریان بە«عەبدولقادرە فەندی» ناسراوە کە لە ناوچەی هەولێری عێراقدا مامۆستایەتیی کردووە. لەو لێکۆڵینەوەیەی لەگەڵیاندا کرا دەرکەوت:

هەموو خێزانی بارزانییەکان چوونەتە عێراق و تۆپ و برێن و تفەنگی خۆیان داوە بەدەوڵەتی عێراق، بەڵام مەلا مستەفا ئامادەی چوونە عێراق نەبووە و لەگەڵ نێزیکەی ٤٠٠ مرۆڤی تفەنگهاوێژی بژاردەی خۆیدا وای نیازە بچێتە بارزان هەتا لەوێندەر بتوانێ برایانی خۆی لە چەنگی سوپای عێراق رزگار بکات. شەش کەس لە ئەفسەرانی سوپای ئێرانیش لەگەڵ مەلا مستەفادان. لە ئەفسەرانی عێراقییش چەند کەسێک لەگەڵ مەلا مستەفادا بوونە بەڵام پاش ئەوەی لە نیازی ئەو گەیشتوون کە بیری چوونەوە عێراقی هەیە، لێی دابڕاون و هێشتا نەزانراوە بەرەو کوێ رۆیشتوون.

لە مێژووی سێیەمی مانگی ئاخەلێوەدا دوو کەس لە پێڕەوکارانی مەلا مستەفا کە عێراقی بوون خۆیان بەسەرکردەی مۆڵگەی شنۆ ناساند. یەکێکیان ناوی عەلی حەسەن و ئەویتریان ناوی عەلی رەشید بوو و هەریەکەیان تفەنگێکی برنۆ و چل فیشەکی پێ بوو و بەدەستەوەیان دان. بەپێی ئەو ئاگەدارییانەی لەوان کەوتنەدەست هەمان ئەو زانیارییانە دووپات بووەوە کە لە دیلەکان وەرگیرابوون بەتایبەتیش ئەوەیان گوت کە مەلا مستەفا رۆیشتووە و خۆی بەدەستەوە نەداوە.

ڕۆژی پاشتر واتە لە سی و یەکی ئاخەلێوەدا سەرکردەی فیرقەی چوار زانیاریی دا کەوا زێڕۆ و ئالیگرانی وی لە دۆڵی «پیسەلیس»ی ڕۆژئاوای چۆمی گادەری سەر بەزەویی

ئێراندان و، مەلا مستەفا لە «خاسۆک»ی سەر بە «خاکسۆر»ی عێراق دەیباتە سەر. پۆلیسی عێراق و هەندێ لە تفەنگهاوێژانی عێراقی بەدوای ئەوانەوەن و تەهاش لە خرێنەیە.

لە مێژووی سیی ئاخەلێوەوە سەرکردەی هێزی عێراق پێوەندیی خۆی بەهێز «واتە بەهێزی ئێران - وەرگێڕ»ەوە پچڕاند. لە هەمان ڕۆژدا کاروانێک لە کەتیبەی ئازەرپاد بەرەو سنووری دالانپەرداغ چوو. هەروەها لە سایەی سەراسۆیی و پشکنینەوە دەرکەوت نێزیکەی ۸۰ مرۆڤ لە لایەنگرانی زێرۆ بەهادوری لە بانەکانی ناسراو بە ۱۲۵۵دا خۆیان پەنا داوە. بۆیە دەسبەجێ لە لایەنی سەرکردەی فیرقەوە فەرمان درا کەتیبەیەک لە فەوجی ئاهەن «کاروانی عەقید فولادوەند» بۆ هاوکاریی کەتیبەی ئازەرپاد و لە بن چاوەدێریی عەقید سەردادوەردا بەرەو شوێنی ناوبراو بکەوێتە ڕێگە.

لە ڕۆژی یەکەمی مانگی گولاندا کاروانی پێشوو تەبای فرینی باڵەفڕە بەرەو چیای «زیارەت مووسی» کە مەکۆی ئالیگرانی زێرۆ بوو بەڕێ کەوت و، لە سەعات دووی پاشنیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا گەیشتە بانەکانی زیارەت مووسی و لوتکەی ۱۲۵۵، ئالیگرانی زێرۆش لە لکی باشووری چۆمی گادەرەوە بەرەوپاش کشانەوە.

لە ڕۆژی دووەمی مانگی گولاندا فەرمان درا بە کەتیبەگەلی پێشوو بۆ ئەوەی راوەدووی چەکداران بنێن و هەتا سنوور برۆن و هەرچی دۆڵ و نەوالی ئەو ناوە هەیە بیانپشکنن و سەراسۆیان بکەن. کاروانی ناوبراو دەسبەجێ کەوتە دوای ئەوان و لە سەعات ٦ و نیودا گەیشتە سنوور و پێ حەسیا کە زێرۆ خۆی بەدەست بەرپرسانی عێراقییەوە داوە.

لە ڕۆژی سێیەمی مانگی گولاندا دوو لکی باکور و باشووری چۆمی گادەر و سەروەها بنارەکانی ڕۆژئاوای دالانپەرداغ و زەوییە گومان لێکراوەکان بەهۆی ئەم کاروانەوە پشکنران و هەرچەندە سەرتاسەری ئەو زەوییانە بەبەفر داپۆشرا بوون و پڕ لە هەڵدێری ڕک بوون، کاروان درێژەی بەسەراسۆیی و پشکنینی خۆی دا و لە هێلی سنووردا تێکڕای یەکەکان یەکیان گرتەوە. لە بستووی سنووردا گرووپێکی عێراقی لە مۆڵگەی سنووریی عێراقەوە بەسەرکردایەتیی ملازم سێیەم عەبدولڕەحیم عەبدولوەهاب هاتنە پێشوازیی کەتیبەی ئازەرپاد و پاش نواندنی ڕێزلەیەکترگری، ئالای ئێران لە سنووردا بەرز کرایەوە. هەروەها ئەفسەری ناوبراوی عێراقی گوتی کەوا زێرۆ و تەها هەردووکیان لە خنێرەدان. زێرۆ لە کاتی خۆ بەدەستەوەدانیدا ۱۲ تفەنگ و ٦ برێنی لەلا بوون، دانیەوە بەپۆلیسی

عێراقی، شێخ ئەحمەد لە بەغدایە و مەلا مستەفا لە خاکسۆرکە.

بەو شێوەیە هەموو کاروانەکانی سوپا لەو شوێنەدا گەیشتنە سنوور و ئەو ئەرکەی پێیان سپاردرابوو رایانپەڕاند و، دوا ناوچەی سنوورییان لە هەبوونی چەکداران پاک کردەوە.

لە ئەرکـانی سوپاوە فـەرمـان درا بۆ ئەوەی کـاروانـگەل بۆ بنکەی خۆیان بچنەوە و لەو خاڵانەی تایبەتن بە لێ سەندنەوەی چەک کە لە ماکۆوە هەتا سەردەشت دەگرێتەوە، کۆجێ بن و بگیرسێنەوە، هەتا مێژووی ١٥ گولان ١٣٢٦یش کاری کۆکردنەوەی چەک لە کاتی خۆیدا جێبەجێ ببێ. ئەرکانی سوپا لە پێناوی بەردەوامی لە چارەسەری ئەم کێشـەیەدا و بۆ چەککردنی ناوچەکانی کوردستـانی باکور، هێزگەلی: قـەرە زیائەدین، خووی، قـەتوور، شـاپوور، ورمێ، تەرگـەوەڕ، سـۆمـای برادۆست، مـەرگـەوەڕ، شنۆ و پیـرانـی دامـەزراند و دەستی بەکار کرد.

## له دادگەدان و هەڵواسینی قازی محەمەد، سەدری قازی و سەیفی قازی

مەهاباد باژێرێکی بچووکە، ناوی کۆنی «ساباڵغ» بووە و لە رابردوودا بەسەرهاتی پڕ لە رووداوی هەیە. ئەم شارە کە لە سەر لێواری رووباری بچووکی مەهاباد هەڵکەوتووە، سەبارەت بەناهێمنی و بشێوێنییەوە تەناهی و خۆشیی بەخۆیەوە نەبینیوە، لە رواڵەتی شارستانەتیی نوێدا لە کارگەیەکی بچووکی کارەبا و چەند باڵەخانەیەکی دوو نهۆمیی بێ بایەخ بترازێ شتێکی تری تێدا نابینرێ. مەهاباد لە نێوان چەند زنجیرە چیایەکی کە ئەم شارەیان لە کۆش گرتووە و لەملا و لەولاوە سەریان بۆ ئاسمان هەڵبڕیوە، هەڵکەوتووە. زنجیرە بانەکانی باکور و باشوور، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کە چێترین پارێزی ئەم شارەن، لە بارەی دیرۆکی مەهابادی بچووکەوە نهێنیی بەمەترسییان لە دڵدا هەڵگرتووە. مەهاباد سەردەمانێ لە لایەن رووسە تزارییەکانەوە داگیرکراوە و، ڕۆژانێ بەدەستی سوارانی خوێنەخۆری سمایلاغاوە بووە. بەینێکیش شەڕگەی زۆر خوێناویی هێزگەلی دەوڵەت و کوردان بووە. بەڵام ئەم رووداوانە لە ڕێزی ئەو بەسەرهاتانەن کە زۆرینەی دانیشتووان کەم هەتا کورتێکیان لێ ئاگەدارن. لەم شارەدا بەسەرهاتی ئەوتۆ روویانداوە دوورنییە بەساڵان رابوورن و کەسێک پەیدا نەبێ باسیان بکات. نهێنیی ئەوتۆ هەن لەوانەیە هەتا هەتایە کەس پێیان نەزانێ: جەردەیی، خوێنڕێژی، پیلانگێڕی و بێنەوبەردەی نۆکەرانی ولاتانی بیانی و هیتر و هیتر ئەم باژێڕەیان کردبوو بەگۆڕەپانی زۆرانێی خۆیان.

مەهاباد لە نێزیکی سنووری سێ ولات یان چاتر بلێیم چوار ولاتدایە. بەرژەوەندی دژبەیەکی: نەوت؛ کۆماری کورد؛ سەرکوتینەوەی کورد؛ خۆبەڕێوەبەریەتی، ناوبەناوێ دانیشتوانی بەلەنگازی ئەم سەرزەوییە بەسەر دەکەنەوە. ڕۆژێ کۆلۆنێل لۆرەنس دەیکا بەمەیدانی تەڕاتێنی خۆی، ڕۆژێکی تر ئەسەدۆف بۆ پێشوەبردنی سیاسەتی ولاتی خۆی گورجوگۆڵیی تێدا دەنوێنێ و سەردەمانێکی تریش نەوت پێوەندیی دانیشتوانی ئەم سەرزەوییە بەسیاسەتگەلی دەرەکییەوە گرێ دەدا. راپەڕین، خوێنڕژتن، دووبەرەکی و کوشتار، گەلێک جاران دێنەوە کایە. بارودۆخ هێمن دەبێتەوە و پاش تۆژینەوە لەوەی رووی دا، چاودێری بێ لایەن دەگاتە ئەو بەرکەوتەی کەوا پاش هەموو ئەو قوربانیدان و نیشتنەوەی لافاوە تەنیا دەوڵەتێک دۆڕاندبێتی ئێرانە و تەنیا گەلێک لە خۆڕایی قوربانی دەدا گەلی ئێرانە، جا چ لەم لا بێ چ لەو لا. بەو شێوەیەی لە بەرگی پێشوودا گۆتمان کۆماری خۆبەڕێوەبەریەتیی کوردستان و ئەم بیرە بەر لە شەڕی ناوولاتان شان

بەشانی دەسڕۆیشتنی وڵاتێکی بیانی کە لە ئێران و تورکیا و عێراق و سووریا و شام واتە لە ناوچەگەلی کوردنشیندا دەسەڵاتی دەنواند، بەرە بەرە ، لە زار بۆ زار، لە دڵ بۆ دڵ و لە گوێ بۆ گوێ لە هەموو شوێنێکدا پەرەی گرت و ئالیگرانی لە خۆی کۆ کردەوە. وڵاتانی بیانیش کە چاویان بڕیوەتە ئەم ناوچەیە و لە کانگەی نەوتە گەشەدارەکەی رامـاون، کەڵکیان لەم ئاواز و لەم نێزەی خۆبەڕێوەبەریەتییە وەرگرت و ئەوەیان هێنایە کایە کە بینیمان(٢٧).

نووسەر بێ ئەوەی بیەوێ ناوچەگەلی کوردستان و کوردەواری بەدوور و درێژی و بەنەخشەوە بۆ خوێنەران شرۆڤە بکات، بەئازادییەوە دەڵێ دەستی سروشت زەویی بەنرخ و زێڕینی ـ کە لە سەرنجی ئابووری و سوپایی و سیاسییەوە بۆ ئینگلیز و رووسی کۆن و سۆڤیەت و ئەمەریکا و بەریتانیای نوێ لەو پەڕی گرینگیدان، بەمرۆڤگەلێک داوە کە کوردیان پێ دەگوترێ و برێتین لە کۆنترین دانیشتوانی ئێران. جارێکی تریش ناچارم ئازادانە ئاماژە بکەم کە دانانی سنووری وڵاتانی بچووکی ئێستەی ڕۆژهەڵاتی نێزیک بەجۆرێکە کوردستانی لەت لەت کردووە، کورد لەم ناوچەیەدا جگە لەوەی کە لە ئێراندا هەن و ئێرانین، هەروەها لە تورکیا و عێراق و سووریاشدا بەشێوەی کەمینە ـ کەمینەیەکی کارەسات دیتە، هەن. سەبارەت بەو نەوتە بەهادارەی لە زەویی کوردنشینی ئێران و تورکیا و عێراق و سووریا و تەنانەت بەشێکی قەفقاسیاشدا هەیە، ناوی کورد بەردەوام لەگەڵ ناوی نەوتدا جووتە کە ئەمڕۆ نەوت بەوێنەی کیمیایە. هەمان سیاسەت کە نەوتی دەوێ و لە پرسی نەوتدا تێکەڵە، لە پرسی کوردستانیشدا چالاکی دەنوێنێ.

قازی محەمەد پاش ئەو گۆڕانانەی هەمووومان دەیزانین، دروست لە هەمان ئەو کاتەی فیرقەی دیموکراتی ئازەبایجان لە گوێ بەفەرمانیی دەوڵەتی ناوەندی هەڵگەڕایەوە، ئەویش ئالای زۆرداریی هەڵ دا و دەنگی خۆی بۆ دانانی کۆماری کوردستان بڵند کرد و دەستی پێ کرد ئاوازی (خودموختاری ـ خۆبەڕێوەبەریەتی) بژەنێ. وەک لە پێشەوە گوترا، بیری هێنانە کایەی ئەم بەڵایە نوێ نەبوو، چالاکیی قازی محەمەدیش شتێکی تازەبابەت نەبوو، چاکتر وایە بەشێوەیەکی کورتەبڕی باسێک لە ژیانی رابردووی قازی محەمەد و برایانی ئەو بکەین.

(٢٧) نووسەری کتێب هەمان قسەی ڕێژیمە داگیرکەرەکان دووبارە دەکاتەوە کاتێ کە ئامانجە سیاسییەکانی بزووتنەوەی کورد بەدەسکرد و فیتی بێگانە پێناسە دەکات.

باوکی قازی محەممەد، ناوی قازی عەلی و لە پیاوانی رێزدار و شایەن رێزی کوردستان بووە. لە شەڕی پێشوو لەگەڵ قازی مونعیمی ئامۆزایدا خزمەتێکی گەورەیان پێشکێشی دانیشتوانی مەهاباد کردووە و هەتا پێیان کراوە پێشبڕییان لە دەسەڵاتی رووسە تزارییەکان و زوڵمی ئەوان کردووە. مامی باوکی قازی محەممەد، قازی فەتاح کە دەسەڵاتێکی فرەوانی لە کوردستاندا هەبوو، لە رووداوی «مەشرووتە» و «ئیستیبداد»دا سوێندی خواردبوو هەتا زیندووبێ نەهێڵێ سەربازی تزار پێ بنێنە ناو مەهابادەوە، بۆ ئەمە کفنی لەبەر کرد و بانگی لە خەڵک گێڕایەوە بۆ «جیهاد» و لەم پێناوەدا شەهید بوو. ئەو رابردووە گەشەدارەی بنەماڵە کە هێشتا لە بیری دانیشتوانی مەهاباد نەسڕاوەتەوە، ئیتر ناوبانگی بنەماڵەی قازیی لەگەڵ رووبەڕووبوونەوەی بیانیدا هاوتا کردبوو و دانیشتووانی کوردستانی هان دەدا لە پێش کەسانی سەر بەم بنەماڵەیەدا سەری رێز و نەوازی دابنوێنن. بەتایبەتیش لەبەرئەوەی ئەندامانی ئەم بنەماڵەیە پیاوی ئایین و زانست بوون و، بەشێک لە سوننییەکانی کوردستان گوێڕایەڵیی ئەوانیان دەکرد.

لە سەردەمانی دەسەڵاتدارییەتیی پاتشای پێشوودا کە هێزگەلی سوپا لە پێناوی چەسپاندنی دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتیی دەوڵەت لە کوردستاندا ناچار بوون لەگەڵ خێڵان و ئاییندارانداا پێکەوە خەبات بکەن، لەو رۆژانەدا دەوڵەت بێ رادە خاوەن دەسەڵات بوو، توانا و دەسەڵاتی ئەو رۆژانەش وەک پەندی پێشینانن، ئیتر لەو رووەوە کە باوکی قازی محەمەد و مامی دەسەڵاتێکی فرەیان لە مەهاباد و دەوروپشتیدا هەبوو، دەوڵەت مۆڵەتی بەهەردووکان دا سوود لە بەرگی ئایینی وەربگرن، دەستهاوێژەکەیشیان بەشێوەی خوارەوەیە:

«ژمارە ٦٦، بەگوێرەی مۆڵەت، بەڕێزان میرزا عەلی و میرزا مونعیم قازی، بەپێی بەندی ٣ لە مادە ٢ی یاسای شێوەی یەکگرتوودا، لە لەبەرکردنی جلکی مەلایەتیدا مۆڵەت دراون. بەژمارە ٢٦٦٩ شەهادەی مۆڵەتی دەرس گوتنەوەیش لە زانستی (منقول) و (معقول)دا بەگوێرەی پەسندکردنی یەکێک لە زانایانی ئەهلی سوننەت بەناوبراوان بدرێت.»

میرزا عەلی قازی کە دەسەڵات و رێزی شایەنی هەبوو و، پاتشای پێشوو کەیفی پێی دەهات، لەساڵی ١٣١٧دا کۆچی دوایی کردووە. بەپێشنیازی سەرکردەی فیرقە و رێنوێنیی بەرپرسانی سوپا، لە تارانەوە مۆڵەت و فەرمانی دادوەری لە لایەنی پاتشای

پێشووەوە لەسەر ناوی قازی محەمەدی کوڕی دەرچوو. پلە و ڕێزی مەزەبیی قازی محەمەد پاش ئەوەی بایەخی دەوڵەتی ناوەندی و بایەخی پاتشاشی هاتنەسەر، دەسەلاتێکی بەرهەڵدای بۆ ئەو لە کوردستاندا هێنایە گۆڕێ، بەڵام میری پێی نەکرا سوود لەو دەسەلات و خۆشەویستییەی ئەو وەربگرێ، لەبەرئەوەی تاران هەستی نەکرد کە قازی محەمەد هەرچەندە خۆی موفتیی مەهابادە و فەرمانی دادوەریی هەیە و ئەنگوستیلەی ئەڵماسی بەدەست هێناوە، هەروەها دەشیەوێ سەدری قازیی برایشی بەنوێنەرایەتیی ئەنجوومەن بۆ تاران بنێرێ.

ئەو ڕۆژانە وەکو ئێستە، تەنیا هەندێ ماستاو ساردکەرەوە دەیانتوانی سەرنجی بەرپرسانی مەڵبەند بەکێش بکەن. گوێ بەو بابەتە نەدرا، تەنانەت کارشکێنی لە دژی قازی محەمەد کە تێ دەکۆشا بەبێ خۆدەرخستن پلەیەک بۆ خۆی بەدەست بهێنێ، دەستی پێ کرد. هێشتا لە بیر نەکراوە کەوا لە یەکێک لە سەردانە مێژووینەکاندا پاتشای پێشوو لە دیمانەی دەمڕاستی ئەو شارەدا کە پیاوێکی دەروون پاک و پیر و پەککەوتە بوو، شایەتیش بۆ گەورەترین هونەری ئەو ئەوەبوو بەبێ مۆڵەتی سەرکردەی مۆڵگە نەدەهاتە شار و سەعاتێک لە پشت دەرگەی ژوورەکەی ئەودا لە چاوەڕوانیی دەرچوونی مۆڵەتدا دەوەستا، بێ خوڵکیی خۆی پێشان دا و لە یەکێک لە دانیشتنەکاندا کە ژمارەیەک لە پیاوانی ئاینی و بازرگان تیایدا ئامادە بووبوون، پاش ماوەیەک لە باسوخواس و تێگەیشتن لە زانین و خوێندەواری و دەسەلات و قەسەکانی ئەو پیاوە، پاتشا بەسەرکردەی فیرقەی فەرمووبوو: «بۆچی لەمانە نانێری بۆ ئەنجوومەن؟»، ئەو خوالێخۆشبووە بەشێوەیەکی نهێنی گوتبووی: «ئەمانە گوێڕایەڵ نین!».

بەهەرحاڵ دوورەپەرێزی لە بایەخدان بەپێویستییەکانی سەردەم و گۆڕانەکانی ڕۆژ، بووە هۆی ئەوەی نوێنەرایەتیی مەهاباد لە پەرلەماندا بەکەسێک بسپێردرێ کە لە ڕۆژی توانابیدا دەوڵەت نەتوانێ دەست و پێی قازی محەمەد گرێ بدات و پاش مانگی گەلاوێژ لە ترسی ئەو نەچێتە مەهاباد و دەوڵەت لە چالاکیی ئەو کەڵک وەرنەگرێ.

قازی محەمەد پیاوێکی لەبنەوە و فێڵاوی بوو، بەزاراوی ناسکئامێزی ئەمڕۆ سیاسەتکار بوو. بێ ئەوەی هیچ بیانووەک بداتە دەستی ناحەزانی خۆی، لە چاوەڕوانیی هەل و دەرفەتدا کاتی خۆی بەموتالا و وردبوونەوە بەسەر دەبرد. ئیتر بەرە بەرە خۆی لە پیاوێکی ئاین پەروەری کوردەوارییەوە کرد بەپیاوێکی زانا، بەتایبەتیش لە بواری

فێربوونی زانستی نوێدا چالاکییەکی زۆرتری لە خۆیدا پیشان دەدا و پێی کرا زمانگەلی: عارەبی، ئینگلیزی و فرەنسی پتر لە رادەی بەجێ گەیاندنی پێویستی فێر بێ. تەنانەت بەجۆرێک لە مێژووی کۆنی کوردستانی کۆڵییەوە کە ئاخاوتنەکانی ئەو بۆ زۆر لە ئاگەدارانیش بووبوون بەدەستهاوێژ. بەم هەموو توانا و دەسەڵات و ئامادەکارییەوە، باری ئارامی کوردستان بەهاتنی هێزی بیانی لێک هەڵوەشایەوە، پاڵەپەستۆی بیانییان لەو ناوچەیەدا بەرادەیەک گرژ بوو شەوێکیان بەهاندانی قازی محەمەد ئەوکاتەی بەرێز فەریق جیهانبانی بۆ پشکنین چووبووە دەر، هەندێ لە خراپەکاران لە پشت باڵەخانەیەک کە ئەو تیایدا رووەدەنیشت، هەتا سەری سبەینێ خەریکی گوللەباران بوون، پاش تاوێک بنکەی پۆلیسی مەهابادیان چەک کرد و شوێنەوارێکی بەکردەوە لە هێزی میری لەو ناوچەیەدا نەما. لەو بار و دۆخەدا کە هێشتا شەڕ بەکۆتا نەهاتبوو و خەریکبوونی وڵاتانی بیانی بەشەڕەوە بووبوو بەپێشبڕ لە تێکەڵبوونیان لە کاروباری ئێراندا. قازی محەمەد، قازی سەدری برای یا وەک بەناوی سەدری قازی بەناوبانگە، بەناوی نوێنەری کوردستانەوە لە خولی چواردەدا ناردە ئەنجوومەن. هەموو ئەو ماوەیە قازی محەمەد بەکردەوە چیی پێویست بوایە دەیکرد بەڵام ناوێک لە «خودموختاری» یان دژایەتیی دەوڵەتی ناوەندی بەسەر زاریدا نەدەهات. بەرادەیەک، جارێک یان دوو جاریش هاتە تاران و بەخزمەت پاتشا گەیشت و ئەنگوستیلەی ئەڵماس و بڕێکیش پارەی پێ درا.

ئەرکانی سوپا لە رێگەی کرێگرتە نهێنییەکانی خۆیەوە لە مەهاباد و ناوچەگەلی تری کوردستاندا کە ئەرکی کۆکردنەوەی دەنگوباسیان هەبوو، چالاکیی دەنواند. بەڵام دەوڵەت زێدە لە رووداوی ئەوێدا خۆی تێکەڵ نەدەکرد لەبەرئەوەی ململانەیەکی گەرموگوڕ لە نێوان کاردارانی سیاسی و سوپاییی دوو دەوڵەتی بیانیدا لە پەنای پەردەوە دەگەڕا و ئێران بۆی نەدەلوا دەست بەکارێکی بەکار و لەبار بکات. بەپوختی بەهەمان ئەو شێوەیەی قازی محەمەد لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا گەمەی دەکرد دەوڵەتی ناوەندییش خۆی لەو نەبان دەکرد و، لەو کار و کردەوانەی قازی محەمەد لە مەهاباد و سەدری قازی لە تاراندا بەئەنجامیان دەگەیاند خۆی کڕ و بێدەنگ دەکرد.

بێ ئەوەی بمانەوێ ئەو باسانەی لە بەرگی یەکەمدا گوتوومانە جارێکی تر دەور بکەینەوە، دەڵێینەوە کەوا بەهۆی ئەو گیروگرفتانەی لەو رۆژانەدا هەبوون و ئەو کێشە و بەرانەی لەبارەی پرسی نەوتەوە سەریان هەڵدابوو و بووبوونە مایەی رووداوەکانی ساڵی

١٣٢٣ و ١٣٢٤، له نيوه‌ی دووه‌می ساڵی ١٣٢٤ به‌دواوه بارودۆخی کوردستان و مه‌هاباد رووه‌تێکی تریان گرته‌خۆ و ئاشکرابوو له‌کوردستانیشدا په‌رده‌یه‌کی بچووک که داخوازه‌کانی حیزبی کۆمه‌ڵه‌ی هه‌تا ئه‌وکاته داپۆشیبوو، به‌زوویی چووه لاوه و، بارستی راسته‌قینه‌ی کاره‌کانی قازی محه‌مه‌د ئاشکرا بوو. له‌به‌رئه‌وه‌ی ده‌ستهاوێژ هه‌بوون پێشانیان ده‌دا که‌وا له کوردستانیشدا پێشینه‌ی پێویست له پێناو به‌جێ گه‌یاندنی سیاسه‌تێکی له‌گوێن ئه‌و سیاسه‌ته‌ی که له ئازربایجان به‌رێوه ده‌چوو، ئاماده‌یه و له‌به‌رده‌ستدایه. هاتنی بارزانییه‌کان ئالیکارییه‌کی گرینگی دا به‌فره‌وانکردنی داوێنی ئه‌و رووداوانه.

له ئه‌نجامدا، له هه‌مان رۆژی که‌وتنی فیرقه‌ی ته‌ورێزدا واته له رۆژی بیست و یه‌کی مانگی سه‌رماوه‌زی ١٣٢٤دا (واته ١١ کانوون١ ١٩٤٥) قازی محه‌مه‌دیش نیازی خۆی له پشته‌وانیی ئه‌و سیاسه‌ته‌دا به‌ناردنی نێرده‌یه‌ک بۆ ته‌ورێز ئاشکرا کرد. ئه‌و نێرده‌یه به‌سه‌رۆکایه‌تیی محه‌مه‌د حوسێن قازی (سه‌یفی قازی) و، برێتی (نیابةً) له گه‌وره به‌رپرسانی حیزبی کۆمه‌ڵه بوو. ئه‌مانه وتووێژێکی فره‌وانیان له ته‌ورێز له‌گه‌ڵ پیشه‌وه‌ری و گه‌وره به‌رپرسانی فیرقه‌ی ئازربایجاندا کرد و، یارمه‌تی و ده‌سته‌وایی و پشته‌وانیی خۆیان بۆ یه‌کتر راگه‌یاند.

قازی محه‌مه‌د رۆژی بیست و دووی سه‌رماوه‌ز نه‌خشه‌ی کوردستان و به‌رنامه‌ی سه‌رخۆبوونی خۆی خسته به‌رده‌می دانیشتوانی ساده‌ی مه‌هاباد و، نێزیکه‌ی ٣٠٠ که‌سی له لاوانی مه‌هاباد چه‌کدار کرد. رۆژی بیست و شه‌شی سه‌رماوه‌زیش (١٦ کانوون١) ئاڵای ئێرانی له باڵه‌خانه ده‌وڵه‌تییه‌کان دابه‌زاند و ئاڵایه‌ک که برێتی بوو له سێ ره‌نگی سوور و سپی و که‌سک، به‌ره‌واژی ئاڵای ئێران، هێمای گوڵه‌گه‌نم و رۆژ و قه‌ڵه‌می پێوه‌بوو، که به‌ناوی ئاڵای سه‌رفرازیی کورده‌وه دروستی کردبوو، به‌رز کرده‌وه. رۆژی دووه‌می رێبه‌ندان، قازی محه‌مه‌د حکوومه‌تی کۆماری کوردستانی جاڕ دا (واته: ٢٢ کانوون٢ ١٩٤٦)، پاش ئه‌مه محه‌مه‌د حوسێنی سه‌یفی قازی به‌جلک و به‌رگی یونیفۆرم و پله‌ی جه‌نه‌رالییه‌وه چووه پشت مێزی وتاردان و، قازی محه‌مه‌دی وه‌ک پێشه‌وا و سه‌رۆک کۆماری کوردستان خوێنده‌وه. قازی محه‌مه‌دیش به‌جلک و پله‌ی جه‌نه‌رال و به‌ناونیشانی سه‌رکرده‌ی هه‌موو هێزگه‌لی کوردستان له شوێنێکی به‌رز به‌پێوه وه‌ستا و خۆنواندنی هێزه‌کانی خۆی بینی و پاش به‌جێ هێنانی رێوڕه‌سمی خۆنواندن، قازی

محەمەد پێکهێنانی کابینەی کۆماری کوردستانی بەشێوەی ژێرەوە ڕاگەیاند:

(١) حاجی بابەشێخ ـ سەرۆک وەزیر (ڕەئیسی هەیئەت).

(٢) محەمەد حوسێنی سەیفی قازی ـ وەزیری شەڕ (جەنگ).

(٣) محەمەد ئەمینی موعینی ـ وەزیری ناوەخۆ (کیشوەر).

(٤) ئەحمەدی ئیلاهی ـ وەزیری ئابووری (ئیقتیصاد).

(٥) کەریمی ئەحمەدەین ـ وەزیری پۆست و تەلیگراف.

(٦)حاجی ڕەحمان ئێلخانی زادە ـ وەزیری ڕاوێژکار (مشاور).

(٧) مەنافی کەریمی ـ وەزیری ڕۆشنبیری (فەرهەنگ).

(٨) سەدیقی حەیدەری ـ وەزیری ڕاگەیاندن (تەبلیغات).

(٩) خەلیل خوسرەوی ـ وەزیری کار.

(١٠)حاجی مستەفای داودی ـ وەزیری بازرگانی (تیجارەت).

(١١) مەحموودی وەلی زادە ـ وەزیری کشتوکاڵ (کیشاوەرزی).

(١٢) سمایلی ئێلخانی زادە ـ وەزیری ڕێگەوبان.[(٢٨)]

دوای ماوەیەک، واتە لە ڕۆژی چوارشەمووی ٢٤ی مانگی ڕێبەنداندا، بەپێی ئەوەی لە ڕۆژنامەی بڵاوکەرەوەی بیری حیزبی کۆمەڵەدا نووسراوە، قازی محەمەد سوێندی خوارد. ڕێوڕەسمی ئەو سوێندە لە ڕۆژنامەی کوردیی بڵاوکەرەوەی بیری قازی محەمەددا بەشێوەی خوارەوە نوسراوە:

«... لە هەوەڵ و ئاخیر و نێوانی وتارەکاندا لە هەر کاتێکدا نێوی ریاسەتی جمهوور قازی محەمەد، بەسەر زاراندا دەهات بێ وچان مووزیکی میللی لێ دەدرا و چەپڵەڕێزان دەکرا و بەیناوبەینیش قوتابییەکانی مەداریسی کوڕ و کچ سروودی میللییان دەخوێندەوە. لەم کاتەدا ڕەئیسی جمهووریی بەرز بەئەندامەکانی کۆمیتەی مەرکەزیی ئەمر فەرموو کە

(٢٨) کابینەی وەزیران بریتی بووە لە ١٤ وەزیر، لێرەدا سەید محەمەدی ئەیوبیان ـ وەزیری لەشساغی (بیهداری) و مەلا حوسێنی مەجدی ـ وەزیری دادپەروەری «یا سەرۆکی دادپەروەری ـ عەدلییە» ناویان نەهاتووە. بڕوانە: د.عەبدولڕەحمان قاسملو، چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم ١٩٨٨، لاپەڕە ٦٩.

قورئانی موقەدەس و نەقشە و ئاڵای کوردستان حازر بکرێت، بێ وچان هەیئەت کۆبوونەوە و دوو بەدوو لە پشت سەری یەک کەوتنە ڕێ و چوون لە کانگای حیزبی دیموکراتی کوردستان قورئانی موقەدەسیان دەگەڵ نەقشە و ئاڵای کوردستان دەگەڵ ئیحتیرامێکی فەوقولعادە لە سەر دەستی مەلا حوسێنی شکاک دانا و، هەیئەت بەتەرتیبی هەوەڵ لە پشت سەری وی گەڕانەوە تا گەیشتنەوە حزووری پێشەوا. پێشەوا بەدەستی خۆی سەرپۆشی لەسەر قورئانی موقەدەس و نەقشە و ئاڵای بەرزی کوردستان لابرد و مەراسیمی سوێندی:

(ئەمن بەخودا، بەکەلامی عەزیمی خودا، بەنیشتمان ، بەشەرافەتی میللەتی کورد، بەئاڵای موقەدەسی کوردستان سوێند دەخۆم کە تا ئاخیر هەناسەی ژیانم و ڕژاندنی ئاخیر تنۆکی خوێنم بەگیان و بەماڵ لە ڕێی ڕاگرتنی سەربەخۆیی و بەرزکردنەوەی ئاڵای کوردستاندا تێ کۆشم و نیسبەت بەرەئیسی جمهووریی کوردستان و یەکەتیی کورد و ئازربایجان موتیع و وەفادار بم.)ی خوێندەوە.» (٢٩)

پاش بەجێ هێنانی ئەم ڕێوڕەسمە کە گومانی تێدا نییە قازی محەمەد سەبارەت بەهەست گرژییەوە دەلەرزی و، ئەو کەسانەیش کە ئەو گەمەیەیان هێنابووە گۆڕێ پێ دەکەنین. قازی محەمەد پلەی جەنەراڵیی دا بەهەندێک کەس، لەوانە دای بە«ڕێگر»ێکی وەک محەمەد رەشید کە بانەی لە ئاگر هەڵکێشا بوو و بەسەتان مرۆڤی بێ گوناحی کوشتبوو بێجگە لەم وشەیە ناتوانرێ بەهیچ ناوێکی تر بانگ بکرێ.

قازی محەمەد پاش ئەوەی «بەقسەی خۆی» بەئاوات گەیشت، بەوێنەی فیرقەی دیموکراتی ئازربایجان بەفەرمانی بێگانان لە ڕێگەی سەدری قازیی برایەوە لە تاران خەریکی نواندنی چالاکی بوو. لەوان ڕۆژانەدا ئەحمەد قەوام سەرۆک وەزیر بوو و کەشی دەوروبەر بۆ ئەم شێوە چالاکییانە لەبار بوو. لە یەکەمین خولی وتووێژی نێوان دەمڕاستانی ئازربایجان و تاراندا سەرکەوتن بەدی نەهات و دەوڵەت ڕاگەیاندنێکی لە یەکەمی مانگی گوڵاندا دەرکرد و لە خاڵی یەکەمیدا گوتی: «لەبەرئەوەی دەوڵەت بڕوای وایە دامەزراندنی

(٢٩) ئەم شوێنانەمان لە فارسییەکەوە وەرنەگێڕاوە بگرە ڕاستەوخۆ لە ڕۆژنامەی «کوردستان ـ بڵاوکەرەوەی بیری حزبی دیموکراتی کوردستان»مان وەرگرتووە، زمانەکەی کە زمانی کوردی نووسینی ئەوکاتەیە وەکو خۆی هێشتوومانەتەوە بەڵام ڕێنووسەکەیان گۆڕیوە بەهیی خۆمان. بڕوانە: ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە ١٤، ١٣٢٤/١١/٢٤.

سـەرۆکـانـی بەرپرسـیـاری سـوپا و پۆلیس لە لایەنی دەوڵەتەوە بێ بەڵام دەمـڕاسـتـانـی ئازربایجـان لەو باوەڕەدا بوون کـە دەبێ دانانـی سـەرۆکـان بەپێـشنیـازی ئەنجـوومـەنی هەرێمایەتی و پەسندکردنی دەوڵەت بێ بۆیە وتووێژ بێ ئەنجام مایەوە.»

بیـانیـیـەکـان بۆ ئەوەی پاڵەپەسـتـۆیەک بخـەنە سـەر دەوڵەتی ناوەندی، لە تـەورێز و مـەهابادا دەسـتـیـان کرد بەنواندنی چالاکـیی سـیـاسی و لە هەندێک شـوێندا «کە وەک سنووریان لێ بەسەر هاتبوو» خەریکی خۆپێشـانـدانی سـوپایی بوون. تەنانەت بۆ ئەوەی دەوڵەت بترسێ، قـازی مـحەمـەد خۆنواندنێکی گرینگی بەهەمـوو خێڵان «کە ئەو کاتە لە سایەی لەبار بوونی هەواوە دەیانتـوانی چالاکی بنوێنن» لە مەهاباد بەجێ هێنا و، دەستی کرد بەخۆپێشـاندانێکی گـرینگ و، رادیۆی تەورێز بەسـتنی پەیمانێکی گرینگی لە نێوان تەورێز و مەهابادا راگەیاند.

ئەم دەسـتـپـێشـکەرییـە کـارێکی نالەباری لە تاران کـرد، لەبەرئەوەی لەو دەمـەیدا کـە دەوڵەت پێوەبوو لە ڕێگەی وتووێژی ڕاستەوخۆ و ئاشتیخوازانەوە ئۆتۆنۆمیی ئازربایجان لەبار بچوێنێ، ڕۆژی سێشـەمی سێیەمی مـانگی گـوڵان (واتە: ٢٣ نیـسـان ١٩٤٦) ئازربایجان و کـوردسـتـان بەوێنەی دوو دەوڵەتی سەربەخۆ خۆیان راگەیانـد و پەیمانی شەڕ و ئابووریـیـان بەیەکـەوە بەست. لەبارەی ئەو پەیمانە و ئەو مـەرجـانەی تیـایدا تۆمـار کـراون ڕۆژنامـەی کـوردسـتـان نووسـیـویەتی: «...ڕۆژی سێ شـەمـوو ٣ی بانەمـەڕی ١٣٢٥سـاتی پێنجی ئێـواریٚ لە شـاری تەورێز لە عـەمـارەتی مـیللیی ئازربایـجـان بەحـزووری سـەرانی حکوومەتی میللیی کوردستان:

* رەئیسی حکوومەتی میللیی کوردستان جەنابی ئاغای قازی محەمەد،
* ئاغـای سـەید عـەبدوڵڵای گـەیلانـی عـزووی کـۆمـیـتـەی مـەرکـەزیی حیـزبی دیموکـراتی کوردستان،
* ئاغای عومەر خانی شەریفی عزووی کۆمیتەی مەرکەزیی حیزبی دیموکراتی کوردستان و رەئیسی عێلی شکاک،
* ئاغای محەمەد حوسێنی سەیفی قازی وەزیری هێزی حکوومەتی میللیی کوردستان،
* ئاغای رەشید بەگی جیـانگیری عزووی کۆمیتەی مەرکەزیی حیـزبی دیموکراتی کوردستان و رەئیسی عێلی هەرکی،
* ئاغای زێرۆ بەگی بەهادوری عزووی کۆمیتەی مەرکەزیی حیزبی دیموکراتی کوردستان،

* نوێنەری کوردی شنۆ ئاغای قازی محەمەد خدری و،
وە بە حزووری سەرانی حکوومەتیی میللیی ئازربایجان:
* رەئیسی مەجلیسی میللیی ئازربایجان جەنابی ئاغای حاجی میرزا عەلی شەبستەری،
* سەرۆک وەزیری حکوومەتی میللیی ئازربایجان جەنابی ئاغای سەید جەعفەری پیشەوەری،
* معاونی سەدری فیرقەی مەرکەزیی حیزبی دیموکراتی ئازربایجان ئاغای پادگان،
* وەزیری داخلیەی ئازربایجان دوکتۆر سەلامولڵلا جاوید،
* وەزیری فەرهەنگی ئازربایجان ئاغای محەمەد بیریا،

بۆ قایم و مەحکەم کردنی دۆستایەتی کە لە بەینی ئازربایجان و میللەتی کوردستاندا بووە و بۆ پایەداریی صەمیمییەت و دۆستایەتیی زیاتر لە بەینی ئەو دوو میللەتەدا ئەو قەرارانەی خوارەوەیان قەبووڵ کرد و هەردووکیان لەوەدوا لەگەڵ ژیانی خۆیان تەتبیقی دەکەن.

(١) لەو جێگایانەی پێویست بزانرێ هەردووک حکوومەتی میللی نوێنەر دەگۆڕنەوە.

(٢) لە ئازربایجاندا ئەو جێگایانەی کە دانیشتووانی کورد بن کاری ئیداراتی دەوڵەتی بەکوردان دەبێ و هەروەها لە کوردستانیش لەو جێگایانەی کە بەشی زۆری دانیشتوان ئازربایجانی بن لە تەرەف مەئموورانی حکوومەتی میللیی ئازربایجانەوە ئیدارە دەکرێ.

(٣) بۆ حەل بوونی مەوزووعی ئیقتیصادی لە بەینی هەردووک میللەتان کۆمیسیۆنی تێکەڵاو دادەمەزرێ و قەراری ئەو کۆمیسیۆنە بەکۆششی سەرانی ئەو دوو حکوومەتە ئیجرا دەکرێ.

(٤) لە کاتی پێویستدا لە بەینی حکوومەتی میللیی ئازربایجان و کوردستان هاوکاریی پێشمەرگەیی دەکرێ و دەبێ ئەوەی لازم بێ بۆ کۆمەگی یەکتری ئەنجام بدرێ.

(٥) هەر کاتێک پێویست بێ لەگەڵ حکوومەتی تاران قسە بکرێ دەبێ موافیقی نەزەری حکوومەتی میللیی ئازربایجان و کوردستان بێ.

(٦) حکوومەتی میللیی ئازربایجان بۆ ئەو کوردانەی کە لە خاکی ئازربایجاندا دەژین تا ئەو ئەندازەی کە بتوانێ بۆ پێشکەوتنی زمان و تەرەقی پێدانی فەرهەنگی میللیی

وان هەوڵ بدا. هەروەها حکوومەتی میللیی کوردیش بۆ ئەو ئازربایجانییانەی کە لە خاکی کوردستاندا دەژین بۆ پێشکەوتنی زمان و تەرەقی پێدانی فەرهەنگی میللیی وان ئەو ئەندازەی بتوانێ هەوڵ بدا.

(٧) هەرکەس بۆ تێکدانی دۆستایەتیی تاریخیی نەتەوەی ئازربایجان و کورد و لە بەین بردنی برایەتی وە دیموکراتیی میللی وە یا لەکەدارکردنی یەکەتیی وان هەوڵ بدا هەردوو لا بەیەک دەست ئەو مورتەکیبانە بەجەزای خۆیان دەگەیەنن.»(٣٠)- لە ژێر ئەم ڕێککەوتنەدا ئیمزای هەموو ناوبراوان دەبیندرێ.

قازی محەمەد پاش بەستنی ئەم پەیمانە، دەستی کرد بەچالاکی نواندن لە پێناو ڕاکێشانی خێڵان لەبەرئەوەی هەرچەندە ئەو ڕۆڵێکی گرینگی لەناو شاری مەهاباد و دانیشتوانی شاردا دەگێڕا بەڵام سەرۆکی خێڵان هێندە گوێڕایەڵی ئەو نەدەبوون. هەر لەبەر ئەمە بوو سەرەتا کاربەدەستانی بیانی دەیانویست سەید عەبدوڵڵای گەیلانی بۆ سەرۆکایەتیی کۆماری کوردستان ڕاست بکەنەوە بەڵام بەهۆی هەوڵدانی بەڕێز «فەهیمی»یەوە ئەویان لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا نەگونجا و ئەوەبوو ڕوو لە قازی محەمەد کرا.

قازی محەمەد خێڵ و هۆزێکی نەبوو بەڵام سوودی لە هەبوونی بارزانییەکان وەرگرت کە مرۆڤگەلێکی شەڕکەر بوون، بۆ ترساندنی خێڵانی ئێرانی بەکاری هێنان و، دەستی کرد بەدابەشینی چەک و پارە بەناویاندا. ئیتر، تووتن و تۆماکۆی کوردانی دا بەکاربەدەستانی بیانی و لە بەرامبەردا پارە و چەکی وەرگرت. پێناوی ئەم کارەش «ئەسەدۆڤ» بوو کە بەرووالەت دەمڕاستی بازرگانیی سۆڤیەت بوو لە تاراندا.

قازی محەمەد لە کاتی فەرمانڕەوایەتیی خۆی لە مەهاباددا بەکارزانییەکی تایبەتەوە هەڵسوکەوتی کرد، ڕێگەی نەدا کوشتن و جەردەوانی لە شار روو بدەن و ماڵی هاووڵاتیان بەتاڵان بچێ. ئەمە بووە مایەی ئەوەی لە ماوەی دوو ساڵی فەرمانڕەوایەتیی ئەودا تەنیا یەک مرۆڤی دانیشتوانی شار بکوژرێ و، خەڵک حەزێکی تایبەتی بۆ قازی محەمەد پەیدا بکەن. ئەم سیاسەت و کارزانییە وەک لە پێشەکیدا هاتووە، دەوڵەتی ناچار کرد لە سەرەتای گەڕانەوەی هێز بۆ مەهاباد بەشێوەیەکی ئاشتی بجووڵێتەوە و، لە دەسبەسەرکردن و گرتنی خەڵکدا خۆی لابدات. سەیر ئەوەیە لە ڕۆژانی سەرەتادا لیوا هومایوونیی

(٣٠) ئێرەشمان هەر لە ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە ٤٥، ١٣٢٥/٢/١٨ وەرگرتوە.

سەرکردەی هێزگەلی کوردستان لە مەهاباد لە ماڵی قازی محەمەد لای دا و فراڤینی لەگەڵ ئەودا خوارد و باس و خواسێک لەبارەی گرتنی ئەو لە گۆڕێدا نەبوو.

لەو ڕۆژانەدا برای قازی محەمەد ـ کە پێوەندییەکی نێزیکی لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتە بەڕێز ئەحمەد قەوامدا هەبوو لە تاران خەریکی نواندنی چالاکی بوو بۆ ئەوەی ـ بەقسەی خۆی، ئەو بۆندژییەی هەیە لە نێواندا هەڵستێ و دەوڵەت دەست لە دژایەتیی خۆی و خزمەکانی هەڵگرێ. بەهەمان نیاز، سەدری قازی لە تاران بەپەیامنێری ڕۆژنامەکانی گۆت: «من لە ڕێکوپێکیی بەڕێز لیوا هومایوونی و هەڵسوکەوتی هێزگەلی سوپایی لە کوردستاندا زۆر ڕازی و خۆشحاڵم، دانیشتوانیش هەر بەهۆی ئەم بارودۆخەیە بەخۆشییەوە خەریکی بەدەستەوەدانی چەکن.»

لە ڕۆژانی هاتنی مەلا مستەفا و چوونی بۆ تاراندا، قازی محەمەدیش گیرا و دەسبەجێ لێتوێژینەوەی لەگەڵدا دەست پێ کرا. چەند ڕۆژی پاشتر، لە تاران بوو بەدەنگ گوایە «لەبەرئەوەی قازی محەمەد هەندێک شتی گوتووە پێویست بێ سەدری قازیش بۆ ڕوونکردنەوە بچێتە مەهاباد، ئیتر ئەویش گیراوە بۆ ئەوەی ڕەوانەی مەهاباد بکرێ.» ئەم ڕستەیە سەردێری هەواڵی ڕۆژنامەکانی تاران بوو. بەڵام ڕاستی شتێکی تر بوو و سەدری قازی لە نێوان ململانەی دوو هێزدا هەڵکەوتبوو. سەرۆک وەزیران کە پێوەندیی تایبەتیی بەبرایانی قازییەوە هەبوو و، لە سەرهەڵدانی هەرای کوردستانیشدا بەهەمان شێوەی ڕووداوی ئازربایجان بێ تەئسیر نەبوو، دەیویست ئەمانەی لەبەر دەستدابێ بۆ پاڵپەستۆدانی هەندێ لە بەرپرسان لەکاتی پێویستدا. بۆیە حەزی نەدەکرد بگیرێن و سزا بدرێن، لە لایەکی ترەوە بەرپرسانی سوپا کە تێ دەکۆشان دەسەڵاتی دەوڵەت بەسەر سەرتاسەری کوردستاندا بڕەوێنن، مانەوەی ئەمانەیان بەلەمپەر لە پێش ئۆپەراسیۆنی خۆیاندا دەزانی.

بەو شێوەیە، کاتێ کاردارانی پۆلیس لە تاران کەوتنە سۆراغی گرتنی سەدری قازی، ئەو خۆی گەیاندە باڵەخانەی وەزارەتی دەرەکی و چووە دیمانەی سەرۆک وەزیران.

بەڕێز ئەحمەد قەوام پێی گوت: «من ئەوەی پێویست بێ بۆ دەربازکردنی ئێوە دەیکەم بەڵام وا چاترە خۆت بەدەست کاردارانی سوپاییەوە بدەی هەتاکو بۆندژییەکە نەمێنێ.»

سەدری قازی گوتی: «گیرانی من و ناردرانم بۆ مەهاباد واتە بۆ هەمان بەدارەوەکردنە. کارێک بکە بەڵکو لە تاران نەمبەنە دەرەوە و هەر لێرە لە دادگە بدرێم.»

«بەڵام،» سەرۆک وەزیران گوتی: «پاڵەپەستۆی بەرپرسانی سوپا زۆرە و ئیتر هیچم لەدەست نایێ!»

سەدری قازی زۆر ناهومێد و بێ هیڤی لە ژوورەکەی ئەوان چووە دەرەوە، بەجۆرێک ورەی بەردابوو کەوا لە سالۆنی ناوەندیی وەزارەتی دەرەکیدا خۆی بەدیوارەوە هەڵپەسارد هەتاکو نەکەوێتە زەوی. ئەو کاتە، یەکێک لە نوێنەرانی دەستی راستی ئەنجوومەنی چواردە خۆی لێ نێزیک کردەوە و گوتی: «کاک سەدر بینیت حیسێبی ئێوە هەڵە بوو و دەوڵەت بەهێزە؟»

سەدری قازی گوتی: «ئەمە من نیم کە شکاوم، ئەمە سیاسەتی سۆڤیەتە لە ئێران دۆڕاندوویەتی...»

هەرچۆن بێ، سەدر بەترس و لەرزەوە لەگەڵ ئەسکورتێکی (کاروانێکی) سوپایی لە تارانەوە بۆ تەورێز و لەوێشەوە بۆ مەهاباد بردرا. لەوێ لە ژوورێکی بەتەنیایی لە گرتووخانەدا خرایە ژوورەوە. ئەوکاتە، سەیفی قازی و برێکی تر لە هاوەڵانی قازی محەمەد و بنەماڵەکەیان گیرابوون.

لەدادگەدانی گوناحبارانی سەرەکیی وەک محەمەد قازی و سەدری قازی و سەیفی قازی لە دادگەیەکدا کە بەسەرۆکایەتیی بەڕێز عەقید پارسی تەبار و، داواکەری گشتی عەقید فەیووزی پێک هاتبوو، دەستی پێ کرد. لەو دادگەیەدا وتوویژێکی زۆر کرا، داواکەری گشتی گوتەی گرینگی لەبارەی ناپاکی و گوناحی برایانی قازی و هەڤالانی ئەوان خستە روو. گوناحبارانیش دەستهاویژیان لەمەڕ بێ گوناحی و پێوەندیی خۆیان بەهەندێ لە بەرپرسانی ناوەندییەوە پیشان دا. زۆر قسە و باس هاتنە ئارا، پرسی جیاجیا پێشکێش کران و هەردوو لا پێی گەلێک کەسیان لە بەرپرسانی ناوەکی و دەرەکی کێشایە ناوەوە و بەڵگە و نموونەیان هێنایەوە. تەنانەت ئاماژە بەنەوت و داوای راستەوخۆی دەرەکی و هاتنی هەندێ لە بەرپرسانیش دران. ئەوەی پێویست بێ لە دادگەیەکی مێژوویی سوپاییی ئاوەهای سەردەمی شەڕدا روو بدا، رووی دا. ئێمە لێرەدا بەکورتی و بەپوختی ئەوەی بواری قسە لەسەرکردنی هەیە و بۆ بڵاوکردنەوە دەشێ، رادەگەینین هەتاکو خوێنەرانی ئێمە لە چۆنیەتیی ئەم دادگە مێژووییە ئاگەدار بن.

لە کاتی دانای دادگە هێشتا شەڕ لەگەڵ بارزانییەکاندا دەستی پێ نەکردبوو و دەوڵەت سیاسەتێکی توندی لە مەهاباد نەگرتبووە بەر، بگرە لە رێگەی ئاشتییەوە هەنگاوی بەرەو

پێش دەهاوێشت. لەبەرئەوەی هێشتا سەرتاپێی ناوچەکە هێمن نەبووبوو و زۆر لە خێڵان بەتایبەتیش خێڵانی گۆشەی سنووری ئێران و سۆڤیەت و تورکیا چەکدار بوون بۆیە دەوڵەت نەیدەویست پێش دەسەلات شکانی خۆی بەسەر بارودۆخدا ترس و سامێک بنوێنێ. لەبەر هەمان هۆ و بۆ ئەوەی دەسەلاتی واتایەکیی قازی محەمەد لە بار بچێ، بێ وچان پاش دانانی دادگەی سوپایی، دەوڵەت زۆرینەی خێلانی باکور و باشووری بۆ تاران بانگهێشتن کرد و لە ڕۆژی دەیەمی مانگی ڕێبەندان لە تاران لە ڕێورەسمێکی بەشان و شکۆدا هەموو سەرۆک خێلان و پیاوانی ئاین و ماقوولانی کوردستان لە ڕێگەی سەرۆکی ئەرکانی سوپاوە بەخزمەت مەزن ڕێداری پیرۆز شاهەنشا گەیشتن. هەر یەکە و بەگوێرەی پلە و پایەی خۆی بەخەلاتی گوستیلکی ئەلماس و فەرمانی دادوەری و میدالیە و نیشان و داردەست شاناز کران. ئەو کاتە لەگەڵ شانازی پێدانەکەدا هەندێ لە سەرۆک خێلانی مەنگوڕ و مامەش و ئایندارانی گەورە لە خزمەت پاتشادا داوای لەداردانی قازی محەمەد و برا و ئامۆزایەکانیان کرد. ئەوە بوو ئەو ئاخاوتنانە لە ڕێگەی ڕۆژنامە و بەلاڤۆکەوە بەناو خێلاندا بلاوکرانەوە. داوەتکراوەکان بەدیتنی داوودەزگای سوپا و یەکەگەل، توانا و دەسەلات و وزەی دەوڵەتیان زانی بەجۆرێ دوای گەڕانەوەیان جگە لە باسی دژبەریی قازی محەمەد و داوای لەداردانی ئەو، شتێکی تریان نەدەگوت.

پارێزگاری ئازربایجان ئەو کاتە بەڕێز عەلی مەنسوور بوو کە پیاوێکی سیاسەتکار و بەوردە و نەرم بوو، بەری لە دەسدرێژی و تۆڵەسێنی و زەبروزەنگی نابەجێ دەگرت و، بۆ دەستەبەرکردنی خۆشگوزەرانی و هێمنیی دانیشتوان هەتا ئەو شوێنەی لە توانایدا بوایە هەنگاوی دەهاوێشت.

بەم سەروبەر و کارزانییەوە، لێتۆژینەوە لە قازی محەمەد و برا و ئامۆزایەکانی بەبێ سەرهەلدانی ڕوداوی ناخۆش یا خۆپیشاندانی ناپەسند، لە مەهاباد دەستی پێ کرد، بەجۆرێ قازی محەمەد خۆی لە سێیەمین دانیشتنی لێتۆژینەوەدا گوتی: «من ئێستە هەندێک هیوام بەژیانی خۆم ماوە لەبەرئەوەی دەبینم دەتانەوێ لە دادگەمان بدەن بەلام سەرەتا پێم وابوو بێ پێشەکی دەمانکوژن.»

لەبەرئەوەی دادگەی کتوپڕی سەردەمی شەڕ کە لە مەهاباد دامەزرابوو، بەگوێرەی بڕیاری سوپا نەیدەتوانی دانیشتنەکانی خۆی بپسێنێتەوە بۆیە زۆربەی دانیشتنەکان لە سەعات ٨ ی سبەینەوە هەتا نیوەشەو و هەندێک جاریش هەتا سێ سەعاتی پاش نیوەشەو درێژەیان

دەکێشا.

پاش ئەوەی تۆژینەوە لەگەڵ یەکەیەکەی گوناحباران بەجیا بەکۆتا گەیشت، بۆ راوێژکاریەتی، فایل رەوانەی دادگە کرا و بەگوناحباران گوترا بریکار بۆ خۆیان دیاری بکەن. قازی محەمەد لە کاتی دیاریکردنی بریکاردا چەند ئەفسەرێکی لێوەشاوە و بەتوانای سوپای ـ وەک زەعیم عەمید ئەسلانی و عەقید مووسا شاقولی «کە ئەو دەمە بەژیان مابوو» بۆ بریکارەتی هەڵبژارد، بەڵام پێیان گوت: «پێویستە بریکاری خۆت لە ناو ئەفسەرانی ئامادەی مەهاباد و مۆڵگەی ئەم شارەدا هەڵبژێری نەک لە شوێنانی تر لەبەرئەوەی کار کۆسپەی تی دەکەوێ و یاساش رێگە نادا، دوور نییە تۆ بتەوی لە لەندەن بریکار هەڵبژێری.»

قازی محەمەد گوتی: «ئێوە چی بڵێن من وا دەکەم، ئەگەر پێوەندیم بەلەندەنەوە هەبوایە کارم بەم رۆژە نەدەگەیشت. زۆرباشە، لە ناو ئەم ئەفسەرانەی هەڵدەبژێرم، ملم لە موو باریکترە.» پاش ئەوە نەقیب شەریف و چەند کەسێکی تر بۆ بریکارەتیی ئەو و سەدری قازی و سەیفی قازی هەڵبژاردران.

رۆژی نۆزدەی بەفرانبار کە دانیشتن لە پێشبڕیی گوناحبارانی کۆڵییەوە، محەمەد قازی لە سەعات ٨ی بەیانییەوە هەتا سەعات ٢٢ واتە لەو ماوەیەش کە دادگە بەناوی پشووی نانخواردنەوە هەڵدەگیرا، نیزیکەی ١٤ سەعات قسەی کرد و کەموکورتیی جۆربەجۆری لە دادگە گرت. قازی محەمەد بەشێوەیەکی گشتی سێ کەموکورتیی لە دادگە گرت، یەکەم: ئەم دادگەیە دەسەڵاتی بڕیاری لە گوناحەکانی ئەودا نییە لەبەرئەوەی پیاوێکی غەیرە سوپاییە و پێویستە لە دادگەی شارەکیدا، یان لە تاران لە دادگەی سوپاییدا لەژێر لێکۆڵینەوەدا بێت. دووەم: دادگە کاتێکی تەواوی پێ نەدا بۆ بیرکردنەوە و هەڵبژاردنی بریکار. سێیەم: ئەوەیە دەبێ گوناحباران بەیەکەوە بۆ پێش دادگە بانگ بکرێن.

دادگە پاش راوێژ هەرسێ رەخنەکانی ئەوی بەپاش دایەوە. پێشبڕیی یەکەم نابەجێ بوو لەبەرئەوەی دادگەگەلی سوپایی لە شوێنانی پێویستدا بۆ بڕیاردان لە گوناحی کەسانی وەک قازی محەمەد پێک دەهێنرێن و، یاسای سزادانی ئەو کەسانەی لە دژی هێمنیی وڵات رادەپەڕن، بەدادگەی سوپایی دەسپێردرێن، بەتایبەتیش ئەوانەی کاری چەکدارانەیان کردبێ. دووەم: لە یاسادا ٢٤ سەعات مۆڵەت بۆ دانانی بریکار و لێکۆڵینەوەی فایل بەگوناحبار دەدرێ، بەڵام دادگە بۆ قازی محەمەد و سەدر و سەیفی قازی ئەم مۆڵەتەی

هەتا ٤٠ سەعات درێژ کردەوە. لەبارەی لێتۆژینەوەی بانگهێشتن کردنی تاوانبارانیش بۆ پێش دادگە، دادگە رایگەیاند کەوا بۆ ڕێگەگرتن لە ڕێککەوتنی گوناحبارانە کە هەموویان بەیەکەوە نەهێنراونەتە پێش دادگە. لەبەرئەمە ئەو پێشبڕییانە بەرپەرچ درانەوە و دادگە دەستی بە لە دادگەدان کرد.

لە دادگەدا قازی محەمەد بەشێوەیەکی یەکجارەکی بەرتەکی هەڵسوکەوتی دەوڵەتی ناوەندیی دایەوە و گوتی: «من لەم گۆشە دوور هەڵکەوتەی کوردستان و لەم سووچی گرتووخانەیەوە بۆ دەوڵەتی ناوەندی و کاربەدەستانی بەرپرسیاری جاڕ دەدەم و دەڵێم من گوناحبار نیم و ئێوە گوناحبارن. لەبەرئەوەی ئەگەر دەوڵەت لەم چەند ساڵەی دواییدا وزە و دەسەڵات و ویستی ئەوەی هەبوایە هێز بۆ ئەم ناوچەیە بنێرێ و فەرمانڕەوایەتیی خۆی بنوێنێ و دەسەڵات بەسەر بارودۆخدا بکێشێ ئەوا بیانییان پاڵەپەستۆیان نەدەهێنایە سەر دانیشتوانی بەلەنگازی ئەم دەڤەرە و من ناچار نەدەبووم بۆ پاراستنی گیانی خۆم و بنەماڵەم دەست لەم کارە وەربدەم. من لە لایەنی خۆمەوە ئەوەی پێویست بووبێ لە کاتی خۆیدا بەبەرپرسانی بەرزم گەیاندووە و، سەرۆک وەزیران و تێکڕای بەرپرسانم لە هەلومەرج ئاگەدار کردووەتەوە، ئێوە زۆرداری و بێ ڕەحمیمان لە دژدا دەکەن. وەک چۆن دەوڵەتی شاهەنشایی، وێڕای ئەوەی کە باڵیوزخانەی دەرەکی لە تاراندا هەن و لەبەر چاوی نوێنەرانی وڵاتانی جیاجیا و بەئاگەداریی هەموو دنیا لەم بارودۆخە، دەوڵەت چەندان جار لە پێش پاڵەپەستۆی سۆڤیەتدا خۆی بەدەستەوە داوە و فەرمانگەلی ئەو دەوڵەتەی ڕاپەڕاندووە، بۆ پارێزگای جۆربەجۆری وڵات هێزی نەناردووە و ماڵ و گیان و سامانی خستووەتە بەردەستی رووس، ئێمەش ناچاربووین. منیش کە هێز و وزە و سوپام نەبوو ناچار بووم فەرمانی ئەوان بەجێ بهێنم(٣١)، بەخوا ناچار بووم، وەڵڵا ناچار بووم...»

سەدری قازی، بەرگرییەکەی جۆرێکی تر بوو. لەبارەی ئەو شتەی لە خولی نوێنەرایەتیی ئەودا رووی دابوو دەیگوت من پاسەوانەتیم هەبوو و، لەگەڵ کەمینەیەکی پێکهاتوودا هاوکاریم دەکرد. لەبارەی کردەوەکانی ئەم دواییەش دەیگوت من لە تاران بووم و کارێکم نەکردووە. پێویستە من لە دادگایەکی شارەکیدا لە دادگە بدرێم نەک لەم دادگەیەدا.

(٣١) ئەوەی دەماودەم بیستراوە ئەوەیە کە قازی محەمەد گوتوویەتی: «من لەژێر پاڵەپەستۆی ناوچەکەدا ناچاربووم کۆمار دابمەزرێنم و لە دەسەڵاتی ناوەندی جیاببمەوە».

سەیفی قازیش لەبارەی لەبەرکردنی جلکی جەنەرالی ڕۆیشتنی بۆ باکۆ دەیگوت: «حکوومەتی هەرێمایەتیی تەورێز ئەو دەسەڵاتەی بەئێمە دابوو و چاوەڕوان بووین دەوڵەتی ناوەندیش بەرەسمی بمانناسێ. پاش ئەوەی سەرۆک وەزیرانیش منی کرد بەقایمقامی مەهاباد ئیتر وازم لە لەبەرکردنی جلکی جەنەرالی هێنا.»

بێ بەختیی قازی محەمەد و سەدری قازی و سەیفی قازی لەوەدابوو دادوەریی ئەم دادگەیە بەعەقید فەیوزی سپێردرابوو کە سەرۆکی ئەرکانی هێز بوو، لە نێوان ئەندامانی ئەم دادگەیەدا کەسانی وەک عەقید مزەفەری دەبینران کە بەدرێژاییی ساڵێک لەگەڵ قازی محەمەد و ئەوانیتردا سەری پێوەندییان هەبوو و زانیاریی زۆر قووڵیان لەبارەی چالاکی و ئەو نامانەی بەدەسخەتی خۆی لە دژی دەوڵەتدا نووسیبوونی، لەبەر دەستدا هەبوون کە بوواری نکووڵییان بەقازی محەمەد نەدەدا. ئەگەر ئەوان دەیانویست دامەزرانی حیزبی کۆمەڵەی کوردستان و ڕاپەڕینی لایەنگرانی ئەو و سەرجەم کارەکانی تریان بەئەنجامی سیاسەتی بیانییەکان بژمێردرێن و، بەپشت گوێ بخرێن ئەوا دەستهاوێژی تر لەبەر دەستدا بوون پێشانیان دەدا کە قازی محەمەد خۆی و سەیفی قازی و سەدری قازی بەئارەزووی خۆیان هەندێ کاریان کردبوو کە ڕەنگە کاربەدەستانی وڵاتانی بیانی بەهیچ جۆر رایان لەسەر نەبووبێ.

بۆ نموونە لە ئازربایجان، هەرچەندە بناخەی حکوومەت بەکۆمۆنیستی داڕێژرابوو و ئەم نیازە لەگەڵ بنەڕەتی سوڵتانەتی «پاتشایەتی»دا ناکۆکە، بەڵام سەرەڕای ئەمە لە ڕادیۆی تەورێز و بەڵاڤۆکی فیرقەی دیموکراتدا هێرشی توند نەدەکرایە سەر پایەی پاتشایەتی. بەڵام لە مەهاباد بۆ هاندانی خەڵک لە دژی پاتشا و بنچینەی سوڵتانەتیدا لە هیچ کارێک نەدەسڵەمینەوە. تەنانەت بۆ ئەوەی دانیشتوانی وڵاتپارێزی مەهاباد بۆ خۆیان رابکێشن پاتشایان بە«دوژمنی گەلی کورد یا خەڵکی کورد» پێناسە دەکرد. بۆ ئەو مەبەستە ناوبەناو لاوێکیان بەجل و بەرگێکی پڕ لە زێڕ و زیو دەڕازاندەوە و هەندێ چەکداریان دەخستە دەوری و هەڕەشەیان لێی دەکرد. لەسەرەوەشدا تابلۆیەکیان هەڵدەواسی و لێیان دەنووسی:

«بمرێ ئەو کەسەی دژی ئازادیی کوردە».

لە لایەکی ترەوە هەندێ نووسینی ئەو کەوتنە دەست کە ئاشکرایان دەکرد ناحەزی سەڵتەنەتی «مەشرووتە»یە و بەچاوی کینە و رک لە سوپا دەڕوانێ. بەتایبەتیش لەم

بارەیەوە عەقید فەیوزی کە پلەی دادوەری دادگەی هەبوو نووسینێکی پێشان دا خوێنی هەموو ئەفسەرانی هێنایە جۆش و هەستی هەموانی هاڕووژاند. ئەو نووسینە نامەیەک بوو قازی محەمەد بۆ ئەرکانی هێزگەلی کوردستانی نووسیبوو. قازی محەمەد لە وەڵامی پرسیاری سەرۆکی ئەرکاندا کە چەند مانگ پێش ڕوودانی ئەم ڕووداوانە ئەوی بۆ گوێڕایەڵی بۆ پاتشا و یاسا بانگ کردبوو و لە دژبەریکردنی سوپای وریادار کردبووەوە، وەڵامیکی بەسووکایەتییەوە بەشێوەی ژێرەوە دابووەوە:

«ئێوە ئەفسەرانی هەمان ئەو سوپایەن لە دەمی شەڕ و کاتی گیان لەسەر دەستیدا ڕێگەی هەڵاتنتان گرتەبەر و، ئەو شیعرەی شاعیری مەزن فیردەوسی ـ تان بەجێ هێنا کە دەڵێ:

همه سربسر پشت بدشمن کنیم

از ان به که خود را بکشتن دهیم

واتە: هەمووومان بەیەکەوە پشت لە دوژمن بکەین + چێترە لەوەی خۆمان بەکوشتن بدەین». ئاشکرایە ئەم جۆرە کار و نووسینە دوور لە ڕێزە بۆ بەرپرسانی سوپا بەهیچ بارتێک لە بیر نەدەکرا و نەیدەتوانی لە سزا ڕزگاری بکات.

دادوەر جگە لە پێشاندانی دەستهاوێژی پێویست بەدادگە، ئاماژەی بەو گەشتەی خۆی دا کە لە سەردەمی سەرۆک کۆمارەتیی قازی محەمەددا بۆ مەهاباد کردبووی و گوتی: «قازی محەمەد نەک تەنێ سووکایەتیی بەسوپا دەکرد بگرە لە سەردانی ڕۆژی حەوتی گەلاوێژ و یەکی ڕەزبەر و بیست و یەکی گەلاڕێزاندا کە بۆ مەهاباد کردم هەڕەشەی لێ کردم و گوتی: "بەم زووانە هێرش دەکەمە سەر هێزگەلی میری، سەقز و سنە و کرماشانیش دەگرم." لە سەردانی حەوتی گەلاوێژدا لەبەر چاوی من بەجلکی جەنەراڵییەوە خۆنواندنی بەهێزەکانی خۆی کرد.»

قازی محەمەد و سەیفی قازی چوونی باکۆیان نکوولی کرد بەڵام دەستهاوێژی گرینگ بەدەستەوە هەبوون و خرانە بەرچاوی دادگە، ناچار هەردووک دانیان پێدا هێنا و لە ئەنجامدا دەرکەوت قازی محەمەد خۆی دوو جار چووەتە باکۆ. گرینگتر لە هەمووی ئەوە دەرکەوت ئاڵای سێ ڕەنگیی شمشێر و ڕۆژ کە جێگەی ڕێز و سەردانواندنی گشتییە، ئەو گۆڕیویەتی، ڕەنگی سووری بردووەتە سەرەوە و کەسکی هێناوەتە خوارەوە، لە جێگەی شمشێر و ڕۆژدا «ئارم»ی کۆماری کوردستانی کێشاوە.

بریکاری بەرگریکەری قازی محەمەد گوتی: «لە یاسای بنەڕەتیدا شتێک لەبارەی شوێنی ڕەنگەکانەوە نەگوتراوە.»

دادوەر وەڵامی دایەوە: «ئەگەرچی شوێنی ڕەنگەکان دیاری نەکراوە بەڵام گۆڕینیشی پێشبینی نەکراوە. وێڕای ئەمە ئەگەر لە گۆڕینی ڕەنگەکانیشدا چاوپۆشی بکرێ ئەوا گۆڕینی (ئارم ـ دروشم)ی میللی کە شمشێر و ڕۆژە ناشێ نەبینرێ.»

لەبارەی کردوەکانی سەدری قازیشەوە، بەقسەی دادوەر ئاشکرا بوو کەوا ڕۆژی شازدەی سەرماوەز ئەو لە مزگەوتی عەباسی لە مەهاباد ئاخاوتنێکی داوە و خەڵکی بۆ ململانەی هێزگەلی میری هان داوە و گوتوویەتی:

«دەوڵەت ناتوانێ لە هەردوو بەرەی ئازربایجان و کوردستاندا شەڕ بکات. من نێزیکەی سێ ساڵ لە تاران ماوم و چاک شارەزای وڕەی سەرباز و ئەفسەر و ئەفسەرانی پۆلم. دەوڵەت لە سەردەشت و سەقز و تکاودا هێزی نییە، ئێمە بەیارمەتیی (فیدائیانی دیموکرات)ەوە دەتوانین هێزی دەوڵەت تەفروتوونا بکەین. جاران پەلێک لە خێڵان دەیتوانی ماوەیەکی زۆر لە پێش هێزگەلی دەوڵەتدا بووەستێتەوە، ئێستە ئێوە لەوان کەمتر نین. نابێ بترسن، دەبێ شەڕ بکەن و لە بەرامبەری دوژمندا بووەستن.»

دەستهاوێژی تر هەبوون پێشانیان دەدا قازی محەمەد دوو ڕۆژ پێش گەڕانەوەی هێز هەشت هەزار ڕیاڵی لە داراییی بۆکان وەرگرتبوو. جگە لەم کارانە، گوناحێکی لێ خۆش نەبووی تری قازی محەمەد لەبەر چاوی سوپاییەکان ئەوەبوو، بۆ هاوکاری لە محەمەد ڕەشیدی گێڕابووەوە. لە گەڕانەوەی لیوا هومایوونیش لە بیست و دووی مانگی سەرماوەز مەرجی ئاگربڕی بەجێ نەهێنابوو و بارزانییەکانی چەکدار کردبوو و مۆڵگەشی تالان و بڕۆ کردبوو...

لەبارەی سەیفی قازیشەوە زۆر بەڵگە بەدەستی سەرکردایەتیی هێزگەلی کوردستانەوە هەبوون، بۆ نموونە لە مێژووی شەشەمی مانگی خەرماناندا پەنجا قوتابیی بۆ تەواوکردنی خولی کۆلێجی سوپای سۆڤیەتی ناردبووە تەورێز بۆ ئەوەی لەوێوە ڕەوانەی باکۆ بکرێن.

لەو ڕۆژانەدا «حاجی بابە شێخ»ی سەرۆک وەزیرانی قازی محەمەد کە پیرە پیاوێکی دڵنەرم و دوورزەین بوو، ئازاد بوو. ڕۆژێکیان نووسەر لەگەڵ ڕائید دوکتۆر خەمسە سەفا کە یەکێک بوو لە نۆشدارانی لیوەشاوە و ئەو دەمە کیژی حاجی بابە شیخی چارەسەر دەکرد، هەروەها ملازم دوکتۆر عەزیمی کە ماوەیەک لە لای بارزانییەکاندا دیل بوو،

بەیەکەوە چووین بۆ لای حاجی بابە شێخ. ئەو کە ئاگاداری سەرلەبەری چالاکییە سیاسییەکانی قازی محەمەد بوو دەیگوت:

«پاش مانگی گەلاوێژ بیانییەکان هەندێ لە سەرۆکانی کوردیان ـ لەمانەیش قازی محەمەد، بەرەو لای چۆمی ئاراس برد، هێند بەپەلە بوون لە ماوەی بیست و یەک سەعاتدا ئێمەیان لە سەقزەوە گەیاندە جەلفا و لەوێشەوە بردیانینە باکۆ. لە باکۆ لەگەڵ گەلێک لە جەنەرالەکانی رووس کە نەماندەناسین دیمانەمان کرد، هەتا ئەوەی یەکێکیان کە خۆی بەناوی «ئاتاکیشۆڤ»ەوە بەئێمە ناساند، دیمانەیکی دوور و درێژی لەگەڵدا کردین و هەڕەشە و گوڕەشەی دەکرد کە دەبێ فەرمانەکانی جێبەجێ بکەین،» حاجی بابە شێخ دەیگوت: «ئێمە بەهیچ رووێک ئامادەی قەبووڵ کردنی فەرمانەکانی ئەوان نەبووین بەڕادەیەک قازی محەمەد پێوەبوو خۆی دەرمانخوار بکات. پاش ئەوەی پازدە ڕۆژ لەوێ ماینەوە ئینجا گەڕاینەوە مەهاباد.» حاجی بابە شێخ دەیگوت: «من بەگەلێک شێوە راپۆرتی ئەم ورووداوانەم بەکاردارانی دەوڵەت ڕاگەیاند و جاری دووەم خۆم لە چوونی باکۆ بەتەواوی بەدەستەوە نەدا.» ئەو دەیگوت: «قازی محەمەد دوو جار و سەیفی قازی سێ جار چوونەتە باکۆ. لەم گۆڕانانەی دواییشدا ئەو دەمەی دەوڵەت جاڕی دا کەوا دەیەوێ بۆ جێبەجێ کردنی هەڵبژاردن هێز بنێرێتە ئازربایجان، من بەقازی محەمەدم گوت وا چاکترە ئێمەش بروسکە بکەین بۆ ئەوەی هێز بێت. ئەویش رازی بوو بەڵام ئەسەدۆڤ کە «کل فی کل» بوو بەجۆرێک دەستی بەسەرماندا کێشا نەیهێشت هیچ بکەین.» حاجی بابە شێخ دەیگوت: «بەپێچەوانەی نواندنی بیانییەکان ئێمە هەرگیز نەمانتوانی لەگەڵ فیرقەی دیموکراتدا هەڵبکەین، لەبەئەوەی ئەوان دەیانگوت دەبێ ئێوە سەر بەتەورێز بن لە کاتێکدا ئێمە دژ بووین و دەمانگوت پاش ئەم هەموو بەزم و هەرایە ئەگەر بویستری ئێمە گوێ بەفەرمانی تەورێز بین، ئەوا وەک جاران سەر بەتاران دەبین.»

هەرچۆنێک بێ بەگوێرەی ئەو دەستهاوێژانەی بەدەستەوە بوون و ئەو قسانەی لەناو دادگەدا کران، لە دوادوای دانیشتنێکی نهێنی کە زیاتر لە ١٨ سەعات درێژەی کێشا، لە بەرەودواهاتنی مانگی بەفرانبار بەپێی بۆچوونی دادگەی کتوپڕی سوپایی، قازی محەمەدی موفتیی مەهاباد، سەدری قازی «سەدرولئیسلام» نوێنەری پێشووی ئەنجوومەنی ڕاوێژی میللی و، سەیفی قازی «سەیفولئیسلام»، فەرمانی لەداردانیان بۆ دەرچوو. بۆ جێبەجێ کردن، بەرپرسیارانی سوپایی لە تاران لە بۆچوونی دادگە ئاگەدار

کرانەوە بەڵام لەبەرئەوەی لێرەولەوێ قسەوباس لەمەڕ ڕەچاوکردنی زرووفی تاونبارانەوە دەکرا، لە لایەکی ترەوەش بەهۆی ئەوەی هێشتا شەڕ لەگەڵ بارزانییەکاندا دەستی پێ نەکردبوو، دەوڵەت نەیدەویست لەناو ئەو وتووێژە ئاشتیخوازانەیەدا ئەم جۆرە کارە تیژانە لە خۆیدا بنوێنێ. بۆیە جێبەجێ کردنی فەرمانەکە بەدوا خرا هەتا ئەو کاتەی دادگەیەکی تر بەسەرۆکایەتیی بەڕێز عەقید نەجاتوڵڵا زەرغامی بەتایبەتی لە تارانەوە بۆ بڕیاردان چووە مەهاباد. لەبەرئەوەی هیچ تێبینییەکی سیاسی و سەرنجێکی تر نەمابوو بۆیە فەرمانی ئەم دادگە نوێیەش فەرمانی لەداردانی تاوانبارانی وەک دادگەی پێشوو دەرکردەوە. لە شەوی دەیەمی مانگی ئاخەلێوەدا فەرمانەکە جێبەجێ کرا و قازی محەمەد و سەدری قازی و سەیفی قازی بەداری سزاوە هەڵواسران. قازی محەمەد زۆر ڕماو و بێدەسەڵات بووبوو. سەدری قازییش ڕەنگی هەڵبزرکابوو بەڵام دەیویست پتەویی خۆی بپارێزێ. بەڵام سەیفی قازی بەلەشی تێکسمڕاویەوە وەک بێئاگا سەرنجی ترساوی بەملا و بەولادا دەگێڕا و لە دووەکەی تر زیاتر دڵەڕاوکەی پێوە دیاربوو(٣٢).

سێ سەعات لە نیوەشەو تێپەڕی کردبوو گوناحباران هێنرانە بەر پێی دار. لەسەر بان و

(٣٢) نەقیب شەریفی کە حکوومەت کردبووی بەبریکار(وکیل)ی قازی محەمەد لە دادگەدا، ساڵی ١٩٥٦ هەندێ رووی ئەو دادگەیەی خستووەتە روو و دەڵێ: «بەداخەوە بۆ قازی محەمەد، ئەو پیاوە گەورە و دانایە. قازی محەمەد لە بەردەم دادگەدا بەوپەڕی ژیری و بەبێ ترس دەدوا، لە راستیدا ئەو دادگەی لەدادگە دەدا و، حکوومەتی گوناحبار دەکرد کە ناپاکیی لەگەڵ کردووە. قازی محەمەد بەئازایەتی و چاونەترسییەوە بەرگریی نەک هەر لە گەلی کورد بگرە لە تێکڕای گەلانی ئێران دەکرد.» هەروەها دەڵێ: «ئەو قارەمانانە بەرگرییان لە کێشە و بیروباوەڕی خۆیان دەکرد بەجۆرێک کە دادگە پێی سەرسام بووبوو و، ئەوان هەرگیز لە کردەوەکانی خۆیان پەشێمان نەبوون.» هەروەها رائید ئەمیر پەرویز سەرۆکی پۆلیسی مەهاباد لە ژمارە ٥٠ی گۆڤاری (إطلاعات)دا دەڵێ: «کاتی خۆی هەندێ بەرپرسی ئەمەریکاییی سەر بەباڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە تاران لەگەڵ عەقید «پارسی تەبار»ی سەرۆکی دادگەدا لە مەهاباد سەردانی قازیەکانیان لە گرتووخانە کرد و بە«قازی محەمەد»یان گوت ئەگەر کێشەی کورد بەپێی سیاسەتی ئەمەریکا بەرێوە ببەی ئەوا لە مردن رزگارت دەکەین، بەڵام قازی داوایەکەیان رەفز دەکاتەوە و دەڵێ من یەک رووم هەیە و ناتوانم ناپاکی لە گەلی خۆم بکەم.» هەروەها دەڵێ کاتی قازی محەمەدیان بردە بەر پێی دار نەیهێشت چاوی ببەستنەوە و گوتی: من هیچ شەرمەزارییەکم نییە هەتا لە پێش گەل و نیشتمانە خۆشەویستەکەمدا چاوم ببەسترێتەوە، دەمەوێ لە دووا ساتی ژیانمدا نیشتمانە جوانەکەم بەباشی ببینم، بژی کورد و کوردستان.» بۆ زیاتری زانیاری خوێنەر دەتوانێ سەیری: کریم حسامي، قافلة من شهداء کوردستان إیران، ترجمة نزار محمود ١٩٧٣، لاپەڕە ٢٥ـ ٢٦ بکات.

باڵەخانەکانی مەهاباددا برێن داندرابوون. قازی محەمەد سەرەتا نوێژی کرد و پاڕایەوە گوتی: «سەدر بێ گوناحە، خوێنی خۆمتان پێ حەڵاڵ دەکەم برایەکەم ئازد کەن.» لە دادگەشدا ئەو هەر کنەی دەکرد بۆ ئەوەی بێوەری بوونی سەدر پێشان بدات. پاشی ئەو، دوو کەسەکەی تریش بەدارەوە کران. سەدری قازی سەرسڕماویی پێشان دەدا و تکای لێبوردنی دەکرد و واش پێ دەچوو کە بەراستی خۆی بە بێگوناح بزانێ. هەرچۆن بێ، لە ئەنجامی لە ڕێ لادان و پاڵەپەستۆی سیاسەتی دەرەکی، یەکێک لە گرینگترین و دەوڵەمەندترین بنەماڵەکانی کوردستان لەداردران[٣٣].

نێزیکەی دوو مانگ پاش ئەوە، کاتێ مەزن ڕێزداری پیرۆز تەشریفی بۆ مەهاباد برد، ئافرەتێکی ڕەشپۆشی پێچەدار خۆی گەیاندە پاتشا و نامەیەکی پێشکێش کرد. مەزن ڕێداری شا فەرمووی: «ئەم ئافرەتە کێیە؟» عەرزیان کرد «ژنی قازی محەمەدە!» هەستێکی جۆراوجۆر بەشای لاودا سەری کرد. کەس تێ نەگەیشت چ هزرێک لەو کاتەدا بەبیری شای ئێراندا رابورد. مەزن ڕێزداری پیرۆز چەند ترووکەیەک چاوی داخست، پاشان فەرمووی: «هەقتان بەسەر ماڵی ئەمانەوە نەبێ و چاوتان لە پاشماوەکانیان بێ.»

(٣٣) پێشەوا و هەڤاڵەکانی لە ڕۆژی ١٠ ئاخەلێوە ١٣٢٦ «واتە لە ٣٠ ئادار ١٩٤٧»دا لە گۆڕەپانی بەناوبانگی «چوار چرا» لە مەهاباد واتە لە هەمان ئەو شوێنەی لە ڕۆژی ٢ ڕێبەندان ١٣٢٥ «واتە لە ٢٢ کانوون(٢) ١٩٤٦»دا کۆماری کوردستانی لە لایەن قازی محەمەدەوە تێدا جاڕ درابوو، لەدار دران. بەڵام ناو و کردەوەیان هەتا هەتایە بەزیندوویی لە دڵی گەلی کورددا مایەوە.

## شەڕی دووەمی هێزگەلی میری و بارزانییەکان

وەک دەزانرێ مەلا مستەفای بارزان پاش کشانەوەی لە پێش هێزگەلی میریدا لە ئێران، لە ڕێگەی دۆڵی بێنارەوە چووە ناو زەویی عێراق و بەشێوەیەکی کەس پێ نەزان لە نێوان سنوورگەلی عێراق و تورکیادا دەیبردە سەر. لەبەرئەوەی ناوبراو لە لایەن بەرپرسانی تورکیا و عێراقەوە بۆی دەگەڕان، ناچار بەسوودوەرگری لە بانە سنوورییەکان شەوی پێنجی مانگی جۆزەردانی ۱۳۲٦ (واتە ۲٦ ئایار ۱۹٤۷) دێتە ناو زەویی ئێران و دەچێتە گوندی «جیرمێ» و لەوێوە بەرەو گوندی «خشکێ» دەچێ کە ئەویش هەر لە خاڵی سنووردایە.

دەسبەجێ پرسی گەڕانەوەی مەلا مستەفای بارزان، لە ڕێگەی فیرقەی ٤ەوە گەیشتە ئەرکانی سوپا و فەرمانی پێویست بۆ لەبن هێنان و سەرکوتینەوەی ئەوان دەرچوو. فیرقە، یەکەگەلی سوپای بۆ شوون هەڵگرتنی مەلا مستەفا و هەڤالانی ئەو «کە پتر لە ٤٠٠ کەس دەبوون» هەنارد و، شان بەشانی یەکەگەلی پیادە و سوارەی سوپایی دەستیان بەشوون هەڵگرتنی ئەوان کرد. مەلا مستەفا کە بەبنەگە و کەلوپەلەوە گرێ نەدرابوو و هێزێکی بژاردەیشی لە بن دەستدا بوو، بەوپەڕی خێرایی لە ناو زەویی ئێرانەوە و، بەسوودوەرگری لە خاڵە کێوەلانییە ڕژد و تووشەکان، بەرەو باکور کەوتە هەڵکشان. هەرکاتێ هێزگەلی دەوڵەتی لە نێزیکی خۆی ببینیایە و هەستی بەنێزیک بوونەوەی مەترسی بکردایە ئەوا رووکاری خۆی دەگۆڕی و دەچووە ناو ئاخی تورکیا. لەبەرئەوەی مانەوە لە ناو سنووری تورکیاشدا بۆ ئەو دژوار بوو جارێکی تر بەرێنوێنییەکی شاراوە و بەشەو دەهاتەوە ناو زەویی ئێران. بەڵام هەرکاتێ هێزگەلی دەوڵەت شوونیان هەڵبگرتایە دەسبەجێ تووش بەتووشەوە بوونەکەی دەپساند. ئیتر بەم شێوەیە خۆی دەگەینێتە سنووری ماکۆ.

لە ناوچە کێوەلانییەکانی ماکۆ و لەو بانانەی بەناوی چیای «سوسوز» و «سکار» ناسراون و برێتین لە ناوچەی کێواوی و هەزار بەهەزار، هێزگەلی دەوڵەت توانیی تووشی چەکدارە دەسبژێرەکانی بارزانی ببێ و بەشەو لە خاڵێکی ئەو بەرزاییانەی پێشوودا کە «داش فشل»ی پێ دەگوترێ، بەیەکدادانێکی گەرم لە نێوان بارزانییەکان و برێکی بچووک لە هێزی دەوڵەتی رووی دا و شەڕێکی خوێناویی دەستەویەخەی لێ کەوتەوە. نۆزدە مرۆڤ لە بارزانییەکان کوژران و ٦یشیان بریندار بوون. تفەنگێکی تەماتیک و

برنۆیەک و پارابلوومێک و برێکی گەورە لە کەرەستە و تەقەمەنی کەوتنە دەستی هێزگەلی دەوڵەتی(٣٤).

بارزانییەکان کە هەلومەرجەکە بەمەترسیدار دەبینن، لە پەنای رەوەزە بەرد و لە تاریکیی شەودا دەست بەپاشەکشێ دەکەن و بەدانانی هێزێکی کەم لە بەرامبەر هێزگەلی میریدا جارێکی تر بەتووشەوەبوونی خۆیان دەپسێنن و بەرەو باکور دەڕۆن. هێزی دەوڵەت دەستی لە شوون هەڵگرتنی ئەوان هەڵنەگرت هەتا ئەوەی لە ناوچەیەکی هێڵی سنووریی نێوان ئێران و سۆڤیەتدا کە راست کەوتبووە بەرامبەری ئەو بنکە سۆڤیەتییەی (سیراجلی)ی پێ دەگوترا، چەکداران لە چۆمی ئاراس پەڕینەوە و پەنایان بۆ ئاخی سۆڤیەت برد.

لە لێواری چۆمی ئاراسدا چەکداران برێکی گەورە لە چەک و تەقەمەنی و دەوار و کەلوپەلی خۆیان، وەک: ٢٠٤ تفەنگی برنۆ، ١٥ تفەنگی جۆراوجۆر، نێزیکەی ١٦ چەکی بەرپشتێن و نێزیکەی ٦٠ هەنارۆکی دەستی و ٢٥٠٥٠ فیشەک و هەندێ هەسپ و هێستر و وڵاغ و چەند تەلیسێک جل و بەرگیان بەجێ هێشتبوو و لە چۆمی ئاراس دەربازی ئەوبەر بووبوون.

(٣٤) نەجەف قولی لێرەدا وەک زۆربەی شوێنەکانی تر زانیارییەکانی بەچەوتی تۆمار کردووە، راستییەکە بەم جۆرەی خوارەوەیە:
لەو شەڕەدا چوار کەس لە پێشمەرگەکانی بارزانی شەهید بوون بەم ناوانە: مل لیری، حەجی گویزی، محەمەد مەلا محەمەد مێرگەسۆری و ساڵح لیری، چواردە کەسیش بریندار بوون، بەڵام زیانی دوژمن سەتان کوژراو و بریندار بوو و ٢٧١ کەسی تریشیان بەدیلی کەوتنە دەستی بارزانییەکان کە پاشی تەواوبوونی شەڕ بەرەڵلایان کردن، هەروەها سەتان پارچە چەک و پەنجا وڵاخ بەباری تەقەمەنی و ئازووخەوە بوون بەدەسکەوتی بارزانییەکان، ئەو وڵاخانە بۆ گواستنەوەی برینداره‌کان زۆر بەکەڵک بوون لەو کات و ساتەدا. ئەو شەڕە کە لە ٩ هەتا ١١ی مانگی ئایاری خایاند بارزانییەکان تیایدا دەستپێشکەربوون و ئەوان هێرشیان بردبووە سەر سوپای ئێران و دەستێکی گەورەیان لێ وەشاندن. سوپای ئێران لەو شەڕەدا کە بەخەیاڵی خۆی گەورەترین هێزی بۆ سەرکەوتن و لە ڕەگەوە برینەوەی بارزانییەکان کۆکردبووەوە بەجۆرێک لووتی شکا کە نەیتوانی بۆ ماوەی چەند ڕۆژی پاشتریش خۆی بگرێتەوە هەتا ئەوەی بارزانییەکان فریا کەوتن لە ئاوی ئاراس بپەڕنەوە و دەرباز ببن. خوێنەری بەڕێز دەتوانێ بۆ وەرگرتنی زانیاریی ورد و تەواو بگەڕێتەوە سەر کتێبی بەڕێز سەرۆک مەسعود بارزانی لەبارەی شۆڕشی بارزان ١٩٤٥ـ ١٩٥٨، لاپەڕە: ٨٩ ـ٩٠.

له ئێران، بەداخەوە ئەفسەران و بەرپرسانی سوپا و میری، هێشتا خوویان بەراپۆرتی ڕۆژانە و ڕێکخستنی دەفتەری بیرەوەرییەوە نەگرتووە. بەبیانووی جۆراوجۆر، تۆماری بەسوود و گشتی کە خزمەتی مێژووی ئێران بکات و، بەسەرهاتی شاراوە شرۆڤە بکات و، بەشە تاریکەکان ڕووناک بکاتەوە، لە پاش خۆیان بەجێ ناهێڵن. ئەو دەمەی لەسەر کارن دەست لە هیچ تیژییەک ناپارێزن بەڵام کاتێ لە سەر کار نامێنن ئیتر دەبن بەلایەنگیری گەل، خولیای سیاسەتی چەپ دەکەوێتە سەریان و سەری زمان و بنی زمانیان دەبێ بەجنێو و نەفرەت و، دەبن بەپشتەوانی هەژاران و لایەنگیری چاکەکاری.

گەڕانەوەی سەرلەنوێی مەلا مستەفای بارزان لەگەڵ مرۆڤگەلی دەسبژێری خۆیدا بۆ ناو زەویی ئێران و چوونی بۆ سۆڤیەت، بوو بەمایەی سەرهەڵدانی بۆنگژییەکی گەورە لە تاراندا. هەندێ لەوانەی ناحەزی داوودەزگای ئێستەی سوپان ئەم بابەتەیان کرد بەبیانووی گلەیی و، تێپەڕینی ئەویان بەناو زەویی ئێراندا ـ سەرەڕای ئەوەی یەکەگەلێکی مشە و هێزێکی تەواو لە ئازربایجانی ڕۆژئاوادا هەبوون کە ئەو کاتە دەگەیشتە یازدە کەتیبەی پیادە و دوو فەوجی سوارە و چەند هاوەن و دوو پۆل لە هێزی ئاسمانی، بەمایەی سووکایەتی بۆ دەوڵەت دەژمارد. بەڵگەنەویستە ئەگەر نەمانەوێ لەگەڵ ئەواندا هاوبیر بین و ئەم کارەی مەلا مستەفاش بەکارێکی سووکایەتی پێکەر دابنێین، ئیتر ناتوانین سستی نواندنی هەندێ لە بەرپرسان نەبینین و پەسنی ئەم هەڵسوکەوتەیان بدەین و پێناسەی بکەین. ڕاستییەکەی ئەوەیە وەزارەتی شەڕیش دەسبەجێ هەستی بەهەڵەی هەندێ لە سەرکردەکان و چەوتیی ئەوان لە پێشبڕی کردنی بارزانییەکاندا کرد و، بەناردنی نێردەیەکی تایبەتیی سوپا کەوتنە لێکۆڵینەوە و پلەی هەندێ لە ئەفسەرانیان داگرت و هەندێکی تریشیان گرتن.

لەم ڕووداوەدا بابەتێکی تر کە شایەنی لێکۆڵینەوە بێ ئەوەیە چ دەستێ بوو مەلا مستەفای هێنایەوە زەویی ئێران و چۆن بوو ڕاست لە هەمان ئەو کاتەی مەزن ڕێزدای پیرۆز لە ورمێ و مەهابادا خەریکی گەڕان و سەردان بوو، مەلا مستەفا هێرشی کردەوە ناو ئێران! وەک خوێنەرانی بەڕێز ئاگەدارن، مەزن ڕێزداری پیرۆز شاهەنشا لە ڕۆژی دووی جۆزەردانی ١٣٢٦ (واتە٢٣ ئایار ١٩٤٧)دا لە تارانەوە بۆ ئازربایجان تەشریفی برد بۆ ئەوەی لە نێزیکەوە داواکاریی خەڵکی پێ بگا و لەپێناو ڕاستکردنەوەی بارودۆخی دانیشتوانی ئازربایجاندا فەرمانگەلی پێویست بفەرمووێ.

سەیر ئەوەیە بزووتنەوەی شا لە تەورێزەوە بەرەو خووی و ورمێ لەگەڵ هاتنی مەلا مستەفا و چەکدارانی ئەو بۆ ناو ئێراندا هاوکات بوو. هەرچەندە ئەو بڕیاری چوونە سۆڤیەتی دابوو بەڵام نێزیکەی بیست ڕۆژ لە ناو پێچ و پەنا مەزنەکانی چیای ئاگری و نەواڵی قووڵی کێوەکانی سنووردا خۆی حەشار دا و پاش ئەوەی لە هەموو لایەکەوە هێزگەلی سوپا کەوتنە شوێن پێی، ئیتر ئەوەبوو پەنای بۆ زەویی سۆڤیەت برد. دوور نییە هەندێ لە بیانییان «بەبۆچوونی نووسەر» دەستیان لەم کارەدا هەبووبێ و بەدژی پاتشای مەزن ئەنجامیان دابێ و ویستبێتیان بەم کارە مەترسیدارە ئەنجامێکی نالەبار بۆ ئێران بهێننە کایە، بەڵام دواجار سەرکەوتنیان نەهێنایە دی.

لەبارەی ئەم ڕوداوە و هەندێ لەو پێکدادانە مەترسیدارانەی لە ماوەی یەکساڵەی ئۆپەراسیۆنی کوردستان لە نێوان هێزگەلی میری و ئاژاوەگێڕاندا ڕوویان دا و، بەو جۆرەی خەڵک چاوەڕوان بوون هەرچەندە لە ڕووی ژمارە و چەکەوە بەلای سوپادا بوو بەڵام نەیتوانی جێ پەنجەیەکی بتەو پیشان بدات. هەندێ لە ئەفسەرانی زانا کە بڕێکیان سەرچاوەی کاری گرینگیشن، نامەی پڕ ڕێز و نەوازییان بۆ نووسەر نووسیوە و سەبارەت بەو چەوتییانەی لە بەرگی یەکەمدا من چاوم لێ پۆشیون داخی خۆیان دەربڕیوە.

پێویستە برایانی ئازیز بزانن، نووسەر بەبێ پێڕەوی لە شوێن پێی هەندێ لەوانەی پێنووسەکانیان بۆ دەرۆزە بەکاردێنن و وەک باوکی خۆیان بەکلکەسووتێ و پاڕانەوە و کاری ئاوهایی دەیانەوێ نان بخۆن و بەپێش بکەون. لە نووسینی ئەم دوو بەڵاقۆکەدا من پێڕەویم لە هەستی خۆم نەکردووە و بەرژەوەندیی خۆمم بەسەر بەرژەوەندیی گشتیدا نەشکاندووەتەوە. بەخۆبەختکەرییەکی بێ وێنەوە ـ لەو کاتەیدا دەمتوانی ڕاستی بگۆڕم و، لە جیاتی وردبوونەوە لە پرسگەلدا، بەپەسن دانی خۆم و داوودەزگای میری و کۆڕی دەسەڵاتداران، خۆم ڕەپێش بکەم، هاتووم ئەوەی ڕووی داوە و من لێی ئاگەدار بوومە نووسیومە.

بەڵگەنەویستە لەشکر کێشییەکانی ئازەربایجان و مەهاباد بوونە هەل بۆ گەلێک سوودوەرگری و گەلێک مافیش پێپەست کران، بەڵام ئەگەر شێوەی کاری زۆر کارگێڕی و داوودەزگا و مرۆڤگەل لەبەرچاو بگیرێن ئەوا دەتوانین بەڕاشکاوی بڵێین لەم کردەواندا تای تەرازووی کاری بەسوود و گشتی سووکتر بووە لە باری گوناحی هەندێ لە کەسانی ناڕاست کە بەداخەوە لەم کۆمەڵگە پیرۆزەدا هەن و بەجلکی سەربازی شانازکراون.

لەبەرئەوەیش کۆمەڵگەی ئێمە بەشێوەیەکی گشتی لە چەپەڵی بێوەری نەبووە بۆیە لە سوپاشدا ئەم جۆە مرۆڤە ناپاک و درۆزن و فێڵبازانە هەر ئاوها درێژە بەژیانی شەرمێونی خۆیان دەدەن. لە لایەکی ترەوەش لەبەرئەوەی مەبەستی نووسەر لە نووسینی ئەم کتێبەدا تەنیا باسی کردوەگەلی سوپایی بووە بۆیە لێرەدا ئاماژەمان بەهەڵسوکوتی ئەو جۆرە مرۆڤانە نەداوە.

لەبارەی بۆچوونی من لەمەڕ ئەو کردەوانەی لە ئازەربایجاندا کران پێویستە بەبیرانی بێنمەوە کە پاش روودانی پێشهاتی سەرماوەزی ۱۳۲۵ و گیرسانەوەی هێزگەل لەو هەرێمانەدا، دوو هەل هاتنە پێش بۆ سەرلێدانی برایانی ئازربایجانی کە بەداخەوە نەمویست و نەمتوانی سوودیان لێ ببینم. لەبەرئەوەی نەلەخۆمدا وزەی بینینی لاوانی هەستیاری بێکار و چارەڕەشم هەبوو نەتوانای ململانەیەکی ئاشتییانە لەگەڵ ئەوانەی ببوونە سۆنگە و سەبەبکار. تەنانەت ئەو دەمەی ساڵی رابردوو یەکێک لە مرۆڤە بەروومەتەکانی ئازربایجان بۆ موتالای ورەی خەڵک، نووسەری بانگهێشتن کرد بۆ ئەوەی ماوەیەک لە ئازەربایجانی بەسەر ببەم، بەدڵناڕەحەتییەوە ئەو بانگهێشتنەم بەپاش دایەوە و گوتم دیمانەی ئازربایجانییەکان لەم هەلومەرجە نالەبارەدا من خەبار دەکا و ناچارم دەکا هەمان ئەو رستەیە بڵێمەوە کە «ئەریک ماریا ریمارک»ی ئەڵمانی گوتبووی. ئەم پیاوە نووسەری کتێبی بەناوبانگی «لە بەرەی رۆژئاوادا هەواڵی نوێ نییە»یە، کاتێ گەڕانەوەی هێزگەلی ئەڵمان پاش شەڕی چوارساڵە و پاشی شکانێ، بۆ وڵاتی خۆی باس دەکا و دەڵێ: «وەک ئەمە وابوو زایەڵەی بەیەکترکەوتنی زەمزەمی و تفەنگ و ئەسپابی تری سوپای ئێمە ئەو راستییەی ئاشکرا دەکرد کە ئەو خۆبەختکەرییانە هەمووی بۆ هیچ بوون، هیچ! بۆ من و ئەوانی لە گوێن منن کە شایەدی ئەم هەست و قوربانی و، سەیرکەری ئەم چارە کلۆڵییەم، چ چاری تر نییە تەنیا ئەوە بڵێم هەندێ لەم کارانە هەر بۆ پاڵەپەستۆ بوون و بۆ تالان.»

لەم کتێبەدا لە بارەی هەڵەی هەندێ لە ئەفسەرانی بچووک و فەرماندەی یەکەگەل هەندێ شت نوسراون کە نابێ ببێتە هۆی دڵ رەنجانی ئەوان یا کەسانی سەر بەبنەماڵەکانیان، لەبەرئەوەی بۆ ئەفسەر واتە ئەو مرۆڤانەی ئامادەی گیان لەسەر دەستێن رووداوی نالەباری شکان یا بەدیل بوون لەوە بترازێ کە دەبێ ببێتە مایەی پوختەیی و لێوەشاوەیی نابێ هیچ بەرکەوتێکی تری لێ بکەوێتەوە. هیوام وایە بەرپرسانی کاری

سوپا بێ ئەوەی گوێ بدەنە قسەی ناحەزان، سوود لە بابەتەکانی ئەم کتێبە بۆ چاککردنی سوپا وەربگرن و کارێک بکەن لێوەشاوەییی ئەفسەران و پلەداران و کەسانی ئۆپەراسیۆنی سوپا زیاتر بکەن و، بنچینەی واتایەکیی سوپا بتەو بکەن و بەبێ خۆهەڵنان بڕوای خەڵک بەرەو ئامانجی نەتەوەیی ڕێنوێنی بکەن.

# ڕۆژەژمێری ڕووداوە گرینگەکان

١٩٤٣ تەمووز ١٢: بارزانیی نەمر شان بەشانی دوو لە هاوەڵانی خۆی بەناوی مستەفا عەبدوڵڵا و سلێمان سۆرە لە سلێمانی دەرکەوتن و لە ڕێگەی کوردستانی ئیرانەوە بەرەو بارزان گەڕانەوە بۆ دەست پێ کردنەوەی شۆڕش.

١٩٤٣ تشرین(١) ٢: گرتنی بنکەی پۆلیسی شانەدەر کە یەکەمین کردەوەی پێشمەرگانەی بارزانی بوو دوای گەڕانەوەی بۆ بارزان.

١٩٤٣ تشرین(١) ١٢: شەڕی بەناوبانگی خێرەزووک کە تیایدا بارزانییەکان دەستێکی گەورەیان لە سوپای عێراق وەشاند و ئەو شەڕە زۆر دەنگی دایەوە.

١٩٤٣ کانوون(١) ١٢: خوا لێخۆشبوو شێخ ئەحەدی بارزان و هەڤالانی و خێزانەکانیان ڕێگەیان پێ درا بچنەوە بارزان.

١٩٤٥ ئاب ١٥: دامەزرانی حیزبی دێموکراتی کوردستان لە شوێنی «کۆمەڵەی ژ.ک»دا لە شاری مەهاباد.

١٩٤٥ ئەیلوول ١٢: ئاڵای کوردستان لە شاری مەهاباد بەرزکرایەوە.

١٩٤٥تشرین(١) ١١: سەردانی قازی محەمەد و سەیفی قازی و هەندێک لە سەرۆک خێڵانی کورد بۆ باکۆ.

١٩٤٥ کانوون(١) ١٢: پەڕینەوەی بارزانییەکان بەخۆیان و ماڵ و منداڵیان کە ژمارەیان نێزیکەی دە هەزار کەس دەبوو بۆ دیوی کوردستانی ئێران.

١٩٤٦ کانوون(٢) ١٥: کۆماری ئازربایجانی ئۆتۆنۆمی لە تەورێز لەلایەن جافەر پیشەوەرییەوە ڕاگەیەندرا.

١٩٤٦ کانوون(٢) ١١: دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی کوردستان ـ بڵاوکەرەوەی بیری حیزبی دێموکراتی کوردستان، لە مەهاباد.

١٩٤٦ کانوون(٢) ٢٢: کۆماری کوردستان لە شاری مەهاباد لەلایەن قازی محەمەدەوە و بەئامادەبوونی بارزانیی نەمر ڕاگەیەندرا و قازی محەمەد بوو بەپێشەوا و سەرکۆماری کوردستان، پلەی جەنەراڵ بەبارزانیی نەمر درا و، بوو بەسەرپەرشتیاری سوپای کوردستان.

١٩٤٦ نیسان ٢٣: پەیمانی دوو قۆڵیی هەردوو کۆماری ئازربایجان و کوردستان لەشاری

تەوریز، ئەم پەیمانە ڕێککەوتنێکی سیاسی، سەربازی، ئابووری و ڕۆشنبیری بوو کە تیایدا هەردوو کۆمار وەک دوو وڵاتی سەربەخۆ خۆیان پێشان دا.

١٩٤٦ ئاب ١٦: دامەزرانی پارتی دیموکراتی کوردستان.

١٩٤٦ ئاب ١٦: لەدایکبوونی بەڕێز سەرۆک مەسعود بارزانی.

١٩٤٦ کانوون(١) ١٦: سوپای ئێران بەبێ شەڕ چووە ناو شاری مەهاباد و کۆتایی بەژیانی کۆماری کوردستان هات کە تەنیا ٣٣٠ ڕۆژ ژیا.

١٩٤٦ کانوون(١) ١٨: گیرانی پێشەوا قازی محەمەد و سەیفی قازی و هەندێ لە بەرپرسانی تری کۆمار.

١٩٤٦ کانوون(١) ٣١: گیرانی سەدری قازی.

١٩٤٧ ئادار ١٩: شەڕی بەرەی شنۆ و نەغەدە لە نێوان بارزانییەکان و سوپای ئێراندا.

١٩٤٧ ئادار ٢٥: شەڕی هەڤرس و هەلەج لە ناوچەی مەرگەوەڕ لەنێوان بارزانییەکان و سوپای ئێراندا.

١٩٤٧ ئادار ٣٠: لەداردانی قازی محەمەد و سەدری قازی و سەیفی قازی لە شاری مەهاباد لەلایەن دادگەیەکی سەربازیی حکوومەتی ئێرانەوە.

١٩٤٧ ئایار ٢٣: چوار باڵەفڕەی عێراق و ئینگلیز هێزی بارزانییەکانیان لە گوندی «درێ» بۆمباباران کرد.

١٩٤٧ حوزەیران ١٧: پەڕینەوەی دەستەی یەکەمی هێزی بارزانییەکان لە ئاوی ئاراس و چوونیان بۆ دیوی رووسیا.

١٩٤٧ حوزەیران ١٨: پەڕینەوەی بارزانیی نەمر لەگەڵ دەستەی دووەمی هێزی بارزانییەکان لە ئاوی ئاراس و چوونیان بۆ رووسیا.

١٩٤٧ حوزەیران ١٩: لەسێدارە دانی چوار ئەفسەرەکە (خەیروڵڵا عەبدولکەریم، عیزەت عەبدولعەزیز، محەمەد مەحموود قودسی و مستەفا خۆشناو) لە بەغدا لەلایەن حکوومەتی عێراقەوە.

ئەبولحەسەن تەفرشیان

# بارزانی
## خۆی بەدەستی کەسەوە نادات

بیرەوەری

# پێشەکی

پەڕینەوەی بارزانیی نەمر و هێزی شەڕکەری بارزانییەکان وێڕای خەباتکار و ڕووناکبیرانی تری کوردستانی عێراق بۆ کوردستانی ئازادی دیوی ئێران لە ساڵی ١٩٤٥دا و، پشتەوانییان لە دامەزراندن و چەسپاندنی کۆماری کوردستانی دیموکراتیدا یەکێکە لە ڕووداوە سیاسییە گرینگ و سەرنج ڕاکێشەکانی بزووتنەوەی کورد لەم سەدەیەدا. ئەو ڕووداوە و ڕووداوەکانی تری بەدوایدا هاتن وەک: بەرگری کردنی بارزانییەکان لە کۆماری کوردستان، بەرگری لە خۆکردن و کشانەوەی خۆیان و خێزانەکانیان بەنێو چیا و چۆڵی ئاسێ و بەفرگرتووی سەر سنوورەکان و ئەو قوربانییانەی لەبەرامبەر شەڕگێڕیی هێزی سوپای ئێران بەدەم ڕێگەی کشانەوەدا دایان، هەروەها باسی ڕێگەبڕین و کۆچە مێژووییەکەی بارزانی و هاوەڵەکانی بۆ یەکەتیی سۆڤیەت و مانەوەی دووازدە ساڵیان لەو وڵاتەدا، هەتا ئێستەشی لەگەڵدابێ بوونەتە مایەی سەر سڕمان و بەدووادا چوونی نووسەر و لێکۆڵەوانی بیانی زیاتر لە هیی خۆماڵی.

پشتەوانیی بارزانی و هێزە لایەنگرەکانی ئەو، لە خۆگرتن و بەخۆداهاتنی کۆماردا، بنچینەیەکی گرینگی متمانە پەیاکردنی سەرکردەکانی کۆمار و حیزبی دیموکرات و تەواوی گەلی کورد بوو لە چاوەڕوان بوونی ئاسۆی ڕووناکی پاشەڕۆژدا. تەنانەت لە لێکۆڵینەوەی ئەو شەڕانەی بارزانییەکان لەدوای ڕمانی کۆماردا تووشی بوونەوە و ئەو قارەمانەتییانەی لەبەرامبەر دوژمناندا نواندیان، گەلێک لە لێکۆڵەوان پێیان وابووە ئەگەر سەرکردەکانی کۆمار وا بەزوویی خۆیان بەدەستەوە نەدایە دوور نەبوو کۆماریش وا بەئاسانی کورتە تەمەن نەبێ و دوژمنیش ناچار ببێ لەبەرامبەر هەندێ لە داخوازییەکانی گەلی کورددا کۆڵ بدات.

نابێ ئەوەشمان لە بیربچێ کە هەبوونی هێزی بارزانییەکان لەو نێزیکانەی دەوروپشتی مەهاباد بۆ سوپای ئێران هێشتا بەمەترسییەکی گەورە دەژماردرا و لەناو شاری مەهاباددا بەردەوام بانگەشەی ئەوە هەبوو کەوا بارزانییەکان ئێستە نا ئێستە هێرش دەکەنەوە و شار دەگرن و قازی و هاوەڵەکانی ڕزگار دەکەن، ئەمە خۆی لە خۆیدا بووبوو بەهۆی ئەوەی سوپا نەپەڕژێتە سەر جێبەجێ کردنی پیلانی کوشتوبڕ لەناو مەهاباد یان ئەوەی هەر بوێرێ بیری لێ بکاتەوە.

پێشەوا قازی محەمەد و سەدری قازیی برای و سەیفی قازیی ئامۆزای، بەپێچەوانەی

ئەو بەڵێنەی لیوا هومایوونی - سەرکردەی سوپای ناردراو بۆ کوردستان دابووی، گیران و خرانەبەر لەدادگەدانێکی بەڕواڵەتی سوپایی و دووای نێزیکەی سێ مانگ و نیو مانەوە لە گرتووخانەدا، لە شەوی ۳۰ی ئاداری ۱۹٤۷ لە ناو شاری مەهاباد بەدارەوە کران. جێگەی خۆیەتی لێرەدا وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە: ئایا بۆچی بارزانییەکان هێرشیان نەکردەوە سەر مەهاباد و قازی و هەڤاڵەکانی ئەویان لە گرتووخانە دەرنەهێنا ؟

سەرۆک مەسعوود بارزانی لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی «بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد - شۆڕشی بارزان ۱۹٤٥ - ۱۹٥۸»دا باس لە رووداوەکەی گوندی «سێلوێ» دەکات و دەڵێ زانیاریی بڕواپێکراو هەبوون کەوا هەندێ لە ئاغاکانی خێڵی مامەش چەکیان لە حکوومەتی ئێران وەرگرتووە و بەڵێنیان داوەتێ شوێنە گرینگەکانی بەرپاڵی چیای سپیرێز هەتا دەگاتە چۆمی گادەر بگرن. ئەمەش مەترسییەکی گەورەی دەخستە سەر چارەنووسی بارزانییەکان. بۆیە هێزێکی بارزانی ڕۆژی ۲۳ شوبات ۱۹٤۷ بەرەو گوندی سێلوێ جوولا. سەرۆکانی مامەش ئەو دەمە کۆبوونەوەیەکی گرینگیان لەو شوێنەدا دەکرد. هەرچەندە هێزەکەی بارزانی تەنیا فەرمانی ئەوەی هەبوو ئەو ئاغایانە چەک بکات و، بەدیل بیانگرێ و بیانبات بۆ شنۆ بەڵام کاتێ گەیشتنە گوندەکە، بەهۆی لەیەکتر حاڵی نەبوونی هەردوولا شەڕێکی کتوپڕ رووی دا، دوازدە کەس لە مامەشەکان کوژارن و دوو کەسیش لە پێشمەرگەکانی بارزانی شەهید بوون.

ئەو رووداوە چاوەڕوان نەکراوە، بوو بەهۆی کرژبوونی دۆخەکە و نەمانی متمانە لە نێواندا. ولیام ئیگلتن لە کتێبی «کۆماری کوردی ساڵی ۱۹٤٦»دا دەڵێ رووداوەکەی سێلوێ مەترسیی خستە سەر بزووتنەوەی بارزانییەکان لە گەڕانەوە بۆ مەهاباد و رزگارکردنی قازی محەمەد و گیراوەکانی تر لەبەرئەوەی ئەو شارە شوێنی دەسڕۆیشتنی خێڵی مامەش و هاوپەیمانەکانیان بوو.

دووای هەڵاتنی سەرکردەکانی کۆماری ئازربایجان و گیران و بەدارەوەکرانی سەرکردەکانی کۆماری کوردستان، تەنیا هێزی بارزانییەکان مابوو مایەی مەترسی بێ بۆ رێژیمی ئێران، بەتایبەتیش لەبەرئەوەی ئەو هێزە لەناوچەکانی نێزیکی سنووری سۆڤیەتدا دەژیان و شیمانەی ئەوە هەبوو بەرهەڵستکارانی ئازربایجان و کوردستان بتوانن بەهۆی ئەم هێزەوە جارێکی خۆیان کۆبکەنەوە و تێ هەڵبچنەوە. هەروەها پێشتریش رێژیمی شای ئێران هەتا بڵێی لەو هێزە «بیانی!»یە دڵپڕ و سەغڵەت بوو، ئەمەش بەهۆی ئەو

بیرەوەرییە ناخۆشانەی لەگەڵیاندا هەیبوو. بارزانییەکان لە شەڕەکانی «قاراوە» و «مامەشا» لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا زەبری گەورەیان لە سوپای ئێران دابوو. بەڵام بەرپرسانی سوپا دەیانزانی رووبەڕووبوونەوەی ئەو هێزە ئازا و شەرکەرە کارێکی هێندە ئاسان نییە و، زاڵ بوون بەسەریاندا لە ڕێگەی شەڕەوە خەونێکە نایەتە دی، بەتایبەتیش لەبەرئەوەی بارزانییەکان بەهۆی دەست بەربوونیان لە حەوانەوە لە زەویی کوردستانی عێراق و ئێران، شەڕی مان و نەمانیان دەکرد. بۆیە بەرپرسانی میریی ئێران کەوتنە داو دانانەوە و جێبەجێ کردنی هەوڵی خاپاندن، بارزانیی نەمریان بانگهێشتن کرد بۆ تاران بۆ ئەوەی لەوێ دیمانەی شا و سەرۆک وەزیران و سەرۆکی ئەرکانی سوپا و بەرپرسانی تری بەرز بکات و چارەسەرێک بۆ کێشەی نێوان بارزانییەکان و میریی ئێران بدۆزنەوە. لەوێ چەند ڕێگەچارەیەکیان خستە بەردەمی بارزانی کە دەبوو یەکێکیان هەڵبژێرێ، گرینگترینی ئەو ڕێگەچارانە، دووان بوو:

(١) بارزانییەکان چەک فڕێ بدەن و خۆیان بەدەست میریی ئێرانەوە بدەن.

(٢) دەسبەجێ زەویی ئێران بەجێ بێڵن و لەو ڕێگەیەی لێوەی هاتوون بگەڕێنەوە.

شایەنی باسە کاتی ئەو وتوویژانە کەوتبووە مانگی بەفرانبار و ڕێبەندانی ساڵی «١٩٤٦ - ٤٧»ەوە و، ئەو ڕێگەیەی بارزانییەکان ناچاز دەبوون «لە باری هەڵبژاردنی ڕێگەچارەی دووەمدا» بیبڕن، کەوتبووە کێوەڵانێکی هەزار بەهەزاری بەفرگرتوو، وێڕای ئەمە ئەگەر بشیانتوانیایە ئەو ڕێگە گیراوە ببڕن، ئەوا هەر بەپەڕینەوەیان لە سنوور و ئاوابوونیان بۆ کوردستانی دیوی عێراق بەرەنگاری پێشوازیی گەرمی باڵەفڕەکانی عێراق و ئینگلیز دەبوونەوە، لەبەرئەوەی بارزانییەکان لە عێراقیش هەر قاچاغ بوون. هەروەها ڕژێمی تورکیاش خۆی ڕێک دابووەوە بۆ ئەوەی ئەگەر بارزانییەکان لە سنوورەکانی ئەو نێزیک بوونەوە ئەوا ئەویش دەستی خۆیان لێ بووەشێنێ. ئیتر بەم ئاوایە شای ئێران دەیزانی مەلا مستەفای بارزان نایەوێ ئەم ڕێگەچارەیە هەڵبژێرێ و بەو چلەی زستانە خێڵی بارزان دووچاری پەرێشانی و لەناوچوون بکات بەتایبەتیش بەهۆی ئەوەی خەڵکەکەی نەخۆش و بێ بەرگ و بێ بژیو بوون. «بارزانی»ش نەیدەویست ڕێگەچارەی یەکەم هەڵبژێرێ و خۆی بەدەستەوە بدات، لە «فەرهەنگی سیاسەت»ی بارزانیدا چەک دانان و خۆ بەدەستەوەدان نەبووە، وەک تەفرشیان دەگێڕێتەوە بارزانی بەردەوام لەناو هاوەڵ و پێشمەرگەکانیدا دەیگوت: «ئەو کاتەی چەکت دانا و خۆت بەدەستەوە دا واتە

رازی بوویت بەوەی خەڵکی تر بڕیارت لەبارەوە بدەن، ئەو کاتەش تۆ ناچار دەبی بڕیارەکانیان جێەجێ بکەی، جا هەرچییەک بن». هەروەها دەیگوت: «کێ بەئێوەی گوتووە مەلا مستەفا خۆی بەدەستەوە دەدات، مەلا مستەفا خۆی بەدەستی هیچ کەسێکەوە نادات.»

بارزانی دەیزانی ئێرانییەکان «بەتایبەتیش قەوامولسەڵتەنەی سەرەک وەزیران» دەیانەوێ دەسخەڵەتی بدەن و بیخەنە داوەوە، هەروەها دەشیزانی ئەگەر ڕێگەچارەی یەکەم «واتە خۆ بەدەستەوەدان بەئێران» بداتە دواوە ئەوا بێ سێ و دوو دەیگرن و ڕێگەی گەڕانەوەی پێ نادەن. ڕێژیمی ئێران لەم بارەیەوە رابردووی شەرماوی و بێ بەڵێنیی لەگەڵ میوانەکانیدا گەلێک زۆرە. بارزانی هەستی بەم مەترسییە دەکرد بۆیە بە «شایەکەیان»ی گوت: «من لەلایەنی خۆمەوە هیچ ڕەخنەیەکم لە هەڵبژاردنی ڕێگەچارەی یەکەمدا نییە بەڵام ئەم بڕیارە چارەنووسییە دەبێ شێخ ئەحمەد بیدات، شێخ ئەحمەد سەرۆکی خێڵە و بڕیاری یەکجارەکی بەدەستی ئەوە»، هەروەها بەشێوەیەکی ڕواڵەت و زارەکی بەهەڵبژاردنی ئەم ڕێگەچارەیە رازی بوو. لە راستیدا بێ ئەوەی بڕیاری راستەقینەی خۆی بەوان بڵێ گەڕایەوە ناو پێشمەرگەکانی و خێڵەکەی.

بارزانیی نەمر دوای گەڕانەوەی و پرس و راوێژی لەگەڵ خوالێخۆشبوو «شێخ ئەحمەد»ی برا گەورەی و بەرپرسانی تردا هاتنە سەر ئەوەی هیچ یەکێک لەو ڕێگەچارانە پەسند نەکەن کە ڕێژیمی ئێران پێشنیازی کردبوون و، هەوڵ بدەن هەتا بەهاری داهاتوو لەناو چیا سەخت و دژوارەکاندا خۆیان بگرن و، پاشی ئەوە پێداپێدا بۆ باکور بەرەو سنووری سۆڤیەت هەڵکشێن. نیازی بارزانی لەمەدا ئەوەبوو خێزان و ئافرەت و منداڵانی خێڵی بارزان بەپەسارگەیەکی هێمن بگەینێ و لەوێ بەدواوە خۆی و پێشمەرگەکانی بەدووای ئامانجی - وەک خۆی دەڵێ «سەربەخۆییی کوردستان» بکەون. بەڵام هێرشی گەورە و لەناکاوی سوپای ئێران بوو بەبەرگر لە پێش هێنانەدیی ئەو پرۆگرامەدا و، بێ وچان شەڕ و شۆڕێکی خوێناوی لە نێوان بارزانییەکان و سوپای ئێراندا دەستی پێ کرد. بارزانییەکان ناچار بوون بەرەو ناوچە کێوەڵانییە دژوارەکان بڕۆن. ئیتر لەلایەکەوە پەلاماری یەک لە دوای یەکی سوپا و لەلایەکی ترەوە هێرشی بێ بەزەی سەرماوسۆڵە و بێ بژیوی و بێ جلوبەرگی زۆری ئازار دان. باڵەفڕەکانی ئێران زۆر کوێرانە و بەبێ بەزەیی دەیانکوتانەوە و ڕۆژ نەبوو زیانی چەند کوژراوێکیان لێ نەدەن. لەبارەی ئەو بۆمبابارانانەوە بڕیارێکی

گرینگی شای ئێران هەبوو دەیگوت: «نەهێڵن بارزانییەکان دەرباز بن و کاروانی کۆچی خاوخێزانیان بۆمبابااران بکەن بۆ ئەوەی چیتر ئابڕووی (ئەرتەش) نەچێ و بارزانییەکانیش دەرسێکی وا وەربگرن ببڕای ببڕ بیری وا نەکەوێتەوە سەریان».

بارزانیی نەمر خۆیشی دەڵێ: «خاڵی لاوازی ئێمە لەو شەڕانەدا ئەوەبوو ژن و ماڵ و منداڵمان لەگەڵ ئێمەدا لە بەرەکانی شەڕ لە ژێر گوللەباران و بۆمبای دوژمندا بوون. دوژمن ئەو خاڵە لاوازەی لە ئێمەدا دۆزیبووەوە و بەبێ بەزەیی و ئینساف و وەحشییانە ماڵ و منداڵی ئێمەی بۆمبابااران دەکرد». سەرەڕای ئەمە لە سایەی بەرگریی قارەمانانە و شەڕوانیی بارزانییەکان، ژن و ماڵ و منداڵیان دەرچوون و لەسنوور ئاوابوون. سوپای ئێرانیش تەنیا شەرمەزاریی بۆ مایەوە. بەڵام ئەگەر ئەم بارودۆخە ناسکە نەبوایە ئەوا دوور نەبوو سوپای ئێران نەتوانێ هەر لە بنەڕەتەوە بیر لەوە بکاتەوە بارزانییەکان بەزۆردارەکی لە زەویی ئێرانیان وەدەر بنێ. لەوانەبوو بارزانی خۆیشی لەبیری خەبات و بەرگری لەناو زەویی ئێران بوایە. بۆ بارزانی جیاوازییەک لە نێوان کوردستانێک و کوردستانێکی تردا نەبوو. تەفرشیان لەم بیرەوەرییانەیدا دەڵێ: «بارزانی پێی گوتین، من هیوادارم ڕۆژێک بێ بتوانم ئاڵای کوردستان لەسەر خاڵێکی کوردستاندا بەرز بکەمەوە جا ئەو خاڵە لە کوردستانی عێراق، ئێران، یا تورکیا بێ، هیچ جیاوازییەکی نییە».

بەهۆی تەنگەتاوکردنی بەردەوامی سوپای ئێران و دووری لە سنووری سۆڤیەت و وەرزی سەرماوسۆڵەوە، بارزانییەکان دەستیان لە بیری چوون بۆ یەکەتیی سۆڤیەت هەڵگرت. لە نێزیکی سنووری عێراق خوالێخۆشبوو شێخ ئەحمەد لەگەڵ بەرپرسانی میریی عێراقدا کەوتە وتوویژ بۆ ئەوەی بارزانییەکان بتوانن بگەڕێنەوە ناو زەویی باوک و باپیرانی خۆیان. ئەوەبوو دوای ڕێک کەوتن، لە چۆمی گادەر پەڕینەوە و گەیشتنەوە ناو عێراق. بەڵام بارزانی و پێشمەرگە دەسبژارەکانی خۆی کە ژمارەیان دەوروبەری ٥٥٠ کەس دەبوو خۆیان لە ناوچە سنوورییەکاندا گرت و چاوەڕوان بوون هەتا ئەوەی کۆچی خێزانە بارزانییەکان بەهێمنی گەیشتەوە «دیانە».

سەرۆک بارزانی خۆی بەدەستەوە نەدا بۆ ئەوەی «چەکی هەر بەدەستەوە بمێنێ و چاوەڕوان بێ هەتا هەلێکی لەباری بۆ هەڵدەکەوێ و ئامانجەکانی گەلی کوردی پێ دێتە دی». هەوڵی دەدا ئەو ڕۆژانە لە ناوچە چیاییەکاندا بەسەر ببات، بەڵام تەبایی و هاوکاریی بەردەوامی تورکیا و ئێران و عێراق بۆ سەرکوتینەوەی بارزانییەکان، هەلی

مـانەوەیان بەبارزانی و هێـزە شـەرکـەرە قـارەمـانەی نەدا بۆیە بەناچاری ملی ڕێگەی سۆڤیـەتیان گـرت و بەرەو باکور بەتەلان و هەورازی چیـایەکاندا هەڵکشان و لە مـاوەی نێزیکەی بیست ڕۆژدا ٣٥٠ کیلۆمەتریان بڕی و خۆیان بەئاوی «ئاراس» گەیاند و چوونە ناو زەویی سۆڤیەتەوە. ئەو ڕێڕۆیشتنە پڕ لە قارەمانەتی و چاونەترسییە لاپەڕەیەکی پڕ لە شانازیی مێژووی بزووتنەوەی گەلی کوردستانە لەپێناو هێنانەدیی ئامانجە ڕەواکانیدا.

پەنابردن بۆ سـۆڤـیـەت و بردنی زیاتر لە ٥٠٠ شـەڕوانی بژاردە لەگـەڵ خـۆیدا، ئەوە دەگەینێ کە بارزانی بەهیوای گەڕانەوەیەکی نێزیک بوو بۆ کوردستان بۆ ئەوەی لە هەلێکی گونجاودا دەست بەبزووتنەوەکەی بکاتەوە. لە گەلێک قسەی بارزانیی نەمر بۆ خاوەنی ئەم بیـرەوەرییـانە ئەو ڕاسـتـیـیـەی پێشـەوە دەردەکـەوێ. نووسـەری ئەم بیـرەوەرییـانە دەڵێ: «بارزانی، سۆڤیەتی تەنیا بەجێگەیەکی هێمن دادەنا کە بەشێوەیەکی کاتەکی بۆی بچێ و لە هەلێکی لەباردا بۆ پرسی دانانی حکوومەتی کـوردسـتـان بگەڕێتەوە عێـراق». هەروەها دەیویست خۆی بەدەسـتی کـەسـەوە نەدات بۆ ئەوەی چەکی هەر بەدەسـتـەوە بێ. هەروەها بارزانی بەهیـوای ئەوەش بـوو یارمـەتی و هاوکـاریی سـۆڤـیـەتەکـان بۆ بزووتنەوەی کـورد دەسـتـەبەر بکات. بەداخەوە، مـانەوەی بارزانی و هەڤاڵـەکـانـی لەو وڵاتە مـاوەیەکی درێژی پڕ لە چەوسانەوەی خایاند. سۆڤیـەتەکـان لەو سەردەمـەدا ئیـتـر پشـتـیـان لـە بزووتنەوەی ئازادیخـوازی گـەلـی کـورد کـردبوو. چیـرۆکی خـەبات و بەرخـۆدانـی بارزانیـیـەکـان لەناو سۆڤیـەت و ئەو ئازار و ئێشـانەی بەهۆی سیاسـەتی شۆڤێنیسـتانەی سـتالینەوە کێشـایان لاپەڕەیەکی زۆر گرینگە و شتێکی ئەوتۆی لێ تۆمار نەکراوە.

بارزانـی پاش شـۆڕشی ١٤ی تەمـووزی سـاڵی ١٩٥٨ و هەڤـاڵـەکـانـیـشی لە سـاڵی ١٩٥٩دا گەڕانەوە عێـراق، ئەو پێشـوازییـەی لە سـەرتاپێی وڵاتـدا هەر لە بەسراوە هەتا هەولێر لێـیان کـرا، نیشـانەی ئەوەبوو نەک تـەنیـا گەلی کـورد بگرە تێکڕای گەلی عێـراق بەهەمـوو نەتەوە و کـەمـەنەتەوەکـانیـەوە شـانازی بەهاتنەوەی ئەو پیـاوە نەبەز و بوێـرانە دەکات و پێیان سەربەرزە.

خوێنەرەوەی بەڕێز!

ئەوەی لەم کـتـێبەدا بەرچاوتـان دەکەوێ برێتـییـە لە بیـرەوەرییەکانی ئەفسـەرێکی فـارس «ئەبولحەسـەنی تەفرشیـان» و یەکێکە لەو ئەفسەرانەی ڕاپەڕینە نیوە چڵەکەی خۆراسانیان لە ساڵی ١٩٤٥دا هێنایە کایە. ئەو ئەفسەرانە سەر بەحزبی توودەی ئێران بوون و لە دژی

ڕێژیمی شا ڕاپەڕیبوون، بێ تاقیکردنەوەییی خۆیان لەلایەک و بێ پشتووانییان چ لە حزبی توودە و چ لە سۆڤیەتەوە بوو بە هۆی ئەوەی ڕاپەڕینەکەیان سەرنەگرێ. پاش ڕاگەیاندنی کۆماری میللیی ئازربایجان، نەقیب ئەبولحەسەن و هاوەڵەکانی چوونە ڕیزی سوپای ئازربایجانەوە. ڕاگەیاندنی جاڕی دەست لە بەرگری هەڵگریی هەردوو کۆماری ئازربایجان و کوردستان، وای کرد هەندێ لەو ئەفسەرانە بەگەڵ هێزی بارزانییەکان بکەون و لەسایەی ئەواندا بژین. ئەو ئەفسەرانە وەک ئەبولحەسەن دەڵێ ژمارەیان دە کەس بوو و لەناوەڕاستی مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥ەوە چوونە پاڵ بارزانییەکان و لەناو ئەواندا ژیان و لە شەڕوشۆڕەکانیان دژ بەسوپای ئێران و کشانەوەیان بەرەو سنووری عێراق بەشدار بوون. دووای گەیشتن بەسنوور، ئەفسەرەکان پاش وتوویژ لەگەڵ بەرپرسانی عێراقدا، خۆیان بەدەست میریی عێراقەوە دا بەو هیوایەی وەک پەنابەری سیاسی مامڵەتیان لەگەڵدا دەکرێ و دەتوانن لە عێراقەوە بۆ ئەو شوێنانە بڕۆن کە دەیانەوێ. بەڵام میریی عێراق بێ بەڵێنیی لەگەڵدا کردن و بەشێوەیەکی نامێرانە بەدەست ڕێژیمی ئێرانەوەی دان.

ئەبولحەسەن بیرەوەرییەکانی خۆی لەو ماوە دیاریکراوەی باسمان کرد نووسیوەتەوە و، لە کتێبێکدا بەناوی «ڕاپەڕینی ئەفسەرانی خۆراسان» بڵاوی کردووەتەوە و پێشکێشی «فەریدە»ی کچی کردووە. ئێمە ناونیشانی کتێبەکەمان لە «ڕاپەڕینی ئەفسەرانی خۆراسان»ەوە کرد بە «بارزانی خۆی بەدەستی کەسەوە نادات» کە برێتییە لە قسەیەکی بارزانیی نەمر خۆی و نووسەری بەڕێز تەفرشیان تۆماری کردووە. بۆ سەرنج ڕاکێشانی خوێنەرەوەی کورد ئەم ناونیشانەمان بەپەسندتر زانی.

**شەوکەت شێخ یەزدین**

١٤ تشرین (٢) ١٩٩٦ - پیرمەم

بۆ چاپی یەکەمی فارسی

# وشەیەک

خوێنەرەوەی بەڕێز

ئەم کتێبە باسی رووداوگەلێکە کە بەشێک لە مێژووی هاوسەردەمی ولاتی ئێمەیان پێک هێناوە، من گەردێکی بچووک لە کەرەستەی ئەو پێکهێنانە بووم.

گەلاوێژی سالی ١٣٢٠، لە کۆنگەی شەڕی دووەمی دنیادا بووم بەئەفسەر. دەسبەجێ لەلایەن سۆڤیەتەکانەوە بەدیل گیرام. چەند مانگێکم لە گرتووخانەی ئاشقاوە «عشق اباد»دا بردە سەر، لە ڕاپەڕینی ئەفسەرانی خۆراساندا پشکداریم کرد، بووم بەئەفسەری سوپای گەلێری ئازربایجان، لە شەڕوشۆڕی بارزانییەکان لە دژی سوپای ئێراندا بەشداریم کرد و دوواجار لە ئاخەلێوەی ١٣٢٦دا پەنام بردە بەر عێراق و لە ئاخەلێوەی ١٣٢٩دا منیان بۆ ئێران گێڕایەوە و هەر لەو مێژووەوە لە گرتووخانەی جۆراوجۆردا گیرام. پاش کودێتای ٢٨ خەرمانان بۆ دوورگەی خارک دوور خرامەوە، هەتا پاش شازدە سال و ئەوەندە مانگ مانەوە لە گرتووخانەدا، لە ئاخەلێوەی ١٣٤٢دا بەربووم.

لەم باسەدا تەنێ لە ڕووداو و دیتەنی و بیستەنییەکانی کەنالێکی باریکەلە دەدوێم کە خۆم پیایدا ڕابردووم.

ئەمجارەش دووپاتی دەکەوە کە من ماسییەکی بچکۆلە بووم و لەلاوە خزامە سەر تاتەبەردەکانی ئەم کەنالە و زۆر سەیرە زیندوو مامەوە. بەم پێیە نەمدەتوانی زانیارییەکی تێروتەسەلم لە بارەی بەسەرهات و رووداوگەلی مێژوویی ئەو سەردەمەوە هەبێ بێ ئەوەی بگەڕێمەوە سەر ئەرشیف و دەستهاوێژ و سەرچاوەکانی ئەو سەردەمە، تەنێ بەیاریدەی بیری خۆم هەولم داوە چیم بینیبێ، بیستبێ یان ئەوەتا ڕۆلم تیایدا گێڕابێ بۆ کچەکەمی بگێڕمەوە. پاش بیست و پێنج سال لە دووری، کچەکەمم لە سالی ١٣٥٠ لە بەرلینی ڕۆژهەلاتدا بینییەوە.

هیوادارم ئەم بەسەرهاتە، گۆشەیەکی تاریکی بەشێک لە مێژووی ولاتمان ڕوون بکاتەوە و دەسبارێک بداتە بیری ئەو لاوانەی بوێرانە خەبات دەکەن بۆ ئەوەی پاشەڕۆژی ڕاستەقینەی ولاتمان پێکەوە بنێن.

سەرلەبەری ئەم ڕووداوە پڕە لە سۆزبزوێنی و بوێری و خۆبەختکەری و گیان

پێشکێشکەری بەڵام سەرئەنجامی نالەباریان ئەوە ئیسپات دەکات کە ڕەوتی پەرەگرتنی کۆمەڵگە و گۆڕانکارییەکانی، گرێدراوی یاساگەلی ڕێکوپێک و تایبەتن کە گیان بەختکەریی تاکە کەسی و خەباتی پێکەوەیی بەبێ هەبوونی پێوەندیی مکوم و توندوتۆڵ لەگەڵ جەماوەر و داوخوازەکانی ئەواندا، سەرئەنجامی نابەدڵی هەیە. بۆیە دەبێ هەموو لایەک ئەمەیان لەبیر بێ.

ئەبولحەسەن تەفرشیان

گەلاوێژ ۱۳۵۵

- باوەگیان، بڵێ، چیرۆک بڵێ!
- هەی بەچاوان، باشە. هەبوو نەبوو،
- نا! نا! لەم چیرۆکانەم ناوێ، چیرۆکی خۆت بڵێ!
- ها، بەسەرهاتی ژیانی منت دەوێ، باشە، گوێ بدێ.

لە ٢٩ خەرمانانی ١٣٢٠ بووم بەئەفسەر، ناوەڕاستی شەڕی دووەم بوو، ئەمە ڕێکەوتی سەردەمێ بوو کە وڵاتی ئێمە لەلایەن هێزگەلی بیانییەوە داگیر کرابوو(١).

دەسبەجێ جلکی ئەفسەرییان لەبەر کردین و بۆ ئەو بەشانەیان ڕەوانە کردین هەتا لە پێکدادانەکانی شەڕدا بەشداری بکەین. من ڕێگەی کاری پێ سپێردراوم بەرەو مەشەد (مشهد) گرتەبەر. وەک دیار بوو، بەرەی شەڕ ئەو کاتە لە باجگیران و سەرخەس و ئەو ناوانە بوو. سوپای ئێمە هیچ جۆر ڕووبەڕووبوونەوەیەکی لەگەڵ سوپای سۆڤیەتدا نەکرد و هەر لە نیوەی ڕێگەدا لە خۆوە گەڕاینەوە.

یەکێک لەو فەوجانە فەوجی تۆپخانە بوو. من ئەفسەری تۆپخانە بووم هەر بۆیەش لە بیرم ماوە ڕۆژی چواردە یان پازدەی مانگی گەلاوێژ بوو ئەو یەکەیە گەیشتەوە مۆڵگە. ئەو کاتە من تەمەنم بیست و یەک ساڵان بوو. باشتریش وایە بڵێم من «نیشاپووری»م و دایک و خزمانم لە نیشاپوور بوون. ئەو دەمەی لە ڕێگەی خۆمەوە گەیشتمە نیشاپووور دایکم نەیتوانی لە یەک شەو زیاترم لەوێ ببینێ، لەبەرئەوەی کەوتمەوە ڕێگە، پێم وابوو سووودم بۆ وڵاتەکەم هەیە یا بەلایەنی کەمەوە هەوڵم دەدا سوودم بۆی هەبێ. دایکم دەترسا شتێکم بەسەربێ و دەیویست چەند ڕۆژێکی لەلا بمێنمەوە بەڵام من بەحەز و خولیاوە دەرکەوتم بۆ ئەوەی خۆم بەمەشەد بگەینم و بگەمە پاڵ یەکەکەم.

لە مەشەد کەس بەکەس نەبوو، سبەینان دەرگەی دوکان و بازاڕ وەک ئاسایی دەکرانەوە، بەڵام هەرکە یەکێک بیگوتایە ئەوا ڕووسەکان هاتن ئیتر دەسبەجێ تێکڕای دوکان دەرگەیان دەگیرایەوە. پاشی نیو سەعات دەیانگوت هەواڵەکە درۆ دەرچوو، دوکانەکان دەکرانەوە. کەسێ نەبوو ئەو کۆمەڵگە بەلەنگازە ڕێنوێنی بکات. تەنیا کارێکی کە کاروەرانی مایەوەی میری دەیانکرد ئەوەبوو هەوڵیان دەدا نانپێژەکان کراوەبن بۆ ئەوەی

(١) بۆ خۆلادان لە درێژنووسی، ئەم بەشەمان بۆ خوێنەری کورد کورت کردەوە و تەنیا سەرپێچڕێکمان لێی وەرگێڕا ـ وەرگێڕ.

دانیشتوان نانی پێ بژیویان دەست کەوێ. ماڵ و خێزانیش بێ ئەوەی کەسێ فەرمانی پێ دابێ شاریان بەجێ هێشتبوو. چوومە سەربازگە، سەربازگە چۆڵ بوو. چوومە ئەرکان کەس نەبوو. تەنێ دوو ئەفسەری لێ گۆڕاوی وەک خۆم نەبێ و ئەفسەرێکی ئینجیباتیش مابووەوە. ئەو ئەفسەرە ئینجیباتە گەلێ تێ کۆشا بۆ ئەوەی بەیاریدەی ئێمە سەربازە پەرت و بڵاوەکانی خۆی لە شار کۆ بکاتەوە و بیانهێنێتەوە بۆ پاراستنی سەربازگە. بەهەر جۆر، نێزیکەی بیست و پێنج کەسم کۆ کردەوە و بردمن بۆ سەربازگە. هەر لە هەمان ئەو ڕۆژانەدا بوو سەر و گوێلاکی فەوجەکەی لەمەڕ خۆیشمان دەرکەوت. سەرۆکی فەوج «عەقید لوتفوڵلا ئەفشار ئۆغلی»ش لە بەراییی فەوجدا گەیشتە جێ.

پاش ٤٨ سەعات هەواڵیان هێنا وا سوپای سۆڤیەت گەیشتە مەشەد. سەرۆکی فەوج ڕۆیشت و لەگەڵیاندا کەوتە وتوویژ. ئەوان گوتبوویان ئێمە نەهاتووین لەگەڵ ئێوەدا شەڕ بکەین و کارێکمان بەئێوە نییە. ئێمە دۆستی ئێرانین و هیچمان لە بەرامبەر سوپای ئێراندا نییە. نیازی ئێمە ئەوەیە ئێران لە تێدابوونی ئەڵمان پاک بکەینەوە.

تاکە سەرکردەیەکی مابێتەوە سەرکردەی فەوجی تۆپخانە بوو، ئەویش کاتێ سوپای سوور هات فەوجەکەی خۆی بەدەستەوە دا. پاشان فەرمانیان پێی دا شەو بچێتە ئەرکان، گوتی «بەچاوان». ئێمەی هەموو کۆوە کرد و بۆمان دووا، گوتی ئەمانە دۆستی ئێمەن، لەگەڵ ئێمەدا شەڕ ناکەن و سوپایشمان بێ ئەوەی دەستی لێ بدرێ لە شوێنی خۆیدا دەمێنێ.

پاسەوانی لەناو سەربازگە بڵاوکردەوە و ئێمەی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ ئەرکان. کاتێ گەیشتینە بەردەمی ئەرکان هەندێ سەربازی تەماتیک بەدەست گەمارۆیان داین و بەرەو ژوورێکی ئەرکان ڕێنوێنییان کردین. پاشان گۆتیان ئێوە مێوانی ئێمەن و ئەمشەو لە خزمەتتاندا دەبین. چل و هەشت سەعات ئێمەیان لەو شوێنەدا هێشتەوە، پاشان بردیانین بۆ ئۆتێل «باختەر» کە ئەو دەمە گەورەترین ئۆتێلی مەشەد بوو. لە چوار دەوری ئۆتێل پاسەوانیان دانابوو. پاشان بانگیان ڕاهیلا بۆ ئەوەی سەرجەم ئەفسەرانی سوپا بێن و خۆیان بناسێنن. لە ڕاگەیاندنی سۆڤیەتەکاندا گوترا بوو ئەوان دۆستی ئێمەن و، بۆ هاوکاری و دەستەوای ئێمە هاتوون، سوپامان دەستی لێ نادرێ و پێویستیشە ئێمە یارمەتییان بدەین. ئیتر هەندێ لە ئەفسەرانیش خۆیان بەدەستەوە دا.

ئۆتێل باختەر جمەی دەهات. ئۆتێلێکی تر بەناوی ئۆتێلی «میللی»یەوە هەبوو، ئەویش

هەروەها. هەمووی بەسەریەکەوە سەت و نۆهەت و شەش ئەفسەری سوپای خۆراسان لەوێندەر گیراین. نێزیکەی بیست ڕۆژێک لە ئۆتێل ماینەوە و پاشان ڕۆژێکیان ئێمەیان لە ئۆتۆمۆبێل سوار کرد و بەرەو ئاشقاوەیان بەڕێ خستین.

ئێمەیان گەیاندە ئاشقاوە، بەورەیەکی ڕماو و تێکشکاوەوە، بەشێک لە گرتووخانەی ئاشقاوەیان بۆ ئێمە جیا کردەوە و لەوێیان بەکەیس کردین. هەموومان نێزیکەی ١٧٠ کەس دەبووین. ماوەی دیلایەتیمان نێزیکەی سێ مانگ و نیو درێژەی کێشا. لە ٢٤ گەلاوێژدا ئێمەیان بردەوە بۆ ئاشقاوە و پاشان لە پازدە یان شازدەی مانگی بەفرانباردا بۆ ئێرانیان گەڕاندینەوە. ئێمەیان بەدەست پارێزگای مەشەدەوە دا. لەوێ پێیان گوتین جلکی سڤیل لەبەر بکەین - لەبەرئەوەی هێشتا جلکی ئەفسەریمان لەبەردابوو- و بچین خۆمان بەتاران بناسێنین. ئێمەش دە پازدە ڕۆژێ لای کەسوکارمان ماینەوە پاشان بەرەو تاران بزواین.

ئەو دەمەی تارانم بەبیر دەهاتەوە بەردەوام ڕووالەتێکی بێوەری و گریاوم دەهاتەوە پێش چاو. ڕووالەتی دەسگیرانەکەم کە ڕۆژی ڕۆیشتنمان بۆ دیلیەتی هاتبووە دیمانەم بەڵام هەلیان پێی نەدا. لە بەرامبەری ئۆتێل لە لێواری شەقامەکەدا ڕاوەستابوو، ئەو دەمەی سواری ئۆتۆمۆبێل دەبووم کەوتە بەرچاوم. بەپڕاوپڕی ڕووی دەگریا و فرمێسک وەک تەزرەی بەهار، فرەوان و جوان لە هەردوو چاوانیەوە دەباری. ئەو ڕۆژە بۆ دڵدانەوەی ئەو، بزەیەکم کرد و دەستم هەڵشەقاند، ئۆتۆمۆبێل بەڕێگەدا تەکانی دا. بەڵام ئەو ڕووالەتەم هیچ جارێ لە چاوان نەسڕایەوە.

پاشی پازدە ڕۆژان دەستی ژنەکەمم گرت و هاتمە تاران. نێزیکەی سێ مانگ لە تاران لانەواز بووم. بەڵام ئەو دەمەی هاتمە تاران، من ئەفسەری وڵاتێک بووم لەلایەن سێ سوپای بیانییەوە داگیر کرابوو. ئەو کاتەی لەناو شەقامدا ئەفسەری ڕووس و ئینگلیز و ئەمەریکامان دەبینی خۆمان بچووک و سووک دەهاتە پێش چاو.

بۆ ئەوەی لە دەنگوباسی وڵات ئاگەدار بم ڕۆژنامەی «اطلاعات» هەروەها ڕۆژنامەی «إقدام»م دەخوێندەوە. هەندێ جاران بابەتی نوێ لەنێو ئەو ڕۆژنامانەدا سەرنجی منی بۆ خۆی بەکێش دەکرد. لەناو بابەتگەلی ئەو ڕۆژانەی ڕۆژنامەکاندا وتووێژی ناو پەرلەمان کەفوکولێکی لە دەروونی مندا هێنایە کایە.

ئەو کاتە بڕیار درا لیوایەک - بێگومان بەپرس پێ کردنی سۆڤیەتەکان، لە «توربەت

جام» پێکەوە بنرێ. بۆ منیش لەو لیوایە - کە هێشتا لەسەر کاغەز بوو، کارێکیان دیاری کرد. سەرۆک و ئەفسەرانی ئەو لیوایە راگەیەنران و بڕیار درا هەر کاتێ لیوا پێک هات ئێمە بچین خۆمان بناسێنین. دووای چەند مانگێک لیوای توربەت جام پێک هات و لە ماوەی مانگی جۆزەردان یا پووشپەڕی ١٣٢١دا من لەو لیوایەدا کەوتمە کار. سەرۆکی ئەرکانی ئەو لیوایە لەو سەردەمەدا عەقیدێک بوو بەناوی «یەکرەنگیان» و بنکەکەی لە مەشەد بوو. لە سەرەتای هاتنم بۆ مەشەد خۆم بەعەقید یەکرەنگیان ناساند و لەبەرئەوەی لیوای «جام»ی لەمەڕ ئێمە سەر بەئەو بوو و هێشتا دەست بەکار نەبووبوو داوام کرد هەر لەو ئەرکانەدا کار بکەم. پاش پێکهاتنی لیوای «جام»یش من هەشت نۆ مانگێک لەو لیوایەدا کارم کرد و پاشان دووبارە بۆ مەشەد گواسترامەوە.

لیوای ناردراو بۆ مەشەد «بطریە»یەکی تۆپخانەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو کە بۆ فیرقەی ٨ی ڕۆژهەڵات گواسترایەوە، من بەسەرکردەی ئەو «بطریە»یە دامەزرام، ئەمە لە کۆتاییی ساڵی ٢١ و سەرەتای ساڵی ١٣٢٢دا بوو. لە کۆتاییی ساڵی ١٣٢٢دا مەڵبەندی کولتووریی ئێران و سۆڤیەت «وکس» لە مەشەد کرایەوە. سەرکردەی فیرقە ڕۆژێکیان لە یانەی ئەفسەران، بەگوێرەی ئەرک نەک حەز، ئەو هەواڵەی بەئێمە دا و ئامۆژگاریی کرد هەر کەسێکی حەزی لێیە با بچێ و فێری زمانی رووسی ببێ. من «بەڵێ»م گوت و کەیفخۆش بووم.

ساڵی ١٣٢٣ «رەزم ئارا» سەرۆکی ئەرکان بوو و بڕیاری دا هەندێ لە ئەفسەران جێگۆڕکێ پێ بکات بەو نیازەی بەردەوام هەندێکیان لە تاران بن و هەندێکی تریان ناچاربن لە شاران و سنووران بمێنن. ئەم کارەیشی لە ڕێگەی پشک ڕاکێشانەوە جێبەجێ کرد.

یەکێک لەو ئەفسەرانەی بۆ مەشەد گواسترایەوە رائید «عەلی ئەکبەر ئەسکەندانی» بوو کە لە کۆلێجی ئەفسەریدا سەرکردەی تیپەکەی ئێمە بوو لە پەلی تۆپخانە. ڕۆژی پاش هاتنی بۆ مەشەد، بەڕێکەوت لە شەقام بینیم، ئەمە لە مانگی ڕەزبەری ١٣٢٣دا بوو. پاشی چاکی و چۆنی دەرکەوت لە ئۆتێل «باختەر» دابەزیوە. لەبەرئەوەی من شارنشین بووم و خانووەکی مەزنم لە مەشەد هەبوو پێشنیازم کرد بەشێوەی کاتەکی لە ماڵی ئێمە بێ هەتا ئەو کاتەی بۆ خۆی خانوو پەیا دەکات. پێشوازیی لە پێشنیازەکەم کرد و هەر ئەو شەوە لەگەڵ خۆمدا بردمەوە بۆ ماڵ. ئێواران بەیەکەوە شیومان دەخوارد. پاشی شێوان

دەستی بەقسان دەکرد و لە هەموو بابەتێک دەدووا. هەستم کرد قسەکانی ئەو لە قسەی ئاسایی ئەفسەرانی تر جیایە. پێداپێدا هەستم دەکرد لە بابەتگەلی نوێ دەدوێ کە هەتا ئەو کاتە وەبەر گوێی من نەکەوتبوون. هاتبوومە کەفوکوڵ و دەمویست هەتا زووە ئەم باس و خواسە چێتر و زووتر تێ بگەم. چەندین شەوی یەک لەسەر یەک بۆم دووا، لەبارەی ماتریالیزمی دیالەکتیک و ماتریالیزمی مێژوویی و بنچینەی کۆمەڵگەناسی و پەرەگرتنی کۆمەڵگەوە زۆر بەکورتی بۆ من قسەی کرد. پاشان من خۆم بەشێوەیەکی هەراوتر شتم لەبارەی بنچینەکانی کۆمەڵگەناسی خوێندەوە. لە یەکێک لەو شەوانەدا لەبارەی سۆڤیەتەکانەوە لە منی پرسی، گوتم:

– هیوادارم هەر ئەمشەو گوێم لە هەواڵی شکانیان بێ. سبەی مرۆڤ بڕژێنە دەرەوە و لە وڵاتیان وەدەر بنێن.

گوتی:

– ئەم بۆچوونەی تۆ پێوەندیی بەڕابردووەوە هەیە لەبەرئەوەی سوپای تزاری لە ئێراندا کاری ئەوتۆی کردووە خەڵک هێشتا لە بیریان ماوە. بەڵام لەبارەی سوپای سوورەوە ئەوا لە بن و بناوانەوە لە سوپای تزاری جیایە. ئەم باسە هەتا نیوەی شەو درێژەی کێشا، ئەگەر نەشڵێم بێزاریی منی لەبارەی سوپای سۆڤیەتەوە لە بن هێنا ئەوا بەلایەنی کەمەوە زۆری لێ گۆڕی. پاشان، بەگوێرەی تێ هەڵکشانم لە خوێندنەوەدا، کەیفم بەسۆڤیەت و سوپای سوور هات و حەزم لێ کردن. چەند شەوێک دووای ئەوە کە گوتی: «من ئەندامی حزبی توودەم» سەرم سڕ نەما و، پاشانیش کە گوتی: «ئایە تۆ دڵت دەیەوێ ببی بەئەندامی ئەم حزبە؟» من بەبێ دواکەوتن پەسندم کرد و گوتم:

– پێویست نەبوو لێم بپرسی. خۆت دەتتوانی هەڵی بێنی. بێگومان تۆ لە کوێ بی منیش لەوێم.

لەبارەی مەرجی ئەندامەتی لە حزبی «توودە»دا دووا، پاشان خۆی و «پەروین گونابادی» منیان پاڵاوت و ئەنکێتی حزبی «توودە»م ئیمزا کرد. «پەروین گونابادی»م پێشتر دەناسی، مامۆستای «ئەدەب»مان بوو لە دواناوەندیی «شا ڕەزا»ی مەشەد. ئەو کاتە ڕۆژنامەی «ڕاستی»ی ئۆرگانی کۆمیتەی هەرێمایەتیی حزبی توودەی ئێرانی لە خۆراسان بڵاو دەکردەوە. ئەسکەندانی گوتی:

– ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حزبە.

بیستم هەندێ لە ئەفسەران لە کۆلێجی ئەفسەری ڕێکخراوێکی تریان دامەزراندبوو، ناوەکەیم بەوردی لەبیر نەماوە، لەوانەیە «ڕێکخراوی ناسیۆنالیستەکانی ئێران» بووبێ. دەیانگوت «ئاریانا» لە سەرۆکایەتیی ئەو ڕێکخراوەدایە کە ئەو کاتە ناوی «منوچەهری» بوو. هەروها دەیانگوت ئاریانا فاشیستە و لایەنگری لە ئەڵمانەکان دەکا، بەڵام بەبۆچوونی من ئاریانا فاشیست نەبوو، هەڵسوکەوت و ئاخاوتنی ئەو بەجۆرێک بوو لاوانی ناسیونالیست و وڵاتپەروەری بۆ خۆی بەکێش دەکرد. دەیانگوت ئەو کاتە «روزبێ»، «دانش»، «مورتەزەوی» و «قازی ئەسەدوڵلاهی» لە ئەفسەرانی کۆلێجی ئەفسەری، لە دەوروپشتی ئەو بوون و پاشانیش هەر هەموویان هاتنە پاڵ حزبی توودە.

ئەسکەندانی خۆیشی لە ساڵی ١٣٢٢ و لە ڕێگەی عەقید «ئازەر»ەوە[٢] بووبوو بەئەندامی حزبی توودە. عەقید ئازەریش پیاوێکی لێهاتوو بوو، لە فرەنسا خوێندبووی. مامۆستای ڕووبەرگرتن بوو لە کۆلێجی ئەفسەری. دەتوانین بڵێین بیری مارکسیزم لە ڕێگەی ئازەرەوە گەیشتە ناو سوپا. هەر ئەم ئازەرە و پاشان روزبێ، قازی ئەسەدوڵلاهی، مورتەزەوی، ڕەسەدی ئیعتیماد، حاتەمی و تێکڕای ئەو ئەفسەرانەی ئەو سەردەمە لە کۆلێجی ئەفسەری لێهاتوو بوون، ئەو بەرەو خۆی بەکێشی کردبوون. ئەسکەندانی لە مانگی پووشپەڕی ساڵی ١٣٢٣ گواسترایەوە بۆ مەشەد، هەتا خەرمانانی ساڵی ١٣٢٤ کە ڕاپەڕینی ئەفسەرانی خۆراسانی ڕێک خست، بیست و یەک کەسی لە ئەفسەران هێنایە ناو حزبی توودە. ئەو کاتەی ژمارەمان گەیشتە ١٤ کەس، ئەسکەندانی پێشنیازی کرد هەڵبژاردنێک بکەین لەبەرئەوەی دەبێ ڕێکخستنی ئێمە دێموکراتی بێ و حزبیش پشتەوانیی لێ بکات. ڕۆژێک دیاری کرا بۆ هەڵبژاردن، ئەو ڕۆژە سکرتێری کۆمیتەی هەرێمایەتیی حزبیش لە مەشەد، باقر عەلی، لە کۆبوونەوەکەی ئێمەدا بەشدار بوو. بەئامادەبوونی ئەو ئەسکەندانی بەناوی بەرپرسی ڕێکخراو دەسبژێر کرا و سێ کەسیشمان بۆ دەستەی ڕاپەڕاندن هەڵبژارد.

ئەو سەردەمە ئەفسەرانی بژاردەی سوپا بەپەنجە دەژماردران: روزبێ، قازی ئەسەدوڵلاهی، مورتەزەوی، ڕەسەدی ئیعتیماد، ئاگاهی و ئەوانیتر، هەر هەمووشیان

(٢) عەقید ئازەر لەپاش ڕووداوی ئازربایجان چوو بۆ سۆڤیەت و هەتا ساڵی ١٣٥٥ لەوێ مایەوە، لە دووا دووای ساڵی ١٣٥٥ هاتەوە بۆ ئێران و پاشی ساڵ و نیوێک لە مانگی گەلاوێژی ساڵی ١٣٥٧ لە تەمەنی حەفتا و سێ ساڵیدا کۆچی دواییی کرد (نووسەر).

ئەندامی حزبی تووده بوون. هەر ئەمانە بوون ئەو جارەی لە مانگی خەرمانانی ١٣٢٤ لە تاران بڕیاریان دا ڕاپەڕین ساز بدەن. ئەو کاتەی بیری ڕاپەڕین لە مێشکی ئەسکەندانی پێ گەیشت لەبن کارتێکەریی کەسایەتیی «تیتۆ»دا بوو، دەیگوت:

– ڕێبەر ئەو کەسەیە وەک تیتۆ بچێتە کێوان. هەڤاڵان لە خۆی کۆ بکاتەوە و بەزەبری چەک سەرکەوێ نەک وەک ئەوانەی لە شەقامی «فیردەوسی»(٣) لە پشت مێز دادەنیشن.

ئەسکەندانی ڕێکخەر و بیرکەرەوەیەکی باش بوو، ئەگەر بمایە دەیتوانی لە داهاتوودا ببێ بەپیاوێکی یەکجار بەکار بۆ بزووتنەوەکە. لەو ڕۆژانەی ئەسکەندانی ڕاپەڕینی ڕێک دەدایەوە، لە بیری ئامادەکردنی پارە و ئامێرەکانی تری شەڕی پارتیزانیدا بوو.

سەرکردەی ڕوکنی ٣ لە هەڤاڵانی ئێمە بوو. ئەو بەپێی ڕاسپاردەی ئەسکەندانی، ملازم یەکەم «نەجدی»ی کرد بە چاودێری داراییی ئێمە. ملازم یەکەم نەجدی هەڤاڵی خۆمان بوو، پێشتر فێر کرابوو پاش وەرگرتنی پارە، فلانە سەعات بەفیسارە کۆڵانی چۆڵدا بڕوات. هەر ئەو سەعاتە یەکێکی تر بەسواریی پایسکل بەو کۆڵانەدا تێ دەپەڕێ و مستەکۆڵەیەک بەسەر و گوێلاکی «نەجدی»دا دەکێشێ و پارەکەش دەڕفێنێ و بۆ ڕێکخستنەکەی لەمەڕ ئێمەی دەهێنێ. بەو جۆرە بێ ئەوەی هیچ قسەیەک بێتە سەر ڕێکخستنەکەمان، سی هەزار تومانی مووچەی ئەفسەران بوو بەشی. سەرچاوگەیەکی تر بۆ پەیاکردنی پارە: لە سەروبەندی شەڕ تایەی ئۆتۆمۆبێل زۆر گران بووبوو، لە بنکەی بارهەڵگریی تارانەوە هەندێک تایەیان بۆ فیرقەی مەشهەد ناردبوو، ئەو تایانە پێش ئەوەی بگەن بەمەشهەد هەر بەڕێگەوە فرۆشرانەوە و پارەکەی کەوتە دەستی ئێمە. ئەسکەندانی خۆی سەرکردەی بارهەڵگریی مەشهەد بوو و دەبوو ئەو تایەکان وەر بگرێ. پسوڵەی وەرگرتن لەلایەن فیرقە و پسووڵەی کۆگەش جێبەجێ کران. ئەسکەندانی ئێمەی ڕاسپاردبوو هەرچۆنێکی بۆمان لوا پارە پەیا بکەین، ڕۆژێک هەر دێ بەکەڵکمان بێ. پێمانی گوتبوو بەردەوام مووچەی مانگێک بەیارمەتی وەربگرین.

هەر ئەو کاتەی ئەسکەندانی ڕاپەڕینی ڕێک دەدایەوە، لە تاران هەندێ لە ئەفسەران دەیانویست بەسەرۆکایەتیی عەقید ئازەر نوایەکی چەکداری پارتیزانی لە گۆشەیەکی ئێراندا بێننە کایە. ئەوان بۆ جێبەجێ کردنی ئەو ئامانجە پلانێکیان دانابوو کە نەگەیشتە قۆناغی کردەوە. ئەوان بۆ بڕوا پێ هێنانی حزب دەیانگوت هەندێک لەوان ئاشکرا بوونە و

(٣) ئەو کاتە بنکەی حزبی تووده لە شەقامی فیردەوسی بوو لە تاران ـ نووسەر.

پێویستە پێش ئەوەی سوپا بیانگرێ، بگوازرێنەوە بۆ شوێنێکی هێمن. حزبیش بڕوای هێنابوو و بڕیاری دا ئەوانە بنێرێتە باکور بۆ ئەوەی لە ناوچەگەلی کرێکاری خۆیان بشارنەوە و کاری حزبی ڕاپەڕێنن. بەم ئاوایە لە مانگی خەرمانانی ١٣٢٤ لە یەکێک لە گەراجەکانی شەقامی «ناسر خەسرۆ» ئۆتۆبووسێک بەکرێ دەگیرێ و بەشەو هەر هەموویان لە ماڵی ئازەر بەجلکی خۆیانەوە لێی سوار دەبن. ئۆتۆبووس بەبۆنەی کارێک دەچێتەوە بۆ گەراج، ئەفسەرەکان دەبینن خاوەن گەراج پاش ئاخاوتنێک لەگەڵ شوفێرەکەدا کەوتە تەلەفۆن کردن. لەبەرئەوەی ئەوان لەبارێکی نائاساییدا دەبن پێیان وا دەبێ وا بۆ سەرکردەی سوپایی تەلەفۆن دەکات. ئیتر هەموویان بەزێلکی ڕژاوەوە لە ئۆتۆبووس دادەبەزن و پێی پێوە دەنێن. تەنانەت چەند جانتایەکیش لە ئۆتۆبووسەکەدا بەجێ دەمێنێ. بۆ سبەی هەندێکیان وەک نەبای هاتبێ و نەباران دەچنەوە مۆڵگە و بەخزمەت خەریک دەبن، بەڵام هەندێکی تریان کە بەڕاستی لە مەترسیدا دەبن بەدزیکەوە لە تاران دەردەچن.

ئەسکەندانی هەمووومانی بەبڕوا هێنابوو کە ئەم ڕاپەڕینە هەم پێویستە و هەم کارێکی کردەنیشە. تەنیا دوو کەس هەبوون بەشێوەیەکی ناژیرانە و لاواز بەرهەڵستییان دەکرد، یەکێکیان ملازم یەکەم سەڕاف زادە و ئەویتر ملازم یەکەم شەهید نوورائی بوو کە ئێستە نازانم لە کوێن.

پێش ڕاپەڕین، ئەسکەندانی یەکێکی لە ئەندامانی کۆمیتەی ڕاپەڕاندن «نەقیب بەهرام دانش»ی بۆ پێوەندی کردن بەحزب یان ئازەر ڕەوانەی تاران کرد. لەبەرئەوەی ئازەر ڕاپەڕینی پێ پەسند بوو بڕیار درا پلانی ڕاپەڕین بدرێ بە ئەو و لە ڕێگەی ئەوەوە کۆمیتەی ناوەندیی حزبی توودە بەبڕوا بهێنرێ بۆ ئەوەی ئەم پلانە بەپەسند بزانێ. وەک دەڵێن، کامبەخش، ئیرەج ئەسکەندەری و ئەردەشێر ئاوانسیان بینیبوویان، ئەوانیش هەندێکیان پەسندیان کردبوو و هەندێکی تریان بەرهەڵستی. بێگومان پەسندی و بەرهەڵستیی ئەوان ڕوویێکی ڕەسمیی نەبوو. بەڵام ڕێکخراوی ئەفسەری، لەوانە ڕوزبێی قارەمان، ڕاپەڕینیان پێ پەسند بووبوو. دانش ڕۆژی دوواییی کە ویستبووی بگەڕێتەوە مەشهەد گوتبووی کۆمیتەی ناوەندی چ لەگەڵدا بێ چ دژ ئێمە ئەم کارە هەر دەکەین.

کەلوپەل و ئامێری ڕاپەڕین، لە وێنەی جلوبەرگی ئەستوور، زەمزەمی، ڕەخت، خواردن و شتی تر لە ماڵی عەقید «ئەبولقاسم عەزیمی» کە پاشان لە ئازربایجان بەدارەوە کرا، هەڵگیرابوو.

ئەو شەوەی بڕیار بوو بەڕێ بکەوین، ئەرکی هەر کەسێک پێشتر دیاری کرابوو. دەبوو من لە چەکەکانی لای خۆم - ئەو کاتە سەرکردەی «بطریه»ی سەربەخۆی فیرقەی هەشتی خۆراسان بووم - ٢٠ پارچە تفەنگ، ١٠ شەش ئاگر، و بڕێکی تەواو گوللە بهێنم. ئەرکی ئەسکەندانی خۆیشی ئامادەکردنی لۆری بوو. دەبوایە ئەو جگە لە دوو لۆری و جیێبێک کە مایەی پێویستی بوون، هەروەها سەرجەم ئامێرگەلی مۆتۆریی فیرقەش لەکار بخات بۆ ئەوەی پاشان نەتووانن سەرمان لەدوو بنێن.

شەوی ٢٥ خەرمانانی ١٣٢٤ بوو بەرەو قۆچان بەڕێ کەوتین: ١٩ ئەفسەر و شەش سەرباز. لە هەموو شوێنێک بەدەم ڕێوە تێلی تەلەگراف و تەلەفۆنمان پساند. گرینگترین ڕووداوی سەر ڕێگە چەک لێکردنەوەی مۆڵگەی «مراوەتەپە» بوو. مراوەتەپە شارۆکەیەکە لە نێزیک سنووری سۆڤیەت کە سریەیەک لەوێ خۆی گرتبوو. ڕاسپاردەی ئەسکەندانی بۆ ئێمە ئەوە بوو ئەگەر جەندرمە یان هەر پاسەوانێک بەنیازی وەستاندن هاتە پێش ئۆتۆمۆبێلەکانمان ئەوا بەبێ پرس و وەڵام بیدەینە بەر ئاگری دەسرێژ. ڕووداوی ئاوەها ڕووی نەدا، تەنانەت لە بجنوورد، ئێمە بەپێی پیلان زۆر بەئاسانی لە شار وەدەرکەوتین. شەوی پاشتر گەیشتینە مراوەتەپە، لە دەوروپشتی شار پارێزمان وەرگرت و بۆ سبەینێ پیلانی چەک لێ کردنەوەی مراوەتەپەمان زۆر بەئاسانی کرد بەکردەوە.

سەرۆکی ڕوکنی ٣ی ئەرکانی فیرقە «رائید پیرزادە» لەگەڵ ئێمەدا بوو، ئەو دەیزانی کەوا بڕیارە دەستەیەک لە تارانەوە بۆ پشکنینی مۆڵگەکان بنێردرێ. ئەو ئەم بابەتەی پێشتر بەمۆڵگەی مراوەتەپە ڕاگەیاندبوو. هەروەها هەمان کات مراوەتەپەی ئاگەدار کردبوو کە پێش ناردنی دەستەی پشکنینی تاران، دەستەیەکیش لەلایەن فیرقەوە دەنێردرێتە لایان.

لە مەشهەد ئەو نامانەی بۆ سەرکردەی مۆڵگەی مراوەتەپە ئامادە کرابوون بەمۆر و ئیمزای فیرقەوە لەبن دەستی ئەسکەندانیدا بوون. ئەو نامانە، رائید پیرزادەیان بەناوی سەرۆکی دەستەی پشکنینی فیرقە بەمۆڵگە دەناساند. لە نێزیکی مراوەتەپە رائید پیرزادە، نەقیب نەدیم و ملازم یەکەم قەمسەریان و یەک دوو مرۆڤی تر بەناوەی دەستەی پشکنینی فیرقەوە سواری جیێب بوون و پێنج کەسیش لەو سەربازانەی لەگەڵماندا بوون بەهاوەڵەتیی ملازم یەکەم نەجەفی «ئەفسەری ئینجیبات» ئەوانیان پاسەوانی دەکرد. بەو ئاوایە «دەستەی پشکنینی فیرقە» چووە ناو مراوەتەپەوە.

رائید پیرزاده هەر بەگەیشتنی، دەست دەکات بەڕەخنەگرتن و بیانوو لە سەرۆکی مۆڵگە ملازم یەکەم فەخران. پاشی ماوەیەک لە پشکنین، ئەو و سەرکردەی تیپ لادەدا و دەسبەجێ فەرمانیان پێ دەدا بچن خۆیان بەمەڵبەندی فەوج بناسێنن. ئەوان لە جێب سوار دەکات و بەرەو بجنووردیان دەنێرێ کە بێگومان ئێمە لە نیوەی ڕێگە چاوەڕوان بووین و، گرتمانن.

ئەو دەستەیەی پێشتر چووبوو، بەکاردارانی تری سریەی گوتبوو کەوا دەستەی پشکنینی تاران بەڕێوەیە و بەم زووانە دەگاتەجێ. ڕائید ئەسکەندانیش لەگەڵ چەند کەسێکی تر بەناوی ئەم دەستەیەوە ڕێگەی مراوەتەپە دەگرنەبەر. سەربازانی مۆڵگە لەلای ئەم دەستەیە گازن دەکەن کەوا ماوەی خزمەتیان بەکۆتا هاتووە و ئەوان لە زیادە لەم مۆڵگەیە ماونەتەوە.

سەرۆکی دەستە، ڕائید ئەسکەندانی بەڕواڵەت خۆی دڵتەنگ پێشان دەدا و فەرمان دەردەکات سەربازان دەسبەجێ بەرەو ڕووکاری بجنوورد بکەونە ڕێگە. تەنیا یەک ئەفسەر لە مۆڵگە مابووەوە، ئەویشی بەبیانوویێکەوە ناردە لای ئێمە و گرتمان. بەپێی پیلانی پێشوومان تەبای دیلەکان بەرەو مراوەتەپە کەوتینە جووڵە و، لە شوێنێک کە پێشتر دیاری کرابوو، هەڵوەستەمان کرد.

هەڤالانی ئێمە لە مراوەتەپە تەواوی چەکی مۆڵگەیان لە لۆری بارکرد و بەرەوڕووی ئێمە هاتن. ئیتر ئێمە لە ڕووی چەکەوە تێروتەسەل بووین: دوو برێنی سووک، ١٣٠ پارچە چەک، سی هەزار گوللە، وێڕای برێکی تری گوللە کە لە مەشەدەوە لەگەڵ خۆماندا هێنابوومان.

دیاریکردنی چارەنووسی سێ ئەفسەرە دیلەکە بووبوو بەکێشە بۆمان. نەماندەزانی چییان لێ بکەین. هاوەڵێکی ئێمە، حوسێن فازلی، پێشنیازی کرد هەرسێکیان بدەینە بەر گوللە و بیانکوژین. دەیگوت ئێمە گرووپێکی شۆڕشگێڕین و دەبێ شۆڕشگێڕانە هەڵسوکەوت بکەین. بێگومان هیچ یەکێ لە ئێمە ئەمەی پەسند نەکرد. ئەسکەندانی دەیگوت مەرج نییە شۆڕشگێڕانەترین کار تیژترینیان بێت، بگرە دەبێ ژیرانەترینیان بێت. دوواجار بۆ ئەوەی نەتوانن لەم ناوچەیە، کە پێی شارەزا بوون، گرووپگەلێ لە دژی ئێمە ڕاست بکەنەوە، بڕیارمان دا دوور لەم شوێنە بەرەڵلایان بکەین و هەر ئەم کارەشمان کرد.

بیست و حەوتی خەرمانان گەیشتینە «گونبەت کاوس». لەوێ سۆڤیەتەکان ئێمەیان

ڕاگرت. ئەسکەندانی پێشتر فەرهەنگێکی فڕەنسی - ڕووسیی پەیا کردبوو، بەیارمەتیی ئەو فەرهەنگە، بەشەپەشەپ دەیتوانی لەگەڵیاندا بدوێ و بڕوایان پێ بێنی ڕێگەمان بدەن بەرەو گورگان بچین. مەبەستی ئەسکەندانی ئەوەبوو لەوێ لەگەڵ «ئەحمەد قاسمی»ی بەرپرسی کۆمیتەی هەرێمایەتیی حزبی توودە لە گورگان پێوەندی بکات. وا پێ دەچوو «کامبەخش» لە تاران پلانەکەی بینیبێ و «دانش»ی ڕاسپاردبێ ئێوە بەرەو گورگان بڕۆن و من لەوێ فەرمان بەقاسمی دەدەم یارمەتیی پێویستتان پێشکێش بکات. شەو، لە دوو کیلۆمەتر دووری گورگان لە دارستانێکی دوورەپەرێزی جادەدا هەڵوەستاین. بۆ سبەینێ ئەسکەندانی چوو بۆ گورگان، کە هاتەوە زۆر دەمارگر بووبوو، وا دیاربوو قاسمی پێی گوتبوو:

- ئێوە کارێکی لەخۆوەتان کردووە. ئێمە لە هەلومەرجێکدا نیین بتوانین ڕاپەڕینی چەکدارانە بکەین. ئەم کارە بیانوو دەدا بەدوژمن بۆ ئەوەی پەلاماری ڕێکخستنەکانی حزب بدات. ئێمە بەهیچ بارێک ئالیکاریی ئێوە ناکەین.

پێ دەچوو ئەسکەندانی پێوەندیی بەسۆڤیەتەکانەوە کردبێ. ئەوانیش ڕوویێکی خۆشیان پێی پیشان نەدابوو و ڕێنوێنیی ئەوەیان کردبوو بچێتە خاڵی نەگیراوی نێوان «گونبەت» و «مراوەتەپە» و لەوێ چاوەڕوان بێ. لە «گورگان» شەش ئەفسەری تر کە لە تارانەوە هاتبوون، هاتنە پاڵ ئێمەوە. ئەمانە پاشماوەی ئەو ئەفسەرانە بوون کە دەیانویست بەگەلەکۆیی لە تاران ڕابکەن بەڵام سەرنەکەوتبوون. تەنێ ئەم شەشە لە مەترسیدابوون و بەدزی هاتبوون بۆ باکور بۆ لای ئێمە. یەکێ لەوان عەقید «ئازەر» و ئەوانیتر: نەقیب «ڕەسەدی ئیعتیماد»، ملازم یەکەم «عەبدولحوسێن ئاگاهی»، «محەمەد پوور هورمزان»، «پزیشکیان» و «وەتەنپوور». ئەمەی دووایی پاشان چوو بۆ سۆڤیەت بەڵام لەوێ جارێکی تر هەڵاتەوە بۆ ئێران و چووەوە بن دەسەڵاتی میری. ئیتر ژمارەی ئێمە بوو بە ٢٥ ئەفسەر و ٦ سەرباز.

بڕیارمان دا بگەڕێینەوە و بچینەوە هەمان ئەو شوێنەی بۆیان ڕاسپاردبووین. لە «گونبەت» جارێکی تر سۆڤیەتەکان ئێمەیان گیر کردەوە بۆ ئەوەی پرس بەبەرپرسانی سەرەوەی خۆیان بکەن. ئێمە کەڵکمان لەو هەلە وەرگرت، تاوێ پشوومان دا و برێک پێ بژیومان کری. بڕیارمان دا بەشەو بەرێ بکەوین لەبەرئەوەی لە ڕووی هێمنی و هەواوە لەبارتر بوو. هەروەها ئەسکەندانی بڕیاری دا لە گونبەت پێوەندی بەبەڕێز «بەهلەکە»وە

بکات کە بەرپرسی حزبی بوو لەوێ، بۆ ئەوەی بەیەکەوە بڕیار و پرۆگرام بۆ داهاتوو دابنێن.

لە گونبەت هەندێ جەندرمە خۆیان گرتبوو، ئەو ئەفسەرانەی کارداری پەیاکردنی پێ بژیوی بوون هەواڵیان هێنا وا جەندرمە خۆیان بۆ رووبەڕووبوونەوە ساز دەدەن. بەڵام «ئەسکەندانی» ئەوەندە لە خۆی دەرچووبوو پێی وانەبوو جەندرمە و پاسەوان بوێرن خۆیان لە ئێمە بدەن. جەندرمەکان پێشتر پێوەندییان بەتارانەوە کردبوو و لیوا روکن «ئەرفەع»ی سەرۆک ئەرکان فەرمانی پێ دابوون پێش لە ئێمە بگرن. وێڕای ئەمە بۆ سەری هەر یەکێک لە ئێمە چەند هەزار تومان خەڵاتیان دانابوو. سەرۆکی جەندرمەی گونبەت ملازم یەکەم «حوسێنی»ش تەواوی جەندرمەکانی ئەو ناوە و پاسەوانانی هێنابووە ناو گونبەت بۆ ئەوەی ڕێگەمان ٢٥ بگرن. لەلایەکی ترەوە رائید «فیرازی» پێوەندیی بە «ئەسکەندانی»یەوە کرد بۆ ئەوەی کێشەکە بەئاشتەوایی چارەسەر ببێ. لەو وتووێژەدا بەڕێز «بەهلەکە»ی بەرپرسی حزب لە گونبەت پێناو بوو.

لێرەدا ناچارم بابەتێکی تر بەبیر بهێنمەوە: وەک دەبینرێ تەواوی کار و بڕیار لە ڕێگەی ئەسکەندانییەوە جێبەجێ دەکران، بەڵام بەهاتنی شەش ئەفسەر لە تارانەوە کە عەقید ئازەریش لە ناویاندابوو، ئیتر دەبوو سەرۆکایەتی بەو بسپێردرێ لەبەرئەوەی بەرپرسی ڕێکخستنی سوپا بوو. ئەم کێشەیەش بەلێزانی لەلایەن ئەسکەندانییەوە چارەسەر کرا. ئەو کاتەی لە گونبەت خەریکی حەسانەوە و پەیاکردنی پێ بژیوی و وەرگرتنی هەلی بەڕێ کەوتن لەلایەن سۆڤیەتەکانەوە بووین، ئەسکەندانی هەموو هاوەڵانی کۆوە کرد و گوتی:

- لێرە کاری من تەواو دەبێ و بەهاتنی هاوڕێ ئازەر ئەرکی هەمووومان ئەوە دەبێ گوێڕایەڵی ئەوبین. بەڵام چاتر ئەوەیە بەهەڵبژاردن بێ.

ئازەر وەڵامی دایەوە بەبۆچوونی ئەو واچاترە خۆی هەتا دوایی ڕابەری ڕاپەڕینەکە بێ. لەبەرئەوەی ئەو دەستی پێ کردووە و ئەفسەران باشتر لەو تێ دەگەن.

هەرچۆن بێ پاش ماوەیەک لە یەکترناسین، هەڵبژاردن کرا و ئەسکەندانی بەتێکڕای دەنگ بوو بەڕابەری ڕاپەڕین. لەڕاستیدا ئەمە خۆنواندنێک بوو ئەسکەندانی بۆ چەسپاندنی شوێنی خۆی لە بەرامبەری ئازەردا کردی.

دواجار سەعات ٥ی پاشنیوەڕۆی ٢٩ خەرمانان ١٣٢٤ لە باخی کشتوکاڵی کە شوێنی

حەسانەوەمان بوو، دەرکەوتین و بەهەموو کەلوپەل و ئامێرەوە کەوتینە ڕێ. لەبەرئەوەی بەهۆی هەواڵی دژ و بەردژ لەناو شار و هاتنی جەندرمە و پۆلیس بشێونەیەک هاتبووە کایە، ئەسکەندانی خۆی چووە سەرکردایەتیی کاروان و تەبای هاوەڵانی شەڕ، سواری جێب بوو.

ڕوونی دەکەمەوە کەوا ئێمە لە ڕێگە دابەشی پێنج گرووپ یان پەل بووین و هەر پەلەی بەرپرسێکی هەبوو. ئەسکەندانی بێجگە لەوەی ڕابەری ڕاپەڕین بوو، هەر خۆیشی بەرپرسی پەلێک بوو. پەلەکان بەنۆرە سواری جێب دەبوون و دەبوون بەسەرگەلەی کاروان. ئەو ڕۆژانە، ئەرکی سەرگەلەداریی کاروان لە ئەستۆی «ئەسکەندانی»دا نەبوو بەڵام بۆ ئەوەی هیچ هەڕەشە و گوڕەشەیەک لە گۆڕێدا نەمێنێ و بەبوێریی خۆی زاتمان وەبەر بنێ، بەپێشمان کەوتبوو.

جەندرمە و پۆلیس لە باڵەخانەی شارەوانی کە بەسەر شەقامەکەیدا دەڕوانی، بەخۆیان و تفەنگ و برێنەوە خۆیان لە پارێز نابوو. پاشان بیستمانەوە ژمارەیان سەت و بیست کەس بووە و دوو برێنی سووکیشیان هەبووە. هەرکە جێبی ئەسکەندانی گەیشتە نێزیکی شارەوانی، کتوپڕ و بێ هیچ دەنگدانێک لە دوو لوولەی برێن و سەت و بیست تفەنگەوە ئاگر بەسەر «جێب»دا باری. من لە ئۆتۆمۆبێلی دووەمدا بووم و بینیم جێبەکە دەسبەجێ داوەشا و لەناو تەپ و دووکەڵدا بزر بوو.

تەواوی ئەم ڕووداوە لەیەک وردکەدا رووی دا و سەرنشینەکانی جێب بێ ئەوەی کەمترین بەرتەکیان لێ دەرکەوێ شەهید بوون. ئەوان حەوت کەس بوون: ڕائید ئەسکەندانی، ملازم یەکەم نەجدی، ملازم یەکەم شابازی، ملازم یەکەم نەجەفی، ملازم دووەم مینائی و، سەربازانی موکەللەف مووسا ڕەفیعی و بەهلوول لە تەنیشت یەکتر و لە ئاگری ڕاپەڕینێکی پاڵەوانانە بەڵام لە کاتێکی نالەباردا سووتان.

پاشان هەواڵ هات کە تەرمەکانیان بەتەواوەتی داوەشاون.

تەرمەکان هەتا بەیانی لەناو جێب و لە ناوەندی جادە مابوون. لەناو جێبەکەدا چەند نیوە پێستەیەک هەبوون بۆ ئەوەی ئەگەر شەوان سەرما داهات سوودیان لێ وەربگرن. ئەو دەمەی بای دەهات و پێستەکانی دەبزواند جەندرمەکان لە ترسان دەستیان بەئاگرهاوێژی دەکرد و تەرمەکانیان بەر گوللە دەدا. بەم ئاوایە هەتا بەیانی تەرمەکان لەبەریەک هەڵوەشان.

ئۆتۆمۆبێلەکان دەسبەجێ وەستان. ئێمە لەبەرامبەر شارەوانی دابەزیین. سەرەتا لە پەرگەی جادە و پاشان لە پەنای دیواری باڵەخانەکانی بەرامبەر، پارێزمان گرت. لە ئۆتۆمۆبێلەکەی ئێمە یەک سەر مرۆڤ «ملازم یەکەم ئیحسانی»ی شوفێرمان بریندار بوو. ئەو لەو کاتەی لە ئۆتۆمۆبێلەکە دەهاتە خوارەوە بەرکەوت. لە ئۆتۆمۆبێلەکەی دواوەشمان ملازم یەکەم رەحیم شەریفی بەهەمان شێوە بریندار بوو. ئەوانیتر هەموومان یان لەناو نۆبنی لێواری جادە یان لەپەنای دیواری باڵەخانەکانی بەرامبەر شارەوانیدا پارێزمان گرت و رووبەڕوویان وەستاین. یەکێ لەو برێن - دلرانەی ئێمە خۆی گەیاندە بن یەکێ لە ئۆتۆمۆبێلەکان، برێنەکەی سوار کرد و کەوتە دەسرێژ. ئێمە پاش زیانەکانی سەرەتا ئیتر زیانمان لێ نەکەوت تەنانەت توانیشمان چوار کەس لە جەندرمەکان بپێکین کە لە پەنجەرەی شارەوانییەوە تەقەیان دەکرد.

ئەم دەسرێژە ماوەیەک درێژەی کێشا. ئەو کاتە عەقید ئازەر رابەرایەتیی گرتە شان. کاتێ سەرنجم دا وا عەقید ئازەر لە ناوەندی جادە وەستاوە و بەدەست ئیشارەت دەدا وەدوای کەوین. ئێمە پێمان وابوو لە دیوی پشتەوە هێرش دەباتە سەر شارەوانی. لە هەلێکی گونجاودا، لە پەنای دەسرێژی هاوەڵانەوە من و چەند کەسێکی تر لە جادە پەڕینەوە و بەدوای ئازەر کەوتین. دوو کەسی تر کە بریندار بووبوون لە لێوی جادە مانەوە، هەندێکی تر لە نهۆمی دووەمی باڵەخانە و لەبن میچی خانووەکەوە بەرەو بنکەی پۆلیس تەقەیان دەکرد. ئەمانە هەتا نیوەی شەوێ لەوێ مابوونەوە و بەسوودوەرگری لە تاریکی و نوتەکیی شەو خۆیان گەیاندبووە ناو ئۆتۆمۆبێلەکە، توانیبوویان برێک پارە و هەندێ ئامێری پێویست دەرباز بکەن. لەمە بەدواوە هەر کۆمەڵە و چارەنووسێکی جیای بەسەر هات، هەندێکیان پاشان هاتنەوە پاڵمان.

یەکێ لە بریندارەکان برای خۆم و ئەویتر بەهرام دانش بوو، لە پشتیان دەکەن و دەیانبەن بۆ مۆڵگەی سۆڤیەتەکان، ئەوانیش هەر وەریان نەگرتبوون. ئیتر بەناچاری بریندارەکانیان لە شوێنێکی دەرەوەی شار حەشار دابوو. بۆ سبەینێ جەندرمە، بریندارەکانیان بەگیر هێنابوو و ناردبوویانن بۆ تاران. بێجگە لەو دوو کەسە، سێ ئەفسەری تر: نەقیب بەهرام دانش، ملازم یەکەم حوسێن فازلی، ملازم دووەم عەلی سونائی و چوار سەرباز: مەسعوود تەفرشیان، عەلی ئەکبەر فزووهش، عەلی وسووق و شاهێن لە شوێنی جیاجیا هەتا دەگاتە شاهڕوود دەگیرێن و دەگوازرێنەوە بۆ گرتووخانەی ئینجیبات لە تاران. ئیتر بەو ئاوایە ئەو

ڕاپەڕینەی وا ئازا و بوێرانە و بەوردی لە خۆراسـان سـەری هەڵدا، پاشی پێنج ڕۆژ لە گونبەت، لە خوێناوی شەهیدانی خۆیدا گەوزی.

ئەو کاتەی دوا بەدوای ئازەر لە شەڕگە وەدەر کەوتین ئەو بیرەمان لە کەڵکەڵەدا بوو کە ڕێگەیەکی لەبار بۆ هێرش بردنە سەر بنکەی پۆلیس بدۆزینەوە و وەڵامێکی گونجاو بۆ ئەو شکانە کتوپڕە بدەینەوە. بەڵام چەندێکی لە شـەڕگـە بەدوور دەکـەوتین هێندەی تر شوێنەواری شکان خۆی دەنواند و ورەی شەڕوانیـمان دادەبەزی. ئەو زەبرەی لە گومبەت پێمان کەوت، ئێمەی گێژوویژ کرد. لە دەرەوەی شار، لە دوو کیلۆمەتر دووری شاردا خۆمان لە پشت گردوڵکەیەک مەڵاس دا و بەهزری خۆمان پارێزمان گرتبوو کە شتێکی تەواو بێ واتا بوو. لەبەرئەوەی نەکەسێک بەدواماندا دەگەڕا و نەدەکرا لەوێوە پەلاماری شوێنێک بدەین. لەوێ بوو ئازەر گوتی:

- لێـرە بنووین چی بکەین. هەڵسن با بەڕێ بکەوین، ئەوانەی کـوژران کـوژران، بریندارەکانیش بەلای زۆرەوە دەگیـرێن، ئێمـە دەبێ بەپلەی یەکەم خۆمـان بەشوێنێک بگەینین هەتا بەم ژمـارە کەمەی خۆمـانەوە ئەگەر ڕووبەڕووی پەلامـار بووینەوە، بتـوانین بەرگرییەک لە خۆمان بکەین.

ئیتر ئێمەی بۆ لێڕەوارێک ڕێ بەدێیی کرد. لەوبەری ڕێ لە لێڕەوارەکە لامان دا. ڕائید «شـیـفـائی»ی بەرپرسی دارایی ڕاپەڕین بڕێک پارەی پێ بوو «نێـزیکەی شـەش هەزار تومان»، گوتی:

- لەبەرئەوەی دوور نییـە بەناچاری لەیەکـتر دابڕێین وا چاترە هەریەک لە ئێمـە بڕێک پارەی پێ بێ. پارەکەی دابەش کرد، هەریەکە و شەشسـەت تومانمان پێ بڕا. بەبەزیوی، نەخۆش و ورە ڕماو بەڕێ کەوتین. تاکە کەسێکی ورەی هەبێ، ئازەر بوو.

هەرچۆن بێ بەگاگۆلکێ و کەوت و ڕەوت، خۆمـان بە«شاپەسند» گەیاند. لە شاپەسند بنکەیەکی جەندرمە هەبوو، پێش ئەوەی بگەین بەشاپەسند ئازەر پێشنیازی کرد وا چاکە سەرەتا بنکەکە سەراسۆ بکەین و ئەگەر ژمارەی جەندرمەکان کەم بێ، چەکیـان بکەین. لەبەرئەوەی هێشتا نەگەیشتبووینە قۆناغی کردەوە، کەسمان بەربەرەکانێی نەکرد. ئەو خۆی بەتەنیـا چووە سەراسۆ و هەواڵی هێنا تەنیـا یەک جەندرمـەی نوستووی لێیە و یەکێکی تریش لە دەرەوە پاسەوانی دەکات و، پێشنیازەکەی خۆی دووپات کردەوە. هەموومان دژبەر بووین و لە بنکەکـە دوور کـەوتینەوە. سـەعـات نێزیکی دوازدەی شـەو بوو لە پەرگـەی لێڕەواری شاپەسند هەڵوەستاین و هەتا سبەینێ سەعات ٥ بەنۆرە سەرخەومان شکاند.

ئازەر نەخشەکێش و هەروەها ئەسپ ناسێکی لێزان بوو، بۆ کڕینی ئەسپ چەندان جار هاتبووە «تورکمان سارا» و شارەزای ئەم ناوە بوو. چووە سەر بنەدارێک و پاش سەراسۆیی، ڕێگەی بزاوتنی بۆ دیاری کردین.

لێرە ملازم یەکەم پوور هورمزان رووی تێ کردین و گۆتی:

- دەتانەوێ بچن بۆ کوێ؟ ئێمە بەم دوازدە تفەنگەوە چیمان لە دەست دێ. ئەگەر بەکۆمەڵ و پێکەوە بین پتر لە مەترسیدا دەبین، بەتایبەتیش ئەم تفەنگانە هەر بکوژی ئێمەن. ئەوا من چووم.

ئەمەی گوت و تفەنگەکەی تێ هەڵدا، بلووزە سەربازییەکەی داکەند، پووزەوانەی پۆستاڵەکەی بڕی و گوتی:

- من دەچم پێوەندی بەحزبەوە دەکەم. خوا حافیز!

و ملی ڕێگەی گرتەبەر.

ئاخاوتن و هەڵسوکەوتی پوور هورمزان شوێنەواری نالەباری بەسەر ئێمەوە بەجێ هێشت.

ئێمە لە تەنیایی دەترساین بۆیە وەدوای ئازەر کەوتین و چووینە ناو لێڕەوارە مەزنەکەی ئەوێ. لەوێ کەمێک هەستمان بەدڵنیایی دەکرد و لێڕەوار ئێمەی لە باوەشی خۆی دەگرت. نێزیکەی دە ڕۆژێک لە لێرستانەکەی نێزیکی شاپەسند ماینەوە. لەو ماوەیە پیرەمێرێکمان لێ راست هاتبوو پێ بژیویی بۆ دەهێناین، هەروەها ئازەر چەند جارێک ئەرکیشی پێ راسپارد. لەمانە جارێکیان ناردی بۆ گونبەت هەتا زانیاریمان لەبارەی کوژراوەکان و هەلومەرجی ئەو شوێنەوە بۆ بهێنێ. هەر ئەو کاتە جارێکیش ئازەر بۆ بەدەس هێنانی یارمەتی چوو بۆ مۆڵگەی سۆڤیەتەکان بەڵام پێیان گوتبوو ئێمە ئێوە ناناسین و دەبێ لەم بارەیەوە پرس بەمەڵبەندی خۆمان بکەین.

جارێکیان ویستمان لە ڕێگەی لێرستانەوە خۆمان بەگورگان بگەیێنین بەڵام پاش هەوڵی ڕۆژێکی تەواو لەناو ئەو بێشەڵانە چڕ و فرەوانەدا بزر بووین.

ئازەر هەر بەو پیرەمێرەی «هیچ جار ناویمان نەزانی» گوت هەتا برێک جلوبەرگی تورکمانیمان بۆ پەیا بکات بۆ ئەوەی بتوانین بەهۆی جلگۆڕییەوە لە بێشەڵانەکە دەرکەوین. شەوێکیان، نیوەشەو ئازەر تفەنگەکانی لە شوێنێک کە پێشتر خۆی سەراسۆی کردبوو، شاردەوە. پیرەمێر و هاوەڵەکەیشی پێشتر جلە تورکمانییەکانی بۆمان ئامادە

کردبوو، پیرەمێر ئێمەی هەتا نێزیکی جادە ڕێنوێنی کرد، خوا حافیزیی لێمان کرد و چوو. پێم وایە پیرەمێر دەبێ ئێستە مردبێ، خوا لێی خۆش بێ.

تورکمان سارا وەک ناولەپی دەست بێ گرێیە و، ڕێگەدۆزی تیایدا کارێکی ئاڵۆزە. ئێمە نیوە ڕۆژێک لەو دەشتەدا سووڕمان دا هەتا دواجار گەیشتینەوە شوێنەکەی سەرەتا. ئەو کاتە نەقیب «پزیشکیان»، پێسیری «ئازەری» گرت و بەجنێوەوە گوتی:

- ئەمە چ کارێکە چەند ئەفسەرێکتان هێناوەتە ئەم سارا و بیابانە و وەک زلۆبی سووڕیان پێ دەدەن.

بەستەزمانە هێشتا پێی وابوو ئەفسەرە. بەردەوام دەیگوت رابەری بەڕێز دەبینی چ هەڵەیەکت کرد. بەڵام ئازەر هەموو دەم لەسەرەخۆ بوو و دەیویست کارێکی بەسوود بکات. قسە و باس هەموو جار دەگەیشتە ئەوەی هەموو ئەو قسانەی گوتتان درۆ بوو. دواجار جامی سەبری رائید «شیفائی» پڕ بوو و لێی رژا، هاواری کرد:

- وس بن! مارکس و ئەنگلسی بەستەزمان گوناحیان چییە ئەگەربێو ئێمە تیۆری و ڕێنوێنییەکانی ئەوان تێ نەگەین و بەچەوتی جێبەجێیان بکەین؟...

نێزیکی نیوەڕۆ بوو چوار کەس گەمارۆیان داین و بەتورکمانی هەندێک قسەیان کرد و ئێمەیان بەدزی و ڕێگری تاوانبار کرد. دەڵێن لە تورکمان سارا دەنگوباس لە تەلەگراف زووتر دەگوازرێتەوە. هەواڵی ڕۆیشتنی چەند مرۆڤێکی بیانی گەیشتبووە هەموو شوێنێک. ئازەر زمانی تورکمانیی دەزانی، پێیانی گوت ئێمە کێین و گەفی لێ کردن ئەگەربێو مووەک لەسەری ئێمە بەربێتەوە ئەوا سۆڤیەتەکان باوکیان دەردێنن. ئازەر ورەی ئەوانی دەناسی و هەر بەهۆی ئەم ناسینەش بەڵێنی پێ دان ئەگەر بمانگەیننە گورگان ئەوا دوو دەمانچەیان دەدەینێ.

هەرچۆن بێ ئەوان ئێمەیان شاردەوە و خواردنیان بۆ هێناین، ڕۆیشتن هەتا دەمەوئێوارە بێنەوە و بمانبەن بۆ شوێنێکی هێمن. ئازەر بۆ چاوەدێری چووە سەر بنەدارێک، ئێمەش هەریەکە و سەعاتێک نووستین.

دەمەوئێوارە تورکمانەکان چوار ئەسپیان بۆمان هێنا، شەو ئێمەیان برد بۆ هەوارێک(٤)، دەمانچەکانیان وەرگرت و لێیان دا ڕۆیشتن. لەم هەوارە پاش شیو خواردن

(٤) هەوار واتە (هۆبە): گوندی تورکمانان - نووسەر.

پەنجا تومانیان لە هەریەکێ لە ئێمە ویست هەتا بمانبەنە گورگان بەڵام ئەوانیش پاش وەرگرتنی پارەکە ئێمەیان گواستەوە بۆ هەوارێکی تر. لە هەوارە نوێیەکەدا ئازەر هاوەڵێکی پەیا کرد، ئێمەی بەو سپارد و خۆی لێمان جیا کردەوە. ئێمە لێرە شەش ئەفسەر مابووین و هەریەکە و بەجۆرێک خۆی جیا کردبووەوە. لەم هەوارە نوێیەشدا دەیانویست هەر ئەو چیرۆکەی پێشوو دووبارە بکەنەوە بەڵام ئێمە نەچووینە ژێری. لاوێک رازی بوو بەدووسەت تومان هەتا سەر جادەی گورگانمان ببات. سەعات و نیوێک پاش نیوەشەوی رۆژی پاشتر گەیشتینە جادە. لەوێ بوو جارێکی تر رائید پیرزادە هەڵچووەوە، پاش هەندێک قسەی بێ رێ و جێ بە«ئازەر» و «ئەسکەندانی»، تەبای «رائید شیفائی» لە ئێمە جیابوونەوە. ئەوان لەگەڵ یەکتر رێک کەوتبوون. لەبەرئەوەی رائید شیفائی سەرۆکی بەسەربازگریی «سەوزەوار» ببوو و لەوێندەر ناسیاری هەبوو، بڕیاریان دابوو بەیەکەوە خۆیان بگەیننە سەوزەوار، خۆیان لەوێ بشارنەوە و پێوەندی بەحزب بکەنەوە. هەر ئەم کارەشیان کرد و پاشان هاتنەوە پاڵ ئێمە. پزیشکیانیش سەری خۆی بەردایەوە و گوتی:

- ئەوا منیش چووم.

ملازم دووەم «رەئیس دانا»یش گوتی:

- ئەگەر جیاجیا و بەتەنیا برۆین شیمانەی پێوەبوونمان کەمترە.

خوا حافیزیی لێمان کرد و بەری خۆی دا بەلایەک. من مامەوە و ملازم یەکەم «کەیهان». ئێمە بڕیارمان دا بەسواری خۆمان بەگورگان بگەینین، بەڵام لەبەرئەوەی جلوبەرگمان تیتۆڵ بەتیتۆڵ و هەژارانە بوو هیچ شوفێرێک ئەزیەتی راوەستان و سوارکردنی ئێمەی نەکێشا. ناچار بەپێیان دامانەوە رێ.

سۆڤیەتەکان لە دارستان داریان لە هەندێ گالیسکەی ئەسپ کێش بار دەکرد، من بەو چەند وشە رووسییەی دەمزانی لەگەڵ یەکێکیان رێک کەوتم کەوا هەریەکە و بیست ریاڵی پێ بدەین بۆ ئەوەی هەتا گورگان سوارمان بکات.

نێزیکەی سەعات پێنجی پاشنیوەرۆ بوو گەیشتینە گورگان. مانگی رەمەزان بوو. ئەو رۆژە بەو سەر و سەکوتەوە نەمانتوانی بارەگای حزبی توودە بدۆزینەوە، بڕیارمان دا شەو لە مزگەوتێک لابدەین. سەعاتێکی مابوو بۆ بەربانگ چووینە چایەخانەیەکی نیوەگیراو بۆ ئەوەی شتێک بخۆین.

بڕیارمان دا خۆمان وەک شوان و گاوان یان شتێکی ئاوهایی بناسێنین کەوا بۆ دۆزینەوەی کار هاتووینەتە ئەم ناوە. من بەشێوەی ئاخاوتنی «نیشاپووری» دەدووام. ڕۆڵەکەشمان بەچاکی دەگێڕا. بۆ نموونە لە چایەخانەکە مێز و کورسی هەبوو بەڵام ئێمە گوندەکییانە لەسەر زەوی ڕۆنیشتین و کەوتینە خواردنی نان و پەنیر و چایە. ئەو دەمە دوو جەندرمە بۆ ڕۆژوو شکاندن هاتنە چایەخانەکە. ئێمە بەبینینی ئەوان بەڕاستی هەترەشمان چوو. نەماندەتوانی بیر بکەینەوە لەوانەیە ئەمانە بەڕێکەوت هاتبن بۆ ئەو شوێنە. بەڵام وێڕای ئەمەش خۆمان نەشێواند و لە وەڵامی خاوەن چایخانەکەدا گوتمان گاوانین و بۆ پەیاکردنی کار هاتووینەتە ئەم لایە. یەکێک لە جەندرمەکان گوتی:

– چەند کەیفخۆشی! کار لەکوێ هەیە؟ خەڵکی ئێرە خۆیشیان بێ کارن. بیست و چوار سەعاتە لەسێبەری دیوار پاڵ کەوتوون و تریاک دەکێشن.

ئێمە پێمان وابوو جەندرمەکان دەیانەوێ بەم جۆرە قسانە بمانخافڵێنن و لە هەلدا بمانگرن، ئیتر بەم ئاوایە ئێمەش هەتا دەهات خۆمان کرژ دەکردەوە و بچووکتر دەبووینەوە.

لە چایەخانەکە دەرکەوتین و لە بیری چارەدۆزییەکدا بووین. کەیهان بەبیری هاتەوە کچە پوورێکی لە گورگان هەیە و شووی بەپیاوێکی «عەرەب» ناو کردووە. دەشیزانی مێری کچە پوورەکەی دوکاندارە. هەرچۆن بێ دوکانەکەیان دۆزییەوە. پاشی چاکی و چۆنی، دوو دەستە جلکی بۆمان پەیا کرد و شەو ئێمەی بۆ ماڵ بردەوە. ئێمە پێوەی نووسابووین. بەڵام کیژە پوور بەبینینی «کاک مەهدی»ی پوورزای زۆر شادمان بوو. بۆ سبەی خانەخوێ بەشەرم و لەڕوو هەڵنەهاتنەوە داوای لێبووردنی کرد. مافی خۆی بوو. بەمەترسییە دوو پیاوی هەڵاتوو لە ماڵ دابکەی. ماڵێکی چاک بوون، پاکژ و خاوێن. دووای چەندان ساڵ بۆ بینینی خزمێک چوومە گورگان. هەوڵم دا شوێن پێی بیرەوەریم لەو بازێڕ و چایەخانە و مزگەوتەدا هەڵگرمەوە. ساڵان بەسەر ئەو کاتەدا تێ پەڕیبوون، نەکەسم بۆ دۆزرایەوە و نەناونیشانم بۆ هەڵگیرا. ئەگەر مابن یادیان بەخێر و ئەگەر مردوو بن خوایان لێ خۆش بێ.

بۆ سبەی، بەناوی دوو قوتابیی کۆلێجی یاسا سواری ئۆتۆمۆبێلی بەندەرشا بووین، بەڕواڵەت دەمانەوێ پشووی هاوین لە لێوی زەریا بەسەر ببەین. لە بەندەرشا، ئەندازیار «داختە» بەرپرسی حزبیی ئەو شارە بوو، زوو بەدەستمان کەوت. ئەو ئێمەی لە ماڵە کرێکارێکی بەندەرشادا شاردەوە و بەدەستی کرێکارێکی ڕاسپاردین کە لە ژوورێکی

دارین لەگەڵ دایکیدا دەژیا. دووای سێ چوار ڕۆژ سۆڤیەتەکان ئۆتۆمۆبێلێکیان پێ داین بۆ ئەوەی بمانگەیەنێتە شوێنێکی هێمن لە تورکمان سارا.

پاش ڕاپەڕینی ئەفسەرانی خۆراسان، لە تاران هەندێک لە ئەفسەران تەنگاو دەکرێن و هەندێکی تر سوور دەبن لەسەر ئەوەی بێنە پاڵ ئێمە. حزب ناچار بوو ئێمە و پاشماوەی ئەو ئەفسەرانەی هەریەکە و بەجۆرێک لە مەترسیدا بوون، کۆبکاتەوە. بۆ ئەم نیازە چاوی بڕیبووە هەواری سۆفیان لە نێوان گونبەت و مراوەتەپەدا. هەوارێک بوو، هیچ هەواڵێک لەوێ لەبارەی سوپای ئێران و سۆڤیەتەوە نەدەبیسترا. حزب تەواوی ئەفسەرانی پەرت و بڵاوی خۆراسان و هیتری لەوێ کۆکردەوە.

ئۆتۆمۆبێلێکی «زیسی» ئێمەی بۆ ئەو شوێنە برد، ئۆتۆمۆبێلەکە پڕ بوو لە ئالیکی هیشک و، ئێمە لەسەر ئالیکەکە نوستبووین. شوفێری ئۆتۆمۆبێلەکە سەربازێکی سوپای سوور بوو، تورکمانێکیش ڕێنوێنیی دەکردین. پێش ئەوەی بگەینە هەواری سۆفیان، ئێمەیان لە گونبەت بردە مۆڵگەی سۆڤیەتەکان. لەوێ رائیدێکی سۆڤیەتی گازنی کرد بۆچی دەستمان داوەتە ئەم کارە ناپۆختە. دوو دەستە جلکی سۆڤیەتییان لەبەر کردین و بردیانینە مۆڵگەی خۆیان لە گونبەت. کاتێ گەیشتینە ئەوێ بینیمان تەنیا نین، دە پازدە کەسێکی تر پێشی ئێمە گەیشتبوونە ئەو شوێنە. بەرەبەرە ژمارەمان گەیشتە چل کەس. ئازەریش بەر لە ئێمە گەیشتبووە ئەو شوێنە. پاشان شەوێک جلکە سەربازییەکانی سۆڤیەتیمان داکەند و جلکی خۆمانمان لەبەر کرد و رەوانەی هەواری سۆفیان کراین. لەوێ ئێمەیان دابەزاند و سۆڤیەتەکان گوتیان:

- ئێوەمان هەتا ئێرە هێنا و ئیتر لەمەولا کارمان بەسەرتانەوە نییە. چەکتان هەیە و پێویستە خۆتان ئاگاتان لە خۆتان بێ.

ئەو چەکانەی لە بێشەڵانەکە شاردبوومانەوە، ئازەر لەگەڵ خۆیدا هێنابوونی. بێجگە لەمە هەر کەسە و دەمانچەی خۆمانمان پێ بوو. دانیشتین و لێژنەیەکمان بەناوی «کۆمیتەی سوپای میللی»یەوە دامەزراند کە ئازەر سەرۆک بوو و چەند کەسێکیش «لەوان خۆم» ئەندامی کۆمیتەکە بووین.

بەهەموومان لە هەواری سۆفیان مۆڵگەیەکی بچووکمان پێک هێنا کە بێجگە لە داکۆکی لەخۆکردن مافی هیچ کارێکی ترمان نەبوو. ئەم بابەتەمان لەلایەن «ئەحمەد قاسمی»ی بەرپرسی ڕێکخراوی حزب لە گورگان پێ گوترا. ڕۆژی پاشتر هاتە سۆفیان و

گوتی پێویستە چاوەڕوانی فەرمانی حزب بین. تەنیا مۆڵەتی ئەوەی دا ئەو بنکە بچووکەی لە نێزیکی هەواری سۆفیان بوو چەک بکەین، ئەویش بەمەبەستی پاراستنی هێمنیی هەواری سۆفیان. بەڵام گوتی پێویستە کارەکە بێ پێکدادان و خوێنڕێژی جێبەجێ بکرێ. سەرۆکی بنکەی جەندرمە نایب زابتێک بوو بەناوی «کەیانی» کە پێشتر لەبەشی تۆپخانە لەبەر دەستی نەقیب «ڕەزم ئاوەر»ی هەڤاڵمان، خزمەتی کردبوو. ئەو پاش وتووێژ لەگەڵ ڕەزم ئاوەر جەندرمەکانی بەڕێ کرد و خۆیشی هاتە پاڵ ئێمە.

ئیتر بەو ئاوایە لە نیوەی دووەمی مانگی گەلاوێژی ١٣٢٤ەوە ئێمە لە هەواری سۆفیان بنەجێ بووین. هەر لەو کاتە فیرقەی دێموکراتی ئازربایجان دامەزرا و یەکەمین ڕاگەیاندنی فیرقە لە ڕۆژی سێیەمی گەلاوێژ ١٣٢٤ لەوێ گەیشتە دەستمان. دەستەی دامەزرێنانی فیرقە بۆچوونی خۆیان لەو ڕاگەیاندنەدا دەربڕیبوو. ڕاگەیاندنەکە لەلایەن «ئەحمەد قاسمی»یەوە بۆ ئێمە هات.

نێزیکەی ٢٥ ڕۆژ لەوێ بووین هەتا شەوێکیان هەواڵیان هێنا خۆمان کۆبکەینەوە و ئامادەی ڕۆیشتن بین. نیوەی شەو بەڕێنوێنیی لایتێکی دەستی، سێ چوار کیلۆمەتر بەپێیان ڕۆیشتین. لە گۆشەیەکی تورکمان سارا، لە پەنای کۆمەڵە پووشێکی پەستراوەدا کە سۆڤیەتەکان بۆ ئالیکی ئەسپەکانیان ئامادەیان کردبوو، کۆکراینەوە. لەوێ چەند ئۆتۆمۆبێلێکی سۆڤیەتی لە پەنای پووشەکە ڕاگیرابوون. رائیدێک کە بەرپرسی بەشەکە بوو، فارسیی دەزانی و قسەی لەگەڵماندا کرد. گلەی لە کاری نابەجێی ئێمە کرد و گوتی ئێوە بەڕاکردنتان لە سوپا گرینگترین بنکەی خۆتان لەدەست دا و هیچیشتان پێ نەکرا. پاشان پێی گوتین سوپا بۆ گرتنی ئێوە کاروانێکی تەواوی لە ڕێگەی «فەیرووز کۆ»وە ناردووە بۆیە «لەبەرئەوەی ئێوە گیانتان لە مەترسیدایە ئێمە ناچارین بتانگوازینەوە بۆ شوێنێکی تر».

ڕۆژئاوای ڕۆژی پاشتر بەڕێ کەوتینەوە و لە ڕێگەی جادەی لاچەپەوە لە سنووری «ئەستارا» پەڕیینەوە و بەرەو ئەو دیو ڕێنوێنی کراین. ئیتر بەو ئاوایە، لە دوادوای مانگی گەلاوێژ لە گوندێک بەناوی «شائۆلان» لە نێزیکی باکۆ بەشێوەی نیوەگیراو گیرساینەوە. سێ مانگی ڕەزبەر و گەڵارێزان و سەرماوەز لەوێ ماینەوە و لە ڕاستیدا بەشێوەیەکی ڕێزدارانە گیراین.

وەک لە هەر شوێنێکی دەرگە لێ گیراوی تردا، کاتێ هەندێ کەس پاش بەڕێ کردنی

زنجیرەیەک رووداو بێ کار و کردەوە دەبن. دەکەونە سەر و گوێلاکی یەکتر و کۆڵی دڵی خۆیان بەیەکتر دەڕێژن، لەوێش ئاوها بوو. سەرەتا شەپۆلێک دژایەتی لەهەمبەر ئازەردا سەری هەڵدا و ئەویان بەبەرپرسی سەرتاپێی ئەو راپەڕینە بێ بەرە دانا. پاشان دووبەرەکی دەستی پێ کرد. ئەو کێشە و گوریس کێشەکییە گەیشتە رادەی تێک هەڵدان و ئەوەی رۆژێکیان سەرۆکی گرتووخانە یان مێوانخانە «چۆنی حەز دەکەی وای ناوبنێ» خۆی تێکەڵ کرد. رائیدێک بوو، پاش ئەوەی هەموومانی کۆوە کرد گوتی:

ئێوە مێوانی ئێمەن. بەرژەوەندی ئێوە لەوەدایە ئێمە بۆ ماوەیەک بەشێوەیەکی دۆستانە لێرە چاوەدێریتان بکەین. ناچارمان مەکەن هەڵسوکەوتی درِتان لە بەرامبەردا بەکار بێنین و بیکەین بەدیسپلینی سوپایی.

لەنێوان ئەم باس و ململانە و پەژارە و ئاشتەواییەدا، ڕۆژێکیان هەواڵ هات کەوا ڕاپەڕینێک لە ئازربایجان ڕابووەتە سەر پێیان.

ئەو هەواڵە لە لایەن رائیدی سەرۆکی جێ نیشتگەوە بەئێمە درا. ئەو، ئێمەی کۆوە کرد و لە ناو قسەی ناسکوێژی خۆیدا گوتی:

- گەلی ئێران ڕابووە. سەرگەلەی ئەم ڕاپەڕینە لە ئازربایجانەوە سەری هەڵداوە، ئەو دەمەی گەل ڕادەپەڕێ هیچ هێزێک ناتوانێ ڕێگەی ببەستێ. ئەو خەڵکەی ڕاپەڕیوە ئاتاجی بەسوپا هەیە و من هیوادارم ئێوە هەر بەزوویی لە سەرۆکایەتیی سوپای گەلێری ئازربایجاندا ببینم. دڵنیام بۆ بەڕێوەبردنی سوپای ئازربایجان لە ئێوە پێوە کەسێکی تر نییە. ئەمە ئێوەن کە دەبێ شانەی یەکەمینی ئەم سوپایە بەدی بێنن و ڕێبەرایەتیی بکەن.

خولیای گەڕانەوە بۆ ئێران و پشکداری لە ڕاپەڕینی کۆمەڵانی خەڵک هەموو باس و ململانە و ڕابوێری و پێشبڕییەکانی خستە ژێر تیشکەی خۆیەوە. ئیتر لەمە بەدوواوە بەتاسە و ئاڵهاوە چاوەنۆڕی گەڕانەوە بۆ ئێران بووین. ئەو کاتە هێشتاکە ٢١ی سەرماوەز و ڕۆژی سەرکەوتنی ڕاپەڕینی میللیی ئازربایجان نەهاتبوو. دوادوای گەلاڕێزان بوو و تەنیا پێشەکیی ڕاپەڕینەکە سەری هێنابووە دەر. سۆڤیەتەکان بەپرس پێ کردنی «ئازەر» ئێمەیان دابەشی چەند گرووپێک کرد. بەر لە هەموان ئازەر خۆی تەبای حەوت کەس کە هەموویان زمانی ئازربایجانییان دەزانی، ناردران. ئەمانە بۆ ڕێبەرایەتی و ڕێنوێنیی «فیدائی»یان هەڵبژاردرابوون.

لکی دووەم بیست و دوو کەس بوون و منیش لەگەڵیاندا بووم. ئێمە ئەرکمان ئەوەبوو شانەی یەکەمی سوپا دابمەزرێنین. ڕۆژی دەیەمی مانگی بەفرانبار گەیشتینە تەورێز. ئیتر ڕاپەڕین سەرکەوتبوو. لە تەورێز خانوویێکیان بۆ ئێمە ئامادە کردبوو. ئازەر سەرۆکی گشتیی ئەرکانی سوپا بوو و هاتە پیرمانەوە. ڕۆژی دووەمی گەیشتنمان بەتەورێز، جلکێکمان بۆ ئەفسەر و سەربازانی سوپای ئازربایجان پێشنیاز کرد، پاشی هەشت هەتا دە ڕۆژ جلکەکان ئامادە بوون و، بۆ جاری یەکەم جلکی یونیفۆرمی سوپای ئازربایجانمان لەبەر کرد.

ئەرکانی سوپای ئازربایجان بەسەرۆکایەتیی ئازەر دامەزرا. ئەم سوپایە لەبارەی ژمارە و بەشەکانی ڕێکوپێکییەوە بەشێوەیەکی گشتی بەپێی بیری فیرقەی دێموکرات دامەزرا بەڵام ئێمە خۆمان ڕێکمان خست. بەڕێوەبەرایەتیی «بەسەربازگری» بەسەرۆکایەتیی ڕائید

شیفائی دامەزرا و بەسەربازگرتن دەستی پێ کرد. ئێمە بۆ بەڕێوەبردنی سەربازگەکان کەڵکمان لەو باڵەخانانە وەرگرت کە خاوەنەکانیان هەڵاتبوون. سێسەت و پەنجا سەربازیان وەمن دا، جلکم لەبەرکردن و لەیەکێ لەم خانووی ئاغایانەدا جێگەیان پێ دام.

هەڵپەی ئێمە بۆ ئەوە بوو بەر لە جێژنی نەورۆزی ١٣٢٥ بتوانیین سەربازگەل بۆ خۆنوێنی کە بڕیار بوو لەو ڕۆژە لە گۆڕەپانی تەوریز لەبەردەم «پیشەوەری»دا بکرێ، ئامادە بکەین. سەربازانی من توانییان لەو ڕۆژەدا بەخۆیان و تۆپەکانیانەوە خۆ بنوێنن.

ئەگەر ئێمە توانیبوومان لە ماوەی دوو مانگ و نیودا سوپایەکی تەیار و ڕێکوپێک بهێنینە گۆڕەپانی خۆنوێنی ئەوا لەم بارەیەوە قەرداری ئالیکاریی سۆڤیەتەکان بووین. ئەوان لە بواری ڕێکوپێکی و فێرکاریدا یەکجار بەکار بوون. هەر ڕۆژی یەکەم کۆمەڵێک گوللەتۆپیان لە گۆڕەپاندا هاویشت و سەربازان کەوتنە گوللەهاوێژی. سەرۆکی «میرە» کابرایەکی عەقید بوو و بڕیار بەدەستی ئەو بوو چەک و گوللە و کەلوپەلی تر بە چ ڕادە و پێوانە دەدا بەکێ. «ئازەر» ڕاوێژکاری نەبوو بەڵام لەگەڵ ئەفسەرانی ڕێنوێنیکەری سۆڤیەت لە پێوەندیدا بوو. هەموو بەشەکانی تر ڕاوێژکەری سوپاییمان هەبوو. ئەمانە ئەفسەر و عەریفی ئازربایجانیی سەر بەسۆڤیەت بوون و، کتومت وەک ئێمە جلکی یونیفۆرمی سوپای ئازربایجانیان لەبەرکردبوو.

بۆ نموونە لە بەشەکەی من «فەوجی تۆپخانەی یارمەتیدەری ڕاستەوخۆی لیوا» یان بەگوتەی ئازربایجانییەکان «بریگاد تۆپ تابووری»، ملازم سێیەمێک و حەوت هەشت عەریفی سەر بەسوپای سوور کاریان دەکرد. کاری ئەمانە پتر لایەنی فێرکاریی گرتبووە خۆی.

سۆڤیەتەکان ٥٦ تۆپی ٧٥ میللیمەتریی دژە تانک و ١٢٠ تۆپی ١٠٥ میللیمەتریی دژە حەوایی و بڕێکی زێدە گوللە تۆپ و تفەنگیان بەئێمە دابوو. زۆرینەی ئەو چەکانە ئەڵمانیایی بوون کە لە شەڕ بەدەسکەوت گیرابوون و بەکارهێنانیان پێویستیی بەفێربوون هەبوو. ئەفسەر و عەریفانی سوپای سوور هەتا ئەو شوێنەی من لە نێزیکەوە ئاگەدار بووم دەستیان لە سەرۆکایەتی وەرنەدەدا. هەڵسوکەوتیان زۆر ڕێزدارانە بوو و هەوڵیان دەدا سەرۆکایەتیی ئێمە بنەجێ بکەن، هیچ جار دەستێوەردەرییەکیان لە کاروباردا نەدەکرد کە سەربەرزیی ئێمە بشکێنێ. بۆ نموونە ڕۆژێکیان یەکێک لەم عەریفانە ڕاپۆرتی بەشەکەمانی هەر بەو ڕائیدە دا، هەرچەندە من نەقیب بووم و ئەو لە من لە پێشەوەتر بوو،

بەڵام قسەی ڕەقی بە عەریفی ناوبراو گوت کە شەرم ناکا لە پێش سەرکردەیەک ڕاپۆرت بەو دەدا. ئەوان دەیانویست ئێمە تێ بگەیێن کەوا تەنێ بۆ ئەوە هاتوون ئالیکاریمان بکەن بۆ ئەوەی سوپامان بکەوێتە سەر پێیان و پاشان ئەوان دەڕۆن. هەرچۆن بێ ئێمە لە بەشەکانی خۆماندا سەرکردەی دەسڕۆیشتوو بووین.

هێزی چەکداری ئازربایجان شێوەی جۆراوجۆری هەبوو، ئەفسەرانیش چوار جۆر بوون. لە کاتی ڕاپەڕین هەندێ لە ئەندامانی فیرقەی دێموکرات یان ڕابەرانی سەندیکای کرێکاری یان جۆتیاری تەبای هەندێ لە خەباتکارانی بن دەستی خۆیان لە ڕاپەڕین بەشدار بووبوون. ئەمانە پلەی ئەفسەرییان هەبوو کە خۆیان بەخۆیانیان دابوو، پاشان ئەم «پلە»انە لەلایەن فیرقەوە پشتەوانییان لێ کرابوو. ئەمانە مەشقی سوپاییان نەبینیبوو، لەڕاستیدا لەناو ڕووداوگەل بووبوون بەئەفسەر. ئەمانە ئەفسەرانی گیان لەسەر دەست «واتە: فیدائی» بوون. ژمارەیەکی تر لە ئەفسەران بەرپرسانی حزبی بوون کە بەناوەی ڕابەری سیاسی یان بەرپرسی کارگێڕی ناردرابوونە بەشەکان. فیرقە پلەی ئەفسەریی بەمانە دابوو. هەندێکی تریش ئەو ئەفسەرانە بوون کە لە کۆلێجی تازە دامەزراوی ئەفسەری مەشقیان کردبوو. لە ئازربایجان، پاشی ڕاپەڕین، کۆلێجی ئەفسەری دامەزرا و ژمارەیەک کەسی پاشی دوو مانگ بەپلەی ملازم دووەم یان ملازم سێیەم کرد بەئەفسەر. هەندێکیشیان ئێمە بووین کە بەپلەکانی خۆمانەوە لە سوپای ئێرانەوە هاتبووین و دابوومانە پاڵ سوپای ئازربایجان. ئێمە نێزیکەی حەفتا کەسێ بووین بووبووین بەبڕبڕەی پشتی سوپا. بەو ئاوایە چوار جۆر ئەفسەر لە سوپای ئازربایجان خزمەتیان دەکرد کە ڕێکوپێکیی کارداریی دیاریکراویان نەبوو.

ئەفسەرانی فیدایی کەسیان پێ کەس نەبوو. لافی ئەوەیان لێ دەدا کە حکوومەتیان بەزەبری چەک وەرگرتووە، هیی ئەوانە، پلەکانیشیان لە نێوان خوێن و شۆڕشدا بەدەست هێناوە و لەوانیتر لەپێشترن. ئێمە خۆمان بەخوێندەوار و مەشق دیتە دەبینی و خۆمان بۆ کار بەڕێوەبردنی هێزی چەکدار بەلێوەشاوەتر دەزانی. ئەو هەلومەرجە ناپەڕژایە دیسپلینی سوپای هاوێشتبووە بەر مەترسییەوە.

فیرقەی دێموکرات ئەفسەرانی فارسی «بەئێمەیان دەگوت: فارس ئەفسەرلەر» پلەیەک بردبووە سەرەوە، هەر ئەم بابەتەش خۆی لە خۆیدا ئالۆزییەکی خستبووە ناو ئەفسەرانەوە لەبەرئەوەی ئەو ئەفسەرانەی لە سوپای ئێران جیابووبوونەوە یەک جۆر نەبوون. هەندێکیان

له ڕاپەڕینی خۆراسان پشکدار بوون. هەندێکی تریان هەر ئەوها له تارانەوه هەڵاتبوون و چووبوونه پاڵ سوپای ئازربایجان. هەندێکی تریان پێشتر له سوپای ئازربایجان خزمەتیان کردبوو و پاش خۆبەدەستەوەدانی بنکەکانی ئازربایجان چووبوونه پاڵ سوپای نوێی ئازربایجان. هەندێکی تریان هەر له بنەڕەتەوه بناوان یان پێشینەی سیاسییان نەبوو، یان ئەوەتا بەهۆی سۆزداری یان بەهۆی کەسایەتییەوه له ئازربایجان مابوونەوه. هەندێک لەمانه تەنانەت بارودۆخی گوماناویشیان هەبوو. دەبوو سەروبەرێکی ئەم بارودۆخه بکرایه.

دواجار ڕۆژێکیان هەموو ئێمەیان بانگهێشتن کرد بۆ یانەی ئەفسەران، لەوێ کۆنفرانسێک بەئامادەبوونی بەڕێزان پیشەوەری، بێریا و کاویان - وەزیری شەڕ، سازدرا. کۆبوونەوەکه بەئاخاوتنی پیشەوەری کرایەوه. ئەو پێشنیازی کرد کێشەکه بەبۆچوونی ئەفسەران خۆیان و بەئاوایەکی دێموکراتییانه چارەسەر بکرێ. بەڵام کارەکه سەری کێشایه هەراوزەنای ئەفسەران و جنێودانی پیشەوەری بەیەکێک له ئەفسەران.

ئەو سەردەمه بەهۆی نەزانی یان له سۆنگەی نیازخراپییەوه بانگەواشەی چەوت و چەوێلیان لەمەڕ «فارس ئەفسەرلەر»ەوه بڵاو دەکردەوه. تەنانەت گەیشتە ڕادەی گوللەبارانکردنی هاوەڵانمان، رائید «سەفوەت»ی سەرکردەی ئەو کاتەی کۆلێجی سەربازی له شوێنی خزمەت کوژرا. رائید «خەلعەت بەری»ی سەرکردەی فەوجی تۆپخانه له پشت مێزی کاری خۆی درایه بەر دەسرێژ، بەختی باش بوو بەهۆی ساویلکەیی و پەشۆکاویی تەقەکەر و ژیریی خەلعەت بەری خۆیەوه، گوللەکان چەوت چوون و تەنیا تۆزێک پێی بریندار بوو.

ئیتر له کژێکی ئاوهادا دانیشتنەکه پێک هات و بەدروشمی هەرەشاویی ئەفسەرانی فیدایی تەواو بوو. دوواجار عەقید «پەناهیان» کە له جێگەی «ئازەر»دا بووبوو بەسەرۆکی سوپای ئازربایجان، پێشنیازی کرد هەموو یەکبوونی ئەفسەرانی هێزی سوپا بەلێژنەیەک بسپێردرێ کە له هەندێک ئەفسەر و چەند ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندیی فیرقه پێک هاتبێ. ئەمه بڕیاری لەسەر درا و بەشێوەیەکی کاتەکی کێشەکه له نێواندا نەما. ئەو لێژنەیه هەندێک بڕیاریشی دا بەڵام هەلی جێبەجێ بوونیان پێ نەبڕا.

ئاماژەم کرد کەوا «ئازەر» لەباتی «پەناهیان» بووبوو بەسەرۆکی ئەرکانی سوپا. ئازەر له مانگی گوڵانی ۱۳۲۵دا درایه لا و بەڕواڵەت بەناوەی پشوو ناردیانه ئەوبەری سنوور.

ئەو لەگەڵ پیشەوەریدا ناکۆکییان کەوتبووە نێوان. ڕابەرایەتیی فیرقە لەناو سوپادا بەو شێوەیەی دەویستـرا بەلای ئەوەوە پەسند نەبوو. سۆڤییەتەکان، بێگومان بەئاماژەی پیشەوەری، ئەویان بەشێوەیەکی ڕێزدارانە ئاوا کـرد و بردیان بۆ باکۆ هەتا لەوێ بحەسێتەوە. چەند مانگێک لەوێ بوو، ئەو کاتەی سوپای سۆڤیەت ئێرانی بەجێ هێشت، بەڕێز و سلاوەوە هێنایانەوە. پیشەوەری وێڕای لێبوردن خوازی لەوەی لە ڕابردوو رووی دابوو، بەچاکی ڕێزی لێ گـرت، سەرەتا بردیان بۆ ورمێ پاشان بۆ ئەردەویل. لەدەمی هێرشی سوپای ئێران، هێنابوویان بۆ تەورێز بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە سەر بەرپرسیارەتیی جارانی بەلام چیتر هەلی ئەم کارە لە گۆڕیدا نەمابوو.

لەبارەی سەرکەوتن و شکانی خێرای شۆڕشی ئازربایجانەوە قسە زۆرە بەلام من تەنێ بەبۆچوونی خۆم، بۆچوونی ئەفسەرێک کە لە نۆینێکی باریکەڵەوە تێپەڕیوە، دەدوێم. بەبۆچوونی من ماکەی سەرکەوتنی بەپەلە و هەروا ژێرکەوتنی بەپەلەی شۆڕشی دێموکراتی ئازربایجان، هاوەڵەتی و هاوکاریی بێ وچانی سوپای سۆر یان راستتر بڵێم پشت بەستنی بێ ڕادەی فیرقەی دێموکراتی ئازربایجان بوو بەم هاوەڵی و هاوکارییە برایانەیەی یەکەتیی سۆڤیەت. بێگومان دروشم و داوخوازەکانی فیرقەی دێموکراتی ئازربایجان گشتیان رەوا و راست و پێشکەوتوو بوون: ئازادییە دێموکراتییەکان، زمان، قەڵەم، کۆوەبوون، کولتوور، ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی ولاتی سەربەخۆی ئێراندا، لەبارەی داخوازییە خۆشبژییەکانی لەمەڕ چینگەلی چەوساوە، گۆڕینی پێوەندیی نێوان کرێکار و خاوەنکار، ئاغا و کرمانج، شتێک نەبوو مایەی ڕەخنە یان گلەی هیچ ئازادیخوازێکی ئێران بێ، بەلام ئەو دروشم داوخوازانە بەشێوەیەکی بەرفرە بەنێو گەلدا پەلیان نەهاوێشتبوو. ئایە لە درێژەی سێ یان چوار مانگ، لە پێکهاتنی فیرقەی دێموکراتی ئازربایجانەوە بگرە هەتا دەگاتە ٢١ی سەرماوەزی ١٣٢٤ «ڕۆژی سەرهەڵدان و سەرکەوتنی فیرقەی دێموکرات» دەشیا سەرجەم جەماوەری کرێکار، وەرزێر و هووردە بۆرجوازیی گەلێری ئازربایجان، لەپێناو شۆڕشێکی گەلێر و دێموکراتدا ساز بدرێن؟ راستە پێش پێکهاتنی فیرقە، هەندێ کار بەهۆی حیزبی توودەی ئێرانەوە کرابوون، هەندێ ڕێکخراوی پەرتوبلاو و لەڕولاواز لە هەندێ شوێنی ئازربایجان هاتبوونە کایە بەلام چالاکییەکان بەشی ئەوەیان نەدەکرد لە کاتێکی کورتدا هۆکارە بەرچاوەکانی کۆمەڵگەی فیۆداڵ - بۆرجوازیی ئەو سەردەمەی ئازربایجان بگۆڕێ بۆ هۆکاری بیرەکیی لەبار و، ئامادەییی شۆڕشگێڕیی لێ بکەوێتەوە و ڕووەتی کۆمەڵگە بگۆڕێ.

لەوانەیە بەهۆی هەلومەرج و دۆخی کاتەکی و شوێنەکیی هەڵکەوتوو و بەسوودوەرگری لە سایەی پاسەوانەتیی سوپای سوور لە ئێران، فیرقەی دێموکراتی ئازربایجان هاتبێتە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی لە دەست پێ کردن و سەرکەواندنی ڕاپەڕیندا بکەوێتە پەلەپەلی. بێگومان سوپای سوور ڕاستەوڕاست بەشداری سەرهەڵدان نەبووبوو بەڵام ئامادەبوون و پاسەوانەتیی ئەو لە شۆڕشی ئازربایجان شتێک بوو لە هەموو جێیەک هەستی پێ دەکرا. هەر خۆی لە خۆیدا ئەم هەستە بوو بەمایەی خۆبەدەستەوەدان و دەست لەبەرگری هەڵگریی مۆڵگەی تەورێز و مۆڵگەکانی تر.

هەرچۆن بێ ڕاپەڕین بەسەرکەوت. حکوومەتی گەلێری ئازربایجان هاتە کایە و لە ماوەی یەکساڵەی دەسڕۆیشتنی خۆیدا کەوتە ڕیفۆرمی بنەڕەتی، لەوانە: دابەشینی هەندێ زەوی، خۆماڵی کردنی هەندێ کارگە، دەست بەسەردا گرتنی پارەوپوولی دوژمنانی گەل، پێکەوەنانی سوپای گەلێری ئازربایجان، دانانی زانکۆی تەورێز و کاری شەو و ڕۆژ بۆ خۆشکردنی ڕێگەوبانی تەورێز و قیرکردنیان. ئێستەش زانکۆی تەورێز و قیرکردنی شەقامەکانی تەورێز بیرەوەریی ئەو سەردەمانەن. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە فیرقە نەیتوانی بیر و سەرنجی یارمەتیدەرانەی جەماوەری بەرهەڵدای ڕەنجدەران بەکێش بکات و بیهێنێتە پاڵ خۆی. بۆچی؟ پێویستە هۆیەکە لە بناوانەی پێکهێنەری ڕاپەڕین و سەرکەوتنیدا تاوتوێ بکرێ.

ئەوسا «و ئێستەش» هۆی شکانی شۆڕشی ئازربایجان لە هاوکێش نەبوونی هێزگەلی نێوان ئیمپریالیزم و سۆشیالیزم لە گۆڕەپانی ناونەتەوەییدا تاوتوێ دەکرێ. بەڵام هۆی سەرکەوتنیشی «بەلەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی شوێنەکی» هەر ئەمە بوو. سەرکەوتنی خێرای شۆڕشی گەلێری ئازربایجان لە ئەنجامی یارمەتیدانی نەپساوەی سۆشیالیزم بوو. بەڵام هەر تەنیا لەبەرئەوەی ئەم یارمەتیدانە «ئەویش بەهۆی هاوکێش نەبوونی هێزگەل لە گۆڕەپانی ناونەتەوەییدا» لە حکوومەتی گەلێری ئازربایجان گیرایەوە، ئیتر ئەویش شکا.

من بەهیچ جۆرێک ناحەزی ئەنتەرناسیۆنالیزم، هاوکاریی ناونەتەوەییانەی ڕاپەڕینی گەلانی ئازادیخواز و بزووتنەوەی کرێکاریی دنیا، یارمەتیی برایانە و کاری دەستەوای ڕەنجبەران نیم بگرە زۆر بەرژدیش بروام پێیانە. لە دنیایەکدا کە سیستەمی یەکپارچەیی و جیهانیی ئیمپریالیزم گەرووی گەلانی لاواز و ڕەنجبەری لە هەموو کونجێکی دنیادا گوشیوە، ساویلکەیییە گەلان لە هاریکاریی و دەستەوایی بێبەری بکەین. بەڵام ئەم

یارمەتیدانە، یان راستتر بڵێین پشەوانیی دەرەکی هەر بۆ ڕواڵەتی ماکەی شۆڕشگێڕیی ناوەوەی کۆمەڵگە بەکارە. بەواتەیەکی تر، یارمەتی و پاڵپشتیی دەرەکی ماکەی شۆڕشگێڕیی ناوەکی پتەو دەکەن بەڵام شۆڕش ناهێننە بەرهەم.

شۆڕشی گەلێر و دێموکراتی ئازربایجان نموونەی زیندووی ئەم جۆرە پشتەوانییە بوو. بەشی پشتەوانیی یەکەتیی سۆڤیەت بۆ ئەم شۆڕشە پتر بوو لە پشتەوانی و پشکداریی خەڵکی ڕێنجبەری ئازربایجان خۆیان. ماکەی سەرکەوتن و شکانی شۆڕشیش هەر لێرەدایە. هەتا ئەو کاتەی پشتەوانی هەبوو هەناسەی شۆڕش لەگەڕدابوو، بەبڕانی ئەم پشتەوانییەش شۆڕش لەگەڕ کەوت.

لە ئازربایجان، بەتایبەتیش پاش چۆڵکردنی سوپای سوور، ئەو گەرموگوڕییەی لە سەرەتای شۆڕشدا هەبوو لەناوچوو، تەنانەت گرووپگەلی ناحەز دەستیان بەخۆپێشاندان کرد. هۆیەکە ڕوون بوو: شۆڕشی ئازربایجان ڕەگی قووڵی دانەکوتیبوو، تەنیا ڕێبەری بەکاری شۆڕش «پیشەوەری» هەر خۆی بوو. بەڕێزان: قیامی و پادگان، هەروەها وەک دەیانگوت ئیلهامی و فەرەیدوون ئیبراهیمی و ئەوانیتر بریتی بوون لە پیاوانی بەبڕوا بەڵام لەوان بەولاوە ئەندامانی بنکەی فیرقە بیری شۆڕشگێڕیی ئەوتۆیان نەبوو یان ئەگەر هەشیانبووبێ کەم بوو. هەندێکی تری لەهەڵگەڕیش هەبوون خۆیان هاوێشتبووە پاڵ بزووتنەوەکە، کۆمەڵێک دروشمی لە قاڵبدراویان لەبەر کردبوو، بەگەرمی و مستەکۆڵە هەڵشەقاندنەوە دەیانگوتەوە و پێیان وابوو ئەمە بنەتای کاری شۆڕشوانییە.

تەنانەت پیشەوەری خۆیشی هەندێک جار کاری سەیر و سەمەرەی بەتایبەتی لەناو سوپادا دەکرد. وا پێ دەچوو هێشتا متمانەی بەسوپای ڕێکوپێک نەبێ، تەنیا بایەخی بە«فیدائیان»ی چەکدار دەدا کە لە هەلومەرجێکی تایبەتدا هاتبوونە کەفوکوڵ و هەندێک کاریان کردبوو. لە بیرمە جارێکیان پیشەوەری هاتە سەردانی مۆڵگە، لە کاتی هاتنی ئەودا ئەفسەری پاسەوان ملازم یەکەم «دیانەت»، چاودێریی دابەشینی خواردنی لە چێشتخانەدا دەکرد. پیشەوەری بەدوایدا دەنێرێ و ڕەخنەی لێ دەگرێ بۆچی لە ژووری پاسەوانی و لە پشت مێزی خۆی نییە. ئەفسەری پاسەوان ڕوونی دەکاتەوە نابێ بەردەوام لە پشت مێز بێ، ئەرکی ئەو ئەوەیە لە تێکڕای کاروبار، لە مانەیش دابەشینی خواردندا چاودار بێ. پیشەوەری لە «زماندرێژی»ی ئەو تووڕە دەبێ و فەرمان بەسەربازگەل دەدا بیکوتن، سەربازەکان بیرەبیر دەبن و نایانەوێ لە ئەفسەری خۆیان بدەن، فەرمان

بەپاسەوانەکانی خۆی دەدا و، «فیدائی»یانی پاسەوان ئەفسەری ناوبراو دارکاری دەکەن. ئەفسەران بەناوی پێشبڕی لەم کارەی پیشەوەری چەند سەعاتێک دەستیان لە کار هەڵگرت بەڵام لەبەرئەوەی پێیان وابوو ئەم کارە لەو کاتە ناسکەدا بۆ سوپای گەلێر زیاندارە، زۆر زوو گەڕانەوە سەر کارەکانیان بەڵام پێشبڕییەکانیان هەر مایەوە. پیشەوەریش بۆ ئەوەی ئەفسەران دڵنەوایی بکات پاشان هەندێ کاری کرد لەوانە شەوانی هەینی بانگهێشتنی ئەوانی بۆ «شاگولی» دەکرد و هەروەها لەبارەی شۆڕشی ئازربایجان و کارەکانی داهاتوو و ئەرکی هێزگەلی چەکدارەوە بۆیان دەدووا.

لەبەر رووناکیی وتەکانی پیشەوەری و ئەو زنجیرە رووداوانەی پێش ئەو دانیشتنانە هاتنە پێش من گەیشتمە ئەو ئەنجامەی وا پێ دەچوو پێوەندییەکی چاک لە نێوان بەڕێز پیشەوەری و حزبی توودەی ئێران نەبێ. لە بیرمە پاش هاتنمان بۆ تەورێز لە یەکەمین جڤاتی یەکتر ناسین لەگەڵ پیشەوەریدا، ئەو لەگەڵ بەخێرهێنانی ئێمە و روونکردنەوەی هەڵوویستی فیرقەی دێموکراتدا، گوتی:

– حزبی توودە تەنیا قسە دەکا و دروشم دەدا بەڵام ئێمە دەستمان دایە چەک و کارمان بەجێ هێنا.

هەر لەو کاتەوە ئەم جۆرە بیرەوەرییانە لەبارەی حزبی توودەوە زایەڵەیەکی ناخۆشی لە گوێی مندا هێنایە کایە. پاشانیش کە خۆڵکیان کردین ببین بەئەندامی فیرقەی دێموکراتی ئازربایجان، هەموومان بەبێدەنگی بەرگریمان کرد. پێم وایە ڕەگی ناتەباییی پیشەوەریش لەگەڵ ئازەر هەر لەم شوێنەوە ئاوی دەخواردەوە. هاواری لە ناکاو و بەبێ بۆنەی پیشەوەری بەسەر یەکێ لە ئەفسەراندا لەو دانیشتنەی پێشتر لەبارەیەوە ئاخاوتم، دارکاری کردنی ئەفسەری پاسەوان و ئەو کژە ناهەڤاڵانییەی لە پێوەندیی نێوان «فیرقەیی»یەکان و ئەفسەرانی «حکوومەتی»دا هەبوو هەر دەبێ لە بناوانی ئاوهاوە سەریان هەڵدابێ. پاشان بیستمانەوە حزبی توودە هەر لە بنەڕەتەوە لەگەڵ ئەوەدا نەبووە کە ڕێکخراوە حزبییەکان لەناو فیرقەی دێموکرات بتاوێنەوە و کارەکانی دواتری فیرقەی ئەوەندە پێ پەسند نەبووە، بەڵام ڕووبەڕووی کاری جێبەجێ کراو دەبووەوە و بەچوار پەلان بەدووای فیرقەدا رادەکێشرا.

بەهەر ئاوایەک بێ، پاش دەرچوونی سوپای سوور، هەڵچوونی شۆڕشگێڕایەتیی جاری بەرایی بەرەبەرە کەوتە پاشەکشێ و، سەرنجیش دەدرا کارێک بۆ پاراستنی ئەم ورەیە

ناکرێ. تەنانەت بەبۆچوونی من ئەم هەڵچوونەی سەرەتاش هەتا رادەیەک لە گیانی هەلپەرستییەوە سەری هەڵدابوو. لە فیرقەی دێموکراتدا ژمارەیەکی گەورە لە کۆچەران «موهاجیران» ئەندام بوون و کاری گرینگیان لە دەستدا بوو: وەزیری بەرگری، سەرۆکی گشتیی شارەوانی، سەرۆکی گشتیی پاسەوانی، سەرۆکی ئینجیبات، بنکەی پۆلیس و هیتر و هیتر. هەڵسوکەوتی ئەم کۆچەرانە هەر لە سەرەتای هاتنەوەیان بۆ ئێران شوێنەوارێکی باشی لە بیری جەماوەری دانیشتوواندا بەجێ نەهێشتبوو. ئەمانە هەڵسوکەوتیان «ئۆباش»یانە بوو و بەتایبەتیش کاتێ لە فیرقە چەکدار بووبوون گەلێک تیژ «بەخەیاڵی خۆیان - شۆڕشگێڕانە» دەجووڵانەوە. هەلپەرستی ڕاست هەر ئەمانە بوون، بەڵام بەشێک لە جەماوەری ڕاستەقینەی ئازربایجان لە سەرەتا بەدڵ و بەگیان بەپیر بانگەوازی فیرقەوە چووبوون.

بێگومان ئەمانە هۆی سەرەکیی ناڕەزاییی خەڵک نەبوون. لە تەورێز ژمارەیەک لە بەرهەڵستکاران کە پێشتر پیاوی ڕێنجبەر بوون بەئاشکرا کۆبوونەوەیان کردبوو. لە تەورێز باوبوو دەیانگۆت ڕۆژێکیان هەندێکیان لە شەقامدا دروشمیان دەدا:

- "یاشاسون!" واتە: بژی.

تەڕەفرۆشێک لە یەکێک لەو خۆپێشاندەرانە دەپرسێ:

- "یۆڵداش کیم یاشاسون؟" واتە: کاکە کێ بژی.

ئەویش وەڵام دەداتەوە:

- "هەلە مەعلووم دەگل." واتە: هێشتا نەزانراوە.

ئێمە ئەوەندە تێکەڵاویمان بەخەڵکەوە نەبوو بەڵام جارناجارێ ئەو دەمەی لەگەڵ یەکێکی ڕێنجبەر یان کەسانی تردا قسەیەکمان بکردایە لە شێوەی ئاخاوتنمان تێ دەگەیشتن ئێمە ئازربایجانی نیین، ئیتر لە هەڵسوکەوتیان لەگەڵماندا رووخۆشتر دەبوون و ڕاست و رەوان دەیانگۆت هەرنەبێ دەتوانین لەگەڵ ئێوەدا دوو قسەی بەجێ بکەین، بەم ئاوایە نفرینیان لە ئەفسەرانی فیرقە یان فیدائیانی فیرقە دەکرد. هەڵبەتە هەندێک لەمانە بەرژەوەندەکانیان کەوتبووە بەر هەڕەشەوە.

ئێمە هەرچەندە لە سەربازگە دەمانەوە و لە گۆڕەپان بەدوور بووین بەڵام پێداپێدا هەستمان دەکرد ئەم دۆخە ناتوانێ ئەوەندە درێژە بکێشێ. حکوومەت، حکوومەتێک

نەبوو خەڵک لەمەڕ خۆیانی بزانن و بەشوێن ڕێنوێنییەکانی بکەون. بەتایبەتیش کاتێ هاتوچۆ لە نێوان تاران و تەورێزدا دەستی پێ کرد. مزەفەر فەیرووز جێگری گشتیی حزبی قەوامولسەڵتەنە هاتە تەورێز و پیشەوەری چووە تاران بۆ ئەوەی ڕێگەیەکی ئاشتیخوازانە بۆ پرسی ئازربایجان بدۆزنەوە. دەرکەوت هەندێ کار و بەرکار لەسەرەوە سەریان هەڵداوە و هەستمان دەکرد ئیتر شتێک لە شۆڕشی گەلێری ئازربایجان نەماوە. لە بیرمە هەر لەو ڕۆژانەدا یەکێک لە ئەفسەرانی ئێمە لووتی بەپاگونیەوە ناو و گوتی:

- پاگونەکانمان بۆنی نەوت دەدەن.

بێگومان ئێمەی ئەفسەران لەناو ڕووداوی سیاسەتگەلی پەنا پەردەدا نەبووین، جڤات و کۆبوونیشمان نەبوو هەتا لەوێوە ئاگەداریمان دەست کەوێ، ئەوەی ئێمە هەستمان پێی دەکرد لەسەر بنەڕەتی دیتنی بەرۆژەوەی خۆمان بوو. هەرچۆن بێ ئەمە هەستی گشتیی ئێمە بوو، پاشانیش دەرکەوت زۆر بەهەڵەدا نەچووبووین و بینیمان کار بەکوێ گەیشت.

پاش ئەوەی ڕوون بووەوە وتووێژ بەهیچ کوێ نەگەیشتووە، حکوومەتی ئێران بڕیاری دا هێز بۆ ئازربایجان بنێرێ. گەلێک کوڕ لە شارە جۆراوجۆرەکانی ئازربایجان بەستران و بەرواڵەت کەوتنە تەیارکردنی خەڵک بۆ بەرگری، دروشمی ناسراوی «ئۆلمەک وار، دونمەک یۆخدر- واتە: مردن هەیە، گەڕانەوە نییە» بیرەوەریی ئەو ڕۆژانەیە. بەپەلە هەندێک بەش لە سوپای ئازربایجان بۆ بەرگری بەرەو سنوور ناردران.

سۆڤیەتەکان کاتی چۆڵ کردنیان، ئەو چەک و کەلوپەلانەی بەسوپای ئازربایجانیان دابوو لەگەڵ خۆیاندا بردیاننەوە، لەمانەیش تۆپەکان. ئێمە تەنیا چوار تۆپی ٧٥ی چیاییمان هەبوو لە سوپای پێشووی ئازربایجان بەپاش کەوتبوون. سەرکردەی ئەو تۆپانە من بووم. دوو دانە لە تۆپەکان لەبن سەرکردایەتیی نەقیب هورمزان ڕەوانەی «قافلانکۆ» کران و دوو دانەکەی تر ناردرانە فریای حکوومەتی گەلێری کوردستان و بەسەرکردایەتیی خۆم بەرەو بەرەی سەقز بەڕێ کەوتن.

ئەو کاتەی ئەرکی بەرەی سەقزم پێ سپاردرا مەلا مستەفای بارزان بەرپرسی ئەو بەرەیە بوو. تۆپەکانم گواستەوە گوندی «سەرا»ی سێ کیلۆمەتری دوور لە سەقز. «سەرا» سنووری نێوان حکوومەتی گەلێری کوردستان و سوپای ئێران بوو. لێرە، پاش ناسینی هێڵی بەرە، تۆپەکانمان لە شوێنێک کە بەسەر سەقزیدا دەڕوانی دامەزراند و چاوەڕوانی فەرمان بووین.

پێکدادان لە هیچ یەکێکی بەرەکاندا رووی نەدا. تەنیا لە کاتی جێگۆڕی هێزەکان و پارێزوەرگری و سەنگەرکاری لە قافلانکۆ، رائید قازی ئەسەدوڵڵاهی، ئەم پیاوە ئازا و بەبڕوایە، ئەم هاوەڵە هەرە باشەی ئێمە لە حەواوە ئەنگاوترا و شەهید بوو. هەموومان چاوەڕوان بووین هەر بەزوویی تۆڵەی بکەینەوە، بەدڵنیاییەوە لە پارێزەکانی خۆمان چاوەڕوانی هەڵمەت بووین، لە ناکاو هەموو هیوامان بەبا چوو.

شەوی ۲۱ سەرماوەز بۆ سەرانسۆی ئەرکەکانی پشتەبەرە چووبوومە گوندێک بەناوی «ئاڵتوونی خواروو». بنکەی پشتەوانیی ئێمە لە یەکێک لە خانووەکانی ئەو گوندەدا بوو. لەوێ خەریکی موتالای نامە گەیشتووەکان بووم هەواڵیان هێنا سوارێک منی دەوێ.

ئەو سوارە لەلایەن عەقید عیزەت - سەرۆکی ئەرکانی مەلا مستەفا و، لە ئەفسەرانی کوردی عێراق بوو پاشان لە بەغدا گیرا و هەڵواسرا - نامەیەکی بۆ من هێنابوو و ناوەڕۆکەکەیشی هەر بریتی بوو لە راگەیاندنە بەناوبانگەکە. ئەو راگەیاندنە لەلایەن فیرقەی دێموکراتی ئازربایجان و کوردستانەوە جاڕ درابوو، بۆ خۆلادان لە براکوژی بڕیاری بەرگری نەکردنیان دابوو و فەرمانیان بەسوپای ئازربایجان دابوو بگەڕێتەوە مۆڵگەی خۆی. عەقید عیزەت وێڕای ڕاگەیاندنەکە، تێبینییەکیشی نووسیبوو:

«بەڕێز سوڵتان...

پیشەوەری هەڵاتووە، ڕێبەرانی فیرقە هەڵاتوون، سوپای حکوومەتی ناوەندی هاتووەتە ناو تەورێز و پشتەوەی بەرەی ئێمە، میاندوواویش گیراوە. بۆیە لە پێناو پاراستنی پشتەوەی بەرە، ئێوە بچنە بۆکان و بەرەو میاندوواو دابمەزرێن...».

من لە نامەکەی ئەو هەستم بەسەرسڕمانێک کرد.

رائید پیرزادە لە حکوومەتی ئازربایجانەوە بۆ ئالیکاریی ئەرکانی مەلا مستەفا ڕەوانەی «سەرا» کرابوو. بڕیارم دا پێوەندیی پێوە بکەم بۆ ئەوەی پاش ئاگادارییەکی هوورد لەبارەی بەرەوە بتوانین پلانێکی گونجاو بۆ کشانەوە دابڕێژین. تەتەرێکم هەنارد بۆ لای ملازم یەکەم «ڕەئیس دانا» کە لە سەنگەردا بوو بۆ ئەوەی تۆپەکان کۆبکاتەوە و بێتە «ئاڵتونی خواروو»، خۆیشم چووم بۆ «سەرا». لەوێ هەندێ لە ئەفسەرانی ئازربایجانم بینی، ئەمانە بۆ ئالیکاریی بەرەی کوردستان هاتبوون. «ئەسغەر ئیحسانی»ی سەرکردەی فەوجی پیادە، «مەحموود تیوای»ی بەرپرسی پاشەبەرە و «مورتەزا زێڕبەخت»ی ئەفسەری ئاسمانیم لەوێ بینی. لە هەمووی پێکەنیناویتر ئەرکی زێڕبەخت بوو. ئەویان ناردبوو

ئامانجه زەوینییەکان سەرانسۆ بکات و پاشان بەباڵەفڕە بێتەوە بۆ بۆمبابارانیان. لە ئازربایجان تەنێ دوو باڵەفڕ هەبوون کە بەڕێزان مورتەزا زێرِبەخت و عەلی جوودی لە «ئەرکی فڕین بەرەو ئازادی» لە تارانەوە لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان. ئەو «قەلەڕەشکانە» بۆمباشیان پێ نەبوو، لەوانەبوو بەنارنجۆکی دەستی لە ئاسمانڕا ئامانجەکان بکوتنەوە...

دەرکەوت پیرزادەی سەرۆکی ئەرکانی بەرە، بەر لە هەموان بنکەی سەرکردایەتیی بەجێ هێڵاوە. ڕاگەیاندنی دەست لە بەرگری هەڵگری لەلایەن سوار ماتۆڕێکەوە گەیشتبووە «سەرا». پیرزادەی بەڕێزیش بۆ هاوێرکردنی ڕاستی لە چەوتییی ئەو هەواڵە سواری پاشکۆی ماتۆڕ دەبێ و پاشان لە سۆڤیەت سەری هێنایەدەر.

لەبارەی جەنەڕاڵ «عەزیمی» کە ئەرکانەکەی لە میاندوواو بوو، پرسیارم کرد، کەسێک وەڵامی پێ نەبوو. پاشان لە تەورێز گیرا و لە سێدارە درا. بەناچاری چوومە لای عەقید عیزەت، ئەو گوتی:

– ڕاستییەکەی ئەوەیە ڕێبەرانی فیرقەی دێموکرات هەموویان هەڵاتوون، ئیتر شتێک بەناوی «فیرقە»وە لە گۆڕێدا نییە. سوپای ئێرانیش هەر لەم دوو سێ ڕۆژەدا تەواوی ئازربایجان داگیر دەکات. ئێوە بڕیارێک لە بارەی خۆتانەوە بدەن! خێڵی بارزان خانوویەکی لێرە نییە بەرگریی لێ بکات. بەڕاستی، ئێمە بەحەواوە هەڵواسراوین. ئێوەش هەر بەحەواوە هەڵواسراون، ناتوانن خۆتان بگەیننە تەورێز، دژانی شۆڕش لە ڕێگە و نیوەی ڕێگەدا هەرنەبێ بۆ وەرگرتنی چەکەکانتان دەتاندەنە بەر دەسڕێژی گوللە. ئێستە ئەگەر بەساغیش بگەنە تەورێز نازانن لەوێ چیتان بەسەر دێت. تەنیا ئەرکی ئێوە و ئێمەمانان پاراستنی گیانی خۆمانە. ئێمە بۆ مەهاباد دەکشێینەوە، ئێوەش ئارەزووی خۆتانە، ئەگەر حەز دەکەن لەگەڵ ئێمەدا وەرن.

پاشان بیستمەوە سۆڤیەتەکان ئامۆژگاریی «پیشەوەری»یان کردبوو بۆ ئەوەی لەهەمبەر سوپای ئێراندا نەوەستێتەوە، تەبای کۆمیتەی ناوەندیی فیرقەی دێموکرات لە سنوور بپەڕێتەوە و بۆ سۆڤیەت بچێ. ئەفسەران وماڵەکانیشیان کە لە تەورێز بوون، سەبارەت پێگیری و پشتەوانیی جەنەڕاڵ «ئازەر»ەوە ڕێگەیان پێ درا ئاوابن. پاشان بەرەبەرە کار گەیشتە ئەوەی سنوور بەڕووی هەموو لایەکدا بکرێتەوە. تەنانەت زانیمان مۆڵگەی ئەردەویل بەخۆیان و تەواوی چەکەوە دەربازی ئەولا بووبوون، لە کاتێکدا ئەگەر ڕێبەرانی فیرقە سەریان لێ نەشێوایە و نەکەوتنایەتە هەڵپەی ڕزگارکردنی گیانی خۆیان و

هەڵنەهاتنایە ئەوا دەیانتوانی تەواوی بەشەکانی سوپا و فیدائیان و سەرلەبەری ئەو کەسانەی مەترسیی هەڵواسینیان هەبوو، کۆبکەنەوە و بەرێکوپێکی بکشێنە دواوە. تەنانەت ئەگەر پێویستیی بەشەڕ و پێکدادانیش بکردایە ئەوا زیانێکی کەمتر لە زیانی سێ ڕۆژەی «قەتلوعام»ی خەڵکی بێ نوای تەورێز و شارەکانی تری دەبوو.

ئێمە بڕیارمان دا بۆ پاراستنی چەک و بەشەکانی خۆمان بچین بۆ مەهاباد کە هێشتا قازی محەممەدی ڕێبەری حکوومەتی دێموکراتی کوردستان لەوێ بوو. ئەو شارە بەڕاستی دەیتوانی بۆ ئێمە ببێ بەنوایەکی هێمن.

بڕیار بوو «ئیحسانی» بەخۆی و فەوجەکەیەوە بچێ بۆ بۆکان کە بنکەی پێ بژیویی بەرە بوو. پێ بژیویی ناو کۆگەکان لە ئۆتۆمۆبێل بار بکات و لە ڕێگەی شارۆکەی «بورهان»ەوە بچێ بۆ مەهاباد. منیش تۆپەکانم لە ئۆتۆمۆبێل باربکەم و شوێن ئەوان بکەوم. لەبەرئەوەی لەیەک ئۆتۆمۆبێل پترمان نەبوو پاشماوەی مرۆڤەکانم بەدەوار لەبن بەرپرسیارەتیی یەکێک لە ئەفسەران هەر بەو ڕێگەیەدا بەڕێ کرد. بارزانییەکانیش بەپێیان و وەک هێزی پارێزگاری دوابەدوای ئێمە کەوتنە بزووتن.

لە بۆکان ئەو دەمەی ئیحسانی تەبای ئەفسەرانی تر بۆ بەتاڵکردنی کۆگە دەچێ، دانیشتوانی حەز لە چەکی بۆکان لێیان کۆدەبنەوە و سەریان لێ دەشێوێنن، بەبیانووی ڕزگارکردنیان، چەکەکانیان لێ دەکەنەوە و وایان لێ دەکەن هەڵێن. کورت و کرمانجی، کاتێ ئەفسەران پاشی نیو سەعاتێک دەگەڕێنەوە دەبینن لە فەوجێکی پێنسەت کەسی شوێنەوارێک نەماوە، هەر سەربازێکی بەرەو کوێ ئاوەزی بڕیوەتی پێی پێوە ناوە. هەر حەوت ئەفسەری لەگەڵ فەوجەکەدا بوون: ئیحسانی، زێڕبەخت، تیوای، ئەرتەشیار، تەوەکولی، ئەسغەری و نیکۆلا ماکاریان کە هەلومەرجەکە بەنالەبار دەبینن هەر بەو ئۆتۆمۆبێلەی پێ بژیوییەکەی هەڵگرتبوو و لە شەڕگە دەربازبووبوو، خۆیان دەگەیننە مەهاباد.

من لەو سێ چوار مانگەی لە کوردستان بووم هەتا ڕادەیەک لە وزەی خەڵکی ئەوێ شارەزا بووبووم. ئەمانە بەهۆی سالانی ساڵ لە ژیانی بن هەلومەرجی فیۆدالی، ورەیەکی هاوشانی ئەو هەلومەرجەیان پەیا کردووە: لایەنگری زۆرکارین، ئەو زۆرکارییەی ئاغاکانیان بەسەر ئەوانیاندا سەپاندووە. بێگومان ئەم کەسانە هەر کاتێ هەلیان بۆ هەڵدەکەوێ هەر ئەو زۆرکارییەی تەمەنێکە لە ئاغاکانی خۆیانیان بینیوە، ئەمجارە ئەوان

لە کەسانی بندەستی خۆیانی دەکەن. لە راستیدا ئەو دڵپڕییەی لە ئاغاکانیان هەیانە لەمانی دەردەهێننەوە. بێگومان دانیشتوانی شار ئاوها نەبوون و هەتا رادەیەک لەم جۆرە پێوەندانە ئازاد بووبوون و بەرەو ئەوە دەڕۆیشتن ورەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی بۆ خۆیان پەیا بکەن.

من لەسایەی ناسینی ورەی ئەوانەوە، پاشان هەموو جار دەمتوانی بەرەی خۆمان لەناو ئاوێ دەربێنم. پێش ئەوەی بچمە ناو هەر ئاواییەک یەک دوو گوللەتۆپم بەبێ ئامانج دەهاوێشت. ئەگەر تۆپم پێ نەبوایە ئەوا لەگەڵ ئەوەی یەکەمین گوللەم بەحەواوە بنایە یان یەکەمین گازی و هاوارم بکردایە ئیتر هەموو لایەک بۆم دەهاتنە ڕا. هەر ئەوانەی پێشتر ئامادە نەبوون لەتەنانێک و هێلکەیەکی مریشکت لە بریتیی نرخێکی چەندجار زێدە پێ بفرۆشن، ئێستە هەرچەند پێ بژیوی و پێ خۆرێکت بویستایە بەپەلە بۆیان دەهێنای و ئامادەش نەبوون بەهیچ جۆر پارەت لێ وەرگرن. ئەگەر لە سەرەتاوە بەئاشتەوایی و بەخۆهێشت و بە«ناورانەوە» داوایەکەت پێشکێش بکردایە دووچاری گێچەڵ دەبووی. خواستی ناوکۆی هەر هەموویان چەک بوو.

ئەم هەلومەرجە بەتایبەتی لە بۆکان باڵادەست بوو. سەرنج راکێش ئەوەیە ئەو کوردانەی فەوجێک سەربازیان چەک کردبوو و راویان نابوون، هەر خۆیان زۆربەیان لە فیدائیان و پێشمەرگەکانی حکوومەتی میللیی کوردستان بوون.

پێش ئەوەی بگەینە بۆکان، سەرپێهاتی فەوجەکەی ئیحسانی و هەڵسوکەوتی دانیشتوانم بۆ سەربازەکانم باس کرد و راستییەکەم بۆیان روون کردەوە. تێیانم گەیاند، ئەگەر هەموو بەیەکەوە بین ترسێکی کەمتر هەڕەشەمان لێ دەکات وەک لەوەی پەرژوبڵاو بین. ئێمە لەبەرئەوەی لەبارودۆخی ناوچەکە بەڵەد نیین ئەگەربێو گیانیشمان لەدەستی سەرماوسۆڵە رزگار بکەین ئەوا لە دەستی هەلپەرستان رزگاریمان نابێ. بەڵێنم پێیان دا هەر بەگەیشتنمان بەنوایەکی هێمن، بەرێیان بکەم، بێگومان پاشانیش هەر وام کرد. ئەوان بۆچوونی منیان بەپەسند زانی. نێزیکەی نیوەی شەوێ بوو چووینە ناو بۆکان. لەبیرم چوو بڵێم دانیشتوانی بۆکان سێ ئەفسەریان بەناوی: رائید خاکساری، نەقیب زەهیری و ملازم حەقپەرست - ەوە خاپاندبوو و بردبوویان بۆ ماڵەکانی خۆیان بەو ناوەی دەیانشارنەوە بەڵام لە راستیدا گرتبوویانن بۆ ئەوەی ئەو کاتەی سوپای ئێران دەگەیشتەجێ وەک گاووگەردوون بیانبنە پێشیان، هەتا بەو ئاوایە خۆیان لە گوناحی

پشتەوانی لە حکوومەتی میللیی کوردستان بشۆنەوە.

لەم بەشەی بیرەوەرییەکانمدا گەلێک جار ناوی «ئیحسانی» هاتووە، وەک پێشتر بینیمان لە «گونبەت» بریندار بوو و ناردرایە تاران، تەبای ئەفسەرانی تری گیراوی راپەڕینی خۆراسان: بەهرام دانش، حوسێن فازڵی و عەلی سەنائی لە ئینجیباتخانەی ناوەندی گیرابوون. پاش دامەزرانی حکوومەتی گەلێری ئازربایجان لە کاتی لەدادگەداندا لە گرتووخانە هەڵاتبوون و هاتبوونە پاڵ سوپای ئازربایجان. پلانی هەڵاتنیان لەلایەن شەهیدی قارەمان «ڕۆزبێ»وە دانرابوو و بەیاریدەی رائید «حەمیدی» جێبەجێ کرابوو. رائید «حەمیدی»یش تەبای ئەوان هەڵاتبوو و هاتبووە گەڵ سوپای ئازربایجان. بەو هۆیەوە، چوار کەس لە سەربازان گیرابوون، بەگرتنی هەشت مانگ حوکم دران و پاش تەواوبوونی ماوەی گیرانەکانیان رەوانەی سەربازی کرانەوە بۆ تەواوکردنی خزمەتیان.

بگەڕێینەوە بۆ ڕووداوەکان:

«رائید جەلال» کە یەکێک بوو لە ئەفسەرانی کوردی عێراق و چووبووە پاڵ بارزانییەکان، ئامۆژگاریی کردین ئەگەرهاتوو کوردەکان لێمان نێزیک بوونەوە، بێ وچان دەسڕێژێک تەماتیک لەبەرپێیاندا بەتاڵ بکەین بۆ ئەوەی هەم ئەوان بترسێن و هەم وورەی سەربازانیش دانەبەزێ. من بەبیانووی خۆبوێری لە شیمانەی کوشتوبڕی کتوپڕ بیرەبیر بووم لە بەجێهێنانی ئەو ئامۆژگارییەدا بەلاّم هەرکە هەستم کرد بیرەبیری من بووەتە مایەی وێرانی ئەوان و، بێ ئەوەی گوێ لە هەڕەشە و گوڕەشەی من بگرن ئۆتۆمۆبێلەکانیان لە گەمارۆ ناوە و بارەکە کەوتووەتە مەترسییەوە، بێ وچان ڕێژنەیەک گوللەم لەبەرپێی ئەواندا بەتاڵ کرد، ئیتر کوردەکان کە تێ گەیشتن وا ڕێژنەی دووەم دادەگرمەوە ، کشانە دواوە، بەلاّم بەردەوام چەند پێنگاوێک لە دوای ئێمە بەشوونمانەوە بوون. هەڵسوکەوتی ئەوان چیرۆکێکی بەبیرهێنامەوە کە لە کتێبەکانی سەرەتاییدا خوێندبووم «تۆپینی کەر و هەلەکەسەمای گورگ»: ئەوان چاوەڕوان بوون ئێمە لە قوڕ بچەقین و گیربین، ئیتر ئەوانیش بڕژێنە سەرمان. ئەوان هەر تامەزرۆی تفەنگ بوون.

هەرچۆن بێ پاش بەسەربردنی سێ ڕۆژی ناخۆش لەنێو سەرماوسۆڵە و قوڕولیتەدا، تەبای سەربازان گەیشتینە مەهاباد. بێگومان ناچاربووبووم لە ڕێگە تۆپەکان لە شوێنێکی لاچەپ بەجێ بهێڵم، ئۆتۆمۆبێل لە قوڕ ئاسێ بوو و ئیتر لە شوێنی خۆی نەبزووت. پاشماوەی سەربازان کە بەسواریی ولاّغ بەرێمان خستبوون گەیشتنەوە لامان.

مێژووی ٢٤ یا ٢٥ی سەرماوەزی ١٣٢٥ بوو گەیشتینە مەهاباد. بێ ناوبڕ چووینە

دیمانەی قازی محەمەد بەڵام لەوێ نەبوو، گوتیان چووەتە میاندوواو بۆ پێشوازی لە سوپا. ئەمیر حوسێن خان - وەزیری بەرگریی ئەو، گوتی ئێمە خۆیشمان نازانین چی دەکەین بەڵام بەبڕوای من مانەوەی ئێوە لە مەهاباد باش نییە لەبەرئەوەی دوور نییە ئێستە نائێستە سوپا بگاتە مەهاباد.

بێگومان ئێمە لە چاوەڕوانیی گەیشتنی سوپا بۆ مەهاباد دانەنیشتین، هەروەها هاتنی سوپای ئێرانمان بۆ ئازربایجانیش نەبینی بەڵام پاشان بیستمانەوە کە سوپا پیش ئەوەی بگات بەتەورێز، ماوەی سێ ڕۆژ لە «باسمینج: گوندێکی نێزیکی تەورێزە» هێوریبوو. دەستی دەسکیز و کرێگرتە و ناحەزانی شۆڕشیان بەرەڵڵا کردبوو هەتا هەر کارێکی بیانەوێ بەسەر دانیشتوانی بێ پەناو پەسیوی تەورێزیدا بهێنن. لەو سێ ڕۆژەدا خەڵکی تەورێزیان لە گۆمی خوێن گەوزاند. مرۆڤیان کوشت، پڕیان دایە ئافرەتان، ماڵانیان تاڵان و برۆ کرد و خانوویان ئاگر تێ بەردا. ئینجا دوای سێ ڕۆژ سوپا «بەسەرکەوتوویی» گەیشتە ناو تەورێز و ئەوەی بەکرێگیراوان بۆیان نەلوا بوو بیکەن خۆی کردی. بیست و شەش کەسیان لە ئەفسەران گرت و پاش لەدادگەدانێکی گاڵتەبازاڕی بەکوشتن حوکمیان دان. جەنەراڵ ئەبولقاسم ئەعزەمی، عەقید مورتەزەوی، رائید قاسمی، جەودەت، ئاگەهی، نەقیب غەفاری و جەعفەر سوڵتانی تەبای ١٩ کەسی تر گوللەباران کران. فەرەیدوون ئیبراهیمی، رامین، قولی سوبحی... و چەندان کەسی تر بەدارەوە کران. پاشان زانیمانەوە نێزیکەی بیست هەزار مرۆڤ تەنیا لە تەورێز شەهید بوونە و هەر ئەو ڕۆژانە چوار لە ئەفسەران: زەهیری، حەقپەرست، سەقاوی و خاکساری کە کوردانی بۆکان گرتبوویانن، لە مەهاباد گوللەباران کران.

ئەمان شەهیدگەلێک بوون بەتەواوی گیان و بڕوای قووڵی خۆیانەوە چووبوونە پاڵ شۆڕشی ئازربایجان بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە بتوانن ئازادی بە سەرتاپێی نیشتمانەکەیاندا بڵاو بکەنەوە. بەدرێژاییی مێژووی نوێدەمی وڵاتی ئێمە، گەلی ئازربایجان بەردەوام پێشەوانی ئازادیی ئێران بووە. ئەمجارەش هەر هیوا و خولیای هەموو ئازادیخوازان وابوو بڵێسەی گڵپەداری ئازادی لەوێوە بەسەر تەواوی ئێراندا ڕووناکی باوێژێ. مخابن لە بیرێکی خەمبار و دەیان هەزار شەهید بەولاوە شتێکی تری لێ بەجێ نەما، بۆ؟ پێم وایە پێشتر هۆیەکەیم باس کرد. ئەگەر ئەم ڕاپەڕینە لە کاتی خۆی و لە هەناوی کۆمەڵانی خەڵکی ئازربایجانەوە دەهاتە کوڵ ئەوا بەو ئاسانییە کپ نەدەکرایەوە تەنانەت ئەگەر پشتەوانیی هەڤاڵانی ئەو دیو سنووریشی لەگەڵدا نەبوایە.

مەڵبەندی خێڵی بارزان لەوپەڕی باکوری عێراق و، لە ناوچەیەکی کێوەلانیی دژواری بەستراوە بەسنووری ئێران و تورکیادا هەڵکەوتووە.

بارزانییەکان لەبەرئەوەی نیشتەجێی ئەو ناوچە دژوارەن و لە مەڵبەندی شارانەوە دوورەپەرێز ماوەن، مرۆڤگەلێکی لەشساغ و بەهێزن، لەڕووی ڕەوشتیشەوە هێشتا خاوەنی هەمان داوونەریتی باوک سالارین و لە هەموو جۆرە نالەبارییەکی شارستانەتی بەدوور ماون. شارستانی و پیسبوونی رەوشتی شارەکی لەناو ئەواندا هێشتا جێی نەبووەتەوە. بەبۆچوونی من ئەوان موسڵمانی بەبیروباوەڕن نەک ئەفسانەیی. سەرۆکی خێڵ لە هەمان کاتدا پێشەوای مەزەبیشیانە و ئەو پایەیە بە پشتاوپشتە. بارزانییەکان پێیان وایە پێشتر پیاوێکی خواناس بەناوی «شێخ ئەحمەد»ەوە هەبووە و بەردەوام پاسەوان و پارێزەری خێڵ بووە، سەرۆکانی ئێستەی خێڵ لە نەوەی هەمان ئەو «شێخ ئەحمەد»ەن.

بارزانییەکان بەردەوام لەبەرامبەر ئەو حکوومەتە جۆراوجۆرانەی دەسەڵاتیان بەسەر ئەو ناوچەیەدا ڕۆیشتووە، شەڕیان کردووە و هەلومەرجی ئاشتی بۆ ئەوان لە کایەدا نەبووە: سەردەمێک لەگەڵ تورکان و سەردەمێک لەگەڵ عەرەب و جارێکیش لەگەڵ ئێرانییەکاندا.

ساڵی ١٩٣٦، ئەو دەمەی کەمال ئەتاتورک جاڕی دا کەوا پرسی کوردی «بێگومان لەرێگەی کوشتوبڕی کوردانەوە لە دیاریەکر» چارەسەر کردووە، سەرۆکی ئەو خێڵە بەناوی شێخ عەبدولسەلام خێڵەکەی خۆی بەنیازی هاوکاری کردنی کوردانی تورکیا، رەوانەی ئەو وڵاتە کرد. وەک ئاشکرایە، ئەوان هەتا دیاریەکریش چوونە پێش بەڵام لەوێ شکان. شێخ عەبدولسەلام خۆی گیرا و بەدارەوە کرا، بارزانییەکانیش بڵاوەیان کرد و بۆ ناوچەی بارزان گەڕانەوە[٥]. پاش شێخ عەبدولسەلام، شێخ ئەحمەدی برای، سەرۆکی خێڵ بوو. ئەو

(٥) ئەم زانیارییانە چەوتن، لەبەرئەوەی شێخ عەبدولسەلامی بارزان «واتە: شێخ عەبدولسەلامی دووەم» کە برای گەورەی بارزانیی نەمر بووە ساڵی ١٩١٤ یا ١٩١٥ لە لایەن عوسمانییەکانەوە لە مووسڵ لە سێدارە دراوە، ئەمەش سەبارەت بەوەی کە شەهید شێخ عەبدولسەلام لە ساڵی ١٩٠٧ەوە بۆ وەرگرتنی مافەکانی گەلی کورد لە دژی داگیرکەرانی عوسمانیدا کەوتبووە بزووتنەوە. بەڵام، چوونی هێزی شەرکەری بارزانییەکان بۆ یارمەتیی کوردە ڕاپەڕیوەکانی تورکیا لە نێوان ساڵانی ١٩١٧-١٩١٩دا بووە، ئەوەبوو ئەو هێزە بەسەرۆکایەتیی بارزانیی نەمر گەیشتە فریای شێخ عەبدولقادری نەهری و شێخ سەعیدی پیران. جارێکی تریش شەڕوانانی بارزانی پاش ئەوەی ڕاپەڕینی یەکەمی بارزان لە ساڵی ١٩٣٢دا کەوتە کشانەوە، بەخۆیان و خاووخێزانیان پەنایان بۆ=

دەمەی من لەنێوان ئەو خێڵەدا بووم لە بەرەو دووا هاتنی ساڵی ١٣٢٥دا، هێشتا هەر ئەو کەسە سەرۆکی خێڵ بوو.

بارزانییەکان هیچ دەمێ لەبەرامبەر دەوڵەتی عێراقدا کۆڵیان نەداوە. پاش شەڕی دووەمی دنیا و پاش شکانی ئەوان لە تورکیا، حکوومەتی عێراق بەساڵان ناوچەی بارزانی داگیر کرد[٦]. شێخانی بارزان: شێخ ئەحمەد، مەلا مستەفا، شێخ محەمەد سدیق - برایانی شێخ ئەحمەد و، شێخ سلێمانی کوڕی شێخ عەبدولسەلام - یان گرت و لە بەسرا و کەرکووک لە گرتووخانەیان پەستاوتن و خستیاننە بن چاوەدێرییەوە.

سیاسەتی ئینگلیزەکان لە عێراق ئەوە بوو سەرباری حکوومەتی ناوەندیی عێراق، هێزگەلِی فیۆدالّی ئەو ناوچەیەشیان لە ژێر مامزەدا بێ بۆ ئەوەی ئەگەر رووداوی لەگوێن راپەرینەکەی «رەشید عالی گەیلانی» هاتەپێش ئەوا لە بەرامبەر دەوڵەتی ناوەندیدا کەڵک لەم هێزانە وەربگیرێ. یەکێک لەو خێڵانەش خێڵی بارزان بوو کە یارمەتیی شێخانی ئەوانیان دا هەتا لە گرتووخانە رزگار بن و بگەڕێنەوە ناوچەی بارزان. ئەو سەردەمە ئینگلیزەکان بەشەو مەلا مستەفای بارزان لە کەرکووک دەرفێنن و برێک چەک و تەقەمەنیی پێ دەدەن[٧].

= تورکیا برد و بۆ ماوەی ساڵێک لەو وڵاتە مانەوە، بڕوانە: بەڕێز مەسعوود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، راپەرینی یەکەمی بارزان ١٩٣١-١٩٣٢.

(٦) راستییەکەی ئەمەیە: پاش کشانەوەی راپەرینی یەکەمی بارزان ١٩٣١-١٩٣٢ و چوونی بارزانییەکان بۆ تورکیا، ئینگلیز و حکوومەتی عێراق هەتا ساڵی ١٩٤٣ ناوچەی بارزانیان خستە بن دەسەڵاتی خۆیانەوە، زۆربەی ئەو ماوەیە بارزانیی نەمر و خوالێخۆشبوو شێخ ئەحمەدی بارزان لە گرتووخانە و دەست بەسەریدا دەژیان.

(٧) نووسەر وەک خۆیشی لەو کورتە پێشەکییەی بۆ ئەم کتێبەی نووسیوە دانی پێدا دەنێ کەوا تەنیا پشتی بەبیرەوەریی خۆی بەستووە و نەگەڕاوەتەوە بۆ سەر ئەرشیف و دەستهاوێژ و سەرچاوەکان، بۆیە کەوتووەتە ئەم هەڵە زلانەوە. راستییەکی شاراوە نییە کە بارزانیی نەمر لە رۆژی ١٢ تەمووز ١٩٤٣ لەگەڵ دوو لە هەڤاڵانی خۆی بەناوی مستەفا عەبدوڵڵا و سلێمان سوورە لە سلێمانی «نەک کەرکووک - وەک نووسەر دەڵێ» دەرکەوتن و لە رێگەی کوردستانی ئێرانەوە گەڕانەوە بۆ بارزان و شۆڕشیان لەبەرامبەر حکوومەتی عێراق و سوپای داگیرکەری ئینگلیزدا دەست پێ کردەوە. هەموو سەرچاوەکانیش تەبان لەسەر ئەوەی بارزانیی نەمر بەهاوکاریی هەڤاڵانی خۆی و کوردپەروەر و شۆڕشگێرانی کورد بەتایبەتیش خوا لێخۆشبوو شێخ لەتیفی شێخ مەحموودی حەفید و خەباتکارانی پارتی هیوا ئەو دەرچوونەی کرد و شۆڕشی بارزانی ساڵی ١٩٤٣ - ٤٥ی =

پاش گەڕانەوەیشی بۆ بارزان و کۆکردنەوە و چەکدارکردنی پیاوانی خێڵەکەی، کەوتە شەڕ لە بەرامبەر دەوڵەتی عێراق و ناچاری کرد شێخانی بارزان لە گرتووخانە بەربدات و بگەڕێنەوە بارزان.

خێڵی بارزان نێزیکەی هەزار و پێنسەت مرۆڤی شەڕوانی لێهاتوون کە یەکجار دیسپلیندار و خەباتکارن. مەلا مستەفا خۆی ئەگەرچی پلەیەکی لە خوێندەواریی کۆن «کلاسیک»دا نییە بەڵام پیاوێکی تێگەیشتووە. زمانگەلی فارسی، عەرەبی و کوردی بەباشی دەزانێ و بەتورکیش قسە دەکات. زمانی فارسی لە «گولستان» فێربووە و بەهەمان دارشتنیش دەدوێ.

لە بیرمە ئەو دەمەی لە مەهاباد لەلای میر حوسێن خان - وەزیری بەرگریی قازی محەمەد، دەرکەوتین، مەلا مستەفام بینی وەک پەیامبەرێ لەناو ئالیگرەکانیدا وەستابوو، فیشەکی بەسەریاندا بڵاو دەکردەوە و بۆیان دەدووا. کاتێک منی بینی بەگەرمییەوە بەرەورووم هات، من پێشتر ئەوم دەناسی، پاش ئەوەی بیرەبیری و دوودڵی و پەشێویی ئێمەی بینی، گوتی:

- من پیشەوەری نیم، «پەناهیان»یش نیم لەکاتی ئاشتیدا سەرۆکی ئەرکانی سوپا بم و

= هەڵگیرساندەوە، ئەو شۆڕشەی لە ژێر پاڵەپەستۆی بەردەوام و نەپساوەی حکوومەتی عێراق و ئینگلیز پێکەوە بەکۆتا هات و، بارزانی و شەڕوانەکانی تەبای هەموو خاووخێزانیان لە سنوور ئاوابوون و چوونە پاڵ کوردە راپەڕیوەکانی کوردستانی ئێران. تەنانەت هەتا ئەو ڕۆژەی گەلەکۆچی بارزانییەکان لە سنووریش دەرباز بوو باڵەفڕەکانی عێراق و بەریتانیا دەستیان لە بۆمبابارانی ئافرەت و منداڵانی ئەوان هەڵنەگرت و زیانیان لێ دان.

بۆ زانیاریی پتر خوێنەری بەڕێز دەتوانێ سەیری ئەم سەرچاوانە بکات:

* بەڕێز مەسعوود بارزانی: بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد «شۆڕشی بارزان ١٩٤٣ - ٤٥».

* نەجەف قولی پسیان: لە مەهابادی خوێناوییەوە... هەتا لێوارەکانی ئاراس، گۆڕینی بۆ کوردی: شەوکەت شێخ یەزدین. «شایەنی باسە ئەم کتێبە لە ساڵی ١٩٤٧ بۆ یەکەم جار بەفارسی بڵاو بووەتەوە.

* نووسینی د. ئیسماعیل ئەردەڵان و گۆڕینی بۆ کوردی: مەعرووف قەرەداغی «بارزان و نهێنییەکانی»، ساڵی ١٩٥٩ بڵاو بووەتەوە و لە لاپەڕە ٢٢دا وەرگێڕ دەڵێ: «لەم دەربازبوونی مەلا مستەفایە، راستی سوپاسی شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحموودی مەزن و زۆر لە کوردە بەشەرەفەکان دەکرێ کە یارمەتییان دا».

لە کاتی شەڕدا کتوپڕ سەر لە باکۆ بێنمە دەر. خۆمم و ئەم تفەنگە «تفەنگەکەشی بەدەستەوە بوو» ، هەتا ئەم تفەنگەم بەدەستەوە مابێ خۆم خاوەنی خۆمم. خزمەتکاری هیچ هێز و حکوومەتێکیش نیم، نەئینگلیز ، نەئەمەریکا ، نەڕووس.

پاش ئەوەی پتر لەگەڵ یەکتردا دووایەن، هەستم کرد لە رووی سیاسییەوە هەتا رادەیەک بەرچاوی روونە. هەر خۆی بەهەمان شێوە ئاخاوتنی نووسەکی دەیگوت:

– ئەوە هەلومەرجی تایبەتیی دنیایە رووسەکان یارمەتیی ئێمە دەدەن. ئەوان ئێستە لەناوچەکەدا پێویستییان بەئێمە هەیە، بۆیە ئێمەش دەتوانین بۆ سەرفرازبوونی کوردستان سوود لە لێرەبوونی ئەوان وەربگرین. من کۆمۆنیست نیم، فیۆدالیش نیم، من دیموکراتم.

لەلای ئەو دیموکرات واتایەکی تایبەتیی هەبوو: لەگەڵ گەلەکەیدا لەسەر یەک سفرە دادەنیشت، لەگەڵ ئەواندا نانی دەخوارد، لەگەڵ ئەواندا دەچووە شەڕەوە و هەر لەگەڵ ئەوانیشدا لە سەنگەر دەنووست. ئەو بەجۆرێک بوو پیاوانی بارزانی خۆشیان دەویست. هەر ئەوەندە بەس بوو لە ئەسپ سوار ببێ ئیتر بێ وچان پێنسەت سواری چەکدار بێ ئەوەی بزانن یان بپرسن، بەدوای دەکەوتن. ئەو دەمەی فەرمانی شەڕێکی دەدا دڵنیابوو لەوەی جێبەجێ دەبێ. بەچاوی خۆم بینیومە چۆن لەسەر چیایەک دەوەستا و فەرمانی بەپیاوەکانی دەدا:

– پێنج مرۆ بچن بۆ سەر ئەو چیایە، عومەر تۆ و پێنج مرۆی تر بچن بۆ سەر ئەو چیایە، مووسا تۆ لەگەڵ چوار مرۆدا بچن بۆ سەر چیایەکەی تر...

ئەم فەرمانانە دەسبەجێ جێبەجێ دەکران. ئەو زەویی چاک دەناسی و زۆر بەچاکی دەیتوانی کەڵک لە لەمپەری زەوی وەربگرێ و بڕیار بدات، بەزیرەکی و لێزانییەوە کاری دەکرد. ئێمە هەرچەندە بەڕواڵەت پسپۆڕ و پیاوی تەکتیک و خوێندەوار بووین بەڵام پاش لێکۆڵینەوە و هووردبوونەوە لە نەخشەی زەوی و وتووێژکردن، ئەگەر بەچاکیش بڕیارمان بدایە ئەوا هێشتا وەک بڕیارەکەی ئەومان بڕیار دابوو. وەک چۆن گوتم ئەو زەویی زۆرباش دەناسی، دەیتوانی زۆرباش کەڵک لە لەمپەر و کەلەبەری زەوی وەربگرێ، ورەی سەربازانی دوژمن و ورەی پیاوانی خۆیشی بەباشی دەناسی. راستییت دەوێ، هەرچەندە نهێنیی سەرکەوتنی شەڕەکانی مەلا مستەفا هەتا رادەیەک گرێدراوی ئازایەتیی پیاوەکانی خێڵەکەی بوو، بەڵام لە پێشەوەی ئازایەتیی پیاوانی بارزانی، ژیریی مەلا مستەفا خۆی بوو کە دەبوو بەمایەی سەرکەوتن. تەرازووی هێزی خۆی و پیاوانی خۆی

دەزانی و لەو شوێنەی بیزانیایە دەسەلاتی بەسەردا ناشکێ بەدڵنیاییەوە پاشەکشەی دەکرد. کەس نەیدەتوانی بڵێ ئەوە لە ترسانەیە پاشەکشێ دەکات. ئەو بەباشی دەیتوانی لە کاتی لەباردا پەلامار بدا و لە کاتی لەباردا بکشێتەوە.

لە بەرەودوواهاتنی شەڕی دووەمی دنیا «واتە لە ساڵی ١٩٤٥»دا، خێڵی بارزان لەبەرئەوەی هێشتا حکوومەتی عێراق تەواو خۆی نەگرتبوو، هاتە سەر ئەو بیرەی بەو چەکانەی بەدەستیەوەن، کوردستان لە عێراق جیا بکاتەوە و حکوومەتی سەربەخۆی کوردستان دابمەزرێنێ. دانیشوانی کوردستان چ شارەکی و چ گوندەکی، دڵیان بەئەڤینی کوردستانەوە تریو دەدا. بێگومان لەوانەیە سەرفرازیی کوردستان لە بۆچوونی ئەوانەوە تێگەشتەیەکی تایبەتیی هەبێ بەلام ئەوان ئەڤینداری ئەمەن. ڕۆژێکیان من لە یەکێک لە خانانی تێگەیشتووی ئەوانم پرسی: ئایە مەبەست لە ئازادی و سەرفرازیی کوردستان چییە؟ وەلامی دامەوە:

- ئازادی ئەوەیە من سەرپشک بم لەوەی مەڕەکانم لە کوێی دەمەوێ لەوێ بلەوەڕێنم. بتوانم شیر و ڕۆنی خۆم بەهەر کەس و بەهەر نرخێ حەز بکەم بفرۆشم و حکوومەتی ناوەندی دەست لە کاری من وەرنەدات.

ئاساییە جەماوەری دانیشتوان هەست بەتێگەیشتەیەکی تر لەبارەی سەرفرازییەوە بکەن. بەم جۆرە، وشەی سەرفرازی بێ ئەوەی تێگەیشتەیەکی هووردی لەلای ئەوان هەبێ، هەر لە منداڵییەوە لە گوێی کورداندا دەزرینگێتەوە و هیوایان وایە ڕۆژێک بێ تفەنگیان بکەوێتە دەست و لە ڕێگەی سەربەخۆیی کوردستاندا شەڕی پێ بکەن. بێگومان مەلا مستەفا و شێخ ئەحمەد واتەی سەربەخۆیی لەمە هووردتر دەزانن. ئەوان لە مێژووی ژیانی کورد و کوردستان، لە سنوور و سەرژماریان لە ولاتان و شارانی جۆربەجۆردا ئاگەدارن. ئەو سەردەمە ڕێکەوتی ئەو کاتانە بوو کە حکوومەتی گەلێری ئازربایجان و کوردستان دامەزرابوون. مەلا مستەفا دەیگوت:

تەنێ بەهاوکاریی سۆڤیەتەکان دەتوانرێ کوردستانی یەکگرتوو و سەرفراز بێتە کایە، لەبەرئەوەی ئەوان سوودێک لە بەش بەشیی کوردستان نابینن. بگرە بەپێچەوانە، سوودی ئەوان ئەوەیە لە کوردانی ئێران و عێراق و تورکیا حکوومەتێکی سەربەخۆ پێک بێت. بەبەڵگە دەیگوت هەرکاتێ بلوێ پارچە زەوییەک لە ئینگلیز و ئەمەریکا جیابکرێتەوە، ئەوان لاوازتر دەبن. ئەو هەموو ئەو ولاتانەی بەکۆلۆنیی ئینگلیز و ئەمەریکا دەزانی و

دەیگوت:

- ئەو دەمەی لە عێراق بۆ بەدیهێنانی حکوومەتێکی کوردی تێ دەکۆشام، هەوڵم دا لەگەڵ رووسەکان کە لە ورمێ بوون پێوەندی ببەستم، پێوەندیشم بەست. بەڵام رووسەکان پیاوی «رژد - رەزیل»ن (مەبەستی ئەو لە وشەی رژد، پیاوی بزۆز و تێگەیشتوو بوو)، بەئاسانی نەدەتوانرا متمانەی ئەوان بەکێش بکرێ. بۆ بەکێش کردنی متمانەی ئەوان پێویست بوو گەلێک کار بکرێن کە من نەمدەتوانی بیانکەم. من خزمەتکار یان دەسکیز نیم. من تەنێ خزمەتکاری خێڵی بارزانم، خزمەتکاری نەتەوەی خۆمم.

بەڵام وێڕای ئەمەش توانیبووی متمانەی سۆڤیەتەکان بۆ خۆی بەکێش بکات. خێڵی بارزان لە شەڕ لەگەڵ وڵاتی عێراقدا شکابوو، لەبەرئەوەی ئەو کاتە بەشێک لە سوپای ئینگلیز بەیارمەتیی باڵەفڕەی «هاریکن»ەوە ناوچەی بارزان لە ئاگر هەڵدەکێشێ و کێڵگە دەسووتێنێ، ئیتر لە ئەنجامدا ئەوان دەکشێنەوە بۆ ئێران و پەنا دەبەنە بەر حکوومەتی گەلێری کوردستان.

لە مانگی گەلاوێژی ١٣٢٥دا ئەو رۆژەی مەلا مستەفای بارزان «ئێستە بووبوو بەجەنەراڵ بارزانی» لەگەڵ ٦٠ مێری بارزانیدا گەیشتە سەربازگەی تەورێز. ئەوانی هێنابوو خولی فێربوونی تۆپهاوێژی ببینن. ئەو لاوانەی شرە خوێندەوارییەکیان هەبوو ناردیانن بۆ کۆلێجی ئەفسەری و بچووکەکانیشیان ناردن بۆ ئامادەییی سوپایی لە تەورێز. سەرۆکی ئەو شێست مرۆڤە رائید نووری بوو کە یەکێک بوو لە ئەفسەرانی سوپای عێراق. لەوێ بوو مەلا مستەفای بارزانم ناسی. ئەمانە هەلی خوێندیان لە سێ مانگ پتر بەدەست نەکەوت و شەڕی نێوان سوپای ئێران و فیرقەی دێموکراتی ئازربایجان و کوردستان دەستێ پێ کرد کە مەلا مستەفا دیسان هاتەوە تەورێز و پیاوەکانی خۆی بەرەو بەرەی «سەرا»ی نێزیک سەقز برد.

ئەو شەوەی گەیشتینە مەهاباد مەلا مستەفامان بینی کە بەقسەی یەکێک لە هاوەڵەکانم وەک پەیامبەرێک خەڵکەکەی خۆی لە دەوری خۆی کۆکردبووە و فیشەکی بەسەریاندا دابەش دەکرد. ئەو پێشنیازی بەئێمە کرد بچینە پاڵ ئەوان. دڵنیای کردین لە ناو ئەواندا بەتەناهی دەیبەینە سەر. ئێمەش پەسندمان کرد و بەهەڤاڵەتیی ئەوان، بەشەو بەرووکاری نەغەدەدا بەرێ کەوتین، بەڵام بەر لە بەرێ کەوتنمان سەرپەرشتیی هەندێ لە سەربازان و چەند مرۆڤێکی بارزانیمان لە بارکردن و هەڵگرتنی تۆپەکاندا کرد و، ئەمانە

ڕۆژی پاشتر گەیشتنەوە ئێمە.

شنۆ هێشتا ناوچەیەکی تەنا بوو، بارزانییەکانیش بڕیاریان لەسەر ئەوەبوو بچن بۆ ئەوێ. شێخ ئەحمەد پێشتر چووبوو بۆ ئەو شوێنە. ئەم شارە لە سێکوانی سنووری ئێران و عێراق و تورکیادا هەڵکەوتووە و سوپای ئێران هێشتا نەگەیشتبووە ئەوێندەر. بارزانییەکان وایان نیاز بوو پێش ئەوەی سوپا خۆی بگەیێنێتە ئەو شوێنە، ئەوان بۆ زستان و خۆپارێزی لە سەرماوسۆڵە حەشارگەیەک بۆ خۆیان بدۆزنەوە.

لەهەمبەر بارزانییەکاندا سوپا سیاسەتێکی تایبەتی گرتبووە بەر. وەک دیارە لەمە بەولاوە چ ڕێگەچارەیەکی تری نەبوو. سوپا لەو هەلومەرجەدا نەیدەتوانی بارزانییەکان وا بەئاسانی سەربکوتێتەوە و، لەباری پێکدادان لەگەڵیاندا زیانی گەورەی دەدا. وێڕای ئەمە، لەباری سەرکەوتنیشدا لەبەرئەوەی بارزانییەکان ئێرانی نەبوون، ناچاربوو یان بەناوەی پەنابەر وەریان بگرێ و جێ نیشتەیان بکات یان ئەوەتا بیاندانەوە بەعێراق ئەمەش خۆی لە خۆیدا گیروگرفتی دەنایەوە. لەوانەیە ڕێگەچارەی تر ئەوە بووبێ سەرلەبەریان بکوژێ یان گەمارۆیان بدا و بەزۆردارەکی لە ئاخی ئێرانیان وەدەربنێ و بەرووکاری عێراقیاندا پاڵ بنێ.

وەک دیارە سوپا لەم بارەیەوە ژیرانەترین ڕێگەچارەی گرتەبەر. سوپا، تازە هاتبووە ئازربایجان و هێشتا زۆری گیروگرفت هەبوو. دەبوو لەگەڵ پاشماوەی فیرقەی دێموکراتی کوردستاندا(٨) یەکلای بکاتەوە، ناچار بوو سەرەتا بەرە و پاشەبەرە ساف بکات و پاشان لەبارەی بارزانییەکانەوە بڕیار بدات. هەر ئەم کارەشیان کرد. سوپا لەگەڵ بارزانییەکاندا کەوتە وتووێژ. ئێمە تازە لە نەغەدە «مەڵبەندی خێڵی قەرەپاپاغ»، گیرسابووینەوە. نەغەدە کەوتووەتە سەرەڕێی مەهاباد و شنۆ. عەقید غەفاری - دەمڕاستی سوپا، بۆ وتووێژ هاتە نەغەدە و مەلا مستەفای بۆ وتووێژ داوەتی تاران کرد. مەلا مستەفا پاش پرس پێ کردنی شێخ ئەحمەد داوەتەکەی پەسند کرد و تەبای دوو سێ کەس لە ئەفسەرانی عێراق ڕێگەی تارانی گرتەبەر. ئەو دەمەی ئەو گەیشتە مەهاباد سوپا ئەوێی گرتبوو و عەمید هومایوونیی سەرکردەی کاروانی ناردراو بۆ کوردستان، خۆنواندنی لە سوپاکەی وەردەگرت. لەوێ، ئەو لەلایەک و قازی محەمەد لەلایەکەی تری عەمید هومایوونیدا سەرنجیان لە خۆنواندنی سوپا دەدا. مەلا مستەفا خۆی لە پاشان باسی ئەم خۆنواندنە و

(٨) لەوانیە مەبەستی لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بێ - وەرگێڕ.

سەردانەکەی خۆی بۆ تاران بۆ کردم.

مەلا مستەفا و هەڤاڵەکانی بەباڵەفڕە بردرانە تاران، نێزیکەی بیست ڕۆژ لەوێ لەگەڵ بەرپرسانی حکوومەتدا دیمانە و وتوویژی کرد. ئامانجی میری ئەوەبوو بەئاشتی چەکیان لێ بکاتەوە و لە شوێنێکی ئێران، گوایە لە هەمەدان، وەک پەنابەر جێ نیشتەیان بکات. میری بەڕواڵەت ئامادەبوو ئەو کەسانەی لە عێراق حوکمی سیاسییان بەدوواوە هەیە وەک پەنابەری سیاسی وەربگرێ، زەوی و دەسمایەش بخاتە بەردەستی پاشماوەی پیاوانی خێڵەکە بۆ ئەوەی خەریکی چاندن بن.

مەلا مستەفا وای دەنواند ئێمە چ شەڕێکمان لەگەڵ دەوڵەتی ئێراندا نییە، ئێمە لێرە ئاخێکمان نییە هەتا بمانەوێ بەرگریی لێ بکەین یان دوژمنایەتیمان لەگەڵ کەسێکدا نییە بمانەوێ چەکی بەڕوودا هەڵکێشین. ئێرە ئاخی ئێرانە و هەردەبێ سوپای ئێران ڕۆژێک بێ ئەم زەوییە بگرێتەوە و ئێمە بەڕێ بکات. ئێمەش نامانەوێ خۆمان بکەین بە دیلی زەوییەک کە لەمەڕ ئێمە نییە. تەنێ یەک ڕێگەچارە لەبەردەمی ئێمەدا ماوەتەوە: هەڵمان هەبێ هەتا ئەو کاتەی بەفر و سەرماوسۆڵە بەکۆتا دێن، پاشان ئافرەت و منداڵ و پیرەمێران بنێرینەوە عێراق و خۆشمان پەنا ببەینە بەر سۆڤیەت هەتا لە هەلێکی لەباردا بگەڕێینەوە عێراق و وەدوای ئامانجی خۆمان بکەوین. ئەو لە هەمان کاتدا دەیگوت: «سۆڤیەتیش جێگەی ئێمە نییە». ئەو خۆی لەبارەی حکوومەتی سۆڤیەتەوە وشەی ڕژد «ڕەزیل»ی بەکار دەهێنا کە بەلا ئەوەوە بەواتەی: لێهاتوو، ژیر، گورجوگۆڵ و شتێکی لەم بابەتە دەهات. دەیگوت: «لەوێ هەر کەسێکی کار بکات ئەو نان دەخوات، بۆ ئەو شێخانەی لەمەوبەر نانی ئەوانیتریان خواردووە، ئەو وڵاتە ناشێ بۆیان ببێ بەجێگەیەکی گونجاو. بەڵام تاکە جێگەیەکی هێمن کە بۆ ئێمە بشێ ئەو جێگەیەیە بتوانین چەکەکانمانی تێدا بپارێزین هەتا ئەو ڕۆژەی بۆمان دەلوێ بۆ سوودی حکوومەتی سەربەخۆی کوردستان بەکاریان بهێنینەوە، پێویستە ئێمە بۆ ئەو جێگەیە بڕۆین».

لەبارەی سەردانەکەی خۆی بۆ تاران، مەلا مستەفا بۆ ئێمەی دەگێڕایەوە دەیگوت: «ئێمەیان بۆ سوپای دووەمی کۆشک برد و لەوێ مێوانداریان کردین. لەو ماوەیەدا دیمانەی قەواموسەڵتەنە و ڕەزم ئارام کرد. ڕەزم ئارا زۆر ژیرە و قەواموسەڵتەنە پیاوێکی خۆویست و کورسی پەرستە»، «لەگەڵ پاتشایەکەشتاندا قسەم کرد». هەروەها بەئاخاوتنە تایبەتەکەی خۆی دەیگوت:

- ڕۆژێکیان لەنگەرییەکیان خستە سەر سەرم، ملپێچێکیان لە ئەوکم گرێ دا و، پاڵتۆیەکی ڕێکوپێکیان بۆ کڕیم، سوپا پارەی دابوو بۆمی بکڕن بەڵام ئەو عەقید غەفارییە چەپەڵە دەیویست پارەکە بخوا و کۆنە جلەکانی خۆیم لەبەر بکات. بۆ من پاڵتۆی کۆن و نوێ جیاوازییەکی نەبوو بەڵام ویستم تێی بگەینم کە ڕاستە ئێمە چیایین بەڵام لە هەموو شتێکیش دەگەین، پێم گوت:

- عەقیدی بەڕێز، شوورەیییە بۆ دەوڵەتێکی وەک ئێران بەم هەموو مێژووەوە جلکی کۆنە بکاتە بەر مێوانەکانی.

دەمودەست بردمی بۆ کۆگەیەک و گوتی: «هەرچیی دەتەوێ هەڵی گرە! ئەم پاڵتۆیەی وا لەبەریشمدایە هەر لێرەم هەڵگرتووە.» پاش ئەوە بردمیان بۆ کۆشکی پاتشا. لە ساڵۆنی چاوەڕوانیی پاتشادا هەموویان بەئیشارەت و ئاماژە دەدوان و بەردەوام دەیانگوت: «هیس... هیس» و دەرگەیان بەمن پێشان دەدا. گوتم باوکە دەڵێی زمانتان لە دەمدا نییە، بۆچی وا لاڵ و پاڵ ماون و هەر هیسە هیستانە، بۆچی ئاماژە دەکەن، چیتان دەوێ بڵێن، بەتەواوی بیڵێن. دیسانەوە ئەوان بەئیشارەت لەگەڵ مندا دەدوان، من دەمزانی ئەوان چی دەڵێن، بەڵام دەمویست بپەیڤن. ئێ باشە خۆ پاتشایش هەر مرۆڤە. پاشان دەرگەیان کردەوە و بینیم مەزنرێزدار وا ڕۆنیشتووە، چووم سڵاوم لێ کرد، جێگەی پێ پێشان دام و، لەسەر کورسییەک دانیشتم».

مەلا مستەفا بەردەوام بوو: «دوو سەعات بۆ پاتشایەکەی ئێوە ئاخاوتم، گەلێک کەیفی پێم هات. پاش دوو سەعاتەکە ویستم هەڵستم، گوتی: دانیشە. گوتم جارێکی تر هەڵناسمەوە هەتا خۆتان فەرمان نەدەن. جارێکی تر تێ هەڵچوومەوە. ئەو لەبارەی نیشتەجێ کردنەوەی ئێمە لە ناوچەیەکی ئێراندا قسەی کرد. وەڵامیم دایەوە:

- بەخوا مەزنرێزدار ئێوە زۆر دەسواڵا و نانبدەن، من هەموو پێشنیازەکانی ئێوەم بەدڵە بەڵام دەبێ شێخ ئەحمەد بڕیار بدات، ئەو سەرۆکی خێڵە.

لەبارەی ئێوەی ئەفسەرانیشەوە پاتشا دەیگوت بەدەستەوەتان بدەم. گوتم:
- ئێمە ئەوانمان نەگرتووە هەتا بیاندەینەوە، ئەوان شەش ئەفسەری لاون «لە دە کەس ئێمە شەشمان ئەفسەری ڕەسمیی سوپا بووین»، سەرجەمی تەمەنیان ناگاتە سەت ساڵ. لە جیاتی شەش لاو، من هەژدە لاو بەئێوە دەدەم. بنەماڵەی من و شێخ ئەحمەد و تێکڕای برایانم هەژدە لاومان هەیە، هەمووشیان لاوی لێهاتوون، لە جیاتی ئەم شەش لاوە من

ئەوان بەئێوە دەدەم. بەڵام ئێوە مەتانەوێ ئەو شانازییانەی هەتا ئێستە شێخانی بارزان بۆ ئێمەیان بەجێ هێڵاوە بەفیڕۆیان بدەین و، نفرو جوێنی نەوەگەلی داهاتووی بارزان بۆ خۆمان بکڕین.»

بەکورتی لە تاران پێشنیازیان بۆی کردبوو لە ناوچەیەکی نێزیکی هەمەداندا نیشتەجێ بن، ئەویش رازی بووبوو. ئەگەر بهاتایە و شێخ ئەحمەد پەسندی بکردایە ئەوا پاش شکانی سەرمای هەوا ئەم جێگۆز و جێگۆڕکەیە دەستی پێ دەکرد، بڕیار بوو لە باتی هەر کامیۆنێک گەنم چەند ماڵە بارزانییەک پاش چەک لێ کردنەوەیان بەرەبەرە بەرەو شوێنی مەبەست بگوازنەوە.

بۆ رۆنکردنەوەی ئەم رازیبوونەیشی دەیگوت:

– ئەگەر پەسندم نەکردایە بەریان نەدەدام.

لە تاران مەلا مستەفایان بۆ سەیرکردنی کارگەی چەک، کۆگەی چەک، سەڵتەنەت ئاوا، هێزی ئاسمانی و کۆلێجی ئەفسەری بردبوو. خۆی دەیگێڕایەوە دەیگوت: ئەو رۆژەی منیان بۆ کۆلێجی ئەفسەری برد بەڕەزم ئارام گوت:

– بەخوا جەنەراڵ ئەم هەموو چەک و سوپا بەتوانایە من لێی ترسام، بەڵام دەبێ خێڵی بارزان بترسێ. ئەوان لەم هەموو چەکە ناترسن، ئەوان یەک تفەنگیان هەیە و بەیەک پارووە نان لەسەری چیایان دەژین.

هەروا دەیگوت:

– ئەو دەیویست ئەم هەموو چەکە بخاتە بەر چاوی من منیش ئاوها وەڵامیم دایەوە.

لە نیوەی دووەمی مانگی بەفرانباردا بوو مەلا مستەفای بارزان لە تاران هاتەوە. پێوەندیی مەلا مستەفا لەگەڵ ئێمە چەند ئەفسەرێکدا زۆر باش بوو، هەستی دەکرد ئێمە چێتر لە قسەکانی ئەو دەگەین.

سەرۆکایەتیی شێخ ئەحمەد و شێخانی تری بارزان، سەرۆکایەتیی فیۆداڵیی بەزەبروزەنگ و چاوچنۆک نەبوو. لە رووی مەزەبییەوە بەڕاستی باوەڕیان بەشێخ ئەحمەد هەبوو. ئەویان بەپێشەوای ئایینی و جێ نشین و دەمڕاستی شێخانی بارزان دەزانی. شێخی بارزان لە راستیدا سیمبۆلی باوەڕی مەزەبیی خێڵی بارزان بوو.

مەلا مستەفا دەیوت:

- گەڕانەوە بۆ بارزان پێویستی بە چەکدانان هەیە، ئێمەش ئەگەر چەکەکانمان لەدەست بدەین دەبین بەمرۆگەلی لاواز و بێدەسەلاتی ئەوتۆ کە خەڵکانی تر بڕیارمان لەبارەوە دەدەن.

پاڵپشتییش بۆ بڕیاری مەلا مستەفا بەردەوام ئەمە بوو:

- مرۆڤ هەتا چەکی بەدەستەوەیە خۆی خاوەن بڕیارە، بەڵام هەر کاتێ چەکی دانا ئەوا ئیتر بڕیاری لەبارەوە دەدەن. مرۆڤیش ناچار دەبێ بۆ ئەو بڕیارە هەرچەندە دژواریش بێ مل بدات. لە خێڵی بارزان زۆران هەن نایانەوێ چەک لە دەست بدەن بەتایبەتیش کە سەت و بیست مرۆڤ لە پیاوانی ئێمە لە عێراق فەرمانی لە سێدارەدانیان بەدواوەیە.

ئەو، سۆڤیەتی تەنیا بەجێگەیەکی هێمن دادەنا کە بەشێوەیەکی کاتەکی بۆی بچێ و لە هەلێکی لەباردا بۆ پرسی دانانی حکوومەتی کوردستان بگەڕێتەوە عێراق.

ئەو دەیگوت:

- من کۆمۆنیست نیم، کەیفیشم بەکۆمۆنیزم نایێ، من دێموکراتم و حەز دەکەم لەگەڵ گەلی خۆمدا لە ئاشتی و هێمنی و یەکسانیدا بژیم و بۆم بلوێ ئاڵای کوردستان لە خاڵێک لە کوردستاندا هەڵ بدەم، جا ئەو خاڵە عێراق، ئێران یان تورکیا بێ جیاواز نییە.

پێشتر گوتم نیوەی دووەمی مانگی بەفرانبار بوو مەلا مستەفا لە تاران گەڕایەوە. هەتا مانگێک پاش گەڕانەوەی ئەو، پێوەندیی خێڵی بارزان و میریی ئێران باش بوو. تەنانەت باری لۆرییەکیش گەنمیان بۆ ناردن بەڵام مەلا مستەفا بەبیانگەی سەرما و وتووێژ لەگەڵ شێخانی بارزاندا، لە بەدەستەوەدانی چەک و چەند خێزانێک بۆ گواستنەوە بۆ هەمەدان خۆی نەدایە دەست. پاشی مانگێ سوپا بەرەبەرە لە خۆبەدەستەوەدانی بارزانییەکان بێ هیوابوو، ئیتر کەوتە مۆڵدان و ڕێکدانەوەی هێز لە دەوروبەری ناوچەی بارزانییەکان و خۆئامادەکاری بۆ لێدانیان. بارزانییەکانیش کەوتنە خۆڕێکدانەوە و ئامادەکاری بۆ دەسوەکەری و بەرگری. ئەو دەمە بارزانییەکان لە نەغەدە، شنۆ و دەشتەبێڵ و مەرگەوەڕ جێگیر بووبوون. بەرلەوەی لە باسی خۆئامادەکاریی هەردوولا و دەسپێکی شەڕ بدوێم، لەبارەی سەرپێهاتی خۆمان و ئەوەی هەتا ئەو دەمە لە چ هەلومەرجێکدا بووین قسە دەکەم.

من و رەئیس دانا پاش ئەوەی لە مەهاباد بەبارزانییەکان گەیشتین و بڕیارمان دا بەگەڵیان کەوین، سەرپەرشتیی هەندێک سەرباز و پیاوانی بارزانیمان لە بارکردنی

تۆپەکاندا کرد و خۆیشمان بەڕووکاری نەغەدەدا بزواین.

شەش ئەفسەری تر کە فەوجەکەیان لە بۆکان تاوابووەوە، پاش گەیشتن بەمەهاباد و بەستنی پێوەندی لەگەڵ قازی محەمەددا، بەرەو ڕووکاری ورمێ کەوتبوونە ڕێگە بەو هیوایەی بەرەو سۆڤیەت بڕۆن بەڵام لە نێزیکی ورمێ زانیبوویان ورمێ کەوتووەتە دەستی دوژمنانی فیرقەوە، بۆیە لەنیوەی ڕێدا گەڕابوونەوە و چووبوونە نەغەدە. ئەوان سەعات هەشتی شەو دەگەنە نەغەدە و لە چایەخانەیەکدا لا دەدەن. ئەو دەمە هێزگەلی بارزانیش گەیشتبوونە نەغەدە و لەلایەن شێخ محەمەد سدیق «یەکێک لە برایانی شێخ ئەحمەد»ەوە حکوومەتێکی سەربازی ڕاگەیەندرابوو، جاڕکێش لە شارۆکەی نەغەدەدا دەگەڕێ و بانگ ڕادەهێڵێ:

«فەرمان فەرمانی شێخ محەمەد سدیقی بارزانە، هاتوچۆ پاش سەعات نۆی شەو قەدەغەیە».

هاوەڵانی ئێمە پاش شیو خواردن لە سۆنگەی بێ تاقیکردنەوەیی و دڵنیابوونەوە هەر لەو چایەخانەیەدا پێکەوە سەرخەو دەشکێنن. ئاگایان لەوە نابێ لە نەغەدە دەسەڵاتدارییەکی دووانە هەیە: بارزانی - قەرەپاپاغ.

قەرەپاپاغ خێڵێکی تورکی زمانە بەوێنەی دوورگەیەک لە ناوچەی کوردستان، لە نێوان مەهاباد و ورمێدا نیشتەجێ بوونە. ئەو ناوچەیە بەناوی «سوڵدووز»ەوە دەناسرێ و مەڵبەندەکەی نەغەدەیە. ئەو دەمە سەرۆکی خێڵ کەسێک بوو بەناوی «قولیخان برجالوو» کە لەلایەن فیرقەی دێموکراتی ئازربایجانەوە پلەی عەقیدی هەبوو و هەر لەو دوواییانەدا هەزار سواری قەرەپاپاغی بۆ شەڕ لەدژی حکوومەتی ناوەندیدا ئامادە کردبوو. کاتێ دۆخ بەرەواژ بووەوە، ئیتر قولیخانیش بێ ناوبڕ ڕووی خۆی وەرگێڕا و ئاڵای ئێرانی لە نەغەدەدا هێنایە لەرە و کاربەڕێوەبەریی ناوچەی سولدووزی گرتە دەستی خۆی. بەناوی قەوامولسەڵتەنەوە خۆی کرد بەکاربەدەست و، بەڕێوەبەری بۆ نەغەدە دەست نیشان کرد. هەر ئەو سوارانە کە هێشتا مێدالیەی بیست و یەکی سەرماوەزیان بەسینگەوە هەڵواسرابوو، بوون بەکارداری سوپا و کەوتنە سەرکوتینەوەی ئەو کەسانەی هێشتا بەدڵسۆزی بۆ فیرقە مابوونەوە.

لە هەمان ئەو بارانەدا دەبیسترێ حەوت ئەفسەری فیرقە لە چایەخانەیەکدا رازاون. ئەو ڕۆژانە ئەفسەر بۆ ئەو گیانلەبەرە لە هەلگەڕانەی دەیانویست گوناحی رابردوویان پاکژ

بکەنەوە، پارووێکی چەور بوو. گرتن و دانەوەی ئەوان بەهێزگەلی میری دەیتوانی لاپەڕەی «ڕەش»ی ئەو کەسانەی خزمەتی فیرقەیان کردبوو پاگژ و خاوێن بکاتەوە. هەرچۆن بێ، بەشەو دەڕژێنە ناو چایەخانەکە و هەر حەوت کەس: زێڕبەخت، ئیحسانی، تیوای، ئەرتەشیار، تەوەکولی، عەلی ئەسغەری و نیکۆلا دەگرن و چەکیان لێ دەکەنەوە. شەو ئەمانە دەبەن لە مزگەوتێک دەیانگرن و بەبیانگەی پشکنینی لەش رووتیان دەکەنەوە و سبەینێ دەیانبەن بۆ ماڵێک کە ناویان نابوو بەڕێوەبەرایەتیی ناوچە. لە ڕێگە مرۆڤێکی بارزانی بەناوی «کاک ساڵح» ئەم ئەفسەرانە دەبینێ و بەبەسەرهاتەکەیان دەزانێ و، شێخ محەمەد سدیق ئاگەدار دەکاتەوە.

لە بەڕێوەبەرایەتیی ناوچەدا، ئەو دەمەی ئەفسەرانیان بەدەستی گرێدراوەوە ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی بیانبەن بۆ پێشوازیی سوپا و بیانکەن بەگاووگەردوون، کوڕی شێخ محەمەد سدیق تەبای چەند چەکدارێکی بارزانی بەسەر ڕادەگەن و، ئەفسەرەکان بەرەڵلا دەکەن، قەرەپاپاغەکان چەک دەکەن و بەڕێوەبەرایەتیی ناوچەش دەپێچنەوە. ئیتر دەمودەست پاسەوانە ڕەقەکار و میری پەروەرەکانی پێش تاوێک، دەبن بەپاکار و گوێ لە مستی ئەفسەرەکان، دەسبەجێ کەلوپەلە تالانکراوکانیان بۆ دەگێڕنەوە و داوای لێبووردن دەکەن، هەریەکە و دەیەوێ خۆی ڕاستوێژتر و بەوەفاتر بۆ فیرقە پێشان بدات. بەڵگەشیان هەر مێداڵیەی ۲۱ی سەرماوەز دەبێ کە هێشتا بەسینگیانەوەیە.

ئەو دەمەی گەیشتمە نەغەدە دوو ڕۆژ بوو ئەفسەرەکان بەربووبوون. بێگومان ئەوان لە مەترسییەکی گەورە دەرباز بووبوون. من تەبای تۆپ و سەربازەکانم بەهەیت و هووتێکی ڕێکوپێکی سوپاییەوە گەیشتمە ناو نەغەدە. ئیتر ئێمە بۆ خۆمان هێزێکمان پێکەوە نا: دە ئەفسەر، دوو تۆپ و نێزیکەی سەت و سی چل سەرباز. هەر بەم بۆنەیەوە شوێنێکی جیامان بۆ خۆمان کردەوە و گیرساینەوە و چەند ڕۆژێک چاوەنۆڕ بووین.

سەربازەکان بەرەبەرە سەبریان سووا. ئامانجێکیان لە پێشدا نەبوو، لە ڕاستیشدا سەربازەکان هەستیان دەکرد کارێکی بەزۆردارەکی لە پێناوی مندا دەکەن. من لە ئازربایجانەوە هەندێک پارەم لەگەڵ خۆمدا هێنابوو، هەر یەکە و نەختێک پارەم پێ دان هەتا بەماڵ دەگەنەوە، چەکەکانم لێ کردنەوە و بەڕێم کردن. تەنیا چەند کەسێکی بژاردەیانم بێگومان بەپەسندکردنی خۆیان بۆ پارێزگاری لە تۆپەکان، لەلای خۆمدا گل دایەوە.

پاش ماوەیەکی کەم بەهاوەڵەتیی ڕێنوێنێک یان بەگوتەی بارزانییەکان «شارەزایەک»

چوومە شنۆ. لە بیرمە ئەو دەمەی گەیشتمە شنۆ و بۆ بەسەربردنی شەو چوومە چایەخانەیەک، هاوەڵێکمان گوتی:

- ئێستە شەوی یەکەمی بەفرانبارە و سێ مانگی سەرومڕ زستان و بەفرمان لە پێشدایە.

خانووەکمان لەوێ گرت. خانوو خانووی ئافرەتێک بوو کە فراقێن و شێویشی بۆ لێ دەناین. پرۆگرامێکیشمان بۆ کات رابواردن بۆ خۆمان رێک خست، هەروەها پرۆگرامەکەی خۆیشم لە بارەی ئامادەکردنی تۆپەکانەوە پرۆگرامێکی تێروتەسەل بوو. هەر بەگەیشتنمان بۆ شنۆ پاشماوەی سەربازەکانم بەڕێ کرد و بیست مرۆڤی بارزانیم بۆ بەکاربردنی تۆپەکان خستە مەشقەوە.

شنۆ پاڵی داوە بەچیایەکی بڵندەوە کە بەردەوام بەفر گرتوویەتی. سبەینان سەرلەزوو بۆ خاوێنی و مەشق دەچووینە بناری چیا. نیو سەعاتێ مەشقمان دەکرد، تاوێک هەڕامان دەکرد و پاشان بەرەو ماڵ دەبووینەوە، کەمێک نانی بەیانیمان دەخوارد و پاشان پاشماوەی ڕۆژ بەدەستی بەتاڵ دەسووڕاینەوە.

شێخ لە ماڵێکی دوو ژووریدا دادەنیشت، لەڕاستیدا یەکێک لەم ژوورانە کادین بوو خاوێنیان کردبووەوە. ژن و منداڵی شێخ ئەحمەد لە یەکێک لەم ژوورانەدا دەژیان، خۆیشی لە ژوورەکەی تردا لەسەر چوارپایەک دادەنیشت. لەبەردەمی ئەودا قۆدیلکەیەکی بچووک هەبوو بەردەوام هەندێک چێوی تاشراوی تێدابوو. کردبووی بەخوو بەقەڵەمبڕێکی جوان یەکەیەکەی ئەم چێوانەی هێندە دەتاشی هەتا تەواو دەبوون. ئەم کارە بۆ ئەو خۆ مژوول کردن بوو بەڵام بۆ ئالیگرەکانی حیکمەتێک بوو. پێیان وابوو لەو کاتانەدا هزری بۆ دێ بۆ ئەوەی چ بڕیارێکی پێویست بۆ بەرژەوەندیی خێڵ بدات.

شێخ ئەحمەد پیاوێکی چاک و میللی بوو. هێندەش بەلای سیاسەتەوە نەدەچوو. تەنیا حەزێکی هەبوو ئەوەبوو خێڵەکەی بەهێمنی بباتەوە بۆ بارزان. لە زۆرینەی ئاخاوتنەکانیدا خولیای گەڕانەوە بۆ بارزان، بیری ترێی بارزان، نیسک و کشتوکاڵی بارزان، بەتایبەتیش ئەو ئاگرانەی لە زستانان هەڵیان دەکرد شەپۆلی دەدا.

ئاگرەکانی زستانانی بارزان بۆ بارزانییەکان هەردەم بیرەوەرییەک بوو. ئەو دەمەی ئاگرێکی گەورەیان دەکردەوە دەیانگوت:

- ها دەڵێی ئاگری بارزانە!

کەسێکی تر کە دەشێ سەرپێهاتییەکەی سەرنج راکێش بێ لاوێک بوو «سەعید» ناو. ئەم لاوە لە کوردانی عێراق بوو، هەر پازدە ڕۆژ جارەک دەهاتە شنۆ[٩]. ئەمە لە راستیدا پێوەندی ڕاگری نێوان حزبی رزگاریی عێراق و خێڵی بارزان بوو. مەلا مستەفا سەرۆکی شانازیی ئەو حزبە بوو[١٠]. ڕۆژنامەی «ڕزگاری»یش بەزمانی کوردی، بەشێوەیەکی کەس پێ نەزان چاپ و بڵاو دەبووەوە. ئەو ڕۆژنامەیە حەفتانەیی بوو. هەردەمێکی سەعید بهاتایە بۆ شنۆ هەندێک دانەی لەو ڕۆژنامەیە لەگەڵ خۆیدا دەهێنا.

سەعید کوڕێکی ئازا بوو. هەر پازدە ڕۆژ جارێک سەروگوێلاکی وەدەر دەکەوتن. ئێمە دەمانزانی کەی دێ. هەرجار سەعات چوار یان پێنجی پاشنیوەڕۆ دەهات. یەکێک لە سەرنج بەکێش کەرەکانی ئێمە سەیرکردنی هاتنی ئەو بوو کە لە نێو بەفری بەرپاڵی بەرزاییەکانی پشت شنۆوە بەدەر دەکەوت. بەرەبەری ڕۆژئاوا رەشاییەکمان دەبینی لەناو بەفرە ئەستوورە زۆر سپییەکەدا گلۆر دەبووەوە. تاک و تەنیا و بەپێیان، لەو بەفر و سەرمایەدا تەنیا بەخۆی و داردەستێکەوە بەرێگەدا دەهات. دەهات و گیرفانەکانی پڕ بوون لە ڕۆژنامە و پرۆگرام و نامە بۆ مەلا مستەفا کە وەڵام و سەرنجی ئەویان دەویستەوە. هەروەها پارەیشی بۆ خێڵی بارزان دەهێنا. پاش جێبەجێ کردنی کارەکانی، شەو لەکن ئێمە دەنووست و بۆ سبەی ڕۆژ بەهەمان ئەو ڕێگەیەی پێیدا هاتبوو دەچووەوە و بەناو بەفرەکەدا ون دەبوو.

بەدرێژاییی ئەو ماوەیەی لە کوردستان بووین، سەعید بەردەوام هەڤاڵی ئێمە بوو. بەتایبەتیش پاش ئەوەی شەڕ لە نێوان بارزانییەکان و سوپای ئێراندا هەڵگیرسا، بەردەوام لەناو خێڵ دەمایەوە، هەتا سەر سنووری عێراقیش لەگەڵ ئێمەدا بوو، لە سنوور بەپێی ئەرکێک کە مەلا مستەفا پێی راسپارد چووەوە بۆ عێراق، لەوێ گیرا و خرایە گرتووخانەوە.

تاقیکردنەوە و تێکەڵیی ئێمە لەگەڵ کورداندا ئەو سەرنجەی لەلا پەیا کردین کە

(٩) واپێ دەچێ ئەم لاوە حەمە سەعید کانی مارانی بووبێ- وەرگێڕ.

(١٠) ناچارین جارێکی تریش بڵێین بەداخەوە وا دیارە نووسەری بەرێز بەهۆی ئەوەی سەیری هیچ سەرچاوەیەکی نەکردووە و لە کەسی نەپرسیوە هەندێ شتی لێ تێکەڵ بووە، ئەو کاتەی نووسەر قسەی لەبارەوە دەکات بەهاری ١٩٤٧ە، ئەو کاتە پارتی دیموکراتی کوردستان لە ١٦ ئاب ١٩٤٦دا بەسەرۆکایەتیی بارزانیی نەمر دامەزرابوو، حزبی«ڕزگاری»یش خۆی هەڵوەشاندبووەوە و هاتبووە ناو پارتی - وەرگێڕ.

ڕۆناکبیرانی کوردی عێراق زیاتر و بەبیرترن. ئەو کاتە «پارتی»یەکی پێشکەوتوویان هەبوو کە ڕێکخستنێکی زانستیی هەبوو. ڕێکخستنەکەیان لەسەر بناخەی خێڵ و هۆز نەبوو. هەرچەندە لە حکوومەتی میللیی کوردستاندا هەندێک سەرۆک خێڵ لە دەوری قازی محەمەد کۆوە بووبوون بەڵام ئەوان «واتە ڕۆناکبیرانی کوردی عێراق - وەرگێڕ» تێکەڵییان لەگەڵ حکوومەتی سەربەخۆی کوردستاندا هەبوو. ڕاستییتان دەوێ، حزبێکی سیاسیی سەربەخۆ کە خاوەن ڕێکوپێکییەکی سیاسی بێ لە کایەدا نەبوو یان ئەوەتا بەشێوەیەکی زۆر بچووک هەبوو. هێزی بنەڕەتیی حکوومەتی کوردستان لە خێڵەکانی: هەرکی، مامەش و مەنگوڕ و ئەوانیتر پێک هاتبوو. قازی محەمەد پتر وەک سەرۆکی ئایینی دەژماردرا و جێگەی ڕێزی هەموان بوو.

من خۆم لە نێزیکەوە قازی محەمەدم نەبینیبوو، بەڵام محەمەد حوسێن خانم بینیبوو کە فیۆدالێک بوو، خزمی قازی محەمەد و وەزیری بەرگریی ئەو بوو. قازی محەمەد لەگەڵ هاوەڵانی ئێمە ئاخاوتبوو و لەناو قسەکانیدا گوتبووی:

- پیشەوەری تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی ئەوا من چووم و ئەتۆش وەرە، بەڵام من ناتوانم وەک پیشەوەری گەلەکەم بەرەڵڵا بکەم و بۆ ڕزگاریی گیانی خۆم گەلەکەم بەخوا بسپێرم. من ئەگەر پێ لە مەهاباد باوێژمە دەرەوە ئەوا گەلەکەم بەردەبنە گیانی یەکتر. من بۆ پاراستنی ئەم گەلە ناچارم لە مەهاباد بمێنم هەتا سوپا دێ و دەسەڵاتی نوێ دەچەسپێنێ. من هەر لێرە دەمێنمەوە ئەگەر لە داریش بدرێم.

قازی محەمەد هاوکاریی چەسپانی سوپای کرد، تەنانەت چووە پێشوازیی عەمید هومایوونیی سەرکردەی سوپای هاتوویش، بۆ ئەوەی بەم شێوەیە ببێ بەبەرگر لە پێش کوشتوبڕدا. ئامانجی سوپاش ئەوە بوو بەیارمەتیی قازی محەمەدەوە جێگیر ببێ پاشان دەسەڵاتی ئەو کورت بکاتەوە، تەنانەت سوپا پاش ئەوەی گەیشتە مەهاباد قازی محەمەدی لەکار لا نەبرد. ئەو هەروەک پێشەوا مابووەوە و لە بنکەی سەرۆکایەتیی خۆیدا لە مەهاباد کاربەڕێوەبەریی دەکرد. پاش جێگیربوونی سوپا، ئەو و محەمەد حوسێن سەیفی قازی و سەدر گیران و بەناجوامێری بەدارەوە کران، گیانیان شاد بێ...

هەرچۆن بێ پاش گەڕانەوەی مەلا مستەفا لە تاران، بەپێی ئەو ڕێکەوتنەی کرابوو، بارزانییەکان نەغەدەیان بەجێ هێشت و لە ناوچەی شنۆ، دەشتەبێڵ و مەرگەوەڕ جێگیربوون.

پاش گیرانی قازی محەمد، عەقید غەفاری لە یەکێ لە هاتنەکانیدا بۆ شنۆ، لەگەڵ ئێمەش ئاخاوت. بۆی روون کردینەوە کەوا لەداردانی قازی محەممەد و خزمەکانی دواترین لەداردان دەبن، چاترە ئێمە سوود لەم هەلومەرجە وەربگرین و خۆمان بەدەستەوە بدەین و لەم ناگزووربیە رزگارمان بێ. ئێمە بۆ خۆبەدەستەوەدان دەستەبەری تەواومان دەویست، بۆ نموونە بەشێوەیەکی رەسمی لێبووردنمان بۆ دەربچێ و لە رادیۆی تاران رابگەیەندرێ.

ئەم گفتوگۆیە لە حزووری مەلا مستەفادا کرا. عەقید غەفاری لە وەڵامی ئێمەدا گوتی:

- باشە، ئەمە لەسەر بەرێز مەلا مستەفا وەستاوە کە لە تاران قسەی داوە ئێوە بەدەستەوە بدات.

مەلا مستەفا لەم قسەیە زۆر شڵەژا و بەرتەکی دایەوە گوتی:

- بۆچی درۆ دەکەی؟ من بەپاتشایەکەی ئێوەم گوت لە بریێتی ئەم شەش لاوە من هەژدە لاو لە کوڕانی خۆمان دەدەم. ئەمە شوورەییە بۆ خێڵی بارزان شەش لاو بگرێ و بەدەستی ئێوەی بداتەوە.

بۆ بەدەستەوەدانی ئێمە، لە رێگەی «عەقید بێگلەری»ی سەرکردەی ئەو هێزەی بریاربوو لەبەرامبەر بارزانییەکاندا بکەوێتە شەڕ، دەست بەکار کرا. من عەقید بێگلەریم پێشتر دەناسی، لەو کاتەوەی ئەو سەرکردەی سوپای ٨ی خۆراسان بوو. ئەویش منی دەناسی و دەیویست سوود لەم ناسینە وەربگرێ. ئەو کاتە تەلەفۆنێکی مەیدانی لەنێوانی نەغەدە و شنۆدا هەبوو. ئەم تەلەفۆنە لەبن دەستی شێخ سلێمان - برازای شێخ ئەحمەددا بوو. شێخ سلێمان لە راستیدا بەوەزیری دەرەوەی شێخ ئەحمەد حسێب دەکرا. فارسیی باش دەزانی و پیاوێکی ژیر بوو. رۆژێکیان بەدوایدا ناردم گوتی عەقید بێگلەری دەیەوێ قسەت لەگەڵدا بکات. لەو وتووێژە تەلەفۆنییەدا عەقید بێگلەری پاش وەبیرهێنانەوەی دۆستایەتیی کۆن، داوای کرد خۆمان بەدەستەوە بدەین. بەڵێنی بەرەڵلاکردنی پێمان دەدا و دڵنیای دەکردین هاوکاریمان دەکا و، شەرەفی خۆی دەخستە پێناوی بەجێ گەیاندنی ئەو بەڵێنانەوە. لەهەمان کاتدا، هەڕەشەشی کرد ئەگەرێو سوود لە هەل وەرنەگرین ئیتر درەنگ دادێت، بەڵام من بەناوەی ئەوەی ناتوانین بۆ پاراستنی گیانمان پشت بەبەڵێنە کەسییەکانی ئەو ببەستین داوای لێبووردنم لە تکا یەک لەسەر یەکەکانی ئەو کرد و گوتم:

- ئێمە بەرگری لە گیانی خۆمان دەکەین و دوو دانە تۆپمان لەبەردەستدایە، دڵنیابن پەنجەمان لەسەر پەلەپیتکە نالەرزێ.

ئەو کاتە ٢١ی رەشەمێ بوو و تەنیا سێ ڕۆژی مابوو بۆ هێرشی هەموولایەی سوپا.

هەروەکو گوتم هەردوولا - سوپا و بارزانییەکان - خۆیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە ساز دەکرد. دەوڵەت هەندێ لە خێڵە میریخوازەکانی چەکدار دەکرد. گرینگترینی ئەو خێڵانە مامەش و مەنگوڕ بوون کە سەرۆکەکانیان پارەیان لە میری وەردەگرت و لە پێکدادانەدا پتر لایەنی میرییان دەگرت. زێدەباری ئەمە، بەشی جۆربەجۆری سوپایان لە خاڵەکانی تری ئازربایجانەوە دەهێنا و لە دەوروپشتی شوێنی جێگیربوونی بارزانییەکانیان دەگیرساندنەوە.

لە هەمبەردا، بارزانییەکانیش سەرقاڵی سەنگەرگری بوون بۆ ئەوەی جگە لە بەرگریکردن لەخۆ، سوودیش لە هەل وەربگرن هەتا ئەو دەمەی هەوا خۆش دەبێ و لە ئێران دەچنە دەرەوە. یەکەمین زەبری بارزانییەکان ئەو چاوشکاندنە بوو بۆ خێڵی مامەش و مەنگوڕیان کرد. هەواڵ گەیشتە بارزانییەکان وا ئاغاگەل (خانان)ی مامەش و مەنگوڕ لە گوندێک بەناوی «سۆفیان» کە مەڵبەندی ناوچەی «لاجان»ە کۆبوونەتەوە بۆ ئەوەی لە دژی بارزانییەکاندا هاوسوێند بن. مەلا مستەفا چەند تفەنگدارێکی برد و کەوتە ڕێ. بۆ سبەینێ هەواڵ هاتەوە کەوا مەلا مستەفا لە ناکاو چووەتە ناو جڤاتی ئەوان لە سۆفیان و بەچەکی تەماتیک هەموویانی هەلا بەهەلا کردووە، دوو کەسیشی بەدیل گرتووە و بڕێکیش چەکی ئەوانی گرتووەوە و هێناونی بۆ شنۆ[11]. وێڕای ئەمە، مەلا مستەفا بەناو خێڵی هەرکیدا چووەتە ئەو ناوانە و لەگەڵ سەرۆکانی خێڵدا وتووێژی کردووە و قسەی لێ وەرگرتوون کەوا لە بەرامبەری ئەودا شەڕ نەکەن. هەروەها بڕێکیش پێ بژێوی لە شنۆدا کۆکردووەتەوە بۆ ئەوەی لە کاتی شەڕدا برسی نەمێنن. پێویستە بزانرێ کورد بەگشتی حەزیان نەدەکرد بکەونە شەڕی بارزانییەکان لەبەرئەوەی بارزانییەکان پیاوی ئازا

(١١) نووسەری بەڕێز بەهەڵەدا چووە و ئەم ڕووداوە هەر ڕووداوەکەی گوندی «سێلوێ»یە کە لە پێشەکیی ئەم کتێبەدا ئاماژەمان پێی داوە و بەپێویستی نازانین جارێکی تر دووبارەی بکەینەوە، بەڵام پێویستە ئەوە بڵێین کە بارزانیی نەمر لەو ڕووداوەدا بەشدار نەبووە، بەپێچەوانەوە خوالێخۆشبوو شێخ ئەحمەدی بارزان بەڕووداوەکە زۆر ناڕەحەت بووە. خوێنەری بەڕێز بۆ وەرگرتنی زانیاریی تەواو دەتوانێ سەیری هەمان کتێبی بەڕێز مەسعود بارزانی لەبارەی شۆڕشی بارزان «١٩٤٥ - ١٩٥٨» «لاپەڕە: ٥٦» بکات کە لەم بارەیەوە وردترین و بڕوا پێکراوترین سەرچاوەیە. هەروەها کتێبی «کۆماری کوردی سالّی ١٩٤٦»ی ولیەم ئیگلتن، لاپەڕە: ١١٩ - ١٢٠ کە ئەویش سەرچاوەیەکی زۆر گرینگە و لە ساڵی ١٩٦٣دا چاپ بووە - وەرگێڕ.

و شەڕوان بوون.

دووەم خێڵانی کورد وەک نەریت لە نێوانی خۆیاندا هەستیان بەبەندیوارییەکی دەروونی دەکرد و ئامادە نەبوون لە بەرامبەری یەکتردا شەڕێکی بەڕاستی بکەن. بەجۆرێ تەنانەت لە دەمی شەڕیشدا ئەو کوردانەی لەلایەن سوپاوە لەهەمبەر بارزانییەکاندا ساز درابوون پێشتر پێوەندییان بە«مەلا مستەفا»وە دەکرد، کات و شوێنی هێرشیان پێ رادەگەیاند، پاشانیش شەڕێکی بەدرۆیان دەکرد و هەڵدەهاتن.

رێکخستنی بەڕێوەبەرایەتیی خێڵ بەپێی زنجیرەی شێخان بوو، رێکخستنێک بەگوێرەی سوپایی یان حزبایەتی لەگۆڕێدا نەبوو. لە سەرۆکایەتیی خێڵدا شێخ ئەحمەد هەبوو. پاشان برایانی ئەو هەبوون هەر یەکە و بەرپرسی بەشێکی بەرە بوو. پاشی ئەوان کوڕانی ئەم شێخانە هەبوون سەرۆکایەتیی بەشە بچووکترەکانیان دەکرد. پاشی کوڕانی شێخیش هەندێک لە خزم و کەسانی نێزیکی ئەوان هەبوون، ئەمانە لێوەشاوەییی خۆیان لە شەڕاندا پێشان دابوو و، بەرپرسیارەتییە بچووکەکانیان هەبوو.

بیست و چواری رەشەمێ بوو ئێمە وەک نەریت، سەعات پێنج یان شەشی سبەینێ بەئاگا هاتین و چووینە لێواری رووباری شنۆ و سەرگەرمی مەشقی بەیانیە بووین ئەو کاتەی دەنگی تۆپ بەرز بووەوە. دوو سێ کیلۆمەتر دوور لە شنۆ لە لێواری چۆمی گادەردا گوندێک بەناوی «سینگان»ەوە هەبوو بارزانییەکان تەماتیکێک و حەوت هەشت تفەنگ هاوێژیان لەوێ دامەزراندبوو. سوپا لەوبەری چۆمی گادەر و بارزانییەکانیش لەم بەرەوە بوون. سوپا کتوپڕ ئاگری بەرەو رووی سینگان کردەوە. لەبەرئەوەی گوندی سینگان لەسەر بەرزاییەک هەڵکەوتبوو و دەیڕوانییە سەر شنۆ. ئەگەر سوپا ئەو شوێنەی بگرتایە ئەوا کەوتنی شنۆ نێزیکەپەرێز دەبوو. ئەوانەی بۆ گرتنی سینگان راسپاردرابوون برێتی بوون لە سوارانی خێڵی مامەش و مەنگوڕ کە ملازم سێیەمێکی سوپا رێنوێنیی دەکردن.

بەبیستنی دەنگی تۆپ ئاگەدار بووین کە رووداوی چاوەڕوانکراو دەستی پێ کرد. سوپا بیانووەکی بۆ پەلاماردانی بارزانییەکان نەبوو، لەبەرئەوەی بارزانییەکان نیازیان نەبوو بەرگری لە ئاخێک بکەن کە هیی خۆیان نەبوو، بگرە تەنیا چاوەڕوانی بەسەرچوونی سەرماوسۆڵەی زستان بوون هەتا پەنا ببەنە بەر شوێنێک. سوپاش ئەمەی دەزانی بەڵام هێشتاش هێرشی سوپا بۆ سەر بارزانییەکان گەلێک چاوەڕوان نەکراو نەبوو.

من بێ وچان ئەو چەند مرۆڤە کوردەی لە خزمەت تۆپەکاندا بوون، کۆم کردنەوە و

تۆپەکانم بەگەڕ خست و چوومە لای شێخ ئەحمەد. بەبۆنەی ئەو پێوەندییەی شێخ ئەحمەد لەگەڵ ئێمەدا پەیای کردبوو، دەمتوانی هەر کاتێکی بمەوێ بچم بۆ ماڵەکەی. بینیم لە دانگەی ماڵدا پەشێواوە، شێخ سلێمانی بۆ بەرگری لە سینگان ناردبوو و بەمنیشی گوت هەتا بەفریای ئەوەوە بچم. ئەو کاتە مەلا مستەفا لە مەرگەوەڕ بوو، سوپا لەلای ورمێشەوە بەرەو مەرگەوەڕ هێرشی کردبوو.

من تۆپەکەم بردە سینگان و خۆم ئامادەی تۆپباران کرد. یەکەمین شت بەخەیاڵمدا هات ئەوەبوو تۆپی بەرەکەی تر کپ بکەم. لەبەرئەوەی تۆپباران بۆ ئەوانەی نەیانبینیوە شتێکی بەمەترسییە. تۆپبارانی سوپاش پەشێوییەکی گەورەی لەناو دانیشتواندا بڵاو کردبووەوە. ئەو دەمەی گەیشتمە سینگان سوارانی مەنگوڕ و مامەش لە ملەی چیایەکەی بەرامبەرەوە سەرەولێژ دەبوونەوە و بەچوارناڵە بەرەو ڕووباری گادەر ملیان دەنا. لەگەڵ یەکەمین گوللەتۆپی ئێمەدا، تۆپی سوپا کپ بوو. وەک دەرکەوت ترس و لەرزەی سەربازان بووبووە هۆی بێدەنگ بوونی تۆپەکە. پاشان ڕووم بۆ سوارەکان وەرگێڕا. ئەوان هێشتا لە داوێنی چیا پەرژ و بڵاو و دوور بوون. چاوەڕوان بووم هەتا لە هەلی گونجاودا تۆپی دووەمم بووەشێنم. دەبوو لێدانەکە زۆر بەکار بێ بۆ ئەوەی زووتر شەڕ ببڕێتەوە و زیانی گیانی زۆر نەبێ. مەبەست تەنیا برێتی بوو لە ترساندن و ڕەواندنەوەی ئەوان. چۆمی گادەر تژیی ئاو بوو. چاوەڕوان بووم هەتا ئەوەی هێرشبەرەکان لە ڕۆخی چۆم کۆبن. دەمزانی بۆ پەڕینەوە لە ئاو بەردەوام خۆیان بەدرەنگ دەخەن و بەلەرزە لەرز و دوودڵی دێنە ناو ئاو، لەئەنجامدا سوار هەموو کۆ دەبن و تێک دەسووڕێن. هەر ئاوهاش بوو. ئەو دەمەی سوارەکان لە لێواری چۆمەکە کۆوەبوون، گوولەیەکی ڕووناکیدەرم بەسەریاندا هاوێشت، نەمدەویست کەس بکوژرێ. هەر ئەو گوللەیە و زایەڵە برووسک ئاسایەکەی بوو بەمایەی ئەوەی کەسێک لە مامەش و مەنگوڕ لەو ناوەدا نەمێنێ. بەپەشێواوییەوە سەری ئەسپەکانیان وەرسووڕاند و پێیان پێوەنا. ئیتر چڕ و چارەی خێڵی مامەش و مەنگوڕ نەک هەر ئەو کاتە بگرە لە هیچ شەڕێکی تردا شوێنەواری لێ بەدەر نەکەتەوە. من یەک لە دوای یەک گوللەم پێوە دەنان و پتر هانم دەدان رابکەن. ئیتر بەو شێوەیە شەڕ هەر لە سەرەتا خۆیدا لەو ناوچەیە بەکۆتا گەیشت و سەعات نۆی سبەینە بوو هەموو شت بڕایەوە.

دەست پێ کردنی شەڕ وڕەیەکی لە ئێمەدا هێنایە کایە، لەبەرئەوەی لە چەند مانگی بێکاریدا تەمەڵ و بێ هێز بووبووین و وامان هزر دەکرد چارەنووسی ئێمە لەشەڕدا ڕوون

دەبێتەوە: یان دەکوژرێین، یان رزگار دەبین و یانیش... هەرچۆن بێ چیی زووتر بێ چاترە.

پاش ئەم هیوابڕانە، سەرگەلەدارانی سوپا لە گوندێک بەناوی «نەڵۆس» گیرسانەوە. ئێمە بیرمان دەکردەوە هێرشێک بۆ سەر ئەو خاڵە بکەین، لەوێ هێزێکی بیست کەسی لە بارزانییەکان لە هەمبەری سوپادا شەڕی دەکرد. من بەشەو تۆپەکەم بردە شوێنێک کە بەسەر «نەڵۆس»یدا دەڕوانی، دێیەکی بچووک بوو بەناوی «گندۆڵە» و بەهیوای هەل چاوەڕوان بووم.

ئەو فەوجەی سینگانی خستبووە بەر ئاگری تۆپخانە و نیازی بوو لە دووای سوارانەوە بەرەو پێش مل بنێ، پاش هەڵێ هاتی سوارانی مامەش و مەنگوڕ، بەپەشێواوییەوە نەڵۆسی بەجێ هێشت و، لەو گردۆڵکەیەی کەوتبووە پشتی نەڵۆسەوە و بەسەر دەشتی شنۆیدا دەڕوانی، گیرسایەوە. بەڵام بەو کارە خۆی لە مەڵبەندی پێ بژیوی و ئاو بێ بەش کرد. رائید کلاشی، سەرکردەی فەوجی ناوبراو، لەسەر بانی گرۆڵکەکەدا چوارگۆشەیەک دەکێشێ و سەربازان ناچار دەکات رووی ئەم چوار گۆشەیە بکۆڵن و بیکەن بەسەنگەر، بنکەی تۆپەکەش لە ناوەندی ئەو چوار گۆشەیە دادەمەزرێنێ. رۆژی پاشتر، هەوا تیشکن و رووی زەویش هەتا رادەیەک هیشک بوو. بەڵام ئەو خۆڵەی لە هەڵکەندنی سەنگەرەکە وەرگەڕابوو هێشتا شێدار بوو و لە دوورەوە رەش دەچووەوە. ئیتر بەو ئاوایە بووبوو بەئامانجێکی دیار و بەرچاو کە لە وچانی ٩ کیلۆمەتر دووری شوێنی گردۆلکەکەی ئێمەوە بەچاکی دەبینرا. ئەو فەوجە نێزیکەی سێسەت سەرباز، برێکی گەورە هەسپ و هێستر، دوو تۆپ، چوار برێنی گران، شەش هاوەنهاوێژ و برێکیش خواردنی هەبوو و، هەر هەموویانی لەسەر ئەو گردۆلکەیە و لەناو ئەو چوارچێوەیەدا کۆکردبووەوە. پاش ئەوەی ئەم فەوجەمان بەدیل کرد و ئەرشیڤەکەیمان کەوتە بەردەست، پەشێواوی و ترس و لەرزەی ئەوان لە راپۆرتەکانیان دیار بوو. ئەوان بەچۆڵکردنی نەڵۆس خۆیان لە توانای نێزیکەپەرێز بەتایبەتیش ئاو بێبەش کردبوو. بیست و چوار سەعات بوو بێ ئاو بوون. هەرچەندە چۆمی گادەر لەبەر پێیاندا هاژەی دەهات، زاتیان نەدەکرد خۆیان بگەیننە لێوی ئەو چۆمە.

ئەوان هەر ئەو کاتەی نەڵۆس چۆڵ دەکەن، بیست مرۆڤە بارزانییەکە بەبێ شەڕ نەڵۆس دەگرن. بارزانییەکان بەرووبەری ئەو بانانەی دەوروبەر کە دەیانڕوانییە سەر سەنگەری فەوجەکە بڵاو دەبنەوە و ناوبەناوێ گوللەیەک دەگرنە رووکاری فەوجەکە. فەوجیش گێژ و وێژ وا خەیاڵ دەکات لە هەر چوار لاوە گەمارۆ دراون، هەتا ئەوەی ناوێرن بەلای بەرەی

سۆفیـانیـشـەوە کـە بنکەی پشـتـەوانـی و ناوپشـتـەی هێـزی سـوپا بوو رایەڵە بکەن. لە کاتێکدا کە رێگەی پشتەوەیان سەرتاسەر ئازاد و تەنانەت رێگەی ئۆتۆمۆبێلیش بوو.

هەرچۆن بێ، کـۆوەبوونی فـەوج لەبەرپاڵی ئەو گـردۆڵکەیەدا سـەرنجی منی بۆ خـۆی بەکـێش کـرد. بەهۆی مـەودای تۆپەکـانەوە، بۆ ئەوەی دەسـەڵاتم چاکـتـر بەسـەریدا بشکێ بڕیارم دا خـۆم بگەینمـە نێـزیکـتـرین خالێـک کە بۆم بلوێ. بۆ ئەم کـارە دەبوو لە ناوەندی دەشتایی و لەبەر چاوی زاڵی ئەوانەوە تۆپەکان بەرەوپێش ببەم. ئەم خۆنوێنییە لەسەرینیی پەرت و بڵاویی سـەربازەکـان و پەشێـواویی فـەوجـەکـەوە لە تـوانادا هەبوو. تۆپەکـەم لە لاچەپی گـردۆڵکەیەکی بنەپاڵـی ئەوان دامــەزراند. دووەمین گـوللەمـان یەکـراست بەر تۆپەکـانی فـەوج، واتە جـەرگـەی چوارگـۆشـەکە کـەوت و هەر بەم گـوللەیە فـەوج ون بوو و شـوێنەوارێـکی لێ بەدەر نەکـەوت. بەدووربین سـەرنجم دەدا گـەلـەی مـرۆڤ و گـیـانلەبەر لەیەکـتـر دابڕاون، هەر یەکە و ملی لەلایەک ناوە و را دەکات. بەڵام من بۆ پێشگـێری لە هەڵاتنی ئەوان، بەردەوام گـوللەم دەهاوێشـتـە بەرپێـیـان و ناچارم دەکـردن دیسـان بەرەو جـەرگـەی چوارگـۆشـەکـە وەرسـووڕێنەوە. پاشـان یەکـێک لە هاوەڵەکـانمان، مـەحـمـوود تەوەکـولی، تەبای دە مرۆڤ خـۆی گـەیاندە ئەو بەرپاڵە و سـەرلەبەر فـەوجـەکـەی بێ ئەوەی یەک مرۆڤ چییە هەڵبێ، گرت و بەشێوەیەکی سەربازییانە بەرەو شنۆی دانەپێش.

زیانی گـیـانیی ئەوان زۆر نەبوو لەبەرئەوەی ئێـمـەش هەوڵـمان دەدا بەپێی توانا، کـەس نەکـوژرێ. بەڵام لەگـەڵ یەکـەمین تـەقـەدا رائـید کـلاشی بەخـەسـتی بریندار بووبوو و خـۆی کـوشـتـبـوو. پاشـان لە دەمی لە دادگـەدانی مندا یەکـێک لە گـوناحـەکـانم کـوشـتـنی خوالێخـۆشبوو کلاشی بوو. هەرچەندە لەشەڕدا نەئەوەی دەکوژێ بکوژە و نەئەوەی دەکوژرێ کوژراو.

لەم شەڕەدا وێڕای چەکەکانی فەوج، ژمارەی حەوت ئەفسەر، حەڤدە عەریف و نێزیکەی سێسەت سەرباز بەدیلی گیران.

پاش ئەو تۆپ بارانە ناوی مـن زۆر دەنگی دایەوە و ئەگەر ئەو پێکدادانە چەند ساڵێک درێژەی بکێـشـایە ئەوا دوور نەبوو ببم بەسـەرۆکی خێـلـێـک لە کـوردسـتـان. بارزانیـیـەکـان دەیانگوت:

- سـوڵـتـان تەفـرشیـان لەلایەن شێـخی بارزانەوە بۆ ئێـمـە رەوانە کـراوە، ئەمـە پەرجـووی شێخی بارزانە بەیەک گوللە، تۆپی دوژمنی تەقاندەوە و لە کاری خست.

بەرە بەرە ئەو بۆچوونەیان لەلا دروست بوو کەوا لە هەر جێیەک بکەونە تەنگژەوە، هێندە بەسە پێی من بگاتە ئەو شوێنە. ئەوان وزە و توانای تۆپیان نەزانیبوو. سەرنج ڕاکێش ئەوەبوو ناوی من گرێی ئەو پرسانەشی دەکردەوە کە دەهاتنە پێش. بۆ نموونە ئەو دەمەی برسی دەبوون و دەچوونە گوندێک هەر چییان بویستایە بەناوی «ئەفسەری تۆپ»ەوە وەریان دەگرت.

- ئەفسەری تۆپ نانی دەوێ، هێلکەی مریشکی دەوێ یان مریشکی دەوێ... هەرچۆن بێ ئەفسەری تۆپ بووبوو بەسیمبۆلی هێز. پاش ئەمە بارزانییەکان بەرێز و ڕووەتێکی لە دڵەوە بۆم دەهاتنە پێش و چاکترین خواردن یان نوێنی نووستنیان پێشکێشی من دەکرد و بچوومایەتە هەر شوێنێ لە خۆوە دە پازدە مرۆڤی بارزانی لەگەڵم دەکەوتن و پاسەوانەتییان دەکردم.

ئەو سەرکەوتنە لە هەمان کاتدا بارزانییەکانی خستبووە شنە و بەردەوام بۆ گرتنی ئەم دێ یان ناوچە و سەنگەرە منیان دەبردە بەرەی جیاجیا. هەرچەندە گرتن وپاراستنی ئەو شوێنانە تەواو بێ سوود و مایەی بەڵا بوو، بەڵام بڕوا پێ هێنانی ئەوانیش تەواو دوورەپەرێز بوو. من هەوڵم دەدا ئەوان بەتایبەتی شێخانی بارزان تێ بگەینم کەوا پێویستە ئێمە تەنیا بەرگری بکەین و خۆمان لە پێکدادانی بێ واتا و، بڵاوە پێکردنی پیاوەکانمان بەدوور بگرین. دەبوو ئێمە هەتا کاتی گونجاو بەرگری لە خۆمان بکەین و پاشان پێداپێدا بەرەو عێراق پاشەکشێ بکەین. ئامانجی ئەوان عێراق بوو.

جارێکیان هەوڵێکی بێ سوودمان بۆ گرتنی گوندی سۆفیان - بنکەی پشتەوانی و هێزی گرینگی سوپا، بەکار هێنا کە بێگومان بەفیڕۆ چوو. بەڵام بۆ من سوودێکی هەبوو. هەتا ئەو ڕۆژە گوللەی تۆپ لەسەر سەرم نەتەقیبووەوە و، بێ پێوەنان لێی دەترسام. بەڵام لەوە بەدواوە ترسم لێی شکا. لەو شەڕەدا من سەنگەرێکی پارێزراوم هەبوو و بەتۆپباران پشتیوانیم لە هێرشی خۆمان دەکرد بەڵام سەنگەرەکەمان ئاشکرا بوو، ئیتر بێ وچان تۆپبارانی بەرامبەر دەستی پێ کرد. هاشەی گوللەتۆپ، دەنگێکی تیژ و مەترسیداری هەیە و مرۆڤ پێی وایە هەر گوللەتۆپێک لەناو سەری ئەودا دەتەقێتەوە، لە کاتێکدا پاشان دەرکەوت لە دوو سەت مەتر دووری مرۆڤ دەتەقێتەوە. ئیتر بەو شێوەیە سەرەتا زۆر ترسام، پاش تەقینەوەی چەند گوللەیەک خووم بەدەنگ و ترسەکەوە گرت بەجۆرێ بەبێ ترس لە سەنگەر دەرکەوتم و تۆپ و پیاوەکانی خۆم بردە شوێنێکی هێمن. بەوردی، ڕۆژی یەکەمی ئاخەلێوە، جێژنی نەورۆزی ١٣٢٦، لەو سەنگەرەدا بووم و بەئاگری تۆپ

جێژنمان کرد.

هەرچۆن بێ، لەبەرئەوەی بەبۆچوونی من پاراستنی ناوچەکە کارێکی نابەجێ بوو، تۆپەکانم بەرووکاری شنۆدا بەرێ خست و لەگەڵ شێخ سلێماندا راوێژم کرد کەوا هەر بەیەکجاری ئەو ناوچەیە بەجێ بێڵین. لەبەرئەوەی ئاخەلێوە داهاتبوو، بەفر پێداپێدا دەتاوایەوە و چەندی زیاتر لەو ناوچەیە بمایەین زیانی گیانیی پترمان پێ دەگەیشت. ئەو، بۆچوونەکەی منی بەپەسند زانی بەڵام نەشیدەوێرا بەشێخ ئەحمەد بڵێ، داوای لێ کردم خۆم بچم بۆ «گێلاس» - کە ناوچەیەکی ئاسێ بوو و شوێنی دانیشتنی شێخ ئەحمەد بوو، بۆ ئەوەی وا بکەم بۆچوونەکە پەسند بکات.

پێشتر لەبارەی دیلەکانەوە ئاخاوتم. دیلەکان وەک لە پێشەوە گوتم، مەحموود تەوەکولی بۆ شنۆی بردن و لە مزگەوتێک دایانان. بۆ بەیانی چوومە شنۆ بۆ ئەوەی بیانبینم. ئەفسەرە دیلەکانیش جلی سەربازییان لەبەر کردبوو بۆ ئەوەی نەناسرێنەوە. لەناو دیلەکاندا رەنگ و رووێکی ناسم کەوتە بەرچاو. ئەوە ملازم یەکەم کەمالی بوو کە لە کۆلێجی سەربازی دەمناسی. ساڵی یەکەم لەگەڵ مندا بوو. کاتێ بەناوی خۆیەوە گازم کرد سەرەتا راچڵەکی و پاشان هاتە پێش و بەرێزەوە ماچی کردم. گلەییم لێ کرد بۆچی جلی سەربازیی لەبەر خۆی کردووە، گوتی لە ترسی کوردان. من دڵیم دایەوە و دڵنیام کرد کورد چ پێوەندییەکیان بەدیلانەوە نییە و، پرسیاری ئەفسەرەکانی ترم کرد. ئەوانیتریش خۆیان پێناسە دا، لەناویاندا ئەفسەرێک هەبوو بەم جۆرە خۆی دایە ناسین:

- خزمەتکارت خوا دۆست!

پێکەنیم و لە پلەی ئەوم پرسی. گوتی:

- قوربان پلە گرینگ نییە، لە سوپادا «نەقیب»یان پێ دەگوتم بەڵام من دوکتۆرم، بۆ ئێمە حەز و ناحەز جیاواز نییە، خزمەتکارت تەنیا دوکتۆرە.

گوتم:

- توخوا هێندە مەڵێ خزمەتکار و قوربان. رووداوێکە رووی داوە و بەم زوانە دەچنەوە سەر ماڵ و ژیانی خۆتان.

گوتی:

- خۆت دەزانی هەموو ئەم بەزمە بۆ نانە. ئێمەش بۆ ئەوەی کارێک بکەین چووین

بووین بەئەفسەر هەتا نانێک بخۆین. ئەم زستانە لە خوام دەویست لە ژێر کورسیدا بم(۱۱). ئێمە چیمان بەشەڕەوە هەیە.

لەبارەی جێگەی خواردنیانەوە گازنیان کرد، پێم گوتن بارزانییەکان خۆیشیان خواردنیان تەواو نییە. من خۆم چەندان شەو بەکەمۆکەیەک نان یان گەنمی برژاو دەیبەمە سەر، هەندێک شەو ئەوەیشم بەدەست ناکەوێ. هەمان شەو ئەفسەرەکانم جیا کردەوە و لەگەڵ خۆمدا بردمن، بەیانی لەگەڵ شێخ ئەحمەد ئاخاوتم کەوا عەریف و سەربازەکان بەڕێ بکەین. بۆیم روون کردەوە سوپا هێندە لاواز نییە لە رووی مرۆگەلەوە لە تەنگژەدا بێ و دیسانەوە ئەمانە بنێرێتەوە شەڕ. دووەم ئەمانە هێندە ترساون جارێکی تر بەکەڵکی شەڕ نایەنەوە. زێدەباری ئەمە، ئێمە نان و ئاومان نییە پێیان بدەین. دوواجار شێخ رازی بوو، ئەوانمان بەیەکێک لە هاوەڵانمان «جەواد ئەرتەشیار» راسپارد بۆ ئەوەی بیانباتە نێزیکی بەرەی سوپا و لەوێ بەرەڵڵایان بکات.

ئیتر بەم جۆرە تەنێ ئەفسەران مانەوە کە تەبای ئێمە و شان بەشانمان دەژیان. بەڵام ئەوان بەتایبەتیش هەمان نەقیب خوادۆست وەرەی بەتەواوی بەزیبوو. بۆ نموونە ئەو دەمەی شنۆمان بەجێ هێلا و پاشەکشێمان کرد، ئەم ئەفسەرانەش لەگەڵ ئێمەدا بوون. لە رێگە یەکێک لە باڵەفڕەکانی سوپا لەسەر سەرمان پەیابوو، نەقیب خوادۆست هاتە لامەوە گوتی توخوا بەم کوردانە بڵێ با تفەنگەکانیان سەرەوژێر بکەن نەوەکا بریسکەی سەرە نێزەکانیان سەرنجی باڵەفڕە بەکێش بکات و تۆپباران بکرێین. دەیگوت:

– ئێوە لە رووی ویژدانەوە بەرپرسی پاراستنی ئێمەن و دەبێ چاوتان لێمان بێ نەوەکا لە خۆڕایی بکوژرێین.

خراپ نییە بزانن کەوا پاشان لەکاتی لەدادگەداندا هەر ئەم «خزمەتکار»ە تاکە ئەفسەرێک بوو دژی ئێمە قسەی دەکرد و گەلێک ئەفسانەی لەبارەی تاوانەکانی ئێمەوە دەخستە بەردەمی دادگە. لە کاتێکدا عەقید بێگلەریی سەرکردەی کاروان کە ئەو کاتە بووبوو بەعەمید، لە دادگەدا گوتی:

– من خۆم ئەم بەرێزانەم لە ناوچەکەدا نەبینیوە بەڵام وا باوبوو لەناو بارزانییەکاندان و

(۱۱) لە ئێران باوە زستانان چرایەک لە ژێر مێزێکدا پێ دەکەن و پارچەیەک بەسەر مێزەکەدا دەدەن بۆ ئەوەی گەرماییەکەی نەچێتە دەرەوە، ئینجا لە دەوری مێزەکە دادەنیشن و پێیان درێژ دەکەنەوە ژێری – وەرگێڕ.

له دژی سوپادا شەڕ دەکەن. بەهەر جۆر، ئەوە ئەگەر راستیش بێ ئەمانە هێشتا زۆر لاون.

هەرچۆن بێ ئەو دەمەی گەیشتمە گێلاس مەلا مستەفا و «شێخ تەها»ی سەرۆک خێڵی هەرکیش لەوێ بوون. لە کۆبوونەوەیەکدا بەئامادەبوونی شێخ ئەحمەد گوتم لەبەرئەوەی ئێمە بەرگری لە ناوچەیەکی تایبەت ناکەین بگرە تەنیا بەرگری لە گیانی خۆمان دەکەین، چاترە لە شنۆوە بەرەو شوێنێکی هێمنتر پاشەکشە بکەین. سەرەڕای ئەمە باسی ئەو پرسەشم کرد کە پیاوانی خێڵی بارزان ئیتر وەک ڕۆژانی سەرەتا بەچاکی شەڕ ناکەن لەبەرئەوەی هیچ بیانووەک بۆ شەڕ و بەرگری لە ناوچەیەکی دیاریکراو نادۆزن. ئەوان بەرگری لە ئافرەت و منداڵ و ماڵاتیان دەکەن کە دەتوانن هەموو دەم لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تریان گوازنەوە.

بۆچوونەکەی منیان پەسند کرد و بەپێی سەرنجی مەلا مستەفا بڕیار درا تۆپەکان بگوازمەوە بەرەی مەرگەوەڕ. ئەو دوو گالیسکە تۆپەی بووبوون بەدەسکەوتمان تێکمان دان و هەموو بارزانییەکان لە شنۆ کشانە دواوە. ڕۆژی پاش ئەم چۆڵکردنە سوپا شنۆی گرت.

هەتا ئەو ڕۆژە بارزانییەکان پلان و ئامانجێکی بەرچاویان نەبوو بەڵام لەمە بەدواوە پرۆگرام ڕۆن بووەوە. بەشەڕ و پاشەکشێ و پاراستنی پاشکۆ، تەبای خێڵ بەرەو سنووری عێراق کشاینەوە. منیش لەگەڵ سەرجەم شەڕوانانی بارزانیدا لە مەرگەوەڕ پلانی شەڕ و دەربازبوونمان دانا کە پاسەوانی لە خێڵ بکەین هەتا ئەوەی خۆی دەگەیەنێتە سنوور. بەم شێوەیە باری رووبەڕووبوونەوە بەتەواوی بەجێ هێڵرا و شەڕ شێوەی سوود لەهەل وەرگریی گرتە خۆی. ئەم شەڕ و دەربازبوونە لە گەلێک لاوە سەرنج راکێش بوو.

شەوێکیان لە مەرگەوەڕی سەر چیای شێرکان کە جێ نشینگەی مەلا مستەفا بوو، پاش ئاگەداربوون لە پلانی بارزانییەکان، لەگەڵ مەلا مستەفا دانیشتبووین و لە نەخشەی کردەوەی بەیانیمان دەکۆڵییەوە. وتووێژمان هەتا سەعات چواری پاشنیوەشەو درێژەی کێشا. نێزیکەی دەمەو بەیان رەشاییەک لە دوورەوە دەرکەوت دوور بەدوور دیاربوو یەکێکە لە پیاوانی خێڵی هەرکی. هەواڵی هێنا ئێمە سەت سوارین و بڕیارە سبەینێ زوو لە پاڵ سوپاوە پەلاماری ئێوە بدەین، بەڵام لەبەرئەوەی ئێمە نامانەوێ لە رووی برایانی کوردمان بووەستینەوە، ئێوە پاش سەعاتێکی تر چەند نارنجۆکێک باوێژنە ئەو دۆڵەی ئەم نێزیکە کە شوێنی مۆڵبوونی ئێمەیە، ئیتر ئێمە رادەکەین و ئێوەش لەگەڵ سوپادا چی دەکەن بیکەن.

ئەمــە دووەمین جــار بوو من بەچاوی خـۆم ئەم جـۆرە نواندنانە ببـینم. جـارێکی تـر لە ناوچەی شنۆ، من لە «قەڵاتان» لەلای محەمەد ئاغای مێرگەسۆری «یەکێک لە شێخانی بارزان» بووم، سوارێک هات قسەیەکی لەگەڵ محەمەد ئاغادا کرد و چوو. محەمەد ئاغا پێی گـوتم ئەم سـوارە لە فـلانە خێـڵە، دەڵێ ئێـمە شـێست مرۆڤین و وا لە فـیسـارە شـوێندایـن، دەیەوێ ئێـمـە دوو گـوللەتۆپ بەشـوێنەکـیـانەوە بنێین بۆ ئەوەی رابکەن. ئەویشیان هەر وابوو.

ئەگەر ئەم هەڵسوکەوتەی کوردان لەگەڵ ئەوانی لە پێشەوەدا گوتم کۆبکەینەوە، دەشێ لە ورەی کـوردان و لە رادەی ئالیکاریی ئەوان بـۆ سـوپا تێ بگەیشـتـرێ. مـن نێـزیکەی لە هەموو بەرەکانی ئەو سەردەمەدا بووم و، هێرشی یەکەمی خێڵی مامەش و مەنگوڕی بۆ سینگان لێ دەربچێ ئیتر هیچ دەمێ کوردانم بەشێوەیەکی پوخت لە شانەبەشانی سوپادا نەبینیوە. بێگومان پاش سەرکەوتنی سوپا گوێ بیست بووین گەلێک لە سەرۆک خێڵان وەک قارەمانی شەڕ خۆیان هەڵکێشاوە، تەنانەت پاشانیش گەلێک هەوڵیان داوە میری پەروەریی خۆیان ئیسپات بکەن، بەڵام لە راستیدا هەرنەبێ جەماوەری رەسەنی کورد، ئامادە نەبوون لەهەمبەر برا کوردەکانی خۆیاندا شەڕ بکەن.

هەرچۆن بێ سبەی شەو، سوپا زۆر بەرێکوپێکی هێرشی کرد. پێش هێرش، بەگوێرەی بڕیارەکەی شەو لەگەڵ تەقینەوەی چەند نارنجۆکێکدا سوارگەلی هەرکی بەرەیان بەجێ هێشت و بەریان بەدەشتەوە نا. بەڵام یەکەمین جار بوو سوپام دەبینی زۆر بەرێکوپێکی دەست بەهێرش بکات. سەرەتا بەڵەفڕ سەنگەرەکانی ئێمەی بۆمباباران کرد، پاشان تۆپخانە بەرەی کوتایەوە، دوای ئەمە تانکەکان کەوتنە رێ و بەدوای ئەوانیشدا هێزی پیادە. باڵەفڕەکانیش لە بەرزاییەکی زۆر کەمەوە پاسەوانەتیی ئەوانیان دەکرد. بەڵام شوێنەکەی ئێمە زۆر قایم بوو و تەواو بەسەر بەرەدا زاڵ بووین. بارزانییەکان لەم بەرەیە هەمووی بەسەر یەکەوە سی چل کەسێکیان هەبوو. بەگوێرەی بڕیاری شەو، تەنانەت پێش ئەوەی سوپا دەست بەهێرش بکات دەبوو ئێمە ئەو شوێنە چۆڵ بکەین و جێ ژوانمان کورد گوتەنی «شاخ»ەکەی پێشەوە بوو بۆ ئەوەی بۆ ماوەی بیست و چوار سەعاتی تر سوپا پەک بخەین بۆ ئەوەی خێڵ بتوانێ خۆی کۆبکاتەوە و بەرەو پاش بڕوات.

شەوی پاشتر کاتێ خۆم بەشاخەکەی پشتەوە گەیاند سەیرم کرد وا لە شوێنی پێشوو نێزیکەی سەت جۆخین ئاگر کراوەتەوە و پێم وابوو بەرەواژی بڕیاری پێشوو بارزانییەکان

هێشتا ئەو شوێنەیان بەجێ نەهێشتووە. بەڵام کاتێ مەلا مستەفان بینی و هۆیەکەم لێی پرسی، گوتی ئێمە ئەو شوێنەمان بەجێ هێشتووە و ئەو ئاگرانەشمان بۆ چەواشەکردنیانە. سوپاییەکان وا دەزانن لە دەوری هەر ئاگرێکدا بەلایەنی کەمەوە دە کەس کۆ بوونەتەوە و بەم پێیە حسێبی دەکەن ئێمە هەزار کەس وا لەو شوێنەداین. بەیانیش پاش سەرکەوتن زۆر بەسەر سڕمانەوە دەبینن تەنیا لەگەڵ سێبەرەکانی ئێمەدا شەڕیان کردووە.

ئەم تەکتیکە، شەڕ و دەرپەڕین، ئاگر هەڵکردن و هەڵاتن، بەهەمان شێوە درێژەی کێشا هەتا تێکڕای خێڵات و ماڵات، مەرگەوەڕیان چۆڵ کرد.

چوار ڕۆژ بوو لە مەرگەوەڕ بووم، شەوێکیان مەلا مستەفا منی برد بۆ دانیشتنێک تیایدا بەرپرسیاری تەواوی بەرەکان و لە ناویاندا شێخ محەمەد سدیق ئامادە بوو. پاش ئاڵوگۆڕی زانیاری و کۆڵینەوە لە هەلومەرجی بەرە و پیاوانی خێڵ، بڕیاردرا: (کەمترین ڕووبەڕووبوونەوە، کەمترین هاوێشتنی گوللە و زۆرترین پێ بڕیوی و... پاشەکشێ بەرەو گادەر). مەلا مستەفا پاشکۆپارێزی خێڵ بوو و ئێمەش لەگەڵ ئەودا بووین.

شتێکی سەرنج ڕاکێش من لەم پاشەکشێیەدا بینیم ڕادەی خۆڕاگریی بارزانییەکان بوو لە بەرامبەر سەختیدا. شەڕ لە ٢٦ی ڕەشەمێی ١٣٢٥دا دەستی پێ کرد و ئێستە ٢٠ی ئاخەلێوە بوو. ئێمە بەزنجیرە چیای زاگرۆسی هاوشانی سنووری عێراقدا هەڵگەڕاین، چەندی بەرزایی پتر تێ هەڵدەکشا، ئەستوورایی بەفر پتر دەبوو و لە هەندێک شوێناندا دەگەیشتە یەک مەتر. لە زۆربەی ئەو شوێنانەدا بەفر بەستبووی، هەوا بەڕادەیەک سارد بوو هەندێ لە ولاغەکانی ئێمە شەویان بەبەیانی نەدەگەیاند و لە سەرما ڕەق دەبوونەوە. بەڵام ئەم هەلومەرجە بۆ بارزانییەکان دەتگوت شتێکی ئاساییە. ئافرەت و منداڵ و ماڵاتیان لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی تر دەگواستەوە، چادریان هەڵدەدا، نانیان دەپژاند و پاش چەند ساتێک پشوودان دووبارە بەڕێ دەکەوتنەوە. ئەو هەلومەرجە بەئێمە بەرگەی نەدەگیرا.

ئەفسەرە دیلەکانیش بەڕاستیی بووبوون بەسەربار بۆ ئێمە. لەگەڵ مەلا مستەفا وتووێژم کرد و ڕازیبوونی ئەوم وەرگرت بۆ ئەوەی ئەفسەرە دیلەکان بەرەڵڵا بکەین. ئێمە خۆمان خواردنمان نەبوو بەڵام لە ڕووی ویژدانەوە ناچاربووین ئەوان لە خۆمان پتر چاوەدێری بکەین. پاشان لەگەڵ شێخ ئەحمەدیش ئاخاوتم، بەڕێکەوت سەیدێکی دانیشتووی «زێوە»ی مەڵبەندی مەرگەوەڕ لەلایەن سوپاوە بۆ دیمانەی شێخ ئەحمەد هاتبوو و لەوێ

بوو. بڕیار درا ئەفسەرە دیلەکان بەو بسپێرین هەتا لەگەڵ خۆیدا بیانباتەوە.

لەو ڕۆژانەدا، ئیتر سوپا دەستی نەدەگەیشتە بارزانییەکان، بەڵام باڵەفڕ زۆر ئازاری دەدان. سەرتاپێی ناوچە بەبەفر داپۆشرابوو، شوێنەواری ڕۆیشتنی خێڵ لەسەر بەفرەکە ڕەشاتییەکی بەجێ دەهێشت و ئەو هێڵە ڕەشە چاترین ڕێنوێنی باڵەفڕ بوو. ئەوان بەڕێنوێنیی ئەم هێڵە ڕەشەوە دەگەیشتنە مەکۆی خێڵ کە یان لەحەسانەوەدا بوو یان لە بزووتنەوەدا و، بێ دەسپاریزی دایاندەگرتە بەر لێزمەی مەترەلۆز. بەو ئاوایە ترس و لەرزەیەکی بێ ڕادەیان هێنابووە کایە، تفەنگدار و پاشکۆپاریزانی کاروان لەبەرئەوەی لە شوێنێکی هێمندا بوون چ زیانێکیان پێ نەدەگەیشت، بەڵام ئافرەت و منداڵ و مالات و گاو و گۆتاڵ زۆریان زیان پێ دەکەوت.

بارزانییەکان وەک نەریت بەگژ باڵەفڕەدا نەدەچوونەوە. ئەوان بەتاقیکردنەوە بۆیان دەرکەوتبوو کە تەقەکردن لە باڵەفڕ، ئەویش بەتفەنگ، جگە لە بەفیڕۆدانی گوللە چ بەرکەوتێکی تری نییە. هەر بەو هۆیەوە باڵەفڕ بووبوونە میرکوڕی ئاسمان و بێ ترس و لەرزە لە بەرزاییەکی کەمدا دەفڕین هەتا ئەوەی باڵەفڕوانان بەچاکی دەبینران. دواجار پاش کوشتاری یەک لە دوای یەک، ڕۆژێکیان شێخ ئەحمەد فەرمانی دا هەر لەگەڵ دەرکەوتنی باڵەفڕدا، تفەنگداران لە هەموو لایەکەوە تەقەی لێ بکەن. بەڕێکەوت، لە یەکەمین پەلاماردا یەکێک لە باڵەفڕان ئەنگاوترا و بەرەبەرە هەتا لێمان دوور کەوتەوە نزم و نزمتر بووەوە و لە نێوان سەرسڕمانی ئێمە و شاگەشکەبوونی بارزانییەکاندا لە ناوەندی دەشتی مەرگەوەڕدا کەوتەوە، ئاگری گرت و ئەو دوو سەر مرۆڤەی تیایدا بوون لەناو ئەو ئاگرەی هەر خۆیان هەڵیان گیرساندبوو بوون بەڕەژوو. لەوە بەدواوە ئیتر باڵەفڕ لە بەرزاییی زۆردا دەفڕین و، ئەو بۆمب و ڕستە گوللە شێست تیرانەی پێشیان بوو بەتاڵیان دەکرد و دەڕۆیشتنەوە.

ئەو ڕۆژەی بڕیار درا ئەفسەرە دیلەکان بەرەڵڵا بکرێن، شێخ ئەحمەد یەکێکیانی بەناوەی دەسبەسەر گێڕایەوە، ئەویش ملازم یەکەم جیهانبانی، کوڕی لیوا ئەمانوڵڵا جیهانبانی بوو. شێخ ئەحمەد پێی وابوو دەتوانێ بەهۆی ناوبانگ و بنەماڵەی ئەم ئەفسەرەوە سەرکردەی کاروانی ناردراو ناچار بکات دەست بپارێزێ. نامەیەکی بۆ سەرکردەی کاروانی ناردراو نووسی و هەڕەشەی لێ کرد ئەگەربێتو باڵەفڕ سەرلەنوێ ژن و منداڵمان بۆمبابارن بکەن ئەوا ئێمەش ئەم دەسبەسەرە دەکوژین. پێشبینیی من ئەمجارە ڕاست دەرنەچوو. من

دەمگوت ئەگەر بەرژەوەندیی ئەوان پێویست بکات هیچ بایەخێک بەگیانی ئەم ئەفسەرە نادەن، بەڵام وەک ئەوەی بایەخیان دابێ یاخۆ بەڕاستی لە ترسی تەقەکردن، ئیتر باڵەفڕ دەستیان لە بۆمباباران و کوتینەوەی کوێرانە هەڵگرت و، وەک دیاربوو بۆ سەرانسۆیی لە بەرزاییەکی زێدەدا دەفڕین.

ئەم بۆمبابارانە ئێمەشی گرتەوە، پرووشکی بۆمبایەک بەرانی یەکێک لە هەڤاڵانی ئێمە - عیزەت عەلی ئەسغەری، کەوت و برینداری کرد، پاشان بەتەواوی پەکی کەوت و دەبوو هەڵی بگرین. لە نێو ئەو بەفر و سەرماوسۆڵ و کێوەڵانە دژوارەدا هەڵگرتنی برینداریکی پەرێشان کارێکی کارەساتاوی بوو. دەردی ئەو بەجۆرێک گران بوو بەهیچ جۆر پێمان هەڵنەدەگیرا. سەرەتا سواری ولاغمان کرد، خۆی رانەگرت. لە پشتی خۆمان کرد هاوار هاواری چووە ئاسمان. پاشان بەهۆی دوو تفەنگ و بەتانییەک دارەبەستێکمان دروست کرد. ئەمجارەش خۆی پێ رانەگیرا بەڵام هیچ چارەسەری تر نەبوو. دواجار لە نێزیکی سنوور بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێک چوومە لای مەلا مستەفا. کەسێکی پێ ناساندین وا پێ دەچوو برین پێچەوەی خێڵ بێ. لە کەرستەی برین پێچانەوە تەنیا پلایزێکی پێ بوو. ئەو برین پێچە بەڕێزە وای پێشان دەدا ئەگەربێتو بریندارەکە خۆی رابگرێ ئەوا لە چاوترووکانێکدا گوللەکە دەردەهێنێ. ڕێگەچارەی تر نەبوو، دەست و پێی هاوەڵەکەمان بەستەوە و دەمیمان بەرەڵڵا کرد. دوکتۆری بەڕێز پلایزەکەی لەناو کیسە تووتنەکەی دەرهێنا و بەلیکاو تەڕی کرد و لە برینەکەی ڕا کرد. پاش ماوەیەک گەڕان و سووڕان، زیڕەی لە هاوەڵەکەمان بەرز کردەوە و پلایزەکەی کێشایە دەرەوە. سبەی ئەو ڕۆژە پێی بریندارەکە بەڕادەی بالیفێک هەڵئاوسا، تاکە چارەسەرێک بۆ ئەم هاوەڵەمان ئەوەبوو ڕەوانەی عێراقی بکەین. ئەوەبوو بەدارەبەست ئاوای ئەودیوی سنوورمان کرد و بەدەستەوەمان دا، پاشان لە گرتووخانەی ئەبوو غرێب لە بەغدا یەکترمان گرتەوە.

لەو کاروانەی پاشەکشێی دەکرد، وێڕای بارزانییەکان هەندێک خەڵکی تریش هەبوون. ئەمانە یا کەسانێک بوون لە فیرقەی دێموکراتی ئازربایجاندا خزمەتیان کردبوو و لە ترسی تۆڵەسەندنی حکوومەتی ناوەندی یا لە ترسی تۆڵەسەندنی هەلپەرستان هەڵدەهاتن، یان ئەو کوردانە بوون لە ئێران هەستیان بەتەنایی نەدەکرد و بەرژەوەندیی مایەکیان لە عێراقدا هەبوو.

یەکێک لەمانە شێخ تەها هەرکی بوو کە بەهەڤاڵەتیی کۆمەڵێک لە پیاوانی خێڵەکەی

پاشەکشێی دەکرد و لە عێراقیش سامانی هەبوو. وەک دەگوترا بەردەوام هاوکاریی قازی محەمەدی کردبوو و پیاوێکی خراپیش نەبوو. هەندێکی تریشیان تاونباری بەناوبانگ بوون، لەسەرووی هەموویشیانەوە کەسێک هەبوو بەناوی «زێرۆ بەگ» کە لە ترسانە لەناو کوردان هەڵدەهات.

زێرۆ بەگ نۆکەری یەکێک لە ئاغایەکانی هەرکی بوو کە ئەو کاتە ئەندامی ئەنجوومەنی عێراق بوو و لە ئێرانیش موڵکی هەبوو. هەشت نۆ کەسێکی لە دەوروپشتی خۆی کۆکردبووەوە، خێڵێکی بەناوی «خێڵی بەهادور»ەوە دانابوو و خۆیشی کردبوو بەسەرۆکی خێڵ. لەسەردەمی حکوومەتی میلليی کوردستاندا پلەی عەقیدی دابوو بەخۆی. بنکەکەشی لە «بالانۆچ» بوو و، لەوێ باخ و باڵەخانە و داوودەزگایەکی دامەزراندبوو. بالانۆچ لە سەرەڕێی ورمێ و مەهاباد هەڵکەوتووە و هەر ئۆتۆمۆبێلێکی بەو ناوەدا تێپەڕی بکردایە دەبوو باجی تێپەڕین بەزێرۆ بەگ بدات. هەرچۆن بێ ئەم «عەقیدە ڕێزدارە» لە هەرێمی دەسەڵاتداریی خۆیدا رایەخی خانی خانانی راخستبوو، جارێکیش پەلاماری ورمێی دابوو. وا بلاو بوو پیاوێکی مێرکوژ و بێ بەزەیە و دەیانگوت عەقیدێکی لە بالانۆچ لە خافڵەکی گرتبوو و بەشێوەیەکی دڕندانە کوشتبووی. لە ترسی تۆڵە و سزای هەموو ئەو تاوانانەی کردبوونی، لە پەنای خێڵی بارزانەوە هەڵدەهات. هەروەها باوبوو بڕێکی گەورە پارەی هێشکە و زێڕی پێیە. ئەم پیاوە پاشان لە گرتووخانەی ئەبوو غرێب گەیشتەوە ئێمە و لەوێ پێشانی دا چ پیاوێکی بێ زراوی ترسنۆکە. لە گرتووخانە، مەرایی و کلکەلەقێی بۆ هەموو سەرباز و عەریفێک دەکرد بۆ ئەوەی زگیان پێی بسووتێ، بۆ نموونە بۆ ئەوەی دەرگەی ژوورەکەی پتر کراوەبێ. پاشی دوو ساڵان، بەهۆی دەسڕۆیشتنی ئاغایەکەی کە لە ئەنجوومەنی عێراق بوو لە گرتووخانە دەرکەوت و، پاشان لەسەردەمی حکوومەتی عەبدولکەریمدا ئەو دەمەی مەلا مستەفا گەڕابووەوە عێراق، هەندێک خەڵکی بۆ خزمەتی سوپای عێراق لە خۆی کۆکردەوە و لە بەرامبەر هێزەکانی مەلا مستەفادا کەوتە شەڕ و کوژرا.

بێگومان بارزانییەکان نەیاندەویست لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا سەری پێوەندییان هەبێ بەڵام نەشیاندەتوانی لە خۆیانی دوور بخەنەوە.

هەرچۆن بێ، ئەم کۆمەڵەیە لە نێوان ڕۆژانی ٢٠ هەتا ٢٥ی ئاخەلێوەدا گەیشتە گەرووی «گادەر»ی بنکەی سنووریی ئێران و عێراق.

پاش ئەوەی هەڤاڵە بریندارەکەمان ئاوای ئەودیو سنوور کرد و بەدەستەوەمان دا، پرسێکی بنەڕەتی بەرۆکی گرتین ئەویش چارەنووسی خۆمان بوو. ئێمە لە نێزیکی سنووری عێراق هەستمان کرد ئیتر ڕێگەمان لە ڕێگەی بارزانییەکان جیا دەبێتەوە. شێخ ئەحمەد سوور بوو لەسەر ئەوەی بچێتەوە بۆ بارزان، حەزی گشتیی خێڵیش هەر ئەمە بوو.

مەلا مستەفا و نێزیکەی حەفسەت چەکداری خۆی بەتایبەتیش ژمارەیەک لە بەرپرسانی خێڵ کە سەت کەسێ دەبوون هەموویان لە عێراق حوکمیان بەدواوە هەبوو. دەیانویست بەهەر جۆرێکی بۆیان بلوێ خۆیان بگەیننە سۆڤیەت کە تاکە پەسارگە و شوێنێکی تەنا بوو بۆ ئەوان. ئیتر لێرەوە ژمارەی ئێمە بووبوو بەهەشت کەس، جگە لە «عەلی ئەسغەر»ی بریندار، «نیکۆلا»ش جیابووبووەوە و لەگەڵ هاوەڵێکی ئاشوورییدا ڕۆیشتبوو. لە بیرم چوو بڵێم جگە لە ژمارەیەک لە ئاشوورییەکانی ورمێ کە لە ئەندامانی فیرقەی دێموکراتی ورمێ بوون و بەگەڵ ئێمە کەوتبوون، هەروەها «سەعید»یش، ئەو لاوەی پێشتر لەبارەیەوە دووام لەگەڵ ئێمەدا بوو. ئەو ئامادە بوو لەگەڵ ئێمە بێت بۆ سۆڤیەت. ئێمە بڕیارمان وابوو لە یەکەمین هەلی بۆ گونجاودا بچین بۆ سۆڤیەت. بڕێک خواردنیشمان ئامادە کرد و سەعیدیش بەڵەدێکی باش بوو، مەرجیشی ئەوەبوو ئێمە بتوانین ڕێگە ببڕین و بەرگەی سەرما و برسیەتی بگرین و بتوانین پێ بەپێی ئەو لە لوتکەی کێوانەوە بێ ئەوەی نێزیکی شار و ئاوەدانی ببینەوە خۆمان بگەیننە ئاراس و لە ئاو بپەڕینەوە.

هەندێ لە تفەنگەکانی خۆمان دا بەکوردان و لە بڕێتیی هەر تفەنگێک نێزیکەی «من»ێک گەنمان وەرگرت و چەند کیلۆ خورمایەکیشمان ئامادە کرد. بۆ بەیانی کاتێ دەستمان بەئامادەکردنی خواردن کرد، گوتیان پیاوێک هاتووە بەدوای ئەفسەری تۆپدا دەگەڕێ «ناوی من بووبوو بەئەفسەری تۆپ». مەلا مستەفا بەدوایدا ناردبووم. چوومە چادرەکەی. زۆر بەدڵنەوایی وەری گرتمەوە و فەرمانی دا نان و ماستم بۆ بێنن: نانی گەرمی تەندوور و ماستی تازەی مەڕ، لەوانەیە سەرتان سڕ بمێنێ لەوەی ئاوها باسی نان و ماست دەکەم. نان و ماست لەو هەلومەرجەدا نانێک بوو وا بەئاسانی بەدەستی هەموو کەس نەدەکەوت. ئەو ڕۆژانە، چاترین خواردنی ئێمە گەنمی وشک بوو. تەنیا جارێکیان توانیمان بزنێک بدزین، نەشماندەزانی بیکوژینەوە، زێڕەبەخت خەنجەرێکی پێ بوو، ئەو ئاژەڵە بەستەزمانەی لەزەوی دا و کەوڵی کرد، ورگیمان بەتاڵ کرد و بەجارێک هاوێشتمانە ناو مەنجەڵ و...

مەلا مستەفا بەدڵنەوازییەکی زۆرەوە گوتی:

- سوڵتان تەفرشیان، دەتەوێ بچی بۆ کوێ؟ سەعید هەموو شتێکی پێ گوتووم. ئێوە لە مەلا مستەفا چاکترتان بۆ پەیا نابێ، لەگەڵمان بمێنن، ئەگەر بەگوللە بکوژرێین سەرەتا من دەکوژرێم پاشان ئێوە. بەیەکەوە سەرمان دەخەینە سەر بەردێک و چارەنووسمان پێک گرێ دەدەین: مردین، هەموو پێکەوە دەمرین. ژیاین، هەموو پێکەوە دەژیین.

گوتم:

- وەک لە بڕیاری ئێوەدا دەردەکەوێ دەتانەوێ بچنەوە بۆ عێراق، ئەگەر وابێ ئێمە ناتوانین لەگەڵ ئێوەدا بمێنین لەبەرئەوەی هەر بەخۆبەدەستەودانمان بەعێراق یەکڕاست دەماندەنەوە بەئێران و هەر لەسەر سنوور گوللەبارانمان دەکەن.

مەلا مستەفا گوتی:

- کێ بەئێوەی گوتووە مەلا مستەفا خۆی بەدەست عێراقەوە دەدا؟ مەلا مستەفا خۆی بەدەستی کەسەوە نادات. بمێنن بزانین شێخ ئەحمەد بڕیاری لەسەر چییە. ڕاستە ئەو دەیەوێ بچێتەوە بۆ عێراق بەڵام ئەگەر من خۆم بەدەستی عێراقەوە بدەم پاشی ٢٤ سەعات لە بەغدا هەڵم دەواسن. من چۆن دەتوانم بچم بۆ عێراق؟ جارێ لەگەڵ ئێمەدابن و دڵتان هیچ نەکات.

هەرچۆن بێ، مەلا مستەفا بڕیاری بەئێمە گۆڕی. من قسەکانی ئەوم بەهاوەڵەکانم گەیاندەوە و بڕیارمان دا لەگەڵ ئەوان بمێنین. سەعیدیش بەکارێکی مەلا مستەفاوە ڕۆیشت و چوو بۆ عێراق، ئێمەش بڕیارمان دا چاوەڕوانی ئەو بین.

لەو ڕۆژانەدا پێی سنووروانانی عێراقی بۆ هاتوچۆی ناو خێڵ کرابووەوە. شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا خەریکی وتوویژ بوون لەگەڵیاندا. هێزگەلی عێراقیش لە نێزیکی سنوور بۆسەیان نابووەوە. کاردارانی عێراقی کەوتبوونە تێکەڵاوی لەگەڵ ئێمەدا، پێیان وابوو ئێمە ڕۆڵێک لە ڕێکوپێکی و لەشەڕ سەرکەتنی بارزانییەکاندا دەلەیزین و ئەگەر ئێمە لەوان جیا بکەنەوە ئەوا مەترسیی خێڵی بارزان کەم دەکەنەوە.

وتوویژی ئەوان لەگەڵ ئێمەدا لەسەر ئەو بنچینەیە بوو: ئێوە دەتوانن پەنا ببەنە بەر عێراق و ئێمە بەگوێرەی یاسای ناوولاتان لەبارەی پەنابەرانی سیاسییەوە هەڵسوکەوتتان لەگەڵدا دەکەین. ئەوان دەیانگوت لەم بوارەدا دەوڵەتی عێراق لەگەڵ ئێراندا بڕیاری

بەستووە تەنیا تاوانبارانی ئاسایی ئالوگۆڕ بکەن. بێگومان ئێمە بڕیارمان نەدابوو ببین بەپەنابەر لە عێراق بەلام وەلامی «نەرێ»شمان بەوان نەدەدا و نەماندەهێشت پێوەندیمان ببڕێ.

هەر لەو ڕۆژانەدا جارێکیان دیمانەمان لەگەڵ شێخ ئەحمەددا کرد و وتوویژمان کرد. ئەو دەیگوت:

من لە هەموو ژیانی خۆمدا پیاوگەلی وەک ئێوە ڕەوشت پاک و بوێرم نەبینیوە. چەند حەزم دەکرد ئێمە هەمان هەلومەرجی جارانمان لە بارزان هەبووایە و ئێوەش ببوونایە میوانمان. بەلام بەداخەوە ئێستە دەستی خۆیشمان لە هەموو جێیەکدا کورتە، ئێستە شتێکمان نییە سوپاسی ئێوەی پێ بکەین. بیستم ئێوە ویستووتانە بچن بۆ سۆڤیەت بەلام نەتانتوانیوە، وەک دیارە حەز دەکەن لەناو خێلّی بارزاندا بمێنن. من بەرژەوەندیی ئێوە لەوەدا دەبینم خۆتان بەدەستی عێراقەوە بدەن. ئێران و تورکیا جێی ئێوە نییە. تەنیا هیوای ئێوە لە عێراقدایە. ئێمە لە خۆبەدەستەوەدان بەعێراق بترازێ ڕێگەیەکی ترمان لەپێشدا نییە. بڕیارمان داوە هەموومان بچینەوە بۆ عێراق. تەنیا مەلا مستەفا و هەندێک لە پیاوانی چەکدارمان خۆیان بەدەستەوە نادەن. بڕیارە ئەوان پاشان بەزەبری زۆردارەکی بێنەوە بۆ ناو عێراق و هەندێک بنکەی سوپایی چەک بکەن و هەتا ئەو ڕادەیە بەربەرەکانێی میری بکەن کە ناچار ببێ ئێمە بەلێبووردنی گشتی بدات و سەرلەنوێ لە ناوچەی بارزان بنەجێ ببینەوە.

بەو ئاوایە بارزانییەکان بڕیاری خۆیان دابوو. ئەوان پێیان وابوو هەبوونی ئێمە لەناو خێلّدا گیروگرفتێک لە ڕێگەی بەجێ هێنانی ئەو پلانەدا دێنێتە کایە.

باو بوو ئێمە کۆمۆنیستین و تەنانەت لەگەڵ مۆسکۆشدا سەری پێوەندیمان هەیە و ئەگەر لە ناو خێلّی بارزان بمێنین ئەوا ئەوان ناچار دەبن خالێکی تر لەبارەی ئێمەی شەش مرۆڤی کۆمۆنیستەوە لە بڕیاری خۆیان لەگەڵ دەولەتی عێراقدا زیاد بکەن. بەم جۆرە لە ڕێککەوتن لەگەڵ عێراقدا گرفتێکی تر دەچووە سەر گرفتەکانیان. ئەوان هزریان دەکرد ئەگەر ئێمە لەگەڵ ئەواندا بین ئەوا دەولەتی عێراق گرانتر لەگەلیاندا ڕێک دەکەوێ، ڕەنگە هەر لە بنەڕەتەوە ڕێک نەکەوێ و مەرجی ئەو بڕیتی بێ لە بەدەستەوەدانی ئێمە. ئەوان بەئێمەیان دەگوت ئێوە گوناحێکتان لە عێراقدا نییە، ئەگەر جیا لە ئێمە خۆتان بەدەستی عێراقەوە بدەن ئەوا باری ئێوە سووکتر دەبێ. بەم ئاوایە ئەوان لە ڕاستیدا

بەشێوەیەکی ڕێزپەروەرانە ئێمەیان لە خۆیان بەدوور دەخستەوە.

بێگومان شێخ ئەحمەد بەڕواڵەت دەیگوت ئەگەر حەز بکەن دەتوانن لەگەڵ مەلا مستەفادابن. ئەو نیازیەتی ئەم شەو «یاخی» ببێ، هەرچەندە بەرژەوەندیی ئێوە لە خۆبەدەستەوەداندایە بەڵام ئەگەر حەزیش بکەن بەگەڵ مەلا مستەفا بکەون ئەوا ئێمە ڕێگەتان لێ ناگرین. ئێمەش بڕیارمان دا تەبای مەلا مستەفا «یاخی» ببین و مەلا مستەفاش بڕیارەکەمانی بەپەسند زانی.

هەر ئەو شەوە ئافرەت و منداڵ و پیرەمێران ڕێگەی عێراقیان گرتەبەر(١٣) بەڵام نێزیکەی حەوسەت مرۆڤی چەکدار بەرەو ناو عێراق پاشەکشێیان کرد. ئەو شەوە گایەکیان کوشتەوە، گۆشتەکەیان بەسەر «یاخی»یەکاندا بڵاو کردەوە، ئێمەش بەتێکڕایی پشکێکمان بەرکەوت. پێستەکەشیان کرد بەپێتاو. لە داوێنی گەرووێکدا شێومان خوارد و بۆ شەو چووینە چیا بۆ چادری مەلا مستەفا.

من لەوێ هەستم کرد ئەو بەهاتنی ئێمە دڵشاد نییە. هەقیشی بوو، لەبەرئەوەی ئێمە تەنیا گرینگیی چەکدارێکمان هەبوو، ئەویش ئەو چەکدارەی ناتوانێ پێ بژیو و جێ ژیانی خۆی دابین بکات و بەردەوام بووەتە بارگرانی، لە کاتێکدا چەکدارانی بارزانی لەم بارەیەوە لێهاتوو بوون. بەکورتی ئێمە دەست و پێ گرێدەر بووین. بۆ نموونە هەر ئەو شەوە کاتێ بەمەلا مستەفام گوت لەکوێ بخەوین، گوتی:

- باشە، بڕۆن لە یەکێ لەو چادرانە شوێنێک بۆ خۆتان بکەنەوە.

ئەو ئاخاوتنە لە کورتییە پێشانی دا ئێمە بەدوو شێوەی تەواو جیا بیر دەکەینەوە. ئێمە چاوەڕوان بووین ئەو جێگە و پێ بژیوی و شتی ترمان بۆ دەستەبەر بکات و ئەویش چاوەڕوان بوو ئەم جۆرە چاوەڕوانییە لەو نەکەین.

لەو سەر کەپکی چیایەدا بارزانییەکان تەنیا سێ کۆنیان هەبوو. سەرمان بەهەر یەکێکیاندا گرت مۆنجەی دەهات و جێگەمان دەست نەکەوت. ئەو شەوە سەرما لێی دام و تام هاتێ. هاوەڵانم تەنیا کارێکی لەدەستیان هات ئەوەبوو لە یەکێ لەو کۆنانەدا جێگەیەک بۆ من بکەنەوە، خۆیشیان لەبەر ئەو بەفر و سەرماوسۆڵەیە مان و خۆیان

(١٣) ڕۆژی ١٧- ١٨ نیسانساڵی ١٩٤٧ نێزیکەی ١٥٥٠ پیاو، ١٦٨٨ ئافرەت و ١٣٢٩ منداڵی بارزانی لەگەڵ شێخ ئەحمەدی بارزاندا هاتنەوە ناو زەویی کوردستانی عێراق. بڕوانە وتارێکی د. فوئاد حەمە خورشید لە گۆڤاری ڕەنگین ژمارە ٩٦ .

گورمیله کرد. دەزانرێ گیروگرفت لە بەرزاییی چوار هەزار مەتری سەر بەفردا چەند زۆرە. هەر ئەو شەوە سێ ئەسپ و دوو سەگ لە سەرمانە هیشک هەڵاتن. من خۆم سبەینێ وەئاگا هاتم هەستم کرد گەرووم گەرم داهاتووە، توومەز دەوروپشتی ملم بەفر گرتبووی. شەو تەنیا سەرم لەبن رەشماڵ بووبوو، پاشماوەی لەشم لە دەرەوە مابوو.

ڕۆژی پاشتر هەموومان باوەڕمان هێنا بەرگەگرتنی ئەم جۆرە گرفتانە لە وزەی ئێمەدا نییە و تێکڕا بڕیارمان دا خۆمان بەدەستەوە بدەین. دەمانزانی ئەگەر هەتا دوێنێ گرینگییەکمان هەبوو لەسایەی تۆپەکانەوە بوو، ئێستە لە چەکدارێکی ئاسایی و جێگەگر بەولاوە شتێکی تر نیین، دە کەسیش لە ئێمە نەدەگەیشتە پێی مرۆڤێکی بارزانی.

سەرەڕای ئەو مەترسییەی هەستمان پێی دەکرد، لە ڕۆژی ٢٦ی مانگی ئاخەلێوەی ساڵی ١٣٢٦ خۆمان بەدەستی عێراقەوە دا.

پێش ئەوەی خوا حافیزی لە بارزانییەکان یان چاتر بڵێم لە کوردستان بکەین، بەسەرهاتی دایکێکی کوردت بۆ دەگێڕمەوە، بەسەرهاتی ئەو هەست و سۆزەی تەنیا دایک دەتوانێ بیهێنێتە کایە.

زستانی ساڵی ۱۳۲٤ له شنۆ دۆستایەتیم لەگەڵ لاوێ بەناوی «خەیروڵلا»دا پەیدا کرد، لەبەرئەوەی هەموان بەناوی «خەیری»یەوە بانگیان دەکرد بۆیە منیش هەر بەو ناوەوە بەیادی دەکەمەوە. ئەو یەکێک بوو لە ئەفسەرانی کورد لە سوپای عێراق و چووبووە پاڵ بارزانییەکان، لە تەک ئەواندا هاتبوو بۆ ئێران و لە سوپای حکوومەتی گەلێری کوردستان بەڕێبەرایەتیی قازی محەمەد پلەی «نەقیب»ی هەبوو. لە مەهاباد کچێکی یەکجار جوانی مارە کرد. پاش هەڵمەتی سوپای ئێران، لە هاوەڵەتیی بارزانییەکاندا کەوتە کشانەوە.

بەڕواڵەت خۆی لە سەرووی چل ساڵی پێشان دەدا بەڵام ڕەوت و بزاوتی بەتایبەتیش کاتێ سوواری ئەسپ دەبوو، مرۆڤی بۆ خۆی بەکێش دەکرد بەجۆرێ کوڕێکی گەنجە و تەمەنی ناگاتە بیست و پێنج بیست و شەش ساڵان. هەتا بڵێی گورجوگۆڵ، ئازا و بزێو بوو. یەکجار بەورە بوو، لە هەر هەواڵێکی هەرچەندە زۆر نالەباریش بووایە، دەیتوانی ئەنجامی گەشبینانە بخوێنێتەوە. یەکێک لە پیاوانی خێڵ کۆنە رادیۆیەکی بەپیل ئیشکەری هەبوو، هەندێ لەو شەوانەی هەلمان نەدەبوو خۆمان گوێ لە هەواڵی رادیۆ بگرین، بۆ بەیانی خەیری هەواڵ و شرۆڤەی تێروتەسەلی بۆمان دەهێنا لەبەرئەوەی ئەو یەکێک بوو لە گوێگرانی هەموو شەوانی رادیۆ. بۆ نموونە ئەگەر رادیۆی مۆسکۆ لە گوتارێکی راگەیاندندا بیگوتایە «دەمی هەرزەوێژان تێک دەشکێنین»، ئەوا ئەو وای شرۆڤە دەکرد هەر سبەی سوپای سوور لە باکوری ئێرانەوە شۆڕ دەبێتەوە، سوپای داگیرکەر و زۆرکاری ئێران تێک و پێک دەشکێنێ و کۆماری میللیی کوردستان دەژیێنێتەوە.

ئەو کارداری دابینکردنی پێ بژێوی بارزانییەکان بوو و هەرجارەی لە گەشتی پەیاکردنی پێ بژێو دەگەڕایەوە کۆمەڵێک دەنگوباسی تایبەت بەخۆی دەهێنایەوە. فلانە خێڵ قورئانی مۆر کردووە لەکاتی شەڕدا لایەنی بارزانییەکان بگرێ، فیسارە خێڵ خۆی لە میریی ئێران تەکاندووەتەوە و بەڵێنی داوە هیچ جارێک ئالیکاری بەسوپای ئێران نەدات. یا بۆ نموونە سەرۆکی ئەو خێڵەکەی تر لەسەردەمی ڕەزاشادا کوژراوە، بۆیە ئەستەمە ئالیکاری بدات بەسوپای ئێران. ئیتر لەم جۆرە هەواڵ و شرۆڤانە...

بەکورتی، لە تێکڕای هەواڵ و شرۆڤەگەلی ئەودا ئەوە دەبینرا تەواوی گەلی کوردستان هەموو لەهەموو لە دووای بارزانییەکانەوە وەستاون، ئەگەر سوپای ئێران دەست بەشەڕ بکات ئەوا زوو بەزوو لەبەریەک هەڵدەوەشێ. ئەو نەک تەنێ بۆ خۆی لاوێکی بەردەوام

دڵگەش بوو بگرە هیوا و دڵگەشیی بەملا و بەولاشدا بڵاو دەکردەوە.

لە شنۆ، کەسانێک هەن پێوەندیی خۆشەویستیی ئەویان لەگەڵ خێزانەکەیدا بینیوە. من بۆ خۆم ڕۆژێکیان بینیم برا بچووکی ژنەکەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو بۆ گەرماو و وەک منداڵی خۆی بەوپەڕی خۆشەویستییەوە دەیشوشت و هیشکی دەکردەوە. ئەو بەچاکی پێشانی دەدا نەک تەنێ پیاوێکی شەڕوان و کاردارە بگرە بەتەواوی واتاوە پیاوی ماڵەوەشە.

سوپای ئێران هەڵمەتی هێنا و بارزانییەکان پاش چەندین ڕۆژ لە شەڕ و هەڵاتن، بەرەو سنووری عێراق کەوتنە کشانەوە. لە کاتی کشانەوەدا دایک و ژنبرای خەیری لە شنۆ مانەوە بەڵام ژنە جوانەکەی بەگەڵی کەوت.

بەسەرهاتی ئێمە لە سنووری عێراقەوە دەست پێ دەکات. لەوێ، کاتی سەردانی چادرەکان و پرسینی هەواڵی ئەو ماڵانەی دەمانناسین، نەقیب «خەیری»مان بینی لە ناو نوێن کەوتووە و دەناڵێنێ، تایەکی گەرمی لێ هاتبوو و ناوبەناوێ وڕێنەی دەکرد. کورد بەنەریت (لە یەک دوو لە دە پلەی) تادا ناڵەیان دەگاتە ئاسمان چ جای ئەوەی بگاتە نێزیکی سێ پلە.

کە ئێمەی بینی سەری ڕەزامەندیی ڕالەقاند. ئێمە چەند ئەفسەرێک بووین لە کشانەوەی بارزانییەکاندا هاوڕێگە بووین. خەیری داوای لێ کردین لە تەنیشتی دابنیشین، پاشان بەزمانی تورکی بەدەم ئاهوناڵەوە گوتی:

– من دەمەوێ تکاتان لێ بکەم بڕوا بەژنەکەم بێنن بگەڕێتەوە بۆ مەهاباد. من نەخۆشم و ناچارم خۆم بەدەست عێراقەوە بدەم. لەبەرئەوەیش کە لە سوپای عێراق فەرمانی لە سێدارەدانم بەدواوە هەیە، ئیتر نازانرێ چ چارەنووسێک بۆم لە پارێزدایە. هەبوونی ژنەکەم، دەست و پێم دەبەستێ و ورەم دێنێتە خوار، وێڕای ئەمەش جاحێڵ و جوانە...

ئێمە دەمانبینی ژنەکەی وەک پەپوولە بەدەوریدا دەسووڕایەوە و دەیلاواندەوە:

– خەم مەخۆ، زوو چاک دەبیەوە...

ئەو دەمەی خەیری بابەتی گەڕانەوەی ئەوی بۆ مەهاباد لەگەڵ ئێمەدا کردەوە، گوتی:

– خۆت ماندوو مەکە، خۆت پێشتر هەموو ئەم قسانەت پێ گوتووم، قسەی ئەمانەش لە قسەی خۆت زیاترم کار تێ ناکەن. من لەم حاڵ و باڵەدا بەهیچ جۆر دەستت لێ

هەڵناگرم. هەلومەرج هەرچۆن بێ من ژنی تۆم، بۆ هەرکوێ بچی لەگەڵتدا دێم و لە هەرچییەکی بەسەرت بێ هاوبەش دەبم، هەتا بەژیان بمێنی لەپاڵ تۆدا دەبم و ئەگەر مردیشی...

لێرە، رووی خۆی بەلایەکەی تردا وەرگێڕا.

ئێمە لەبەرئەوەی دەمانزانی قسەکانمان کارێکی ئەوتۆی تێ ناکەن پێمان گوت:

- لەبەرئەوەی تۆ ژنێکی جاحێڵ و جوانی، بەتایبەتیش لەبەرئەوەی ژنی پیاوێکی حوکمدراوی، لە عێراق مەترسیت لەسەر هەیە. لەوانەیە ببی بەمایەی رێزنەگیری و تەنانەت دەسدرێژییش، لەم بارەیشدا ئازار و ئێشی پیاوەکەت پتر دەبێ. ئەگەر ئەوت خۆش دەوێ بگەڕێوە بۆ مەهاباد، ئەمەیش لە دوو حاڵ بەدەر نییە یان ئەوەتا پیاوەکەت دەرباز دەبێ و دەگەڕێتەوە لات یان ئەوەتا لە سێدارە دەدرێ... ئیتر ئەو کاتەش هیچ جیاوازییەکی نییە تۆ لە مەهاباد بی یان لە بەغدا...

نەدەزانرا قسەکانی ئێمە کاری لێ دەکەن یان نا، بەڵام هەرچۆن بێ کاتێ جارێکی تر «خەیری»مان لەناو ئاخی عێراقدا بینییەوە ژنەکەی لەگەڵیدا نەبوو. ئێمەش بۆ ئەوەی برینی نەکولێنینەوە پرسیارمان لێی نەکرد، وا پێ دەچوو ژنەکەی لە سنوورەوە گەڕابێتەوە بۆ مەهاباد.

ئێمە لە دوو سێ قۆناغی ناو زەویی عێراق، لە ناوچەیەک بەناوی «باپشتیان» کە بنکەیەکی پۆلیسی عێراقی بوو، جارێکی تر «خەیری»مان بینییەوە. هێشتا نەخۆشییەکەی گران بوو بەڵام بەبۆنەی ئەوەی ئەفسەرانی عێراقی پێشتر دەیانناسی، لە رووی داوودەرمانەوە چاویان لێی بوو. بۆ سبەینێ گەیشتینە شوێنێک بەناوی «دیانە»، وڵاغیان بۆی گرت و بەسواری بەڕێیان کرد. ئێمە هەموومان بەپێیان بووین.

بەسەرهات لە دیانەوە کە یەکەمین خاڵگەی سنوورە ئۆتۆمۆبێلی بگاتێ، دەستێ پێ کرد. لەوێ ئێمەیان سواری لۆری کرد. ئێمەی گیراویان لە دوو لۆری سوار کرد و دوو لۆریی زرێداریش پاسەوانییان لێ دەکردین. دوو سێ کیلۆمەتر لە دیانە دوور نەکەوتبووینەوە لەبەری چەپی ریگەدا ژنێکم بینی بەهەڵەداوان رووەو رێگە دەهات و بەدەنگی بڵند شتێکی دەگوتەوە. کاتێ نێزیک کەوتەوە گوێم لێ بوو دەیگوت:

- کوڕم خەیری! کوڕم خەیری!

بەهەڵەداوان و پرچی کراوەوە رای دەکرد. ئەو کۆنەی(١٤) لە پشتێنی بەستبوو، لەسەرەوەڕا شۆڕ بووبووەوە و دەگەیشتە سەر زەوی، لە دوایەوە دەکشا و تۆزی بڵند دەکردەوە. سەری کراوە بوو و مووە مشکی رەنگییەکانی وەک پەڕی جووچکە تیژ ڕاوەستابوون. بەژن و باڵایەکی داوەشاو و هێسکدار و لەبەر ڕۆژ سووتاوی هەبوو. لە تەواوی ڕواڵەتیدا تەنێ دوو چاوی سوور دەبینرا بریسکیان دەدا. بێ ئەوەی خەیری ببینێ رووە و ئێمە و پۆلیسەکان و ئۆتۆمۆبێل تەنیا هاواری دەکرد:

- کوڕم خەیری! کوڕم خەیری!

پاش ئەوەی خۆی هاوێشتە سەر بۆدیی ئۆتۆمۆبێلەکە، خەیری سەری خۆی شاردەوە و بەچرپە پێی گوتین:

- دایکی منە، پێی بڵێن من لێرە نیم.

بەڵام نەئێمە لە زمانی ئەو دەگەیشتین و نەپۆلیس مۆڵەتیان دەدا قسەی لەگەڵدا بکەین. ئۆتۆمۆبێل وەستا و دوو عەریف دابەزین، ئەویان لە ئۆتۆمۆبێلەکە دوور خستەوە و لە لێواری ڕێگەیان دانا بەڵام هەر لەگەڵ بەڕێ کەوتنەوەی ئۆتۆمۆبێل، ئەو لەیەک ترووکەی چاودا خۆی هاوێشتەوە سەر لمۆزی ئۆتۆمۆبێلەکە. ئەم ڕووداوە دوو سێ جار دووبارە بووەوە، هەتا دواجار پۆلیسەکان لە پیلی نەوین و چەندین مەتریان بەسەر زەویدا ڕاکێشا و هەڵیاندایە ناو جۆگەلەیەکی تەنیشتی ڕێگەوە. ئەم جارە هەتا پێ ڕاگەیشت هەستێتەوە ئۆتۆمۆبێلەکان بەدوور کەوتبوون.

کەس نەیدەزانی ئەم ژنە لە کوێی زانیوە کوڕەکەی لەم ئۆتۆمۆبێلەدایە. بەڵام هەرچی بێ لە قۆناغی پاشتر ئەومان بینییەوە. لە قۆناغی پاشتر ئێمەیان برد بۆ چادری پاسەوانیی فەوجێکی سوپا. ئەو فەوجە لە پەڕگەی گوندێکدا هێوری بوو. ئێمە هەر لە ئۆتۆمۆبێل دابەزین دایکی «خەیری»مان بینی لە تەنیشت چادری پاسەوانیدا لەسەر چۆکان دانیشتبوو. دەمودەست و بەچ شێوەیەک بەر لە ئێمە خۆی گەیاندبووە ئەو شوێنە، کەس نەیدەزانی! مرۆڤ دەیتوانی هەست بکات ئەو تەنیا بەبۆن و هەستی دایکانە بەرامەی کوڕەکەی لەهەر کوێ بێت خۆی دەگەیەنێتە ئەو شوێنە.

(١٤) لە کوردەواریدا ئافرەتان پارچەی ڕەشماڵ «کۆن - کوێن» بۆ شیوەن گێران و ئازیەتباری لە خۆیان دەئاڵێنن. زۆرجار «مل بەکوێن» لە گۆرانی فۆلکۆریدا دەبیسترێ - وەرگێر.

ئەو شەوە ئێمەیان بردە قەڵایەک گوایە بنکەی پۆلیس بوو. بەو پێناوییەی ئێمە کردمان و ئەو پارەیەی دامان، مۆڵەتیان دا دایکی خەیری بۆ چەند ساتێک کوڕەکەی ببینێ. لەو دیمانە کورتەدا، بێ ئەوەی یەک وشە چییە بپەیڤێ، تەنیا سەرنجی کوڕەکەی دەدا، دەتگوت هەموو گیانی بووەتە سەرنج و هەر بەو سەرنجە هەموو خۆشەویستی و لاواندنەوەی دایکانەی خۆی بەسەر کوڕەکەیدا بڵاو دەکاتەوە. وەک چۆن ئەڤینداری بۆ ئەڤینەکەی راکێشرابێ ئاوها سەرنجی لە کوڕەکەی دەدا. وەک ئەوەی بەم بێدەنگییە هەموو قسەیەک دەربڕێ. تەنیا قسەیەکی دەیکرد ئەوە بوو:

- کوڕم خەیری!...

بێگومان خەیری قسەی دەکرد و شتگەلێکی پێ دەگوت. هەبێ و نەبێ دڵی دەدایەوە و داوای لێ دەکرد بگەڕێتەوە ماڵ، بەڵام ئەو لە هەموو ئەو ماوەیەدا لەوانەیە پێنج شەش وردکە بێ ترووکەی چاو تەنیا سەرنجی لە کوڕەکەی دابێ.

بۆ سبەی، لەگەڵ گەردی بەیانی ئێمەیان بەرەو کەرکووک برد. هەتا دەمی رۆژئاوا لە کەرکووک بووین. بەرەبەری رۆژئاوا ئێمەیان بۆ وێستگەی هێڵی ئاسنین برد، لە فارگۆنێکی تایبەتیان سووار کردین. لەوێ حاڵی خەیری خراپتر بوو، بەردەوام دەیناڵاند و دەیگوت:

- انزل الطبیب فی سبیل الله... «واتە لە رێگەی خوادا دوکتۆر بێنن»

فارگۆنەکەی ئێمە بەجیا و دەرگەگیراو بوو، پێوەندیی بەفارگۆنەکانی ترەوە نەبوو. دەستێ ئێمەیان، هەر دوو کەس دوو کەس، کەلەپچە کردبوو. «خەیری»ش هەرچەندە پەکی کەوتبوو بەڵام دەستی بەکورسیی فارگۆنەکەوە بەسترابوو. دوای سەعاتێک لەبەرێ کەوتنی شەمەندەفەر، دەنگە دەنگێک لە پشتی دەرگەوە هاتە گوێ، دەتگوت پشیلەیە پەنجە بەدەرگەدا دەکێشێ و نووزەنووز دەکات، ئەم دەنگە سەرنجی پاسەوانانی بەکێش کرد.

سەرەک پاسەوانی ئێمە «مفەوەز»ێکی یەکجار بەفیز و لەخۆبایی بوو. هەڵسوکەوت و رەفتاری لەو گەنجانە دەچوو کە رابردووێکی لەباریان نەبێ. عەریفەکەش، هەر بەم جۆرە لەبارەی ئەو دەدوا. لەم ئەرکەیدا زۆر بەخۆیەوە دەنازی و دەیویست لەهەر هەلێکی بۆی هەڵدەکەوێ هێزی خۆی پێشان بدات. فەرمانی بەعەریفەکە دا بزانێ ئەو دەنگە چییە.

کاتێ دەرگەی ناوەندیی فارگۆن کرایەوە بینیمان دایکی خەیری وا لە پشت دەرگە

وێستاوە. ئێمە بەهۆی عەریفەکەوە کە تورکیی دەزانی، داوامان لە مفەوەزەکە کرد مۆڵەت بدات ئەم دایکە لە تەنیشت کوڕەکەی دابنیشێ، بەڵام ئەو بەتیژی بەرتەکی دایەوە و فەرمانی دا ژنەکە لە پشت دەرگە بەدوور بخەنەوە و دەرگەش دابخەن. بێگومان «خەیری»ش حەزی نەدەکرد دایکی لەم حاڵی نەخۆشی و دەست بەستراوەییەدا بیبینێ. هەرچۆن بێ دەرگە داخرایەوە، جارێکی تر دەنگی ئاهوناڵینی دایکی خەیری و دەنگی لەپەکوتەی بەدەرگەدا بڵند بووەوە و ئەمجارە هەتا بەیان درێژەی کێشا. بێگومان دوو سێ جار، پۆلیسەکان بەتوندوتیژی ئەویان لە پشت دەرگە بەدوور دەخست بەڵام ئەو لەهەمبەر هەموو ئەو تیژییانەدا نەقسەیەکی دەکرد و نەبەرگرییەک، تەنیا سینگی دەکوتا و دەیگوت:

- کوڕم خەیری!...

نەتکا و پاڕانەوەیەک، نەتووڕەیی و دەمارکرژییەک و نەهیچ بەرتەکێک...

بەدرێژاییی شەو، خەیری لەم بەری دەرگەوە، بەدەستی بەستراوە بەکورسییەوە، دەیناڵاند:

- انزل الطبیب فی سبیل الله...

دایکیشی لەودیو دەرگەوە ناوبەناوێ دەیگوت:

- کوڕم خەیری!...

بۆ سبەینێ ئێمەیان برد بۆ بەغدا بۆ «مەرکەز سەرا» و پاش بەخێرهێنانێکی سەرەتایی ئێمەیان فڕێ دایە ژوورێکی پیس و پۆخڵ. ئەمجارەش دایکی خەیری لە پێش دەرگەی گرتووخانەدا وەستابوو، وەک پێشان سەرنجی لە کوڕەکەی دەدا و لە ژێر لێوەوە بەچرپە دەیگوت:

- کوڕم خەیری!...

پاش نیو سەعات پۆلیسێک پرێسکەیەکی بۆ خەیری هێنا. دایکی ناردبووی: برێک نانی هیشک و حەوت هەشت دەنکە خورما!

پاشی سێ ڕۆژ، سەرەودەری ئێمە ڕۆناک بووەوە و لە «مەرکەز سەرا»وە بردیانین بۆ گرتووخانەی «ئەبوو غرێب». ئەمجارە «خەیری»مان لەگەڵدا نەبوو، ئەویان حەواڵەی سوپا کردبوو. ئیتر بەو شێوەیە ڕێگەی ئێمە و ئەو لە یەکتر جیا بووەوە، چیتر هەواڵی ئەومان

پێ نەگەیشت، تەنیا لە ڕێگەی ڕۆژنامەکانەوە زانیمان کە سپاردوویانە بەدادگەیەکی سوپایی.

پاشی پێنج شەش مانگ، کاتێ «عەلی ئەسغەری» کە یەکێک بوو لە هاوەڵانی ئێمە، گەیشتەوە لامان، لە چارەنووسی ئەو و دایکی ئاگەداری کردینەوە. عەلی ئەسغەری لە کاتی شەڕ بریندار بووبوو، بەناچاری بەر لە خۆمان ئەومان بەدەست سنوورەوانانی عێراقەوە دابوو، پاش چابوونەوەیشی، دەسبەجێ بەگرتووخانەی گشتی سپاردرا بوو. ئەو بۆ ئێمەی گێڕایەوە:

– خەیری لە هەموو شوێنێک بەهۆی دایکیەوە ناوبانگی دەرکردبوو. ئەو لە هەموو شوێن بەدوای کوڕەکەیەوە بوو. دەتگوت بۆنی کردووە و بێ ئەوەی لە کەسێ بپرسێ لە هەموو جێگەیەک ئامادە دەبوو. ئەو دەمەی خەیروڵڵا لە مۆڵگەی سوپا گیرابوو، دایکی ببوو بەجێنیشتەی بەردەوامی مۆڵگەکە. کاتێ دەیانبردە دادگە بەدوایدا ملی ڕێگەی دەگرت و لەگەڵیشیدا دەگەڕایەوە. سەرلەبەر ئەفسەران و دادوەرانی دادگە دەیانناسی، دڵیان دەدایەوە و دڵنیایان دەکرد کوڕەکەی بەم زوانە بەردەبێ. ئەو تەنیا ئەوەی بەئەفسەران دەگوت کوڕەکەی بدەنەوە بۆ ئەوەی بیباتەوە ماڵ.

دوواجار، خەیروڵڵا فەرمانی لەداردانی بۆ دەرچوو(١٥). ڕۆژنامەکانیش نووسییان لە گرتووخانەی ناوەندی لە بەغدا بەدارەوە هەڵواسرا، بەڵام دایکی هێشتا هەر داوای دەکردەوە.

بەرەبەیانی ڕۆژی بەدارەوە کردن، خەیروڵڵا دوو ڕکات نوێژ دەکات و ئامادەی لەداردان دەبێ، لەبەر پێی داردا دەڵێ:

– من لاوێکی کوردم و شانازی دەکەم لە پێناوی سەربەخۆیی کوردستاندا دەمرم...

لە دووا ساتیشدا رادەسپێرێ «تەرمەکەی بدەنەوە بەدایکی...»

هەر ئەو ڕۆژە بەدایکی خەیروڵڵا دەڵێن کوڕەکەت لە دار دراوە، بەڵام ئەو هێشتا دەڵێ:

– کوڕەکەم بدەنەوە، دەیبەمەوە بۆ ماڵ...

(١٥) شەهید خەیروڵڵا عەبدولکەریم لە بەرەبەیانی ڕۆژی ١٩ حوزەیران ١٩٤٧ تەبای سێ ئەفسەرە قارەمانەکەی تر: عیزەت عەبدولعەزیز، مستەفا خۆشناو و، محەمەد مەحموود قودسی لە گرتووخانەی ناوەندیی بەغدا بەدارەوە هەڵواسران.

کوڕەکەی پێ دەدەنەوە بەڵام بەبێ گیان.

چەند کەسێکی کورد هاوکاریی دەکەن و پیکابێک دەگرن و ئەم شەهیدە کوردە دەبەنەوە بۆ هەولێر. دەڵێن دایکی خەیری لە ئۆتۆمۆبێلەکەدا لە پشت سەری کوڕەکەی دادەنیشێ، سەری لەسەر تەرمەکە دادەنێ و بێ ئەوەی شیوەن و گریان بکات دڵی دەداتەوە.

- کوڕم خەیری سەغڵەت مەبە، هەر بگەینەوە ماڵێ چاک دەبیەوە...

عەلی ئەسغەری لە گرتووە کوردەکانی بەغدای بیستبوو کەوا لە هەولێر خزم وکەسانی خەیری کۆ دەبنەوە، تەرمەکە پاش بەرێ کردنێکی بەکۆمەڵ لە گۆڕستانی شار دەشێرنەوە و دەچنەوە، بەڵام دایکی خەیری لەناو کۆمەڵ نابینرێ.

بۆ سبەی، دایکی خەیری لەسەر گۆڕی کوڕەکەیدا دەبیننەوە، سەری خستووەتە سەر گۆڕەکە و مردووە.

ئەو دەمەی بڕیارمان دا خۆمان بەدەست عێراقەوە بدەین خوا حافیزیمان لە مەلا مستەفا کرد، ئەمە دواجار بوو مەلا مستەفا ببینم.

واپێ دەچوو بەم بڕیارەی ئێمە دڵخۆش بێ، وەک بڵێی بارێک لەسەر شانی لا دەکەوت.

ئێمە سنووروانانی عێراقمان ئاگەدار کرد کەوا ئامادەی خۆ بەدەستەوەدانین، بەمەرجێ ئێمە بەپەنابەری سیاسی وەربگرن. ئەوان برووسکەیەکیان بەئیمزای سالح جەبر - سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی عێراق بەئێمە پێشان دا، تیایدا گوتبووی دەوڵەتی عێراق بەگوێرەی یاسای ناووڵاتان لەبارەی پەنابەرانی سیاسییەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەفسەرانی سوپای ئێراندا دەکات.

پێشتر تفەنگەکانی خۆمان بەبارزانییەکان دابوو. بەترس و هیواوە لە سنوور ئاوا بووین و چووینە ناو چادری سنووروانانی عێراقی.

سنووروانان سەرەتا هەڵسوکەوتێکی دۆستانەیان لەگەڵدا کردین. لە یەکەمین بنکەی مۆڵبوونی هێزگەلی عێراق ئێمەیان بەبەرپرسی سنوور یان بەقسەی خۆیان «ئامیری هێزگەلی پۆلیس - امر قوات الشرطة»ی عێراق ناساند کە ناوی عەمید حیجازی بوو. ئەم پیاوە پاشان کودەتایەکی ناسەرکەوتووی لەهەمبەر «عەبدولئیلا»دا کرد و لە سێدارە درا. عەمید حیجازی بەتورکیی ئەستەمبۆڵی لەگەڵ ئێمە دەدووا و دەیگوت:

- ئەفسەرانی رەسمی نەترسێن، ئێمە بەهیچ جۆر ئەوان بەدەستەوە نادەین و بەپێی یاسای ناووڵاتان هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکەین.

هەتا ئەم جێگەیە پۆلیسی عێراقی هەڤاڵەتیی ئێمەیان کرد، لەوێوە پاش دە دوازدە سەعات پشوو، ئێمەیان بەچەکدارانی ناوچەیی راسپارد کە قۆناغ بەقۆناغ لەگەڵمان دەهاتن. ئەوان بەو ناوەی ئێمە سەرپێچیکەری دژ بەدەوڵەتین بەوپەڕی تیژییەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکردین هەتا ئەوەی لە شارۆکەی دیانە ئێمەیان هەواڵەی سوپا کرد.

لێرەشەوە ئێمەیان بۆ کەرکووک برد. لە کەرکووک سەرەڕای بەرگری و پێشبڕیی گەرماوگەرممان، دەستی ئێمەیان لە دەسبێن گرت. مفەوەزێکی لاو ئەرکی گەیاندنی ئێمەی بەبەغدا لە ئەستۆدا بوو. ئەم مفەوەزە نۆلاوێکی بەکەشوفش بوو و زۆر بەم ئەرکەی خۆیەوە پۆزی لێ دەدا. لە وەڵامی پێشبڕیی ئێمەدا دەیگوت:

- کەلەپچە ئابڕووی حکوومەتی عێراقە. وەزیرەکانی رەشید عالی گەیلانی هەموویان بەم دەسبێنەوە چوونە بەرپێی دار و دەبێ ئێوە شاناز بن لەم ئابڕووەدا پشکێکتان بەرکەوتووە.

لە کەرکووک ئێمەیان لە شەمەندەفەر سوار کرد و بۆ «مەرکەز سەرا» لە بەغدا بەرێ کراین. «مەرکەز سەرا» سێ لابیانی زۆر گەورەی دەرگە ئاسنی هەبوو، هەرسێکیان پڕاوپڕ بوون لە مرۆڤی چەپەڵ: دز، چەقۆکێش، قاچاغچی، هەتیوباز و ئەم جۆرە کەسە پاشکەوتوانەی کۆمەڵگە. لە هەریەکێک لەم لابیانانەدا پتر لە پەنجا شێست کەسی لەم جۆرە مرۆڤانەیان خزاندبووە ژوور کە حەزیان دەکرد بزانن ئێمە چ جۆرە گیانلەبەرێکین.

چەند ئافرەتێکی داوێن پیسیش لە گۆشەیەکی حەوشەکە دانیشتبوون، جنێوی زۆر پیسیان لەگەڵ بەرپرسانی گرتووخانەدا دەگۆڕییەوە. یەکێک لەو ئافرەتانە کرماشانی بوو و لەبەرئەوەی جلوبەرگی ئێمە کوردی بوو، رووی لە ئێمە کرد، پرسیی:

- ئێوەیان لە کام کارخانە گرتووە؟

بەستەزمانە وایدەزانی هەر کەسێکی رێی بەگرتووخانە بکەوێ دەبێ یەکێک بێ لە کریارانی ئەم جۆرە کاولگانە. درێژەی دایێ گوتی:

- بۆ نەهاتن بۆ لای من هەتا تووش نەبن؟

یەکێک لە هاوەڵانمان «جەواد ئەرتەشیار» کرماشانی بوو، چەند جنێوێکی پێی دا بۆ ئەوەی خۆی رێکوپێک بکات.

ژنەکە لە وەڵامدا گوتی:

- باشە بۆ زویر بووی، هەموو پیاوان ئەم کارە دەکەن، تۆش یەکێکی لەوان. بۆچی ئێستە بەردەنوێژ خاوێن دەکەیەوە؟

هەرچۆن بێ یەکێک لە لابیانەکانیان بەتاڵ کرد. گرتووەکانیان پەستایە دوو لابیانەکەی تر و ئێمەشیان لەوەکەی تردا بەکەیس کرد. لەم لابیانەدا سێ چوار رایەخی داوداری پیس رایەخرابوون، هەوای لابیانەکە هێندە پیس و گەنی بوو بەقسەی یەکێک لە هاوەڵەکانمان دەبوو بەسیکارد بیبڕی. دوو تەنەکە بۆ پیسایی گرتووەکان لە گۆشەیەکی لابیانەکە داندرابوون. ئیتر بەو ئاوایە یەکەمین مێواندارییی رەسمیی میریی عێراق بۆ ئێمە لێرەوە دەستی پێ کرد.

لێرە، ئێمە بینەری هەندێ بوێری بووین کە لە زەبروزەنگەوە سەرچاوەیان هەڵدەگرت. وا دەهاتە بەرچاو ئەم دوو خەسڵەتە پێوەندیی هۆک و بەرهۆکیان بەیەکەوە هەبێ. ئایا بوێریی گیراوەکان بووبوو بەهۆک بۆ تیژیی بەرپرسانی گرتووخانە یان ئەوەتا تیژیی بەرپرسانی گرتووخانە بووبوو بەمایەی بەدیهاتنی بوێری لە گرتووەکاندا؟ بێگومان زیاتر وا تێبینی دەکرا تیژیی بەرپرسانی گرتووخانە لە بوێریی گرتووەکانەوە هاتبێ.

هەر ئەو ڕۆژانەی ئێمە لە مەرکەز سەرا بووین یەک دوو جار حەوت هەشت قوتابیی زانکۆیان هێنا. ئەو سەردەمە هەموو دژەکانیان بەناوی «شیوعی»یەوە سەرکوت دەکرد، وەک هەموو شوێنانی دنیا، ئەو قوتابیانە هەر بەم بیانووەوە دەگیران. جارێکیان ئەو قوتابیانە لە بەرامبەر بێ تۆرەیی و سووکایەتی پێ کردنی پاسەواناندا دەستیان هەڵهێنا. گەیشتە رادەی تێکسرەواندن و من ئاگام لێ بوو پاسەوانان بەچ تیژی و بێ بەزەییەک پەلاماری ئەوانیان دا. لە کاتێکدا قوتابیانی زانکۆ دەست بەستراوە بوون ئەوان پەلاماریان دان و تەنیا ئەو کاتە دەستیان کێشایەوە کە خۆیان ماندوو بوون. بەڵام هەرچەندێکی تیژیی پاسەوانان پتر دەبوو، بوێری و ئازایەتیی قوتابیانیش پتر پەرەی دەسەند. پاشی دارکاری، دەستی ئەوانیان کردەوە بەڵام هەر بەبەرەڵلابوونی دەستیان، یەکێک لە قوتابیانی زانکۆ کتوپڕ وەک شێر نەڕاندی و دوو زللەی بەبناگوێی یەکێک لە پاسەواناندا کێشا. ئازایەتیی خەڵکی عێراقم لە مەرکەز سەرادا لە یەک دوو جار زیاتر نەبینی بەڵام پاشان نموونەی سەرنج راکێشم لە ئازایەتی و دەسوەکەری و بوێریی ئەوان بینی، بینیم چۆن هەتا دەمی مردن بەرەنگار دەبنەوە و دەست لە بەرگری هەڵناگرن.

یەکێک لە سیمبۆلەکانی تیژیی پۆلیسی عێراق زنجیرێکە بەدەست و پێوە پەرچ دەکرێتەوە. لەبەر دەرگەی هەر گرتووخانەیەکدا ئاسنگرێک هەیە، هەر کەسێکی حوکم بدرێ و بچێتە ژوور وەک چۆن دەچێتە وێنەگرتنەوەی پەنجە ئاوها دەچێتە لای ئاسنگرەکە. بەزنجیر ژمارەیەک لە پێی دەدەن و پەرچی دەکەنەوە. تەنانەت عەلی ئەسغەریش کە یەکێک بوو لە هەڤاڵانی ئێمە و بەناوی سنووربەزێنییەوە بۆ ماوەی مانگێک گیرابوو، لەم دەستاندەیە بێ بەش نەبووبوو لە کاتێکدا ئەو بریندار بووبوو و لە سنووردا خۆی بەدەستەوە دابوو.

ئەو دەیگێڕایەوە کاتێ بردوویانە بۆ گرتووخانەی ناوەندیی عێراق، نێزیکەی سێ هەزار کەس لەوێ گیرابوون کە هەر هەموویان زنجیریان بەپێوەبوو. ئەو زنجیرانە لە رووی ناسکی

و پانی و کورتی و درێژییەوە لە یەکتر جیاواز بوون و بەگوێرەی گرانی و سووکیی تاوانەکە گونجـا بوون. زنجـیری برێکیـان بەڕادەیەک درێژ بوو لە دەوری «مل»یان دەئالاند بەڵام ئەوانی کورت بوون داوێکیان لە ناوەندی هەڵدەکێشا بۆ ئەوەی لە کاتی ڕۆیشتن لە زەوی نەخشێن. زنجیرە درێژەکان سەرەڕای پێ، بەدەستیشەوە پەرچ دەکران.

دووای چەند ڕۆژێک پاش تۆژینەوەیەکی کورت لە «مەرکەز سەرا»، ئێمەیان بردە گرتووخانەی ئەبوو غرێب. ئەبوو غرێب گوندێکە لە نێزیکی بەغدا پێشتر مۆڵگە بووبوو و لەو سەردەمەدا کرابوو بەگرتووخانەیەک بەناوی «السجن الملکی». پاسەوانانی ئەم گرتووخانەیە هەموویان سەر بەگاردی پاشایەتیی عێراق بوون.

پێشەکی هەرسێک لە ئێمەیان لە لابیانێک پەستاوت و هەریەکەی دوو بەتانیی دڕادڕاویان پێ داین و دەرگەیان لەسەرمان پێوە دا. هەر ڕۆژەی ئێمەیان نیو سەعاتێک دەبردە دەرەوە، بەڵام پاش پێشبڕیی یەک لەدوای یەک بارەکە چاکتر بوو: دەرگەی لابیانەکانیان تەنیا بەشەو کلیل دەدا، دەمانتوانی بچینە کن یەکتر و لە داڵانەکە پیاسە بکەین و خواردن بۆ خۆمان لێ بنێین.

بۆ هەر یەکێک لە ئێمە ڕۆژانە ۳۰۰ فلس «نێزیکەی شێست ڕیاڵ»یان بۆ خەرجی تەرخان کردبوو. سەرەتا خۆیان خواردنیان بۆ دەهێناین بەڵام پاشان دوای چەندین ڕکابەریمان لەبارەی چۆنیەتیی خواردنەکە، خەرجییەکەیان بەپارەی پێشەکی پێ دەداین و لەمە بەدواوە خۆمان خواردنمان بۆ خۆمان لێ دەنا.

هەرچۆن بێ پاش یەک دوو مانگێ باری ئێمە گەلێ چێتر بوو، ڕایەخیان پێ داین بەڵام هەڵسوکەوتی پاسەوانان جیاوازیی تێ نەکەوت و وەک پێشان بەشەو دەرگەی لابیانەکەی ئێمەیان دادەخست و گوێیان بەڕکابەریمان نەدەدا.

چابوونی بارودۆخی ئێمە هەر تەنیا لە سۆنگەی فەرمانی بەرپرسانی بەرزەوە نەبوو بگرە ئەو پارەیەی بەناوەی خەرجی بەئێمەیان دەدا لەم چابوونەدا پتر کارا بوو، لەبەرئەوەی بەو پارەیەی گلمان دەدایەوە زاری «عەریف حوسێن»ی بەرپرسی پاسەوان و پاسەوانانی ترمان گرێ دەدا. لە ئەنجامی ئەم کێشانە و پێوانەیەوە باری ئێمە ڕۆژ بەڕۆژ سووکتر دەبوو.

بەرتیل و بەرتیلخۆری سەرتاپێی پەیکەری داوودەزگای میریی عێراقی پیس کردبوو، هەموو کارێک بەپارە جێبەجێ دەکرا. پاشی شەش مانگ هەلیان پێ داین نامە بۆ ماڵەوەمان بنووسین. ڕۆژنامە و کتێب تەنانەت بەڵاوۆکی حزبیش دەگەیشتنە دەستمان.

سەرلەبەری ئەو نامە و چاپکراوانەی لە ئێرانەوە بۆمان دەهاتن پێش ئەوەی بچن بۆ داوودەزگای ئاگەداری، دەهاتن بۆ لای خۆمان. لە سانسۆرمان دەدان و دەماندانەوە دەستی عەریف حوسێن هەتا لەرووی ڕواڵەتەوە بیانبات بۆ دەزگای ئاگەداری کە پاش ماوەیەک لە گیربوون و سەرانسۆیی، دەگەڕایەوە دوا. شایەنی باسە هەندێ لەو نامانەی خۆمان بەبێ زیانمان دەزانین و، ڕەوانەی سانسۆرمان دەکردن، دەزگای ئاگەداری گیری دەکردن.

من دوای پێوەندی لەگەڵ ماڵەوە، زانیم ژن و منداڵەکەم لە ئازربایجانەوە چوونەتە سۆڤیەت. ئەو دەمەی تەورێزم بەجێ هێشت ژنەکەم و هەردوو منداڵە بچووکەکەم بەساغی لە تەورێز بوون کە لەگەڵ تەواوی ماڵەکانی تر بۆ سۆڤیەت کۆچیان کردبوو. ئێستە پاش ڕابوردنی ساڵێک، لەم بابەتە ئاگەدار دەبوومەوە. نەبوونی ئاگەداریم لەم ئازیزە بێوەرییانە لە ماوەی ساڵێکی تەواودا، ئەو کاتەی نامەی ماڵەوەم پێ گەیشت بەوێنەی ئاگر دەروونی منی سووتاند. دایکی ژنەکەم «خوا لێی خۆش بێ» زۆر ئازا بوو، دەرگەی کۆنسولیەتی سۆڤیەتی لە «مەشەد» لە گرێژنە دەرهێنابوو، هێندەی دادوبێداد کردبوو هەتا دواجار توانیبووی نامەیەکی لە کچەکەیەوە پێ بگات و پاشانیش هەلی بەدیهێنابوو بەردەوام نامەی بۆ بنووسێ و هەمان ئەو نامانە بۆ من بنێرێتە عێراق. بەم ئاوایە توانیم تەنانەت ڕاستەوخۆش نامە بۆ ژنەکەم بنووسم.

پاشان توانیمان لەگەڵ سەرانسۆکەری دەزگای ئاگەداری ڕێک بکەوین. ئێمە دوای ماوەیەک مۆڵەتمان درا ناوبەناوێ بچینە مەڵبەندی پۆلیسی عێراق لە بەغدا. لەوێ پیاوێک بەرپرسی کاروبار بوو، هەر بەدیمانەی ئێمە دۆلابی مێزەکەی ئاوەڵا دەکرد، نرخی هەر داوایەکیشی برێتی بوو لە یەک دیناری عێراقی.

پاشی ساڵ و نیوێک جارێکی تر ئێمەیان گواستەوە بۆ بەغدا کە پاشان بەسەرهاتەکەی دەگێڕمەوە. لەبەرئەوەی توانای بەرتیل هاتە پێشەوە هەلم پێ بدەن با ئەم بەشە تەواو بکەم. لە سامەڕا، ناوبەناوێ بەبیانووی جۆربەجۆر، سەردانی نۆشداری پسپۆڕ یان نەخۆشخانەوە و هتد...، یەکێک لە ئێمەیان دەبرد بۆ «مەرکەز سەرا» بۆ لای هەمان پیاو، بێ هیچ پرسیار و وەڵامێک یەک دیناری بەرتیلمان هەڵدەدایە ناو دۆلابەکەی و پاشان داوایەکانمان دەخستەڕوو:

- جاری داهاتوو بەڕێز «زێربەخت» داوا بکە، ئەمە دینارەکەی ئەو. چەند ڕۆژێک بۆ چارەسەری نەخۆشی لێرە دەبم دەمەوێ بچم بۆ بازێڕ، ئەمەش دینارێک. ئەو کتێب و

نامانەی لە سانسۆر گیراون دەمەێ بیانبینم، ئەمەش دینارێک...

ئیتر بەم ئاوایە هەموو داوایەکانمان پەسند دەکران.

سالانی ١٩٤٦ - ٤٧ سالانی چلەپۆپەی راپەرینی ئازادیخوازانەی ولاتانی نیوە کۆلۆنی بوو، رێبەری ئازادیخوازانی عێراق حزبە دیموکراتییەکان بوون لەسەرووی هەموویشیانەوە حزبی شیوعیی عێراق بەرێبەرایەتیی یوسف سەلمان یوسف «فەهد». ئەم حزبە چاپەمەنیی شاراوە و ئاشکرای جۆراوجۆری هەبوو. «القاعدة» ئۆرگانی شاراوە و «الأساس» ئۆرگانی ئاشکرای رای حزب بوو کە بەیارمەتیی «دهن واشر»ەوە(١٦) دەگەیشتە دەستێ ئێمە. رۆژ نەبوو لە رکابەریی پەیمانی کۆلۆنیالیستانەی عێراق و ئینگلیز، خۆپێشاندان و رووبەڕووبوونەوە لە نێوان جەماوەر و پۆلیسدا روو نەدات. هەتا دواجار نووری سەعید بەنوێنەرایەتیی دەولەتی عێراق چوو بۆ بەریتانیا و پەیمانێکی نوێی لە نێوان نووری سەعید و بۆین - ی وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەی بەریتانیا لە لەنگەرگەی «پۆرتسمۆس» مۆر کرد کە هەر بەو ناوەوە ناوبانگی دەرکرد. جەماوەر ئەو پەیمانەشیان بەزنجیرێکی نوێی کۆلۆنیالیزم دادەنا کە دەست و پێی گەلی عێراقی دەبەستەوە. نەک تەنێ رکابەری و خۆپێشاندان لە کورتیی نەدا بگرە هەر پەرەی گرت هەتا ئەوەی کابینەی سالح جەبر کەوت و دەولەتێکی بەرواڵەت چاکتر بەسەرۆکایەتیی «موزاحیم پاچەچی» پێک هات. بزووتنەوەی سەرخۆبوون بەرەو پێشتر چوو، بەلام نەپالەپەستۆی خەلک کەمی کرد و نەمانگرتن و خۆپێشاندان، وێڕای ئەمە هەموو رۆژ برێکی تری خەلک دەگەیشتنە گرتووخانە.

ئەو دەمە، سالی ١٩٤٨ رووداوی فەلەستین و پێکهاتنی حکوومەتی ئیسرائیل هات بەپیر دەستەی دەسەلاتدارانی عێراقەوە. هاواری عەرەب لە سەرتاپێی نیوە دوورگەی عەرەبیدا بەرز بووەوە. کۆنفرانس و، دووای ئەوە کۆوەبوون و فەوجی خۆبەختکەر بۆ چوونە فەلەستین و شەڕی جوولەکان، یەک لە دوای یەک پێک دەهاتن. ئاساییییە لەم هەوا گەرموگوڕەدا یەکەمین خۆبەختکەرانی میریگەلی کۆنەپەرستی عەرەب برێتی بن لە ئازادیخوازان و لە سەروویشیانەوە حزبە پێشکەوتنخوازەکان. لەم لا هەتا ئەو لای عێراق حکوومەتی عەسکەری راگەیەندرا و راوە ئازادیخواز و راوە بەرهەلستکارانی دژ بەئیمپریالیزم بەشێوەیەکی گرینگ دەستی پێ کرد.

(١٦) «دهن واشر» واتە بەرتیل - نووسەر.

تاکە چەکێکی حکوومەتە کۆلۆنیالیستەکان و نۆکەرانی بیانی برێتی بوو لە ئازار و پاشانیش کوشتن. بەرپرسی رێکخستنەکانی حزبی شیوعیی عێراق، «کەمال سەیف» بەناوی خوازراوەی «یوسف کامل»ەوە گیرا و لەبن لێدان و کوتان تەواوی پەیکەری حزبی ئاشکرا کرد، لەناو ئەوانیش یووسف سەلمان «فەهد» ئاشکرا بوو.

سەرجەم گرتووخانەکانی بەغدا و لەگەڵ ئەوانیشدا گرتووخانەی «ئەبوو غرێب» لێوانلێو پڕ بوون لە مرۆڤ، هەندێک لەوان لە ژێر دارکاریدا شەهید بوون. یووسف سەلمان «فەهد»، زەکی بەسیم، ناجی شەمیل و حوسێن شەبیبی لە سەرکردەکانی حزب بوون و فەرمانی هەڵواسرانیان بۆ دەرچوو. ئەوانیتر رەوانی گرتووخانەی «نوگرە سەلمان» کران کە بەمەترسیترین گرتووخانەی عێراق بوو و کەوتبووە پەرگەی بیاوانی گەرم و هیشکی عەرەبستان.

ئێمە لە گرتووخانەی «ئەبوو غرێب» هەلی کاری بەئازادیمان پتر بۆ کرایەوە. ئەو گرتووانەی دەهاتن بۆ کۆریدۆرەکەی ئێمە زۆربەیان بیست و چوار سەعاتە برسی و تینوو بوون. سەرەڕای ئەمە، ئەوان لە قۆناغی لێتۆژینەوەدا بوون و دەیانویست سەرپێهاتی هاوڕێیانی تریان بزانن و بەپرس و راوێژی یەکتر بتوانن رێبازگەی تۆژینەوەی خۆیان دیاری بکەن. پێویستیان بەهاوکاریی ئێمە هەبوو، ئێمەش بەبۆنەی هاو کۆت و بەندییەوە دەبوایە بەدەم هاواریانەوە بچین.

کاردارانی گرتووخانە لەناکاو هەستیان کرد رادەی خواردنی ئێمە زۆر زیاد بووە. دەبوو ئێمە بۆ هەر یەکێکیان بەلایەنی کەمەوە ژەمێک خواردن بەهانا بگەینین. ژمارەی ئەوانیش نێزیکەی سەت کەس دەبوو. هەر ئەمەش بوو بەمایەی ئەوەی بەرپرسان بەچاوی پڕ لە رکەوە سەرنج لە ئێمە بدەن و، یەکێکمان لە کاتی جێبەجێ کردنی «تاوان»دا بگرن. هەر هێندە بوو نەیانتوانی بەڵگەی تاوان لە ئەوکی گیراو دەربهێننەوە، بەڵام ئێمەیان بێ وچان بۆ سامەڕا دوور خستەوە. چۆنیەتیی تۆژینەوەی گیراوێکمان گەیاندبووە دەستی هاوڕێیەکەی، ئەویش هەر لەگەڵ پەلاماری پاسەواناندا هاوێشتیە زاری و ئاوای کرد.

لەو ماوەیەی ئێمە لە «ئەبوو غرێب» بووین، بۆ روونکردنەوەی چارەنووسی خۆمان لەیەکبینە پێشنووسمان دەدا بەبەرپرسانی میریی عێراق و، دەمانووسی: ئێوە بەناوی پەنابەری سیاسی ئێمەتان وەرگرتووە، مافی ئەوەتان نییە لە گرتووخانەمان رابگرن. یان دەبێ مافی جێ نیشتەبوونمان لە عێراق پێ بدەن یان ئەوەتا هەمان بدەن لە عێراق

دەربچین.

جارێکیان لەگەڵمان دانیشتن و بڕیار درا سێ وڵات بۆ نیشتەجێ بوونمان دەست نیشان بکەین بۆ ئەوەی میریی عێراق بەباڵیۆزخانەی ئەو سێ وڵاتەوە پێوەندی بکات و هەر یەکێکیان وەری گرتین بۆ ئەوێندەرمان بنێرن، بێگومان ئەمەش ئەنجامی نەبوو و وەڵامێکیان پێمان نەدایەوە. لە کاتی برەوستاندنی راپەڕیندا ویستمان پێوەندی بەرۆژنامەگەلی ئازادەوە بکەین و هەلومەرجی خۆمان بخەینە بەرگوێی خەڵکی عێراق و هاوکارییان لێ بخوازین. توانیمان پێوەندی بەرۆژنامەی «الأساس»ی ئۆرگانی نیوە ئاشکرای لاوانی دیموکراتەوە بکەین، کاردارانی پێوەندییەکە سەربازانی «مکلف» بوون، لەگەڵیان دەدواین و هەندێک جاریش پارەمان پێ دەدان. رۆژنامەی «العصفور» جێگرەوەی ئاشکرای «الأساس» بوو، نامەکەی ئێمەی بڵاو کردەوە. دووای چاپبوونی ئەو نامەیە بوو کە بۆ سەر گەرم کردنمان پێوەندییان پێوە کردین.

لە سامەڕاماڵێکی بچووکیان بۆ گرتین و ناویان نا گرتووخانە، چەند پۆلیسێکیش پاسەوانی ئێمە بوون. ئێمە لەوێ دە کەس بووین، هاوەڵە بریندارەکەمان دوای سارێژبوونەوەی پێ پل و بەسەربردنی مانگێک لە گرتووخانە، گەیشتەوە ئێمە. ماوەی نێزیکەی ساڵ و نیوێکیش لە سامەڕا ماینەوە. لەوێش دەستمان لە خەبات بۆ روونکردنەوەی چارەنووسی خۆمان هەڵنەگرت. هەوڵمان دەدا هەتا زووە میریی عێراق چارەنووسی ئێمە روون بکاتەوە. جارێکیان مانمان لە خواردن گرت، دەمانویست ئازاد بکرێین. دەمانگوت لەبەرئەوەی ئێمە پەنابەری سیاسیین ئێوە مافی ئەوەتان نییە بمانگرن. یان شوێنێک بۆ نیشتەجێ بوونمان دیاری بکەن یان ئەوەتا مۆڵەتمان پێ بدەن بۆ خۆمان لە عێراق دەربکەوین.

ئەم مانگرتنەی ئێمە لەگەڵ تیرۆرکردنی شا لە ١٥ ڕێبەندان ١٣٢٧دا هاوکات بوو. هەلومەرجەکەمان بۆ درێژەپێدانی مانگرتن بەگونجاو نەزانی، بەڕواڵەت قسەی سەرۆکی گرتووخانەمان رەچاو کرد و دەستمان لە مان لە خواردن گرتن کێشایەوە.

مانگرتنی ئێمە لە خواردن سێ ڕۆژ درێژەی کێشا و بەگوێرەی ئەو قسانەی بەئێمەیان دا مانگرتنەکەمان شکاند. هیچ ئەنجامێکیشمان لەو گوتە و بەڵێنانە بەدەست نەکەوت. تەنیا بڕیاریان دا عەلی ئەسغەری بەرەڵلا بکەن لەبەرئەوەی ئەو چووبووە دادگە، مانگێک گرتنی بۆ بڕابووەوە و ماوەکەشی تەواو کردبوو، بەڵام سەرۆکی گرتووخانە بەپێچەوانە

جوولاَیەوە، لەبەرئەوەی گوتی بارودۆخی هەمووان وەک یەک وایە، یان دەبێ هەمووان لە گرتووخانە بمێنین یان هەمووان ئازاد ببین.

ئەو ئێرانییانەی تەبای ئێمە هاتبوون بۆ عێراق، جگە لە بارزانییەکان کە عێراقی بوون هەموویان بەئازادی دەژیان. شوێنی نیشتەجێ بوونیان بۆ دیاری کردبوون و بۆ خەرجییش مووچەی مانگانەیان وەردەگرت. تەنیا ئێمە دە کەس گیرابووین. بارودۆخیشمان وەکو یەک نەبوو. شەشمان ئەفسەری رەسمیی سوپا بووین بەلاَم چوارەکەی تر تەنیا ئەفسەری سوپای ئازربایجان بوون، ئەمان بیریان دەکردەوە ئەگەربێو خۆیان بەدەست ئێرانەوە بدەن ئەوا مەترسییەک هەڕەشەیان لێ ناکات و بەسوودوەرگری لە یاسای لێبووردنی گشتیی ئازربایجان ئازاد دەبن. بۆیەش ڕێگەی خۆیان لە ئێمە جیاواز کردەوە و بەردەوام داوایان دەکرد بەدەست ئێرانەوە بدرێن. بێگومان ئێمەش رکابەریی بڕیاری ئەوانمان نەدەکرد.

دواجار میریی عێراق ئەو چوار کەسەی لە ئێمە جیاواز کردەوە و بۆ بەغدای بردن. ئێمەشیان، ئەم شەش کەسە بۆ خانوویێکی گەورەتر و خۆشتر گواستەوە.

پاش ماوەیەک دیسان مانمان لە خواردن گرتەوە، داوای ئازادییەکی زیاترمان دەکرد هەتا ئەوەی دواجار ملیان دا بۆ ئەوەی هەر ڕۆژەی سێ کەس لە ئێمە تەبای پاسەوانێک بەناو شاردا بگەڕێن. سامەڕاش جگە لە هەندێ شوێنی پیرۆز و شوێنەواری کۆن و کاولگەکانی کۆشکی «موعتەسەم بیللا»ی خەلیفەی عەبباسی، جێگەیەکی تری نییە.

لە ماوەی ئەو ساڵ و نیوەی لە سامەڕا بووین بەرپرسانی دوو وڵاتی عێراق و ئێران دیمانەی یەکتریان دەکرد و بەدزییەوە پەیمانی بەغدایان ڕێک دەدایەوە. لە ڕێکدانەوەی ئەو پەیمانەدا «عەبدولئیلا»ی جێگری سەرۆک وەزیرانی عێراق، دوا دوای ساڵی ١٣٢٨ گەشتی ئێرانی کرد. دوای زنجیرەیەک هاتوچۆ، میریی عێراق بەڵێنی دا ئێمە بداتەوە بەئێران و میریی ئێرانیش سێ مرۆڤ لە ئەفسەرانی بارزانیی عێراق کە پەنایان بردبووە بەر ئێران، بداتەوە بەعێراق. بەڕواڵەت بۆ پاراستنی پاکنیازیی سیاسی، میریی ئێران ئەوەی پەسند کردبوو ئێمە هەڵنەواسێ.

دوا بەدوای ئەم ڕووداوانە ئێمەیان ئاگەدار کردەوە هەتا بۆ چوونەوە ئێران خۆمان ساز بدەین. ئێمە بەتوندی بەرتەکمان دایەوە و کەوتینە بەرگری. بەلاَم سەرۆکی شارەوانیی سامەڕا پێوەندیی دۆستایەتیی لەگەڵ ئێمەدا هەبوو دەیگوت:

- بەرگری بێ سوودە...

دواجار بۆ چارەسەردۆزی بۆ ئەم گیروگرفتە لەگەڵ قایمقامی سامەڕادا کەوتینە وتوویژ. لەلایەکی ترەوە خاوەنی ئەو ماڵەی ئێمەی تێدا نیشتەجێ بووین زۆر بۆ ئێمە تێ کۆشا. ئەو سەرۆکی یەکێک لە خێڵە عەرەبەکانی سامەڕا بوو و بۆ ئێمە زۆر پیاوانە بوو. تەنانەت بۆ ماڵی خۆی چەند جار ئێمەی بانگهێشتن کرد و هەر لە ڕێی ئەوەوە کۆمەڵێک لە پیاوە ئاینییەکانی سامەڕامان ناسی و لە جڤاتی دەرس و وتارەکانیان ئامادە بووین. ئەو، لیستەیەکی بەئیمزای خۆی و چەندان گەورەپیاوی ئاینیی «سوننە» مەزەبی سامەڕا ڕێک دابووەوە و تیایدا ئامادەییی خۆی پیشان دابوو هەر دەستەبەرێکی میریی عێراق دەیەوێ لە برێتیی بەردان و بەدەستەوەنەدانی ئێمە بەئێران، ئەوان بیدەن. تەنیا کارێکی قایمقامی سامەڕا کردی ئەوەبوو لیستەکەی بۆ وەزیری ناوەخۆی عێراق ڕەوانە کرد. بەڵام بڕیارەکە یەکجارەکی بوو. لە دواییدا، سەرەتای مانگی ئاخەلێوەی ۱۳۲۹ ئێمەیان هەنارده بنکەی فێرکاریی پۆلیسی بەغدا. چوار هاوەڵەکەی خۆیشمان هەر لەوێ بینییەوە، سەرلەنوێ بووینەوە بە دە کەس. بەهاوەڵانی خۆمان گوت ئێمە بڕیاری بەرگری کردنمان داوە و ئامادە نیین بدرێینەوە بەئێران. ئەوانیش هاوبۆچوونی ئێمە بوون. سەرۆکی شارەوانیی بەغدا هاتە دیمانەمان و گوتی لەبەرئەوەی میری بڕیارەکەی دەرکردووە ئیتر هیچ کارێک داد نادات. ئێمەش بە«نەرێ» وەڵاممان دایەوە.

بۆ سبەی سەرۆکی گشتیی شارەوانیی عێراق هاتە دیمانەمان و هەر ئەو قسانەی دووبارە کردەوە، هەروەها دڵنیای کردین کەوا بەگوێرەی ئەو ڕێکەوتنەی لەگەڵ ئێراندا کراوە، ئێمە بەدارەوە ناکرێین. بەردەوام بەزمانی تورکیی ئەستەمبوڵی دەیگوت:

– بەدارەوەکردن نییە.

بەردەوام دڵنیای دەکردین و داوای دەکرد بەرگری نەکەین. وەڵامی ئێمەش هەر بەنەرێ بوو و میریی عێراقمان بەبەڵێن شکێن و بەزاندنی یاسا ناوولاتییەکان گوناحبار دەکرد.

دواجار، ڕۆژی پاشتر ڕۆژی هەینی بوو و کۆلێجی پۆلیس داخرابوو، سەرەتا بەخاپاندن و بەناوی وتوویژەوە، ئێمەیان لە یەکتر جیاواز کردەوە و پاشان بەزۆردارەکی هەڵمەتیان هێنایە سەرمان و هەموومانیان پاش دارکارییەکی تێروتەسەل زنجیرپێچ کرد و فڕەیان داینە ناو دوو پیکاب و بەڕووکاری خانەقیندا بەڕێیان خستین. سەرتاپێمان خوێناوی بووبوو. مەلاژووم بەهۆی پاڵەپەستۆی دەسبێنەوە بەخەستی بریندار بووبوو و خوێنێکی زۆری لێ بەربووبوو. ئەو دەمەی من گیرام، بۆ ئاگەدارکردنەوەی هاوەڵانم کەوتمە هاوار

هاوار، پۆلیسەکان بۆ ئەوەی دەنگم کپ بکەن دەستکی دەسبێنەکیان پەستایە ناو دەمم و هێندەشیان پاڵ دا بەجۆرێک تەواو دەنگبڕ بووم: هەروەها ئەو دەمەی کراینە ناو ئۆتۆمۆبێل، کاردارانی زۆر ئازای عێراق لە کاتژمێر و قەڵەمی مەرەکەب و پارەی گیرفانمان بێ بەش نەبوون و دەتوانم بڵێم ئێمەیان هەموو تالان و برۆ کرد. ئەو دەمەی کراینە ناو ئۆتۆمۆبێل، تێ گەیشتین کەس لە ئێمە بەساغی دەربازی نەبووە، هەموومان لەسەر هەتا پێمان خوێناوی بوو.

لەبەرئەوەی دەمانزانی بەهەر ئاوایەکی بێ هەر دەمانبەن، پێشتر نێزیکەی ۳۰۰ پەڕە راگەیاندنی دەستنووسمان ئامادە کردبوو. ئێمە لەو راگەیاندنەدا خۆمان بەخەڵکی عێراق ناساندبوو و، هەڵسوکەوتی نامێرانە و یاسابەزێنیی میری عێراقمان روون کردبووەوە.

لەناو پیکابەکەدا هەرچەندە دەست و پێ گرێدراو بووین بەڵام راگەیاندنەکانمان لە گیرفانی یەکتر دەرهێنا و لە رێگەوبانی ناو بەغدا و خانەقیندا فرێمان دان.

لە خانەقین، پاش سەعاتێک لە گەیشتنمان بەگرتووخانەی شار، کۆنسولی ئێران لە خانەقین مرۆڤێک بوو بەناوی «ئیعتیسام زادە» بەهاوەڵەتیی قایمقامی خانەقین هاتە دیمانەمان. بەگەرماوگەرمی کەوتە هەواڵپرسیمان و گوتی کەوا بەبۆنەی هاونیشتمانییەوە شانازیمان پێوە دەکات. ئێمەی بە«شێری ناو قەفەز» ناوبرد و پاشان لەوەی ئێمە وا بەتیژی لە بارەی وڵاتی خۆمانەوە دەدووێین داخی خۆی پێشان دا. قسەی تریشی کرد پوختەکەی ئەمە بوو: ژیان و مردن لە ئاخی نیشتماندا هەرچۆن بێ چێترە لە هەندەران، بەڵام نابێ ئێمە لە داهاتوو بەترس بین لەبەرئەوەی میریی ئێران بەڵێنی داوە ئێمە لەدار نەدات. ماوەیەکی کورت لە گرتووخانە بەسەر دەبەین و پاشان بەردەبین. پاشان تکای کرد سەر و روومان رێک بخەینەوە بۆ ئەوەی شایەنی گەڕانەوە بەنیشتمان بین، ئیتر لەم جۆرە قسانە...

بۆ سبەی، لە یەکەمین ڕۆژانی نەورۆزی ساڵی ۱۳۲۹دا کەوتینە ناو سنووری خەسرەوی و دراین بەدەست چاودێریکەرانی سوپاییەوە. ئیتر بەم ئاوایە، دەق پاشی سێ ساڵ و سێ ڕۆژ مانەوە لە گرتووخانەکانی عێراق، سەرلەنوێ گەڕاینەوە بۆ ئێران.

چیرۆکی لێتۆژینەوە و لێکۆڵینەوە و دادگەی سوپایی و حوکمدرانمان چیرۆکێکە کەم هەتا کورتێک بەسەر گەلێک لە هاونیشتمانانی ئێمەدا هاتووە، ئەو جیاوازییەی لەگەڵدابێ ئێمە نەکەوتینە بەر ئەو لێدان و کوتانانەی لەم دواییانەدا برەویان ستاند،

لەبەرئەوەی داوایەکیان لە ئێمە نەدەخواست شاراوە و کەسنەزان بێ، یان ئەوەتا دان پێداهێنانی پێویست بێ. ئێمە مەرد و مەردانە راپەڕیبووین، پڕمان دابووە چەک و هەتا ئەو شوێنەی بۆمان لوا بوو لە دژی کاردارانی میری شەڕمان کردبوو.

من بەهەڵواسین و چواریش لە هاوەڵانم: مورتەزا، زێڕبەخت، ئەسغەر ئیحسانی، مەحموود تیوای و جەواد ئەرتەشیار بەگیرانی هەتا هەتایە و عەلی نەقی رەئیس دانا بە دە ساڵ گیران حوکم دران.

بۆ هەموومان هەریەکە و پلەیەکیان دابەزاند. چوارکەسە، گیران هەتا هەتایەکە بۆ دوازدە ساڵ و رەئیس دانا بۆ شەش ساڵ سووک کران کە تەواو دەقاودەق رایانکێشا و، منیش بەگیرانی هەتا هەتایە گیرام.

پاشی شازدە ساڵ و چەند مانگێک لە ئاخەلیۆەی ١٣٤٢دا بەربووم.

لەم هەمووە، تەنیا ئەم بیرەوەرییانە و لەشێکی نیوەمر و هیوایەک بەپاشەڕۆژ و کیژێکی تاک و تەنیام لە سۆڤیەت بۆ ماوەتەوە. یەکێک لە منداڵەکانم هەر لە سەرەتاگەی کۆچ و رەودا گیانی سپاردبوو و دایکیشیان پاش شازدە ساڵ چاوەڕوانی، دەق شەش مانگ پێش بەربوونی من بەشێرپەنجەی سیپەلک کۆچی دواییی کردبوو. یادی بەخێر.

ئەو کاتەی لە گرتووخانە دەرکەوتم زۆر تێ کۆشام بەڵکو کچەکەم بهێنمەوە بۆ ئێران، بۆم نەکرا. ئەو لە کاتی کۆچ کردنی لە ئێران کچۆڵەیەکی دوو ساڵانە بوو، بەبێ ویستی خۆی و لە داوێنی دایکیدا دوچاری ئەو کۆچە بووبوو، هیچ رابردووێکی کاری سیاسیی نەبوو بەڵام هێشتاش کەسێک گوێی بۆ ئەم قسانە شل نەکرد.

دواجار ساڵی ١٣٥٠ پاشی بیست و پێنج ساڵ لە دووری، توانیم لە بەرلینی رۆژهەڵاتدا پێی بگەم. کچۆڵەیەکی دوو ساڵانەم بەجێ هێشتبوو ئێستە ژنێکی بیست و حەوت ساڵیم لە پێش خۆمدا دەبینی: ژنەکەمم دەبینی پێنج ساڵ هەراشتر بووە. ئەو دەمەی دایکیم بەجێ هێڵا تەمەنی بیست و دوو ساڵی بوو.

لە هەموو تەمەنی خۆیدا لە نازی باوکانە بێ بەش بووبوو و ئەمڕۆ حەزی دەکرد وەک منداڵ بکەوێتە بەر لاواندنەوەی باوک. شەوان هەتا دەگەیشتە نیوەی شەو بەوشیاری دەمایەوە و دەیویست چیرۆکی بۆ بگێڕمەوە. دەیگوت:

- دەبێ بەڕادەی ئەو بیست و پێنج ساڵە چیرۆکم بۆ بڵێی.

چ چیرۆکێکی لەم بیرەوەرییانە چاکترم هەیە؟

پاش تەواو بوونی سەرپێهاتەکەم پرسیاری کرد:

- باوە پەشێمان نییت؟ دایە، بەستەزمانەی زۆری پەسنی تۆ دەدا و هەموو دەم دەیگوت بەداخەوە کە...

ئەو وەڵامەی پێیم دایەوە وا لە بنەتای ئەم قسانەدا دەنووسم:

ژیانی مرۆ، وەک دەفرێکە گرانیی ناوەڕۆکەکەی برێتییە لە پێوانەی راستی. چەند زۆرن ئەو ژیانانەی بەهێمنی بەڵام دوور و درێژ رادەبوورن و، بەلای زۆرەوە چەند پاشماوەگرێک لە دواوە بەجێ دەهێڵن و هیچی تر... با دەستخۆشانە لەو مێرە بوێرانە بکەین ژیانی خۆیان بەپڕاوپڕیی دەفرەکە گران کردووە و، مێژووی پڕ لە بەسەرهاتی گەلی ئێمەیان هێناوەتە کایە.

**مورتەزا زەربەخت**

# لە کوردستانی عێراقەوە... هەتا ئەوبەری چۆمی ئاراس

ڕێڕۆیشتنە مێژووییەکەی مەلا مستەفای بارزان
لە بەهاری ١٩٤٧دا

# پێشەکی

بەشداریی بارزانیی نەمر و هەڤالانی لە کۆماری میللیی کوردستان بابەتێکی گرینگ و لاپەڕەیەکی پڕ لە شانازییە لە مێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازیماندا. لە راستیدا، ئەم لاپەڕە پڕ لە شانازییە سێ سەرباسی تایبەت دەگرێتەخۆ کە هەریەکێ لەم سەرباسانە دەکرێت چەندان نووسین و لێکۆڵینەوەی گرینگی مێژووییان لەسەر بکرێت. سەرباسەکان ئەمانەن:

(١) بەشداریی بارزانییەکان لە کۆماری میللیی کوردستان - کۆماری مەهاباد - دا:

لە بەرەو پایزی ساڵی ١٩٤٥شۆڕشی بارزان ١٩٤٣- ١٩٤٥ دامرکایەوە، بارزانی خۆی و هەڤاڵە شۆرشگێڕەکانی و پێشمەرگەکانی و ژمارەیەکی زۆر لە ماڵباتە بارزانییەکان کوردستانی عێراقیان بەجێ هێشت و چوونە پاڵ مەهاباد. لە راستیدا ئەم چوونە دەگەڕایەوە بۆ تێکەڵی و پێوەندییەکی پێشدەست کە لە نێوان بارزانی و لێژنەی ئازادی «هەیئەتی ئازادی» لە لایەک و کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد (ژێکاف) لە مەهاباد لە لایەکەی تر دروست بووبوو. بارزانییەکان و پێشمەرگەکانی تری کوردستانی عێراق و ماڵباتەکانیان لە کوردستانی ئێران زۆر رێز لێگیراو بوون. ئەمانیش بەوپەڕی دڵسۆزی و گیان لەسەر دەستی بەشدارییان لە دامەزراندن و فراژیبوون و گەشانەوەی کۆماردا کرد. بارزانییەکان ناوکی سوپای شۆڕشگێڕی کۆماری کوردستان بوون. لەشەڕەکانی ملی قەرەنی و مامەشادا زەبری زۆر گەورەیان لە سوپای رژێمی پاتشایەتیی ئێران وەشاند و، ئەو سەرکەوتنانەی ئەوان، بوون بە مایەی چەسپین و جێگیربوونی بنج و بنەوانی کۆماری کوردستان و، متمانە بەخۆ ئەستوور بوونی خەڵکەکەی. بۆ زیاتر زانیاری، خوێنەری بەڕێز دەتوانێ بگەڕێتەوە سەر کتێبی:

- بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان: مەسعود بارزانی.
- لەمەهابادی خوێناوییەوە... هەتا لێوارەکانی ئاراس: نەجەف قولی پسیان. وەرگێڕانی: شەوکەت شێخ یەزدین.
- کۆماری کوردی ساڵی ١٩٤٦: ولیەم ئیگلتن.

(٢) سەرباسی دووەم لە بەشداری و پاڵپشتیی بارزانییەکان لە کۆماری کوردستانی ساڵی ١٩٤٦ لە مەهاباد، ئەو شەڕ و بەرخودانە قارەمانانەیەیە کە لە دوای رووخانی

کۆمار لە هەمبەر سوپای پاتشای ئێراندا کردیان:

لە ناوەڕاستی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦دا کۆماری کوردستان هەرەسی هێنا. پێشەوا قازی محەمەد و هەڤاڵەکانی گیران. حکوومەتی ئێران نیازی وابوو بارزانییەکانیش بخاتە داوەوە و بەهەر جۆرێ بێ ژێردەستیان بکات. لە ڕاستیدا، ئێرانییەکان سەبارەت بەتێشکانەکانیان بەدەستی سوپای شۆڕشگێری بارزانییەکانەوە، زۆریان لێ کۆڵدار بوون و بەدوای هەل و دەرفەتێکدا دەگەڕان فریویان بدەن و بیانخاپێنن. بەڵام بارزانییەکان لەوە وریاتر بوون و خۆیان بەدەستەوە نەدا. دەستیان بەپاشەکشێ کرد، سوپای ئێران بە تۆپ و تانک و باڵەفڕەوە پەلاماریان دان و تەنگیان پێ هەڵچنین. بەهاری ئەو ساڵە، کوێستانەکانی کوردستان سارد و سەرما بوون، پێشمەرگەکانی بارزانی بەسەرۆکایەتیی سەرۆکی نەمر مەلا مستەفای بارزان بەشێوەیەکی زۆر ئازا و گیان لەسەر دەستانە شەڕیان دەکرد و بەرەودواش دەکشانەوە. بارزانیی نەمر لە ئاخاوتنێکی خۆی لەبارەی ئەو شەڕانەوە دەفەرمووێ: "دوژمن خاڵێکی لاوازی لە ئێمەدا بەدی کرد بوو ئەویش برێتی بوو لەو ژن و منداڵەی لەگەڵماندا بوو و، زۆر کوێرانە و دڕندانە بۆمبابارانی دەکردین". پاتشای ئێران لەو سەردەمە لە فەرمانێکی ئاشکرای خۆیدا بۆ باڵەفڕوانانی ئێرانی، فەرمانی دابوو: "لێیان بدەن و نەهێڵن ژن و منداڵیشیان دەرباز بن". ئەو بەرگری و بەرخودانە گەرمەی بارزانییەکان لە بەهاری سارد و سەرمای ساڵی ١٩٤٧ لە هەمبەر سوپای ئێراندا کردیان ئەفسانە و داستانێکە لە گێڕانەوە نایەت.

خوێنەری بەڕێز دەتوانێ سەر لەم سەرچاوانەی خوارەوە بدات بۆ زێدەی زانیاری:

- بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان: مەسعود بارزانی.
- لە مەهابادی خوێناوییەوە... هەتا لێوارەکانی ئاراس: نەجەف قولی پسیان. وەرگێڕانی: شەوکەت شێخ یەزدین.
- بارزانی خۆی بەدەستی کەسەوە نادات: ئەبولحەسەنی تەفرشیان. وەرگێڕانی: شەوکەت شێخ یەزدین.
- چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی: عەبدوڕەحمان قاسملو.

بارزانییەکان، بەشێوەیەکی ئازا و ژیرانە، دوای ئەوەی زۆر زەرەر و زیانیان لە سوپای پاتشای ئێران دا، رزگاربوون و ئاوای کوردستانی عێراق بوونەوە. رۆژی ١٣ی نیسان خوالێخۆشبوو شێخ ئەحمەدی بارزان و تەواوی ماڵباتە بارزانییەکان دوا کەسیان لە چۆمی

گادەر دەرباز بوون و پەڕینەوە بۆ کوردستانی عێراق. حکومەتی عێراق وەری گرتنەوە و ڕێگەی دان بگەڕێنەوە بە هیوای ئەوەی مەلا مستەفای بارزان و هەڤالانیشی خۆیان بەدەستەوە دەدەن. بەڵام لە ڕاستیدا بڕیاری بارزانی بڕیارێکی تر بوو. بڕیاری ئەو ئەوە بوو ئەگەر بتوانێ لە چیا و چۆڵەکانی کوردستان و بەتایبەتیش لە ناوچەی بارزان بمێنێتەوە ئەگینا بەرەو باکور هەڵکشێ و پەنا بۆ یەکەتیی سۆڤیەت ببات. بارزانی لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە سەرکردە و شۆڕشگێڕ و بەرگریکارانی میللەت نابێ خۆ بەدەستەوە بدەن و بکەونە بن دەست و بن ویستی دوژمن. کەواتە تاکە ڕێگە کە بمێنێتەوە، ڕۆیشتنە بەرەو سۆڤیەت و خۆ هەڵگرتنە هەتا ئەو دەمەی هەل لەبار دەبێ و دەگەڕێتەوە بۆ کۆڕی خەبات لە کوردستان.

(٣) سەرباسی سێیەم لە لاپەڕەی گرینگی بارزانی و کۆماری مەهابادا بڕیتییە لە ڕێگەبڕینی مێژوویی بەرەو یەکەتیی سۆڤیەت.

ئەم کتێبەی بەردەست، دەتوانین بڵێین تایبەتە بەم سەرباسە. ئەم ڕێگەبڕینە مێژووییە لە ناوچە ئاسێ و چیا هەڵەموتەکانی کوردستانی عێراقەوە دەست پێ دەکات. سەرەتا بەزاندنی سنووری تورکیا و پاشان پەڕینەوە بۆ دیوی ئێران و هەڵکشان بەرەو باکور بەشان بەشانی سنووری ئێران لەگەڵ تورکیادا. بڕینی ئەم ڕێگە پێچەڵپێچ و لەو دەمە سەرماوسۆڵەیەدا و بەنێو بۆسەگەلی سوپای ئێران و، داوی نەیاران و گوێ لە مستاندا، کارێک بوو لەوپەڕی دژواریدا. لەم ڕێگە بڕینە مێژووییەدا هەر تەنیا ئازایی و گیان لەسەر دەستیی بارزانی و پێشمەرگەکانی پشتیوان نەبوون، بگرە ئەو تەکتیک و لێهاتووییەی شەڕی پارتیزانی کە لەم ڕێگەبڕینەدا دەردەکەوێ شتێک بووە مایەی سەیر پێ هاتن و سام گرتنی دوژمنان. دوای ئەو ڕووداوە، لە زانکۆی تاران و لە کۆلیجی سەربازیدا ئەم ڕێگە بڕینە جوامێرانەیە وەک نموونەیەکی سەرکەوتووی شەڕی پارتیزانی بەقوتابیان گوتراوەتەوە. نامانەوێ زیاتر لەم باسە بدوێین، با بەسەرهات و بیرەوەری و بەڵگەنامەکانی نێو ئەم کتێبە خۆیان بدوێن، بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوەش بۆ خوێنەری بەڕێز بەجێ دەهێڵین. هەر ئەوە دەمێنێ کە بڵێین نووسەری کتێب: مورتەزا زەربەخت یەکێک بووە لە ئەفسەرانی ڕاپەڕینی ئەفسەرانی خۆراسان کە ڕاپەڕینێکی سەرنەکەوتووی ئەفسەرانی ئازادیخوازی ئێران بوو لە کاتی شەڕی دووەمی جیهاندا. دوای ئەوەی ئەفسەرەکان دایانە پاڵ کۆماری ئازەربایجان و لە پاڵ کۆماردا خزمەتیان کرد هەتا

هەڵوەشانی و هەڵاتنی سەرکردەکانی. دوای ئەمە دایانە پاڵ کۆماری مەهاباد کە دوا ڕۆژەکانی تەمەنی دەژیا و لە هێزی بەرگریکاری کوردستاندا تەنیا بارزانی و هەڤاڵەکانی مابوون. ئەفسەرانی ئێرانی کە ژمارەیان شەش کەس بوو بە درێژاییی شەڕی بارزانییەکان لەگەڵ سوپای ئێراندا لە نێو شەڕدا بوون و بەشدارییان کرد. دوای ئاوابوونیش بەرەو عێراق، ئەوان ڕێگەی خۆبەدەستەوەدانیان بە عێراق هەڵبژارد بەو هیوایەی بتوانن لە عێراقەوە وەک پەنابەری سیاسی ڕوو لە وڵاتێکی تر بکەن. بەداخەوە ئەمەیان بۆ نەچووە سەر و عێراق لە کەینەوبەینە زۆرەکانی خۆی لەگەڵ ئێراندا بەدەستەوەی دانەوە و ئەو شەش ئەفسەرە هەریەکە و بە گوێرەی ئۆباڵی ئەستۆیان فەرمانی گیرانیان لە دادگەیەکی ئێرانیدا بۆ دەرچوو. دوای ئازادبوونیشیان، هەندێکیان کەوتنە نووسینەوەی بیرەوەر و سەرپێهاتەکانی خۆیان لە نێو بارزانییەکاندا. ئەمەی بەردەست دووەم کتێبە و پێشتر ئەبولحەسەن تەفرشیان بەناوی «ڕاپەڕینی ئەفسەرانی خۆراسان» کتێبی خۆی نووسیبوو کە ئەویش هەر لە لایەن خۆمانەوە کرا بە کوردی و پێشکێش بە خوێنەرانی بەڕێزی کوردیزمان کرا. هیوادارم بەم وەرگێڕانە خزمەتێکی بچووکم پێشکێش بە نەتەوەی خۆم و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلەکەمان کردبێ. سەرکەوتنیش هەر بەپشتیوانیی خوای مەزنە.

**شەوکەت شێخ یەزدین**

# بەهەڤالەتیی مەلا مستەفای بارزان

لە مانگی جۆزەردانی سالّی ١٩٤٧، مەلا مستەفای بارزان و ٥٠٢ کەس لە هەڤالانی[١]، لە گوندەکانی دەوروپشتی بارزانەوە، لە سنووری عێراق لەگەلّ تورکیا، دەستیان بە ڕێڕۆیشتنە مێژووییەکەی خۆیان کرد و بەدرێژاییی سنوورە هاوبەشەکانی ئێران لەگەلّ عێراق و تورکیادا بەرەو یەکەتیی سۆڤیەت ڕۆیشتن .

ئەم پیاوانە، پاش ڕێڕۆیشتنێکی پێنج ڕۆژە لەناو زەویی تورکیا و بڕینی لوتکە بەفرگر و کێوە سەختەکانی «بێداو» و «ئاسنگرە» و «سپیرێز» و پەڕینەوەیان لە گۆمی گەورەی «دزا گەورە»، ئەوەبوو لە گوندەکانی سنووری «بێدکار» و «جرمی»یەوە پێیان نایە ناو زەویی ئێران و بەرەو ژوور هەلّکشان. ئەمانە پاش ٢١ ڕۆژ شەڕ و پێکدادان لەگەلّ سوپاگەلی عێراق و ئێران و تورکیا و کرێگرتووانی خێلّەکی، دواجار بەپەڕینەوە لە زێی ئاراس ڕێڕۆیشتنە کەلّەمێرانییەکەی خۆیان بەکۆتا هێنا و پەنایان وەبەر یەکەتیی سۆڤیەت برد.

دووای هەلّوەشانی حکوومەتی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان لە مانگی سەرماوەزی ١٩٤٦دا، من و نۆ کەس لە ئەفسەرانی حکوومەتی فیرقە لە پالّ بارزانییەکاندا ماینەوە و لە کردەوەکانی ئەوان دژی سوپای حکوومەتی شا و، شان بەشانی ئەوان شەڕمان کرد. زۆربەی ئەم (١٠) کەسە لە ئەفسەرانی هەلاّتووی سوپا پێک هاتبووین کە دابوومانە پالّ فیرقە. ئێمە ماوەی چوار مانگ لەگەلّ بارزانییەکاندا ماینەوە، بەلاّم لە ئەنجامدا ڕووداوگەل بە جۆرێ کەوتنەوە کە ئێمە بە ناچاری لەوان جیابووینەوە. مەلا مستەفا و هەڤالانی هاتنە ناو زەویی عێراق و پاش ماوەیێ مانەوە لە بارزان و ئەو ناوانە، دەستیان بەڕێڕۆیشتنە مێژووییەکەی خۆیان بەرەو سۆڤیەت کرد. ئێمەش بە ئامۆژگاریی مەلا مستەفا پەنامان وەبەر دەولّەتی عێراق برد.

لە ماوەی سالاّنی پاش ئەم ڕێڕۆیشتنە مێرانەیە، زۆرجاران لێرەو لەوێ، لە چاپەمەنی و

(١) هەڤالانی ڕێبازی بارزانیی لە ڕێڕۆیشتنە مێژووییەکەدا ژمارەیان لە (٥٠٢) کەس زیاترە، ئێمە لە کتێبی(یۆبیلی زێڕینی پێشمەرگە)دا ناوی (٥١٨) کەسمان بلاّو کردووەتەوە کە لەو ڕێڕۆیشتنە پڕ لە مێرخاسییەدا بەشدارییان کردووە. بەلاّم بارزانیی نەمر لە چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسانی بیانیدا فەرموویەتی لەو کۆچەدا (٥٣٠) پێشمەرگەم لەگەلّدا بووە. ئەمەش واتە هێشتا ناوی هەموو هەڤالەکانی ڕێبازی بارزانی نەزانراوە. (وەرگێڕ: شەوکەت شێخ یەزدین).

له نووسینی کەساندا، باس و خواسی لێ دەکرا و بابەتگەلی سەرپێیی لەسەر زوانی سەرکردەی کردەوە و ئەوانەی لەو ڕووداوانەدا هاوپار بوون بڵاودەکرانەوە کە مەزنیی ئەو کارەیان دەگێڕایەوە، تەنانەت لە زمانی هەندێ ئەفسەری ئەرکانەوە دەبیسترا کەوا تەکتیکی سەرکەوتوانەی ئەو شەڕوشۆڕانەی بارزانییەکان وا لە زانستگەی شەڕ دەگوترێتەوە. ئێمە کە لە نێزیکەوە لەگەڵ برێ لەو ڕووداوانە ئاشنا بووین، چاوەچاوی ئەوەبووین بزانین ئاخۆ هاوسەردەمانی پێشوومان لەو سەرپێهاتەدا چییان کردووە و ئەم مێرخاسییەیان چۆن ئەفراندووە و بە کۆتا گەیاندووە... بەڵام مخابن، سەرەوەدەرمان دەرنەکرد، بەڵگە و دەستهاوێژێکمان بۆ پشتیوانی یان بەدرۆخستنەوەی ئەو دمگۆ و واتەواتانە بەدەستەوە نەبوو... ئیتر ئاوها لە حەزی بەدەست هێنانی ئەو سەرپێهاتییانەدا دەسووتاین.

من بەردەوام لەلای خۆمەوە، ئەو ڕێڕۆیشتنە مێرخاسانەیەم لەگەڵ ڕێڕۆیشتنە مێژووییەکەی کۆمۆنیستانی چین و، سوپای هەشتەم بەرێبەرایەتیی «ماوتسیتۆنگ» لە باشوورەوە ڕووەو باکور بەرەو هەرێمی «شاسنی» و مۆڵگەی «ینان» بەراورد دەکرد، بەڵام لە پێوانەیەکی وردیلەتر و بەر تەسکتردا. وەبیرمان دێ چۆن کۆمۆنیستەکانی چین پاش بەرگەگرتنی تێشکانی یەک لەدوای یەک بەدەستی سوپای «چیانکایچک»ەوە لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٣٤دا بە ٩٠ هەزار کەسەوە ڕێڕۆیشتنی مەزنی خۆیان بەرێبەرایەتیی «ماو» لە باشووری چینەوە دەست پێ کرد و پاش بڕینی ١٨ زنجیرە چیا و ٢٤ چۆم و بواردنی ١٢ هەرێم کە فراوانیی هەریەکەیان لە هەریەک لە وڵاتانی ئەورووپا پترە و، لە مەودایەکی ١٠ هەزار کیلۆمەتری و وێکەوتنی زیانی زۆر و زەوەند، دواجار پاش ساڵێکی تەواو لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٣٥دا لە مۆڵگەی (ینان)ی هەرێمی شانسی لە باکوری ڕۆژئاوای چین گیرسانەوە.

ئەم ڕێڕۆیشتنە نیشانەی سەرکەوتنی مرۆڤە بەسەر کێشەکانی ژیان و بەڵگەی بڕوا پتەوی و مۆجیزەیەکە کە هەر بڕوای پتەو دەتوانێ لە زاڵبوون بەسەر گیروگرفتدا وەگیری بێنێ. بارزانییەکان لەم مێرخاسییە زۆر گەورەیەدا، بەم بڕوا پتەوییە چەکداربوون و هەر ئەمەش بوو لە سنووری بە ئامانج گەیشتندا ئەم پەرجووەی هێنابووە دی.

ناوچەی بارزانی لە کوردستانی عێراق هەڵکەوتوو، کەوتووەتە پاڵ سنووری ئێران و تورکیا، ئەم خێڵە مێرخاسە لە ڕابردوودا لە سەرینیی هۆی نەتەوایەتی و، بە کارتێکەریی

خواستی نەتەوایەتییەوە لە یەکبینە و بێ پشوو لەگەڵ حکوومەتگەلی عوسمانی و- پاش شەڕی یەکەمیش- لەگەڵ تورکیا و عێراقدا شەڕوشۆڕی هەبووە.

دواجاریش داوێنی ئەم کێشە و هەرایە پەرەی گرت و حکوومەتی ئێرانیشی گرتەوە. بارزانییەکان خێڵێکی بچووک و هەژار بوون، ڕاستە کە دەوڵەتی تازە دامەزراوی عێراقیش دەوڵەتێکی خاوەن هێز نەبوو بەڵام لایەنێکی هێزدار دایکایەتیی ئەوی گرتبووە ئەستۆی خۆی، باڵەفڕانی ئینگلیز بارزانیان دەکوتایەوە - چەندان جاریان کوتایەوە - خێڵە دراوسێیە ئاشوورییە نەگونجاوەکانیش بووبوونە کێشەی سەر کێشان، تورکیاش - چ تورکیای مستەفا کەمال و چ تورکیای دوای ئەوە - هەر تورکیا بوو و شمشێری لە دژ خەڵکی کورد لە خۆ بەستبوو، دەمایەوە حکوومەتی شا کە ئەویش بە دیاردی و ڕێنوێنییەتیی دایەن و سەرپەرشتانی - پێش و پاش - شەڕی دووەمی دنیا داخلی شەڕبووبوو... ئەمانە هەر هەمووی لە دژی خێڵێکی بچووکی بێ توانستی مایەکی و بێ پشتی دەرەکیدا!

هیچ یەک لە سێ حکوومەتی عێراق و تورکیا و ئێران بارزانییەکانیان بۆ قووت نەدەچوو: دەوڵەتی عێراق خوازیاری ئەوەبوو بێ چەندوچۆن وەگیریان بێنێ و ڕەهەندە و پەراگەندەیان بکات؛ تورکیا خێرێکی بۆ کوردی خۆی نەبوو هەتا لەمەدا پارێکیش وەبەر بارزانییەکان بکەوێ؛ دەوڵەتی ئێرانیش دڵپڕ بوو و سەبارەت بەبیانووی لە بن نەهاتوو هەرگیز نەیدەویست بەگرتنەخۆوەی ئەمانە - بەو شێوەیەی کە هەبوون - گرفتێک بخاتە سەرگرفتەکانی تری خۆی، شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفای بارزانیش شارەزای سیاسەتی ڕەزاشایی و پاش ڕەزاشاییش بوون و دەیانزانی پاڵدان وەچیغ چەند هەڵەیە و، پەنا وەبەر باوک و کوڕ بردن هیچ کات چاکەی بۆ پەناوەبەریەر لێ نەکەوتووەتەوە... وێڕای ئەمانەش، ئینگلیز و ئەمەریکا خۆیشیان خاوەن دۆز بوون.

ئەم شتانەش لەو دەمەدا بوون کە ئیدی بارزانییەکان چیتر وزەی ڕووبەڕووبوون و خەباتیان نەمابوو. نە پێخۆر و پێبژیوێکیان هەبوو و نە کەرەستە و چەکێک کە بتوانن ڕووبەڕووی ئەم سێ دەسەڵاتەی پێ ببنەوە. دەبوو خۆ بەدەست ئەم بارە پڕ ترسەوە بدەن و ئەو ڕێڕۆیشتنە ئاڵۆز و دوور و درێژە بگرنەبەر و بەدوای نوایەکی هێمن بۆ خۆیان لەودیو سنووری ئەوسێ وڵاتە سەر هەڵگرن.

بڕواهێنانیش بەم کارە گرینگە، کارسازێنی بۆ خۆی هێناوەتە کایە؛ بارزانییەکان باوەڕی

تەواویان بە مەلامستەفای سەرکردەی خۆیان هەبوو؛ ئەو وێڕای ئەوەی «سەرۆک»ی خێڵ بوو، پیاوێکیش بوو هەموو نەریتێکی سەرکردایەتیی لەخۆدا کۆکردبووەوە؛ مرۆڤێکی بوێر و شەڕوانێکی بێ میناک بوو، لەشەڕ و کردەوەی سوپاییدا، لێوەشاوەیی و ژێهاتوویی خۆی بە جارێ دەرخستبوو و ئیتر بووبوو بە ڕووگەی خەڵکی بارزان. هەر ئەم نەریتانەش بوون پاڵیان وەهاوەڵانی نابوو چارەنووسی خۆیان بە چارەنووسی ئەو گرێ بدەن و ئەو ڕێڕۆیشتنە مێرخاسانەیە تەواو بکەن... ئەوەبوو هەر واشیان کرد.

***

من و هاوەڵانم وەک گوتم تامەزرۆ بووین بزانین ئەو ڕێڕۆیشتنە چتۆیی بووە، چ ڕێگەیەکیان بڕیووە و، چییان هاتووەتە پێش و چ شەڕ و پێکدادانێک ڕوویان داوە. ئێمە ئەگەر شتێکمان لەو ڕووداوانەوە بیستبێ هەر ئەوەبووە هێندە کەس لە پێک هەڵچوونەکاندا کوژراون، بۆ نموونە: فەوجی نەقیب «بخەر دنیا» لە «شووت» تەرت و وێران بووە و، نەقیب خۆیشی بە هۆی نارنجۆکێکەوە کوێربووە... پاشان؟ چییتر نەبوو... هەڵبەتە حکوومەتیش لە هیچ شوێنێ شتێکی ئەوتۆی بۆ خۆی تۆمار نەکردبوو هەتا ئەو سەرکەوتنانەی بە تەپڵ و زووڕناوە وەک شادمانی بخاتە بەرگوێی خەڵک و داوایان لێ بکات سلاوات بۆ گیانی شاهەنشا لێ بدەن!

... کات بەسەرچوو... شۆڕش ڕووی دا و لە سەروبەندی شۆڕش دەستهاوێژێ کەوتنە دەست و... هەلی بلاوبوونەوەیان... ڕۆژێکیان لە کاتی گفتوگۆ لەگەڵ هاوەڵی ئازیزم بەڕێز کاوە بەیات - دا، کە خۆی لەم بوارەدا کۆڵینەوەی بەسوود و چاکی هێناوەتە بەرهەم، کاتی وەبیر هێنانەوەی ڕووداوی سەردەمانی پیشەوەری و قازی محەمەدی هەر لەبیرماو، جارێکی تر لەبارەی ئەو ڕێڕۆیشتنە کەڵەمێرانییەی بارزانییان قسە و باسم هێنایەوە ناو ناوان و حەزی خۆم بۆ زانین و پێحەسیانی وردایەتییەکانی ئەو ڕێڕۆیشتنە دەربڕی، گوتی بەهەڵکەوت لە نێوان دەستهاوێژی یەک لە ئەفسەرانی بەرزی سوپا کە کاتی خۆی شان بەشانی چەند کەسێکی تری کە لەگەڵیدا بوون ئەرکی کۆڵینەوەی لە چۆنیەتیی کردەوەی سوپا لە دەمی تێپەڕینی بارزانییەکان لە زەویی ئێراندا پێ سپاردرابوو، برێ دەستهاوێژ و بەڵگەی لەم بارەیەوە دەست کەوتووە و دەشێ بۆ ئەم بابەتە ڕێ ڕوونکەرەوە بن، ئەو دەستهاوێژانەم بەدەست هێنا و، سەرنجم دا، هەتا ڕادەیەکی زۆر، کونجە تاریکەکانی ئەم ڕێڕۆیشتنە مەزنە ڕوون دەکەنەوە. چەندان جارم ئەو دەستهاوێژانە وەخوێند و دواجار ئەو

بیرەم لەلا پەیا بوو کەوا ئەگەر بێو ئەم زانیارییانە تەبای دیمانە و چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەوانی لەو ڕێڕۆیشتنەدا هاوپار بوون و هەتا ئێستەش بەژیان ماون، بەکاربێن ئەوا بەدووری نابینم ببێ بە ڕۆنی کەرەوەی چەندان پەناوپەسیو لە مێژووی نیشتمانی خۆشەویستی خۆم.

بەڕێنوێنیی یەکێ لە هاوەڵانی کورد، لە ٢٧ی گەلاڕێزان ١٣٧٣ (١٩٩٥) لە عەزێمییەی کەرەج بە دیمانەی بەڕێزان کازم شانەدەری و حەسۆ میرخان گەیشتم. ئەم دووکەسە لە شەڕوانەکانی بارزانی بوون کە بەهەڤاڵەتیی مەلا مستەفا لەو ڕێڕۆیشتنەدا هاوپشک بووبوون. لەو دیدارەدا، ڕاپۆرتێکی تێروتەسەل و ڕۆژ بەڕۆژی ڕێڕۆیشتنەکەم لەسەر ڕێکۆردەر تۆمارکرد. ئەرکی وەرگێڕانی ئەو ڕاپۆرتەش کە وەر بەرچاوی بخوێنەوەدا تێ دەپەڕێ لە ئەستۆی خاتوونی لێهاتی مەرجان مەلا برایم بوو کە سوپاسبژێری ئەوم.

ئەو خاڵەش دەهێنمەوە بەر بیران کە بەشێک لە هووردایەتییەکانی ئەم گفتوگۆیە تەواو وەک بیرەوەرییەکانی ڕۆژانەی نەقیبی کوردی عێراق میرحاج ئەحمەد ئاکرەیی دەچێ کە لەم دواییانە لە کۆواری «سپێدە»ی (کوردی- عەرەبی ژمارە ٦ی پاییزی ساڵی ١٩٩٤) بە سەرنووسەرایەتیی ئاوڕەحمان پاشا، کە خۆیشی لەم دیمانەیەی لەمەڕ ئێمەدا ئامادەبوو، بڵاوبووەتەوە و وەرگێڕانەکەیشی لە پاڵ دەستهاوێژەکانی تری ئەم کۆمەڵەیەدا هاتووە. میرحاج ئەحمەد ئاکرەیی هەڤاڵ و ڕاوێژکاری جێ متمانەی مەلامستەفا بوو، دوای گەڕانەوەی لە سۆڤیەت خۆی لە کاری سەربازی و سیاسی دایە لا و ئێستە خانەنیشی سوپای عێراقە[٢].

زنجیرەی بەرچاوخستنی ئەم کۆمەڵەیە ئاوهایە:

سەرەتا شرۆڤەیەکی بژاردە لە تێکەڵاویی نووسەر لەگەڵ چالاکییە سیاسییەکاندا. چۆنیەتیی ناسینی جەنەراڵ بارزانی و پێداچوونەوەیەکی بەپەلەی ئەو هاوکارییە ماوە کورتەی گرووپە بچووکەکەی لەمەڕ خۆمان لەگەڵ بارزانییەکاندا کردی، دوای ئەمە کورتە ئاماژەیەک بە چالاکییەکانی پاشتری مەلا مستەفا و هاوەڵەکانی لە دوای گەڕانەوە لە سۆڤیەت پاش شۆڕشی ١٤ تەممۆزی ١٩٥٨ی عەبدولکەریم قاسم، تۆمارکردنی دەقی ئەو چاوپێکەوتنانەی لەگەڵ بەڕێزان کازم شانەدەری و حەسۆ میرخاندا کران، بیرەوەرییە

(٢) تێکۆشەری ناسراو: میرحاج ئەحمەد ئاکرەیی لە مانگی ١٠ی ساڵی ١٩٨٧ کۆچی دوایی کردووە. (وەرگێڕ).

ڕۆژانەییەکانی میرحاج ئەحمەد ئاکرەیی و لە کۆتاییشدا دەستهاوێژەکانی دەستەی لێکۆڵینەوەی سوپای ئێران.

لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی تەواوی ڕێڕۆیشتنی بارزانییەکاندا، بەشێک لە کتێبی کۆماری کوردستان - نووسینی ولیەم ئیلگتن و وەرگێڕانی هاوەڵی بەڕێزم ئیبراهیم یونسیی نووسەر و وەرگێڕی لێهاتوو - دەگوازمەوە و سوپاسی ئەرک کێشان و ڕێنوێنییەکانی دەکەم.

هەروەها سوپاسی دەسبار لەگەڵ گرتن و ڕێنوێنییەکانی بەڕێز ئاوڕەحمان پاشای بەڕێوەبەری کۆواری کوردی- عەرەبی «سپێدە» دەکەم کە لە جێبەجێ کردنی دیمانەی ئەو خەباتکارە بارزانییانەی لە پێشەوە ناویان هات و هەروا پێ ناساندنی خاتوون مەرجان مەلا برایمیش کە دیمانەکانی بۆ کردم بە فارسی، یارمەتیی دام.

* * *

ئەم کتێبە سەرپێهاتی خۆم و هاوەڵان نییە، خوێنەرەوە ئەگەر بیەوێ لەبارەی ئەو ڕووداوەوە بزانێ ئەوا دەتوانێ سەر لە کتێبی «ڕاپەڕینی ئەفسەرانی خۆراسان»[٣] بە پێنووسی بە بڕشتی هاوەڵی لەدەست چووم، ئەبولحەسەن تەفرشیان بدات کە زۆر ڕاستوێژانە نووسیویەتی. بەڵام لەبەر ئەوەی دانەکانی کتێبی ناوبراو، پاش دووبارە لە چاپ دانەوەیشی ناکەونە دەست، بۆیە بۆ ئەوەی خوێنەر زیاتر دۆش دانەمێنێ وا بڕێک لە حاڵی خۆم دەدوێم:

قوتابیی زانستگەی ئەفسەری بووم کە وڵات لە مانگی خەرمانانی ساڵی ١٣٢٠دا (١٩٤١) کەوتە بەر پەلاماری سوپاگەلی بیانی، سوپای دژەگەلی ڕەزاشاش تەنانەت نەیتوانی کەمترین دەسوەکەری بنوێنێ، ئیتر وڵات کەوتە ژێر داگیرکەریی سوپایەلی سۆڤیەت و ئینگلیز و پاشان ئەمەریکایشیان هاتە پاڵ.

ئەم ڕووداوە سەرەڕای بانگەواشەی سەردەمی ڕەزاشا و ئەو بەشان و باڵ هەڵدانەی بۆ سوپای سەرلێشێواو کرابوو و دەکرا - کارێکی نائاساییی دەکردە سەر من و هیی وەکو من. لە هەمان ئەو ڕۆژانەی خەرمانانداندا من خەیاڵی ئەوە هەڵی گرتبووم ڕێگەیێ بۆ

(٣) کتێبی «ڕاپەڕینی ئەفسەرانی خۆراسان» بەشێکە لەم کتێبەی بەردەست، بەڵام ناوەکەی گۆڕاوە بۆ «بارزانی خۆی بەدەستی کەسەوە نادات».

سەرخۆبوونی وڵاتە داگیرکراوەکەم ببینمەوە. حەز و خولیای منیش وەک حەز و خولیای لاوانی ئەو ڕۆژانە پەسندکردن و لایەنگرتنی ئەڵمانیای نازی بوو، بەتایبەتیش کە «هاوپەیمانان» ئێستە وڵاتەکەمیان ژێردەستە کردبوو. لە دۆزینەوەی ڕێگەچارەدا، بەناچاری ڕێگەم بە پارتە سیاسییەکان دەکەوت کە پاش مانگی خەرمانانی ۱۳۲۰(۱۹٤۱) کەوتبوونە خۆ.

لەگەڵ پارتی(کبود)دا هاوەڵیم پەیا کرد کە پارتێکی ئەڵمانخواز بوو و ڕێبەرەکەی (نۆبەخت) بوو کە نوێنەری خولی سێزدەمینی پەرلەمان بوو، چەندان جار دیمانەیم کرد. لەگەڵ حزب و ڕێکخراوەکانی تریشدا بووم بەناسیار، لە کۆلێجی ئەفسەریشدا لە پێناو دۆزینی ڕێگەچارەیێ کۆبوونەوەمان لەگەڵ هاوخولە هاوبیرەکانماندا دەکرد.

ساڵی ۱۳۲۱ بە پلەی ملازم دووەمی پۆلی ئاسمانی لە کۆلیجی ئەفسەری تەواو بووم و ئەرکی خزمەتم لە ئەسفەهان و شیراز پێ سپاردرا، ساڵی ۱۳۲۲ بۆ تەواو کردنی خولی باڵەفڕوانی بانگهێشتنی تاران کرام، ئەو ماوەیە هیچ تاوێ لە هۆڵی گەڕان بەدوای چارەسەردا هەدام نەدەدا، هەتا ئەوەی لە ساڵی ۱۳۲۳دا بە موتاڵای بەڵاوۆکەکانی حزبی توودەی ئێران بە کلاورۆژنەی هیوا گەیشتم و بەڕەسمی بووم بە ئەندامی ڕێکخراوی عەسکەریی حزبی توودە. کۆبوونەوەکانی حزب هەموو حەفتەیەک دەبەستران و قسەکەری کۆبوونەوەکانیش زۆربەی جاران (کامبەخش) بوو کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حزب و نوێنەری ئەنجوومەن (پەرلەمان) بوو، بابەتگەلی ئاخاوتنیش زێدەتر ڕووداوگەلی سیاسیی ئێران و دەرەوە بوون. لە مانگی خەرمانانی ساڵی ۱۳۲٤(۱۹٤٥)دا سەرهەڵدانی ئەفسەرانی سوپای خۆراسان بەڕێبەریی رائید ئەسکەندانی رووی دا. ڕاپەڕیووەکان بریتی بوون لە ۱۹ ئەفسەر و ٦ سەرباز کە هەر هەموویان ئەندامی ڕێکخراوی سوپاییی حزبی توودە بوون. ئەوانە پاش چەک لێکردنەوەی مۆڵگەی مراوەتەپە بەرەو گورگان و گونبەت چوون. لیوا حەسەن ئەرفەعی سەرۆکی ئەرکانی سوپا بۆ سەری هەر یەک لەمانە خەڵاتی دانابوو، ڕاپەڕیوان لە گونبەت کاوس کەوتنە بۆسەوە و پاش ۷ کوژراو و ٥ بریندار - کە بە دیلی گیران - هەڵاتن. ڕێکخراوی حزبی توودە لە گورگان هەڵاتووەکانی کۆوەکرد و بۆ باکۆی ناردن.

لە مانگی (گەلاوێژ)ی ساڵی ۱۳۲٤ فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان بەڕێبەرایەتیی جافەر پیشەوەری سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند و، ڕێکخراوەکانی حزبی توودە لەو ناوچەیە

به فەرمانی بەرپرسیارانی سۆڤیەت پێوەندییان پێوە کردن. لە مانگی (ڕەزبەر)ی ١٣٢٤ بەدواوە بەرپرسیارانی سۆڤیەت پێداپێدا و بە گوێرەی خواست، ئەفسەرانی پاشماوەی ڕاپەڕینی ئەفسەرانی خۆراسانیان بۆ رابەرایەتیی کردەوەی چەک لێکردنەوەی یەکەگەلی سوپا و جەندرمە لە باکوّوە بۆ ئازەربایجانی سۆڤیەت ناردەوە. لە ٢١ی سەرماوەزی ١٣٢٤ مۆڵگەی تەورێز بەیارمەتیی مایەکی و واتایەکیی سوپای سوور خۆی دا بەدەست فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجانەوە و پیشەوەری حکوومەتی خۆی بە ئەنجوومەنی ڕاوێژی گەلی ئازربایجان ناساند. پاش ماوەیەک حکوومەتی خودموختاریی کوردستانیش لە مەهاباد بەڕابەرایەتیی قازی محەمەد خۆی ڕاگەیاند.

لە مانگی (ئاخەلێوە)ی ساڵی ١٣٢٥ بەرپرسی حزبیی نووسەری ئەم کتێبە کە ملازم یەکەمی ئاسمانی ڕەحیم بەهزاد بوو و چەندان ساڵ دوای ئەوە، لە ١٣٣٤دا پاش ئاشکرابوون و گیرانی ئەندامانی ڕێکخراوی حزبی لە سوپا، گوللەباران کرا، لە ماوەی پشووی نەورۆز سەردانێکی ئازەربایجانی کرد، لە گەڕانەوەیدا، بەقسەی عەقید ئاگاهی کە ئەفسەرێکی باڵەفڕوان و لە دامەزرێنانی ڕێکخراوی سوپایی بوو و بەسەرکردەی هێزی ئاسمانیی حکوومەتی پیشەوەری دامەزرابوو، گوتی: سوپای ئازەربایجان پێویستی بە چەکی ئاسمانی هەیە و وا دەخوازێ باڵەفڕوانانێک خۆبەختکردووانە بەخۆ و باڵەفڕیانەوە پاڵ بدەن وەسوپای ناوبراوەوە و هێزی ئاسمانیی ئازەربایجان دابمەزرێنن. دوای تەواوبوونی کۆبوونەوە، ملازم یەکەم عەلی جوودی و نووسەری ئەم دێرانە ئامادەییی خۆیان بۆ خۆدانەپاڵی سوپای ئازەربایجان پێشان دا. بەیانیەی ڕۆژی ٢٦ی (ئاخەلێوە)ی ١٣٢٥(١٩٤٦) بەخۆ و دوو باڵەفڕی شەڕوانی ئاداکس بەرەو ڕووی تەورێز فڕین و چووینە پاڵ سوپای ئازەربایجان.

## یەکەمین دیمانە لەگەڵ جەنەراڵ بارزانیدا

لە مانگی سەرماوەزی ١٣٢٥، یەکەگەلی سوپای شا بەرەو (میانە) وەڕێ کەوتن بۆ ئەوەی لەگەڵ سوپای پیشەوەریدا بکەونە شەڕ. حکوومەتی ئازەربایجان فەرمانی خۆ تەیارکردنی بە یەکەگەلی خۆی دا.

ئێمەی باڵەفڕوانانی هەڵاتوو کە تامەزرۆی خزمەت و بە هیوای بەشداری لە شەڕبووین، سەردانی ئەرکانی سوپامان کرد و، خواستمان، بەشداریی ڕاستەوخۆ لەو پێکدادانەدا

بکەین.

ڕۆژی ١٩ی سەرماوەزی ١٣٢٥ ئەرکانی سوپا بە فەرمانێک بۆ نووسەری ئەم کتێبە، کە لە کاتی نەبوونی سەرکردەی هێزی ئاسمانیدا جێگری ئەو بووم - ئەرکی پێ سپاردم لەگەڵ دوو کەسی تر لە باڵەفڕوانان، ملازم ئەبولقاسم هەقپەرست و ملازم نیکۆلا ماکاریان، بەرەو بەرەی مەراغە و سەقز بچین و لەوێ پێوەندی بە بەرپرسانی مۆڵگەکانەوە بکەین و لە بارەی تەیارکردنی باڵەفڕگەی کاتی و دەستەبەرکردنی پێوەندییی بەرەدا کاروباری پێویست جێبەجێ بکەین. سەعات ٢٣ی ڕۆژی ١٩ی مانگی سەرماوەز، شان بە شانی فەوجێک بە سەرکردایەتیی نەقیب ئەسبەقی کە دەیویست بچێ بۆ مەراغە، بەرەو جێگەی پێ سپاردراومان کەوتینە ڕێ و نیوەڕۆی ڕۆژی بیستی مانگ گەیشتینە میاندوواو. لە میاندوواو بە ئۆتۆمبیلێکی جێب کە نەقیب قەمسەریان و نەقیب قەهرەمان بە ئێمەیان دابوو، ڕووەو گوندی (سەرا) ڕۆیشتین کە بارەگای جەنەرال مستەفا بارزانی بوو.

مەلا مستەفا یەک لە سێ جەنەراڵەکەی سوپای کوردستان بوو، دوو جەنەراڵەکەی تر بریتی بوون لە محەمەد حوسێن سەیفی قازیی وەزیری شەڕ و محەمەد ڕەشید خانی قادرخان زادە کە لەوەوپێش بە دیاردیی ئینگلیزەکان سوپای کوردستانی بەجێ هێڵابوو و چووبووەوە بۆ عێراق.

شەو ڕاشکابوو ئێمە گەیشتینە گوندی سەرا، مەلا مستەفا و سەرۆکی ئەرکانەکەی کە عەقید (پیرزادە) بوو لەوێ نەبوون. نەقیب مەحمود تیوای کە (بەرپرسیاری ڕێکخستنی بەرە بوو) هاتە پێشوازیمان و، شەو لە یەکێک لە خانووەکانی گوند ڕۆژمان کردەوە.

دواجار پاشنیوەڕۆی ٢١ سەرماوەز، مەلا مستەفا لە ڕێگەی مەهابادەوە هاتە نووسینگەی ئەرکان. ئەوە یەکەمین دیمانەی من بوو لەگەڵ جەنەرال بارزانیدا، جلکی جەنەرالیی لەبەردا نەبوو، جلکەکانی کوردی بوون، کورتەک و شەرواڵی کوردی و پشتێن و جامانەی سووری خاڵخاڵی لەسەرنابوو. بەخۆ و بە ڕیزبەندی گوللە و برنۆی ناوەندی کە تایبەت بوو بە یەکەگەلی سوارەی سوپا، پیاوێ بوو ٣٥ساڵی، مووڕەش، برۆ پێک گەیشتوو، چاوگەش و بەژن ڕێک، کورتە باڵا و لەشساغ، چوست و چالاک... ئەمە جەنەرال بارزانی بوو.

ئێمە هەتا ئەو ساتە، لە گۆڕانکاریی سیاسی، کاردانەوە و هەڵچوونی تاران و تەورێز

بێ ئاگابووین، نەماندەزانی کە پیشەوەری و سەرکردەکانی تری فیرقە، شەوێک پێشتر بە فەرمانی قولیئوف - کۆنسولی سۆڤیەت لە تەورێز- شاریان بەجێ هێلاوە و لە ڕێبازگەی جەلفاوە تێیان تەقاندووە و پەنایان بۆ سۆڤیەت بردووە.

خۆمان بە جەنەرال مستەفا بارزانی ناساند و، ئەرکی گرووپەکەی خۆمانمان پێی ڕاگەیاند، لەوەڵامدا، دەقی بروسکەی پیشەوەریی دایە دەستم کە شەوی پێشتر ناردبووی و بە زمانی فارسیی نووسەکی گوتی: «هەموو شت تەواوبووە»، ناوەڕۆکی بروسکەکەی پیشەوەری هەتا ئەو شوێنەی بە بیرم بێتەوە ئاوهابوو: «لەبەرئەوەی سوپای ئێران، بۆ چاوەدێریی کاری هەڵبژاردن، بەرەو ئازەربایجان هاتووە، سەرجەمی یەکەگەل ئاگەدار دەکەینەوە کە بەبێ پێشاندانی بەرگری، بەرەو مۆڵگەکانی بنەڕەتی بگەڕێنەوە».

مەلا مستەفا گوتی کەوا لە میاندوواوەوە دێ، سەید جافەر پیشەوەری و ڕابەرانی فیرقە هەڵاتوون، ئەویش نیازیەتی هەر ئەو شەوە پیاوانی خۆی کۆوە بکات و بەرەو مەهاباد بکشێتەوە. گوتی: ئێوەش دەبێ یەکێ لەم دوو ڕێگەیە هەڵبژێرن، یان لەگەڵ ئێمەدا بێن و سوود لە پارێزراویی ئێمە وەرگرن، یان بە دوای چارەنووسی خۆتانەوە بەرەو کوێ سەرهەڵدەگرن بڕۆن. ئەوەش دەبێ بڵێم کە سەبارەت بە هەڵاتنی پیشەوەری و لەبەریەک هەڵوەشانی سوپا و فیرقە، لە ڕێگەی نێوان سەرا- میاندوواو- ئازەرشا و تەورێزدا هێمنی و تەنیایی بۆ ئێوە لە گۆڕێدا نییە. لە وەڵامی ئەودا گوتم: ئێمە سێ کەس لەگەڵ ئێوەدا دەبین و چیمان لەدەست بێ دەیکەین. مەلا مستەفا گوتی ئێوە ئەم بروسکەیەی پیشەوەری بەدەستەوە بگرن و بچن بۆ پێشەبەری سەقز، لە زمانی منەوە بە سەرکردەگەلی یەکەکان بڵێن پیاوانی ئێمە لە سەعات ٨ی پاشنیوەڕۆ لێرەوە بەرەو مەهاباد بەڕێ دەکەون، ئەوەی حەز بکات لەگەڵ ئێمەدا بێت با سەری سەعات هەشت لە گوندی سەرا ئامادەی بەڕێ کەوتن بێت.

لە ناوەڕۆکی قسەکانی بارزانی تێ گەیشتم کە لەو ساتەوە ئیتر خۆی بە سەکردەی بەرەی سەقز نازانێ و تەنیا لە هەمبەر پێشمەرگەکانی بارزانیدا هەست بە لێپرساوی دەکات. فەرمانی پێویستم بە ملازم هەقپەرست و ملازم ماکاریان دا بۆ ئەوەی لەگەڵ نەقیب تیوایدا هاوکاری بکەن. نەقیب تیواییش بڕێک گۆشت و نان و نیسک و نۆک و ئەمانەی بە لۆری بۆ بۆکان هەنارد بۆ ئەوەی سەربازان کە لە ڕێگەوە دێن خواردنێکی گەرمیان بۆ لێ بنرێ و ملازم هەقپەرستیش خۆ بەختکردووانە، لەگەڵ باری لۆریدا بەرەو

بۆکان چووبوو.

من لەگەڵ جێبەکەی مەلا مستەفادا بەرەو هێڵی پێشەوەی بەرەی سەقز چووم، یەکەمین یەکەی هێڵی پێشەوەی بەرە بریتی بوو لە فەوجێکی پیادە بە سەرکردایەتیی نەقیب عەلی ئەسغەر ئیحسانی کە لە پاشماوەکانی ڕاپەڕینی ئەفسەرانی خۆراسان بوو، نەقیب ئیحسانی لە پێکدادانەکەی گونبەت لەگەڵ هێزەکانی جەندرمە و شارەوانیدا، گوللە بە پێی کەوتبوو و گیرابوو. پاش چارەسەر، دادگەی سوپایی بۆ ئەو و چوار کەسی تر لە گیراوەکان حوکمی لە سێدارەدانی دەرکردبوو بەڵام ئەو و چوار ئەفسەرە گیراوەکە بە یاریدەی حزب و ڕێکخراوی سوپا، لە گرتووخانە ڕایان کردبوو و گەیشتبوونە ئازەربایجان. «دوورکەوتمەوە». بەسەرهاتەکەم بۆ ئیحسانی گێڕایەوە، بە سەرسڕماوی و بێزارییەکی زۆرەوە ئەوجا پەسندی کرد کە سەری سەعات ٨ تەبای پیاوانی خۆی لە گوندی سەرا ئامادەبێ. یەکەکانی تر (فیدائی) بوون بە سەرکردەییی (رامتین) کە یەکێک بوو لە ڕابەرانی یەکەتیی کرێکارانی ڕێگەی ئاسن، لە کاتی ڕاپەڕیندا، پلەی (رائید)یی پێ درابوو. پێشتر یەکترمان دەناسی، لە (زنجان)ەوە یەکترمان دەناسی، کاتێ بروسکەکەی پیشەوەریم لە بارەی پاشەکشێوە پێ ڕاگەیاند باوەڕی نەکرد و لەگەڵ مندا هات بۆ سەرا، لە نووسینگەی سەرکردایەتیی بارزانیدا، لەگەڵ ئەودا کەوتە سێ و دوو، دواجار پەسندی نەکرد بەرەو مەهاباد بەگەڵمان بکەوێت. لە ڕێگەی میانداووەوە بەرەو تەورێز چوو و لە نێوانی ڕێگەدا گیرا، لەدادگەی (گۆڕەپان)ی مەراغەدا لە دادگە درا و فەرمانی لەداردرانی بۆ دەرچوو و هەڵواسرا.

سەعات هەشتی شەو فەوجی نەقیب ئیحسانی گەیشتە سەرا و بە ئەسپایی کەوتینە جووڵە. لەکاتێکدا کە بەفر دایدابوو، بە پێیان بەرەو بۆکان کەوتینە ڕێگە و پاش بڕینی ١٨ کیلۆمەتر دەوروبەری نیوەی شەو گەیشتینە بۆکان.

بەوشەوە و بەو ئاوهەوا بەفراوییە، لەگەڵ ئەفسەرانی فەوجدا گەیشتینە قەڵای بۆکان کە باڵەخانەیەکی کۆنەیە لەسەر گردێکی دەستکرد. ئەوە مۆڵگەی رائید خاکساری بوو.

بەڵام بەرەورووی دیمەنێکی سەرسوڕهێن بووینەوە: شوێنەوارێک لە یەکەی فەوجی رائید خاکساری نەدەبینرا، کوردانی خۆجێیی سەرقاڵی تالان و بڕۆی کۆگەکان بوون! چەند ساتێ گێژوێژ لەناو قەڵاکەدا هەڵوەستاین، پاشان لە قەڵا دەرکەوتین. دیمەنێکی تر: شوێنەوارێک لە فەوج و ڕێکخستنەکەی بەجێ نەمابوو: سەرباز و پلەداران دڵۆپێک ئاوبوون و

چووبوونە زەوی!

بەناچاری هاتینەوە ناو قەڵا؛ لەوێ تووشی لۆرییەکی سەر بە بارزانییەکان هاتین، لۆرییەکە تەنەکەی بەنزینی بارکردبوو، بارزانییەکان ئامۆژگارییان کردین کەوا بۆ ڕزگاری لەم تەنگانەیە لەگەڵ ئەواندا بەرەو مەهاباد بڕۆین. لەگەڵ ئەفسەرانی تردا، ئیحسانی، تیوای، ئەرتەشیار، مەحموود تەوەکولی، عەلی ئەسغەری و ماکاریان لە لۆری سواربووین و لە ڕێی بورهانەوە گەیشتینە مەهاباد.

ملازم هەقپەرست و رائید خاکساری، چارەنووسێکی نالەباریان بەسەرهاتبوو، دەمە و ئێوارەی ئەو ڕۆژە گەیشتبوونە بۆکان، وردە ئاغاکانی ئەوێ گرتبوویانن و پاشان بۆ ئیسپاتی دەست بەسینگەوە گری و شاپەروەریی خۆیان ئەوانیان دابوو بە دەستی سوپاوە. لە مەهاباد، لەگەڵ نەقیب زەهیری و نەقیب سەفایی لە دادگە درابوون و حوکمیان بۆ دەرچوو بوو و گوللەباران کران.

***

بەیانیەی ڕۆژی۲۲ی سەرماوەز کە گەیشتینە ناو مەهاباد و کەوتینە پەیدۆزی قازی محەمەد. مەهاباد هێمن بوو، ئێمەیان بۆ نووسینگەی حزبی دێموکراتی کوردستان ڕێنوێنی کرد. قازی محەمەد لەوێ بوو، ئێمەی بەگەرموگوڕی و ڕووی نەرم و نیانەوە وەرگرتەوە. یەکەمین پرسیاری ئەمەبوو: ئایا تاشتمان خواردووە؟ گوتمان شیویشمان نەخواردووە. فەرمانی دا نانی بەیانییان بۆ هێناین. لەدەمی نانخواردنی بەیانیدا گوتی: پێری شەو پیشەوەری تەلەفۆنێکی بۆ کردم گوتی سوپا لە ڕێگەی هاتنی بەرەو تەورێزدایە، ئێمەش خەریکی خۆسازدان بۆ جەلفا و ڕۆیشتن بەرەو سۆڤیەتین. پێشنیاری کرد گوتی: ئێوەش خۆتان و خاوخێزانتان بەشەو مەهاباد بەجێ بێڵن و پەنا وەبەر سۆڤیەت ببەن. لەوەڵامدا گوتم من لە مەهاباد لەگەڵ خەڵک دەمێنمەوە و هەتا ئەو شوێنەی توانام هەبێ دەبمە لەمپەر لە پێش خوێنڕژان و ئاژاوە، هەتا ئەگەر دەردێک بەسەر خەڵکدا هات بەسەر منیش بێت...

ئەم قسەیەی قازی محەمەدی هەر لە بیرماوم هیچ کاتێ لەبیر نەچووە و ناچێتەوە. قازی محەمەد مایەوە و تەنانەتیش لە پێناوی پێشبڕی لە خوێنڕێژی و قەتلوعامی بێ واتادا، بۆ دیمانەی لیوا هومایوونی -ی سەرکردەی هێزی ناردراو- چوو بۆ میاندوواو و بوو بە بەرگر لە پێش دووبارەبوونەوەی ڕووداوەکانی تەورێز و ورمێ و شارەکانی تری

ئازربایجان له کوردستاندا.

قازییه‌کان - قازی محه‌مه‌د و ئه‌بولقاسم سه‌دری قازیی برای و محه‌مه‌د حوسێن سه‌یفی قازیی ئامۆزایان به دادگه‌ی سه‌رده‌می شه‌ڕ سپارد: دادگه هه‌ر سێیانی به هه‌ڵواسین حوکم کرد و فه‌رمانی دادگه له شه‌وێکدا، ته‌واو پاش ساڵێک یه‌ک ڕۆژ که‌م، پاش ڕاگه‌یاندنی ئۆتۆنۆمی له هه‌مان گۆڕه‌پانی «چوارچرا» که قازی محه‌مه‌د به‌ر له‌وه هه‌بوونی حکوومه‌تی خودموختاریی خۆی ڕاگه‌یاندبوو(٤)، جێبه‌جێ کرا.

هه‌ڵوویستی جیاوازی قازی محه‌مه‌د و پیشه‌وه‌ری - ڕێبه‌رانی دوو کۆمه‌ڵگه‌ی کورد و ئازه‌ربایجانی - شوێنه‌واری جیاوازیان به‌سه‌ر خه‌ڵکه‌وه هه‌بوو و کاردانه‌وه‌ی دوور له‌یه‌کیان هێنابووه پێش: پاش تێپه‌ڕینی سی و دوو ساڵ، پیشه‌وه‌ری و فیرقه‌ی دێموکراتی ئازه‌ربایجان، هیچیان نه‌یانتوانی خۆشه‌ویستییه‌ک له دڵی خه‌ڵکدا بۆ خۆیان په‌یا بکه‌ن، له کاتێکدا له مه‌هاباد گۆڕی قازی محه‌مه‌د، بوو به مه‌زارگه و له ده‌سپێکی شۆڕش و ساڵوه‌گه‌ڕی شه‌هیدبوونیدا، سه‌ت هه‌زار مرۆڤ له ده‌وری کۆوه‌بوون و بۆ بیره‌وه‌ری و بیرئانینی ئه‌و، ڕێزیان نواند و به گه‌رمی یادیان کرده‌وه. پاش شۆڕشیش، خه‌ڵکی مه‌هاباد گه‌وره‌ترین گۆڕه‌پانی شاریان به ناوی ئه‌و پیاوه مه‌زنه‌وه ناودێر کرد.

قازی محه‌مه‌د لێمانی پرسی، ئایه له‌م بارودۆخه‌دا نیازی چیمان هه‌یه؟ گوتمان ئێمه لێره بێگانه‌ین، له ئازه‌ربایجانیش حکوومه‌تی فیرقه هه‌ڵوه‌شاوه‌ته‌وه و ژیانی ئێمه‌ی ئه‌فسه‌رانی شۆڕش له مه‌ترسیدایه، هیچ سه‌ره‌وده‌رێکمان نییه له‌وه بترازێ په‌نا وه‌به‌ر تاکه نوای هێمن که یه‌که‌تیی سۆڤیه‌ته ببه‌ین. قازی محه‌مه‌د له‌و هه‌لومه‌رجه ته‌نگژاوی و ئاڵۆسکاوییه‌دا که باڵی به‌سه‌ر مه‌هاباددا کێشابوو، به هێمنییه‌ک که بۆ ئێمه مایه‌ی سه‌رسڕمان بوو گوتی: جارێ له پێشه‌وه ئه‌و چه‌که ته‌ماتیکانه‌ی پێتانه ده‌ردی سه‌ره بۆ ئێوه، کورد ئاشقه چه‌کن، هه‌ر به‌بۆنه‌ی ئه‌مه‌وه له ڕێگه و باناندا ته‌نگتان پێ هه‌ڵده‌چن. ئه‌و شه‌ش ئاگره‌ی پێتانه له بن جلکه‌وه‌ی ببه‌ستن به‌ستانه، جلکی ئه‌فسه‌رییش بگۆڕن بۆ ئه‌وه‌ی نه‌ناسرێنه‌وه.

فه‌رمانی دا جلکی غه‌یره سوپاییبیان بۆ هێنایین. له ژووره‌که‌ی ته‌نیشته‌وه، جلکی

(٤) نه‌مران پێشه‌وا قازی محه‌مه‌د و دوو قازییه‌که‌ی تر له به‌ره‌به‌یانی ڕۆژی ٣٠ ئادار ١٩٤٧ له‌دار دران به‌ڵام ڕاگه‌یاندنی کۆماری کوردستان له ٢٢ی کانوونی ٢ی ١٩٤٦ بوو واته ساڵێک و دوو مانگ زیاتر له‌و نێوانه‌دا هه‌یه. وه‌رگێڕ.

خـۆمـــان گـــۆڕی، دووســـەت تومـــەنیـــشی بۆ خـــەرجـــیی ڕێگە دا بە هەریەکـــەمـــان، بیرهێنەوەیەکیشی بە زمانی کوردی بۆمان نووسی و دایە دەستمان بەم ناوەڕۆکە: «برایانی کـــورد! ئەمـــانە ئەفـــســـەرانی ئازەربایجـــانـن کـــە بۆ یارمـــەتیی ئێـــمـــە هاتبـــوون، لە هەر پشتیوانییەک کە لە دەستتان دێ بۆ ئەمانە کەمتەرخەمی نەکەن».

خواحافیزیمان کرد و بە پێیان ملی ڕێگەی ورمێمان گرتەبەر. دەوری نیوەڕۆ گەیشتینە قاوەخانەیەک، نانی نیوەڕۆمان خوارد؛ پاش فراوین ویستمان بەڕێ بکەوینەوە، لۆرییەک کە بارزانییـــەکـــانی هەڵـگرتبـــوو گـــەیشـتـــە جێ. لە ورمـــێـــوە دەهات، لۆرییەکـــە لەبەردەم قاوەخانەکەدا وەستا. بەرپرسی چەکدارەکان پیاوێ بوو بەناوی کاک ساڵح، بارودۆخی ڕێگە و حـــاڵی فـــیـــرقـــەمـــان لە ورمێ لێی پرسی، گـــوتی لە ورمێ کـــوشـــتـنی فـــیـــرقـــە هەر بەردەوامە و «ئازاد وەتەن»ی بەرپرسی فیرقەشیان کوشتووە. گوتی لە بەرژەوەندی ئێوەدا نییە بچن بۆ ورمێ، چونکە بێگومان دەتانگرن. پێشنیازی کرد لەگەڵ ئەودا بۆ نەغەدە کە لە ژێر دەستی بارزانییەکاندا بوو بچین هەتا ئەو دەمەی بارودۆخ برێک هێور دەبێتەوە.

پێشنیازی کاکە ساڵحمان بەڕاست زانی و پەسندمان کرد و لەگەڵ ئەو و پیاوەکانیدا بۆ نەغەدە چووین. شەو گـەیشـتـینە نەغـەدە، پرسیـاری قـاوەخانەیەکمـان کرد و داوای نان و چامان کـرد. هەر ئەو کـاتە بـانگ ڕاهێـڵـێـک لە کۆڵانان بانـگەوازی کرد گوتی لە نەغـەدە حکوومەتی عەسکەری فەرمانڕەوایە و، حوکم حوکمی شێخ محەمەد سدیقی بارزانییە. لە سەعات ٩ی شەو بەدواوە هاتن و چوون قەدەغەیە. بە بیستنی دەنگی بانگ ڕاهێڵ کە لە شوێنی مـایکرۆفـۆنی ئەمرۆدابوو هەسـتـمـان بە تەنایی کرد و، سەبارەت بەمـاندووەتیمـان لەسەر سەکۆی قاوەخانەکەدا نووستین.

نیـوەی شـەو بوو لە دەنگی ڕاکـێش ڕاکـێـشی دەسکی چەک و بانگی «هەسـتـنەوە!» لە خەو ڕاپەڕیین. چەند کـەسێـکی کوردبوون - پاشان زانیـمانەوە کەوا کـورد نەبوون و تەنیا سـەروگـوێلاکـیـان کـوردی بوو - تفـەنگیـان بەرەورووومـان کـردبووەوە و گـوتیـان: دەست بەرزکەنەوە، نەجووڵێن!

دەسـتـمـان بەرزکـردەوە، نەجـووڵاین؛ یەکـێـکیـان هاتە پێـشەوە و دەمـانچـەکـانی لێ کردینەوە، فەرمانی دا لە قاوەخانەکە دەرکەوین، ئیتر دیل بووبووین، ئێمەیان لە پشت یەکەوە ڕێز کرد و بردیانینە مزگەوتێک - بەفر دەباری - ئەوان پاسەوانییـان لێ گرتین و، ئێمەش بەرەی مزگەوتمان بەسەر خۆمان دادا و هەتا بەیانی لێی نووستین.

بەیانی جارێکی تر ئێمەیان لە دوای یەکتردا ڕیز کردەوە و، لەگەڵ پاسەوانان، کە لە قەرەپاپاغی نەغەدە بوون، بەناو نەغەدەدا ئێمەیان بردە خانووی ئاغایەک گوایە ناوچە (ناحیة)ی نەغەدەیە.

لە ڕێگە تووشی یەکێک لە فیدائیان بووین. لاوێکی ئاشووری بوو بە ناوی میکائیل، کە هەندێک لە هاوەڵانی ئێمەی دەناسی، گوتی کێوەتان دەبەن؟ هاوەڵە ناسیارەکەی گوتی دوێنێ شەو ئێمەیان لە خەودا لە قاوەخانە گرتووە و وا ئێستا بۆ ناوچەمان دەبەن.

لاوە ئاشوورییەکە ڕۆیشت و ئێمەش گەیشتینە ناوچە؛ لە دەرگەی دەرەوەی خانووی ناوچە ئێمەیان پشکنی و پارە و سەعات و قەڵەم - بە کورتی چیی هەمانبوو و نەمانبوو - لێیان سەندین و گوتیان چاوەڕوان بن با بەڕێوەبەری ناوچە تاشت بخوات پاشان بۆ شوێنێکی هێمنتان دەنێرێ!

بەڕێوەبەری ناوچە، ئەمیر فەلاحی پاپاغ بوو کە ئێستا پارووێکی چەوری دەست کەوتبوو بۆ ئەوەی لە بریتی گوناحی هاوکاریکردنی حکوومەتی خودموختار، بیدات بەدەست حکوومەتی شاوە و مێداڵ و نیشان وەربگرێ.

بەڵام بەخت بۆی نەهێنا و، چارەنووسی ئێمە لاپەڕەیەکی تری گرت. لەو هەرا و بەزمەدا، لاوێکی پازدە شازدە ساڵەی بارزانی، کە پاشان دەرکەوت عەلی محەمەد سدیقە، کوڕی شێخ محەمەد سدیق و برازای مەلا مستەفای بارزانییە، بەخۆ و بە دوو چەکدارەوە پەیابوون، سەری کێشایە ئەو ژێر زەوینەی ئێمەی تێدا بووین و چووە نهۆمی سەرەوە و یەکڕاست چووبوو بۆ لای بەڕێوەبەری ناوچە.

بارودۆخەکە گۆڕا؛ ئێمەیان بردە ژووری پێشوازیی بەڕێوەبەری ناوچە، ئەو کەسەی پێی دەگوترا (بەڕێوەبەری ناوچە) زمانی لاڵ بووبوو لە وەڵامی پرسیاری عەلی محەمەد سدیقدا کە دەیپرسی ئەمانەتان بۆچی گرتووە؟ دەیگوت بۆ پاراستنی گیانیان، ویستم بیانپارێزم، بەڵام زوانی ئێمەش ئێستاکە بووبووەوە و کەوتبووینە پیلەکە و دەمانگوت ئەگەر وابوو بۆچی چەکتان لێ سەندین، بۆچی پارە و کەلوپەلەکانتان بردین!... هەرچۆن بێ، شەش ئاگر و پارە و کەلوپەلەکانیان پێ داینەوە. پاشان بۆمان دەرکەوت ئەو لاوە ئاشوورییە چووەتە جێگەی شێخ محەمەد سدیق و ڕووداوی گیرانی ئێمەی پێ ڕاگەیاندووە و ئەویش کوڕەکەی خۆی بۆ ڕزگار کردنی ئێمە هەناردووە.

ئەوە سێیەمین جاربوو بارزانییەکان لەو بارودۆخ و هەلومەرجەی لە ناوچەکەدا باڵی

خۆی کێشابوو، ژیانی ئێمەی ئەفسەرانی بێ تاقیکردنەوەیان لەو هەرێمە بیانییەی کە زمانی خەڵکەکەی تێ نەدەگەیشتین، ڕزگار دەکرد.

لەگەڵ عەلی محەمەد سدیقدا چووینە لای باوکی، شێخ محەمەد سدیق لەگەڵ ئێمەدا بەزەییی هەبوو، گوتی نەغەدە بۆ ئێوە شوێنێکی هێمن نییە بۆیە لەوانەیە ئەم ڕووداوە جارێکی تر دووبارە ببێتەوە، ئێوە هۆیەکی چاکن بۆ خۆ لە حکوومەت نێزیک کردنەوەی ئەم جۆرە ئاغایانە، بۆ ئێوە وا چاترە بچن بۆ شنۆ کە تەواو لە ژێر دەسەڵاتی ئێمەدایە.

ئەو ڕۆژە، نەقیب تەفرشیان و ملازم یەکەم، رەئیس دانا - لە ئەفسەرانی خۆراسان - بەخۆ و بە تۆپی٧٥ی چیایی و تۆپهاوێژ و وڵاخی پێوە بەستراو، لە سایەی پارێزگاریی بارزانییەکانەوە گەیشتنە نەغەدە. ملازم سێیەم حەمید دەباغ زادەی ئەفسەری فیرقەشیان لەگەڵدابوو، تەفرشیان لە نەغەدە هەریەکە و بڕێک پارەی بۆ مەسرەفی ڕێ دا بە سەربازەکان و ڕەوانەی ماڵی خۆیانی کردن.

دەمە و ئێوارەی هەر ئەو ڕۆژە، عەقید غەفاری، بە نوێنەرایەتیی لیوا هومایوونیی سەرکردەی هێز، بۆ وتوویژ لەگەڵ جەنەرال بارزانیدا گەیشتە نەغەدە و بانگهێشتنیان کرد هەتا بۆ وتوویژ لەگەڵ بەرپرسانی حکوومەتدا بچێ بۆ تاران. ئامانجی ئەو چاوپێکەوتنانە ڕێ لێ برینەوەی بەیەکدادانی زووی نێوان یەکەکانی سوپا و بارزانییەکان بوو. بەرپرسانی سوپا کە ئامادەی ئەو جۆرە بەیەکدادانانە نەبوون، سەبارەت بە زانینی مێژووی خێڵی بارزان و خەباتی ڕابردوویان لە هەمبەر دەوڵەتەکانی عوسمانی و عێراقدا، بەم باسە شڵەژا بوون.

جەنەرال بارزانی دوای وەرگرتنی پەسندایەتیی شێخ ئەحمەدی برا گەورەی خۆی، کە سەرۆک و ڕێبەری ئاینیی خێڵ بوو، تەبای عەقید عیزەت عەبدولعەزیز و عەقید میرحاج ئاکرەیی - لە ئەفسەرانی کوردی ڕاکردوو لە سوپای عێراق - بەرەو مەهاباد کەوتنە ڕێ و، شان بەشانی عەقید غەفاری، بۆ دیمانەی شا و وتوویژ لەگەڵ سەرۆک وەزیران ئەحمەد قەوام و رەزمارای سەرۆک ئەرکانی سوپادا چوو بۆ تاران.

وەک گوترا خواستی سوپا لەم کردەوەیەدا سوود لە هەل وەرگرتن بوو بۆ ئەوەی هێز کۆجێ بکات و خۆی ساز بدات بۆ سەرکوتینەوەی بارزانییەکان. بارزانییەکانیش بێگومان لەم نیازە حاڵی بووبوون، ئەوانیش پێوەبوون سوود لە هەل وەربگرن. ئافرەت و منداڵیان دەست و پێگر بوون و دەیانویست زستانەکە بەسەر ببەن و خۆیان بەبەهار بگەیەنن.

دوماهیی مانگی سەرماوەزی ١٣٢٥ بوو کە دە کەس لە ئەفسەرانی پەرگەندە: تەفرشیان، ئیحسانی، ئەرتەشیار، تیوای، رەئیس دانا، زەربەخت، عەلی ئەسغەری، تەوەکولی، ماکاریان و دەباغ زادە بەخۆ و دوو تۆپی ٧٥ی چیایی چووینە شنۆ. لە شنۆ خانووەکی گڵینمان بە کرێی ڕۆژانەی دوو تومان بە کرێ گرت و نێزیکەی چوار مانگ هەر چوارمان لەو خانووەدا ژیایین.

هەلومەرجی ژیان بێ رادە زەحمەت بوو، لە پاکی و گەرما و، تەنانەت ئاودەستیش شتێک نەبوو ناوی هەبێ. کێچ و ئەسپێش بێ ژمار، زۆربەی شەوان کاتی بێ کارێمان بە کوشتنی ئەسپێوە بەسەر دەبرد. ئەوەش جۆرێ بوو لە ژیان، لاو بووین، هەر چەندە ئەسپێ هەبوو پێکەنینیش هەر هەبوو، مایەی پێکەنین زۆر بوون... ئەسپێ یەکێ بوو لەوان.

ڕۆژان دەچووینە «دیوەخانە»، واتە بۆ ژووری ئەنجوومەن و پرس پێ کردنی شێخ ئەحمەد دەچووین و بە وێژ و ڕاوێژ بەسەرمان دەبرد. لەوێ بە چا پێشوازیی لێمان دەکرد. ئەو ڕۆژانەش کە ئاوهەوا خۆش بوون، تەفرشیان و رەئیس دانا و دەباغ زادە لەگەڵ گەلەپیاوی خۆیان، کە تفەنگداری دەسبژار و لاوی بارزانی بوون، دەچوونە دەر و مەشقی بارکردن و هێنانە خواری تۆپ و مەشقی بەکارهێنانی تۆپەکانیان دەکرد. ئەرتەشیار باجگری ئەو کاڵایە بوو کە دەهاتە شارۆکە؛ ئیحسانی سەرۆکی لە دادگەدانی سەرپێچی کەران لە بڕیار و منیش شارەوان بووم کە ئەرکی سەرەکیم دیاریکردنی نرخی پێبژێوی گشتی بوو. نرخەکانم بە هۆی بانگ راهێڵەوە لە کۆڵان و بازێران دەگەیاندە گوێی خەڵک. بۆ ئەوەی نەبینە بارگرانی بەسەر بارزانییەکانەوە کە خۆشیان دووچاری فرە ئاڵۆزیی ژیان بووبوون - لەنێو خۆماندا ڕێک کەوتبووین، هەموو ڕۆژ هەر یەکە و دوو تومەن بۆ خەرجیی ژیان، لە سندوقی داراییی گشتی وەرگرین کە لەو هەلومەرجە ئاڵۆزەدا باییی ئەوەی دەکرد بە ژیان بمێنین.

مەلا مستەفا و هاوەڵەکانی لە نیوەی دووەمی مانگی بەفرانبار لە تاران گەڕانەوە. جەنەرال بارزانی دوای گەڕانەوەی، شەوێک ئێمەی ئەفسەران و بڕێک لە سەرکردەکانی بارزانیی بانگهێشتن کرد و بەسەرهاتی چوونە تاران و ئەو پرسانەی لە کاتی وتووێژدا لەگەڵ شا و قەوامولسەڵتەنە و رەزمارادا باس کرابوون بۆ ئێمە گێڕایەوە. شا داوای کردبوو ئێمەی ئەفسەرانی راکردوو بەدەستەوە بدرێین، ئەویش گوتبووی بەڕێز ئێوە رازی مەبن ئابڕووی خێڵی بارزان ببێ بە قۆچی قوربانی و، تووک و نفرێ نەوەگەلی داهاتوومان

بۆ بمێنێ. نەریتی خێڵی بارزان نییە ئەو میوانانەی پەنایان بۆی هێناوە بەدەستەوە بدات. من ئامادەم لە بریتی ئەو شەش ئەفسەرە راکردووە (ئەفسەرانی سوپا، جیا لە ئەفسەرانی فیرقە، کە بە بۆچوونی سوپا، بە ئەفسەر نەدەناسران) ١٨ کەس لە کوڕان و برازایانی خۆم لەبەر دەستی مەزنرێزداردا دابنێم. بەڵێ لە بەدەستەوەدانی ئەمانەدا بمانبوورن!

پوختەی قسەکانی ئەوەبوو لە وتووێژ لەگەڵ شادا، پێشنیازی ئەوی لە بارەی چەک لێ کردنەوەی بارزانییەکان و جێ نیشتەکردنیان لە ناوچەی هەمەداندا پەسند کردووە، بەڵام گوتوویەتی کەوا پەسندایەتیی یەکجاری دەبێ شێخ ئەحمەدی براگەورەی بیدات، کە هەم سەرۆکی دنیایی و هەم ڕێبەری ئایینیی خێڵە و، بەڵێنیش دەدات کەوا شێخ ئەحمەد بەمە رازی بکات و، بۆ ئەو خۆ ئامادەکارییە دەگەڕێتەوە شنۆ.

پاش گەڕانەوەی مەلا مستەفا لە تاران بە گوێرەی ئەو ڕێککەوتنەی کە کرابوو بارزانییەکان لە بریتی وەرگرتنی هەندێ ئارد و دانەوێڵە، نەغەدەیان چۆڵ کرد و ناوچەی ژێر دەستیان شنۆ و دەوروبەری لێ مایەوە.

سێ مانگ بەسەر جێنیشتە بوونی بارزانییەکان لە شنۆدا بەسەرچوو، چالاکیی سوپا بە ئامانجی دەرپەڕاندنیان لە ناوچەکە گورجوگۆڵ بوو و، سوپا لە پێشەکیی ئەو کارەدا کەوتە چەکدارکردن و سازدانی خێڵانی کورد. دەسوەشاندنی سوپا ئیتر نێزیک بووەوە.

مەلا مستەفا بۆ وتووێژ لەگەڵ سەرکردەکانی خێڵانی هەرکی و شکاک و، بانگ لێ گێرانەوەیان بۆ خەبات و هاوکاری بەرەو باکور چوو. نەقیب تیوای و من لەگەڵ تفەنگدارانیدا چووینە بەرەی ناوبراو- هەتا گوندی سیلواناش چووینە پێشێ - لەوێ زانیمان کەوا سوپا هێڵی بەرگریی پتەوی دامەزراندووە و ڕێگەی دەربازبوونی بارزانییەکان بۆ باکور بەستراوە.

لە ٢٤ی مانگی رەشەمێ، پێک هەڵچوونی نێوان بارزانییەکان و یەکەگەلی سوپا و چەکدارانی خێڵان لە تەرگەوەڕ ڕووی دا و لە ئەنجامدا بارزانییەکان ناچاری پاشەکشە بوون. ئەو ڕۆژەش زانیمان کەوا لە نەلۆسیش، لە نێوان نەغەدە و شنۆ، شەڕێ ڕووی داوە و لە ئەنجامدا ٣٠ مرۆڤی بارزانی، بە پشتەوانیی ئاگری تۆپخانەی تەفرشیان، یەک فەوجی پیادەیان تەفر و توونا کردووە و ٥ ئەفسەر و ١٧ پلەدار و ٣٠٠ سەرباز دیل بوونە و، دوو تۆپی ٧٥ی چیایی و دوو هاوەن و برێ گوللە تۆپ و هاوەن و کەلوپەل دەسکەوت بوونە و، رائید کلاشیی سەرکردەی فەوجەکەش بریندار بووە و پاشان خۆی

کوشتووه.

ڕۆژی دواتر لەگەڵ تیپوای چووین بۆ شنۆ و لەگەڵ هاوەڵانی تردا چووینە ئەو مزگەوتەی شوێنی حەوانەی دیلەکان بوو و کەوتینە گەڕان بە دوای ئەفسەراندا، ئەفسەرەکان بەرگی سەربازییان لەبەردا بوو بەڵام ئێمە ناسیمانەوە و دڵنیامان کردن کەوا هیچ ناڵەبارییەک لە گۆڕێدا نییە. لە بیرمە مریشکێکمان هەبوو کە پاش ماوەیەکی دوور و درێژی تامەزرۆیی بۆخۆمانمان کڕیبوو و، بۆ خواردنی بەڵێنی زێڕینمان بە خۆمان دابوو، خستمانە بەردەستی ئەوانەوە. ئەو ئەفسەرانە برێتی بوون لە: نەقیبی بژیشک خوادۆست، ملازم یەکەمی پیادە میر هەمزە یاقووبیی سەرکردەی تیپی هاوەنهاوێژ، ملازم یەکەم کەمالیی سەرکردەی گرووپی تۆپخانە، ملازم یەکەمی پیادە بەسیرەت و فاتحی.

ڕۆژی سێیەمی ئاخەلێوەی ۱۳۲٦ لەبەرەی باکوردا، سوارگەلێک لە هێزی حکوومەت بەسەرکردایەتیی ملازم یەکەم ئیمامی و بە پشتەوانیی تیپێک دەسڕێژکەری گەورە، بە ئارمانجی دەس بەسەرداگرتنی ئەو بانانەی بەسەر (هەلەج)یاندا دەڕوانی کەوتنە پەلامار. ئەو یەکەیە لە نکاو و بێ چاوەڕوانی، کەوتە بەر ئاگربارانی بارزانییەکانەوە! لەو پێکدادانەدا، ملازم یەکەم ئیمامی و ۱۳ کەس کوژران و، سەرکردەی تیپی سوارە، ملازم دووەم حەمید جیهانبانی (کوڕی ئەمانوڵڵا جیهانبانی) تەبای ۱۵ سەرباز بەدیل گیران و گوازرانەوە مۆڵگەی دیلان لە شنۆ.

لەو ڕووبەڕووبوونەوانەی لەبەرەی باکوردا هاتنە پێش، سەرکردەی بەرە مەلا مستەفا خۆی بوو، کە لە بانەکانی خەلەجەوە سەنگەریان گرتبوو. لە هەمان بەرەدا، ڕووبەڕووبوونەوەیەکی تر لە نێوان بارزانییەکان و سوارانێک لە فەوجی فەوزییەدا ڕووی دا کە لە ئەنجامدا، ملازم دووەم (هاتفی)ی سەرکردەی سواران و ۷ کەس لە پیاوەکانی کوژران و فەوجی فەوزییەش ناچاری پاشوەکشان بوو.

جێ نیشتەکردنی پتر لە ۳۰۰ دیل و خۆراک پێدان و پاراستنیان گیروگرفتێکی گەورەبوو بۆ بارزانییەکان. لە یەکەمین دە ڕۆژی ئاخەلێوەدا پاش گەڕانەوەی ئێمەی ئەفسەران لە بانەکانی سۆفیان کە برێتی بوو لە بەرەی کردەوەگەلی بەرەی ڕۆژهەڵات، کاتێ گەیشتینە شنۆ چووین بۆ دیمانەی شێخ ئەحمەد و پێشنیارمان بۆ کرد کەوا بۆ ئەوەی گرانی و دژواریی پەیاکردنی خۆراک و پاراستنی دیلەکان کەم بێتەوە قایل ببێ سەرباز و پلەداران بەرەڵڵا بکات و تەنیا ئەفسەران گل بداتەوە، شێخ ئەحمەد ئەو پێشنیازەی

پەسندکرد. پلەدار و سەربازانی دیلمان بە دەسبەسەری گەیاندە نێزیکی هێڵی پێشەوەی بەرەی نەغەدە و بەرەڵڵامان کردن. تەنیا شەش ئەفسەری گیراو بەدیلی لامان مانەوە.

وەک گوتمان مەلا مستەفا لەبەرەی باکور بوو و ئێمە لە بەرەی باشوور بووین. پاش لەنێوچوونی فەوجی کلاشی و خۆ بەدەستەوەدانی یەکەکان لەبەرزاییەکانی نەڵۆس، سەرکردەی بەرەی شنۆ (بەداخەوە ناوەکەیم لەبیر نییە) تەفرشیانی راسپارد کەوا بە تۆپێکی ٧٥ی، لە بانەکانی ڕۆژئاوای سۆفیان سەنگەر بگرێ و، پارێزگاری لە هێرشی بارزانییەکان بۆ سەر مۆڵگەی سۆفیان بکات، ئێمەی ئەفسەرانیش بەخۆ و بەتۆپەوە هەڵکشاینە سەر بەرزاییەکانی سۆفیان. تەفرشیان ڕووی تۆپەکەی بەرەو قەڵای سۆفیان دامەزراند و، ئێمەش لە نێزیک ئەو سەنگەرانەی بەسەر قەڵای سۆفیانیاندا دەڕوانی دانیشتین.

کاتی دەمەو بەیان، ئاگری تۆپی تەفرشیان، بە ئارمانجی دیاریکردنی نیشانە، کەوتە کوتینەوەی قەڵای سۆفیان، بەڵام پاش چەند دەقیقەیەک ئاگری تۆپی ١٠٥یی سوپا لە سۆفیانەوە سەنگەرەکانی ئێمەی خستە بن ئاگری خۆی و ٣٠ خولکەی پاشتر باڵەفڕەیەکی شەڕکەر لە ئاسمانی بانەکانی سۆفیان دەرکەوت و کەوتە بۆردمان و ئاگرباراندن بەمەش توانستی هێرش بردنە سەر سۆفیانی لەدەست شەڕوانانی بارزانی هێنایە دەر. تەفرشیان کە ئەمەی دیت بە پەلەپەل تۆپەکەی لە ولاخ بار کرد و بەرەو شنۆ گەڕاینەوە.

من لەم ڕاسپێرییەدا، هەتا ڕادەیەک تیۆریی هاویشتنی تۆپ لە تەفرشیانەوە فێربووم، ئیتر لەوە پاش بەخۆ و بەیەکێ لەو تۆپانەی لە نەڵۆس بووبوو بەدەسکەوتمان، سەربەخۆ دەچووم بۆ بەرەکانی تری شنۆ (سەڵدووز). عەقیدی تۆپخانە عیزەت عەبدولعەزیز و ملازم یەکەم ڕەئیس داناش لە ئاگربارانی بە تۆپ، لە هێڵە جۆراوجۆرەکانی بەرەدا چالاکییان دەنوواند. بەڵام پاڵەپەستۆی سوپای ئێران و زاڵیی چەک و سوود وەرگرتنی سوپا لە تانک و باڵەفڕ، بارزانییەکانیش سەبارەت بە کەمیی ئازووخە و چەک و دەست و پێگریی خاوخێزانیان، پەکیان کەوتبوو، سرەوتیان نەبوو و ناچاربوون گاف بە گاف بەرەو پاش بگەڕێنەوە. پێشمەرگە کە دەنێردرانە هێڵی پێشەوەی بەرە، بەردەوام دڵیان بە خێزانەکانیانەوە بوو و زۆرجاران بۆ پێڕاگەیشتن بەکاروباری ژیانی خێزان، بەرەیان بەجێ دەهێڵا.

کاتی شیوی ١٤ی ئاخەلێوە بوو کە لەگەڵ ملازم دەباغ زادە و یەک پارچە تۆپ

گەیشتینە شنۆ. زانیمان شێخ ئەحمەد تەبای خێزانەکان، شارۆکەی بەجێ هێلاوە و بەرەو سنووری عێراق ڕۆیشتووە. شەو لە شنۆ ماینەوە و گەردوگۆلی بەیانیە، تۆپمان لە باخەکانی باشووری شنۆ دامەزراند: هێشتاکە هەوا ڕۆنی نەبووبوو کە سەروگوێلاکی ئەو گرووپە سوارانەی خێلان کە لە خزمەتی سوپادا بوون پەیابوون و لە پێدەشتەکەوە دەهاتنە پێش. لەبەرئەوەی ئەو شوێنەی ئێمەی تێدا دامەزرابووین پێداویستییەکانی پاسەوانیی خۆی لەگەلدا نەبوو، پاش هاویشتنی چەند گوللە تۆپێک و پاش ڕەواندنەوە و ترساندنی سوارەکانی پێشوو، ناچار تۆپەکەمان لە ولاخان بارکرد و بەرەو شنۆ گەڕاینەوە کە بازێڕ بە وێنەی شاری تارمایییان خۆی دەنوواند و بچووکترین شوێنەواری ژیان و جوولانەوەی ژینوەرانی پێوە دیار نەبوو. کۆلان بە کۆلان رابردین و لە داوێنی ڕۆژئاوای شارەوە کە بانەکانی زەردکۆ و چیایەکانی زاگرۆس بوو و بە سنووری عێراق بە کۆتا دەهات، ملی ڕێگەمان گرت و هەلکشاین. دەوری نیوەڕۆ گەیشتینە (گەلاز) کە گوندێکی بچووکە لە داوێنی سنوور. شێخ ئەحمەد لەوێ بوو. خێزانەکان بەڕێگەی رووباری (گادەر)ەوە بوون کە هیلی سنووری بوو.

مەلامستەفا هێشتا لەدەشتی «مەرگەوەڕ» (بەرەی باکور) بوو. لە ڕاستیدا خەریکی کردەوەی پاراستنی «پاشکۆ» بوو هەتا بەم هۆیەوە خێزانەکان هەلی بە هێمنی گەیشتنە سنووریان هەبێ. خێزانەکان، بەو بڕە کەمۆکەیەی لە کەلوپەلان هەیانبوو، بەو بەفر و سەرماوسۆلەیە، ملی باریکە ڕێیەکیان لەو ناو بەفرەدا گرتبووەبەر و بەرەو «دۆلی گادەر» دەڕۆیشتن. ئێمەش لەگەل ئەو کاروانەدا بووین و لە بۆمبابارانی بالەفڕان بەدەر نەبووین. لە یەکێ لەو هەلمەتانەی بالەفڕاندا، هاوەل و هاوسەنگەرمان، ملازم عەلی ئەسغەری، لەلای رانیەوە بە هۆی پریشکی بۆمباوە بریندار بوو، چەندی کات بەسەر دەچوو برینەکەی تەشەنەی دەکرد و رانی زیاتر دەئاوسا کە ئیتر نەیدەتوانی ڕێ بکات بۆیە چارناچار سواری ولاخمان کرد و بەدەست نێزیکترین بنکەی سنووریی عێراقیمانەوە دا. ئەویان بۆ بەغدا برد و نەشتەرکارییان بۆ کرد و چاک بووەوە. بێگومان ئەمەمان پاشان زانیەوە، پاش چاکبوونەوە، دادگەیەک لە بەغدا، ئەوی بە هۆی پەڕینەوەی نایاسایی لە سنوور، بە سێ مانگ گرتووخانە حوکم دا و پاش بەسەربردنی ماوەی حوکمدراوی، گواسترایەوە گرتووخانەی «ئەبو غرێب»، ئەو کاتە ئێمەش لەوێ بووین.

ڕێڕۆیشتنی ئێمە لە بەرزاییە هەزار بەهەزار و بەفرگرتووەکانی زاگرۆس هەمووی

بەسەریەکەوە ١١ ڕۆژی کێشا. لەو یازدە ڕۆژەدا نەحەشارگەیەک بۆ خەو و پشوودان هەبوو و نەپێبژیوییەک کە زگ تێر و دڵ ڕازی بکات. شەو و ڕۆژ لەهەوای کراوەدا بووین، بەڵام لەبەرئەوەی لاوبووین، لاوێتی وەڵامدەرەوەی هەموو ئەم ناخۆشییانە بوو.

ڕۆژانی دووا مانەوەمان لە ئێران لە لێواری چۆمی «گادەر»دا بەسەر برد، کە هێڵی سنووری بوو. مەلا مستەفا یەکێ لە تفەنگدارانی خۆی بە دوای تەفرشیاندا نارد - یادی بەخێر تەفرشیان وتەبێژی ئێمە بوو - و پرۆگرامی داهاتووی خۆی بۆ ئەو باس کرد. گوتبووی دەیەوێ پاش خۆ بەدەستەوەدانی شێخ ئەحمەد و خێزانەکانی بارزانی، خۆی لەگەڵ خەباتکارە چەکدارەکانیدا بچێتە عێراق و ناوچەی بارزان و، خەریکی شەڕ و شۆڕ بێ هەتا ئەو کاتەی خۆی و هاوەڵەکانی و شێخ ئەحمەد گیانیان دەستەبەربێ. پێشنیازی بۆ تەفرشیان کردبوو ئەگەر «بمانەوێ» دەتوانین لەگەڵیدا بڕۆین: «ئەگەر نانێ پەیابوو پێکەوە دەیخۆین، ئەگەر کوژراشین لە تەنیشت یەکتردا دەمرین».

هەموومان ئەو پێشنیازمان پێ خۆش بوو، لەبەرئەوەی بەدارەوەکرانمان لە ئێران بێ چەند و چۆن بوو، متمانەشمان بە عێراق نەبوو لەبەرئەوەی دڵنیابووین بەدەستی دەوڵەتی شا- وەمان دەدات.

ڕۆژی ٢٥ی ئاخەلێوەی ١٣٢٦، ئەو کاتەی هەموو خێزانە بارزانییەکان لە پردی کاتەکیی «گادەر» پەڕینەوە و خۆیان بەدەست عێراقەوە دا، مەلا مستەفا جارێکی تر ئێمەی داواکرد و گوتی: «من و ئەم هاوەڵانەم دەبینن، لە هەر سێ وڵاتی عێراق، تورکیا و ئێران حوکمی لە سێدارەدانمان لەسەرە، لەبەرئەوەی بەردەوام لەگەڵ سوپا و هێزە حکوومەتییەکاندا شەڕمان کردووە ڕێگەی خۆ بەدەستەوەدانمان لێ گیراوە، بەڵام ئێوە، تەنیا لەگەڵ ئێراندا شەڕتان کردووە و، لە عێراق تاوانێکتان نەکردووە کە پێویستی بە گیان لەسەردەستی هەبێ. یاساگەلی عێراق ئێوە وەک پەنابەرێک دەپارێزێ...»

وا تێ گەیشتین کەوا بۆچوونی خۆی گۆڕیوە و سەبارەت بە هۆگەلێ کە بۆ خۆی زانراو بوون، حەز ناکات ئێمە لەگەڵ خۆیدا بۆ عێراق ببات. وێڕای ئەمەش بڕیارمان دا ئەو لەبەرامبەر هەڵوێستێکی وەرگیراودا دابنێین و، ئێمەش - ئەو گوتەنی - «یاخی» ببین.

دەمەو ئێوارەی ئەو ڕۆژە مەلامستەفا و ٥٠٠ کەس لە شەڕوانانی هەڵبژاردەی بارزانی، بە بانەکانی باکوری دۆڵی گادەردا هەڵگەڕان؛ ئێمە دوا کەس بووین کەوا لە دوا دوای ئەوانەوە، هێڵی سەروومان گرتەپێش. تەفرشیان تایەکی گەرمی لێ هاتبوو. شەوێکی

ساردبوو کە گەیشتینە ڕەشماڵی هەرکییەکان، سەرمان دەکێشایە هەر چادرێ پڕ بوو، کەس «وەری نەدەگرتینەوە». داوامان کرد شوێنێکمان پێ بدرێ شەوی تیا ببەینە سەر، گوتیان «شوێنێ بۆ خۆتان بدۆزنەوە». بەکورتی ڕوویێکی خۆشیان پێشان نەداین. پاشان ئێمە ئەم کاردانەوەیەمان لەلای خۆمان شرۆڤە کرد و گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کەوا: یەکەم ئێمە چیتر لە ڕووی سوپاییەوە ئەو نرخەی جارانمان بۆ بارزانییەکان نییە؛ لەبەرئەوەی لوولە تۆپەکانمان تەقاندبووەوە و (دەرزیلە)کانیانمان لە چۆمی گادەر هاویشتبوو؛ دووەم - لە بواری شەڕوانیدا ئێمە بایەخی تفەنگداری بارزانیمان نەبوو و، بەواتا «دەست و پێگر» بووین، سێیەم مۆری کۆمۆنیستیمان بە نێوچەوانەوە بوو، و هەڵوێستی مەلامستەفامان لە وتووێژ لەگەڵ دەوڵەتی عێراق کە دەسپۆتی ئینگلیزبوو لاواز دەکرد و ئەگەر ڕێککەوتنێ لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا بووبوایە، ئەو ڕێککەوتنە بەناچاری ئەو مەرجەی تێدا دەبوو کە ئێمە بەدەست دەوڵەتی عێراقەوە بدات، ئەمەش ناکۆک بوو لەگەڵ نەریتی بارزان و پاراستنی پەنابەرانی ئەو خێڵە.

ئەو شەوە هەر چۆنێ بێ لەو بەفر و سەرماوسۆڵە تیژەدا، تەفرشیان - مان کە هەتا ئەو ڕۆژە لە نێو بارزانییەکاندا خاوەن ڕێز و نێزیک بوو- بە ڕووقایمی پەستایە یەکێک لە چادرەکان و خۆشمان هەتا بەیانی لەرزیین.

لەگەڵ ڕووناک بوونەوەی هەوادا، کۆبوونەوەیەکی راوێژمان گرێ دا و بەرژەوەندیمان لەوەدا بینی خۆمان لە مەترسیی بەدەستەوەدران بە ئێران بپارێزین و داوای پەنابەری لە دەوڵەتی عێراق بکەین. بەو بڕیارەوە، لەو ڕێگەیەی لێی هاتبووین گەڕاینەوە دوا و بەرووکاری دۆڵی گادەردا سەرەو لێژ بووینەوە. تیوایمان بە نوێنەرایەتیی ئەم کۆمەڵەیە بۆ وتووێژ ناردە لای سنوورڕوانی عێراق کە پلەی رائیدی هەبوو. رائیدی ناوبراو بەگوێرەی داخوازی ئێمە بروسکەیەکی بۆ وەزارەتی ناوخۆ لێ دابوو، پاش ماوەیەک، وەڵامە وەرگیراوەکەی بەم ناوەڕۆکەوە گەیاندە ئێمە کەوا: داوای پەنابەریەتیی ئەفسەرانی ئێرانی بە پەسند وەردەگیرێ و، بەگوێرەی یاسا هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرێ - وەزیری ناوخۆ.

دەمەوئێوارەی ڕۆژی ٢٦ی مانگی ئاخەلێوەی ١٣٢٦ چەکەکانی خۆمان دا بەدەست بنکەی ناوەندیی عێراق و، بووین بە پەنابەر- چیرۆکی پەنابەریی ئێمە بەسەرهاتێکی ترە کە بەشێکی لە کتێبی «ڕاپەڕینی ئەفسەرانی خۆراسان»دا هاتووە. ئێمەیان بەدەسبەسەری برد بۆ بەغدا؛ ماوەی ٣ ساڵ لە گرتووخانەکانی ئەبوغرێب و سامەڕا گیراین، ڕۆژی

یەکەمی مانگی ئاخەلێوەی ١٣٢٩، بە گوێرەی ڕێککەوتنی بەدەستەوەدانی تاوانباران لە نێوان هەردوو دەوڵەتی ئێران و عێراقدا، ئێمە ١٠ ئەفسەر لە سنووری خوسرەوییەوە، درانەوە دەست سوپای ئێران. لە تاران ئێمەیان دا بەدادگەیەکی سوپایی: لە دادگەی (بەدەوی) هەموومانیان بە حوکمی هەڵواسین حوکم دا؛ لە سەرنج لێ دانەوەدا، تەفرشیان بە حوکمی گیرانی هەتا هەتایە، ئیحسانی، تیوای، ئەرتەشیار و زەربەخت بە ١٢ ساڵ و ڕەئیس دانا بە ٦ ساڵ حوکم دران. بۆ چوارەکەی تریش واتە: مەحمود و تەوەکولی، عەلی ئەسغەری، مەکاریان و دەباغ زادە کە غەیرە سوپایی بوون بڕیاری واز لێهێنانیان دەرچوو و بەرەڵڵاکران. ڕەئیس دانا لە کاتی سەرۆک وەزیری یاد زیندوو دکتۆر موسەدیقدا، یاسای ڕاگرتنی بڕیارەکانی دەوڵەت گرتیەوە و ساڵی ١٣٣١ بەرەڵڵا کرا. چوارکەسی ماوەش کە ١٢ ساڵ حوکم بووبوون، پاش بەسەربردنی ماوەی حوکمدراوییان لە گرتووخانەکانی قەسر و دوورگەی خارک، لە ڕێبەندانی ساڵی ١٣٣٧دا لە گرتووخانە دەرکەوتین. تەفرشیان پاش ١٦ ساڵ و چەند مانگ بەر لێبوردن کەوت و لە ساڵی ١٣٤٢دا بەربوو، ساڵی ١٣٦٩ نەخۆشیی کانسەری سیی گرت و دنیایەک ئەوینی وڵات و بوێری و ئازادیخوازیی بردە گۆڕەوە، گیانی هەرشاد و یادی ڕێز لێ گیراو بێ. عەلی نەقی ڕەئیس داناش، لە ئاخەلێوەی ١٣٧٤دا بە هۆی وەستانی مێشک کۆچی دوایی کرد - یادی بەڕێز و گیانی سەرفراز بێت.

## بارزانییەکان دووای گەڕانەوەیان بۆ عێراق

شێخ ئەحمەدی بارزان دووای خۆ بەدەستەوەدان لە ساڵی١٩٤٧دا هەتا شۆڕشی عەبدولکەریم قاسم لە ساڵی ١٩٥٨ لە بەغدا و بەسرا گیرابوو. ئەو گرتووخانانەی تیایدا بوو، گرتووخانەی گشتی نەبوون، بریتی بوون لە خانوو کە کرابوون بە گرتووخانە. شێخ محەمەد سدیقی برای و، محەمەد ئاغای مێرگەسۆری و هەموو ماڵەکان لە مۆڵگەی مووسڵ و کەرکووک لە بن چاوەدێریدا بوون. چوار ئەفسەرە عێراقییەکەش کە لەگەڵ شێخ ئەحمەددا خۆیان بەدەستەوەدابوو واتە: عەقید روکن عیزەت عەبدولعەزیز، رائید مستەفا خۆشناو، نەقیب خەیروڵڵا بابان و ملازم محەمەد مەحموود، پاش لە دادگەدان لە دادگەی سوپایی حوکمی هەڵواسینیان بۆ درا و حوکمەکە بۆ هەر چواریان جێبەجێ کرا.

***

ئەم نووسین و دەستهاویژانەی دراونەتە پاڵیان، وەک پێشتر گوتم، لە ڕاستیدا بریتین لە بەسەرهاتی بارزانییەکان دوای کشانەوە لە ئێران، هەتا کاتی پەنابردن بۆ یەکەتیی سۆڤیەت، ولیام ئیگلتن لە بارەی کۆماری کوردستانەوە کتێبێکی بە هەمان ناوەوە نووسیوە، کە بەشێک لەو کتێبە تایبەتە بە ڕێڕۆیشتنە کەڵەمیرانییەکەی بارزانییەکان. ئیگلتن دەنووسێ:

«لە گەڕانەوەیان بۆ عێراق، ژمارەیەکی گەورە لە بارزانییەکان لەوانە شێخ ئەحمەد و چوار ئەفسەرەکەی پێشووی سوپا و زۆرتری ئافرەت و منداڵان خۆیان بەدەست بەرپرسانی عێراقەوە دا. سەرەڕای ئەمە زۆرینەی هێزگەلی بارزانی بەسەرکردایەتیی مەلا مستەفا دەستیان نەدا. ئەو هێزە لە شێوەی کۆمەڵی پەرت و بڵاو لە پەنایەکی باکوری ڕۆژهەڵاتی وڵاتدا جێگربووبوون. ئەو دەمەی وتوویژ لەگەڵ بەرپرسانی میری لە گۆڕێدابوو ئەوانیش لە شەڕ بەدوور بوون. ئەو وتوویژانە بە یاریدەی دەمڕاستانی کورد لە پەرلەمانی عێراق لە بەغدا هاتبوونە کایە. هەندێ لە چاودێران پێیان وابوو کەوا دەسرۆیشتنی بەرپرسانی کورد لە پەرلەمان و میریدا دەبێتە مایەی ئەوەی بارزانییەکان بەر لێبوردن بکەون یان بەلایەنی کەمەوە سزای چوار ئەفسەرە سوپاییەکەی چووبوونە پاڵ کۆماری مەهاباد سووک بکرێ. بەڵام حکوومەتی عێراق ئەوکاتە پتری عەرەب بوو و بەرپرسانی سوپای عێراقیش نەرمییان نەنوواند. پاش ماوەیەک لە مانگی حوزەیران هەر چوار ئەفسەری ناوبراو: مستەفا خۆشناو، خەیروڵلا، محەمەد مەحموود و عیزەت عەبدولعەزیز لە سێدارە دران و تەنانەت بارودۆخ و پایەی پێشووی دووا ئەفسەریان کە هەرچەندە پاسەوانی جێنشین (ولی عهد) بوو، بەڵام نەیتوانی کارێک بۆ ڕزگارکردنی بکات.

مەلا مستەفا کە زۆر بە گەرمی هەستی بە ترسی تۆڵەسێنی دەکرد، لە ناوەڕاستی مانگی ئایاردا گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی کەوا تاکە ڕێگەی بەردەم خۆی و ئەو بارزانییە سەرناسانەی تر، پەنابردنە بۆ وڵاتێکی دۆست. کوشتنی ئەفسەر و سەربازانی سوپای ئێرانیش لە کردەوەی دواییدا پرسی پەنا وەبەر ئێران بردنی وەلاوە نابوو. تورکیاش کە خۆی ئەوکاتە دووچاری پرسی خێلایەتی بووبوو، دووربوو لەوەی کە کوردی سەرخۆبوون خواز و «دانەنیشتوو» لە ناوچەیەکی زەویی خۆیدا وەرگرێ. تەنیا یەکەتیی سۆڤیەت مابووەوە کە ئەویش سنوورەکەی - واتە هەتا چۆمی ئاراس - دووسەت میل (نێزیکەی سی سەت کیلۆمەتر) ڕێگە بوو.

هێشتاکە روون نییە کە لەمەوپێش چ کارێ یان چ دڵنیاییەک لە یەکەتیی سۆڤیەتەوە وەرگیرابوو. بەپێی سەرچاوەگەلی بارزانی ئەو بڕیارە ئەوکاتە درا

که مەلامستەفا داوای ڕۆنیشتنێکی لەگەڵ سەرکردەکانی خێڵەکەیدا کرد و لەو ڕۆنیشتنەدا گوتی بۆ ئەو و هەندێکی تریان تاکە پەناگەیەکی شیاو هەبێ یەکەتیی سۆڤیەتە، گوتیشی ئامادەیە هەرکەسێک کە لێرەبوونی بۆ خێزانەکەی زۆر پێویست نییە لەگەڵ خۆیدا بیات، زۆربەی ئەوانەی لە ڕۆنیشتنەکەدا بوون ئامادەبوون لەگەڵ ئەودا بچن، بەڵام هەندێکیانی لەوانەی مەرجی پێویستیان تێدا بەدی نەدەکرا ڕەت کردەوە. کۆی پێنسەت هەتا شەشسەت کەس لەگەڵ ئەودا بەرەو باکور کەوتنە ڕێگە.

سەرەتای ڕۆژی ٢٧ی ئایار (٦ی جۆزەردان) سەرکردایەتیی سوپاگەلی عێراق سوپای ئێرانی ئاگەهدار کرد کەوا بارزانییەکان هاتوونەتە ناو زەویی تورکیا و وا پێ دەچێ ئامانجیان چوونە ئێران بێ. پاشنیوەڕۆی هەر ئەو ڕۆژە یەکێ لە کوڕانی نووری بەگی بەگزادە یەکەمین دەستەی بارزانییەکانی لە نێزیک (ئەنبێ)ی دۆڵی «تەرگەوەڕ»دا بینی. ئەم ڕاپۆرتە کاتێ گەیشتە جەنەراڵ هوومایونی ئەو چاوەڕوانی گەیشتنەجێی شا بوو، ئەوە یەکەمین جاربوو شا پاش گەڕانەوەی سەرلەنوێی ئازەربایجان بۆ پاڵ ئێران سەردانی ناوچەکەی دەکرد. لە ٢٩ی ئایاردا (٨ی جۆزەردان) بارزانییەکان لە تەرگەوەڕ تێپەڕین و گەیشتنە ناوچەی شکاک نشین «سۆمای». ئەفسەرانی ئێران کە چاوەچاوبوون خێڵانی حکوومەت پەروەری کوردی ناوچەکە تووشی بارزانییەکان بکەن ئەو کارەیان بۆ نەچووە سەر، بەڵام توانییان - بارزانییەکان - بگرنە بن چاو. لە یەکێ لە ڕاپۆرتەکانی سوپای ئێراندا هاتووە کەوا بارزانییەکان زۆر بەسستی دەڕۆنە ڕێوە، جگە لە بریندار و کەلوپەلی پێویست کە لە پشتی ئەسپ و ئیستریان بارکردوون، ئەوانیتر هەموویان تەنانەت مەلامستەفا خۆیشی بە پێیان ڕێگە دەبڕن.

لە ٣٠ی ئایاردا (٩ی جۆزەردان) بۆ سوپای ئێران ڕۆن بوووەوە کە ڕووکاری بزووتنەوەی بارزانییەکان سنووری یەکەتیی سۆڤیەتە. سەرۆکی ئەرکان فەرمانی دا لە دۆڵی قتوور ڕێ لە مەلا مستەفا بگرن. بەو مەبەستەوە دوو فەوجیان لە (خوی)ەوە نارد، لە هەمان کات کاروانێکی تر بەرەو ئەودیوی ماکۆ کە خاڵێکی سەرووترە، کەوتە ڕێگە. لە ڕۆژانی نێوان ٣١ی ئایار و ٢ی حوزەیران (١٠ و١٢ی جۆزەردان) سەرانسۆی بارزانییەکان لەگەڵ سوپادا پچڕا، ئەمە کاتێ بوو کە بارزانییەکان بە ڕووکاری ناوچەی ڕۆژئاوای سنوور ڕۆیشتنەوە و پاش گەیشتنیان بە زەویی تورکیا جارێکی تر گەڕانەوە ئێران. لە بەرەبەیانی ڕۆژی ٣ی حوزەیران( ١٣ی جۆزەردان) گرووپێک لە بارزانییەکان لە باکوری قتوور بینران. ئەمانە لەکاتی شەو، بە دزی، لە نێوان دوو فەوجی ئێراندا تێپەڕ بووبوون.

شا کە ئەو کاتە لە ئەردەویل دیمانەی دەکرد فەرمانی دا بارزانییەکان بەبێ دواکەوتن وەگیربێن، ترسیشی دانێ کەوا هەر سەرکردەیەکی لە بەجێهێنانی ئەو ئەرکەدا سستی بنوێنێ بدرێ بە دادگەی مەیدانی. فەرمانگەلی تیژتریش لە لایەنی سەرۆکی ئەرکانی سوپاوە دەرچوون. بەڵام لەو ناوچە پڕ لە هەوراز و نشێوەی ڕۆژئاوای (خوی)دا بارزانییەکان لە هیچ کوێ سۆراخیان نەبوو. بەڵام لە ٩ی حوزەیران (١٩ی جۆزەردان) لە کێوەکانی «سوسوز»ی بیست و پێنج میلی باکوری ڕۆژئاوای (خوی)دا دووبارە ڕووبەڕووبوونەوە رووی دا، ئەمە کاتێ بوو کە کاروانێکی پیادەی نیزامیی سوپای ئێران لە تەنیشتەوە کەوتە بەردەسرێژی گوللە و نارنجۆک. دوای ئەم پێکدادانە بارزانییەکان ڕوویان کردە باکوری ڕۆژهەڵات و بەرزاییەکانی ئەو ناوانە.

ڕۆژی ١٠ی حوزەیران (٢٠ی جۆزەردان) لە بیست و پێنج میل (چل کیلۆمەتر)ی باشووری ڕۆژئاوای ئەرارات، کە دەیڕوانییە سەر چۆمی ئاراس و سنووری یەکەتیی سۆڤیەت، لە دووریی دە میل (شازدە کیلۆمەتر)ەوە بینران. ڕێڕۆیشتنەکە بەکردەوە بەکۆتا هاتبوو، دووسەت و بیست میل (نێزیکەی سێسەت و پەنجا کیلۆمەتر) ڕێگەیان لە وچانی چاردە ڕۆژدا بڕیبوو. لە ١٠ی حوزەیران (٢٠ی جۆزەردان) مەلا مستەفا دوو مرۆڤی ناردە ناو زەویی سۆڤیەت.

لە ماوەی پێنج ڕۆژی دواتردا یەکەگەلی سوپای ئێران لە خوی و ماکۆوە کەوتنە جووڵە بۆ ئەوەی شوێنی بارزانییەکان لە گەمارۆ بنێن. بەڵام کاتێ لە ١٨ی حوزەیراندا گەیشتنە لێواری ئاراس دوو ڕۆژ پێشتر بارزانییەکان لە سنوور ئاوا بووبوون و، چەند تفەنگ و نارنجۆک و دوو خنکاویان لە دوای خۆیانەوە بەجێ هێشتبوو، ئەمە تەواو لە خاڵی بەرامبەر بنکەی سنووریی سۆڤیەت بەناوی «ساراچلو»وەوە بوو. مەلا مستەفا و هاوەڵانی پاش یازدە ساڵ و چوار مانگ گەڕانەوە وڵات».

ئەو بارزانییانەی پاش شۆڕشی عەبدولکەریم قاسم لە ساڵی ١٩٥٨دا لە یەکەتیی سۆڤیەتەوە گەڕانەوە عێراق، هەندێکیان پاش ڕووداوەکانی دواتر لە ئێران نیشتەجێ بوون بیرەوەرییان لە بارەی ئەو ڕێڕۆیشتنەوە هەیە، نووسەر دیمانەی هەندێک لەوانی کرد. یەکێکیان بەڕێز کازم شانەدەرییە کە لە بارەی ڕێڕۆیشتنەکەوە، دوای بڕینی چۆمی ئاراس، دەڵێ:

«بارزانییە برسی و پرزە لێ براوەکان، لەگەڵ هەندێ بریندار، کە ئەو هەلومەرجە ئاڵۆز و پڕ ترسەیان بە بوێری و گیان لەسەر دەستییەوە بڕیبوو، چاوەڕوانی پێشوازی و مێواندارییی

ولاتی خانەخوێ بوون، ماوەیێ لە مۆڵگەکانی ئازەربایجان چاوەڕوان بوون هەتا پاشان بەرپرسانی ئازربایجانی سۆڤیەتی پەسندیان کرد ئەمانە خولێکی مەشقکاری ببینن بۆ ئەوەی ڕۆژێک دابێتەوە وەک هێزێکی شەڕوان، لە کوردستانی عێراقدا بەکاریان بخەن. بارزانییەکان ماوەی ١٨ مانگیان لە باکۆ بەفێربوونی سوپاییەوە بەسەربرد، پاشان لەگەڵ ٢٠ ئەفسەری ئازربایجانیدا کە هەموویان برێتی بوون لە مەشق پێدەرەکانیان ناردیانن بۆ شاری «چەرچیک» لە دەوروبەری تاشکەندی پایەتەختی ئۆزبەکستان و ٧ مانگی تریان لە خولی مەشقکاریدا لەو شارەدا بەسەربرد.

مەلا مستەفاشیان لە هاوەڵەکانی جیا کردەوە و بۆ ماوەی سێ ساڵیان دوور خستەوە بۆ «قەرەقالپاق»ی نێزیک زەریاچەی ئارال لە کۆماری ئۆزبەکستان. دوو شەڕوانی بارزانیشیان بە ناوی سەعید مەلا عەبدوڵلا و زیاب دوڕ بارزانی بەناوەی دەستوپێوەند لەگەڵیدا نارد.

پاش مردنی ستالین، لە سەردەمی دەسەڵاتداریی خرۆشوڤدا، دەوڵەتی سۆڤیەت کەوتە دڵدانەوەی بارزانییەکان و، مەلامستەفا و ژمارەیەک لە شێخەکانی بۆ مۆسکۆ بانگهێشتن کرد. وێڕای ئەمە ٢٢٥ کەسی لە بارزانییەکان بۆخوێندن نارده کۆمارە ئەوروپاییەکان و شارەکانی: ڤۆرونێژ، ساراتۆف، گۆرکی، تامبۆف و باشگیر.

دوای شۆڕشی جەنەرال عەبدولکەریم قاسم لە تەمووزی ١٩٥٨دا، جەنەرال بارزانی، تێلێگرافێکی لە پراگەوە بۆ سەرکۆمار قاسم نارد و داوای کرد بارزانییەکان بۆ پشتیوانی لە شۆڕش بگەڕێنەوە، قاسم داوایەکەی پەسند کرد. بەو پێیە ئەوانەی حەزیان لە گەڕانەوە بوو و لە کۆمارەکانی ئەوروپای یەکەتیی سۆڤیەتدا دەژیان بۆ مۆسکۆ بانگهێشتن کران، ئەوانیتر کە لە ئۆزبەکستان نیشتەجێ بووبوون، لە شاری «ویرۆفسکی» کۆبوونەوە. هەر هەموویان بە بارگە و ژن و منداڵەوە لە مۆسکۆ و ویرۆفسکی لە شەمەندەفەر سواربوون و لە لەنگەرگەی «ئۆدێسا»ی لێواری زەریای ڕەش یەکتریان گرتەوە. لەوێوە ٤٦٠ پیاوی بارزانی و ١٠٨ ئافرەتی ڕووس و ئۆزبەک و گەلانی تری سۆڤیەتی لەگەڵ ٢٢٥ منداڵ لە کەشتیی «کرۆزیا» سواربوون و لە ڕێگەی زەریای ڕەش - بۆسفۆڕ - دەردەنیل - زەریای سپی - کەناڵی سوێس - زەریای سوور - ئۆقیانووسی هیند و کەنداوی فارس، گەیشتنەوە بەسرە. کەشتیی کرۆزیا ئەو ڕێگەیەی بە ١٦ ڕۆژ بڕی. حەوت مرۆڤی بارزانی لە سۆڤیەت مانەوە و زیاتر لە ٣٠ کەسیشیان لەوێ کۆچی دواییان کردبوو.

مەلا مستەفا بە باڵەفڕ لە پراگەوە چوو بۆ قاهیرە و پاش دیمانەی جەمال عەبدولناسر هاتەوە بۆ بەغدا و لەلایەن خەڵکی بەغدا - بە کورد و عەرەب - و عەبدولکەریم قاسم خۆیشیەوە پێشوازیی گەرمی لێ کرا. پێشمەرگەکانی بارزانی پاش ١٢ ساڵ لە دوورەوەڵاتی، دوواجار لە ڕۆژی ١٦/٤/١٩٥٩ واتە: (٢٧/١/١٣٣٨) لەناو کرۆزیاوە پێیان نایە سەر زەوییی وڵات لە بەسرا، بێگومان پێشوازیی خەڵکی بەسرا بۆ ئەوان، رادە و سنووریکی نەبوو.

***

بە گەڕانەوەی مەلا مستەفا و هەڤاڵانی، ئەو ڕووداوەی لە بەهاری ١٣٢٦ (١٩٤٧)دا بەرێڕۆیشتنێکی مەزن و کەڵەمێرانە لە گوندی (بێداو)ەوە دەستی پێ کرد و پاش پێک هەڵچوونی یەک لە دوای یەک لەگەڵ سوپاگەلی ئێران و سنووروانانی تورکیا، هەتا چۆمی ئاراس بەردەوام بوو و بە ١٢ساڵ دوورەوەڵاتی لە یەکەتیی سۆڤیەت وەستابووەوە، بەکۆتا گەیشت و مێژووی بارزان و بارزانی لاپەڕە و لاپەڕەی تری گرت و بەسەرهات و داستانگەلی تری هێنایە کایە کە هەتا ئەمڕۆش هەر بەردەوامە.

مورتەزا زەربەخت

بەهار ١٣٧٥

# گێڕانەوەی کازم شانەدەری

# لە ڕێڕۆیشتنەکەدا

لە ٢٧ی مانگی گەلاڕێزانی ١٣٧٣ هەلێک هاتە پێش کە لە عەزیمیەی کەرەج دیمانەیەک لەگەڵ بەڕێزان کازم شانەدەری و حەسۆ میرخان، دوو لە پێشمەرگەکانی بارزانیدا بکەم لەوانەی لە ڕێڕۆیشتنەکەی ساڵی ١٣٢٦دا بە هەڤالەتیی خوالێخۆشبوو مەلا مستەفای بارزان هەنگاویان لەو ڕێڕۆیشتنە سەختەدا هەڵێنابوو و هەتا دوا هەوار ڕێگەیان بڕیبوو، بەڕێز کازم شانەدەری کە ئێستە تەمەنی ٦٤ ساڵە و ئەوکاتە لاوێکی ١٧ ساڵان بوو، بەڕێز حەسۆ میرخانیش کە ٧٠ ساڵ تەمەنیەتی لەو دەمەدا خۆرتێکی ٢٣ ساڵان بوو و پێش چوونەوە بۆ عێراق لە ئاخەلێوەی ١٣٢٧ لە گوندی ئەنبێ لە کەلەکەیەوە بەرکەوتبوو و بریندار بووبوو، بە درێژایی قۆناخەکانی دواتری ڕێڕۆیشتنەکەش سەبارەت بە برینەکەی دەتلایەوە و ئازاری دەکێشا. لەم چاوپێکەوتنەدا کە بە پرسیارکردن لە بەڕێز کازم شانەدەری دەستی پێ کرد، بۆ تۆمارکردنێکی وردتری ڕووداوگەل سوودمان لە ڕۆژنەژمێری حاجی ئەحمەد ئاکرەییش وەرگرت. بەڕێز ئاوڕەحمان پاشای ڕۆژنامەوان و نووسەوانی کوردی عێراق لە پارێزگەی دهۆک و سەرنووسەوانی بەلاوۆکی سپێدە کە بە زمانی کوردی و عەرەبی بلاو دەبێتەوە سەروبەری ئەم دیمانەیەی کرد کە بە ئامادەبوونی خۆی جێبەجێ کرا و خاتوون مەرجان مەلا برایم کە باوکی ئەویش لە هەڤالانی ئەو ڕێڕۆیشتنە بووە و هێشتاش بە ژیان ماوە ئەرکی وەرگێرانی ئەم دیمانەیەی خستە ئەستۆی خۆی، لێرەدا سوپاسی هەموویان دەکەم.

لە ١٦/٤/١٩٤٧ (٢٧ی ئاخەلێوەی ١٣٢٦) ماڵەکانی ئێمە لە گادەر بوون. چۆمی گادەری ڕۆژئاوای شنۆ و مەرگەوەڕ، سنووری ئێران و عێراقە. هەر ئەو ڕۆژە بە بارزانییەکان گوترا کەوا مەلا مستەفا دەچێتەوە عێراق بەڵام خۆی بەدەستی حکوومەتی عێراقەوە نادات. هەر کەسێ توانی چەک هەڵگرتنی هەیە با لەگەڵ مەلا مستەفادا بچێتەوە بۆ عێراق و هەرکێیش توانی خەباتی نییە با لەگەڵ خێزانەکەیدا خۆی بدات بەدەستی هێزگەلی عێراقەوە.

ئەو ڕۆژە کە بەفر و بارانێکی بەلێزمە دایدابوو، خێزانەکان بەڕێ کەوتن و لە چۆمی گادەر دەرباز بوون. هەر کێ کە دەپەڕیەوە ئەودیوی سنوور دەبوو چەکەکەی خۆی بدات بەهێزگەلی سوپای عێراقەوە و ئەوانەیش کە نیازی یاخیبوونیان هەبوو لەسەر پردەکەی

گادەر خێزان و کەسوکاری خۆیان پەڕاندەوە و گەڕانەوە دوا. هەر ئەو ڕۆژە زۆربەی ئێمە کە لاو بووین بە هەڤالەتیی مەلا مستەفا ملی چارەنووسێکی کەسنەزانمان گرتەبەر. لەو بەرزاییانە و لە نێو ئەو بەفر بارینەدا گەیشتینە ڕەشماڵەکانی تەها هەرکی کە چەند ماڵێکی هەرکی بوون، چەند ڕەشماڵێکیان هەڵدابوو و بە هیچ شێوە بەشی پێنسەت مرۆڤی ئێمەی نەدەکرد و زۆربەی پیاوەکان لە دەرەوەی ڕەشماڵەکان وەستابوون و دەوری پەنجا شێست کەسێ خۆیان کوتایە بن ڕەشماڵەکانەوە. بارودۆخ بێ ڕادە نالەبار بوو، واتە سەرەڕای نەبوونی پەناگە و هەبوونی ئەو سەرماوسۆڵەیە، لەڕووی پێبژبوو و پێخۆریشەوە لە هەلومەرجێکی ئالۆزدا بووین. ئەوەبوو زۆربەی پیاوانی ئێمە لە دەرەوەی ڕەشماڵەکان مانەوە و، بەهەر جۆرێکی بوو شەومان گەیاندە بەیانی.

لەبەرئەوەی ڕۆژی ١٧ی نیسان (٢٨ی ئاخەلێوە) بەفرێکی ئەستوور کەوتبوو نەمانتوانی ببزوێین. بۆیە شەو و ڕۆژی دواتریش هەر لەوێ ماینەوە.

ڕۆژی ١٨ی نیسان (٢٩ی ئاخەلێوە) ئاسمان هەتا ڕادەیەک ساماڵ بوو، بڕیاری ڕۆیشتنمان دا و ڕێگەیەکی زۆر سەخت و دژوارمان گرتەبەر کە بەفرێکی گەورە گرتبووی. لەم ڕێڕۆیشتنەدا کە بە بەرزاییە کێوەلانەکاندا تێپەڕ دەبووین لە چۆمی گادەرمان دا کە ئاوێکی ساردی پێدا دەهات. پاش نیوەڕۆ گەیشتینە چەند ماڵێکی ڕەشماڵ نشین. ئەمانە پیاوانی زێڕۆ هەرکی و سەر بەوی بوون، لە دەستی حکوومەتی ئێران هەلاتبوون و لە حەوت هەشت ماڵێ پتر نەبوون کە لەدەم چۆمی گادەر لە سنووری ئێران و عێراق و چیاکانی نازدارداغدا پەرت و بلاو بووبوونەوە. هەر پێنسەت مرۆڤ لەوێ مێوان بووین. هیچ کاتێ ئەو شەوە و ئەو بیرەوەرەم لە بیر ناچنەوە. شەوێکی هەتا بلێی ساربوو، بەتایبەتیش کە پێشتر لە ئاومان دابوو و هەموو جلوبەرگمان تەڕبووبوون.

بەیانیەی ڕۆژی ١٩ی نیسان (٣٠ی ئاخەلێوە) سەر لەنوێ بەڕێ کەوتینەوە و گەیشتینە ڕەشماڵی تر. ڕەشماڵی زێڕۆ هەرکیش لەوێ هەبوون. ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی خۆش بوو و بەفر نەدەباری.

گرووپەکەی ئێمە، گرووپی شێخ ئۆمەر شانەدەری بریتی بوو لە دە مرۆڤ و لەگەڵ گرووپی میرزاغای مێرگەسۆری کە بیست و پێنج مرۆڤ بوون لەگەڵ یەکتردا بووین. مەلا مستەفا تفەنگێکی دیمۆکراتی دابوو بە ئێمە کە گۆڕیمانەوە بە جوانەگایەک و تەنەکەیەک گەنم. گەنمەکەمان لەجیاتی نان لەسەر سێل برژاند. سەبارەت بە کەمیی گەرمیی ئاگرەکە

لایەکی گەنمەکە خاو و نەبرژاو بوو و لایەکەی تریان سوتابوو. گەنمەکەمان دابەش کرد و هەرکەسە بەشی خۆی لە گیرفان ئاخنی. گۆشتی جوانەگاکەمان خوارد و ئەو شەوەمان بەبەیان گەیاند.

بەیانییەی ٢٠ی نیسان (٣١ی ئاخەلێوە) بەرەو عێراق بەڕێ کەوتین و بەسەر لوتکەی نازداراغدا هەڵگەڕاین و لەوێوە بەرەو ژێر لە دیوی گەلیی خواکورکەوە شۆڕ بووینەوە و گەیشتینە ناو ئاخی عێراق. پاش ئەوەی گەیشتینە ناوچەیەکی لێرەوار لەو شوێنانە، بینیمان وا مەلا مستەفا ڕۆنیشتووە و مرۆڤەکانیشی لە دەوریدا چەمبەریان کێشاوە. هەوا فێنک و خۆش و سەرما لە کورتیی دابوو. هێشتا نیوەڕۆ دانەهاتبوو کە مەلا مستەفا ویستی هەموو سەرکردەگەلی گرووپەکان بۆ ڕاوێژ و بڕیاروەرگری لە بارەی ڕێڕۆیشتنی داهاتوو کۆ بکاتەوە. سەرکردەگەل هاتن و منیش چاوم لە وتووێژی ئەوان بوو. مەلا مستەفا گوتی: ئەمڕۆ ٢٠ی نیسان (٣١ی ئاخەلێوە ١٣٢٦) هاتینەوە ناو زەویی عێراق. بە دیتنی ئێوە کام ڕێگە بگرینە بەر گونجاوترە؟ ئاخۆ بە پیران مەڕان و مەساندا (کە لە گوندەکانی مێرگەسۆرن) بڕۆین باشترە یان بە گوندانی تر؟ هەندێکیان گوتیان ئەزبەنی وا چاترە لە ڕێگەی ناوچەی گەردی و گوندەکانی شەرون، کیلەت و گوندەکانی دەوروبەریاندا بڕۆین چاترە (گوندەکانی تورکیا) بەڵام ئەسعەد خۆشەوی کە یەکێک بوو لە سەرکردە مەزنەکان لەگەڵ حاجی حەیدەر و چەند کەسێکی تر گوتیان بۆچوونی ئێمە ئەوەیە بە ناوچەی مزووری و گوندەکانی ئەرگووش، مێرووز - شیوە - پێندروو - دێزو (ناوچەی بارزان)دا بڕۆین. مەلا مستەفا گوتی ئەو ڕۆژەی ئێمە دەگەینە پیران مەڕان و مەسان هەر ئەو ڕۆژە یان ئەوپەڕەکەی ڕۆژێک دواتر شەڕ لە نێوان ئێمە و هێزگەلی عێراقدا ڕوودەدات. لە ئەنجامدا مەلا مستەفا و چەندێکی تر وایان پێ باش بوو بە ناوچەی مزووریدا بڕۆن نەک بە ناوچەی مێرگەسۆر و گەردی.

وتووێژ بەکۆتا هات و هەڵستاین، هەرکەسە و چووەوە لای گرووپی خۆی. لە خواکورکەوە سەرەوژێر بووینەوە و لە یەکبینە هەتا بەیانی بەبێ پشوو ڕۆیشتین. بەیانیەی ڕۆژی ٢١ی نیسان (١ی گوڵان) لەگەڵ گزنگی بەیاندا گەیشتینە گوندی مووسلۆک. مووسلۆک یەک ماڵی تێدا بوو نەک زیاتر. مەلا مستەفا لە نێزیکی ماڵەکە لە بن دارێکی گوێز دانیشت و پێشمەرگەکان لە دەوریدا بڵاوبوونەوە. مەلامستەفا هەلی بە کەس نەدا بچێتە ئەو ماڵە. هیچ شتێکمان بۆ خواردن نەبوو. دانیشتووی ماڵەکە شیوی

ماش و هەرزنیان بۆ لێ نابن. هەروەها دە - پازدە کاوڕیان بۆ خواردنی ئێمە هێنایە لای مەلا مستەفا. ئەمانەیان لە نێوانی گرووپەکاندا دابەش کرد و ئێمەش کاوڕێکمان بەر کەوت. بۆ خواردنی چێشت هیچ کاسە و کەوچێکێکمان نەبوو تەنیا بڕێ پیاڵە نەبێ کە لە ڕێگە پێمان بوو و بۆ خواردنی چێشتی هەرزن و ماش سوودمان لێ وەرگرتن. خاوەنی ئەو ماڵە ڕێز و مێوانپەروەرییەکی بەزیادەوەی لە بارت ئێمەدا نوواند و ئێمە کە نێزیکەی پێنسەت و دوو هەتا پێنسەت و چوارکەس بووین کەسێ نەبوو کە بۆ خواردن شتێکی بەرنەکەوێ. بێگومان بەو ڕادەیە نەبوو کە تێر ببین بەڵام هەر چۆن بێ برمان پێی شکا. هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێم کەوا لەم ڕێکخستن و سەروبەرکردنەدا قەرزاریاری هەندێک کەسین کە بەرپرسیارەتیی دابەشکردنی خواردنەکەیان لە نێوان گرووپەکاندا لە ئەستۆدابوو.

پاشنیوەڕۆی ٢١ی نیسان (یەکەمی گوڵان) مووسلۆکمان بەجێ هێێشت. شەو لە چیا پشوومان دا و ڕۆژی دواتر بەڕێ کەوتینەوە و شەو گەیشتینە گوندی ئەرمووش. هەوا خۆش بوو و ئاگرمان کردەوە.

ڕۆژی ٢٣ی نیسان (٣ی گوڵان) لە ئەرگووش بەڕێ کەوتین و گەیشتینە بەنێ کە لە ناوچەی خواکورکە و پێی دەڵێن بەنێی خواکورک. ئەو ئاواییە هەژدە - نۆزدە ماڵێ دەبێ و لە گوندی مووسلۆک گەورەترە. خەڵکی ئەو گوندە هەر کەسە و لەبەر ماڵی خۆی خواردنی بۆ کۆ کردبووینەوە و (حەدۆ پەریا) کە یەکێ بوو لە سەرکردەکان خواردنەکەی بەم ئاوایە دابەش دەکرد: دەیپرسی ئێوە چەند کەسن؟ ئێمەش دەمانگوت پازدە یان بیست کەسین و ئەویش بە گوێرەی ژمارە خواردنەکەی دەدا بە دەمڕاستی گرووپەکە. خواردنەکە بریتی بوو لە چێشتی نیسک یان ماش واتە خواردنێکی شل بەبێ نان. گرووپەکەی ئێمە دە کەس بووین و جگە لە چەند پیاڵەیەک شتی ترمان نەبوو شیوەکەی پێ بخۆین. بەشی ئێمە ئەم دە کەسەیان کردە دەفرێکەوە و هەرکەسە بەشی خۆی لەو دەفرەوە دەکردە ناو پیاڵەکە و دەیخوارد. پێیان گوتم تۆ چی دەکەی؟ گوتم بەشەکەی من ڕوو کەنە سەر لەپی دەستم. نەمدەزانی هێندە گەرمە و دەسووتێنێ. لەم دەستەوە کردمە ئەو دەست و بەشێکی ڕژایە سەر زەوی و هاوەڵانم پێم پێکەنین. هەر چۆن بێ هەرکەسە و شتێکی بەر کەوت.

گوندی بەنێ لە داوێنی چیای ئاودەل کودی هەڵکەوتووە کە بەشێکە لە ناوچەی خواکورک. مەلا مستەفا حەزی لێ نەبوو چیتر لەو شوێنە بمێنێتەوە لەبەرئەوەی خێڵی

برادۆست کە لە دەوری ئەو دەشتە بوون لەگەڵ بارزانییەکاندا پێشینەیەکی دوژمنارییان هەبوو و لەوانەبوو شەڕێک لە نێواندا ڕوو بدات کە بارزانی خۆی لەمە دەدایە لا. دوای نیوەڕۆ لە بەنێوە کەوتینە ڕێ و لە گوندەکانی دەریای سۆر و چنارێ تێپەڕین و شەو گەیشتینە گوندی حەیات و لەوێش رابردین و گەیشتینە چۆمێ کە لە گەلیی ڕەشەوە دەهاتە خوار و لەگەڵ چۆمی حەیاتدا کە چۆمێکی بەرین بوو یەکی دەگرتەوە. هەموومان لەو چۆمەش پەڕیینەوە، ئەوەشم لەبیر نەچێ پێشتر مەلا مستەفا پەیامێکی بۆ حوسێن گوزەلای بەگزادەی خێڵی برادۆست ناردبوو کەوا لەگەڵ چەند کەسێکی خێڵەکەی خۆیدا بێ بۆ ڕێنوێنیمان. هەرچەندە پێوەندییەکی خۆشیشی لەگەڵ مەلا مستەفادا نەبوو بەڵام شەو تەبای چوار مرۆڤی خۆی کە شارەزاییی تەواویان لە ناوچەکەدا هەبوو بۆ ڕێنوێنیی بارزانییەکان هاتن.

لە دەشتی بەرازگر (ناوچەی برادۆست) تێپەڕین و لە کێلەکی بنکەیەکی عێراقی لە کانی رە ش لە داوێنی چیا دەرباز بووین و لەوێوە بەرەو دەشتی مێرگەسوور چووین و ئەو دەشتەشمان بوارد. هەرچەندە زۆر ماندوو و کەلەلا بووبووین بەڵام بێ پشوو ناچاری ڕێرۆیشتن بووین لەبەرئەوەی هێزگەلی عێراقی لەو ناوانە و لە نێزیکی ئێمەدا بوون.

لەگەڵ گزنگدانی ڕۆژی ٢٤ی نیسان (٤ی گوڵان)دا گەیشتینە گوندی دەریا سۆر کە هەمووی بەسەریەکەوە دە - پازدەماڵێ دەبوو، بێگومان ئەوان ئەو ئازووخەیەیان نەبوو هەتا پێبژیوی پێنسەد مرۆڤ دەستەبەر بکەن، بەڵام چییان هەبوو بۆیان هێنایین. ئەو گوندە چۆمێکی پڕ ئاوی هەبوو کە سنووری عێراق و تورکیای پێک دەهێنا. هەوا بەجارێ خۆش بوو و ئێمە لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە توانیمان هەر هەموومان لەئاو بدەین و بپەڕینەوە. بێگومان گوندییەکانی دەریاسۆر بۆ پەڕینەوە لە چۆمەکە هاوکارییان کردین. من ناچاربووم چەندین جار لە چۆمەکە بپەڕمەوە هەتا چیی چەک و کەرەستە و جلوبەرگ هەیە بگەینم بەودیوی چۆمەکە.

لەوێوە چووینە ناو زەویی تورکیا و بەرەو ڕۆژئاوا، رووەو چیای گۆڤەند کە دوو ناوی هەیە گۆڤەند یان ژوول- ڕۆیشتین. لە نێوانی چیای گۆڤەند و چیای مەنکوڕ کە لە زەویی تورکیادایە خێڵی سالاری هەیە کە پارێکە لە خێڵی گەردییەکان. ئەم خێڵە کە لە زەویی تورکیادا دەژین، لە ڕووی بیروباوەڕەوە ئالیگری لە بنەماڵەی بارزانیی سەر بە تەریقەتی شێخی نەقشبەندی، دەکەن. ئێمە بەشەو لەوێ دەرباز بووین.

بەیانییەی ڕۆژی ٢٥ی نیسان (٥ی گوڵان) پیاوەکانی ئێمە گەیشتنە گەرووی زێت کە سنووری عێراق و تورکیایە و جارێکی تر پێمان نایەوە ناو زەویی عێراق.

لەوێ بنکەیەکی پۆلیسی عێراقی هەبوو و پۆلیسەکان بەشەو خۆیان بۆ ئێمە لە پارێز نابوو. پێکدادانێک ڕووی دا و سەرکاروانانی ئێمە کە هەموویان خەڵکی ئەرگووش بوون لە ناکاو پەلاماردران و لە ماوەی تێکسرەواندنێکی کەم خایەندا پۆلیسێک کوژرا و دوانیشیان بەدیل گیران. یەکێ لە پۆلیسەکان تەن بەتەن لەگەڵ خەلیل ئەرگووشی تێک گیران و لەبەرئەوەی خەلیل لەو باخۆشتر بوو بەسەریدا زاڵ بوو و کوشتی. یەکێ لە پیاوەکانی ئێمەش بریندار بوو، برینەدارەکەی ئێمە کوڕە لاوێک بوو لە کوردانی گەردیی تورکیا لە گوندی کەلێت کە بەهەڤالەتیی باوکی هاتبووە پاڵ ئێمە. لەلای دەستییەوە خوێنی لەبەر ڕۆیشت و هەتا گەیشتینە گوندی ئەرگووش گیانی لەدەست چوو. ئەمە یەکەمین پێک هەڵچوونی نێوان ئێمە و سوپای عێراق بوو.

ئێوارە بوو پاشماوەی پیاوەکان گەیشتنە شوێنی پێکدادانەکە و لەوێوە بۆ لەوەڕگەی بیێ بەڕێ کەوتین کە دەکەوتە پشت گەرووی زێتێ و بەشێکە لە زەویی تورکیا و لەوێ هەڵوەستاین. مەلا مستەفا گوتی پێویستە گرووپەکان لە یەکتر جیا ببنەوە و دابەشی سەر گوندەکان ببن. بڕیاردرا ئەسعەد خۆشەوی لەگەڵ پیاوەکانیدا بچێتە ناوچەی وڵات و گوندەکانی سێلکێ، پێندروو، دێزو، سپیندار کە خۆیشی هەر خەڵکی ئەوێ بوو. مستۆ مێرووزی لەگەڵ پیاوەکانیدا بچێ بۆ ناوچەی مێرووز، بۆسە، بژیان، بەرکەل و، مەلا مستەفاش لەگەڵ تفەنگدارەکانیدا چوو بۆ گوندی ئەرگووش، منیش لەگەڵ ئەواندا بووم.

شایەنی وەبیرهاتنەوەیە کە ڕێکخستنی هێزەکان بۆ ڕێڕۆیشتن و ئەرک دابەشکردن بە شێوەی خوارەوە دیاری کرابوو: پێشکێشی ئێمە هێزی مامەند مەسیح، مستۆ مێرووز (کە بە دوازدە کەسەوە لە عێراق هاتبووە پاڵ ئێمە) و ئەرگووشییەکان بوون. دوای ئەوان مەلا شنی بەخۆی و پیاوەکانی و پاشانیش مەلا مستەفا بوو لەگەڵ پیاوانی وەک محەمەد ئەمین میرخان و ئیبراهیمە ڕەش و پیاوەکانی دۆڵەمەری کە بەردەوام لەگەڵ مەلامستەفادا بوون و پاش ئەوان هێزەکانی ئێمە بەسەرکردایەتیی شێخۆمەر شانەدەری و هەندێکی تر.

ڕۆژی ٢٥ی نیسان (٥ی گوڵان) گەیشتینە ئەرگووش. گرووپی پێنسەت کەسیی ئێمە بیست و پێنج ڕۆژ لەو ناوچەیە و لە نێوانی گونداندا بڵاوبووبوو و حکوومەتی عێراق هێشتا ئامادە نەبوو ڕووبەڕووی ئێمە ببێتەوە. کاتێ پێ حەسیان کە ئێمە سەرلەنوێ لە

تورکیاوه هاتووینەتەوە عێراق دەستەیەکیان بەسەرپەرشتیی عەلی بەگی قەمچی ڕەش بۆ وتوویژ - لە ڕاستیدا بۆ هەڵسەنگاندنی هێزگەلی ئێمە - نارده لای بارزانی. ئەم عەلی بەگە پیاوێکی فرە بێ بەزە و دەسڕەش بوو و لە دوژمنانی باوەکوشتەی بارزانییان بوو. خۆیشی لە کوردانی سلێمانی بوو کە لە بزووتنەوەی سالانی ١٩٣٤-١٩٣٥ و ١٩٣٦ی زایین بە ڕابەرایەتیی خەلیل خۆشەوی، سەرکردەی سوپای ئەم ناوچەیە بوو و ژمارەیەک لە پیاوانی بارزانی بەدەستی ئەو هاتبوونە کوشتن و چەندێکی تریشیان بە فەرمانی ئەو لەدار درابوون، لەوانەش وەک عومەر ئوسۆمەری، مەلازاده بیەیی و عومەر هۆستانی.

لە سالانی ئەو کاتەی شۆڕشدا کە مەلا مستەفا لە سالی ١٩٣٣ لەدووره هەواریی سلێمانی هەلات(٥) و دەستی بەسەر بنکەی پۆلیسی ڕێزاندا گرت هەر ئەو خۆی بریندار و دیل بوو و مەلا مستەفا لە کوشتنی ئەو چاوپۆشیی کرد و بەری هەڵدا. ئەو کەسە خۆی ئەمڕۆ بۆ زانینی وزەی شەڕوانیی ئێمە و هەروەها تێگەیشتنی ڕێگەی پێداڕۆیشتنی داهاتوومان هاتووەتە ئەرگووش و لەگەڵ مەلا مستەفادا دیمانەی دەکرد. ئەو یەکێ لە بارزانییەکانی بەناوی وەلی بیبانی کە لە گادەر خۆی بەدەستەوە دابوو و لە دیانە لە بن چاوەدێریدا بوو، لەگەڵ خۆیدا هێنابوو بەلام کاتێ تێ گەیشت مەلا مستەفا نیازی شەڕی هەیە و پێشمەرگەکانیش چەک و تەقەمەنییان باشە، ئیتر پاشەکشێی کرد(٦).

لەو کاتەدا، هێزگەلی سوپا و پۆلیسی عێراق لە سێ بەرەی ڕەواندز، ئاکرێ و ئامێدییەوە دەستیان بە چوونەپێشی خۆیان کرد. لە بەرەی ئاکرێ هێزگەلی خۆیان بەرەو گەلیی هۆره نارد و لەبەرەی ئامێدییش بە ئاراستەی ناوچەی چەپی هێرشیان هێنا و هێزگەلی کۆجێ لە ڕەواندز بەرەو شێروان مەزن هاتن. ئێمە بیست و پێنج ڕۆژ لە ئەرگووش بووین و پێشمەرگەکانی تر لە گوندەکانی دەوروپشت.

میرزائاغا لەگەڵ تفەنگدارەکانی خۆیدا لە ناوچەی چەپی لەسەر چیای(سەرخین گەل) خەریکی پاسەوانەتی و چاودێری بوو کە بەشەو دوو کەس لە جاشەکان بە ناوی میرزائاغا ئەرگووشی و محەمەد ئەمین چیوەیی(دوو میرزا ئاغا ناویان هات کە یەکەمیان

(٥) بارزانیی نەمر سالی ١٩٤٣ لە سلێمانی دەرچوو نەک ٣٣ ـ وەرگێڕ.

(٦) تفەنگی برنۆی درێژ و کورت، دەمانچە، نارنجۆک و ڕەشاشێک کە لە خواکورکی عێراق بەجێمان هێشت. دەمانچەکان جۆری کۆلت بوون، زۆربەمان خەنجەرمان پێ بوو. نارنجۆکەکانمان لە مەهاباد هێنابوو و هەندێک لە فەرماندەکان دووربینیان هەبوو- نووسەر.

لەسەرکردەکانی ئێمە بوو و دووەمیان ئەرگووشی و جاش بوو) هێزگەلی سوپایان ڕێ بەدێیی کرد و پەلاماری گرووپی میرزائاغا ڕەشۆیان دا. لەو شەڕەدا جگە لە میرزائاغا کە برینێکی سووکی هەبوو زیانی زیاترمان پێ نەکەوت. پێدا پێدا شەڕ لە ئێمە نێزیک کەوتەوە و بڕیار بوو سبەینێ ئێمە هێرش بکەینە سەر ئەرگووش.

ئێستا پاشی چل و حەوت ساڵ دێتەوە بیرم کە لە ئەرگووش لەسەر لێواری جۆگەلەیەک لە خوارووی ماڵی سەعید عەبدولوەهابەوە لە تەنیشت مەلا مستەفا ڕۆنیشتبووین مرۆڤێک لە ناوچەی گەردییانەوە هات و برێک تووتن و نامەیەکی دایە بارزانی. پێم وایە ناوی ئەو تەتەرە حەسەن بوو. گوتی: دەوڵەتی ئ رکیا هێزێکی فرەی هێناوەتە سنووری عێراق و سنوورەوانانی ئێرانیش هەموو ڕێگەکانیان گرتووە و دایانخستوون، ڕێگەی ئێوە بە تەواوی بەستراوە. مەلا مستەفا کاتێ نامەکەی خوێندەوە هەر ئەوەی گوت: گوێ بگرە با ببینم ئەدی شەڕ چیی لێ بەسەردێ؟

بارزانی پاشان بە پیاوەکانی وت بە سەر پردی (باسیا)وە بچن بۆ گوندی (دێرێ) کە شێخ سلێمان لەوێ بوو، ئێمە لەگەڵ گرووپی شانەدەری و سەعید وەلی بەگ بەشەو بەسەرپردی باسیادا ڕۆیشتین کە لەسەر ڕووباری باسیایە، لە ناوچەی مزووری ڕەت بووین و لەسەر پردەکەوە بەرەو گوندەکانی ستوونێ و (ناوچەلا) و (دێرێ) چووین، کە ناوچەی (هەرکی)یان بوو.

ڕۆژی ١٩ی ئایار (٢٩ گوڵان) بوو گەیشتینە دێرێ. مەلا مستەفاش گەیشتبوە ئەوێندەر، دووبارە دەستەیەک لەلایەن حکوومەتی عێراقەوە بە سەرۆکایەتیی سینوی تووی لە شاری ئامێدییەوە بۆ وتوویژ هات کە لە ڕاستیدا بۆ پێ حەسیانی هێزگەلی بارزانی هاتبوون و بەبێ دەسکەوتنی ئەنجامێک گەڕانەوە دوا.

مەلا مستەفا بەدوای سەعید خۆشەوی و مستۆ مێروزیشیدا نارد کە ئەوانیش بێن بۆ دێرێ. هەتا بارزانی خۆی ڕووگەی بزووتنەوەکەی دیاری نەکرد کەس نەیدەزانی بەکیهە لادا دەڕۆین. هەر بە گەیشتنی پیاوانی ئەسعەد خۆشەوی بۆ دێرێ ئیتر باڵەفڕەی عێراقیش پەیابوون، دوازدە باڵەفڕ بە بۆمبا و شێست تیرەوە پەلاماریان هێنا و لەبەرئەوەی هیچ پەناگەیێ نەبوو خۆمانی لێ وەشێرین دوو کەس لە پیاوانی ئەسعەد خۆشەوی کوژران و حەوتیشیان بریندار بوون.

ڕۆژی ٢٠ی ئایار (٣٠ گوڵان) لە گوندی دێرێ دەرکەوتین و چووین بۆ گوندەکانی

ستوونێ و ناڤ چەلا. لەوێ حەڤدە کەس لە گوندی ستوونێ لە ئێمە جیابوونەوە. ئەمانە لە گرووپی بیری بوون(٧)، برێ لە هێزگەلی ئێمە لەسەر چیایەک لە گوندی بێداو گەیشتنەوە یەک. ئێوارەی بیسەتەمینی مانگ بوو زەویی عێراقمان لە دواوە بەجێهێشت و بەرەو گوندی بێداو کەوتینە رێگە.

گوندی بێداو کە تەواو لەسەر خاڵی سنووریی عێراق و تورکیادا هەڵکەوتووە دوو بەشە: بێداوی عێراق و بێداوی تورکیا و چیایەکی بەرزی هەیە بەناوی چیای بێداو.

رۆژی ٢١ ئایار (٣١ گولان) گەیشتینە گوندی بێداو کە کەوتووەتە بناری چیای بێداو، تەنیا رێبازگەی رۆیشتنمان لە لوتکەی بێداوەوە بوو کە یەکجار بەرزە و بەفرێکی ستوور گرتبووی، ئەمە نالەبارترین و دژوارترین رێڕۆیشتنی ئێمەبوو. چیای بێداو «چوارچەلی هەرکی»شی پێ دەگوترێ و چوارچەل بەواتەی چوار لوتکەیە.

ئێستا لە زەویی تورکیادا بووین، دەمەدەمی ئێوارە مامەند مەسیح لەگەڵ هەندێ پێشمەرگە و ژمارەیەک خەڵکی گوندی بێداو چوون بۆ چیای بێداو بۆ ئەوەی پێپلیکانە لەسەر بەفرەکە دروست بکەن و پێشمەرگەکان بتوانن بەخۆ و کەلوپەلیانەوە پیایدا تێپەڕن. دوای ئەمە کورگەلی پێشمەرگە بەرەو هەوراز و گەرووەکان کەوتنە رێ. بەو پێپلیکانانەدا بەسەرکەوتین و گەیشتینە گەرووەکە. لەوێوە هەتا لوتکەکە تاتەبەردێ بوو دوو هەڤاڵی برینداری ئێمە بە هیچ جۆر نەیانتوانی بەو تاتە بەردەدا سەرکەون. مەلا مستەفا لە خوارەوەی ئەو تاتە هەردوو بریندارەکەی دا بەدەست خەڵکی گوندەکەوە بۆ ئەوەی هەتا بتوانن بیانشارنەوە و ئەگەر نەشیانتوانی ئەوا بۆ چارەسەری برینداریەکانیان بیاندەن بەدەست هێزگەلی عێراقەوە. خەڵکی گوندەکەش ئەوانیان هەتا ماوەی سێ رۆژان شاردەوە و پاشان دایانن بەدەست سوپاگەلی عێراق. دەوڵەتی عێراق ئەوانی تیمارکرد و لە گرتووخانەی هاوێشتن، یەکێکیان لە گرتووخانە کۆچی دوایی کرد و ئەویتریان بەزیندوویی مایەوە.

(٧) کاک حەسۆ میرخان روونی کردەوە: «ئەمانە لە بزاوتنی ئێمە بێ ئاگا بوون و بەپاش کەوتن. ئیتر کە سێ رۆژ دووای بەرێ کەوتنی ئێمە، ئەوانیش بەرەو تورکیا هاتبوون کە بگەن بە ئێمە بەڵام لەبەر ئەوەی شوونی ئێمەیان بۆ هەڵنەگیرابوو ئیتر بۆ خۆیان یاخی بووبوون. بەڵام لەبەرئەوەی توانی دەسوکەریی دوور و درێژیان لەبەرامبەر هێزگەلی عێراقدا نەبوو، خۆیان بەدەستەوە دابوو.» ـ نووسەر.

بەردەوام دە - پازدە بریندارمان هەبوو کە بە گوێرەی هەبوونی توانی سواری یان پیادەیی لەگەڵماندا دەڕۆیشتن. ئەوکاتەی ڕێگە خۆش بوایە بەسواری دەهاتن و ئەگەر ڕۆیشتن زەحمەت بوایە لەسەر داربەست بەشان هەڵمان دەگرتن. هەر ئەم حەسۆ میرخانەی وا لێرە ڕۆنیشتووە بەر لە چوونەوە عێراق لە (ئەنبێ) لە کەلەکەیەوە بریندار بووبوو و شوێنی برینەکەی خوێناوی لێ دەچۆڕایەوە، پاش گەیشتن بە سۆڤیەت توانیی شوێنی گوللەکە سارێژ بکات. ناوی بریندارانی تر برێتی بوون لە: حالی محەمەد خەلانی، مستەفا ڕەشۆ لەلووکی، شێخ ئۆمەر مەلا شانەدەری (کوڕمامی خۆم بوو)، ساڵح خان، غەزالی میرخان، محەمەد ئەمین حەسەن خەلانی و ژمارەیەکی تر.

بگەڕێینەوە سەر دەربازبوونی بارزانییەکان لە چیای بێداو، بەسەر ئەو پێپلووکە یەک مەترییانەی دروستمان کردبوون سەرکەوتین هەتا گەیشتینە دەرەی کەڕ. نیزیکەی کێلومەترێکمان لەو دۆڵە بەسەر پێپلووکەکانی بەفردا بڕی. لە سەرەوە هەتا خوارێی ئەو چیایە نێزیکەی پەنجا گابەردی هەبوو بەجۆرێ لە هەر ڕێگەیەکی تێپەڕ دەبووین پێپلووکی بەفریان دروست کردبوو، بە پێشمەرگەکان گوترابوو سەیری ژێرەوە نەکەن نەوەکا هەڵبدێرێن و ئەگەر کەسێکیش هەڵدێرا کەسی تر بەدوایدا نەچێ لەبەرئەوەی هەلا بەهەلا دەبێ. بەهەزار ناری عەلی لە دەرەی کەڕ تێپەڕیین و گەیشتینە شوێنێ بەفری نەبوو. لەوێ کۆبووینەوە بەڵام چەند کەسێکمان لێ بەجێ مابوون. ئەوکاتە سەیرمان کرد وا چەند کەسێک بەرەو لامان دێن. سەرەتا وا تێ گەیشتین سەربازی تورکن بەڵام ئاشکرا بوو ئەمانە هەر پێشمەرگەکانی خۆمان بوون کە واماندەزانی بەجێ ماون. لەوێوە بەرەو گوندی بائی کەوتینە ڕێگە. ڕێگەمان بە بەفر داپۆشرابوو. شەو لە کوێستانی گەورۆک تێپەڕیین و باران نم نم دایدابوو.

ڕۆژی ٢٢ی ئایار (یەکەمی جۆزەردان) گەیشتینە گوندی بائی و چەند سەعاتێ لەوێ ماینەوە. ئەوجا شەو لەوێ دەرکەوتین و بەرەو گوندی چۆخ بزواین و لەوێوە سەرەوژێر بووینەوە و گەیشتینە ناوچەی شار کە شوێنێکی هێمن بوو. پاسەوانانی ئێمە ئاگەداریان کردینەوە کەوا پێنج جەندرمەی تورک وا بەرەو ئێرە دێن. مەلا مستەفا گوتی ئەگەر لێتان نێزیک بوونەوە چەکیان کەن و ئەگەر خۆیان بەدەستەوە نەدا ئاگریان دەن بەڵام ئەوان بۆ شوون هەڵگرتنی ئێمە نەهاتبوون و بێ ئەوەی لێمان نێزیک ببنەوە، ڕۆیشتن. ئەوکاتە دوو هرچ هاتنە ناو پێشمەرگەکانی گرووپەکەی ئێمە بەڵام لەبەرئەوەی جەندرمەکان نێزیک

بوون نەمانوێرا تەقە بکەین. ڕێ پێشاندەرانی ئێمە سێ کەس بوون لە دانیشتوانی گوندی کوردی (بائی)ی تورکیا. ڕێ پێشاندەرەکەمان گوتی ئەگەربێو بە هەورازی چۆخدا بەسەرکەوین لەوانەیە بەسەر پارێز و مینی دوژمندا بکەوین. بەڵام ڕێگەیێ هەیە قاچاخچیان پیایدا دەڕۆن. هەندێ ئالۆز و دژوارە بەڵام هێمن و بێ گیروگرفتە. شەو، بەرەو خۆرئاوا و سەرچاوەی (گۆرە) بەڕێ کەوتین و دوای سەعاتێ گەیشتینە ئەوێ. ڕێ پیشاندەر گوتی دەبێ لە گۆماوێکی گەورە بدەین و دووپاتی کردەوە کەوا ئەو پێ لە هەر کوێ دابنێ پێویستە ئێمەش شوون پێی ئەو کەوین، هەر کەس لە گۆماوەکە ئاسێ ببێ دەفەوتێ. دوا بەدوای ڕێ پێشاندەر چووینە ناو گۆماوەکە. وچانێکی زۆر بە گۆماوەکەدا تێپەڕیین. گۆماوەکە سیان و لیتەیەکی ڕەشی هەبوو و پێ و بەلەک و جلکمانی پیس کرد. بەهەر ئاوایەک بوو لە گۆماوەکە دەرباز بووین و لەو بەرەوە لە ناوچەی (دزا گەورە) بینیمان وا مەلا مستەفا دانیشتووە و پێشمەرگەکان لە کاتی پشوودان. مەلا مستەفا سەیرێکی کات ئەژمێرەکەی کرد و گوتی پەڕینەوەمان لە گۆماوەکە چوار سەعات و بیست دەقیقیەی کێشاوە. ئەمە یەکێ بوو لەو ڕێگە زۆر سەختانەی بڕیمان و هەمووشمان بەساغی گەیشتینە جێ و دەبوو هەر ئەوددەمە هەتا هەوا ساردی نەکردبوو بەرەو چیای ئاسنگرا بکەوینە ڕێ.

ڕۆژی ۲۳ی ئایار (۲ی جۆزەردان) بە رووکاری ڕۆژهەڵات کەوتینە ڕێ و بە چیای (ئاسنگرا)دا سەرکەوتین و نیوەڕۆ گەیشتینە ئەوێ. هیچ پێبژیوویێکمان پێ نەبوو. لەوێ باڵەفڕانی تورکیا گەیشتنە سەرمان. دوو بۆمبایان هەڵدا و بڕێکیش بە شێست تیر دەسرێژیان کرد و ڕۆیشتن.

لەو پەلامارەدا ئازار بە هەڤاڵانی ئێمە نەگەیشت. کاتێ دنیا تاریک داهات بەرەو چیای سپیرێز کەوتینە ڕێ کە تەواو بەفر گرتبووی و هیچ پشووەکمان نەدا. ڕۆژی ۲٤ی ئایار (۳ی جۆزەردان) بە لوتکەی سپیرێزدا کە سنووری ئێران و تورکیایە سەرکەوتین.

ڕۆژی ۲٥ی ئایار (٤ی جۆزەردان) هەتا ئاوابوونی ڕۆژ بەڕێگاوە بووین و شەویشمان بەبێ پێخۆر و پێبژیو لەو دەشتەدا بردە سەر.

ڕۆژی ۲٦ی ئایار (٥ی جۆزەردان) بەرەو لای گوندەکانی بێدکار و جرمی بزواین و چووینە ناو زەویی ئێران.

کەواتە پیاوانی بارزانی ڕۆژی ۲۰ی ئایار (۳۰ گوڵان) چوونە ناو زەویی تورکیا و

بەیانیەی ڕۆژی ٢٦ی ئایار (٥ی جۆزەردان) زەویی تورکیایان لەدوواوە بەجێ هێشت و گەیشتنە ناو زەویی ئێران. ئەم بەشەی ڕێڕۆیشتنی پێشمەرگەکان برێتی بوو لە ئاڵۆزترین قۆناخ و ویڕای ئەوەی هیچ پێک هەڵچوونێک لەگەڵ هێزەکانی تورکیادا ڕووی نەدا ماوەی شەش ڕۆژ درێژەی کێشا.

ڕۆژی٢٦ی ئایار١٩٤٧ی زایینی(٥ی جۆزەردانی ١٣٢٦) پیاوانی ئێمە گەیشتنە گوندەکانی بێدکار و جرمی لەناو زەویی ئێران. گوندی بێدکار هەر چەندە پێنج - شەش ماڵێ دەبوو بەڵام چۆڵ بوو لە دانیشتووانەکەی. کەچی گوندی جرمی ئاوەدان بوو و خێڵی هەرکی لەوێ دادەنیشتن. هێندە شەکەت و برسی بووین رادەی نەبوو، مەلا مستەفا پێشتر گەیشتبووە ئەو گوندە و برێک خۆراکی بۆ پیاوەکانی ناردبوو کە بەرێگاوەبوون بۆ ئەوەی وزەی بەرێوەچوونیان هەبێ.

هەر ئەو ڕۆژە جەرمیمان لە دواوە بەجێ هێلا و بەرەو دەشتی تەرگەوەڕ بۆ نێو بەگزادەکان چووین. ئەو دەمەی ئێمە لە بناری چیابووین پیاوێ هەواڵی دابوو بە نووری بەگزادە ئەوا جرمی پڕبووە لە خەڵک و هێزی چەکدار لەوێ کۆبوونەتەوە. نووری بەگ گوتبووی برۆن بزانن مەلا مستەفا نییە پەیدا بووەتەوە. دەمێ ئەو پیاوە بۆ هەواڵ دەس کەوتن هات، وەگیر خرا بەڵام هاوەڵەکانی تێیان تەقاند و ڕۆیشتن.

ڕۆژی ٢٧ی ئایار(٦ی جۆزەردان) ئێمە چووینە گوندی (تیلۆ) و مەلا مستەفا چووە گوندی (ئەنبێ) و ژمارەیەکیش چوون بۆ گوندی (بیلە چووک). هەرچۆن بێ ئەو شەوە لەوێ ماینەوە بۆ ئەوەی لەبەر چاوی بەگزادە و هەرکییەکان نەمێنین. بە کورتی هیچ پشووەکمان نەبوو و دووبارە بەڕێ کەوتینەوە و بەرەو لای خێڵی درەی ژووری چووین کە لە چەند گوندێک پێک هاتبوون و ئەم خێڵە لە نێوان خێلانی شکاک و هەرکی و بەگزاردەدا دەژیان. لە چیا سەر کەوتین، لە لوتکەی ئەو چیایەوە دەشتی سۆمای کە ناوچەی خێڵی شکاکە لەبەر پێمانەوە بوو.

ڕۆژی ٢٩ی ئایار(٨ی جۆزەردان) لە چیاوە سەرەولێژ بووینەوە و لە چەند گوندێ رەت بووین، نانمان خوارد و مەلا مستەفاش چوو بۆ گوندی(سیرۆ) و گوندی (حەسەن تەلوو)ی بەگزادە. دەمەو ئێوارە بوو ڕێ پێشاندەرەکەی خەڵکی گوندی (بائی)مان کە بەخۆهێشتی خۆی وەگەڵمان کەوتبوو ماڵئاواییی لێ کردین و گەڕایەوە دوا. ئێمە دوو سێ سەعاتێک لە گوندی (سیرۆ) هەڵوێستاین و بەشەو دەشتی (سۆمای)مان بوارد.

ڕۆژی ۳۰ی ئایار(۹ی جۆزەردان) دەمەدەمی نیوەڕۆ لە داوێنی چیایەک گەیشتینە دوو گوند ناویانم لەبیر نەماوە. خواردنێکمان خوارد و سەیرمان کرد وا لە بەرزاییەکانی ئەو بەرەوە کە ڕێبازگەی پێداچوونی ئێمە بوو نێزیکەی سەد کەسێکی سوارە لە چیا سەر دەکەون. مەلا مستەفا کە بەدووربین سەیری ئەمانەی دەکرد گوتی دەیانەوێ ڕێگەمان لێ ببەستن. بە مستۆ مێروزیی گوت لەگەڵ ژمارەیەک لە تفەنگدارانی خۆی لە ڕێگەی سنووری تورکیاوە پشتیان لێ بگرێتەوە بۆ ئەوەی لە دوو لاوە بیاندەینە بەر دەسڕێژی ئاگر و گۆڕەپانەکەیان پێ چۆڵ بکەین. مستۆ مێرۆزی تەبای پیاوەکانی بەم ئەرکەوە چوو و پاش چەند دەقیقەیەک لە تێکگیراندا سوارانی شکاک شکان و هەڵاتن. ئەو تێکگیرانە زیانی نەبوو. ئەم شکاکانە لە خێڵی (عەبدەوی) بوون کە لەساڵی ١٩١٤دا کاتێ شێخ عەبدولسەلامی برای مەلا مستەفا لە ڕێگەی گەڕانەوەی لە سەردانێک کە بە بانگهێشتنی ڕووسیا بۆ ئەوێندەری کردبوو و بۆ بارزان دەگەڕایەوە، مێوانی ئەم خێڵە بوو و ئەوانیش لەلای عوسمانییەکان زمانیان لێ دان و عەسکەری عوسمانیش بۆ گرتنیان بەسەریان وەربوون، لە پێکداداندا، دووکەس لە هەڤاڵانی شێخ عەبدولسەلام شەهید بوون و ئەوانیتر گیران، شێخ عەبدولسەلام و عەزیز گوهار و محەمەد ئەمین بابسیڤی لەلایەن عوسمانیەکانەوە لە مووسڵ بەدارەوە کران.

ئەم خێڵی شکاکەی بۆ شەڕی ئێمە هاتبوون لە هەمان عەبدەوییەکان بوون. پاش هەڵاتنی ئەمانە، ئێمە لە چیایەکە سەرکەوتین و بەرەو گوندی بالکان سەرەو لێژ بووینەوە. ئەو ڕۆژە ۳۱ی ئایار (۱۰ی جۆزەردان) بوو.

۱ی حوزەیران (۱۱ی جۆزەردان) چووین بۆ گوندی دیلزێ و بڕێک خواردنمان خوارد و پشوومان دا. لە جێرمییەوە هەتا دیلزێ شەو و ڕۆژ لە ڕۆیشتندا بووین و وچانمان نەدابوو.

۲ی حوزەیران (۱۱ی جۆزەردان) چووین بۆ گوندی چیتکۆ. (لە نەخشەدا حاجی جڤان).

۳ی حوزەیران (۱۳ جۆزەردان) چووین بۆ گوندی هەلووران. ( لە نەخشەدا هەبلەران)ە.

٤ی حوزەیران (١٤ی جۆزەردان) چووین بۆ گوندی بڕیشخۆران لە سنووری تورکیا. ئێمە لەو ناوچەیەدا لە بەرزاییەکانی سنووریدا دەڕۆیشتین و خۆراکیشمان لە گوندەکانی ئێران پەیا دەکرد. هێزی چەکداری ئێران هەرچەندە لە ڕووی مرۆڤەوە بێ ژماربوون و چەکیشیان نوێباو بوون، بەڵام لە ڕووی توانی کردەوەیی لاوازبوون و خێڵانی کوردیش تەنیا لە

ڕواڵەتدا وایاندەنواند کە یارمەتیی سوپای ئێران دەدەن و لە هیچ بەرەیەکدا بە تەواوی ڕووبەڕووی ئێمە نەدەبوونەوە. سوپای تورکیا خاوەن هێزێکی زیاتربوو و باڵەفڕانی تورکیا لە بەرزاییەکی زۆرەوە چاویان بۆ ئێمە دەگێڕا بەڵام هیچ شوێنەوارێکیان بەدی نەدەکرد. پیاوانی ئێمە لەو ناوچە سنوورییەدا بە شێوەی پێچاوپێچ دەڕۆیشتنە ڕێوە.

٥ی ئایار(١٥ جۆزەردان) بریشخۆرانی زەویی تورکیامان بڕی و گەیشتین بە دۆڵی قتوور لەناو زەویی ئێران. ئەم ناوچەیە پڕترسترین ناوچە بوو بۆ هێزگەلی بارزانی لەبەرئەوەی سوپای ئێران بەکەلوپەل و یەکەگەلی زۆر لە پیادە و سوارە و تۆپخانە و هاوەن و زرێپۆشی شەڕکەرەوە بۆ هەڵچنینی لەمپەرێکی کەسنەبڕ هێڵێکی بەرگریی لە رادە بەدەریان دروست کردبوو.

٦ی ئایار(١٤ی جۆزەردان) هەرچەندە بەشەو لە چیاوە سەراولێژ بووینەوە و بە ڕێگەیەک کە لە ئێرانەوە دەچوو بۆ تورکیا ڕەت بووین. پاشان لە چیا سەرکەوتین و هەتا گەیشتین بە چۆمێک کە ئاوێکی ئەوتۆشی نەبوو، لە ئاوەکەمان دا و چووین بۆ گوندی (کەلت) و هێڵی بەرگریی (خوی) هەتا (قتوور)مان لە دواوە بەجێ هێشت. لە گوندی (کەلت) خواردنمان خوارد و هەتا دوای نیوەڕۆ پشوومان دا. ئەوکاتە هەر پێنسەت کەسمان لەو چیا بەرزەی کەوتبووە پشت گوندی کەلت بەسەرکەوتین و لەسەر گازی چیایەکەدا دانیشتین.

مەلا مستەفا دووربینەکەی دەرهێنا و بانگی (تەیموور) و (بێجان)ی کرد. ئەم دووکەسە لە شکاکەکانی ناوچەکە بوون و هاتبوونە پاڵ هێزی بارزانی و هاتن بۆ سۆڤیەت. لەبەرئەوەی شارەزای ناوچەکە بوون، بووبوون بە ڕێ پێشاندەریشمان، مەلا مستەفا لە بێجانی پرسی ناوی ئەو دوو چیایە چییە؟ بێجان گوتی چیای ئاگرییە کە یەکێکیان ئاگریی بچووک و ئەویتریان ئاگریی مەزنە (مەبەستی ئەوان هەر ئەرارات خۆیەتی)، ئاگریی بچووک لە زەویی ئێراندایە و ئاگریی مەزن لە زەویی تورکیا و ڕێی ئێمە بەوانەدا رادەبرێ. مەلا مستەفا پرسیاری کرد هەتا ئەوێ چەند فرسەخ ڕێگایە؟ بێجان وەڵامی دایەوە گوتی حەوت ڕۆژ ڕێیە. ڕاست وەک ئەو گوتی پاش حەوت ڕۆژ گەیشتینە ئەو ناوچەیە.

٧ی ئایار (١٧ی جۆزەردان) بەرەو گوندی ئەلەند ڕۆیشتین و لەکاتی نیوەڕۆ گەیشتینە دوو گوندی بەلەڕەش و بەلەسۆر کە لە سنووری ئێران و تورکیادا هەڵکەوتوون و هەتا

سبەینەی ڕۆژی دواتر حەساینەوە. خەڵکەکە بەباشی میوانداریيان کردین.

٨ی ئایار (١٨ی جۆزەردان) بەیانی بەرەو رووکاری ڕۆژئاوا بەرێ کەوتین و پاش ماوەیەکی کەم ڕێگەی خۆمان بەرەو باکور وەرگێڕا و گەیشتینە زۆزانی حاجی بەگ کە زۆر بەرز و یەکجار دڵگیر بوو. لە بەری باکور سەدان ڕەشماڵیان هەڵدابوو، پرسیارمان کرد ئەمانە کێن؟ گوتیان لەو خێڵانەن کە بۆ زۆزان هاتوونەتە چیایان.

٩ی ئایار (١٩ی جۆزەردان) لە سەرەوەڕا بەرەو ڕەشماڵەکان سەرەولێژ بووینەوە. مەلامستەفا چوو بۆ ڕەشماڵی مستەفا بەگی سەرۆک خێڵەکان. هەندێک لە ئێمە چووین بۆ ڕەشماڵەکان و هەندێکی تر بۆ گوند. خەڵکی ئەوێ لە رووی پێبژیو و پێخۆرەوە زۆر بەباشی میوانداریيان کردین.

١٠ ی ئایار (٢٠ جۆزەردان) لە هەواری خێڵات ڕەت بووین و بەرەو گوندی(عەیارێ) ڕۆیشتین. هێشتا ڕۆژئاوا نەبووبوو کە لە داوێنی چیاوە گەیشتینە دوو گوندی تورک نشین کە دانیشتووانەکانیان ڕۆیشتبوون و چۆڵیان کردبوو. خەریکی لێنانی خواردن بووین کە سوارانی خێلات لە دواوە نیزیک بوونەوە، پاشەبەرەی ئێمە ڕووبەڕوویان بوونەوە و دەنگی ئاگرهاوێژی گەیشتە گوێمان.

١١ی ئایار (٢١ی جۆزەردان) ژمارەیەک لە پیاوانی ئێمە گەیشتینە سەر چیایەکەی ئەوبەر و لەگەڵ سوارانی خێلات کەوتنە تێکسرەواندن.

لەسەر ئەو جادەیەی لە (خوی)ەوە بۆ ماکۆ دەهات هێزێکی گەورەی سوپا دەبینرا کە لەگەڵ پێنج تانک و تۆپ و ئۆتۆمۆبیلی پڕاوپڕ لە سەرباز لە ئێمە نیزیک دەبوونەوە. پیاوەکانی ئێمە لەسەر چیایەک کە پێم وایە ناوی قزل داغ بوو و هێندەش بەرز نەبوو و تاوێرەبەردی گەورەی نەبوون، خۆیان لە پارێز گرت. مەلا مستەفا گوتی هەر کەسێ لە خۆی رادەبینێ با بڕوا شەڕ بکات. شەڕی سەرەکیی ئێمە لەگەڵ سوپای ئێران لەوێ ڕووی دا. کەسانی وەک مستۆ مێرووزی، مامەند مەسیح، مەل میری، لاڤکۆ و سەعید عومەر لەگەڵ پیاوانی دەسبژێری خۆیان کەوتنە گۆڕەپانی شەڕ و ژمارەیەکی تریش وەک مستەفا عەبدوڵلا و میرزا ئاغا لە دەشتدا شەڕیان دەکرد. لەو شوێنە کە گۆڕەپانێکی بچووک بوو هەر یەکێ لە پێشمەرگەکان لە شوێنێ شەڕی دەکرد. دواجار نیزیکەی شێست لاشەمان ژمارد. ژمارەیەکیش لە هێزگەلی بەرامبەر بەدیلی خۆیان بەدەستەوەمان دا.

ئەوکاتەی شەڕ بە کۆتا گەیشت نیزیکەی دەمەو ڕۆئاوابوو. لەسەر چۆمێ کە لە بەری

ماکۆوە پێدا دەهاتە خوار، پردێک هەبوو دەبوو خەڵک بەسەریدا ڕەت بن. لە ماکۆوە برێک وشتر هاتن کە ئازووخەیان بۆ سوپا بارکردبوو. مستۆ مێرووزی و هەڤاڵەکانی هێرشیان کردە سەر کاروانی وشتر و کوشتیانن. کەلەشی ئەو وشترانە کە بەر لە پردەکە لەسەر جادە کەوتبوون بووبوون بەمایەی ئەوەی تانکەکان لەکن وشترەکان بووەستن و بۆ ڕەت بوون لە جادە لابدەن و لە پردەکە دەرباز بن، بەڵام کامیۆنەکان کاتێ بە کەلەشی وشترەکان گەیشتن لە شوێنی خۆیان وەستان. لەوێ بوو کە پیاوەکانی مستۆ مێرووزی و مامەند مەسیح کامیۆنەکانیان راگرتە بەر ئاگر و زیان و شکانی گەورەیان لە دوژمن دا. بێگومان من خۆم لەو پێکدادانەدا هاوبەشیم نەبوو لەبەرئەوەی یەکەکەی ئێمە لە دواوە بوو. مستۆ مێرووز و مامەند مەسیح تەبای پیاوەکانیان پردەکەیان کۆنترۆڵ کرد. لە شەڕێکی گەورەدا کە بۆ دەست بەسەرداگرتنی پردەکە رووی دا ژمارەیەک لە هێزی سوپا کوژران و ئەوانیتر هەڵاتن. پردەکە کەوتە بەر دەستی پێشمەرگەکان. مستۆ مێرووز و پیاوەکانی لە پرد پەڕینەوە بەڵام مەلا مستەفا و ژمارەیەکی گەورە لەم بەرەی چۆم مابوونەوە. شەو تانکەکان بەرەو پرد هاتن و دەستیان بە بۆردمانی سەنگەری ئێمە کرد. پیاوەکانی ئێمە لەو تاریکییەدا لە نێزیک پردەکە پڕیان دایە کامیۆنگەلی هەڵگری سەربازان و، بە نارنجۆک و تفەنگەوە هێرشیان بردەنە سەر. ژمارەیەکیان لێ کوشتن و ئەوانیتر هەڵاتن. شێخ سلێمان و ئەسعەد خۆشەوی لە ئێمە جیابوونەوە و دیار نەبوو لە کوێن. شەڕێکی سەیر بوو. لەو شەڕەدا چواردە کەس لە پیاوانی گرووپەکەی مستۆ مێرووز بریندار بوون بەڵام کوژراومان نەبوو. ڕێ پیشاندەرێکمان هەبوو بەناوی میرزا عەبدی کە هەسپێکیشی هەبوو، گوتی من شارەزای ناوچەکەم، ئەو ئێمەی بەرەو چۆمەکە ڕێ بەدێیی کرد و بوارێکی پێشان داین، بە تاریکی توانیمان لەو بوارەدا لە چۆمەکە بدەین و دەرباز بین. هێزی سوپا هەرچەندە لەو ناوانە کۆجێ بووبوون بەڵام لەبەرئەوەی سەر لێشێواو و ترسا بوون نەیاندەتوانی کاردانەوەیەکیان هەبێ، مەلامستەفا لەو ناوەندە واتە لەناو جەرگەی سوپادا بوو، گرووپی مستۆ مێرووز و مامەند مەسیح بەراییکێش بوون کە پردەکەیان هاوێشتە بن دەسەڵات. گرووپی شێخۆمەر شانەدەری کە منیش هەر لەو گرووپەدا بووم لە پاشکۆی سوپای خۆمان بوو.

١٣ی ئایار(٢٣ی جۆزەردان) هەمووومان لە چۆم دەربازبووین و سەرکەوتینە سەرگردێک و لەوێوە چووینەوە پاڵ شێخ سلێمان و ئەسعەد خۆشەوی و هاوەڵەکانیان. مەلا مستەفا بە بینینەوەی ئەوان یەکجار دڵخۆش بوو. ئەوکاتەی سوپا پێ حەسیا ئێمە لە ڕووبارەکە

پەڕیوینەتەوە کەوتە ئاگرهاوێژی و پێشمەرگەیەکمانی بە ناوی محەمەد مەلا محەمەد شەهید کرد و لاشەکەی لەوێ مایەوە بەڵام میرزا ئاغا ڕۆیشت و تفەنگەکەی هێنا.

لە لێواری چۆمەکە ڕێگەیەک هەبوو دەبوو بە پەلە لەو ڕێگەیە بەدوور کەوین چونکە هێزی سوپا بەمرۆهەڵگر و کامیۆنەوە لەوێوە لێمان نێزیک دەکەوتن. دەمی ئێوارە لەو جادەیەوە بەرەو ژوور چووین و یەکێک لە هاوەڵانی ئێمە بەناوی حەجی گوێزی کە لە پێکدادانەکەی شەوی رابردوو بریندار‌بووبوو کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەیمان شاردەوە. پاشان ڕێگەمان بەرەو باکور درێژە دا ۆ لە چیایەک سەرکەوتین و لەوێوە بەرەو گوندێک بەناوی هاسوون سەرەولێژ بووینەوە. پێش ئەوەی بگەینە گوندەکە، لەوێوە ئێمەیان دایە بەر گوللە بەڵام گوێمان پێ نەدا و چووینە ناو گوند. نیوەڕۆ گەیشتینە ئەوێ.

مەلامستەفا وریای کردینەوە کەوا هەرکەس بە ڕادەی خۆی خۆراک بەکاربێنێ و مەڕێکی زیادە سەر نەبڕن کە پێویست نەبێ و، دووپاتی کردەوە دەست لە ماڵ و سامانی خەڵک نەدرێ. لەبن دارەکانی هاسوون وەستا بووین کاتێ باڵەفڕ لە ئاسمان پەیا بوونەوە و پەلاماریان داین. لەو چەپاوە ئاسمانییەدا مەل محەمەد ئەمین لێری کە یەکێک بوو لە سەرکردەکانی ئێمە و لە شەڕی شووت بریندار بووبوو جارێکی تر گوللەی پێ کەوتەوە و ساڵحیش ئەنگاوترا و هەردووکیان کوژارن. ئەمانە دوا زیانی گیانیی ئێمە بوون. لەوڕێڕۆیشتنە دە - پازدە کیلۆمەترییەدا چوار کوژراومان دا: محەمەد مەلا محەمەد، حاجی گۆزی، مەل محەمەد ئەمین لێری و ساڵح. لێرە وریا بووینەوە کەوا سێ کەس لە پیاوانی مستۆ مێرووزی ون بوونە و دیارنەبوو چییان بەسەرهاتووە، ئەوان لە ئاو پەڕیبوونەوە بەڵام ون بووبوون. مەلا مستەفا گوتی: ئیمە دەمێنینەوە هەتا بزانین ئەم سێ کەسە چییان بەسەرهاتووە. ئاخۆ دیلن یان کوژراو یان بریندار بوونە؟

١٤ی ئایار(٢٤ی جۆزەردان) بەو پێیە، ئەو ڕۆژەش هەر لە هامسوون ماینەوە هەتا ئەوەی سێ کەسەکە هاتنەوە لامان. دەرکەوت ڕێیان لێ ون بووە و چوونەتە ناو خێڵی جەلالی. مەلا مستەفا زۆری پێ خۆش بوو. لێرەش جارێکی تر باڵەفڕ پەلاماریان داینەوە. لە هامسوون دەرکەوتین و بەرووکاری ناوچەی خێڵی کوردی جەلالی بزواین. جەلالییەکان خێڵێکی کۆچەری خاوەن پەزن لە لێواری چۆمی ئاراسدا ژیانیان بەسەر دەبرد و هاوینان بۆ لەوەڕی مەڕومالات بەرەو چیاکانی سنووری تورکیا کۆچیان دەکرد. عەمەر ئاغای سەرۆک خێڵی جەلالی لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە بەوە تاوانبار کرابوو کە یاریدەی

بارزانییەکان دەدا، بۆیە سەرمان بە هەر ماڵێک لە گوندێکی ئەواندا بکردایە دەیانگوت شتێکمان بۆ خواردن نییە پێتانی بدەین، جەلالییەکان دزێوترین هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئێمەدا دەکرد و پارووێک نانیان پێ نەدەداین، ئێمەش لە ترسی مەلا مستەفا نەدەوێراین زۆریان لێ بکەین. هەتا نیوەڕۆ لەوێ ماینەوە و عەمەر ئاغا بە مەلا مستەفای گوت ئێوە بڕۆن شەڕ بکەن ئێمە یارمەتیتان دەدەین. پاشان تێگەیشتین ناپاکیی لێ کردووین و هاتنی ئێمەی بە سوپای ئێران گەیاندووە. شەو لەوێ کەوتینەوە ڕێ و کیلۆمەترێک خوارتر گەیشتینە هەندێ کۆچەر کە چەند سەر مەڕ و بزنیان پێ داین و خۆیشمان گایەکمان هەبوو سەرمان بڕی و خواردمان بەڵام هێشتاش نیوە برسی بووین.

١٥ی ئایار (٢٥ی جۆزەردان) بەرەو چۆمی ئاراس ڕۆیشتین کە چەند خانووەکی وێران و چۆڵی لێ بوون. لەوێ، میرحاج، مەشکەیەکی پێ بوو لەگەڵ خۆیدا هێنابووی، پڕی هەوا کرد و لەگەڵ لاڤکۆی (ئاشووری) و محێدین بابازادە کە یەکێ لە ئەفسەرانی فیرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان بوو بە مەلەوانی لە ئاراس پەڕینەوە و لەگەڵ سنوورەوانانی سۆڤیەت کەوتنە وتووێژ بۆ ئەوەی وەرمانگرن. پاش چەند سەعاتێ چۆن چوو بوون ئاوها هاتنەوە و بۆچوونی سنوورەوانانی سۆڤیەت ئاوهابوو: ئێمە داوای هەڵوێستمان لە مۆسکۆ کردووە و هەتا وەڵام دەگەڕێتەوە ئەگەر هەڤاڵانی ئێوە بپەڕنەوە ئەم بەرەی زێ ئێمە ڕێتان لێ ناگرین بەڵام مۆڵەتمان پێ نەدراوە بۆ پەڕینەوە لە ئاراس یارمەتیتان بدەین.

برسی و تێنوو لەناو ئەو خانووە وێران و چۆڵانەدا بێ حاڵ و ڕاکشابووین و حەڤدە کەسمان لە هەڤاڵانمان بە وڵاخ و هێستر ناردە ناو خێڵانی جەلالی بۆ ئەوەی پێبژیوێکمان بۆ بێنن. بەداخەوە کەس لەو ناوانە نەمابوو و مەڕ و ئازووخەیان لەگەڵ خۆیاندا بردبوو، ئەوانەی ناردبوومانن دەمی ئێوارە بەدەست بەتاڵی گەڕانەوە.

١٦ی ئایار (٢٦ی جۆزەردان) مەلا مستەفا گوتی ئێمە ناتوانین ماوەیەکی زۆر لە چاوەڕوانی وەڵامی مۆسکۆ و یارمەتیی سۆڤیەتدا بمێنین چونکە لە برسانە و بە پەلاماری هێزی سوپا لەناو دەچین. پاشان ڕووی لە پێشمەرگەکان کرد و گوتی هەر کەسێ هێزی هەیە با بڕواتە ئەو ناوانە و چەند دارێ ببڕنەوە و بیانهێنن. هەرچەندە لە بێ خۆراکیانە وزەی جووڵانەوەمان نەمابوو - لەبەر ئەوەی دوو - سێ ڕۆژ بوو هیچمان نەخواردبوو - چەند کەسێ خۆبەختکەرانە بەدەم ئەو داوایەوە چوون و پاش بڕێ بەخۆ و چەند دارێکی سەرشانیان گەڕانەوە.

میرحاج لەو ڕێپرۆیشتنەدا دووربینیی کردبوو و سێ پێستە بزنی کردبوو بە مەشکە و هێنابوونی، پڕی کردن لە با و دارەکانی بە شێوەی چوارگۆشە لەسەر دانان و ناوئاخنەکەشی گرت هەتاکو وەک کەڵەکی لێ بێت. ئینجا پیاوەکان بە چەک و ئەسپابیان بە نۆرە سواری کەڵەکەکە دەبوون و دەچوون بۆ ئەو بەری ئاراس. پاشان یەکێک کەڵەکەی بە بە تاڵی دەهێنایەوە. بەم ئاوایە هەتا ڕۆژی دوایی نێزیکەی سەد کەس لەوانەی مەلەوانییان دەزانی لە ئاو پەڕینەوە چونکە مەلا مستەفا دەیگوت ئەوەی مەلەوانی نازانێ با سوار نەبێ.

١٧ی ئایار(٢٧ی جۆزەردان)، ئەمڕۆ یەکێ لە هەڤالانی ئێمە کە ناوی سەلیم خان بیروی و خەڵکی مێرگەسوور بوو بوارێکی دۆزییەوە کە بەفریامان هات و پەڕینەوەمانی- کە لە پەرجووەک دەچوو، ئاسان کرد چونکە سێ ڕۆژبوو هیچ خۆراکێکمان نەخواردبوو و مەلەشمان نەدەزانی. نێزیکەی چوارسەد کەسێ کە مابوونەوە، لەو بوارەوە پەڕینەوە و مەلامستەفا دووا کەسێ بوو لە ئاراس پەڕییەوە. دەوروبەری پێنسەت و چوار کەس لە ئاراس دەرباز بووین، تەنیا ناوی پێنسەد و دوو کەس لەوان بە شێوەی ڕەسمی نووسراوەتەوە (دوو کەسەکەی تر لە کوردی شکاک بوون) لەو ڕێپرۆیشتننەدا وێرای کورد مرۆڤێکی ئاشووریش هەبوو بەناوی لاڤکۆ کە لە کۆنسولیەتی سۆڤیەت لە ورمێ تەرجومانی ڕووسی بوو. مرۆڤەکەی تر محێدین بابازادەی خەڵکی ورمێ لە ئەفسەرانی فیرقەی دێموکرات بوو کە لە سۆڤیەت کۆچی دوایی کرد. ئەم دوو کەسە تەبای میرحاجی ئەفسەری کوردی عێراق و جێبرِوای مەلا مستەفا، ئەوەڵێن کەسێ بوون بۆ وتوویژ لەگەڵ سنوروانانی سۆڤیەت و بەهیوای دەسکەوتنی کەرەستەی پەڕینەوە بەمەلە لە ئاراس دەرباز بوون. مرۆڤی سێیەم سەعید مەحمود لە فیدائیانی ئازەربایجان بوو کە لەگەڵ خۆماندا گەڕایەوە عێراق و مرۆڤی چوارەم فیدائییەکی ئازەربایجانی بوو بە ناوی ڕەزا و لە سۆڤیەت مایەوە. لەو ڕۆژەدا دوو کەس لە ئێمە لە کاتی پەڕینەوە بە ئاوداچوون هێندەی نەمابوو بخنکێن بەڵام مەلامستەفا گەیشتە هانایان و بە پشتێنەکەی خۆی ڕایکێشانە دەرەوە.

***

بەم ئاوایە ڕێپرۆیشتنی کەڵەمێرانەی مەلامستەفا و هەڤالانی لەزەویی تورکیا و ئێران لە دەسپێکی مانگی جۆزەردانی ١٣٢٦ لە گوندی بێداوی سەرسنووری تورکیا و عێراقەوە

دەستی پێ کرد و پاش بڕینی پێنسەت کیلۆمەتر ڕێگەی پێچاوپێچ و سەختی کێوەڵانی و، شەڕ و دەربازبوون، لە ٢٦ی جۆزەردانی ١٣٢٦ لە لێواری ئاراس بە کۆتا گەیشت. ئەم ڕێڕۆیشتنە پتر لە بیست ڕۆژ درێژەی کێشا و بارزانییەکان بەشێوەی مامناوەندی هەر ڕۆژەی بیست کیلۆمەتریان ڕێگە دەپێچایەوە.

# ڕۆژنەژمێری ڕێڕۆیشتن*

١٧ نیسان ١٩٤٧ (٢٨ی ئاخەلێوە ١٣٢٦): بەڕێکەوتن بەرەو خانووەکانی تەها هەرکی و کۆبوونەوە لەوێ.

١٩ نیسان (٣٠ی ئاخەلێوە): بەڕێکەوتن بەرەو ڕەشماڵەکانی زێرۆ هەرکی.

٢١ نیسان (یەکەمی گوڵان): بەڕێکەوتن بەرەو خواکورک لە ناو ئاخی عێراقدا.

٢١ نیسان (یەکەمی گوڵان): گەیشتن بە گوندی مووسلۆک.

٢٢ نیسان (٢ی گوڵان): گەیشتن بە گوندی ئەرگووش.

٢٣ نیسان (٣ی گوڵان): گەیشتن بە گوندی بەنێ، ئەم سێ گوندە بەشێکن لە ناوچەی خواکورک.

٢٤ نیسان (٤ی گوڵان): بەڕێکەوتن بۆ گوندی دەریا سۆر. لە ڕووبار پەڕیینەوە و شەو هەتا بەیانی بەڕێگەوە بووین. لە گەرووی زێت لەگەڵ پۆلیسی عێراقی تێک گیراین. یەکێکمان لێ کوشتن و دوانمان بە دیل گرتن. یەکێکیش لە ئێمە کوژرا.

٢٥ نیسان (٥ی گوڵان): بەڕێ کەوتین بۆ ناوچەی مزووری و لەوێ لە نێوان گوندەکاندا پەرت بووین. نێزیکەی مانگێکمان لەو ناوچەیە بەسەر برد هەتا ئەو کاتەی مەلا مستەفا هەواڵی نارد کە هەموومان لە ئەرگووش کۆ بینەوە.

١٩ ئایار ١٩٤٧ (٢٩ی گوڵان): بەرەو ئەرگووش کەوتینە ڕێ و گەیشتینە گوندی «درێ» کە باڵەفڕانی عێراقی پەلاماریان داین، دوو کەسیان لێ کوشتین و چواریان لێ بریندار کردین.

٢٠ ئایار (٣٠ی گوڵان): گەیشتین بەگوندی ئستوونێ.

٢١ ئایار (٣١ی گوڵان): گەیشتین بە گوندی بێداو لە سنووری تورکیا.

(٨) ڕۆژەنووسی میرحاج ئەحمەد ئاکرەیی ـ ئەفسەری کوردی عێراق و هەڤاڵ و راوێژکەری جێبڕوای مەلا مستەفا ـ لە بن سەردێری (کاروانی مێژووینی بارزانییەکان بەرەو یەکەتیی سۆڤیەت) لە کۆواری سپێدە ژمارە ٦، پایزی ١٩٩٤ (عەرەبی- کوردی) بەسەرنووسەرایەتیی ئاورەحمان پاشا بلاوبووەتەوە.

٢٢ ئايار (يەكەمی جۆزەردان): بە گوندی بائی گەیشتین.

٢٣ ئايار (٢ی جۆزەردان): لە كێوی ئاسنگرا سەركەوتین و بە شەو ناوچەی (گەوەڕ)مان بڕی.

٢٤ ئايار (٣ ی جۆزەردان): لە گەوەی سپیرێز لە سنووری ئێران و توركیا بەسەركەوتین.

٢٥ ئايار (٤ی جۆزەردان): هەتا تاریكیی ڕۆژئاوابوون بەرێوە بووین و گەیشتین بە دەشتێك كە هەتا بەیانیمان لەو دەشتەدا بەسەر برد.

٢٦ ئايار (٥ی جۆزەردان): لە توركیاوە هاتینە ناو زەویی ئێران و گەیشتین بە گوندی (جرمی)ی ناوچەی خێلاتی هەركی.

٢٧ ئايار (٦ی جۆزەردان): گەیشتین بە گوندی (ناخوانا- لەوانەیە بێدكار بێ) بەرەو لای بەگزادە، نووری بەگ لە دەستمان هەلات و ئێمەش لەوێ ماینەوە.

٢٨ی ئايار (٧ی جۆزەردان): گەیشتین بەدەشتی بلەچووك.

٢٩ ئايار (٨ جۆزەردان): گەیشتین بە گوندی حەسەن تیلۆی سیرۆ.

٣٠ ئايار (٩ی جۆزەردان): بەرەو ناوچەی شكاكەكان بەرێ كەوتین. خێلی عەمەر خانی شكاك ڕێگەی ئێمەیان گرت و ئێمەش لە دوورەوە گوللەمان پێوەنان.

٣١ ئايار (١٠ جۆزەردان): بەرەو باڵكان ڕۆیشتین.

١حوزەیران (١١ جۆزەردان): بەرەو رووكاری گوندی دێلزێ كەوتینە ڕێ.

٢ حوزەیران (١٢ جۆزەردان): بەرەو گوندی حاجی چیتكۆ كەوتینە ڕێ.

٣ حوزەیران (١٣ی جۆزەردان): بەرەو گوندی هەولەران ڕۆیشتین.

٤ حوزەیران (١٤ی جۆزەردان): ڕۆیشتن بەرەو بریشخۆران.

٥ حوزەیران (١٥ی زەردان): ڕۆیشتن بەرەو گەلیی قتوور.

٦ حوزەیران (١٦ی جۆزەردان): ڕۆیشتن بەرەو گوندی(كەلێت).

٧ حوزەیران (١٧ی جۆزەردان): بەرێكەوتن بۆ ئەلەند و بەلەسۆر.

٨ حوزەیران (١٨ی جۆزەردان): بەرێ كەوتین بۆ زۆزانی حاجی بەگ كە زۆر دلگیر بوو و شوێنێكی شیناوەرد و بژوێن بوو.

٩ حوزەیران (١٩ی جۆزەردان): بەرێ كەوتین بۆ ڕەشماڵەكانی مستەفا بەگ كە هەموویان

هەڵاتن (کازم شانەدەری پشتیوانی لەم بەشە ناکات).

١٠ حوزەیران (٢٠ جۆزەردان): لە جادەی ماکۆ پەڕیینەوە و چووین بۆ گوندی عیارێ.

١١ حوزەیران (٢١ جۆزەردان): گەیشتین بە گوندێک و شەو لەوێ ماینەوە.

١٢ حوزەیران (٢٢ جۆزەردان): هێزی سوپای ئێران ڕێگەی ئێمەیان گرت. شەڕێکی گەرم ڕووی دا کە ژمارەیەکی گەورەمان لێ کوشتن و بریندار کردن و بە دیل گرتن و چەک و تەقەمەنییەکی زۆرمان بەدەست کەوت. مەل میری کە یەکێک لە سەرکردەکانی ئێمە بوو بریندار بوو. ئەوان بەشەو جارێکی تر چەپاویان کردەوە، ئەم پەلامارە لەساکەدەشتێکی بێ بەرد و لێرەواردا ڕووی دا، ئێمە شەو بەرەو ماکۆ بزواین. لێرە هێزەکانمان بوون بە دوو پار. پارێکیان بەرەو لای پردەکەی سەر ڕووبارەکە بزوان و پارەکەی تر بەرەو شوێنێکی بەرینایی کەمی چۆمەکە ڕۆیشتن. نیوەمان لە چۆمەکە پەڕیینەوە کاتێ پێکدادان ڕووی دا، ژمارەیەکی زێدە لە هێزی سوپا هاتنە کوشتن و لە پێشمەرگەکانی ئێمەش یەک کەس کوژرا و دوازدە کەسیش بریندار بوون، هەرچەندی هێزی سوپا کۆجێ بووبوون بەڵام توانیمان لە چۆمەکە دەرباز بین.

١٣ حوزەیران (٢٣ جۆزەردان): گەیشتین بە گوندی هاسوونی تورکان و کەوتینە بەر هەڵمەتی باڵەفڕ. مەل میری کە پێشتر بریندار بووبوو جارێکی تریش ئەنگاوترا و کوژرا. دوو ڕۆژان لە گوندی هاسوون ماینەوە.

١٤ی حوزەیران (٢٣ جۆزەردان): بەرەو سەرچاوە ئاوێکی کە لە نێوان دارانەوە دەهاتە خوار ڕۆیشتین، باڵەفڕ بۆ سەرانسۆی ئێمە پەیابوون بەڵام لەبەرئەوەی خۆمان لەناو دارەکان وەشاردبوو ئێمەیان پێ نەدۆزرایەوە. هەتا ئێوارەی ئەو ڕۆژە هەر لەوێ ماینەوە و بۆ شەو کەوتینەوە ڕێ.

١٥ حوزەیران (٢٥ جۆزەردان): بەرەو ناو خێڵی جەلالی کەوتینە ڕێگە. ڕۆژێک لەوێ ماینەوە.

١٦ حوزەیران (٢٦ جۆزەردان): بەرەو چۆمی ئاراس بزواین کە چەند خاونووەکی کۆن و کاولگەی لێ بوون. سێ ڕۆژمان لەوێ بێ پێبڕیو و پێخۆر بەسەربرد.

١٨،١٧،١٦ حوزەیران (٢٨،٢٧،٢٦ جۆزەردان): لە ئاوی ئاراس پەڕیینەوە و چووینە ناو زەویی سۆڤیەت کە چەک و تەقەمەنییان لێمان وەرگرت.

# راپۆرتی ئۆپەراسیۆن

## ١

ئەرکانی هێزی کوردستان، روکنی ٢ ، ورمێ، ژمارە ٢٦٧٨٨ /د،
سەعات ٢١،٠٠ ، مێژوو ٢٦/٣/٧

## راگەیاندنی ژمارە ١

هەلومەرجی ٢٤ سەعاتی رابردووی هێز و فیرقەی ٤ی ورمێ بەشێوەی خوارەوە رادەگەینین:

١ - سەعات ٢ی رۆژی شەشەم، هەواڵ بۆ ئەرکانی فیرقە لە ورمێ هات کە سەعات ٢ی ئەو رۆژە ژمارەیەک لە بارزانییەکان هاتوونەتە جرمی و ٢٠ سەر مەڕیان بردووە.

٢ - دەسبەجێ لە سەرکردەی هێزی عێراقەوە زانیاری هات کەوا بارزانییەکان لە عێراقەوە بۆ تورکیا هاتوون و لەوانەیە بەرەو ئاخی ئێران بێن.

٣- سەعات ١٣،٠٠ کوڕانی نووری بەگ و هەرکۆ بەگ (بەگزادە) هاتن بۆ ئەرکانی سوپا و هاتنی بارزانییەکانیان بۆ (خوشکێ)ی شەش کیلۆمەتری باشووری ئەمبێ (ئەنبێ) راگەیاند.

٤ - سەعات ١٤،٠٠ ی هەر ئەو رۆژە کوڕەکەی نووری بەگ رایگەیاند کەوا بارزانییەکان لە خوشکی - یەوە بەرەو ئەمبێ خەریکی پێشوەچوونن.

٥ - لە سەرجەمی ئەو رووداوانەوە دەرکەوت بارزانییەکان لە سنووری تورکیا لە ریگەی بەردەسوور چای - ەوە هاتوون بۆ ئێران و ژمارەیان نێزیکەی ٤٠٠ کەسە.

٦ - دەسبەجێ سەعات ١٤،٠٠ فڕینێکی سەرانسۆیی لەسەر بەرزاییەکانی سنوور و گوندەکانی ناوهاتوو لە پێشەوە ئەنجام درا بەڵام بەهۆی هەبوونی هەور و هێڵەوە هیچ ئەنجامێک لە سەرانسۆیەکە وەگیر نەکەوت.

٧ - دەسبەجێ نەقیب عەدل زەرابی تەبای رەشید بەگ و کوڕانی نووری بەگ بۆ ئەرکان بانگهێشتن کران، فەرمانی ناردنی ١٠٠ تفەنگدار بەرەو مەوانا درا. ناوبراوان سەعات ١٨،٠٠ کەوتنە رێ و هەتا سەعات ٢٢،٠٠ لەرنێ و سەعات ٥،٣٠یش گەرووی گردەپێچ - یان گرت. هەر ئەو دەمە کاروانێک کە پێک هاتبوو لە دوو

فەوجی پیادە (فەوجی ئەسفەهان و فەوجی ۲ی ئازەرپاد)، گرووپێکی تۆپهاوێژ و چوار مرۆهەڵگر، دەزگەیەکی بێتەل، بەیانیەی ئەمڕۆ لەگەڵ ۱۸ لۆری بەرەو لەرنێ کەوتنە ڕێگە و هەتا سەعات ۱۷،۳۰ لە لەرنێ مانەوە و بۆ ڕۆژی پاشتر لە مەوانا جێگیر دەبن.

۸ - ئەمڕۆ سەعات ۱۲،۰۰ نووری بەگ هات بۆ تێلیگرافخانە و نامەیەکی هێنابوو کە مەلا مستەفا بۆ ئەوی نووسیبوو و بۆ ئەوەی ناوبراو لە نێوان ئەو و دەوڵەتدا بێلایەن بووەستێ، پەنای بۆ ناوبراو بردبوو. سەعات ۱٦،۰۰ش نامەیەک کە لە مەلا مستەفاوە بۆ فیرقە نووسرابوو گەیشتە ئەرکانی سوپا و، بەو ناوەی کەوا نیاز لە گەڕانەوەم خۆبەدەستەوەدانە بەدەوڵەتی شاهەنشا، وەڵامی درایەوە کەوا بێ ئەملا و ئەولا و دەسبەجێ بەرەو ورمێ بکەوێتە ڕێ. بەڵام بۆچوونی فیرقە ئەوەیە کە نیازی ناوبراو دەسخەڵەتدان و کات رابوێرییە بۆیە فەرمان بە کاروانی ناردراو درا لە بزاوتی خۆی بەرەو رووکاری مەوانا پێ هەڵگرێ بۆ ئەوەی لە سایەی پاڵەپەستۆی زیاترەوە بتوانێ چیی زووترە بە ئەنجامێک بگات.

۹ - دوا فڕینی سەرانسۆکەر ڕۆژی پێشوو دەڵێ: لە دەوروبەری تەلۆ و ئەمبێ کەسانی گومان لێکراو بینران کە هەر بەدەرکەتنی باڵەفڕ خۆیان شاردەوە و نێزیکەی ۱٥ کەسیش لە پیاوانی خراپەکار لە باشووری تەلۆ لەسەر بەرزاییەکان لەناو سەنگەر بینران بەڵام کۆجێبوون (تمرکز)ێکی گرینگی خراپەکاران بەرچاو نەکەوت. هەرچەندە فڕینەکە نەوییش بوو بەڵام ئەوان تەقەیان لە باڵەفڕ نەکرد.

۱۰ - دوا زانیاری کە سەعات ۲۱،۰۰ لە کاروانی تەرگەوەڕ گەیشت، مەلا مستەفا سەعات ۲۰،۰۰ ئەمبێی بەجێ هێشتووە و بەرەو خانکێ ڕۆیشتووە و ژمارەیەک لە پیاوانی خۆی ناردووە بۆ نازلووچای. بەم ئاوایە نیازی ئەوان تێ هەڵکشانە بەرەو ژووروو و دەست تێکەڵکردنە لەگەڵ خێڵانی باکور و ڕۆژئاوای ورمێ.

سەرکردەی فیرقەی ٤ و هێزی کوردستان - لیوا هومایوونی

سەرۆکی فیرقەی ٤ و هێزی کوردستان - عەقید فەیووزی

## ٢

ئەرکانی هێز و فیرقەی ٤ی ورمێ، روکن ٣، ژمارە ٦٤٤/ھ
سەعات ٢٤ مێژوو ٢٦/٣/٩

# قۆناغی سێیەمی ئۆپەراسیۆن

فەرمانی ئۆپەراسیۆن ژمارە ١

**١- بارودۆخی گشتی**

ئەلیف. زانیاری لە بارەی دوژمن: بەپێی راگەیاندنی پێوەلکاو (ژمارە ٢)

بەکورتی بەگوێرەی ئەوەی لەبارەی بارودۆخی بارزانییەکانەوە بە دەست هێنراوە ئەوان دەیانەوێ هەر بە پەلە خۆیان بە سنووری ماکۆ - بازرگان بگەیەنن.

بێ. هێزی خۆمانە بە شێوەی خوارەوە کۆجێ بوونە:

ماکۆ: دوو فەوجی پیادە، گرووپێکی هاوەن وەشێن، کەتیبەیەکی تۆپی ٧٥ی، کەتیبەیەکی سوارە، دەزگایەکی بێتەل.

سییەچێشمە: فەوجێکی پیادە، گرووپێکی تۆپی ٧٥ی، دوو مرۆهەڵگر، دەزگایەکی بێتەل.

قەرەزیائەدین: سریەیەک پیادە، سریەیەک رەشاش لە کەتیبەی ٢ فەوجی ١٢

خوی: سریەیەکی پیادە لە کەتیبەی پیادە.

قتوور: کەتیبەیەکی پیادە.

لە نێوان رێگەی خوی و قتووردا: فەوجێکی پیادە، گرووپێکی هاوەن، گرووپێکی تۆپی ٧٥ی، کەتیبەیەکی سوارە.

شاپوور: کەتیبەیەکی پیادە کە سریەیەکی کەمە، کەتیبەیەکی سوارە.

تەرگەوەڕ: دوو فەوجی پیادە، گرووپێکی هاوەن وەشێن، دوو مرۆهەڵگر، کەتیبەیەکی سوارە، دەزگایەکی بێتەل.

شنۆ: فەوجێکی پیادە، گرووپێکی هاوەن وەشێن (کەتیبەیەک لەم کاروانە سەعات ٢ -

٢٦/٣/٩ گەیشتە ورمێ).

کەتیبەی سوارەی سەر بە فەوجی ٥ی لورستان بەیەک دەزگای بێتەلەوە ئەمڕۆ لە سنوورەوە گەیشتە نەغەدە.

**٢ - ڕێکخستنی سەرکردایەتی**

ئەلف. بەستنی ڕێگەی دەربازبوونی بارزانییەکان بەرەو باکور، لە دۆڵی خوی - ەوە هەتا قتووری سەر سنوور.

بێ. بەدواکەوتنی بە پەلەی بارزانییەکان لە باشوورەوە بەهۆی کاروانی تەرگەوەڕ، ئەمەش بە بەهێزکردنی کاروانی ناوبراو. لە جێبەجێ کردنی ئامانجی سەرەوەدا ڕێکخستنی خوارەوە دەکرێت.

**٣ - راپەڕاندن**

ئەلف. کاروانی دۆڵی قتووری پێکهاتوو لە ٤ کەتیبەی پیادە، سریەیەکی هاوەن وەشێن (کەتیبەی ٣ - فەوجی ١٠ کە ئێستە لە قتوورە - کەتیبەی ١ی فەوجی بەهادر - کەتیبەی ٢ی فەوجی ٢٢ - کەتیبەی ١ی فەوجی ئازەرپاد) ٤ مرۆهەڵگر، کەتیبەیەکی تۆپی ٧٥ی چیایی (کەتیبەی تۆپخانەی فەوجی کۆپال)، سریەیەک سوارە لە فەوجی سوارەی کوردستان، دەزگایەکی بێتەل، بەسەرکردایەتیی عەقیدی پیادە نیساری و جێگریەتیی عەقید فولادوەند.

ئەرکی پێ سپاردراو: بەرێکوپێکییەکی گونجاو و گرتنی خاڵە گرینگەکان، ڕێگەی دەربازبوونی بارزانییەکان ببەسترێ و، بەر لە پەلهاوێشتنیان بۆ باکور بگیرێ(٩).

ب. کاروانی مەرگەوەڕی پێکهاتوو لە کەتیبەکانی ٢ و ٣ی فەوجی ٦ی ئازەرپاد، کەتیبەی ٢ی ئەسفەهان، سریەیەکی هاوەن وەشێن لە فەوجی ئازەرپاد، دوو مرۆهەڵگر، سریەیەک تۆپی ٧٥ی و دەزگایەکی بێتەل، بە سەرکردایەتیی عەقید سەردادوەر.

ئەرکی پێ سپاردراو: بەدواکەوتنی بەپەلەی بارزانییەکان و گەیاندنی ئەوان بەناوچەی قتوورچای بەنیازی وەشاندنی زەبری گەورە و گورچکبڕ لێیان. هەروەها سەرکردەی ئەم

(٩) ئەم فەرمانی کارە هەندێک دەستکاریی تێدا کرابوو و لەسەری نووسرابوو: «لە نێوان خوی و قتوور و سنوور، گشت خاڵ و شوێنەکان بەجۆرێ بگیرێن کە ئیتر ڕێگەی دەربازبوونی بارزانییەکان بۆ باکور نەمێنێ».

کاروانە ١٢٥ کەس لە سوارانی شکاک بەسەرپەرشتیی رائیدی سوارە سوڵح جۆ و ١٠٠ کەس لە سوارانی هەرکی و بەگزادە بەسەرپەرشتیی ملازم یەکەمی سوارە «ئەردەڵان» لە پێشەکیی کاروانی ناوبراودا دادەنێ بۆ ئەوەی لە کاتی دەستەویەخە بوونی بارزانییەکاندا سوودیان لێ وەربگیرێ. هەردوو ئەم کاروانە لەژێر سەرپەرشتیی عەمید بێگلەریی یاریدەری سەرکردەی فیرقەی ٤ی ورمێدا دەبێ، پێویستە ناوبراو ئەرکانی خۆی لە ئەفسەرانی ئەرکانی فیرقە و میرە و بێتەل پێک بێنێ و بۆ ئەم مەبەستە پێوەندی بە بەرپرسانی پێوەندیدارەوە بکات و دوو ئۆتۆمۆبێلی مرۆهەڵگر و دەزگایەکی بێتەل لە ژێر دەستی ناوبراودا دەبێت.

ج. فەوجی سوارەی فەوزیە کەتیبەیەکی کەمە و سریەیەک رەشاش کە لە کاروانی مەرگەوەڕدا ئەرکی پێ سپاردراوە، بە سەرکردایەتیی سەرکردەی فەوج لە شاپوور کۆجێ دەبێ و، هێوریی ئەم ناوچەیە دەپارێزێ و لە کاتی پێویستیشدا پشتیوانی لە یەکێک لە کاروانەکان دەکات بەپلەی یەکەم کاروانی بەرگەگری باشوور و بەپلەی دووەم کاروانی قتوورچای و، وەک هێزێکی سپێری جووڵاوە لە ژێر سەرپەرشتیی کاروانگەلی ناوبراودا دەبێ.

د. کاروانی مەرگەوەڕ بەو شێوەیەی پێک هاتووە (سریەکانی نادری و ئاهەن، سریەیەک هاوەن، دوو ئۆتۆمۆبێلی مرۆ هەڵگر، دەزگایەکی بێتەل) و کەتیبەیەکی سوارە و سریەیەک رەشاش لە فەوجی فەوزییە، ئەرکی بەستنی رێبازگەکانی دالامپەر و بزسینایان لە باشووری مەرگەوەڕەوە پێ سپاردراوە.

هـ. کاروانی سیبەچێشمە پێک هاتووە لە کەتیبەی ٢ی فەوجی بەهادر یەک سریەی کەمە (سریەیەک لە زۆرئابادە)، سریەیەک تۆپی ٧٥ی و دوو ئۆتۆمۆبێلی مرۆهەڵگر، دەزگایەکی بێتەل لە ژێر سەرپەرشتیی رائید یاسائیدا.

ئەرک: پێکهێنانی هێڵی دووەم لە پاشکۆی ناوچەی قتوور و رێ بڕینەوە لە هەر پەلهاوێشتنێکی بارزانییەکان کە لەوانەیە لەلایەن ئەوانەوە بەرەو باکور ئەنجام بدرێ.

و. کاروانی ماکۆ پێک هاتووە لە کەتیبەی ١ فەوجی ١٢، کەتیبەی ٢ فەوجی ٢٧، سریەیەک هاوەن وەشێنی ئەسفەهان، کەتیبەی تۆپی ٧٥یی نەقیب رەئیسیان، دوو ئۆتۆمۆبێل، دەزگایەکی بێتەل، لەژێر سەرکردایەتیی عەقیدی سوارە مزەفەریدا.

ئەرک: بەستنی هەموو رێبازگە گرینگەکانی نێوان بازرگان و پەل دەشت کە هەتا ئێستە

سەرانسۆ کراون، ئەمەش بۆ دروستکردنی هێلێکی ڕێ لێ گرەوەی یەکجارەکی.
ز. کاروانی قەرەزیائەدین پێک هاتووە لە کەتیبەیەکی دوو سریەییی فەوجی ۱۲ی کرماشان. کەتیبەی ناوبراو سریەیەکی خۆی کە لە (خوی) مۆڵ بووە بانگهێشتن دەکات بۆ قەرەزیائەدین. کۆی هەر سێ کاروانی پێشوو (سییەچێشمە، ماکۆ، قەرەزیائەدین) لەژێر سەرپەرشتیی عەمید زەنگەنەی سەرکردەی لیوای ورمێدا دەبێت. ناوبراو ئەرکانی خۆی لە نێوان ئەفسەرانی ئەرکانی لیوای ناوبراودا هەڵدەبژێرێ. دەزگایەکی بێتەل و دوو زرێدار لە بن دەستی ناوبراودا دەبن.
ح. کەتیبەکانی سوارەگەلی کوردستان کەوا لە ماکۆ و سییەچێشمە و خوی جێگیربوونە لە قەرەزیائەدین کۆ دەبنەوە و وەک سپێری جوولاوە لە ژێر سەرپەرشتیی کاروانگەلی باکوردا دەبن، دەزگایەکی بێتەلیشیان پێ دەدرێ.

**٤- سپێری هێز**

کەتیبیە پیادەی کەمکردنەوەی خزمەت، دوو ئۆتۆمۆبێلی مرۆهەڵگر، سریەیەکی تپی ۷۵یی نەقیب فەرسیو، کەتیبەی ۱۰٥یی بەرزی ئامێرەکی. هێزی سپێریش لە کاتی پێویست و لە شوێنی دیاریکراودا سوودی لێ وەردەگیرێ.

**٥ -** پێویستە گرتنی ناوچەی قتوورچای و هەموو گواستنەوە و جێگۆرکێیەک هەتا سەعات ۱۲ی ڕۆژ بەکۆتا هاتبێ.

**٦- باڵەفڕەیی:** پۆلی هەوایی بەپێی فەرمانی سەرانسۆکردن کە ڕۆژانە دەدرێن و سبەینان و ئێواران خەریکی سەرانسۆکاری دەبن و هەروەها ئەرکەکانی فڕین و بۆمباباران کردن بەگوێرەی بارودۆخ جێبەجێ دەکرێ.

**٧- پێوەندی:** پێوەندیی کاروانگەل بەبنکەی هێز و ئەرکانی فیرقەوە لە ڕێگەی بێتەلەوە دەبێ، هەروەها ئەو کاروانگەلەی لە تەوەرەی ڕێگەی ورمێ - شاپوور - خوی - قەرەزیائەدین - ماکۆدان وێرای بێتەل سوود لە تێلێگراف و تەلەفۆنیش وەردەگرن. پێوەندیی نێوان کاروانگەل و یەکەگەلی هەر کاروانێک پێویستە بەهۆی هەموو ئەو کەلوپەلە هەواڵدەرییانەوە بێت کە لەبەردەستیاندا هەیە بەتایبەتیش نەینۆک و چرا و تەتەری نێوان سریەکان.

سەرکردەی هێز و فیرقەی چواری ئازەربایجان، لیوا هومایوونی

سەرۆکی ئەرکانی هێز و فیرقەی ٤ - عەقید روکن فەیووزی

## ٣

## ئەركانی هێز و فیرقەی ٤، روكنی ٢، ورمێ، ژمارە ٢٧٠٠٠، سەعات ٢٤، مێژوو ٢٦/٣/٩

### راگەیاندنی ژمارە ٢

بارزانییەکان کە هەتا رۆژی ٣١ ئاخەلێوە لە ئەنجامی لێدان و پاڵەپەستۆی یەک لە دوای یەکی کاروانگەل و هێز، ئاخی وڵاتی شاهەنشاهییان بە زۆردارەکی بەجێ هێڵا و بەشێکیان لەگەڵ شێخ ئەحمەد و چەند کەسێکی تر لە سەرۆکانی خێڵ خۆیان بەدەستی سوپای عێراقەوە دا بەڵام مەلا مستەفا لەگەڵ هێزێکی دەسبژاری خۆی کە نێزیکەی ٣٠٠ هەتا ٤٠٠ کەسن لە رێگەی (خواکورک - باکرە)وە چوونەوە ناو زەویی عێراق.

لە ماوەی ئەم مانگەی دواییدا گەلێک جار لەگەڵ پۆلیسی عێراقیدا لە شەڕ و پێکداداندا بووەوە و زیانی پێ گەیشتووە. دواجار هاتەوە ناو زەوی تورکیا و لەوێش کتوپڕ تووشی کاروەرانی ناوەخۆ و سنووروانانی تورکیا بووەوە و لە نێوایاندا شەڕ و پێکدادان رووی داوە و زیانیان پێ گەیشتووە.

ڕۆژی ٦ جۆزەردان، سەعات ٢، بارزانییەکان لە ریگەی دۆڵی هاروونەوە لە سنووری ئێران دەربازبوون و پاش پەلامارداني جرمی و بردنی ٣٠ سەر مەڕ، دڵنیا دەبن کە لە تەرگەوەڕ هیچ هێزێک نییە و بە خەیاڵێکی هێن دێنە ئەو ناوچەیەوە، دەمودەست گوندەکانی: ئەمبێ، چەمەن، قەرانی، تووڵەگی، سلینەک، مسینەک داگیر دەکەن.

رۆژی ٧ی مانگ ناوبراو نامەیەکی لە رێگەی نووری بەگەوە رەوانە کردووە و داوای لێ کردووە کە ببێ بەناوبژیوان لە نێوان ئێران و خێڵ. نووری بەگ خۆی هەر ئەو رۆژە هاتە ئەرکان و بابەتەکەی بەو شێوەیە راگەیاند. فەرمان بەناوبراو درا کە نامەیەک بۆ مەلا مستەفا بنووسێ و پێی رابگەینێ کەوا پێویستە لە ماوەی ٢٤ سەعاتدا بێت بۆ ورمێ و بێ ئەملا و ئەولا خۆی بەدەستەوە بدات. رۆژی پێشتریش نامەیەکی بەهەمان شێوە بۆ عەقید سەردادەوەر نووسیوەوە و داوای لێ کردووە کەوا ئامادەیە خۆی بەدەستەوە بدات بەڵام بڕیار بدرێ کە ئەفسەرێکی پایە بەرز و یەکێک لە سەرۆک خێڵان ببێ بەناوبژیوان لە نێوان ئەو و دەوڵەتدا و کاروباری ئەو رابپەڕێنێ. بەڵام بە پێشینەی رابردووی مەلا مستەفا و بەڵگە و دەستهاوێژەکانی کە لەبەردەستدان نیازی مەلا مستەفا برێتییە لە

خافلاندن و بەرێ کردنی کات و بیانوو هێنانەوە و بەدرەنگ خستن.

رۆژی ٨ی مانگ بارزانییەکان ناوچەی مەرگەوەڕیان چۆڵ کرد و پاش دەربازبوون لە نازلووچای بەرەو سۆمای برادۆست کەوتنە رێ. نیوەڕۆی ٨ (بەیانیەی ٢٦)(١٠) بانەکانی گەلیی شێخان و کەرتش و گوندی سیرۆیان گرت و هەندێکی تریان بەردەوام بەرەو باکور دەڕۆن.

ئەمڕۆ بارزانییەکان بانەکانی گەلیی شێخان و کەرتش و گوندی سیرۆیان بەتەواوی گرت و هەندێکیشیان وا بەرەو گوندی سینا دەڕۆن.

ئەمڕۆ لەگەڵ هەندێ لە تفەنگداران بەسەرپەرشتیی ئەسعەد، بانەکانی گەلیی جیهان - یان کە بۆ پاراستنی پاشکۆی هێزەکانی ئەوان یەکجار گرینگە، گرتووە. رۆژی پێشتر کوڕی عەمەر شکاک لەگەڵ هەندێ لە تفەنگداران لە «مەلوونە» بووە و بەگەیشتنی بارزانییەکان ئەو شوێنەیان بەجێ هێشتووە و بەرەو سیرۆ رۆیشتوون، لەوێش کەوا دەبینن وا دیسان بارزانییەکان خەریکن دێنە ناو گوند، ئەوان دوای بەجێ هێشتنی گوندەکە بەرەو گونبەت دەچن. لە ماوەی سێ رۆژی دوواییدا، فڕینی باڵەفڕانی سەرانسۆکەر، بەیانی و ئێوارە چەند فڕینێکی یەک لە دوای یەکیان بەجێ هێناوە بەڵام زۆربەیان بەهۆی خراپیی هەواوە ئەنجامێکیان لە سەرانسۆکردنی ئەوان بەدەست نەکەوتووە. وێڕای ئەمە لە هەوای خۆشیشدا لەبەرئەوەی بارزانییەکان بێ رادە لەبارەی سەرانسۆییەوە وریایی و لێهاتوویی تەواویان هەیە بۆیە باڵەفڕەکانی سەرانسۆکەر، زۆربەی زۆریان ناتوانن شوێنی وردی ئەوان دیاری بکەن.

ئەنجام: لەوەی هەتا ئێستە بەدەست هاتووە، نیازی بارزانییەکان رۆیشتنە بەرەو باکوری ماکۆ و بازرگان و، بەو نامە گۆڕینەوانەی کە دەیکەن دەیانەوێ بمانخافڵێنن و کات بەسەر ببەن.

سەرۆکی ئەرکانی فیرقەی ٤ - عەقید روکن فەیووزی

(١٠) بەیانیەی ٢٦ زیادەیە.

## راپۆرتێک لەبارەی نووسراوە سوپاییەکان

بە گەیشتنی فەرمانی ئۆپەراسیۆنی ژمارە (١) بە هەژماری ٦٤٤ و هـ ٢٦/٣/٩ سەعات ٢٤ بۆ گشت سەرکردەکان، عەمید بێگلەری خۆی لەلایەن فیرقەوە راسپاردرابوو و ئەرکەکانیشیان لەلایەن فیرقەوە دیار و دەسنیشان کرابوون. جەنەرال عەمید بێگلەری لە سەعات ١٩ی رۆژی ٢٦/٣/١٠ لە ورمێوە بەرەو شاپوور کەوتە رێ و سەعات ١ی رۆژی ٢٦/٣/١١ گەیشتە شاپوور و بەیانیەی ٣/١١ فەرمانگەلی ژێرەوەی دەرچواند:

١- بۆ رائید سولح جۆ سەرپەرشتیاری سوارەگەلی خێڵان:

رائید سولح جۆ، ئێوە لەگەڵ یەکەی سوارەگەل و تفەنگدارانی کە لە ژێر دەستی خۆتاندایە پێویستە رووبەڕووبوونەوەتان لەگەڵ بارزانییەکاندا بپارێزن و رێگەی ئەوان لە پەلهاوێشتن بۆ باکور زۆر بەباشی بگرن. بەهۆی هێزگەلی سوپاشەوە پشتیوانیتان لێ دەکرێ و، بێگومان بۆ بەجێ هێنانی ئەم مەبەستەش لەبەرئەوەی بارزانییەکان پیادەن پێویستە چواردەوریان بگرن و ناچاری شەڕیان بکەن. باشترین شوێن ئەوەیە ئێوە خۆتان بە هێڵی چەهریق- شینا تار- خەرابەجاندار بگەیەن و دوا ئەرکیشتان ئەوەیە رێگەی دەربازبوونی ئەوان لە هێڵی پێشوو و هەتا رۆژی ١٢ی مانگ نەدەن. لە پێناو بەجێ گەیاندنی ئەم ئەرکەدا هەر گیان لەسەر دەستییەکی بکرێ شایەنی خۆیەتی.

ژمارە ٦، شاپوور، سەعات ٨.٣٠ رۆژی ٢٦/٣/١١ جێگری
فیرقەی ٤ و سەرکردەی کاروانگەلی باشوور عەمید بێگلەری

٢- بۆ عەمەرخان شەریفی - سەرۆک خێڵی شکاک:

کاک عەمەر خان شەریفی بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی لەمەڕ دەربازبوونی بارزانییەکان بەرەو باکور هەتانە و، ئەو ئەرکەش بە کاک نەجیب و رائید سولح جۆ سپاردراوە، ئەوپەڕی هەوڵی خۆتان بەکاربێنە و زۆر بە باشی رێگە لە تێپەڕینی ئەوان بەنێو خێڵی شکاکدا بگرە. بەپێی ئەو زانیارییەی لەناوچەکەوە پێمان گەیشتووە ژمارەی ئەوان لە ٣٠٠ کەس زیاتر نییە. ورەیان زۆر دابەزیوە و بڕێک برینداریشیان لەگەڵدایە. ئەگەر

ئێوەی بەڕێز و سوارەگەلی خۆتان دەسوەکەرییەکی تەواو بکەن ئەوا دەتوانن ڕێگەی دەربازبوونی ئەوان بۆ باکور ببڕن و، بەم ئاوایە زەبرێکی کارییان لێ بوەشێنن و خزمەتێکی سوپا بکەن.

شاپوور، سەعات ٨.٣٠ ڕۆژی ٢٦/٣/١١ ژمارە ٥، جێگری فیرقەی ٤ و سەرکردەی کاروانگەلی باشوور عەمید بێگلەری

٣- بۆ سەرکردەی فەوجی ٤ی سوارەی فەوزیە و مۆلگەی شاپوور:

بەگوێرەی ئەو ڕاپۆرتانەی سەبارەت بە زانیاری لە بارەی بارزانییەکان لە ناوچەی دێلزی و شەپیران-ەوە ناردووتانە و، هەروەها بەگوێرەی ئەو دوا زانیارییانەی لە سەرچاوەگەلی ترەوە گەیشتوون وا دەردەکەوێ ژمارەی بارزانییەکان لە ٣٠٠ کەس پتر نییە و وورەیان زۆر دابەزیوە و ژمارەیەکیش برینداریان پێیە و هێشتا لە هێڵی چەهریق شیناتار- خەرابەجاندار نەپەڕیونەتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، ڕائید سوڵح جۆ ڕاسپاردراوە کەوا تەبای سوارەگەلی خێڵی شکاک ببن بە لەمپەر لە پێش بڕینەوەیان لە هێڵی ناوبراودا.

هەروەها فەرمان بە عەمەرخانیش دراوە کەوا بە تێکڕای هێزی خۆیەوە ڕێگە لە دەربازبوونی ئەوان بە ناوچەی خێڵی شکاکدا بگرێ. ئێوە ڕاسپاردراون بۆ ئەوەی بەخۆ و بەکەتیبەیەکی پیادە و کەتیبەیەکی سوارەوە هێڵی لەشگەران- کولان- هەودەر- چارستوون- شوربلاغ هەتا سەعات ١٢ی ئەمڕۆ بگرن و زۆر بە توندی ڕێگە لە پەڕینەوەی بارزانییەکان لەم هێڵەدا ببەستن. هەروەها پێوەندیی خۆتان لەگەڵ ڕائید سوڵح جۆ بپارێزن و لە دەسپێشخەرییەکانی خێڵی شکاک ئاگەداربن. چۆنیەتیی بارودۆخی گشتیش - کە ئامانجی بنەڕەتی بڕیتییە لە ڕێگە لێ بڕینەوەی دەربازبوونی بارزانییەکان بەرەو باکور، چاوەدێری بکەن و ڕاپۆرتی ئەنجامی جێبەجێ کردنی فەرمانەکە لە سەعات ١٤ی ئەمڕۆدا بۆ (خوی) بنێرنەوە.

عەمید بێگلەری، ژمارە ٧، شاپوور، سەعات ٨.٣٠ی ڕۆژی ٢٦/٣/١١

**تێبینی:** بەر لە دەرچوونی فەرمانی سەرەوە، سەرکردەی فەوجی سوارە بەزارەکی لە چۆنیەتیی بارودۆخ ئاگەدار کرایەوە، ئەویش فەرمانی بەڕێ کەوتنی کەتیبە و سوارەگەلی دا و، یەکەگەلی ناوبراو لە شاپوورەوە کەوتنە ڕێ و دەمەو ئێوارەی ڕۆژی ٢٦/٣/١١

راپۆرتی جێبەجێ کردنی فەرمانەکە لەلایەن عەقید پەرتەوی - یەوە درایەوە کەوا رائید (والی)ی سەرکردەی کەتیبەی ٣ی فەوجی ئازەرپاد لەگەڵ کەتیبەیەکی سوارە و فەرمانی پێویست بەرێ خران و لە شوێنەکەدا بنەجێ بوون.

٤- راپۆرتی ئەنجامی کارەکە لەلایەن عەمید بێگلەرییەوە بە تێلیگراف ناردرایەوە بۆ فیرقە لە ورمێ.

**تێلیگراف بۆ ورمێ:** سەرکردایەتیی فیرقەی ٤ لەگەڵ رێزماندا، لە کۆی ئەو زانیارییانەی هەتا بەیانیی ئەمڕۆ بەدەست گەیشتوون، ئەوە دەردەکەوێ کەوا کۆمەڵەی سەرەکیی بارزانییەکان هەتا شەوی پێشوو لە شەپێران کۆچێ بووبوون و لە دێلزێ خەریکی کۆکردنەوەی نان و پێخۆربوون، سوارانی خێلانی رائید سوڵح جۆ لەگەڵ سەرگەلەدارانی ئەواندا لە ئاقچەگوڵ ڕووبەڕووی یەکترن. بە مەبەستی پێشبڕی لە تێپەڕینی بارزانییەکان بە ڕووکاری باکور فەرمانگەلی ژێرەوە دران:

١- فەرمان بە رائید سوڵح جۆ درا کەوا ڕووبەڕووبوونی بەردەوامی خۆی لەگەڵ ئەواندا بپارێزێ و بەر لە پەڕینەوەی ئەوان لە هێڵی چەهریق شیناتار- خەرابەجاندا (نەخشە١/ ٢٥٣٤٤٠) بگرێت.

٢- عەمەرخان شەریفی کەوا لەگەڵ سوارەگەلی خۆیدا پێشبڕی لە دەربازبوونی ئەوان بەناو خێڵی شکاکدا بکات.

٣- فەرمانی بە فەوجی ٤ی سوارەی فەوزیەی مۆڵگەی شاپوور درا کەوا بە کەتیبەیەکی پیادە و کەتیبەیەکی سوارەوە هێڵی لەشگەران- کولان- هودەر- چارستوون- شۆڕبلاخ هەتا سەعات ١٢ی ئەمڕۆ بگرێ و، ببێ بە پێشبڕ لە دەربازبوونی بارزانییەکان لەم هێڵەوە. هەروەها پێوەندیی بەردەوامی خۆی بە سوڵح جۆوە بپارێزێ و ئاگەداری دەست پێشخەرییەکانی خێڵی شکاک بێ و پەرەسەندنی گشتیی بارودۆخەکە - کە ئامانجی سەرەکی برێتییە لە رێ لێ بڕینەوەی بارزانییەکان لە پەلهاوێشتن بۆ باکور، لە بەرچاو بگرێ و، راپۆرتی ئەنجامی جێبەجێکارییەکە سەعات ١٤ی ئەمڕۆ بە(خوی) بگەیەنێتەوە.

نیشانە بەوەی پێشەوە و لەبەرئەوەی کەتیبەی پیادە و کەتیبەی سوارە بەرەو شوێنی پێ سپاردراویان وەرێ کەوتوون و منیش بەرەو (خوی) دەڕۆم تکایە ئەمر بفەرموون کاروانی عەقید سەردادوەر کە هێشتا نەمانتوانیوە پێوەندییان پێوە بکەین، بەرەو باکور بڕوات (ئەم کاروانە پێشتر لە شوون هەڵگرتنی بارزانییەکاندا بوو و لە کاتی ئەرک پێ سپاردندا

له كـاروانگەلی باشـوور ئەركی وەرگـرتبـوو) و بەهۆی بێـتـەلەوە پێـوەندی بە (خـوی)ەوە بكات.

سەعات ٨.٣٠ ڕۆژی ٢٦/٣/١١ عەمید بێگلەری، ژمارە ٩

جەنەرال عـەمـیـد بێگلەری پاش دەركردنی فـەرمانگەلی پێشـوو، لە سـەعـات ٩دا چوو بۆ خوی. لە خوی زانیـاریی پێ گەیشت كەوا كەتیبەی ٣ی فەوجی ٩ی ورمێ بەرەو شاپوور دێت و بە ڕێگەوەیە. بە هۆی تەلەفۆن فەرمـانی بە عەقـید(پەرتەوی)ی سەركردەی فـەوجی ٤ی سوارە و مـۆڵگەی شاپوور دا كەوا لە پێناو پاڵپشـتی لە ناوچەی هەودەر- كـوكـان- چوارسـتـوون- شـوربلاغ بەڕێ بكەوێ. پاشـان لە سـەعـات ١٣ی هەر ئەو ڕۆژە (ڕۆژی گەیشتن بە خوی١١/٣/٢٦) تەبای عـەقـید نیسـاری (سەركردەی كـاروانی دۆڵی قـتـوور) بۆ سـۆسـەكـردنی نـاوچەی دۆڵـی قـتـوور بە (جـیّب) چوو بۆ رەهالی(ئیـرانلی) لە ١٥ كـیلۆمـەتری دوور لە خـوی كـە ڕێگەی ئۆتۆمـۆبیلی هەبوو و پاش سۆسـەكـردن فـەرمـانی ژێرەوەی دەركرد:

**فەرمان بۆ عەقید نیساریی سەركردەی كاروانی دۆڵی قتوور:**

سەركردایەتیی كـاروانی دۆڵی قـتـوور(عەقـید نیسـاری) بۆ بەجێ هێنانی فـەرمـانەكـانی (٦٤٤/هـ)ی فـیرقەی ٤ی ورمێ، كەتیبەكـانی ئاهن و كرمـانشـانی بە هۆی لۆری نارد بۆ ئێـرانلی و هەروەكـو لە كـاتی ئامـادەبوونیـشـمـان لەم شوێنەدا فـەرمـانمان دا كـەوا شـوێنی دامـەزراندنی كـەتـیـبـەگـەل بە شـێـوەی خـوارەوە دەبێ كـە هەتا دەمـەو ئێـوارەی ڕۆژی ٢٦/٣/١٢ پێویستە لە شوێنەكانی خۆیاندا جێگیر بێن:

١- كەتیبەی فەوجی ٣٢ لە بانەكانی ئەستران، رائید زرێپۆش.

٢- كەتیبەی فەوجی ئاهن لە بانەكانی زرێ، مقەددەم نەفیسی.

٣- فەوجی ١٠ لە بانەكانی قتوور، رائید نەوابی(ئێستە لە گوندی قتوورە).

٤- كـەتیبەی فـەوجی بەهادر لە بانەكـانی رازی، عـەقـید فـولادوەند (ئێـسـتـە لە نێـزیـك هەمان ناوچەیە).

كەواتە سەرەڕای وەرگرتنی زانیاری لە بارەی شوێن و هێڵی بزاوتی بارزانییەكان بەهۆی ناردنی خەفـیەی كۆكردنەوەی زانیـارییەوە، پێویستە هێڵی خوی - قـتوور- رازی- سنوور

له ژێر دەستدا بێ و، ڕێگە لە دەربازبوونی بارزانییەکان بەرەو باکور بە باشی بگیرێ. وڵاخی بارەبەری کرێگرتە بۆ بارکردنی کەلوپەلی کەتیبەکانی ئاهن و کرماشان بۆ ئێرانلی بنێردرێ.

خوی ژمارە ١٤، ٢٦/٣/١٢ سەعات ٦ی بەیانی، عەمید بێگلەری

## ڕاپۆرتی بارودۆخ لە دەمەو ئێوارەی ڕۆژی ٢٦/٣/١١ بە شێوەی خوارەوە پێشکێشی سەرکردایەتیی فیرقە دەکەین:

زەعیم، سەرکردایەتیی فیرقەی ٤ کەتیبەی ئاهن هەر لەگەڵ ئەو لۆرییانەی کە لە تەورێزەوە هاتبوون بۆ ئێرانلی(١٥ کیلۆمەتری دوور لە خوی کە بەرەهال ناسراوە) ڕەوانە کرا.

هێشتا لۆریەکان نەگەڕاونەتەوە بۆ ئەوەی کەتیبەی ڕائید زرێپۆشیش بگوازنەوە، بەیانی سەعات ٤ی بەیان بەردان کەتیبەگەلێ کە لە ئێرانلی بۆ شوێنانی ئاماژە پێدراوی خوارەوە ڕەوانە دەکرێن کە شوێنی لێکۆڵینەوە لێ کراو و مەڵبەندی زۆر باشن بۆ تێدا مانەوە:

کەتیبەی ڕائید زرێپۆش لە بانەکانی ئەستران(مەبەست کەتیبەی فەوجی ٣٢)ە.
کەتیبەی ڕائید پەرهیزکار لە بانەکانی ڕەزی (مەبەست کەتیبەی ئاهن)ە
کەتیبەی ڕائید نەوابی لە بانەکانی قتوور(مەبەست کەتیبەی فەوجی ١٠)یە.
کەتیبەی عەقید فولادوەند لە بانەکانی ڕازی(مەبەست کەتیبەی فەوجی بەهادر)ە.

لەبەرئەوەی هەتا ئێستا بنەگە و کەلوپەل ئامادە نەکراون بۆ جێ نیشتەبوون لە شوێنی دیاریکراودا بۆیە هەتا دەمەو ئێوارەی ڕۆژی ١٢ دەخایەنێ. بەڵام چاوەدێری کردنی هێڵی خوی- قتوور هەتا گەیشتنی هۆکارگەلی ئاماژە پێدراو لەم ڕاگەیاندنەدا، لەلایەن کاروانی دۆڵی قتوور(عەقید نیساری)یەوە لە دەمەو ئێوارەی ئەمڕۆوە دەست پێ دەکات.

خوی- بەئامادەبوونی خۆی ٢٦/٣/١١ سەعات ١٨.٣٠

لە وەڵامی تلیگراف سەرەوەدا، فەرمانێکی نوێی ئۆپەراسیۆن بەشێوەی خوارەوە دەرچوو و گەیشتە دەست[١١].

(١١) ئەم وەڵامەمان لە نێو دەستهاوێژەکاندا بەدەست نەکەوت.

## ٥

## راپۆرتێک لەبارەی گۆڕانکارییە سوپاییەکان
## لە وچانی نێوان ٦ هەتا ١٧ی جۆزەردانی ١٣٢٦دا

### هەلومەرج و چۆنیەتیی گەڕانەوەی بارزانییەکان بۆ وڵاتی شاهەنشایی
### مێژووی٦/٣/٢٦ (لەسەر نەخشەی ٢٥٢٠٠٠ / ١)

سەعات ٧ی ڕۆژی ٦/٣/٢٦ زانیاری گەیشتە ئەرکانی فیرقە لە ورمێ کەوا سەعات ٢ی هەر ئەو ڕۆژە بڕێک لە بارزانییەکان هاتوونەتە جرمی و ٢٠ سەر مەڕیان بردووە. لە سەرکردەی هێزی عێراقیشەوە زانیاری هات کەوا بارزانییەکان هەڵاتوون بۆ تورکیا و، وێ دەچێ بەرەو زەویی ئێران بێن. سەعات ١٣ کوڕانی نورری بەگ گەیشتنی بارزانییەکانیان بە خوشکیی شەش کیلۆمەتری باشووری ورمێ دووپات کرد و، سەعات ١٤زانیاری گەیشت کەوا بارزانییەکان بەرەو رووکاری خوشکی لە پێشوەچووندان. لە تێکڕای ئەو ڕووداوانەوە دەرکەوت بارزانییەکان لە سنووری تورکیا و لە ڕێگەی بەردەسوورچای -ەوە هاتوونەتە ناو ئاخی ئێران و ژمارەیان لە دەوروبەری چوارسەت کەسدایە. دەمودەس نەقیب عەدل زەرابی لەگەڵ ڕەشید بەگدا هاتن بۆ ئەرکان و فەرمانیان وەرگرت کەوا لەگەڵ سەت کەسی تفەنگداردا بۆ مەوانا بچن. ناوبراوان سەعات ٨ی ئەو ڕۆژە لە ورمێوە کەوتنە ڕێ و سەعات ٢٢ لەرنێ و سەعات ٥،٣٠ی بەیانی بستووی گردە پلیچ -یان گرت و هەر لەو دەمانەدا کاروانێکی پێکهاتوو لە دوو کەتیبەی پیادە (کەتیبەی ئەسفەهان و کەتیبەی ٢ی ئازەرپاد)، چوار زرێدار، سریەیەکی تۆپ، دەزگەیەکی بێتەل بەسەرکردایەتیی عەقید سەردادوەر دروست کرا و راسپاردرا کەوا سەعات ٤ی ڕۆژی ٧/٣ بۆ وەڕێ کەوتن ساز بێ.

لە سەعات ١٤ی ڕۆژی ٦/٣/٢٦ فڕینێکی سەرانسۆیی بەسەر بەرزاییەکانی سنوور و دێیەکانی پێشوودا هاتە جێبەجێ کرن بەڵام سەبارەت بەهەبوونی هەور و هێڵەوە ئەنجامی سەرانسۆیەکە پووچ بوو.

کاروانی ناوبراو سەعات ٤ی بەیانیەی ٧/٣/٢٦ بەخۆ و بە ١٨ کامیۆنەوە بەرەو

رووگەی لەرنێ کەوتە ڕێ و هەتا سەعات ١٧و نیو لە لەرنێ خۆی گرتەوە و بەیانیەی ڕۆژی ٨ سەعات ٥ بەرەو لای مەوانا کەوتە بزووت و لەوێندەر جێی گرت. ئەرکی پێ سپاردراوی ئەم کاروانە ئەوەبوو بەپەلە بگات بە بەزسینا و یەخەگیری بارزانییەکان ببێ و ڕێگەی تێ هەڵکشانی بەرەو باکوریان لێ بگرێ.

سەعات ١٢ی ڕۆژی٢٦/٣/٧ نووری بەگ هاتە پۆستەخانە و نامەیەک کە مەلا مستەفا بۆ ئەوی نووسیبوو و گوتبووی کەوا لە نێوان ئەو و دەوڵەتدا ناوبژی بکات و، هەروەها نامەیەک لە مەلا مستەفاوە هەر بەم ئامانجە گەیشت بە ئەرکانی فیرقە، وەڵامی ناوبراو درایەوە کەوا بەبێ ئەملاو ئەولا بەرەو ورمێ بجووڵێ و خۆی بەدەستەوە بدات. بەڵام لەبەرئەوەی نامەکان ئەوەیان تێ خوێنرایەوە کە نیازی ناوبراو دەسخەڵەتدان و سوود لە هەل وەرگرییە بۆیە سەرلەنوێ بۆ کاروانی ناردراو دووپات کرایەوە کەوا لە ڕۆیشتن بەرەو مەوانا و لە پێناو ڕووبەڕووبوونەوەی بارزانییەکاندا پەلە بکات بۆ ئەوەی لە ئەنجامی بەکارهێنانی پاڵەپەستۆوە بتوانن زووتر بە ئەنجامێک بگەن.

دوا فڕینی سەراسۆیی لە ڕۆژی ٢٦/٣/٦ کە لە دەوراوپشتی تەلۆ و ئەنبێ کرابوو باسی ئەوەی دەکرد کەوا کەسانێکی گومان لێکراو لە شوێنە ناو هاتووەکاندا بینراون کە هەر بە بینینی باڵەفڕ خۆیان شاردووەتەوە و نێزیکەی ١٥ کەسیش لەسەر بەرزاییەکدا لە نێو حەشارگەیەکدا بینراون بەڵام مۆڵبوونێکی خراپەکاران نەبینراوە. هەرچەندیشە کە فڕینی باڵەفڕ لە بەرزاییەکی کەمدا بووە بەڵام ئەوان تەقەیان لە باڵەفڕ نەکردووە.

دوا زانیاری لە سەعات ٢١ لە کاروانی ناوبراوە هات گوتبووی کەوا مەلا مستەفا سەعات ٢٠ی ڕۆژی ٧ ئەنبێ بەجێ شتووە و چووە بۆ خانەکی (خانەقا) و هەندێک لە پیاوانی خۆی بۆ نازلووچای ڕەوانە کردووە، بەم ئاوایە بۆ فیرقە روون بووەوە کە نیازی بارزانییەکان ڕۆیشتنە بەرەو لای باکور و دەست تێکەڵکەرییە لەگەڵ خێڵانی جۆراوجۆری باکور و ڕۆژئاوای ورمێ.

بەیانیەی ڕۆژی ٢٦/٣/٨ کە کاروانی ناردراو بە ناوی کاروانی تەگەوەڕ لە مەوانا کۆبووبووەوە، ڕایگەیاند کەوا مەلا مستەفا نامەیەکی بۆ کاروان نووسیوە و گوتوویەتی من بۆ خۆ بەدەستەوەدان هاتووم بەڵام یەکێک لە ئەفسەران و یەکێکی تر لەسەرۆک خێڵان بۆ ناوبژی دابنرێ، بەڕاستی ڕوون بووەوە نیازی مەلا مستەفا کات بەسەربردن و خۆ بەدواخستنە و دەیەوێ بەرەو باکور بڕوات بە جۆرێ هەتا سەعات ١٢ی ڕۆژی ٨ هەموو

بارزانییەکان لە نازلووچایەوە بەرەو باکور تێ پەڕین. بەپێی ئەو زانیارییەی لە سەعات ۹،۳۰ی ڕۆژی پێشوو هات بارزانییەکان گەیشتوونەتە سیرۆ و سەرویک، ئەم زانیارییە لەلایەن کاروانی تەگەوەڕەوە گەیشت و لەلایەن ڕائید سوڵح جۆی سەرپەرشتیاری سوارەگەلی شکاکەوە پشتیوانی کرا و، ناوبرا گوتیشی کەوا بارزانییەکان دەیانەوێ لە سەرویک-ەوە بۆ هوسێن بڕۆن. ئەو زانیارییانەی پێشەوە بە کاروانگەلی مۆڵبوو لە ماکۆ، قەرەزیائەوین، خوی، قتوور، سییەچێشمە، شاپوور و عەقید فولادوەند دران و فەرمانیان پێ درا وریا بن.

ڕۆژی ۹ مانگ، کەتیبەی ۲ی فەوجی بەهادر و دەستەیەک تۆپخانەی ۷۵ سەعات ۸ لە (خوی)ەوە بەرەو دۆڵی قتوور کەوتنە ڕێ و ئەرکیان پێ سپاردرا بۆ ئەوەی لەگەڵ کەتیبەی ۳ی فەوجی ۱۰ی مۆڵبوو لە قتوور، بۆ بەستنی ڕێبازگەکانی دۆڵی قتوور دەسوەکاربن. هەروەها یەکەگەلی پشتەوانیی تریش یەک لە دوای یەکتر دەچنە پاڵیان. کەتیبەی ۲ی فەوجی ۳۲ لە شنۆوە بانگهێشتن کرا و سەعات ۱۲ی ڕۆژی ۲٦/۳/۹ گەیشتە ورمێ و سەعات ۱٦ی هەر ئەو ڕۆژە بەرەو شاپوور کەوتە ڕێ. بارزانییەکان ڕۆژی ۹ی مانگ بانەکانی گەلی شێخان و کەرتش و گوندی سیرۆیان گرت و ژمارەیەکیشیان بەرەو گوندی سینا چوون. هەروەها لەو ڕۆژەدا ژمارەیەک لە تفەنگداران بەسەرپەرشتیی ئەسعەد بانەکانی گەلی جیهانیان- کە بۆ پاراستنی پاشەبەری ئەوان گرینگ بوو- داگیرکرد. لە ماوەی ڕووداوگەلی ئەو سێ ڕۆژەدا فڕینی سەراسۆییی یەک لەدوای یەکتر بەیانی و ئێوارە بەسەر ئەو ناوچەیەدا کران بەڵام سەبارەت بە درێژیی هەواوە چ ئەنجامێک لەو سەراسۆیە بەدی نەهات. لە هەوای خۆشیشدا لەبەرئەوەی بارزانییەکان زۆربەی بەڕێوەڕۆیشتنی خۆیان بەشەو جێبەجێ دەکەن و، لەبارەی خۆوەشێریدا وردن و هەتا بلێیی لێوەشاوەن بۆیە باڵەفڕی سەراسۆکەر زۆرجاران ناتوانن شوێنی ئەوان بە چاکی بدۆزنەوە. لە کۆمەڵەی ئەو زانیارییانەی هەتا سەعات ۲۲ی ڕۆژی ۲٦/۳/۹ بەدەست هاتوون ڕوون و دیارە کە نیازی بارزانییەکان ڕۆیشتنە بۆ سنووری باکور و چوونە ناو کێوەکانی ماکۆیە، ئەو نامانەش کە دەیاننێرن بە مەبەستی خافڵاندن و کات بەسەربردنە.

بارزانییەکان ڕۆژی ۹ی مانگ لە سیرۆ و بەردۆک بەڕێ کەوتن و بەردۆکی خواروویان داگیرکرد و بەرەو بەردۆکی سەروو ڕۆیشتن. دوو سەعات لە بانەکانی ڕۆژئاوا و باکوری گوندی ئاقچەگوڵ پێکدادان لە نێوان بارزانییەکان و شکاکەکان بەسەرپەرشتیی ڕائید

سوڵح جۆ کە لە بانەکانی باکوری ئاقچەگول بنەجێ بووبوون، رووی دا. سەراسۆکردنی هەوایی سەعات ٩،٣٠ هەتا ١٢ی ڕۆژی ١٠ی مانگ باسی لە چالاکیی سوارەگەلی خێلان لە بانەکانی باکور و باکوری ڕۆژئاوای گونبەت دەکرد بەڵام شوێنەوارێکی بارزانییەکانی چاو پێ نەکەوتووە.

سەرکردایەتیی هێز لە سەعات ١٨ی ڕۆژی ٩ی مانگ پاش لێکۆڵینەوە لە بارودۆخ، بڕیارێکی بە شێوەی خوارەوەی دا و بۆ ئەوەی پاش خستنە بەردەمی پیرۆزی پاشایەتی دەست بەجێبەجێ کردنی بکرێ. ئێستە پلانی بیر لێ کراوە و پەسندکراوی فیرقە کە لە سەعات ٢٤ی ڕۆژی ٢٦/٣/٩ بەتەواوی یەکەگەلی هێز ڕاگەیەنراوە و جێبەجێ کراوە:

١- گرتنی ڕێگەی بارزانییەکان لە دۆڵی خوی- قتوور- سنوور بە هۆی کاروانێکی پێکهاتوو لە چوار کەتیبەی پیادە: کەتیبەگەلی ٣ فەوجی ١٠، کەتیبەی٢ی بەهادر، کەتیبەی ٢ فەوجی ٣٢، کەتیبەی ٣ی ئاهن، تۆپێکی ٧٥ی چیایی، چوار زرێداری شەڕکەر، بێتەلێک.

٢- بەدواکەوتنی بارزانییەکان بە هۆی کاروانی تەرگەوەڕی پێکهاتوو لە کەتیبەگەلی ئەسفەهان و ٢ی ئازەرباد، دەستەیەک تۆپخانەی ٧٥ی چیایی، دوو زێرێداری شەڕکەر، دەزگایەکی بێتەل لە ژێر فەرمانی عەقید سەردادوەر. ئەم دوو کاروانە لە ژێر فەرمانی عەمید بێلگەریی جێگری فیرقە دادەنرێن، عەقید قزل ئایاغ و کەسانی پێویست بۆ لە ئەستۆ گرتنی ئەرکانی کاروانگەلی ناوبراو دیار و دەسنیشان کران.

فەوجی سوارەی فەوزیە (یەک کەتیبەی سوارەی کەمە)، بەهۆی کەتیبەیەکی تۆپی چیایی بەهێز دەکرێ و لە شاپوور بنەجێ دەبێ و دەزگایەکی بێتەلی پێ دەدرێ. هێزی سپێری جێگۆڕکەر لە شاپوور پێکەوە دەنرێ و ئەو ئەرکەشی پێ دەدرێ کە جگە لە سەراسۆکردنی گشتیی ناوچەی شاپوور و شکاک، هەروەها لە کاتی پێویستدا بۆ ئۆپەراسیۆن کۆک و تەیار دەبێ.

٣- کاروانی ماکۆ پێک هاتووە لە کەتیبەگەلی ١ فەوجی ١٢ کرماشان، کەتیبەی ٢ فەوجی ٢٧، دەستەی هاوەنی ئەسفەهان، تۆپی ٧٥ی کرماشان، دەزگایەکی بێتەل، لە بن سەرکردایەتیی عەقید مزەفەریدا ئەرکی پێ دەدرێ بۆ ئەوەی ڕێبازگەکانی پولدەشت و سنووری بازرگان کە پێشتر سەراسۆی کردووە لە بن چاودێریدا بگرێ.

٤- لە سییەچێشمە، کەتیبەیەک لە فەوجی بەهادر و دەزگایەکی بێتەل، لە

قەرەزیائەدین کەتیبەی ٢ی فەوجی ١٢، فەوجی سوارەی کوردستان (کەتیبەیەکی سوارەی کەمە) وەک سپێری جێگۆڕکەر لە مۆڵ بووندایە. تەواوی کاروانگەلی ٣ و ٤ لە ژێر سەرکردایەتیی عەمید زەنگەنەی سەرکردەی لیوای ورمێدا دەبن و، رائید روکن بەهارەوەند تەبای کەسانی پێویست بۆ لە ئەستۆ گرتنی ئەرکانی کاروانگەل دامەزراون.

کەتیبەی رائید زرێپۆش سەعات ١٢ی رۆژی ٢٦/٣/١٠ بە کامیۆن چوو بۆ خوی و، ٤ زرێداری شەڕکەر بۆ قتوور ڕەوان کران. تەواوی یەکە و سەرکردەگەلی کاروان فەرمانیان دراوەتێ کەوا پلانی باسکراو لە سەعات ١٢ی رۆژی ٢٦/٣/١١دا جێبەجێ بکەن[١٢]. عەمید بێگلەری و عەقید نیساری رۆژی ٢٦/٣/١٠ بەرەو ئەرکی پێ سپاردراوی خۆیان وەڕێ کەوتن و عەقید زەنگەنە بەیانییەی ١١ی مانگ ورمێی بەجێ هێشت.

فەرمانگەلی تەواوکەری تر لە بارەی جێگیربوون لە هێڵی قتوور بریتی بوو لەوەی کەوا کەتیبەی رائید زرێپۆش خرایە پاڵ سێ کەتیبەکەی پێشوو. بارزانییەکان لە سەعات ٣ی رۆژی٢٦/٣/١٢ هەتا سەعات ١٤ی هەر ئەو رۆژە لە هەبلوران هەڵوێستان و پاشان لە قوڵی ئاشنگ و بریشخۆرانەوە کەوتنە ڕێگە. لەگەڵ گزنگی رۆژی ١٣ گەیشتنە راویان و لەوێندەر چەند کەسێکی سەر بە پیاوانی خێڵان کە لەلایەنی کاروانگەلەوە بۆ پەیاکردنی زانیاری ناردرابوون، گرتیانن و برێک وڵاخی بەرزە و پێخۆریان لە نێو ئاواییەکانی پێشوو کۆوە کردووە و لە نێوان حەبەشی ژێری و مەخین-ەوە رۆیشتوون و بەرەو کەلیتی ژۆری سەریان هەڵگرتووە. رۆژی ٢٦/٣/١٥ بارزانییەکان گەیشتوون بە سەگ مەن ئاوا و لەو رۆژەدا لەبەرئەوەی هێزگەلی بڵاوەبووی سەر هێڵی قتوور هەرکاتێ بۆ شوون هەڵگرتنی بارزانییەکان دەکەوتە ڕێ، بەدەستی بەتاڵ دەگەڕایەوە بۆیە کەتیبەی ٢ و ٣ ئازەرپاد و کەتیبەی کەمکردنەوەی خزمەتی فەوجی ٩ کە رۆژی ٩ی مانگ بۆ خوی ناردرابوو، بە لۆری بۆ شووت بارکران بۆ ئەوەی لەوێ ڕێ لە بارزانییەکان بگرن و ڕووبەڕوویان بووەستن.

رۆژی ١٥ی جۆزەردان، زەعیم سەرکردایەتیی هێز و فیرقە ٤ لە ورمێوە کەوتنە بزاوت و هەر ئەو رۆژە بەماکۆ گەیشتن و عەقید روکن غەفاری لە شنۆوە بانگهێشتن کرا، ناوبراو سەعات ١٨ی رۆژی ٢٦/٣/١٦ گەیشتە ورمێ و بێ وچان بەرەو ماکۆ ملی ڕێگەی

(١٢) لە پەراوێزدا نووسراوە «بەداخەوە مەلا مستەفا چاوەڕوان نەبوو».

گرت و هەر ئەو ڕۆژەش بە پلەی ئەرکانی ئۆپەراسیۆن لە ماکۆ دامەزرا.

ڕۆژی ١٦ی مانگ کاروانی قەرەزیائەدین بەرەو چیای سگار و، کەتیبەیەکی سوارە و سریەیەکی رشێنەک (رشاش) لە فەوجی سوارەی کوردستان بەرەو چیای فەرهادخانی کەوتنە ڕێگە و، فەرمان بە کاروانی سییەچێشمە درا کەوا هێزی پێشکۆی خۆی بۆ ڕووبەڕووبوون بەرەوپێش بنێرێ. یەکەگەلی هێڵی قتوور و کەتیبەی رائید زریپۆش بە لۆری بەرەو ماکۆ ڕۆیشتن و کەتیبەی ٢٧ی بەهادور و کەتیبەی ٣ی ئاهەن لە ژێر سەرکردایەتیی عەقید فولادوەندا کەرتی بەدواکەوتنیان پێ سپاردرا. کەتیبەگەلی ئەسفەهان، کەتیبەی٢ی کرماشان، کەتیبەی ٢ی فەوجی ٢٧ بۆ شاری باشکەند و کشمیش تەپە، مووسا ئاقبلاغ، خندۆر و قزلداغ ناردران و شوێنگەلی پێشوویان گرت و هێزی پێشەوەی خۆیان بۆ ڕووبەڕووبوون بەرەوپێش هەنارد.

هەر ئەوێ ڕۆژێ، عەمید زەنگەنە دیمانەی سەرکردەی لیوای بایەزیدی لە بازرگان کرد و بابەتی بارزانییەکانی لە ڕووی زانیارییەوە بۆ شرۆڤە کردن. بارزانییەکان کە بە ڕۆژەوە خۆیان لە زینوێکان حەشار دەدا و بە شەو بەسەر گازی چیایەکانەوە ڕێگەیان دەبڕی، بەرەو بلەسووری مەزن و بچووک و سیرپاگوڵ و لەوێشەوە بەرەو یەکماڵەی سێ کیلۆمەتری بناری باشووری شێخ مەملو لە دەڤەری سییەچێشمە هاتوونەتە پێش.

عەقید زالتاش تەبای ١٥٠ پارچە چەک و برێ گولله و چەند (عەریف)ێک بۆ چەکدارکردنی خێڵی میلان وەڕێ کەوتوون.

ڕۆژی ١٧ی مانگ بارزانییەکان بەشەو هاتنە شوێنێک لە نێزێکی قەرە دەرە و، لەبەرئەوەی شیمانەی ئەوە لە گۆڕێدابوو کە بەرەو رووکاری کورەلەر بڕۆن و دەبوو بە ناچاری لە هێڵی بازرگان- ماکۆ - خندۆر- قزڵداغ بپەڕنەوە، کاروانگەل بەم ئاوایەی خوارەوە لە هێڵی ناوبراو جێگیر بوون: بەپێی ئەو بڕیارەی هەر لە گۆڕەپان وەرگیرا، عەقید نیساری تەبای دوو کەتیبەی پیادە، کەتیبەیەکی تۆپی ٧٥ی، کەتیبەیەک سوارە، سریەیەک رشێنەک لە کلیتی ژۆری لە حاڵەتی شوێن کەوتندا بن، عەقید لەشکری تەبای کەتیبەیەک و کەتیبەیەکی سوارە و دوو زرێدار لە زینوێکانی سگاردا، کەتیبەیەک پیادە و سریەیەک تۆپی ٧٥ی، دوو زرێدار لە سییەچێشمە، کەتیبەیەکی پیادە، دوو زرێداری شەڕکەر و سریەیەک تۆپی ٧٥ی لە هێڵی ساری ئۆجاق و کشمیش تەپە، کەتیبەیەک لە بانەکانی سنگەر، کەتیبەیەک و سریەیەک تۆپی ٧٥یی چیایی لە خندۆر، دووکەتیبەی

پیـاده و تۆپێکی ٧٥ی و کـەتیـبـەیەک سـواره و سێ زرێداری شـەڕکـەر لەگـەڵ عـەقـیـد سەردادوەر لە شووت.

بەم بڕیارەوە، چارەدۆزیی سەرکردایەتی لە سایەی ئەو ڕێکخستنەدا ئەوەبوو ئەگەر پێش دەربازبـوون لە هێـڵـی ناوبراوی سـەرەوە، پێکدادان رووی دا، ئـەوا تەفـروتونایان بـکـەن و ئەگەر نا لە ناوچەی کورەلەر لە گەمارۆیان بکێشن.

سەبارەت بەدووریی ناوچەی ئۆپەراسیۆن لە ورمێوە، ئەرکانی ئۆپەراسیۆن کە لە مێژووی ١٦ی مانگەوە لە ماکۆ پێک هاتووە، فەرمان و بڕیارەکانی خۆی راستەوخۆ بەیەکەگەلی هێـز دەگـەینێ و چۆنیـەتیی ئۆپەراسـیـۆنیش راسـتـەوخـۆ بە راپۆرت دەداتەوە بە ئەرکـانی سوپا.

سەرۆکی ئەرکانی فیرقەی ٤ی ئازەربایجان، عەقید روکن فەیووزی

٦

**ئەرکانی ئۆپەراسیۆنی ماکۆ، روکنی ٣، بنکەی ئۆپەراسیۆنی ماکۆ، ژمارەی تۆماری ٣٠٣ی گەڕۆک، سەعات... ٢٧/٣/٢٣**

**فەرمانی گشتیی ئۆپەراسیۆنی ژمارە ٢ (نەخشە ٢٥٣٠٠٠)**

**مادە ١: بارودۆخی گشتی**

خـراپەکـارانی بارزانـی پاش پێکدادانی ڕۆژی ١٩و شـەوی ٢٦/٣/٢٠ دوای پێکەوتنی زیانی گـیـانەکی، توانـیـیـان لە ناوچەی نێـوان قزلداغ و شووتەوە بەرەو باکـور دەرباز بن. پاش تێ پەڕینیـان، لەلایەن خەڵکی قـەرەتەپەوە بەرەنگارییـەک هاتەکایە و خـراپەکـاران خـۆیان لە چوونە ناو گـوندی ناوبراو دایە لا و ڕۆیشتن بۆ هاسنی مـەزن. لە ڕۆژانی ٢٠-٢١-٢٢دا فـڕینی باڵـەفڕ لەسـەر گـوندی هاسن جێبـەجێ کـرا و خـراپەکـاران کـەوتـنە بەر هێـرشی بۆمبـای گران و سـووک و رشێنـەک و تەنگەتاو کـران. دوا سەراسۆ کە سـەعـات ١٧ی دوێنێ هاتووەتە کـایە دەڵێ خـراپەکـاران هاسنی مـەزنیـان چۆڵ کـردووە و بەریان کردووەتە بانـووەکانی باکوری ڕۆژئاوای نـاوچەی تاتان. ئەم دیتنە هەواییـیە ئەمڕۆ سـەعـات ٦،٣٠ بە راپۆرتی زەوینی پشتیوانی کرا.

هەوڵی مەلامستەفا بۆ بەکێش کردنی خێڵانی جەلالی بۆ خۆی، هەتا ئێستە نەگەییوە بە شوێنێک. هەندێ لە سەرۆک خێڵانی جەلالی دوێنێ هاتن بۆ ماکۆ و ملکەچیی خۆیان پیشان دا، تکای ئەوەیان کرد لەگەڵ سوپادا هاوکاری بکەن، فەرمانیان پێ درا دەسبەجێ پەز و ماڵی خۆیان لە ناوچە کێوەڵانییەکان دەربکەن و خۆشیان بۆ خزمەتکاری بێنەوە ماکۆ.

**مادە ٢: ئەرکی فیرقە**

فیرقە ئەرکی پێ دراوە کەوا بە دابڕینی خراپەکاران لە سنوورەکانی ئاراس و پێشبڕێ لە یەکبوونیان لەگەڵ جەلالییەکاندا، لە ناوچەیەکی کێوەڵان لە گەمارۆیان بکێشێ و بە لێدانی کاریگەر تەفر و تونایان بکات.

**مادە ٣: نەخشەی کار**

بڕینی هەر جۆرە پێوەندی و یەکگرتنەوەیەکی خراپەکاران لەگەڵ سنوورەکانی ئارسدا بۆ ئەوەی نەهێڵن لە سنوور ئاوا بن. پاڵنانی ئەوان بەرەو ڕۆژئاوا و پاش ئەوەی مۆڵ دەبن، سەرکوتینەوە و لە نێوبردنیان لە ڕێگەی گرتنی ناوچەی ماکۆ و سییەچێشمە و زۆرئاوا لە تەوەری هەلەج- دۆشان تەپەسی، شۆربلاغ- ئاق گول.

**مادە ٤: ڕازاندنەوە**

دوو کاروان هەر یەکە لە ٤ کەتیبەی پیادە و هێزی پشتەوانی پێک دێ و بەپێی فەرمانی پێشووی ژمارە ٢ دادەمەزرێن، یەکەمیان لە تەوەرەی هەلەج- دووشان تەپەسی- شۆربلاغ - ئاق گوڵ لە ژێر سەرکردایەتیی عەمید بێگلەری و دووەمیان لە تەوەری قەرەتەپە- هاسەنی مەزن لە ژێر سەرکردایەتیی عەمید زەنگەنەدا دەسوەکار دەبن.

هێزی دەستەبەری ماکۆ لە ٣ کەتیبەی پیادە و دوو زرێداری شەڕکەر لە ژێر سەرکردایەتیی عەقید مزەفەریدا دێ و دە کتیبەی بەهادور لە ژێر سەرکردایەتیی رائید یاسایی، تەبای دوو زرێدار لە سییەچێشمە و زۆرئاوادا دەبێ.

**مادە ٥: ئەرکی کاروانگەل**

کاروانی ڕۆژهەڵات ئەرکی ئەوەی هەیە بە پێشەوەچوونی گورج گۆڵانەی خۆی لە تەوەرەی هەلەج- دۆشان تەپەسی- شۆربلاغ- ئاق گول، هەرچی پێوەندی و پەلهاوێشتنێکی خراپەکاران بە سنووری ئاراسەوە هەیە ببرێتەوە و بەرەو رووکاری ڕۆژئاوایان پاڵ بنێ،

بکەوێتە شوێنیان و بە لێدانی یەکجارە لەناویان ببات و بیان پووکێنێتەوە.

کـــاروانی ڕۆژهەڵات ئەرکی ئەوەی هەیە لە تەوەرەی قـــەرەتەپە- هاســـەنی مـــەزنەوە بەرەوپێش مل بنێ و پاش گـرتنی هاسەنی مەزن و ژمـارە ٦٨٢٥ بانی ناوبراو بەباشی کۆنترۆڵ بکات و چاوەڕوانی فەرمانی داهاتوو بێت.

هێـزی دەسـتـەبەرکـەری مـاکـۆ پێـویسـتـە بە پلە یەک ناوچەی باڵـەفـڕگە و لە پلە دوودا ڕێبـازگەکـانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای دەربەندی مـاکۆ و بانەکـانی باکـوری شار دەسـتـەبەر بکات و هەرچی پەلهاوێشتنێکی خراپەکاران بۆ ئەو ناوچەیە هەیە نەیهێڵێ.

مۆڵگەی سـیـیـەچێـشـمـەش لە ناوچەی سییەچێشمەدا ئەرکی دەستەبەرکردنی هەیە و، دەبێ پاشەبەرە لە پەلاماری گرووپی جیاواز و بچووک بپارێزێ.

ماده ٦: **ئەرکی پۆلی هەوایی**

١- فـڕین بە پێی داوخوازی سەرکـردەکانی کـاروان جـێبەجێ دەکرێ، ئەم داوخوازانەش پێویستە لە ڕێگەی بێتەلەوە بە راپۆرت بدرێ بە ئەرکانی هێز.

٢- سـەراسـۆکـردنی بارودۆخی دوژمن، بەتـایبـەتـیش چاوەدێری کـردنی پەڕینەوە لە ڕێبازگەکانی دەربازبوون لە سنووری ئاراس.

ماده ٧:

دەسـتـەبەرکـردنی هێـڵـی بەیەکەوە بەسـتنی مـاکـۆ- خوی، مـاکـۆ - پولدەشت لە ئەستۆی کەتیبەی جەندەرمەی ماکۆ و هێزی جەندەرمەی پشتیوانی کە لە ورمێوە رەوانە کراوە - دا، دەبێت.

ماده ٨: **سپێر**

سـپـێـری خـۆجـێـیـەتـیی هەر کـاروانێـک برێتـی دەبێ لە کـەتـیـبـەیەکی پـیـادە کـە لەلایەن سەرکـردەکانی کاروانەوە دیاری دەکرێت. کەتیبـەیەکیش لە مۆڵگەی ماکۆ وەک سـپـێری گشتیی هێز لەبەردەستدا دەبێت.

ماده ٩: جێبەجێکاری

بزووتنەوەی کـــاروانگەل لە ســـەرگـــە (مـــبـــدأ)ی مـــاکـــۆوە لە ســـەعـــات ٦ی ڕۆژی ٢٦/٣/٢٦دا دەبێت و دەستەبەرکردنی دوور و نێزیک لە ئەستۆی سەرکردەکان خۆیاندا دەبێت.

ماده ١٠: **پێوەندی**

هەر یەکێ لە کاروانگەل وێڕای کەلوپەلی سوپایی، دوو دەزگای بێتەلی لەبەردەستدا دەبێت و، پێوەندیی هێز بەهۆی بێتەل و تەتەری سوارەوە دەبێت.

**مەڵبەندەکانی سەرکردایەتی**

مەڵبەندی سەرکردایەتیی هێز لە ماکۆ

سەرکردەی کاروانی ڕۆژهەڵات هەتا بەیانیەی ڕۆژی **٢٦/٣/٢٥** لە ئوزون دیزەدا دەبێت و لە پاشان لە شوێنی گۆڕانی خۆی ئاگەدار دەکرێتەوە. سەرکردەی کاروانی ڕۆژئاوا هەتا بەیانیەی ڕۆژ **٢٦/٣/٢٥** لە قەرەتەپە و پاشانیش لە هاسوونی گەورەدا دەبێت.

سەرۆکی ئەرکانی هێز، عەقید ڕوکن غەفاری
سەرکردەی هێز، لیوا هومایوونی

## ٧

## ئەرکانی هێزی کوردستان، روکن٢، بنکەی سەرکردایەتیی ماکۆ، ژمارە ٤٠٩، سەعات ٩ی بەیانیی ٢٦/٣/٢٤

## ڕاگەیاندنی ژمارە ٦

یەکەم: لە دوو ڕۆژی لەمەوبەرەوە زانیاریگەلێ لە چاوگەی جۆراوجۆرەوە بە ئەرکانی هێز دەگات کە هێزێکی دووسەت کەسی لە بارزانییەکان سەرلەنوو لەبەری باشوورەوە بەرەو باکور ملی ڕێگەیان گرتووە و لە نێزیکی ئەلەند و قەرەدەرەدا بوونە و تەنانەت ناوی زێڕۆ بەهادوور - یش[١٣] لە سەرەتای ئەوانەوە گوترابوو، لە سای ئەو لێکۆڵینەوەکارییانەی کراون و مۆڵگەی سییەچێشمەش ڕاپۆرتی داوە کەوا ئەم باس و خواسە بە هیچ کلۆجێ ڕاست نییە. زێڕو بەهادووری ها لە بەغدا لە گرتیگەهدا و هێزی بارزانییەکانیش هەر ئەو هێزەیە کە لە ڕۆژی ١٩ی مانگدا بەرەو باکور ڕۆیشتوون و ئەم دمگۆیەش لە لایەنی ئەوان

(١٣) زێڕۆ بەهادوری لەوڕۆژانە تەبای ئێمە لە گرتووخانەی ئەبوغرێبی بیست کیلۆمەتری دوور لە بەغدا بوو و پاشانیش هەر تەبای ئێمە گوزارایەوە گرتوخانەی سامەڕا. پاش دووساڵ گیراوی، بە هەوڵی فەتاح ئاغای هەرکی- نوێنەری ئەنجومەنی عێراق و بەدەستەبەریی ئەو بەربوو. نووسەر.

خۆیانەوە بۆ چەواشەکردنی بیری هێز و بۆچوونی خەڵک بڵاوەی پێ دەکرێ و بە هیچ بارت هێزێکی لەم ئاوایە لە گۆڕێدا نییە.

دووەم: بارزانییەکان بەهۆی بۆمبابارانی ڕۆژی ٢٠ و ٢١ی مانگ لە هاسوونی مەزن ١٨ کوژراویان داوە کە هەر لەوێ لە ژێر ئاخیان وەشاردوون و ژمارەیەکی زۆریشیان لێ بریندار بوونە. مەلامستەفا زۆر تێکۆشاوە لەپێناو بۆخۆ بەکێش کردنی جەلالییەکان و، دیمانەی لەگەڵ برێکیشیاندا کردووە بەڵام هەموویان وەڵامی هیوابڕیان پێ داوەتەوە و لەم ڕووەوە هیوای نییە و، تەبای هەموو هێزگەلی خۆی چووەتە ئاق گولی نێزیکی ئاراس و خێڵی جەلالیش سەرلەبەر چوونەتە زۆزان و، نوای کاروانی ئەوان گەییوەتە کشمیش تەپە و چەکی خۆیان هێناوە کە بەدەستەوەی بدەن، عەمەرئاغا خۆیشی لە پاشکۆوە خەریکی بزواندنی پاشماوەکەیانە و ئەمڕۆ دەگاتە کشمیش تەپە. سەراسۆکەری ئاسمانیش، ئەمڕۆ سەعات ٦ سەرلەبەری خێڵی لە باری کۆچەریدا بینیوە کە بەرەو باشوور هاتوون. فڕینێکی ئاسمانی ئەمڕۆ سەعات ٦ی بەیانی بەسەر ئاق گوڵەوە کراوە، سەرەتا سەراسۆکەر پێی وابووە گوندەکە چۆڵ و ڤالایە بەڵام پاشان چەند کەسێکی سوارەی گومان لێکراوی لەو ناوانە کەوتووەتە بەرچاو و بۆمبابارانی کردوون، پیاوخراپان لە هوندوری ماڵەکان دەرکەوتوون و کەوتوونەتە بەر شالاوی ڕشێنەک.

ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە بەتەواوی، هێزگەلی خراپەکاران لە ئاق گوڵن. فەرمان دراوە فڕینی پێدا پێدا بە بۆمبای گەورەوە بەسەر ئاق گوڵەوە بکرێ.

ئەوەی لە کۆی زانیارییەکانی پێشەوە دەردەکەوێ ئەوەیە کە بارودۆخی خراپەکان هێجگار نالەبارە، هەموو ڕێبازگەیەکی ئالیکاری کردنیان لێ گیراوە و کەس ئامادەی یارمەتیدانیان نییە. شێخ حەسەن و شێخ ڕەسووڵ و عەلی مستۆش تەبای نێزیکەی چل ماڵ لە سنووری تورکیا ئاوابوونە و ئەم قسەیەش لە لایەن بەرپرسیارانی ڕەسمیی تورکیاوە پشتیوانی کراوە.

سەرۆکی ئەرکانی هێز، عەقید روکن فەیوزی

سەرکردەی فیرقەی٤، ئامیر لیوا هومایوونی

## ٨

## وەزارەتی شەڕ، بەڕێوەبەرایەتیی نووسینگەی ئەرکانی سوپا، ژمارە ٢٠٤٣ /١، مێژوو ٢٦/٣/٢١

ڕێزدار فەریق شابەختی، بەپێی فەرمانی شایانە پێتان رادەگەینین، هەروەک ئاگەدارن بارزانییەکان لە مێژووی ٣/٦دا هاتنە ناو زەویی ئێران، هەرچەندە لە یەکبینە بە فیرقەی ٤ دەگوترا بەدوایان بکەوێ و لەناویان ببات بەڵام فیرقە لە مێژووی ٣/١٩ ڕووبەڕووی ئەو خراپەکارانە بوو لە کاتێکدا ژمارەی هێزی فیرقە بۆ ڕاونانی ئەمانە دە جاران هێندەی ژمارەی پیاوخراپان بوو هەروەها هەموو جۆرە ئامێری ئۆتۆمبێلی و شتی تر لەبەردەستی فیرقەدا بوون بەڵام بارزانییەکان بە ئاوایەکی گشتی بەپێیان بوون و شێوەی ڕێڕۆیشتنی بەپەلەیان نەبوو و تەنانەت مەزنرێزداری پیرۆزی شاهەنشایی پاش ئاگەداربوونی لە ڕووداوگەل فەرمانی پیرۆزی خۆی فەرموو کەوا پێویستە لە هەلی ٤٨ سەعاتدا ئەم کارە بە کۆتا بهێنرێ. ئەمە بەهیچ ئاوایەک نەهاتەدی هەتا ئەوەی لە مێژووی ١٩ی مانگدا لە دەوروبەری شووت لەگەڵ شەڕخوازاندا ڕووبەڕوو بوونەوە و لە ئەنجامی ئەو کردەوەیەدا کە فیرقە راپۆرتی داوە ٣ کەس کوژراون و ٣٥ی تریش بریندار بوونە و بارزانییەکانیش توانیویانە سەرەڕای ئەو پێشهاتەش هەر بەرەو باکور هەڵکێشن. لەبەرئەوەی ئەم بابەتە لە هەموو بارێکەوە شایەنی بایەخە بۆیە بەپێی فەرمانی شایانە بڕیارە شاندەیەک لە ژێر سەرکردایەتیی بەڕێزتان و ئەندامەتیی: لیوا خەسرەوانی، عەمید گورزەن، عەمید وەسووق لە شوێنەکەدا پێکەوە بنرێ و بە وردی لە سەرهەتاپێی ڕووداوگەل بکۆڵێتەوە:

(١) بۆچی فیرقە دەمودەس دەسوەکار نەبووە؟

(٢) بۆچی کاروانگەل وێڕای ئەو ئامێرانەی لەبەردەستیاندا بووە لە دەسوکەریدا سەرکەوتوو نەبوونە؟

(٣) کەمتەرخەمی لەم کردەوەیەدا بەهۆی کێیە؟

(٤) سۆنگەی کردەوەی دواجارە چی بووە و کەمتەرخەمی سەبارەت بەکێیە؟ بە ئاوایەکی گشتی پێویستە لێی بکۆڵرێتەوە و بە ڕاستی دیار بکرێ کەمتەرخەمی لەم

کردەوەیە لەلایەنی کێوە بووە، لەبەرئەوەی ئەم سەرپێچیهاتە رووممەت و پلەی سوپای لەبەر چاوی دراوسێیان و تەنانەت لەبەرچاوی خێڵانی خۆوڵاتیش هێناوەتە خوار و دەستەپارچەییی یەکەگەلی سوپای هەر بە بەجارێ خستووەتە ڕوو. ئەنجامەکە بە زووترین کات بدەنەوە دەست، بۆ ئەوەی بخرێتە بەرچاوی شایانە.

سەرۆکی ئەرکانی سوپا، لیوا رەزم ئارا

## ٩

## وەزارەتی شەڕ، نوسینگەی ئەرکانی سوپا، ژمارە ٢,٤٢ /أ
## مێژوو ٢٦/٣/٢١

لیوا خەسرۆوانی، بەپێی فەرمانی هاوپێچ کە بۆ لێکۆڵینەوە لە ناوچەی ٢ دەرچووە، پێویستە دەسبەجێ بەرەو تەورێز بەڕێ بکەون و لەو شاندەیەی بەسەرۆکایەتیی فەریق شابەختی پێک دێت، بەشداری بکەن.

سەرۆکی ئەرکانی سوپا- لیوا رەزم ئارا

## ١٠

## وەزارەتی شەڕ، بەڕێوەبەرایەتیی سەرکردایەتیی سوپا، ژمارە ٩٣٣،
## سەعات ١٥/ ٢٠، مێژوو ١٣٢٦/٣/٢٦

بەڕێز عەمید وەسووق

لەگەڵ ڕێزماندا، وەبەرچاوتانی دەخەم کەوا لە مێژووی ٢٦/٣/١٦ فەرمانێکم بە ژمارە ٤٩- ٢٦/٣/١٦ لە ڕێگەی سەرکردایەتیی کاروانگەلی باکورەوە بەم ناوەڕۆکە پێ گەیشت کەوا "ئێوە ئەرکتان پێ سپاردراوە بەرەو (ئەواجیق) بکەونە ڕێگە و بەچەکدارکردنی پیاوانی جێ متمانە بەنیازی وەرگرتنی زانیاری لەبارەی شوێنی بارزانییەکان خەریک بن و لە پێناو لەناوبردنی ئەواندا کار بکەن". بۆیە ڕۆژی /٢٦/٣

١٧ له ماكۆوه بەرەو ئەواجیق ملی ڕێگەم گرت و ڕۆژی دواتر بەسییەچێشمە گەیشتم و نێزیکەی سەت و حەفتا پیاوی سوارەی چەکدارم سازدا و سەعات ٢ی پاش نیوەشەو بەرەو رووکاری بەدواکەوتنی بارزانییەکان کەوتمەڕێ. سەعات ٨ی بەیانیەی ڕۆژی ٢٦/ ٣/١٧ له ئاغ داش ڕووبەڕووبوونەوە ڕووی دا و بەپەلە بەنامەی ژمارە ٨٢٩- ٢٦/٣/ ١٩ ئەمەم خستە بەرچاوی ڕێزدار سەرکردایەتیی فیرقەوە. هەروەها زانیاریم لە کاروانی عەقید لەشکری و عەقید سەرداوەر نەبوو و پاشان زانیاریم بەدەست کەوت کەوا کاروانی عەقید لەشکری بانەکانی چیای سۆماری گرتووە بەڵام بچووکترین یارمەتیی بۆ کاروانی من نەبووە و شەویش هەتا بەیانی بەبێ ئامانج یەکتریان گوللەباران کردووە. لەلای تریشەوە عەقید سەردادوەر لەباتی ئەوەی بانە بەرزەکانی دەرەیلێ بگرێ کە برێتی بوو لە سێ کەپک و، ڕێبازگەی ڕۆیشتنی بارزانییەکان لە داوێنی کەپکەکانەوە بوو کە بەسەر جادەیاندا دەڕوانی، تەنیا دووکەپکیان گرتبوو و کەپکە سەرەکییەکەیان کە لەوانی تر بەرزتربوو نەگرتبوو، بۆیە دوژمن پەلاماری دان و زیانێکی کاریی پێ گەیاندن و پاشان بەسەرکەوتووییش بۆی دەرچوون. دواجار کاتێ لە سییەچیشمەوە بەڕێ کەوتم، بەنامەی ژمارە ٨٢٦- ٢٦/٣/١٨ دوو پارچە رشێنەکی گرانم لە مۆڵگەی سییەچێشمە (رائیدی یاسایی) داوا کرد. ناوبراو بە نامەی ژمارە ١٨٦٩- ٢٦/٣/١٨ وەڵامی دایەوە کەوا پێویستە لە ڕێگەی هێزەوە داوا بکەن. بێگومان ئێوەش پشتیوانی لەوە دەفەرموون بەم جۆرە هاوکاری و پاڵپشتییەی ئەفسەران هەیانە دوژمن لەو شوێنەی کە لە ڕاستیدا وەک ئەڵقەیەک لە گەمارۆ ترابوو پێی کرا بۆی دەرچێ و، لەبەرئەوەی منیش کاتم نەبوو بۆم نەلوا لە ڕێگەی فیرقەوە داوای رشێنەک بکەم، ئەم بابەتەم بۆ ئاگەهداریی بیری پیرۆزی بەڕێزتان خستە بەرچاو.

سەرکردەی سوپای باژێڕی ماکۆ، عەقید زیائەدین زاڵتاش

(ئەم تێبینییە لە پشتەوەی لاپەڕەی ڕاپۆرتی عەقید زاڵتاش نووسراوەتەوە):

شەو لەقەرەبۆلاغ مامەوە بەیانی سەعات ٢ی پاش نیوەشەو بەرەو یوموووری داش و ئاقداش کەوتمە ڕێ و بەرەو لای شووت شۆڕبوومەوە و پاشان بۆ وەرگرتنی فەرمان چووم بۆ ماکۆ، لە نێوان ڕێگەدا چاوم بەسەرکردایەتیی فیرقە کەوت و منی بۆ شووت گێڕایەوە و فەرمانی دابوو چەکی خێڵان کۆ بکەمەوە.

عەقید زاڵتاش

## ١١

# ئاخاوتنی ئەفسەرانی بەرپرس لە کردەوەگەلی بارزانی

## ئاخاوتنی لیوا هومایوونی

سەبارەت بە هۆی سەرنەکەوتن لە ڕێ لێ بڕینەوەی دەربازبوونی بارزانییەکان بۆ باکور لە مێژووی هاتنیان بۆ زەویی ئێران لە ٢٦/٣/٦ هەتا ئەو دەمەی بارزانییەکان لە گەلی قتوور تێپەڕین و بەرەو باکور هەڵکشان:

پاش ئەوەی بارزانییەکان لە جاری یەکەمدا بە هۆی پاڵەپەستۆی هێزگەلی سوپا لە زەویی ئێران چوونە دەر، لەلایەن ئەرکانی سوپاوە بڕیار درا یەکەگەلی کاروباری ئۆپەراسیۆن لە ماکۆوە هەتا...(١٤) بە نیازی چەک لێ کردنەوەی خێڵانی کورد لەو ناوچانە بگیرسێنەوە و هەتا ١٥ی جۆزەردان کاری چەک لێ کردنەوە بەکۆتا بێت. بۆ ئەم مەبەستەش گواستنەوە و جێگۆڕکەی یەکەگەل دەستی پێ کرد و خەریکی چەک لێ کردنەوە بوون. لە ماوەی ئەم کارەدا فەرمان هات کەوا بۆ پێشوازیی ڕێز لێگرانە پێویستە یەکەگەل بچن بۆ ئەو شارانەی کە کەژاوەی پاتشایی پیایاندا تێپەڕ دەبێ، ڕاپۆرت درایە ئەرکانی سوپا مۆڵەت بفەرموێ ئەو یەکانەی دەستیان بە چەک لێ کردنەوە کردووە درێژە بە کاری خۆیان بدەن و تکا لە پێشوەریی شا بکرێت سەردانی خۆی بخاتە نیوەی دووەمی جۆزەردان بەڵام پەسند نەکرا بۆیە بە گوێرەی فەرمانگەلی دراو، یەکەگەل بەرەو شارانی ورمێ، شاپوور، خوی و ماکۆ ڕەوانە کران.

لە ماوەی ئەم گواستنەوە و جێگۆزییەدا لە ڕۆژی ٢٦/٣/٦ بەهۆی نووری بەگی خاوەنی (ئەنبێ)وە زانیاری هات کەوا ژمارەیێ مەڕ لە گوندی (جرمی) کە لە نێزیکی سنوور هەڵکەوتووە ڕفێنراون و وەک دەریش کەوتووە ئەم کارە بەهۆی پیاوانی بارزانییەوە رووی داوە، پاش پێوەندی لەگەڵ سەرکردەی هێزی عێراقی ئاشکرا بوو مەلا مستەفا لە ڕێگەی تورکیاوە بەرەو سنوور هاتووە و پێی ناوەتە ناو زەویی ئێران. بێ وچان ٢٠٠ پارچە چەک بەسەر خێڵاندا بڵاوکرایەوە کە سەتیان بەسەرپەرشتیی نەقیب زەرابی و سەتەکەی تریان بەسەرپەرشتیی رائید سوڵح جۆ دامەزران و فەرمان درا ئەمانە بە شێوەی

(١٤) لەدەستهاوێژە بنەڕەتییەکەدا بەتاڵە.

خوارەوە دەسوەکارین:

ئەلیف: نەقیب زەرابی بەرەو لای مەوانا ملی رێ دەگرێ و ئەرکی ئەوە دەبێ ڕووبەڕووی بارزانییەکان ببێ و لەگەڵیاندا بکەوێتە شەڕ هەتا هێزی سوپا دەگاتە جێ.

بێ: رائید سولّح جۆ بەرەو گونبەت لەگەڵ کوڕی عەمەرخاندا بچێتە سیرۆ بۆ ئەوەی رێ لە بارزانییەکان ببڕنەوە.

هەر ئەو ڕۆژە کاروانێکی پێکهاتوو لە ٢ کەتیبەی پیادە و ٤ تانک و سریەیەک هاوەن و سریەیەک تۆپی٧٥ی لە بن سەرکردایەتیی عەقید سەردادوەردا ئەرکی پێ درا بەرەو مەوانا بڕوات و ڕێ لە دەربازبوونی بارزانییەکان بگرێت، لەبەرئەوەی دوای گەیشتنی عەقید سەردادوەر بۆ لەرنێ بارزانییەکان لە (ئەنبێ) دەرکەوتبوون و لە ڕۆژئاوای مەواناوە تێ پەڕیبوون، فەرمانم دا (ڕۆژی نۆیەمی جۆزەردان) بەدوایان کەون و لەبەرئەوەی بە گوێرەی ئەو زانیارییانەی هاتبوون بۆم روون بوو بەدواکەوتنی ئەمانە بۆ سەردادوەر شیاو نییە، کاروانی ناوبراوم بانگهێشتن کرد و ئەرکی ناوچەی باکوری (ماکۆ- شووت)م پێ دا. هەروەها بڕیارم دا لە هێڵی قتوورەوە ڕێ لە تێپەڕینی بارزانییەکان بگرم بۆیە کاروانێکی پێکهاتووم لە ٤ کەتیبەی پیادە، ٤ تانک و کەتیبەیەکی سوارە و کەتیبەیەکی هاوەن و تۆپێکی ٧٥ی بەسەرکردایەتیی عەقیدی پیادە نیساری نارد کە لە ژێر سەرکردایەتیی عەمید بێگلەریدا رازانەوەی پێویست بگرێتە خۆ، بەڵام لەبەرکو وچانی نێوان کەتیبەگەل فرە بوو و پیاوانی بارزانی دەسوژێر بوون بۆیە گرتنی گەلیی قتوور لە توان وەدەربوو و بەدواکەوتنیشیان بە هۆی پیاوگەلێک کە ژێهاتوویی بارزانییەکانیان نەبوو شتێک بوو کاری کردن نەبوو، لەبەرئەمە و لەم سۆنگەیەوە بڕیارم دا لە ناوچەی ماکۆ-شووت- مەرگن-ەوە ڕێگەی دەربازبوونیان لێ ببڕمەوە بۆیە فەرمانی پێویستم بە عەمید زەنگەنە دا و بە گوێرەی فەرمانی ئۆپەراسیۆن، بڕیاری گرتنی هێڵی پێشەوەم دا. لەو ناوچەیەشدا بەهۆی بەرهەڵدایی ناوچەکە و کەمیی ئەژمار و نەبوونی ئامێری پێویست بۆ گواستنەوە و نالێهاتوویی پیاوەکان سەرکەوتن نەهاتەدی و بارزانییەکان پاش پێکدادان لە باشووری شووت و ڕووبەڕووبوون لەگەڵ گرووپەکانی جەندرمەدا، بەشەو دەرباز بووبوون.

## ئاخاوتنی عەمید بێگلەری

### لە بارەی نەتوانینی ڕێ لێ بڕینەوە لە بارزانییەکان

### لە دەربازبوون لە گەلیی قتوور

هۆی نەتوانینی ڕێ لێ بڕینەوەی بارزانییەکان لە (دەربازبوون) لە گەلیی قتوور ئەوەبوو کە درێژیی گەلییەکە نێزیکەی ١٢ فرسەخە[١٥] و، هەروەها کەمیی هێز (٤ کەتیبە)، لەوانەیە وا خەیاڵ بکرێ بۆچی ئەو تیپەڕگە ناچارییانەی بارزانییەکانم بەم هێزە نەگرتووە، ئەمە لەبەرئەوەی تیپەڕگەکان ژمارەیان زۆرە، بۆ ئەوەی هەتا بۆمان بلوێ ئەو نیازە بێنینە دی لەگەڵ جێبڕوایانی ناوچەییدا راوێژمان کرد و لە ئەنجامدا چوار خاڵی «ئەستەران- زەرێ- قتوور- رازێ»[١٦]مان بۆ هێوراندنی ٤ کەتیبە دیاری کرد و بێ لەمە شتێکی تر نەدەکرا.

## ئاخاوتنی عەقید نیساری

### لەبارەی نەتوانینی ڕێ لێ بڕینەوەی بارزانییەکان

### لە دەربازبوون لە گەلیی قتوور

هۆیەکە ئەوەبوو یەکەم هەرچەندە خۆم داوام کرد گەلیی قتوور بە ٤ کەتیبە دابخەم بەڵام کاتێ گەیشتمە شوێنەکە سەیرم کرد ئەم کارە لەکردن نایەت، لەبەرئەوەی ئەم ناوچەیە فرەوانتر بوو لەوەی من بیرم لێ کردبووەوە و، لەگەڵ ئەو نەخشەیەی لێم کۆڵیبووەوە تێکی نەدەکردەوە، ئەمەشم بە راپۆرت گەیاندە سەرکردایەتیی هێز، وێڕای ئەمەش بە هۆی درەنگ گەیشتن بەو شوێنە نەمتوانی هێورینی کەتیبەگەل لە ئەستەران و زەرێ ببینم و سەراسۆییەکی تر لەبارەی شوێن و دابەزینی دوو کەتیبەکەی تر بکەم و چوار سەعات پاش گەیشتنم بەقتوور بارزانییەکان لە نێوان مەخین و حەبەشەوە تێ پەڕیبوون.

(١٥) یەک فرسەخ لە شەش کیلۆمەتر کەمترە (وەرگێڕ).

(١٦) لەوانەیە هەندێ لەم ناوانە بەڕاستی نەنووسراین، لە دەستهاوێژەکاندا واهاتوون و کتێبەکەش وای نووسیونەتەوە، هەندێک جاریش بەشێوەی جیاجیا نووسراون (وەرگێڕ).

## ئاخاوتنی عەقیدی پیادە فولادوەند

ڕۆژی نۆیەمی جۆزەردان لە(خوی)یەوە فەرمانم پێ گەیی بەخۆ و کەتیبەکانی فەوجەکەم بەرەو قتوور بکەومە ڕێ و، ڕێ لە دەربازبوونی بارزانییەکان بگرم، بۆیێ لەسەعات ١٠ بەڕێ کەوتم و لە سەعات ٢٠ گەیشتم بە قتوور، بەڵام پێشتر دوو کەتیبەی پیادە و سریەیەک ڕشێنەکم لە زەرێ دامەزراند. سریەیەکم لە کەتیبەی خۆم تەبای سریەیەک هاوەن لە کەتیبەی رائید نەوابی و سریەیەکی ڕشێنەکیشم لە کەتیبەی خۆم لە قتوور بەجێ هێلا بەڵام سەرنجم دا درێژیی گەلی قتوور ٧٥ کیلۆمەترە و گەلیی قووڵی باکور- باشووری زۆر و زەوەندی هەن تەنانەت فیرقەگەلیش دەتوانن لەوێ دەربازبن بەڵام لەبەرئەوەی ئەرک پێ سپاردراوبووم وەک چۆن پێشتر بۆچوونی خۆم روون کردەوە، پارێزم گرت.

ئەوکاتە رائید نەوابی لە سنوور دیمانەی لەگەڵ تورکەکاندا کرد و تورکەکان گوتیان کەوا هێزگەلێکیان ئامادە کردووە و لە کاتی پێویستدا ئامادەی یارمەتیدانن، راپۆرتی هەموو ئەو بابەتانەی سەرەوەم لەو ڕۆژەدا (١١ی جۆزەردان) بەسەرکرادایەتیی فیرقە راگەیاندەوە. هەروەها بۆ پەیاکردنی زانیاری، هەندێ خەڵکی ناوچەییم ناردە ئەو ناوانە. ئەو کاتە وێڕای وەبیرهێنەوە (مذکرة)یەک کە لە عەقید نیساریی سەرکردەی کاروانەوە- لە بارەی رازانەوەی هێزگەل- گەیشتبوو، فەرمانی ئۆپەراسیۆنیش گەیشت. لەبەرئەوەی کەتیبەی فەوجی ئاهەنیش بەسەرکردایەتیی رائید پەرهێزکار و سەرپەرشتیی عەقید نەفیسی گەیشتبووە جێ بۆیە برێ لە یەکەکانم لە بن سەرکردایەتیی خۆمدا بەپێی فەرمانی پێدراویان لە ئۆپەراسیۆنەوە، رازاندنەوەیان گۆڕی و دامەزراندن.

## ئاخاوتنی مقەدەم نەفیسی

### سەرکردەی کەتیبەی ئاهەن و سەرپەرشتیاری کەتیبەگەلی رائید پەرهێزکار و رائید زرێپۆش سەبارەت بە سوود وەرنەگرتنیان لە زانیارییەک کە لە یەکێ لە دانیشتووانی (راویان)ەوە لە بارەی بەرێ کەوتنی بارزانییەکان لە گوندی راویان - ەوە بە ناوبراوی دابوو

مقەدەم نەفیسی سەبارەت بە سوود وەرنەگرتنی لەو زانیارییەی بەهۆی ئەو کەسەوە پێی درابوو گوتی سەعات ٢ی بەیانیەی ڕۆژی سێزدەی جۆزەردان لە ڕێگەی یەکێ لە پیاوانی

ناسوپایی زانیمانەوە کەوا سەعات ١١ی شەو بارزانییەکان لە ڕاویان بەڕێ کەوتوون. لەبەرئەوەی متمانەم بە زانیاریی ئەو پیاوە نەبوو بۆیە راگیر(توقیف)م کرد. پاشان ناردم بۆ لای سەرکردەی کەتیبەی خۆم هەتا دوو کەسی لەگەڵدا بنێرن بۆ راویان و لە ڕاستیی قسەکانی بتۆژنەوە، لەبەرئەوەی شەو بوو نەمدەویست پێش دڵنیابوون کارێ بکەم.

## ئاخاوتنی عەمید زەنگەنە

## لەبارەی بێدەسەلاتی لە بانەکانی سوکار-یوموورداش- قزڵداش-شووت

لەبەرئەوەی وا بیر دەکرایەوە کە بارزانییەکان بۆ دەربازبوونی خۆیان بەرەو باکور دوو رووکار هەڵدەوژێرن، واتە یان لە ڕۆژئاوا یاخۆ لە ڕۆژهەڵاتی ماکۆوە تێ دەپەڕن بۆیە چوار کەتیبە لە شاری ئۆجاق هەتا قزڵداش داهیۆران و رەچاوی ئەوەش کرا کەتیبەیەک لەدەرەوەی دەربەندی ماکۆ وەک سپێر هەڵوەستە بکات و ٢ کەتیبەش لە شووت لە بن دەستی عەقید سەردادوەردا بمێنێ (کەتیبەگەلی فەوجی ئازەرپاد) بەڵام لەبەرئەوەی فەوجی رائید زرێپۆش نەگەیشتەجێ، بڕیار درا کەتیبەیەک لە فەوجی ئازەرپاد لە ناوەوەی دەربەندی ماکۆ لەسەر تێپەڕگە گرینگەکان بهێورێ (تێپەڕگەی ڕۆژئاوای گەلیی خندوور).

سەبارەت بەمەبوو نەمانتوانی ٢ کەتیبە لە بن دەستی عەقید سەردادوەردا دابنێین، هۆی نەگەیشتنی کەتیبەی رائید زرێپۆشیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەوا لە خوی چاوەڕوانی گەیشتنی ئامێری گواستنەوە بوو. بەهەر ئاوایەک بێ، عەقید سەردادوەر دەمەو ئێوارەی ڕۆژی ١٨ی جۆزەردان تەبای یەکەگەلی ژێر سەرکردایەتیی خۆی داهیۆری و ڕۆژی ١٩ بەرەو لای (یەلی دەرە) کەوتە ڕێ. بۆ زێدە زانیاری ئەوەش روون دەکاتەوە کەوا بە گوێرەی زانیاریی وەرگیراو لەڕۆژی ١٧ی مانگ سۆراغی بارزانییەکان بەچاکی کرا و سەرکردایەتیش لە رووگەی دەربازبوونی بارزانییەکان ئاگەدار کرایەوە بەڵام ڕۆژی ١٨ی جۆزەردان ٣ جار قۆڵی بزووتنەوە گۆڕا و نەدەکرا بەڕاستی بزانرێ لە کیهە قۆڵ بزووتنەوەمان دەبێ.

## ئاخاوتنی عەقیدی پیادە لەشکری

## لەبارەی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بارزانییەکاندا لە ڕۆژی ١٩ی جۆزەردان

ڕۆژی ١٦ی جۆزەردان فەرمانم پێ درا کەوا تەبای یەکەگەلی خۆم و ٥٠ سەر لە تفەنگدارانی خۆوڵاتی بەرەو بانەکانی سکار بکەومە ڕێ بۆیە ڕۆژی ١٧ی مانگ کەوتینە ڕێ، لەبەرئەوەی زانیاری هاتبوو کەوا بارزانییەکان گەیشتوونەتە نێزیک زۆرئاوا، سەراسۆی بانەکانی سکارم کرد. ڕۆژی ١٩ی مانگ بارزانییەکان بەبەر بانەکانی عەرەفات- سکارەوە بەرەو چەمەنلی ئاقداش- یومورداش ڕۆیشتبوون، دەمەو بەیانیی بەیانیەی ڕۆژی ١٩ی مانگ ژمارەیەکی زۆریان پەلاماری بنکەی (سوسووز)یان دابوو کە ١٠ سەر سوارەی خۆوڵاتی دەیانپاراست. پاش دەست پێکردنەوەی ئاگرهاوێژی، سوارگەلی خۆوەڵات بەرەوژێر بەتەقڵەکوت هەڵدێن و بارزانییەکان ئەو شوێنە دەگرن منیش دەسبەجێ بنکەکانی خۆمم ڕێک دایەوە و لێ وردبوومەوە کەوا ڕێگەی هاتنە خوارەوەیان لێ بگرم و، بەهۆی سوارەگەلی خۆییەوە زانیاریم بۆ سەردادوەر نارد کەوا شوێنی جێگیربوونی بارزانییەکان ها لەکوێ، دڵنیابووم ئەم سوارەگەلە لەبەرئەوەی بەرپرسیارەتییەکیان نییە نایانەوێ زانیارییەکە بگەیەن، لە زانیارییەکەشدا ئەوەم تۆمارکردبوو کە بانەکانی شووت بگرێت، ئەم زانیارییەم بۆ هێزیش نارد.

سەعات ١٠ی بەیانی لە باڵی ڕاستەوە بە هۆی سوارێلی خۆوەڵاتیی خۆمانەوە دەست بە ئاگرهاوێژی کرا و دەرکەوت هەندێ لە سواران لە ژێر سەرکردایەتیی عەقید زەڵتاش - دان. کاتێ نێزیک بوونە، بارزانییەکان کە خۆیان وەشاردبوو دەسرێژیان کرد و سوارەگەلی خۆوڵاتیش پاشەکشێیان کرد. پاشان بەهۆی سوارێلی خۆمانەی بن دەستی خۆمەوە هەوڵم دا سوسووز داگیربکەم بەڵام بۆم نەچووە سەر. فەرمانم دا دان بەخۆدا بگیرێ هەتا شەو دادێ و سوود لە تاریکی وەربگیرێ و کارەکە دووبارە بکەمەوە. فیرقەشم بە ڕاپۆرت لەوە ئاگەدارکردەوە و داوام کرد بەهۆی باڵەفڕ بانانی پێشوو بۆمباباران بکەن لەبەرئەوەی هێزی یاریدەرم نییە و هێزەکەی خۆیشم کەمە(٢ سریەی پیادە هەر سریەی دوو وپەل و چوار رشێنەکی گەورە و کەتیبەیەکی سوارە و نێزیکەی ٥٠ سەر تفەنگداری عەجەم) ئێوارە ئاگرهاوێژی بڕا و کێوی سوسووزمان گرت بەڵام لە لای ڕاستەوە هەر لە بەرشەوێوە دەسرێژ دای گرت (لە بەرامبەر پیادەگەلدا وردە وردە و لە بەرامبەر سوارەگەلدا بەزۆر و زەوەندی) و ئاگرهاوێژی هەتا سەعات ٣ی پاش نیوەشەوێ درێژەی دایێ و پاشان بڕا. بەیانیەی

ڕۆژی ٢٠ بەگوێرەی فەرمانی هێزی زەوی، هێزی خۆمان کۆوەکرد و بەرەو لای شووت ڕۆیشتین و لەم پێکدادانەدا چ زیانەکی گیانیمان نەبوو ئەوە نەبێ دوو کەس لە سوارەی خۆولاتی بریندار بوون.

## ئاخاوتنی عەقید سەردادوەر

## لەبارەی ئۆپەراسیۆنی خۆی لە ڕۆژی ١٩ی جۆزەردان ١٣٢٦ لە شووت

سەعات یەکی ڕۆژی ١٩ی مانگ کاروانێک بەسەرکردایەتیی خۆم کە پێک هاتبوو لە ٢ سریەی پیادە، سریەیەک ڕشێنەکی گەورە، کەتیبەیەکی سوارە، ٤ تانکی شەڕ و سریەیەک تۆپی ٧٥ی و، سریەیەک هاوەنهاوێژ لە شووت گیرسانەوە. سەت پارچە چەکیشمان پێ درا بۆ ئەوەی سوارەگەلی خۆولاتی چەکدار بکەم بەڵام جگە لەوە ٥٠ کەسی تریش چەکدار کران و درانە پاڵ کاروانی عەقید لەشکری، تەنیا ٩٠ سەریان لە بن دەستی من داندران، هەروەها ١٨٠ سەر جەندرمەشیان بە ئێمە دا بۆ ئەوەی لە ماکۆوە هەتا تازەکەند دابەش بکرێن و هەرواش کرا.

سەعات ٦ی بەیانیەی ڕۆژی ١٩ی مانگ تفەنگدارێک زانیاریی هێنا کە بارزانییەکان هاتوونەتە داش فێش بۆیە بڕیارم دا بەخۆ و هەموو ئەوانەی لەگەڵمدان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان بچم و تێپەڕگەی ناو گەلی بگرم، سەعات ٨،٣٠ی ڕۆژی ١٩ کاروان کەوتە بزاوت بەڵام نەمزانی کاروانی عەقید لەشکری تووشی شەڕ بووە. پێویستە ئەوەش بڵێم پێشتر لە سەعات ٦ی بەیانی زانیاری هات کەوا ٩ سەر تفەنگداری خۆمان لە «یەلی دەرە» تووشی پێکداداان هاتوون و کەسێک کوژارە و هەر بەو هۆیەش بوو کە ئەرک بە کەتیبەی سوارە درا زارگەلیی «یەلی دەرە» ببەستێ و بگرێ (لەسەرەوە ئاماژەی پێ درا). سەعات ٣٠،١٠-١١ کەتیبەی سوارە بێ ڕووبەڕووبوونی دوژمن ئامانجی خۆیان گرت و پیادەش بە سەرگەی هەڵمەتی خۆیان گەیشتن، تۆپ و هاوەنیش دامەزران.

سەعات نیوی پاش نیوەڕۆ، هێرش تەبای ٤ تانک و پاڵپشتیی هاوەن و تۆپ دەستی پێ کرد، ئامانجی یەکەم کەپکە چیایەکی سوور بوو کە پیادە بەبێ زیان پێی گەیشتن و مرۆهەڵگرەکان بەباشی گەیشتن، لە قۆناخی دووەمدا، تانکەکان لە نیوەی ڕێگەدا بەهۆی زەویی بەردەڵانەوە لە بزاوت کەوتن بەڵام پیادە نەوێستان، درێژەیان بە بزووتنەوە دا و گەیشتن بە ئامانجی دووەمیان، من لە ڕوانگەی سەراسۆکردنی سوارە دابەزیم و چووم بۆ ڕوانگەی تۆپخانە، لەناکاو سەیرم کرد لەسەر بەرزاییەکەدا ئاواییەکی کاول هەیە و

بارزانییەکان خۆیان تێدا وەشێردبوو، لەگەڵ هێزەکانی ئێمە تێکەڵاو بوون و دەنگی گرمەژنی ئاگرهاوێژی و نارنجۆک بەرزبووەوە، ئەو دەمە فەرمانم بە سریەی نۆیەم دا (سەعات ۲،۳۰ی پاشنیوەڕۆ) خۆیان بە پاشدا بکێشنەوە و بانەکانی دواوە بگرن. بارزانییەکانیش بەرەوپێش هاتن و ئامانجی یەکەمی کەتیبەیان گرت و ئاگرهاوێژی هەتا سەعات ۲۰،۳۰ بەگەرمی درێژەی کێشا، ئاگری هاوەن و بۆمبابارانی باڵەفڕیش زیانی هەست پێ کراوی پێ گەیاندن.

## ئاخاوتنی رائید زرێپۆش
## لە بارەی کێشەی قزڵداغ

کەتیبەکەی من لە سەعات ۱۸ی ڕۆژی ۱٦ی مانگ لە ئەستەران کەوتە بزووت و سەعات ٦ی بەیانیی ڕۆژی ۱۷ی مانگ خۆم گەیاندە خوی، چاوەڕوانی ئۆتۆمبیل بووم کە بەرەو ماکۆ بکەوینە رێگە و هەر بۆ ئەم مەبەستەش هەتا ڕۆژی ۱۹ی مانگ لە خوی بووین، ڕۆژی ۱۹ی مانگ سەعات ۱٥ هەندێ ئۆتۆمۆبێل ئامادەبوون و دەسبەجێ فەرمان درا بەڕێ کەوین. عەقید شەفیقی سەرۆکی بارهەڵگری گوتی بەم ٦ ئۆتۆمۆبێلەی لەبەردەستدان ئەوەتان پێ دەکرێ بەڕێ بکەون، ئەوەی دەمێنێتەوە من بەڕێی دەخەم. بۆیە ناندین و، سریەی رشێنەک و، پێبژێوی و ئەرکانی کەتیبەمان بە هۆی ئەو (٦) ئۆتۆمبێلەوە هەتا بەرشەوی ڕۆژی ۱۹ گەیاندە ماکۆ و چووم بۆ سەربازگە، رێزدار سەرکردەی هێز بانگهێشتنی منی کرد و فەرمانی دا ئەم کەتیبەیە بۆ پاڵپشتی لە بنکەکانی جەندرمەی قزڵداغ- قزل ئولووم و شووت بکەونە رێگە، بۆیە ٤٠ سەربازی کەتیبە کە ئامادەبوون لە ئۆتۆمۆبێلێکم سوارکردن و عەقید غەفاریی سەرکردەی ئەرکانی ئۆپەراسیۆنی هێزیش بەرەو لای سەرکردایەتی سواری ئۆتۆمۆبێلێک بوو، سەعات ۲۱.۳۰ی ڕۆژی ۱۹ی مانگ لە سەربازگەوە کەوتینە رێ و بڕیار بوو ئەم ٤٠ سەربازە لە بنکەی قزڵداغ دابنێین و پاشان پێکەوە لەگەڵ عەقید غەفاریدا تەبای تانکەکان بچین بۆ شووت و چاوەڕوانی گەیشتنی پاشماوەی هێزەکانی کەتیبە بین بۆ ئەوەی بیانکەین بە هێزی سپێر بۆ پاڵپشتی لە عەقید سەردادوەر. کاتێ گەیشتینە کاولگەیەک لە نێزیکی پردی قزڵداغ (سەعات ۲۲.۳۰) بینیم ۲ وشتر کوژراون و لەسەر چەقی جادە فڕێ دراون بۆیە تانکە شەڕییەکان وێستان و ئێمەش هەر وێستاین، بڕێک هەڵوێستاین بینیمان هیچ

هەواڵێک نییە و تانک بەڕێ کەوتەوە. لەکاتی بەڕێ کەوتندا تەقە لە ئۆتۆمۆبیل و تانک کرا. بۆیە فەرمانم بە ئۆتۆمۆبیل دا خێرا باژوا لە ناکاو بینیم شۆفێرەکە وەرگەڕایە سەرم. خۆم هاوێتە خوار دەستم بریندار بوو، ها لەو کاتەدا نارنجۆکێکیان هەڵدایە ناو ئۆتۆمۆبێلەکە و پێکدادان دەستی پێ کرد. سەربازەکان دەمودەس خۆیان هاوێشتە خوار و منیش چەند نارنجۆکێکم لێ وەرگرتن و هەڵم دانە ناو کاولگەکەوە، پاش تفەنگهاوێژییەکی کورت کە لە نێوان هەردوولاوە کرا، دەنگێک لە کاولگەکەوە نەهاتە دەر. چوومە ناو کاولگەکە کەسی لێ نەبوو، تاوێکیش لە ناو ئەو تاریکییەدا گەڕاین هەموویان ڕۆیشتبوون، گەڕاینەوە لای ئۆتۆمۆبێلەکە، ناڵەناڵی برینداران بەرزبووەوە. لەوکاتە، تانکە شەڕییەکە کە بۆ پێشەوە چووبوو گەڕایەوە و پرسیاری کرد چی ڕووی دا؟ سەرپێهاتەکەمان گێڕایەوە. لەو پێکدادانەدا، خۆم و عەریفێک و شۆفێری ئۆتۆمۆبێلەکە و ١٤ سەرباز برینداربووبوون و (٥) سەر کەسیش کوژاربوون.

ئیمزا: لیوا خەسرۆ وانی، عەمید وەسووق، عەمید گورزەن

## ١٢

## ڕاپۆرتی دەستەی تۆژینەوە لە تاخاوتنی برینداراانی ڕووداوی شووت

لە ئەنجامی ئەو تۆژینەوانەی لەکاتی سەر لێدانی برینداران لە نەخۆشخانەی ورمێ لە عەریفێکی بریندار و سەربازانی بریندار بەجێمان گەیاندن، ئەم خاڵانەی خوارەوە بۆ کۆمیسیۆن ڕوون و دووپات بووەوە:

١- لە بنەڕەتەوە ناردنی لۆری بەشەو لەگەڵ عەقید غەفاری و رائید زرێپۆشدا کارێکی بێ سوود و دوور لە وشیاری بووە.

٢- عەقید غەفاری بەخۆ و بەتانکێکەوە لەگەڵ لۆرییەک بەڕێ کەوتبوون کە لۆرییەکە چل سەرباز و رائید زرێپۆشی هەڵگرتبوو، بۆ ئەمە دەبوو تانکی عەقید غەفاری بە نیازی پارێزگاری و دەستەبەری، لە دواوە نەک لە پێشەوەی لۆرییەکەوە بڕوات هەتا ئەگەر ڕووبەڕووبوونەوەیەک بەشەو ڕووی دا بتوانێ پارێزگاری و پاڵپشتی بکات.

٣- لەسەر پردی قزڵداغ، لە تەنیشت کاولگەیەک کە خراپەکاران لەوێوە لۆرییەکەیان

گرتبووه بەر دەسرێژ و بە نارنجۆک پەلاماریان دابوو، لۆرییەکە لەسەر چەقی ئەوجادەیەدا تووشی کەلەشی سێ وشتری کوژراو دەبێ، ئەو وشترانە پێشتر پێبژیویان هەڵگرتبوو و تەبای سەربازێک و عەریفێک بەر لە یەک سەعات لەو شوێنەوە رەت بووبوون و کەوتبوونە بەر گوللەباران، سێ وشترەکە تۆپیبوون و جادەکەیان گرتبوو.

لە هەلومەرجێکی ئاوهادا، وەک نەریت پێویست بوو تانکەکە لەبەر کەلەشی وشترە گوللە پێ کەوتووەکاندا بووەستێ و سەراسۆیی بکات، هەر نەبێ دەربازبوونی لۆرییەکە لەسەر پردەکە دەستەبەر بکات بەتایبەتیش بە قسەی یەکێک لە سەربازە بریندارەکان، لەوکاتەدا لێخوڕی تانکەکە هەر ئەم پێشنیازە بۆ عەقید غەفاری دەکات بەڵام عەقید غەفاری فەرمان دەدات لە جادە لا بدا و لۆرییەکە کە بڕستی ڕۆیشتنی لەزەویی لەمپەرداردا نەبووە ناچار وێستاوە و بۆ خۆی کەوتووەتە بەر پەلامار. بەگوێرەی ئاخاوتنی سەربازانی بریندار، نەقرمەژنی گوللە و، نەهات و هاواریان ناگاتە گوێی سەرنشینانی تانک، تانکەکە بۆ خۆی دەڕوات و پاش تەواوبوونی پێکداداان کە تیایدا ٥ سەرباز کوژران و ١٦ سەرباز و عەریفێک و رائید زرێپۆش بریندار بوون، ئیتر تانکەکە دەگەڕێتەوە سەریان.

لەبەر ئەمە، سەبارەت بە نەبوونی وشت و وریایی پێویست بۆ پارێزگاری لە لۆرییەکە (ڕۆیشتن لە پێشەوە - رانەوەستان لە کاتی تووشبوونیان بە کۆسپە) عەقید غەفاری بەتەواوی بەرپرسە و تەتانەت ئەوەش تێ دەخوێنرێتەوە کە ئەو کاتەی لۆری دەکەوێتە بەر پەلامار، ئەفسەری ناوبراو بەدەستی مەبەست بۆ خۆ دەربازکردن لە مەترسی درێژە بە ڕۆیشتنی خۆی دەدات.

لە کۆتاییدا، کۆمیسیۆن هەستی بەو خاڵە کرد کە رائید زرێپۆش هەرچەندە هەر لەسەرەتاوە بریندار دەبێ بەڵام بەوپەڕی بوێری بە هەڵدانی نارنجۆک و ئاگرهاوێژی بە پارابلووم دەستی کردووەتەوە و ئەرکی سەربازیی خۆی بە چاکترین شێوە بەجێ گەیاندووە کە ئەفسەری ئاوەها شایەنی هەموو جۆرە پەسنێکە.

سەرۆکی کۆمیسیۆن: لیوا خەسرۆ وانی- ئیمزا:

عەمید گورزەن- ئیمزا:

عەمید وەسووق- ئیمزا:

## ١٣

## راپۆرت و هەڵسەنگاندنی تێکڕاییی لێژنەی تۆژینەوە

## لە قۆناخە جۆراوجۆرەکانی کردەوەکانی بارزانی

قۆناخ١: لەبارەی کارەکانی فیرقەی ٤ دژی دەربازبوونی بارزانییەکان بەرەو باکور.

١- یەکەمین زانیاری لە بارەی هاتنی بارزانییەکان بۆ ناو سنووری ئێران لە مێژووی ٨ی بەیانیەی ڕۆژی ٦ی جۆزەرداندا گەیشتووەتە فیرقە.

٢- یەکەمین کاری فیرقە ئەرک پێدانی نەقیب عەدل زەرابی بووە کە تەبای سەت سەر مرۆڤی تفەنگدار بچێتە مەوانا هەروەها ئەرک بە رائید سوڵح جۆش دراوە تەبای ژمارەیەک تفەنگداری خۆوڵاتی بکەوێتە شەڕی بارزانییەکان.

٣- فیرقە لە مێژووی ٢٦/٣/٢٧ کاروانێکی پێکهاتووی لە دوو کەتیبەی پیادە، سریەیەک هاوەن، دەزگایەکی بێتەل و چوار تانکی شەڕی لە ژێر سەرکردایەتیی عەقید سەردادوەردا بەرەو لای مەوانا ناردووە. ئەرکی عەقید سەردادوەر بزووتنەوەی بە پەلە بەرەو مەوانا و ڕووبەڕووبوون و تەفر و تووناکردنی بارزانییەکان بووە. یەکێک لە کەتیبەکانی بارهەڵگر لە سەعات ١٣ی ڕۆژی ٧ و کەتیبەیەکی تر لە سەعات ١٧ی هەر ئەو ڕۆژە دەگەنە (لەرنێ)ی نیوە ڕێگەی نێوان ورمێ و مەوانا.

بەرچاوکردنی ئەوەی ماوەی نێوان ورمێ و مەوانا تەنیا ٢٨ کیلۆمەترە عەقید سەردادوەر شەو لە لەرنێ بەسەر دەبات و بەیانیەی ڕۆژی پاشتر بەرەو مەوانا مل دەنێ بەڵام مەلا مستەفا تەبای تفەنگدارانی خۆی بەگوێرەی راپۆرتی ٢٦٨٣٠ - ٢٦/٣/٨ فیرقە پاش ئاگەداربوون لە گەیشتنی کاروان بە لەرنێ لە ڕۆژی حەوتەمدا شوێنی خۆی بەجێ هێشتووە و بەرەو باکور هەڵکشاوە.

بۆچوونی لێژنە «کۆمیسۆن»:

١- یەکەمین کاری هێز برێتی بووە لە چەکدارکردنی سوارەگەلی خۆوڵاتی لە دژی بارزانییەکاندا کە ئەم کارە لە هەمبەر بارزانییەکاندا ئەنجامێکی کاریی نەبووە، دەبوو لەجێیی ئەم کارە یان تەبای ئەو کارە، پاش زانینی هاتنی بارزانییەکان بۆ ناو ئاخی ئێران بێ وچان یەکەگەلی سوپا کە لە ورمێ لە بن دەستی فیرقەدا بوون بێ چواندنی کات واتە هەر لە ڕۆژی شەشەمدا بەرەو لای مەوانا رابدرایەن، بەم پێیە لە ناردنی بە پەلەی

یەکەگەلی سوپادا سستی نواندراوە.

٢- کاروانی عەقید سەردادوەر ڕۆژی ٧ و شەوی ٨ بەبێ ئەنجام لە لەرنێ وێستاوە و کاتی بەنرخی لەدەست چواندووە. ناوبراو بیانووی ئەوەیە کە لە لەرنێ چاوەڕوانی گەیشتنی ئامێری گواستنەوە بووە بەڵام ئەم بیانووە شایەنی پەسندی نییە و خۆی بەرپرسیارە.

بە ئاوایەکی گشتی لەم قۆناخەدا فیرقە لە ناردنی زۆر بەپەلەی کاروانی سوپادا سستیی نواندووە، هەروەهاش عەقید سەردادوەر لە بەجێ هێنانی ئەرکی پێ سپاردراویدا بێ دەسەڵاتیی کردووە.

کۆمیسیۆن بەم پێیە بڕوای وایە ئەگەر فیرقە هەر بە پەلە یەکەگەلی خۆی هەر لە ڕۆژی شەشەمدا بۆ ڕووبەڕووبوونی بارزانییەکان دەنارد و کاروان لە لەرنێ نەدەوەستا و شەڕ لەگەڵ شەڕخوازاندا ڕووی دەدا ئەوا هەر لەو ڕۆژانەی بەراییدا کێشەکە بەکۆتا دەهات.

چۆنیەتیی کاری سوارەگەلی خێڵان:

١- نەقیب زەرابی تەبای سەد سەر لە سوارەی خێڵان لە بن دەستی عەقید سەردادوەردا بووە کە لە لەرنێ فەرمان بە نەقیبی ناوبراو دەدات مەوانا و بانەکانی ئەوێ بە زووترین کات بگرێ و ئەگەر هاتوو بارزانییەکان بیری دەربازبوونیان لەو بوارەدا هەبێ ئەوا هەتا کاروان دەگاتە ئەوێ، بەرگری بکات. بەڵام بارزانییەکان لە پێش مەواناوە دەرباز دەبن و چ جۆرە چالاکییەکی کاری نایەتە کرن.

٢- رائید سوڵح جۆ تەبای سەد سەر مرۆڤ لە سوارەگەلی خێڵان لە شوێنی پەڕینەوەی بارزانییەکان لە ساردیک(١٧) لە گونبەت بووە و پاش ئاگەدار بوونی لە بوونی ئەوان، لە برێتی ئەوەی ڕاستەوخۆ هێرش بۆ بارزانییەکان ببات، شان بەشانی ڕووباری لوساتی بەتەریبیی هێڵی ڕۆیشتنی ئەوان بەرەو باکور هەڵدەکشێ و سەعات ٩ی ڕۆژی ٩ی مانگ لە نێوان بەردۆک و ئاغچەگوڵ لەگەڵیاندا تێک دەگیرێ و بە قسەی خۆی پێکدادان دەکات. سەر لە نوێ ڕووبەڕووبوون دەپسێت.

بۆچوونی کۆمیسیۆن:

بە شێوەیەکی گشتی لە تەواوی ماوەی کاری ئەم دووایییە لە هەمبەر بارزانییەکاندا

(١٧) مەبەستی لە(سەردیک)ە.

سەرنج دەدرێ کەوا گچکەترین سوود لە تفەنگداران وەرنەگیراوە.

لەلایەکی ترەوە کۆمیسیۆن پێی وایە کە نەقیب زەرابی و رائید سولّح جۆ هەولّیان نەداوە ڕووبەڕووی بارزانییەکان ببنەوە و ئەو ڕووداوەی پێکدادانیش کە دراوەتە پالّ رائید سولّح جۆ بە بۆچوونی کۆمیسیۆن جێی گومانە و دیار نییە، بەلاّم ئەگەر ڕووبەڕووبوون لە نێوان تفەنگدارانی خۆولاّتی و بارزانییەکان ڕووی دابێ بەو پێیەی هێزی رائید سولّح جۆ سوارە و بارزانییەکانیش پیادە بوون ئەم ڕووبەڕووبوونە چۆن ئاوها بە هێسانی پچڕاوە و بارزانییەکان شیاون ملی ڕێی باکور بگرنە بەر هەروەها بەو پێیەی لەم پێکدادانەدا چ زیانێ بە سوارەگەلی رائید سولّح جۆ نەگەییوە.

ئیتر بەم ئاوایە، کۆمیسیۆن لەبارەی کردەوەگەلی سەروو رائید سولّح جۆ و نەقیب زەرابی بە بەرپرسیار دەزانێ.

قۆناغ ٢: پێکهێنانی هێلّی بەستنی قتوورچای

پاش ئەوەی چەلەنگییەکانی هێز بۆ ڕێ لێ برینەوەی بزاوتی بارزانییەکان بەرەو لای باکور تووشاری سەرنەکەوتن هات، سەرکردەی هێز بڕیاری دانانی هێلّی بەستنی گەلیی قتوورچای دەدا و لە فەرمانی ئۆپەراسیۆنی ژمارە ١ (سەعات ٢٤ی ڕۆژی ٩)دا ئاوەها گوتراوە:

ئەلف: بەستنی ڕێگەی دەربازبوونی بارزانییەکان بەرەو باکور لە گەلیی خوی -قتوور- سنوورەوە بە یاریدەی چوار کەتیبە.

ب: بەدواکەوتنی بەپەلەی بارزانییەکان لە باشوور بە یاریدەی کاروانی تەرگەوەڕ (عەقید سەردادوەر) کە ئەرکی ئەوەی هەیە بارزانییەکان بەرەو شوێنگەی قتوور پالّ بدات (ئەم کاروانە بەیانیەی ڕۆژی ١٠ سەبارەت بە نەبوونی وزەی وەدواکەوتن، بۆ ورمێ و شاپوور بانگهێشتن دەکرێتەوە و ئەم بەشەی فەرمانی ئۆپەراسیۆن بەو شێوەیەی چاوەڕوان کرابوو، ئیتر بەکردەوە جێبەجێ ناکرێت).

چۆنیەتیی جێبەجێ کردنی ئەم بڕیارە، بەشێوەی خوارەوە لە لایەن سەرکردایەتیی هێزەوە چاوەڕوان کرابوو:

- کاروانی گەلیی قتوور پێک هاتبوو لە چوار کەتیبەی پیادە، سریەیەک هاوەن، چوار تانکی شەڕی، تۆپێکی ٧٥ی، سریەیەک سوارە، دەزگەیەکی بێتەل، سەرکردایەتیی هێلّی

قـتوور به عـەقـیدی پیادە نیسـاری و یاریدەریی عـەقـید فـولادەوەند دەسـپـێـردرێ.
سەرپەرشتیی تەواوی کردەوەگەل دەخرێتە ستۆی عەمید بێلگەریی جێگری فیرقەوە.

بۆ بەجێ گەیاندنی فەرمانی سەرەوە، عەمید بێلگەری فەرمان دەدات بە سەرکردایەتیی گەلیی قتوور(عەقید نیساری) کەوا هەتا دەمەو ئێوارەی ١٢/٣/٢٦ کەتیبەگەلی ئەرک پێدراو بۆ بەستنی قتوور لە شوێنگەکانی خوارەوە بنەجێ بن:

| | |
|---|---|
| کەتیبەیەک لە ئەستەران (رائید زرێپۆش) | مقدەم نەفیسی |
| کەتیبەیەک لە زەرێ (رائید پرهێزکار) | مقدەم نەفیسی |
| کەتیبەیەک لە قتوور(رائید نەوابی) | عەقید فولادوەند |
| کەتیبەیەک لە رازی (عەقید فولادوەند) | عەقید فولادوەند |

نیوەشەوی ١٣-١٤ وێرای ئەوەی هەر چوار کەتیبە لە شوێنگەی دیاریکراویان بنەجێ بووبوون بەڵام بارزانییەکان بەبێ پێکدادان لە تێپەرگەی نێوان مەخیل و حەبەشەوە بەرەو باکوری گەلیی قتوور دەرباز دەبن و بەم ئاوایە گچکەترین ئەنجام لە هێڵی بەستنی قتوور بەدی نایەت و سەرهەتاپێی چەلەنگیی فیرقە لەم قۆناخەی ئۆپەراسیۆندا بێ مایە دەبێ.

بۆچوونی کۆمیسیۆن:

١- چوار کەتیبەی دامەزراو لە شوێنگەی قتوور لە راستیدا بەهیچ بارتێک هێڵی بەستنیان پێک نەهێنابوو، بگرە هەر یەک لە گوندێ وەک لە مۆڵگەیەک بۆ خۆی هێوربببوو، هیچ جۆرە کەسانێکی سوپایی بە پانایی‌دا بۆ پێوەندی دامەزراندن، یانەخۆ بەرەوپێش بۆ سەراسۆیی و هەڵهێنجانی زانیاری لە بارەی شوێنی بارزانییەکان و ئەوەی ئاخۆ بەرەو کێـهـە لا دەرۆن، نەناردرابوون. بەڵگەی پێ ناوێ ئەم شێوازە کارە و بەرچاوکردنی ئەوەی درێژیی گەلییەکە (نێزیکەی ٧٠ کیلۆمەترە) بەو شێوەیەی کەتیبە ئەرک پێدراوەکان دامەزرابوون نەدەکرا گەلیی ناوبراو ببێ بە لەمپەرێک لە پێش تێپەرینی بارزانییەکاندا.

٢- لەم ئۆپەراسیۆنەدا، سەرکردایەتی بەواتەی راستی هیچ هەبوونەکی دەرەکیی نەبووە، عـەمـیـد بێگلەری کارێکی لە سەرکردایەتی و بەرێوەبەریەتیی کردەوەی هاوبەشی ئەم هێزانەدا بەجێ نەگەیاندووە و عەقید نیساری ئەو کاتە گەیشتووەتە شوێنگەی قتوورچای چەند سەعاتێک پێشتر بارزانییەکان ئاوابووبوون.

٣- کەسانی کۆکەرەوەی زانیاری کە ببنە مایەی سوود وەرگرتنی ئۆپەراسیۆن بەشێوەیەکی لەبار بەکار نەبراون و کاتێکیش یەکێکی گوندەکی سەعات ٢ی ڕۆژی ١٤ی مانگ لە راویان دێتە نک عەقید نەفیسی و پێی دەڵێ بارزانییەکان سەعات ١٨ لە راویانەوە نیازی بەرێ کەوتنیان هەیە، ئەفسەری ناوهاتوو سوود لەم زانیارییە وەرناگرێ بگرە بەپێچەوانەوە گومان لە کابرای زانیاریدەر دەکات و راگیری دەکات.

بەپێی شرۆڤەکردنی ژۆر، لە ئۆپەراسیۆنی گەلیی قتووردا: عەمید بێلگەری، عەقید نیساری، مقدم نەفیسی بە بەرپرس دادەنرێن. لەکاتی کۆڵینەوەی فایلی ئۆپەراسیۆنی دواییدا کۆمیسیۆن سەرنجی کەوتەسەر راپۆرتی ١٠٥٩-٢٦/٣/١٤ سەعات ٢٣ی لیوا هومایوونی کە ناواخنەکەی بەشێوەیەی خوارەوەیە:

«بارزانییەکان هێشتا لە باشووری هێڵی قتووردان، فەرمان بە عەمید بێگلەری دراوە کەسانێکی سووکەڵەی بزێو بەرەوپێش بنێرێ بۆ سەراسۆیی» . لەوکاتەیدا کە تەواو بەر لە ٢٤ سەعات (سەعات ٢٣ی ڕۆژی٢٦/٣/١٣ بارزانییەکان لە هێڵی قتوور پەڕیبوونەوە. کۆمیسیۆن گومانی هەیە لەوەی کاتێ لیوا هوومایونی تێلێگرافی سەرەوەی ناردووە لە دەربازبوونی بارزانییەکان بێ ئاگابووبێ بەتایبەتیش کە هەر لەم راپۆرتەدا بۆچوونی لیوا هومایوونی ئەوە بووە یەکەگەلی سوپایی بۆ ماکۆ و خاڵانی باکور بنێردرێن و ئەگەر گریمان سەرکردایەتیی هێز بەراستی ٢٤ سەعات پاش دەربازبوونی بارزانییەکان لە گەلیی قتوور لە بابەتەکە بێ ئاگابووبێ ئەمە واتای خراپیی بەڕێوەبردنی کردەوەگەل و لاوازیی سەرکردایەتیی هێز دەگەینێ.

پاش دەربازبوونی بارزانییەکان لە هێڵی قتوور ئیتر هیچ جۆرە چالاکییەکی بەپەلە بۆ راوەدوونانی ئەوان لە لایەن کەتیبەگەلی نێزیک بەتێپەڕگەکان نەکراوە و هیچ جۆرە کارێکی گرینگ لەلایەن سەرکردایەتییەوە جێبەجێ نەکراوە. هەرچەندە بارزانییەکان پاش دەربازبوون لە گەلیی قتوور، لە کەلیت بینران، بەڵام هیچ سوودێک لەم زانیارییانە وەرنەگیراوە و لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەواندا دەتوانین بڵێین خۆ دراوەتە لا.

قۆناغ ٣: ڕووداوی شووت

پاش ئەوەی بارزانییەکان لە گەلیی قتوور دەربازبوون، سەرکردایەتیی هێز بڕیاری دا بارزانییەکان لە ناوچەکانی سەروو وەرگیر بێنێ و لە ناویان ببات. بەم مەبەستە لە مێژووی ٢٦/٣/١٦ بەپێی نووسراوی (ژمارە ٤٥ی خولاوە) فەرمان لەلایەن سەرکردەی

هێزەوە بە عەمید زەنگەنە دەدرێ هەر بەپەلە لە کاروانگەلی جۆراوجۆر هێزێکی هاوبەش لەپێناو بەستنی رێبازگەکانی نێوان بازرگان و پول دەشت پێکەوە بنێ و، چیش پێویست بێ لە بن دەستی ناوهاتوودا دابنرێ.

بەیانیەی رۆژی ۲٦/۳/۱۹ رازانەوەی هێزگەل بەم ئاوایەی خوارەوە بوو:

چوار کەتیبە لە ساری ئۆجاخەوە هەتا خندۆر و قزلداغ.

لەشووت کەتیبەیەک (سریەیەکی کەم) لەگەڵ ٤ زرێدار و سریەیەک سوارە و سریەیەک رشێنەک، سریەیەک تۆپی ۷۵ی بەسەرکردایەتیی عەقید سەردادوەر.

رێگەی نێوان قزلداغ هەتا شووت و مەرگن، ۱۸۰ سەر جەندرمە.

لە سەکار کەتیبەیەک پیادە (سریەیەکی کەم- سریەی دووپەلی) وێرای سریەیەک سوارە و ٥۰ سەر سوارەی ناوچەیی.

سەد و حەفتا سەر تفەنگداری سوارەی ناوچەیی بەسەرکردایەتیی عەقید زەلتاش لە یوموورى داش و ئاخداش.

کەتیبەی رائید زرێپۆش کە چاوەڕوان بوو لەگەڵ رازانەوەی عەقید سەردادوەردا لە شووت دابمەزرێ (هەتا سەعات ۱٥ی رۆژی ۱۹ی مانگ لە خوی بووە).

بارزانییەکان لە شەوی ۱۹ی مانگدا لە ناوچەی نێوان زێنوێکانی سەکار و یوموورى داش و ئاخداشدا بوون.

ئۆپەراسیۆنی یەکەگەلی سەروو لە رۆژی ۱۹ی مانگدا

۱- چوار کەتیبە کە لە نێوان سنووری بازرگان هەتا ماکۆ- خندوور و قزلداغ جێگیر بووبوون بەشدارییان لە ئۆپەراسۆندا کردووە.

۲- سوارەگەلی عەقید زەلتاش بەگوێرەی راپۆرتی ئەفسەری ناوهاتوو سەعات ۸ی بەیانیەی رۆژی ۲٦/۳/۱۹ لە ئاقداش ڕووبەڕووی بارزانییەکان بوونەتەوە و راپۆرتیان بەسەرکردەی هێز داوە، بێ لەمە ئەفسەری ناوهاتوو کارێکی لەباری نەکردووە.

۳- عەقید زەلتاش تەبای هێزی خۆی لە زێنوێکانی سەکار و سوسووز لە تەواوی رۆژی ۱۹و شەوی ۲۰ ی مانگدا بە ئاگرهاوێتنی دووراودوور لەگەڵ بارزانییە رێ وەپێشدەرەکانی نێوان بەرزاییەکانی یوموورى داش -ئاقداش- سەکاردا بەس (اکتفا)یان کردووە.

٤- عەقید سەردادوەر سەعات ٦ی بەیانی بەهۆی تفەنگدارانی خۆولاتییەوە ڕووبەڕووی بارزانییەکان بووەتەوە و سەعات ٨،٣٠ بەرەو داش فیشل بزواوە و فەرمانی بەکەتیبەی سوارەگەل داوە زارگەلیی (یەلی دەرە) بگرن.

بە گوێرەی ئاخاوتنی عەقیدی ناوهاتوو نیو سەعات دوای نیوەڕۆ دوو سریەی پیادە بە پاڵپشتیی رشێنەک و هاوەن و لەگەڵدابوونی چوار تانکی شەڕی، بەرەو بانەکان مل دەنێن بەڵام تانکەکان سەبارەت بە چەوتیی زەوییەکە گیردەبن و پیادەش کتوپڕ دەکەونە بەر پەلاماری لە نێزیکەوەی - بەنارنجۆک و تفەنگی، بارزانییەکان. شەڕەکە شەڕی دەستەویەخە بووە و دەوروبەری سەعات ١٥ پاش گەیشتنی باڵەفڕ و بۆمبابارانی شوێنگەی بارزانییەکان ئەوجا یەکەگەلی پیادە توانویانە خۆیان لە شەڕ دەرباز بکەن و بەرەوپاش بکشێنەوە.

ئاگرهاوێژی هەتا سەعات ٢٠،٣٠ بەردەوام دەبێ و پاشان دەبڕێ.

٥- کاری رائید زرێپۆش: لە تەواوی ئەم کەتیبەیە کە هەتا سەعات ١٥ی ڕۆژی ١٩ی مانگ لە خوی بووە، لە سەعات ٢٠دا شەش لۆریی هەڵگری ناندین و رشێنەکی گەورەوگران و چل سەر سەربازی بەچەک دەگەنە ماکۆ، دەسبەجێ بەپێی فەرمانی سەرکردەی فیرقە رائید زرێپۆش تەبای لۆرییەک و چل سەرباز بە هەڤاڵەتیی عەقید روکن غەفاری کە خۆی سواری تانک دەبێ بەرەو شووت بەرێ دەکەون، لە قزلداغ لۆرییەکە لەناکاو دەکەوێتە بەر پەلاماری پیاوخراپان و عەقید غەفاری کە لە پێشەوە لەناو تانکی شەڕیدا بووە بەرەوپێش داژوا و پاشان دەگەڕێتەوە شوێنی پێکدادان و ١٦ سەر سەرباز و عەریفێک و سەرکردەی کەتیبە بریندار دەبن و ٥ سەر کەسیش دەکوژرێن کە هەڵدەگیرێنەوە.

بۆچوونی کۆمیسیۆن:

١- سەرکردەی هێز لە چوار کەتیبەکەی کە لە نێوان بازرگان و قزلداغ هێوریبوون سوودی وەرنەگرتووە و پێکدادان تەنیا بە هۆی دوو کەتیبەی پیادەوە ڕووی داوە، لە کاتێکدا کە نیشانەی شوێنەواری ٢٤ سەعاتی رابردوو پێشانی دەدا بارزانییەکان ڕوویان لە تێپەڕگەی قزلداغ بووە و لەلایەکی تریش جادەی سەرەکی بۆ گواستنەوەی یەک دوو کەتیبە لە چوار کەتیبەی ناوبراو لە توانادا بووە و بەهەبوونی ئامێری بارهەڵگری و گواستنەوە، جێگۆڕکێ دەهاتە دی. هەروەها ئامێرەکان لە کاتی خۆیدا ئامادە نەکراون بۆ ئەوەی

کەتیبەی رائید زرێپۆش بخرێتە رێ و نەیتوانیوە لە رازانەوەی چاوەڕوانکراوی بەشەکەی عەقید سەردادوەردا لە شەڕ بەشداری بکات.

هیچ جۆر پێوەندی و بەندیوارییەک لەنێوانی یەکەگەلدا نەبووە، عەقید زەلّتاش هەر لە بنەڕەتەوە لە بوونی بەشە سوپاییەکان لە شوێنە دیاریکراوەکاندا بێ ئاگا بووە، جگە لەمەش هیچ جۆرە یارمەتی و باربووکردنی یەکتر لە نێوان یەکەگەلدا نەبووە و کارێکی گونجاو لەلایەن سەرکردایەتییەوە لەم ئۆپەراسیۆنەدا جێبەجێ نەکراوە.

٢- عەقید زەلّتاش شەڕ و پێکدادانی بە ئاوایەکی پێویست بەجێ نەهێناوە و بەرووبەڕووبوونی دووراودوور و راپۆرت ناردن و وازی هێناوە (وەک زانرا سوارەگەلی خێڵانی سەر بە عەقید زالّتاش دوای کوژرانی یەک سەر چەکدار بەرەو دوا هەڵاتوون).

٣- بەرپرسیارەتییەکی گران لە ئەستۆی عەقید لەشکری - دایە کە هەرچەندە زانیویەتی عەقید سەردادوەر تووشی شەڕبووە بەڵام بچووکترین یارمەتیی بۆ ناوبراو نەبووە و لە تەواوی رۆژی ١٩ی مانگ و شەوی ٢٠دا لە شوێنی خۆیەوە خەریکی ئاگرهاوێشتنی بێ سوود بووە.

٤- عەقید سەردادوەر: بە شێوەیەکی تێکڕایی ئەو هۆیانەی بوونەتە ماکەی زیان گەیاندن بە یەکەگەلی ئەم کاروانە و دەربازبوونی بارزانییەکانیان لە ناوچەکەدا ئاسان کردووە، بەشێوەی خوارەوەیە:

أ- سەراسۆ نەکردنی ناوچەی کار و، نەبوونی وردایەتی و ژیریی عەقید سەردادوەر لە دانانی پلاندا.

ب - بێ سپێرکاری «احتیاط» لە بەرەوپێش ناردنی سریەگەل بێ ئەوەی بیر لە بوونی دوژمن کرابێتەوە.

ج - نەگەیشتنی کەتیبەی رائید زرێپۆش بەشوێنی خۆی لە پێناو پاڵپشتی لەم کارانە.

د - سوود وەرنەگرتنی راست لە بەشی سوارە، بەم جۆرە عەقید سەردادوەر بە بەرپرسیار دەزانرێ.

٥- بەشەو رەوانە کردنی لۆریی رائید زرێپۆش و تانکی عەقید غەفاری کارێکی بێ سوود بووە کە بەبێ سپێرکارییەکی تەواو جێبەجێ کراوە و بووەتە مایە لە خافڵەکی لێدان و زیانی گیانیی زۆر و زەوەندە.

بە شێوەیەکی گشتی لە هەموو ئۆپەراسیۆندا: کاری سەرکردایەتیی لە پێناو جێبەجێ کردن و رێکخستنی هەوڵی یەکەگەلی جۆراوجۆر و، دەرکردنی فەرمانگەلی دەسبەجێ و لە شوێنی خۆ، بۆ هێنانە کایەی کاری تەبایی لە نێوان هێزگەلی جۆراوجۆری ئۆپەراسیۆن و بەگەڕخستنی هەوڵ لە پێناو کۆجێکردنی هێز لە بەرامبەر دوژمندا نەهاتووەتە دی و، پاش رووبەڕووبوون لەگەڵیاندا هەلی هەڵاتن و خۆ رێکدانەوەیان بە دوژمن داوە. سەرکردایەتی هیچ جۆر سپێرکارییەکی نەبووە. بۆیە ئۆپەراسیۆن شێوەیەکی پچڕ پچڕی گرتووەتە خۆ کە لە سێ قۆناخی پێشوودا چەند رۆژ لە نێوان هەریەکەیاندا هەبووە و بووەتە هۆی زاڵ نەبوونی هێزی سوپا.

ئیمزا: فەریق شابەختی، لیوا خەسرۆوانی، عەمید گورزەن، عەمید وەسووق

## ١٤

## هەڵسەنگاندنی یەکجارەکیی لێژنەی توژینەوە لەبارەی کاری ئەفسەرانی سەرکردەی کردەوەگەلی بارزانی

نووسراوی دانیشتن

نیشان بە فەرمانی ژمارە ٢٠٢٣ /أ- ٢٦/٣/٢٦

ئەرکانی سوپا بۆ توژینەوە لە کردەوەگەلی فیرقەی ٤ لە هەمبەر بارزانییەکاندا کە لە مێژووی ٢٦/٣/٢٠ هەتا مێژووی ٢٦/٣/٢٠ درێژەی کێشاوە و بەزاڵ نەبوون کۆتای پێ هاتووە، لێژنەیەک بەسەرۆکایەتیی فەریق شابەختی - سەرۆکی پشکنینی ناوچەی ٢ و ئەندامەتیی لیوا خەسرۆوانی - جێگری ئەرکانی سوپا، عەمید گورزەن - سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتیی بەسەربازگری «تجنید» و عەمید وەسووق - سەرۆکی روکنی سێیەمی ئەرکانی سوپا لە ماکۆ پێکەوەنرا و لە رۆژانی ٢٤-٢٧ی جۆزەردانی ١٣٢٦دا لە شاری ناوبراو دەستی دایە کۆڵینەوەی فایل و توژینەوە لە سەرکردەی فیرقە و تەواوی ئەفسەرانی بەرپرس، ئەنجام بەشێوەی خوارەوە بوو:

کردەوە و رابوونەکانی فیرقە لە دژی بارزانییەکاندا دابەشی سێ قۆناخی خوارەوە دەکرێت:

قۆناخی یەکەم: کردەوە پێشینەکانی فیرقە لە پێناو ڕێ لێ بڕینی بارزانییەکان لە دەربازبوون بەرەو باکور و تەفروتووناکردنیان.

قۆناخی دووەم: کردەوەکانی فیرقە لە پێکەوەنانی هێڵی ڕێ لێ بڕی لە نێوان خوی-گەلیی قتوور و سنووردا.

قۆناخی سێیەم: کردەوەکانی فیرقە لە ڕێ لێ بڕینی پەلهاوێشتنی بارزانییەکان پاش دەربازبوونیان لە گەلیی قتورەوە بەرەو ناوچەکانی باکور و، پێکەوەنانی هێڵی لە گەمارۆ کێشانیان لە دەوروبەری ناوچەی ئاقداش- یومووروداش (ئەو شوێنانەی لە ڕۆژی ١٨دا بارزانییەکان لێی هێوریبوون) و ڕووداوی شووت.

کردەوە و ڕابوونی فیرقە لە هەرسێ قۆناخدا تووشی سەرنەکەوتن هات و لە ڕووداوی شووتدا یەکەگەلی فیرقە ٣١ کەسیان زیان لێ کەوت و ٣٥ کەسیش بریندار بوون.

فەرمان و ڕاسپێرییەکانی ئەرکانی سوپا بۆ سەرکردایەتیی فیرقەی ٤ لە بارەی بارزانییەکانەوە ڕوون و ڕاشکاو بووە:

پێکەوەنان و وەگەڕخستنی کاروانگەلی بژاردە لە ژێر سەرکردایەتیی ئەفسەرانی لێهاتوو، دەسوەشاندنی بەپەلە لە پیاوخراپان، سەرکوتینەوە و تەفروتووناکردنیان لە کەمترین کاتدا، سوود وەرگرتن بە پێی دەسەڵات لە هەموو کەسان و یەکەگەلی تر (بەتایبەتی سوارە) لەپێناو بەجێ گەیاندنی فەرمانگەلی سەروو، ئەرکانی سوپا کە ڕۆژ بەڕۆژ لە چالاکی و کردەوەگەلی فیرقە ئاگەدار دەبوو جگە لە دەرکردنی فەرمانی تایبەت بەشوێن و بارودۆخی ڕۆژانە، هەروەها پێداپێدا فەرمانگەلی سەرەوەشی دووپات دەکردەوە.

سەرۆکایەتیی پشکنینی ناوچەی ٢ش فەرمانگەلێکی لەمەڕ سەرکوتینەوەی بارزانییەکان داوەتە سەرکردایەتیی فیرقەی ٤ کە چۆنیەتیی ئەو فەرمانانە لەگەڵ فەرمانگەلی ئەرکانی سوپادا تێک دەکەنەوە.

کردەوەکانی فیرقە و یەکەگەلی پێوەندیدار لە هەر سێ قۆناخی پێشوودا، لەلایەن لێژنەوە کەوتوونەتە بەر تۆژینەوە و کۆڵینەوە و ڕاوێژ، کە ئەنجامەکەیان لە شەش ڕووپەلدا پێشکێش دەکرێ. کۆڵینەوە و تۆژینەوەی لێژنە (کۆمیسیۆن) لەو ڕۆژە دیاریکراوانە و سەبارەت بەو یەکەگەلە پێوەندیدارە بووە کە کردەوەی ئەوان لە دیاریکردنی چارەنووسی بارزانییەکاندا کارا بووە.

دەسخەڵەتی و گوێ پێ نەدان و سستی نواندن، هەروەها ناوی ئەو ئەفسەرانەی کە لە ئۆپەراسیۆندا بە بەرپرسیار دانراون لە رووپەلە پێوە بەستراوەکاندا شرۆڤەکراون. وێڕای ئەمەش بۆچوونی گشتی و ئەنجام وەرگریی کۆمیسیۆن لە بواری کردەوەکانی فیرقە و یەکەگەلی پێوەندیدار لە دژ بەدژی بارزانییەکاندا بە شێوەی ژێرەوە دەخرێتە ڕوو:

١- لاوازیی سەرکردایەتی: کردەوەگەلی دژ بە بارزانییەکان بەشێوەیەکی نابەجێ بەڕێوەبراون.

٢- یەکەگەلی فیرقە بەلایەنی زۆرەوە لەکات و شوێنی پێویستدا سوودیان لێ وەرنەگیراوە.

٣- بە تایبەتی، سوودی پێویست و بەکار لە سوارەگەلی فیرقە وەرنەگیراوە.

٤- بە دواکەوتنی بارزانییەکان، ڕووبەڕووبوون و سەرکوتینەوەیان بەپەلە جێبەجێ نەکراوە بگرە بە پێچەوانەوە بەدواکەوتنیان بەشێنەیی بووە.

٥- تەنانەت ئەو بیرەش بۆ لێژنە سەری هەڵداوە کە کاروانگەل لە ڕووبەڕووبوونی تەواو لەگەڵ پیاوخراپاندا خۆیان داوەتە لا.

٦- سەرکردەی فیرقە هەر لە سەرەتا هەتا بنەتای ئۆپەراسیۆن سەبارەت بەو ئەفسەرانەی لە بەجێ هێنانی فەرماندا کەمتەرخەمییان نوواندووە و گوێیان نەداوەتێ، چاوی پۆشیوە. کاری ئاگەدارکردنەوەی بە توندی نەکراوە لە کاتێکدا کە بابەتی ئاگەدارنەکردنەوە و سزانەدانی ئەفسەرانی هەڵەکار لەکاتی کردەوەدا، کاریگەرە.

٧- لە نێوان قۆناخە جۆراوجۆرەکانی ئۆپەراسیۆن و پاش ڕووبەڕووبوون، کاتی گرینگ بەفیڕۆ لە دەست ڕۆیشتوون و هەلی وا بە بارزانییەکان دراوە کە لە یەکبینە ڕووەو باکور بڕۆن.

٨- فەرمانە جۆراوجۆرەکانی فیرقە سەبارەت بە شوون هەڵگرتنی بارزانییەکان، کارێکی بەگریان و لەسەر ڕووپەڕە بووە کە هیچ کات کاروانگەلی جۆراوجۆر بەشێوەی کاریگەر فەرمانی وەدواکەوتنی ئەوانیان بەجێ نەهێناوە.

٩- لەو شوێنانەش کە ڕووبەڕووبوون ڕووی داوە، دەمودەست پچڕاوە و ئیتر کارێکی بەجێ نەکراوە، پیاوخراپان بە تەواوەتی سوودیان لەم بارودۆخە وەرگرتووە.

١٠- لە سازدانی کەسانی تفەنگدار، سوودی تەواو نەهاتووەتە دی.

١١- له ڕێ بڕینه‌وه‌ی بارزانییه‌کان له هێڵی گه‌لیی قتووردا سستی و گوێ پێ نه‌دان به ئاشکرا به‌رچاو ده‌که‌وێ.

١٢- ڕووداوی شـووت کـه بوو به‌مـایه‌ی زیانی گـه‌وره‌ی گـیـانه‌کی و ده‌ربازبوونی بارزانییه‌کان، هۆیه‌که‌ی ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ: چه‌وتییه‌کانی سه‌رکردایه‌تی، گوێ پێ نه‌ده‌ری و ناوردییه‌تی له رازاندنه‌وه و سستی و که‌مته‌رخه‌می و به‌شداری پێ نه‌کردنی هه‌وڵه‌کان - له‌لایه‌ن جێبه‌جێ که‌رانه‌وه که له ڕووپه‌ڕه‌کانی پێوه‌لکاودا شرۆڤه‌کراوه.

١٣- ئامـێـرگـه‌لی بارهه‌ڵگری و گـواسـتنه‌وه شـێـوه‌یه‌کی ڕێک و ڕه‌وانی نه‌بووه. ژمـاره‌یه‌کی به‌رچاو له لۆرییـه‌کـان له‌وانه‌بوون کـه نوێ کـرابوونه‌وه، ته‌نانه‌ت له‌وه‌ش کـه هه‌بووه سـوودی ته‌واویـان بۆ گـواسـتنه‌وه و جـێگۆڕکـه‌ی یه‌کـه‌گـه‌ل له‌کـاتی پێـویسـتـدا لێ وه‌رنه‌گیراوه.

ئیمزا: فه‌ریق شابه‌ختی، لیوا خه‌سرۆوانی، عه‌مید گورزه‌ن، عه‌مید وه‌سووق

ماکۆ - ١٣٢٦/٣/٢٧

# پاشکۆکان

لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا، حەزدەکەین بیروبۆچوونی ژمارەیەک لە نووسەران و سیاسەتوانان و لێکۆڵەوانی کورد و بیانی لەبارەی خەبات و تێکۆشانی بارزانیی نەمرەوە بخەینە بەرچاوی خوێنەرانی ئازیزی کورد.

وێڕای ئەمەش لیستێک لەبارەی ناو و زانیاری و بەسەرهاتی پێشمەرگەکانی هەڤالی بارزانیی نەمر لە ڕێگەبڕینە مێژووییەکەی ساڵی ١٩٤٧دا.

دواجاریش فەرهەنگۆکێک بۆ لێکدانەوە و شرۆڤەی وشە گرانەکان.

# خەبات لە پێناوی ئازادیدا

**نووسینی: د. عەبدولڕەحمان قاسملو**

ئەم باسەمان لە کتێبی «چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی، کورتەیەک لە مێژووی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، نووسینی: د. عەبدولڕەحمان قاسملو، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، ١٩٨٨، لاپەڕە ١٢٨ - ١٣٣» وەرگرتووە. بەڵام سەرباسەکە لە لایەنی ئێمەوە دانراوە و ڕێنووسەکەشی کراوە بەهەمان ڕێنووسی ئەم کتێبە.

هێندێک چەک و تەقەمەنی کە لە ئەمبارەکانی کۆماری مەهابادا مابوو بارزانییەکان بردیان کە بریتی بوو لە ٣٠٠٠ تفەنگ و ١٢٠ قەبزە تیربار و ٢ تۆپ و هێندێک نارنجۆک. بارزانییەکان ئەو کاتەی ئازربایجان ڕووخا و ئەرتەش بۆ لای مەهاباد پێشڕەوەی کرد لە جەبهەی سەقز و تکاوەوە خۆیان گەیاندە دەوروبەری بۆکان و لەوێڕا چوون بۆ دەوروبەری مەهاباد. دەبێ بگوترێ کە پاشەکشەیان زۆر ڕێکوپێک و خێرا بوو. پاش گەیشتنی لەشکر بەمەهاباد لە ڕۆژی ٢٩ی سەرماوەز (٢٠ی دیسامبر)دا مەلا مستەفا بارزانی چوو بۆ شاری مەهاباد بۆ دیتنی سەرتیپ همایوونی و پێشنیاری کرد کە دەوڵەتی ئێران لە دەوڵەتی بریتانیا تەزمین وەربگرێ بۆ ئەوەی بارزانییەکان بتوانن بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان و بچنەوە عیراق. سەرتیپ همایوونی کە دیارە خۆی نەیدەتوانی بڕیار بدا، پێشنیاری کرد کە مەلا مستەفا بچێ بۆ تاران. ڕۆژی ٣٠ی سەرماوەز (٢١ی دیسامبر) مەلا مستەفا لەگەڵ «میرحاج ئەحمەد، عیزەت عەبدولعزیز، نووری ئەحمد تەها» پێکەوە لەگەڵ سەرهەنگ غەفاری چوون بۆ تاران و نیزیک مانگێک لە باشگای ئەفسەرانی تاران مانەوە. پاش وتووێژێکی زۆر، دەوڵەتی ئێران پێشنیاری بەبارزانییەکان کرد کە لە داوێنی چیای ئەڵوەند نیزیک هەمەدان نیشتەجێ بن و رایگەیاند کە ئامادەیە تا شەش مانگ هەموو خەرجی خواردن و ژیان و مانەوەیان بداتێ. مەلا مستەفا بەرواڵەت ئەو پێشنیارەی قبووڵ کرد و ڕۆژی ٩ی ڕێبەندان (٢٩ی ژانویە) گەڕایەوە بۆ مەهاباد. سەرتیپ همایوونی داوای لێ کرد کە دەسبەجێ ئەو بڕیارە کە لە تاران دراوە بێتە دی، بەڵام مەلا مستەفا داوای ٢٤ سەعات مۆڵەتی کرد بۆ ئەوەی چاوی بەشێخ ئەحمەد بکەوێ و نەزەری ئەویش وەرگرێ. پاش ئەوەی مەلا مستەفا چوو بۆ لای شێخ

ئەحمەد، وەڵامی بۆ هومایوونی ناردەوە کە شێخ ئەحمەد بڕیاری تاران پەسند ناکا. وا دەردەکەوێ کە مەلا مستەفا بۆ خۆیشی هەر پێشنیاری تارانی قبووڵ نەکردبوو، بەڵام لە تاران پێی خۆش نەبوو کە ئەو نەزەرە بەڕاشکاوی بە دەوڵەتی ئێران رابگەیەنێ و رایگرتبوو پاش ئەوەی گەڕایەوە و لە مەترسی دەرباز بوو پێیان بڵێ. بەم شێوەیە بارزانییەکان یەک ریگایان زیاتر نەما ئەویش: بەربەرەکانی کردن بەرامبەر بەلەشکری دەوڵەتی مەرکەزی بوو.

بارزانییەکان کە لە ٢١ی رەشەمەی ١٣٢٥ەوە تا ٢٤ی خاکەلێوەی ١٣٢٤ (١١ی مارس تا ١٣ی ئاوریلی ١٩٤٧) لە چەند جێگا تووشی شەڕی توند لەگەڵ لەشکری ئێران بوون. هێندێک لە سەرۆک عەشیرەتەکان وەک: هەرکییەکان، رەشید بەگ و نووری بەگ لە پێشدا خۆیان لەگەڵ بارزانییەکان خستبوو زۆر زوو تەسلیمی لەشکری شا بوون، لەوەش زیاتر پاشان بوون بەجاش و دەستیان بەشەڕکردن لەگەڵ بارزانییەکان کرد. شەڕی نەڵۆس یەکێک لە شەڕە گەورەکان بوو کە ٢٦ی مانگی رەشەمە رووی دا، ئەفسەرێک و ١٢ سەربازی تیدا کوژران و ٥ ئەفسەر و ٦٨ سەربازیش بەدیل گیران. ئەو تێکشکانەی لەشکری ئێران دەنگی دایەوە و نیشانی دا کە ئەرتەش بەو هاسانییە لە شەڕی خۆیدا دژی بارزانییەکان سەر ناکەوێ. لە ٥ی خاکەلێوەی ١٣٢٦ (٢٥ی مارسی ١٩٤٧)دا سەرتیپ هومایوونی لە ناوچەی حاجی ئۆمەران چاوی بەژەنەڕاڵی عێراقی «عەلی حیجازی» کەوت، حیجازی پێشنیاری بەهومایوونی کرد کە ئەرتەشی عێراق ئامادەیە دژی بارزانییەکان یارمەتیی لەشکری ئێران بدا. هێزە چەکدارەکانی تورکیەش ئامادەییی خۆیان بۆ هاوکاری لەگەڵ لەشکری شا راگەیاند. ئەمەش لە مێژووی نەتەوەی کورددا شتێکی تازە نەبوو، دیاردەیەک بوو کە زۆر جار رووی دابوو. ئێستاش وێ دەچوو دووپات بکرێتەوە. بەڵام هومایوونی ئەو پێشنیارانەی قبووڵ نەکرد، چونکە بەکەسری شانی لەشکری شای دەزانی کە نەتوانێ دەرەقەتی بارزانییەکان بێ و داوای یارمەتی لە لەشکری بێگانە بکا.

بارزانییەکان لە چەند شەڕی دیکەشدا ئازایانە بەربەرەکانییان کرد و سەرکەوتوو بون و بەلەشکری ئێرانیان نیشان دا کە هێزێکی بەتوانان و هێزی چەکداری ئیران لە وزەیدا نییە بەسادەیی بەسەریاندا زاڵ بێ. ئەوە بیروڕای زۆربەی سەرانی لەشکری ئێران بوو و تەنانەت سەرۆکی ستادی ئەرتەشی ئێران رایگەیاند کە سوپای تازەی ئێران (مەبەستی

ئەو سوپایەیە کە لە کاتی هاتنەسەرکاری رەزا شاوە پێک هاتووە) تا ئێستا لەگەڵ دوژمنی هێندە بەهێز وەک بارزانییەکاندا شەڕی نەکردووە. هەر لەو کاتەشدا شا فەرمانێکی دەرکرد کە مەبەستی کوشتن و لەنێوبردنی هەموو بارزانییەکان بەژن و منداڵەوە بوو. لەو فەرمانەدا کە لە ٢٩ی رەشەمەی ١٣٢٥ (١٩ی مارسی ١٩٤٧) داویەتی دەڵێ: «بە فڕۆکە تەواوی بنکەکان و ڕێبازی کۆچ و کۆچباری ماڵە بارزانییەکان و هەروەها تۆپخانەکانیان بۆمباران بکەن، دەبێ تا ١٥ی خاکەلێوەی ١٣٢٦ (٤ی ئاوریلی ١٩٤٧) شەڕ کۆتاییی بێ و کارێکی وا بکەن کە بارزانییەکان نەتوانن دەرباز بن و لەوە زیاتر ئابڕووی ئەرتەش نەچێ.» بەڵام بارزانییەکان ڕۆژی ٢٤ی خاکەلێوەی ١٣٢٦ (١٣ ئاوریل) لە چۆمی گادەر پەڕینەوە و چوون بۆ دیوی عیراق و دەرباز بوون. دیارە هەم ئابڕووی ئەرتەشی شاهەنشاهیی ئێران چوو و هەم ئابڕووی خودی حەمەرەزا شا کە فەرمانەکانی جیبەجێ نەکران.

بارزانییەکان کە ئێرانیان بەجێ هێشت ژن و منداڵێکی زۆریان لەگەڵ بوو، شێخ ئەحمەدی بارزانی لەگەڵ ژن و منداڵ خۆیان تەسلیمی عیراق کرد و بەخشران. هەرچەند مەلا مستەفا داوای لە هێندێک لە ئەفسەرانی عیراق کرد کە خۆیان تەسلیم نەکەنەوە چونکە بڕوای بەرێژیمی عێراق نەبوو، بەڵام ئەو ئەفسەرانە پێیان وابوو کە دەبەخشرێن و ئامادەش نەبوون ماوەیەکی زۆر لە شاخ و داخ بمێننەوە و پێکەوە وێڕای بارزانییەکان شەڕ بکەن، شەڕێک کە ئاکامی دیار نەبوو. بۆیە خۆیان تەسلیمی رێژیمی نووری سەعید کرد. لەوانە چوار ئەفسەری کوردی لەشکری عیراق کە لەگەڵ بارزانییەکان هاتنە ئێران و لە کۆماری کوردستاندا خزمەتیان کرد بەناوی: مستەفا خۆشناو، عەبدولکەریم خەیروڵڵا، محەمەد مەحموود و، عیزەت عەبدولعەزیز بەئیعدام حوکم دران و ڕۆژی ٢٩ی جۆزەردانی ١٣٢٦ بەرامبەری ١٩ی ژوئەنی ١٩٤٧ لەسێدارە دران. ئیعدامی ئەو چوار کەسە تەئسیرێکی زۆر خراپی کردە خەڵکی کوردستان، چونکە زۆر لە کاربەدەستانی دەوڵەتی عیراق کە کورد بوون تکایان بۆ کردن و هەوڵیان دا بۆ ئەوەی لە مردن رزگاریان بکەن، بەڵام سەرنەکەوتن. هەر لەو کاتەدا لەبەرئەوەی لە دوو پارچەی کوردستان خەباتیان کردبوو وەک شەهیدی زۆر خۆشەویست هاتنە بەرچاو. بۆیە ڕۆژی شەهید بوونیان بەڕۆژێک دانرا کە: «ڕۆژی گریان و ماتەم بوو، وەتەن دڵی پڕ لە خەم بوو، چونکە جوانەمەرگانی وەتەن شەهید کران». بەڕاستیش ئەو چوار ئەفسەرە زۆر ئازایانە پێشوازییان لە مردن کرد و لە نامەی خۆیاندا کە پێش شەهید بوون نووسیویانە داوایان لە خەڵکی کوردستان ئەوە بوو

کە ئەو ڕێگایەی ئەوان پێیدا ڕۆیشتوون واتە ڕێگای ڕزگاریی گەلی کورد هەر درێژە پێ بدەن. ئیعدامی ئەوانە دروستیی بۆچوونی مەلامستەفا بارزانیی دەرخست کە ئامادە نەبوو بەهیچ جۆرێک بڕوا بەوەعدە و پەیمانی حکوومەتی عیراق بکا.

مەلا مستەفا بارزانی و ٥٠٠ کەس لە بارزانییەکان کە بەدڵخوازی خۆیان لەگەڵی کەوتن ڕۆژی ٦ی جۆزەردان لە ڕێگای تورکیەوە گەڕانەوە بۆ ئێران و پاش چەندین شەڕی قارەمانانە و بڕینی زیاتر لە ٣٠٠ کیلۆمیتر ڕێگا لەگەڵ ئەوەی پتر لە ١٠،٠٠٠ کەس لە لەشکری ئێران بۆ لێدان و پێشگرتنی ئەوان تەرخان کرابوو، توانییان ڕۆژی ٢٦ی جۆزەردان واتە پاش بیست ڕۆژ ڕێگابڕینی بێ وەستان و بێ ماندووبوون لە چۆمی ئاراز بپەڕنەوە و پەنا بۆ یەکیەتیی سۆویێتی بەرن.

بەربەرەکانی و شەڕی بارزانییان دژی لەشکری شا ئەو ڕاستییەی سەلماند کە نەک هەر دەکرا دژی ئەم ئەرتەشە بەربەرەکانی بکرێ، بەڵکوو ئیمکانی سەرکەوتنیش هەبوو. ڕاستە کە بارزانییەکان تاقیکردنەوەی شەڕیان زۆر بوو، بەڵام لە ناوچەی کوردستانی ئێران ناشارەزابوون و ژمارەشیان کەم بوو. شەڕی بارزانییان تا ڕادەیەک ئاشبەتاڵی کۆماری کوردستانی قەرەبوو کردەوە و تا ئەندازەیەک هەستی لەخۆ دڵنیابوونی خەڵکی کوردستانی - کە تێک شکابوو، بردە سەرێ. هەروەها شوێنەواری خراپی لەنێوچوونی کۆماری کوردستان و هەموو جووڵانەوەی دیموکراتی ئێرانی تا ڕادەیەکی زۆر لەبەین برد و ئەو بڕوایەی بەهێز کرد کە لەشکری شا و دەوڵەتی مەرکەزیی ئێران هێزی لەشکان نەهاتوو نین و ئیمکانی ئەوە هەیە لە شەڕ لەگەڵ جووڵانەوەیەکی پێشکەوتووی گەلی کورددا تێک بشکێن. بەکورتی، بەتەواوی دەرکەوت کە هەموو کاتێک گەلی کورد توانای هەیە بەرامبەر بەهێزی دەوڵەتی مەرکەزی ڕابووەستێ و بەربەرەکانیی بکا.

# بارزانی

**نووسینی: هەژار موکریانی**

## لەشوێن چوونێک

لە پێشەکیی ئەم کتێبەدا (مەبەست لە کتێبی «شەرەفنامە»یە کە ئەم وتارە وەکو پاشکۆیەک لەوێدا بڵاوکراوەتەوە) لە ڕووپەڕی سەد و پەنجا و هەشتەم وتوومە: ئێستا لە مانگی نۆیەمی ساڵی ١٩٧٣ قەیرانی شەش مانگمان ماوە بەڵێنی خودمختاریدان بە کوردان لە عێراقدا بە کردەوە بێتە بەرچاو.

قەیرانەکە دواییی هات و بەڵێنی بەعسی پێک نەهات و ناچارکراین توشی شەڕ و ماڵوێرانی ببینەوە. لەم شەڕەدا شۆڕش شکا و شۆڕشگێڕ ئاوارەکران. هۆی ئەو شکانەمان چی بوو؟

من گەرەکمە بەپێی توانا و بە سەرچڵی بڕوام لەمەڕ ئەو ڕووداوە ئاشکرا کەم. بۆ ڕوون بوونەوەی مەبەستیش زۆر بەپێویستی دەزانم زۆر بەکورتی و هەڵقرچاوی مێژووی بارزان و بارزانی و دامەزران و کارامەییی حیزبی پارتی و هاوکارانی مەلا مستەفا بارزانی بخەمە ڕوو.

## بارزان چییە؟

ناوچەی بارزان مەڵبەندێکی چڕ و سەخت و لێڕەوارە. لەسەر سنوری نێوانی تورکیا و ئێران و عێراق هەڵکەوتووە و سەر بە ئەستانی هەولێرە. زەویوزاری بۆ داچاندن یەکجار کەمە. زۆربەی مایەی بژیوی خەڵکی ناوچەکە ڕیچاڵی مەڕوماڵات و بەڕۆ ڕنی و مازوچنی و دانۆکە و قەزوان فرۆشتن و گاڵ و گاڕس داچاندن و کاروانی گەنم کردنە. هێندێک ترێ و میوەی جەنگەڵیشی هەیە. ئەگەر هەموو خاکی بارزانی بەتێکڕایی هێن کەسێک بێت بەتەنیایی، هێشتان لە دەغڵ و داهاتدا بارتەقای جووت بەندەیێکی موکریانی نایەتەوە. جا نەخوازە هەرکەس لەوێ پارچە زەوییەکی پێ براوە و پارچەی لە هەموان هەراوتر کەمتر

له هەزار هەنگاوە و بەشی ماڵە شێخەکانیش کە مشورخۆری بارزانن لە مسکێن و هەژارەکان کەمتر نەبێ پتر نییە.

## ژیانی کۆمەڵایەتی

هەتا ئەم ساڵانەی دوایی ئەو خەڵکەی لە بارزان ژیاون دەگەڵ ئەو هۆزە کوردانەی مریدی ماڵە بارزانن و دەگەڵ بارزانیان جیرانن. سەتان ساڵە لە چەشنێک ژیانی هاوبەشی سەرەتایی بەرخوردار بوون. هیچ گا کەسی وای لێ نەبووە خۆی تێر بێ و هاوسای برسی بێ. یەک پڕ و دەی قرپیان نەبووە. یان هەموو پێکەوە تێر بوون یان گشت لە گشتیان بێ نان بوون.

کچ بەزۆری بەشوودان و شیربایی و دیاری و بێگار و باج و خاوەی ئاغایەتی و درۆ و دزی و دەسبڕین و لە پەیمان پاشگەزبوونەوە و هەر خوار و خێچی و دووڕوویی و نالەبارییەک کە ئەمڕۆ لە دنیا باوە یان نەهاتبووە ئەو ناوە یان نەمابوو.

جا چونکە مەڵبەندەکەشیان چڕ و دڕ و لە داعبا و دڕندە پڕە. کوڕوکاڵیان زۆربەی کاتی خەریکی نێچیر و ڕاون... هەمووی زۆر ئەنگێوەی چاک و بە گورد و گوڕ و چالاک و بەجەرگ و ئازا دەرەخسن، لە خوا نەبێ لە هیچ کەسی تر ناترسن.

هەر زۆردارێک ویستبێتی بەناڕەوا دەست بۆ مافی ڕەوای ئەوان درێژ بکا، بێ لێکدانەوە و سێ و دوو بەگژیدا چوون، ژیان و گیانیان دەپێناو ئازادی ناوە.

## حوکمی تورک؟

پێی ناوێ لەسەری بڕۆم.. هەرکەس لە هەمو جیهاندا ناوی تورکی بەرگوێ کەوێ، نەعوزەن بیللایەک دەڵێ، تورک و دڵڕەشی و خوێنخۆری سێ وشەن لە یەک مانادا. مێژووی ئوروپا و ئاسیای چەندین سەدە لە باسی شوومی و بەدفەڕیی حوکمی تورکان هەڵازناوە. ئەو پارچە کوردە هەژارەش کە لە مەڵبەندی بارزانن، بەر حوکمی ئەو تورکانە بوون. لە دەسدرێژی و نامەردیی جەندرمە تالانکەرەکان وەگیان هاتوون، مردنیان هەڵبژاردووە نەک مانی حیزەبخۆیی و چەوسانی بەرەنجەڕۆیی، قەت ساڵێک نەبووە کە بارزان توشی تەشقەڵەی جەندرمە و جەندرمە کوشتن نەبووبێ و کوشتارێکی لێ نەکرابێ. زۆر بەدەگمەن هەڵکەوتووە بارزانی: لەسەر نوێن بمرن، یان کوژراون یان لە زیندانان رزاون.

## شێخانی بارزان

دەماوەدەم وا دەگێڕنەوە کە ماڵە شێخانی بارزان لە رۆژگارانی پێشیندا لە بەرەی ماڵەمیرانی ئامێدی بوون، یەکێکیان بەناوی (مەسعود) لە میرایەتیی میراتی وەرەز بووە، رووی کردۆتە بناری چیای زێبار و دەستی لە دنیا بەرداوە و تەکی داوە بەلای خواوە و بە گۆشەنشینی ژیاوە. لە پاش ئەویش وەچ و نەوەی لەسەر شوێنی ئەو رۆیشتوون، خوێندوویانە و پلە پلە پێ گەیشتوون، بوونە زانا لە زانستی رواڵەتی و نهێنیدا. لەمانە ئەوی ناسراون و نازناوی مەلایان هەبووە، بە زنجیرە: تاجەدین و محەمەد و عەبدوڵلایە. کوڕانی مەلا عەبدوڵلا هاوچەرخی مەولانا خالیدی شارەزوورین (١٧٨٣-١٨٢٦م) = (١١٩٧-١٢٤٢ھ). لەوانە دوان: عەبدوڕەحمان، عەبدولسەلام، بوونە خەلیفەی سەید تەهای شەمزینانی کە سەید تەهاش خەلیفەی مەولانا بووە. لەو ساوە شێخانی بارزان بە تەریقەت نەقشەبەندین. عەبدولسەلام لە شۆڕشی سەربەخۆبوونی کوردستان (١٢٩٦ کۆچی) کە شێخ عوبەیدوڵلا سەرکردەی بوو بەشدار بووە. کوڕە گەورە و جێ نشێنی عەبدولسەلام: شێخ محەمەدی بارزانی دەگەڵ ئاغا و قەڵەوقوتەی خوانەناس و هەژارچەوسێن کەوتۆتە بەربەرەکانی و تورکەکان لێی دردۆنگ بوون و بۆ ماوەیەک لە بەندیخانەی بدلیسدا حەپس کراوە و ماوەیەکیش لە بارزان دووریان خستووە و لە شاری موسڵدا ژیاوە. شێخ محەمەد پێنج کوڕی بوون: شێخ عەبدولسەلامی دووهەم، شێخ ئەحمەد، شێخ حەمە سدیق، شێخ بابۆ، مەلا مستەفا.

لە ساڵانی (١٩٠٧-١٩٠٨م.)دا عەبدولسەلام لە دژی تورکان راپەڕی، هەتا توانیی هێزی چەکداری تورکانی شەق و شڕ کرد. لە ئاکاما لەشکری زۆری دەوڵەتی و کوردی نیشتمان فرۆشی ناوچەکەیان بە هەزاران بەگژدا کرد.. دەری نەبرد، شکستی خوارد، ئیتر هەر ئەوەندەی بۆ کرا کە تەنیا هەر خۆی رزگارکات.. تەنانەت پیر و پاتاڵ و رواڵ و ژن و منداڵیش بەدیل گیران و برانە زیندانی مووسڵ. مەلا مستەفای کەم تەمەن یەکێک بوو لەو یەخسیرانە.

شێخ عەبدولسەلامی رزگار لە پاش ساڵێک شۆڕشی هەڵگیرساندەوە، دەردێکی وای دا بە تورکان کە ناچاربوون بێنە بەر بار و مل بۆ مەرجەکانی لارکەن. بڕیاردرا لە بەرانبەر شەڕ داکوژان: گیراوەکان بەربدرێن و چەند فێرگە و نەخۆشخانەیەک لە ناوچەکە بکرێتەوە، لە پرۆژەی ئاوەدانیشدا مەڵبەندە کوردنشینەکان بەشیان هەبێ.

چەند ساڵ بە ئارامی رابرد. لە ساڵی ١٩١٣ مەحموود شەوکەت سەرەک وەزیری تورکیا رەشکوژ کرا. سەفوەت بەگێک کە لە موسڵ کاربەدەست و دۆستی شێخ عەبدولسەلام بوو، تێ وەدرا، ویستیان بیگرن، هەڵات، خۆی گەیاندە بارزان، شێخ پەنای دا، دیسان شەڕ هەڵگیرسایەوە.

بەهەزاران ئەفسەر و جەندرمەی تورک و پتر لە بیست هۆزە کوردی جاشە تورکی هاتە سەر و لە پاش زۆر شەڕی مەردانە و نەبەردانە لە هێز کەوت و لە بارزان پەڕیوە کرا و هاتە کوردستانی ئێران. دەگەڵ سمایلاغای سمکۆ پەیمانیان بەست کە دوو بەدوو بۆ سەربەخۆیی کوردستان خەبات بکەن. لە رێبازێک شێخ مێوانی سۆفی عەبدولا ناوێک بوو، میواندار نامەردیی کرد و بە هیوای پاداشی تورکان شێخی نیشانی تورکان دا و گیرا و برایە مووسڵێ و لەوێ لە سێدارە درا. شێخ ئەحمەد شوێنی گرتەوە.

## ئاغا گۆران

پاش یەکەم شەڕی جیهانی ئیمپەراتۆریی عوسمانی کوت کوت کرا، کوردستانی ئێستای عێراق کە بارزانیش پاژێکیەتی بەر بریتانیا کەوت و خستیە سەر عەرەبستان و ناوی نا دەوڵەتی عێراق. کوردستان کانگای نەوت بوو، بەو بۆنەوە ئینگلیس نەیدەویست هیچ هێزێکی وای لێ هەبێ بتوانێ بەرهەڵستی بێت. حوکوومەتی شێخ مەحموودی لەبەین برد، دەبوایە هێزی بارزانیش کە جێگەی ترسە بۆ دوارۆژ لەناوبەرێ. بۆ گەڕ دە بارزان هالاندن بۆ بەهانەیەک دەگەڕا. ساڵی ١٩٣١ ئاسۆریەکان لە تورکیا وەدەر نران، پەنایان بە عێراق هێنا. ئینگلیس لەسەر ئەو خەیاڵە کە ئەوانە مەسیحین و دەتوانێ بەناوی هاودین دەکاریان کا، وەری گرتن. بۆشی دانان کە لە بارزان نیشتەجێ بن. نیازی وابوو بە بەردێک دوو چێشکە راوکا.. بارزان لە هێز داتەکێنێ و تۆوی دین دوژمنایەتیش لەناو کورد و ئاسۆریەکاندا بچێنێ. بەڵام ئەو خەونە خۆشەیان نەهاتەدی. نە ئاسۆری ئامادەبوون شەڕی بۆ بکەن، نە بارزانیش ئەم ئاو لەجێ نانەیان قبووڵ دەکرد.

ئینگلیس ئەم لەدەم دانەوەی کردە بەڵگەی سەربزێوی. ئەمجارە بە ناوی ئاین شەڕی بۆ بارزان نایەوە. کوردەکانی دەر و دراوسێی بارزانی خستە شوێن شێخ رەشیدی لۆلان، فتوای کوفری بۆ شێخی بارزان دەرکرد و بۆ خەزا هاتنە سەر بارزان.

شێخ ئەحمەد رووی لە دەوڵەت نا کە شێخ رەشید لای لێ دا و تووشی شەڕ و هەرای نەکەن. بەڵام ئینگلیس لە پشت پەردە و دەوڵەتە داتاشراوەکەی لە باتی دەهانا هاتن،

چەک و پارە و دنەدانیان بۆ دوژمنانی بارزان نارد.

## شەڕی بەزۆر سەپاو

شێخ کە دیتی بەزۆر بیەوێ و نەیەوێ شەڕی بەسەردا سەپاوە، مەلا مستەفای برای خۆی (١٩٠١-١٩٧٩) بە چەکداری بارزانەوە ناردە بەرەنگاری هێرش. سەرکردەی لاو کارێکی بە دوژمنان کرد بەداستان بیگێڕنەوە، هەرچی لە کوشتن رزگار بو بەدیل گیرا، چەک و ئەسپاباتی شەڕیان بەتالان چوو، وەکو بەفری پار توانەوە. ناوی مستەفا بارزانیش لەو شەڕەوە وەک قارەمانی بێ وێنە کەوتە سەر زار و زمانان.

دەستی عەرەب و ئینگلیسی ئاغای عەرەب لەبن هەمانەوە دەرچوو.. لە شکانی ئەو جاشکانەیان بە تەواوی شێت و هار بوون، سوپا و پۆلیسی عارەب و هێزی هەواییی ئینگلیسان بۆ تۆڵەی دەستندەخۆران وەخۆ کەوتن، بە بۆمباران ئاوەدانی کاول کران، قڕان خرا ماڵ و ئاژاڵ. ماوەی دوو ساڵ (١٩٣٢-١٩٣٣) ئەو هێزە کەم و ئازایەی بارزانییەکان دەگەڵ ئەو دوو دەوڵەتەدا و هەزاران کوردی خۆفرۆش شەڕیان کرد و بە تەواوی شڕیان کردن، تا بەهاری سی وچواریش هەر خۆیان گرت. بەلام بێ نانی و ماڵ سوتان برستی لە بارزان بڕی، پەنایان بە تورکیا برد. تورکیش کەوتە حیسابی کۆن ئەستاندنەوە، کێی وەبەردەس کەوت گرتی و هێندێکیشی ئیعدام کردن.

چاری ناچار بەرەو بارزان گەڕانەوە. لە ئاکامی وتووێژ دەگەڵ عێراقدا بڕیار درا: چەک دانێن و شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا و خێزان و کەس و کاریان لە بارزان دوور بخرێنەوە و بارزانیی تر عافو بکرێن..

٨٦ کەس بارزانی کە سەر بە ماڵە شێخان بوون، ماوەی دە ساڵ لە بارزان دوور خرانەوە، سێ ساڵ لە باشووری عێراق، حەو ساڵانیش لە دەوروبەری کەرکوک و لە شاری سولەیمانی مان.

ڕۆژی یازدەی مانگی ژوئن ساڵی ١٩٤٣ لە شاری سولەیمانییەوە مەلا مستەفا ڕای کرد و گەییە بارزان. عێراق مەفرەزەی پۆلیسی بەشوێندا نارد بەردەستی کەن. پێی نەوێران و زۆربەیان لە چەک کران. بارزان دیسان بووژایەوە و ئامادەی هەر پێشهاتێک بوو.

ئینگلیس نەیدەویست سەرەڕای شەڕی ئەڵمان کە جەنگەی بوو شەڕێکی دیش ئەویش لە نزیک نەوتەکەی ملی بگرێ. ئامۆژگاریی عێراقی کرد دەگەڵ بارزانی ڕێک کەوێ و

خۆی دەشەڕەوە نەگلێنێ. لە ئاکامی وتووێژدا بڕیار وابوو لەسەر داخوازیی بارزانی، زمانی کوردی رەسمی بێت، خوێندن لە هەموو کوردستان بەکوردی بێت، فێرگە و نەخۆشخانەی پێویست لە کوردستان دابمەزرێن، زیندانی و دوورخراوەکان ئازاد بکرێن، چەکداری کوردی شۆڕشگێڕ چەک دانەنێن.

بەڵام هەر ساڵی ٤٤ کە هیتلەر دابوویە کزی، ئینگلیسەکان لەم مافە پاشگەز بوونەوە، نووری سەعیدی نۆکەریان کە گفتەکەیان بەو دابوو لەسەر وەزیری لاگرت و یەکی تریان لە جێ دانا و رایان سپارد بۆ پێکهاتنی مەرجەکان بە گزی و تەفرە رای بوێرێ.

دەس کرا بە لەشکر ناردن بۆ کوردستان، خۆیان بۆ شەڕی بارزانییان لە دەسک نا. تا لە ساڵی ١٩٤٥دا دیتیان هەلە شەڕ بفرۆشن. مووچەخۆرانی دەوڵەتیان راسپاردبوو هەر بارزانییەک دێتە ئیدارەی دەوڵەتی گەرێکی بۆ بنێنەوە و بەردەستی کەن. لەو بگرە و بەردە و هەرایە چەند بارزانی و چەند پۆلیسی دەوڵەت کوژران، لەو دەمەدا مەلا مستەفا بارزانی بۆ داکوژانی کێشێکی ناو کوردەکان چووبووە دهۆک. بە هەڵەداوان هاتەوە بۆ بارزان و زۆری حەول و تەقەلا دا دەوڵەت شەڕی پێ نەفرۆشێ، لەم بارەوە یادداشتی دا بە سەفیری فەرانسە و ئەمریکا و رووس و چین و ئینگلیس و سەرەک وەزیری عێراقیش. کەس دەهاواری نەهات و بەزۆر شەڕی بەمل دا هات.

## شەڕ بەخورتی

چل و دوو هەزار سەرباز و پۆلیسی دەوڵەتی عێراق، هەزاران کوردی خۆفرۆش بەهەموو چەکی تازەوە، لە ژێر فەرماندەییی مێجەر جەنەڕاڵ (رنتن)دا کە ئینگلیسێکی یەکدەست بوو بەپانەوە هێرشیان هێنا بۆ سەر بارزان.

لە بارزان و دۆستانی شێخانی بارزان بەینی چوار تا پێنج هەزار پیاوی چەکدار هاتە مەیدان. لە مانگی ئابدا لێکیان دا و دەوڵەت شکا. هێرشکەران لە بارزان و مێرگەسور و دەوروبەری رەواندز و عەقرە و زاخۆ لەبەریەک چوون. نۆ فڕۆکەی بۆمباهاوێژ خرانە خوار، دوو هەزار تفەنگ و هەشت تۆپ، هەشت بێسیم و سەد هەزار فیشەک و گوللە بەتاڵان دەس بارزان کەوت. شەڕ تا دەهات توندتر دەبوو، هێزی هەوای بریتانی بەئاشکرا و دوور لە پەروا وەکار خرا. رەوەی فڕۆکە سی و شەش لە عاسمانی ناوچەی بارزان دەبیندرا وێکڕا بۆمبایان دادەرژاند، تەنانەت بەردیشیان سووتاند.

هەر لە تەنیا گەلیی (نەهلە) کە کەوتۆتە ئەودیو چیای پیرسەوە، هەشت هەزار چەکداری دەوڵەت کەوتبووە ناو ئابلۆقەوە و هیچ دەرەتانیان نەمابوو، خەریک بوون خۆ بەدەستەوە دەن. لە جەنگەی وا تەنگانەدا خەیانەتی کورد خۆی نوواند؟ مەحموودئاغای سەرۆکی هۆزی زێبار و مەحموود خەلیفەی برادۆست کە تا ئەودەم دۆست و هاوکاری بارزان بوون. خۆیان بە دوژمن فرۆشت و پشتی جەبهەیان چۆڵ کرد و بوونە خەنجەر بەدەست دوژمنی داگیرکەر. ئیتر بارزان کەڵکی لێ مانی نەما. شۆڕشگێڕان بڕیاریان دا خۆدەربازکەنە ئێران و یاریدەی کوردی ئێران دەن، کە دژی شا شۆڕشیان هەڵگیرساندبوو.

لە چاخێکدا کە ڕێژنەی ئاگربارانی دوژمن، وچانی پشووی نەدەدا، چەکدار و بێ چەکی بارزان خاوخێزان بەرەو سنووری ئێران بوون، ڕۆژی یازدەی ئۆکتۆبری ١٩٤٥ سی و پێنج هەزار لاو و پیاو و ژن و منداڵ لە ڕێگەی کێلەشینەوە گەینە ئەم دیوەی کوردستان کە ئەوساکە قەڵەمڕەوی رووسەکان بوو.

رووس لە بارزانی دڕدۆنگ بوون نەوەکا سەر بە ئینگلیس بن و بە فێڵ ئاوارەی کردبن.. تا ئەو گومانەیان نەما و ڕێگە دران بێنە ولات و دامەزرێن، برسیاتی و بەفر و سەرما و گرانەتا چوار هەزار و پێنجسەد گیانی لێ ئەستاندن، ماڵ و منداڵ لە گوندان و لە شاران جێ کرانەوە، چەکدارەکان بوونە هێزی پشتیوانی کۆماری ساوای مهاباد. ئەو سەرکەوتنانەی لە شەڕی دژی شادا کوردی ئێران دەستیان کەوت، بەشی زۆربە لە سۆنگەی هێزی بارزان بوو... شەڕی مامەشە و قارەوا لە لای سەقز دوو نموونەی هەرە زیندوون کە هەر لاوێکی بارزانی بەرەنگاری سەد چەکداری دەوڵەت بووە و شکاندوونی، تەنانەت سەرکردەی دوژمن کە ئەوساکە (ڕەزمارا) بوو لە وتارێکا درکاندی: «ئەگەر پەنجا هەزار کەسم لەم بارزانییانە دەگەڵ با، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستم داگیر دەکرد».

مانگی یازدەی ساڵی ١٩٤٦ کۆماری مهاباد روخا.. قازی محەمەد چەکی دانا و شەڕی نەکرد، بەڵام مستەفا بارزانی سەری بۆ نەیار نەنەواند، بە چەکدارانی خۆیەوە دایە چیا...

ئێران ویستی بە نەرمی و بە فێڵ چەکیان کا، بارزانی لە نەغەدەوە لە پازدەی مانگی بەفرانبار بۆ وتوویژ دەگەڵ شادا بانگهێشتن کرا بۆ تاران. لە جوابی شادا کە گوتبووی: چەک دانێن و لە هەرکوێ خۆتان حەزبکەن دادەمەزرێن، گوتبووی: شێخ ئەحمەد دەتوانێ لەم بارەوە بڕیار بدا، با لەو پرسم. بەو بۆنەوە لە گرتن رزگاری هات و خۆی گەیاندەوە

کوردستان. بەتەما بوو تا ڕەشانگ و بەهار دادێ وا نەکا تووشی شەڕ ببێ. بەڵام دەوڵەت ماوەی نەدا، لە بیست و چاری ڕەشەمەی ١٣٢٥ی هەتاوی زۆربەی لەشکری ئێران و جاشە کوردی موکریانی لە مەنگوڕ و مامەش و هەرکی و دێبوکری لێ دەنگ درا، لە عاسمان و زەمینەوە گوللە و بۆمباباران کران.. هێزی چەکداری بارزانی لە دەشتی شنۆ و مەرگەوەڕ بەبێ نانی و بێ ئەنوایی لە ناو بەفر و سەرمای سەختتا یەک بەسەتان بەرەنگاری داگیرکەری کوردستان و کوردی ناموس فرۆش دەبن، هەر هەنگە لەناو دەچێت و هەر خۆفرۆشە قڕی دێت. بە شایەتی (تەفرەشیان) کە ئەفسەرێکی تودەیی و فارس بووە و دوای شکانی پیشەوەری چۆتە لای مەلا مستەفا و شەڕی شنۆی بۆ خۆی دیوە. لە بیرەوەری (قیام افسران خراسان)دا نوسیویەتی: «هەشت بارزانی لە دێی (سینگان) هەمو سوارەی مەنگوڕ و مامەشیان راو نا، بە دە کەسان گوردانێکی سێسەد کەسی کە جگە لە سووکە چەکان، دوو تۆپی گەورە، چوار رەشاش، شەش تۆپی هاوەنیان پێ بوو، بە خڕوپڕی بە دیل گرت و سەرگورد کلاشی فەرماندە کە بریندداریش ببوو، خۆی کوشت».

بیست و شەش رۆژ ئەو شەڕە هەر نەپسایەوە، سەرەڕای شەڕ، بێ جێگەیی و سەرما و بێ نانی و بێ بەرگی گەفی مەرگی لە منداڵ و خێزان دەکرد، دەبوایە بە هەرچۆنێک بێت خۆ ڕزگارکەن. شێخ ئەحمەد بۆ پاراستنی گیانی پیر و منداڵ و خێزانی بێ دەرەتان دەست لە گیانی خۆی هەڵدەگرێ و دێتەوە بەر حوکمی عێراق، ژن و منداڵ و پەککەوتە دەخرێنە ناو زنجانەوە، شێخ ئەحمەد و چەند خزمێکی بە حوکمی لە دار دانەوە بەرێ دەکرێن بۆ باشوور و دەخزێنرێنە زیندانەوە.

مەلا مستەفا و پێنج سەد پیاو دەمێننەوە، داوی لە تەپکە ڕەهابوون دەنێنەوە، لەسەر پیلانی بارزانی لە ٩٤٧/٤/٢٥ بەرەو عێراق بگرە و هاتم... ٤/٢٨ خوت و خافڵ پەلاماری سەر سنووری عێراق دەدەن، چەند مەخفەرێک لە چەک دەکەن. ئەمجارە عێراق دەشڵەژێ و ئێران پشوویێکی ئاسوودە هەڵدەکێشی و لای وایە لەو مافەتایە رزگار بووە، لەشکرکێشی دەوەستێنێ.

١٩٤٧/٥/٢٨ مەلا مستەفا و یارانی لە سنووری کوردستانی بەردەستی تورکان دەبوورن. لەپاش چەند شەڕ و لێکدانێک دێنەوە دیوی ئێران و بەناو بەفری تەنگەبری کوێستاناندا روو دەکەنە عروسیاتی. ئێران دیسان تووشی دڵەتەپێ دەبێ، دوازدە هەزار سەرباز و ئەفسەری سوپا، گەلەکوردی خۆفرۆشی مەڵبەندی ئازەربایجان و هێزی پۆلیسی

ئەو ناوەی لێ دەنگ ئەدا کە ڕێ بگرن و نەهێڵن دەربازبێ.

ئەو سەفەرە پڕ خەتەرە پەنجا و دوو ڕۆژ دەخایەنێ، نۆ جاران تووشی شەڕ دەبن، کوژراوان لە ڕێ دەنێژن، بریندااران بە کۆڵ دەگەڵ خۆیان دەبەن، هەتا دەگەنە سەر ئاراز.

ڕۆژی حەڤدەی مانگی جولای ساڵی ١٩٤٧ دەپەڕنەوە و دەبنە پەنابەری رووسان، لە شاری باکۆ دامەزران، بەڵام لەوێش کوردی خۆیی لێ ناگەڕێ، (ڕەحیم خانی سەیفی قازی) کە کوردێکی مهاباتی و لە باکۆ بوو... دەوڵەتی لێ دوودڵ کردن، هەڵیاندانە ئۆزبەگستان و لەوێش لێک بڵاوکران و ئاگایان لە یەکتر بڕا.

بە مردنی ستالین زیندوو بوونەوە، مەلا مستەفا ڕێ درا بچتە مۆسکۆ، هاوڕێکانی وا دامەزران هەم بخوێنن، هەم کار بکەن. پاش دوازدە ساڵ ئاوارەیی ساڵی ١٩٥٨ کە حوکمی عێراق وەرگەڕا و حوکمی تازە هاوبەشیەتیی کورد و عارەبی ڕاگەیاند... بارزانی و هاوکارەکانی گەڕانەوە بۆ نیشتمانەکەی خۆیان، لەلایەن کورد و عارەبی عێراقەوە ئەوپەڕی ڕێزیان لێ نرا.

## قاسم و کورد

زەعیم عەبدولکەریم قاسم لە سەرەتای کودەتادا ڕایگەیاند: کورد و عەرەب لە چارەنووسی عێراقدا برابەشن بەڵام هەر ئەوەندەی خۆش بوو کە ڕووی دا بە کۆمۆنیستان و ڕێگەی دان دەورەی بتەنن... کۆمۆنیستیش بەبێ دیکتاتۆر هەڵناکەن، ئەوەندەیان یەکەم یەکەم و بلیمەت و پیاوی بێ وێنەی دنیایە بەگوێ دادا، هەر بە یەکجاری شێتیان کرد و بەدەردی ستالینیان برد. گەل خۆشەویستیی وەلانا و کەوتە باری فیز و ملهوڕی و لاساری و خۆپەرستی و خۆی وەکو نیمچە خودایەک هاتە بەرچاو، چاوی بە هیچ خاوەن ناوێک لە عێراقدا هەڵنەدەهات. کە ئەوساش ناوی بارزانی لەو ناوەدا لە سەرووی هەموو ناوان بوو.

حیزبی پارتی بەسەرپەرشتیی بارزانی داوای مافی ڕەوای کوردی خستبوە ڕوو، حیزبی کۆمۆنیست لای وابوو تەنانەت داوای خوێندنیش بەزمانی کورد فاشیستی و جیایی خوازییە. ڕەگەزپەرستی عارەبیش نەیاندەویست کوردی زەبوونی بەردەستیان دەستی بەئازادی بگا. ئەم سێ هۆیە قاسمیان هێنایە بارێک کە بەجارێک دڵی لە کورد کرمێ ببێ و لە بەڵێنی مافی کورد پاشگەزبێتەوە. دەستی کرد بە گەندەڵ فیلان، بڕوبەهانەی

دەتاشین، بەبێ تاوان ئەندامانی پارتی دەگرت، دنەی رۆژنامانی دەدا: رەگەزی کورد بدەنە پاڵ عارەبان و زۆر پێ هەڵڕوشانی تریش کە کورد لە ماف بێ بەش بکات. بارزانی لای وابوو نابێ تا کورد خۆی زۆر تەیار نەکات بە هیچ جۆرێ دەگەڵ دەوڵەتا تێک گیرێ. بەڵام دەگەڵ زۆرداری نەزان چار چییە؟؟

بارزانی لە بەغدا نەبوو، چووبووە سەردانی خزمانی و دەمێک بوو لە بارزان دەژیا. کۆمۆنیستان لە ئەستانی سولەیمانی کە کوردستانی عێراقە، خاوەن زەوییەکانیان هەڵنا دژی پیتاک دانی زەوی خۆنیشان دەن. ئەو مامۆستایانەی پارتی کە ئەوسا لە سولەیمانی بوون، لەوە ترسان کۆمۆنیستان وەرزێری کورد بکەنە پەیڕەوی خۆیان. بە پەلە و بێ لێکدانەوە بڕیاریان دا لەو هانەدانەی جوتیاران دەستی خۆیان رەپێش بخەن. سەرکردەییی وەرزێری خۆنیشاندەریان کردە هی خۆ. لە رۆژی نۆ هەتا یازدەی مانگی ئاوگۆستی ١٩٦١، بە هەزاران وەرزێر و خاوەن موڵکی کورد بە چەکەوە بەرەو دەربەندیخان چوون و بەریان لە تیپێک لەشکری دەوڵەتی گرت کە بەرەو کوردستان دەهات.

حوکمی بەغدا لەباتی وتووێژکردن دەگەڵ خۆنیشاندەرەکان، فەرمانی ئاگربارانی بۆ دەرکردن. شەڕ دامەزرا، هەر ئەو رۆژە تا ئێوارە هێزی بڵاوی عەشرەتان بڵاوەی کرد، هەرکەس ببووە دزی گای خۆی، تەنیا دەوری حەفتا کەسێک کە ئەندامانی پارتی بوون هەتا شەو لە سەنگەردا مان و ناچار پاشەکشەیان کرد. بۆ پینەی ئەم تێشکانە برایمی رازداری پارتی و هەواڵە نێزیکەکانی کەوتنە تەقە لە بارزانی کە مووچەخۆری دەوڵەتە و نایەوێ دەگەڵیا تێک دا و کورد بە گورگان خواردوو دەدا.

قاسم بەو تۆزە سەرکەوتەی لەخۆ دەرچوو... دیتی هەلە بارزانیش لە کۆڵ کاتەوە و ئەو جێ هومێدە گەورەیە لەبیر کوردان بباتەوە. سپێدەی شازدەی ئاوگۆستی ١٩٦١ خوت و خافڵ بارزان وەبەر بۆمبا درا. هۆزی کوردی زێباریش و چەند کوردی خۆفرۆشی دیش کە دوژمنی خانەدانی ماڵە شێخانی بارزان بوون و قاسم چەک و دراوی زۆری پێدابوون کە بەرهەڵستی بارزان بن، پەلاماری بارزانیان دا.

## چەکی بارزان

ساڵی ١٩٥٩ شێخ رەشیدی لۆلان ناوێک بەناوی شەڕ دەگەڵ کوفری کمونیستان لە عەبدولکەریم یاغی بوو، حیزبی کمونیستی عێراق بۆ ئەوە ناوێک دەربکا، کۆمەڵێک لە چەکداری خۆی بە سەرکردەییی بەقاڵێک بەناوی (عەلی سەوزەچی) ناردە بەرایی ئاژاوە،

بەڵام هەر گەینە مەیدان و تێ گەیشتن لە شەڕدا کوژرانیش هەیە، هانایان بە بارزانی برد چەکەکانیان لێ وەرگرێ و لەجیاتی ئەوان شەڕبکا... بەو بۆنەوە نزیکەی سێسەد و پەنجا تفەنگی کۆن و کەم فیشەک لە یازدە تیر و سێ تیر و بەرازکوژ و بابەتی تر وەدەست بارزانییەکان کەوت.

وەختێ دەوڵەت لە نارەوا بۆمبارانی بارزانی کرد و بە زۆرەکی گەری شەڕی بۆ نایەوە، لەسەر دەستووری شێخ ئەحمەد، سەرکردە: مەلا مستەفا بەم چەند چەکە کرووچەوە لە هێزی دەوڵەت راپەڕی، بوو بە ئاگر لە پووشی گیانی دوژمنی، هێزی چەکداری دەوڵەت و کوردە خۆفرۆشەکانی تا کەوشەنی سوریە و تورکیا ڕاونا. لای باکور و رۆژاوای خۆی لە دوژمنان پاکردەوە، ئەمجار بە چەکی زۆرەوە کە لە شەڕ دەستی کەتبوو بەرەو خۆرهەلات بایداوە، خۆی گەیاندە ناوچەکانی سولەیمانی و دەوری هەولێر. هومێدی سیسی لاوانی ئازادیخوازی کوردی ئەوناوەش بووژاوە. بەهەواداری سەرداری نەبەزیویان لە داگیرکەر و دوژمنان وەخۆ کەتن. جگە لە لاوانی پارتی بە هەزاران پۆلیس و دەرەجەدار و سەربازی کورد بەچەکەوە خۆیان گەیاندە شۆڕش و بوونە پێشمەرگەی کوردستان.

دەوڵەت کەوتبووە حەلوەلا، قاسم هەموو سوپا نیزامییەکەی دەگەڵ هەزاران شەرکەری دەرەبەگی کورد و عارەبی خۆفرۆش، تەیار بەهەموو چەکێکی تازە داهاتووی رووسەوە هەر لە فڕۆکەوە بگرە تا تانک و تۆپ و مووشەک و زرێپۆش و تفەنگ و ئاگرپارەوە هاویشتبووە ناو جەهەندەمی جەنگەوە و هێشتا هەر هاواری دەکرد بەشم ناکا. تەنانەت جارێک لە جاران عەبدولکەریم خەبەری دابوو بە رووسان کە ئەگەر لە چوار سەعاتدا مووشەکی دەفریا نەخەن، حاڵی شڕە. رووس بە پەلە بە عاسمانی تورکیادا پێیان گەیاند. لە بەرانبەر گازندەی تورکاندا گوتیان ببەخشن دەرفەت نەمابوو لێتان پرسین ئاخۆ ئێوە رازین لە عاسمانی ئێوە بفڕین؟

## کودەتای بەعس

کەرکووک کانی گەورەی نەوت و رەگی گیانی بریتانی لە ئاکامی ئەم شەڕەوە کەوتبووە بەر خەتەرەوە. زۆربەی لەشکری عێراقی لە کوردستان قەتیس مابوو، هێزێکی وا لە پاتەختدا نەمابوو بیپارێزێ.

بەعسی بە هاندانی ئینگلیس لە فبریەی ساڵی ١٩٦٣ کودەتای کرد. (وەزیر عەلی ساڵح سەعدی کە دەمڕاستی دەستەی کودەتاکەران بوو بە رۆژنامەنووسانی گوت: بە

قەتاری ئەنگلۆساکسۆن هاتووینەوە).

فەرمانی کۆمۆنیست قڕان لە رادیۆ راگەیەندرا، شەلم کوێرم، ناپارێزم. تانکی دەسکردی رووسیا لەسەر شەقام کمۆنیستی قیمە دەکرد. گولله و نێزەی کاری مۆسکۆ بە هەزاران کرێکاری سەر بە مۆسکۆیان پەڵەخاند.

هەر ئەوانە رزگاریان بوو کە لە کوردستان دەژیان و شۆڕشی کورد پارازتنی.

پاش کودەتا جەلال تاڵەبانی ناوێک دیاری کرا بە سەرکردەیی دەستەیەک بۆ گفتوگۆ لەمەڕ داواکانی شۆڕش بچتە بەغدا. وەرە و بچۆ، لە بەغداوە بۆ قاهیرە، تەفرە و درۆ، سوێندی زل، پەیمانی عەرەب، پێنج مانگ لەو ئاڵقەی بەتاڵدا هەڵیان خولاند. هەتا بەعسی کودەتاکەر بەتەواوی خۆیان لەسەر پێ گرتەوە و بۆ هێرش خۆیان تەیار کرد.

لە رۆژی نۆیی مانگی جونی ١٩٦٣ تەقەیان دامەزراندەوە و شەڕ هەڵگیرسا.

دەوڵەتی تورکیە و ئێران ئەو لە مووسڵ ئەم لە کەرکووک بۆ هاوکاری دەگەڵ بەعسی و بۆ کوردقڕان، بنکەی خەبەرییان کردەوە و بە کردەوەش بۆ نەمانی شۆڕشی کورد وەخۆکەوتن. ئینگلیسیش دەرگای قورخانەی بۆ بەعس خستە سەر پشت و هەرچی لێیان ویست بۆی ناردن، پیاو لە عاسمانی شەڕەکەدا فڕۆکەی رووسی و ئینگلیسی و ئێران و تورکانی دەدیت، کە بۆ کورد لەناو بردن ملەیان بوو.

دەوڵەتی رووس کە قازانجی لە عێراقدا زەبوون ببوو، کۆمۆنیستەکانی خۆیشی لە عێراقدا لەدەست دابوو، چاری ناچار بە زەوی بۆ کوردان بزووت، گەفی لە تورک و ئێران کرد کە ئەگەر چیدی هاوکاری لە دژی کورد دەگەڵ دەستەی بەعس بکەن، رووس ناتوانێ هەروا دەس لەسەر دەس دانێ و تماشا کات، جا نەخوازە کە ئەم شەڕە لە نزیک رووسەوە دەکرێ. رادیۆ مۆسکۆ بێ پسانەوە بە ئازایەتیی بارزانی و پێشمەرگەی کوردی هەڵدەگوت و بەگژ بەعسییەکاندا دەچوو، نوێنەری رووس شکایەتی گەلی کوردی بە ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتیی کۆڕی نەتەوە یەکگرتوەکان گەیاند، کە پێویستە ئەم کوشتارە لە کوردستان بەربەست بکرێ. مەنگۆلیاشیان راسپارد دادی کوردان بەرێتە بەر کۆڕی گەلان و مافی رەوایان داواکات.

بەڵام کاتێ کە موشیر عەبدوسەلامی سەرەک کۆمار لە بەعسییەکانی هەواڵی هەڵگەڕاوە و تەکی دا بەلای میسرەوە و بو بەدۆستی زۆر نزیکی عەبدوناسر و ناسریش دۆستی مۆسکۆ بوو. رووسیا لە هاوار بۆ کورد خۆی کێشاوە. هەموو هاوینی ساڵی

۱۹٦۳ هەتا مـانگێـک لە پایزیش بارزان وا دەوره درابوو، باڵـندەی لێ دەرنەدەچوو، لە عاسمانەوه بۆمباران، لەسەر زەمین بە قسەی ئەفسەرێکی دوژمن کە فەرمانده‌ی شەڕەکە بوو، دوسـەت و پەنجـا تۆپی زل بێ پسـانەوه خـاکی بارزانـی دادەبێژت، بەینی هەشـتـا و نەوەد هەزار سـەرباز و کـوردی خۆفـرۆش لە بەرانبـەر پێنج سەد چەکـداری بارزانـی شـەڕی دەکـرد، بەو حـاڵەشڕا دەوڵەت کـەوتە تەنـگانەوه و خـەریکی پاشـەکـشـە بوو، داوای شـەڕ وێستاندنی کرد، تەقە وەستا. بەر لەوەی دەگەڵ بەعسییەکان وتووێژ بکا بە ئاکام. لە ۱۹٦۳/۱۱/۱۸ سەرۆک کـۆمار کە عەبدوسـەلام عـارف بوو بەعسی راونا و بۆ خۆی، خۆی کرده دیکتاتۆر لە عێراقدا و کەوتە گفتوگۆ دەگەڵ کورد... بەڵام ئەویش هەتاسەر هەر سەری نەگرت، لە دەی فبرییەی ۱۹٦٥ دیسان شەڕ هەڵگیرسایەوه.

لە رۆژی سـێـزدەی ئاوریلی ۱۹٦٦ سـەرەک کـۆمـار لەناو فـرۆکـەدا سـوتا... برایەکـەی کەناوی عـەبدوڕەحـمان بوو هاتە شوێنی و نـاوی خۆی نا سەرەک کـۆمار، عەبدوڕەحـمان بەزاز ناویش ناوی نرا سەرەک وەزیر. بە سووتان و ئاڵوگۆڕی جوتەبرا شەڕ لە نێوان کورد و عـێراقدا نەوێستـا. لەپاش دوو مـانگ تەقە و لێک دان کە شەڕی هەندرێن رووی دا و هێـزی دەوڵـەت زۆر پیس شکا... دەوڵەت تـکای ئاگـربەست و وتووێژی لە شـۆڕش کـرد، ئاگربەست راگەیەندرا.

لە بیست و نۆی مـانگی جوونی ۱۹٦٦دا بەزاز بە بەیاننامەیەک هێندێک مافی کوردی سەلماند... بەڵام هێمان زۆری دەویست کە شۆڕشی کورد رازی کات.

لە ۱۹٦۸/۷/۱۷ چەند ئـەفـسـەرێکی دەرباری سـەرەک کـۆمـار بە تەفـره و هانەی بەعـسییەکـان کـودەتایان دژی ئاوڕەحمان عـارف کـرد و دەریان پەڕاند. حوکمی عـێراقـیـان داگیرکرد. پاش سێزده رۆژ حیزبی بەعس ئەو ئەفسـەرانەی هەڵداشت و حکوومەتی دەست کەوتەوه.

لە سـپـتـامـبـری ۱۹٦۸دا دیسـان بەعـسی بەهانەیان داتاشین و شـەڕیان بەسـەردا سەپاندین. تا سەرەتای ساڵی ۱۹۷۰ ئەو شەڕه هەر نەپسایەوه و رۆژ دەگەڵ رۆژ شۆڕشی کـورد لە گەشە و سەرکەوتندا بوو... حوکوومەت هیچ چاری نەما بۆ مافی خودموختـاریمان ملی چەمـاند و رایگەیاند: هەرچییەکمان گەرەکە بیکات، بۆ پێک هاتی ئەم مەبەستە و رەهابوونی گیروگرفتی نێوانمان چوار ساڵیان ماوه دیاری کرد.

## قەیرانی چوار ساڵە

لە هەرەمەی ئاهەنگی خودموختاریدا زوو دەرکەوت: حیزبی بەعس دڵی پیسە و نایەوێ پەیمانەکەی خۆی بەجێ بێنێ... هەروا تۆزێک دوای شەڕ ویستـان دەستی کرد بە قەڵای قایم دروست کردن لە کوردستان و ڕێگەوبانی دوور و پانی بۆ لەشکرکێشی دەکێشا.

لە ۱۹۷۱/۹/۲۹دا پۆلێک مەلای بە چەند بۆمباوە بەڕێ کرد کە بارزانیی بۆ بکوژن. مەلا تەقین و بارزانی بەرنەکەوت. ڕۆژی شازدەی مانگی حەوتی ۱۹۷۲ دیسان بەهۆی کوردێکەوە بۆمبایەکیان لە چەمەدان دا ناردبوو کە بارزانیی پێ بکوژن. ئەو فێڵەشیان سەری نەگرت.

هەر لە ساڵی ۱۹۷۲دا نزیکەی چل هەزار کوردی فەیلی بەو بەهانەی کە ئێرانین لە عێراق وەدەرنران و تاڵان کران.

## ڕووس و بەعس

دەی ئاوریلی ساڵی ۱۹۷۲ ڕووس و بەعس پەیمان نامێکیان ئیمزا کرد کە هەتا ماوەی پانزدە ساڵ لەمەڕ ئابووری و سیاسی و نیزامییەوە یاریدەی یەکتری بکەن.

ساڵی ۱۹۷۳ حیزبی بەعس دەگەڵ حیزبی کۆمۆنیستی عێراقی لایەنگری ڕووس یەکیان گرت و بەناوی جەبهەی یەککگرتوو هەردوو حیزب و ڕووسیش لە پشتی پەردەوە داوایان لە پارتیش دەکرد کە لەو جەبهەدا بەشدار بێت... (لە پایزی ساڵی ۱۹۷۳ کە میوانی ئاکادیمی شوورەوی بووم، پرۆفیسۆر غەفوروۆف ناو کە سەرۆکی زانستگەی ڕۆژهەڵاتناسی و ئەندامی کۆمیتەی باڵای ناوەندی و زۆریش دۆستی بارزانی بوو، دەشیزانی من لە بارزانی نزیکم، گوتی: بە بارزانی بڵێ، لە کرملین دۆستی هەن و دژیشی هەن، ئەمڕۆ قازانجی شوورەوی لەوەدایە عێراق بێ کێشە و هەرا بێ، هەرچەند بەعس لەوانەشە لە فێڵێ بن، با سەرپێچی لە چوون بۆ ناو جەبهە نەکا و هەرچیی بەعسی بۆی دیاری دەکەن رازی بێت - ه). بەڵام وەک ڕۆژ ئاشکرا بوو بەشدار بوون لەو جەبهەیەدا هەمو هێز و دەستەڵاتی دەخستە بەردەستی بەعس و داوای ماف و ئازادی لەبەین دەچوو، کە سەرکردایەتیی شۆڕش بە هیچ جۆرێک نەدەکرا بەمە رازی بێ و ئەو سەرکەوتەی کە بە خوێنی هەزاران لاوی پێشمەرگە دەس کەوتووە بە خۆڕایی لەدەستی دا. چەکدارە کۆمۆنیستە عێراقییەکان کە تا بەر لە پەیمانەکە لە ڕیزی پێشمەرگە بوون و شەڕی

بەعسییەکانیان دەکرد، لەسەر ئامۆژگاریی مۆسکۆ دەسیان لە شۆڕش هەڵگرت و چوونەوە بەردەستی بەعس.

لە ساڵی ١٩٧٤را بەعس کە پشتی بە دۆستی و یاریدەی رووس لە پێشوو قایمتر ببوو بە هەموو هێز بۆ لەناوبردنی شۆڕش خۆی گیف دەکرد، پەیمانی خودمختارییەکەی دەسکاری کرد و رایگەیاند کە: (کەرکووک)و (خانەقین)و (سنجار) و (ناوچەی شێخان)و چەند شوێن و مەڵبەندی دیکەش لە کوردستان بەر خودموختاری ناکەوێ و بە کوردستان حیساب ناکرێن، واتا بەزۆر شەڕی بۆ ساز کردینەوە.

رۆژی شەشی مانگی مارسی ساڵی ١٩٧٥ ئاشتبوونەوە و پێکهاتنی شای ئێران و سەدام حوسێن راگەیەنرا و شۆڕشی کورد توانای خۆگرتنی نەما..

## هۆی شکانی شۆڕش چی بوو؟

بۆ روون بوونەوەی ئەم باسە چەند پەراوێزێک پێویستە. گەرەک بارزانی بناسین. سیاسەتی، ئیدارە و مشوورخواردنی، تەرزی رەفتار و ئاکاری، هەڵوێستی هاوکارەکانی و بەتایبەتی حیزبی پارتی کە سەرۆکایەتیی دەکرد.

**١- ژینامەی پارتی بەکورتی:**

ساڵی ١٩٤٥ بارزانی لە مهابادەوە هەمزە عەبدوڵڵا ناوێکی کردە وەکیل لە کوردستانی عێراق بەناوی ئەو حیزبی پارتی دامەزرێنێ، هەمزە دەگەڵ برایم ئەحمەد ناوێکدا کە لە ژنانەوە خزم بوون. ببووە هاوماڵ، پاش رۆیشتنی بارزانی بۆ رووسیە. زۆری نەبرد ئەو دوو خزمە لەسەر سکرتێری کردن بوو بە شەڕیان و هەرکەسە هێندێک لە حیزبی بۆ خۆی برد.

ئەو چاخە لە حەیفی ئینگلیس هەموو کورد و عارەبێکی ئازادیخواز و رۆشنبیر لە عێراق، لایان وابوو: کۆمۆنیستی و ستالین پەرستی نەکەن خەیانەت بە وەتەن دەکەن. برایم نەتەوەخوازیی لە گشتەکی مارکسیزم پیلۆز دەکرد. بەڵام هەمزە بڕوای وابوو بێ پارتیی کوردستانی کلکی کمۆنیستی عێراقی بێ و هیچ بڕوای سەربەخۆی نەبێت.

حیزبی شیوعی عێراقیش جگە لە خۆی هیچ حیزبێکی پەسند نەبوو ناوی کوردستان هێنانی پێ کوفر و فاشیستانە بوو دەیگوت: بەوپێیەی ستالین دەربارەی گەلان فەرموویە: کوردگەل بە گەل حیساب ناکرێن. حیزبی پارتی لەناو دوو بەرداشی دوژمن، دەوڵەتی نوری سەعید و حیزبی شیوعی عێراقدا قەتیس مابوو. کێشە و هەرای ناوەخۆشی ببووە

سەربار تا وردە وردە وای لێ هات ببووە قالۆری کلۆر و تەنیا بەناو بارزانییەوە کە ئەویش لە مۆسکۆ دەژیا راوێستا بوو، ناو هەبوو، ناوەرۆک نەبوو، لە یەکەمین کۆنگرەی حیزبی پارتیدا کە دوای هاتنەوەی بارزانی بۆ وڵات، لە بەغدا گیرا، بارزانی هەمزە عەبدوڵڵای لە سکرتێری لابرد و بە دەنگدانی بەشدارانی کۆنگرەکە برایم بوو بە سکرتێر.

شەوێک لە دوای ئەم رووداوە بارزانی لەلای من گوتی: (برایم هەل پەرستێکە لە رێی بەرژەوەندی خۆیدا کوردستان و نامووسی خۆیشی دەفرۆشێ، بەڵام چبکەم؟. خەڵکی تر وەک من نایناسن، ئەگەر بڵێم ئەویش دەرکەن... دەڵێن کابرا دیکتاتۆرە - هـ.)

وەک باس کرا هێزی پارتی لە سولەیمانی کە برایم سکرتێری بوو دەگەڵ دەوڵەتا تێک گیرا و سەرنەکەوت و شکستی خوارد. بارزانی بەهێزی بارزان تووانی تۆڵەی بکاتەوە و ئابرووی تکاوی شکاوان بکرێتەوە... بەم حاڵەش را برایم ئەحمەد لای وابوو دەبێ مستەفا بارزانی هەرچەندە سەرۆکی حیزبیشە و هەرچەند بە هێزی تایبەتی بارزانییەکانی پەیرەوی کوردی وەسەر خستۆتەوە؟ وەک ئەندامێکی گوێ لە مست دەستەونەزەری راوەستێ و بە موو چییە لە فەرمانی جەنابی ئەو، کە رازدارە لاری نەکات، کە ئەمەش هەر رێک نەدەهات، پیاوی ترسەنۆک و شکاو تەواو حوکمی بەسەر ئازای سەرکەوتوودا هەبێ. برایم کە بە ئاوات بوو بارزانی لەسەر رێ لابا، نەدەوێراش ئاواتەکەی ئاشکراکا، لە بنەوە و بە دزی و فزیەتی دژی بارزانیی دەپورتاند و دەیەویست بەدناوی بکا.

دوای کودەتای هەشتی فبریەی ۱۹٦۳ کەبەعسی هاتە سەر حوکم و شەڕ وێستا بوو، من لە بەغدا جەلالم دیت کە بۆ وتووێژ هاتبوو... گوتی حیزب دەڵێ: هەژار با بێتە کوردستان، بەڵکو نێوانی بارزانی و ئێمەی حیزب خۆش کاتەوە. لە وەرامی پرسیارێکی منا گوتی: بارزانی هیچ گوێ ناداتە حیزبایەتی و حیزبیش ئەمە قبووڵ ناکا. کاتێ هاتمە کوردستان و چاوم بە بارزانی کەوت و کردەوە حیزبایەتییەکەی جەلال و برایم دیت، تێ گەیشتم خوار و خێچی و رێوبیازی لەژێر سەری سکرتێردا، برایم ئەحمەد دەیەویست لە حیزبا دیکتاتۆرێک بێ کەس لە روویا نەڵێ پیاوم... ئەو پایە و مایەشی نەبوو کە لای خەڵک زل بنوێنێ، ترسەنۆک بوو، زاتی چوونە ناو سەنگەر و هونەری مەردی و نەبەردی نیشاندان و سەرکردایەتیی مەیدانی شک نەدەبرد. نەیدەتوانی بێ بارزانی رۆژێکیش لە شەڕ خۆبگرێ بەتەماش بوو هەموو هەست و نستی شۆڕش، بێ چەک و چەکدار گش لە گش تەنانەت هێزی بارزانیش، هەر سەر بۆ ئەو بچەمێنێ و مەلا مستەفا بارزانی لە ناو

ناواندا نەمێنێ، وەک مشکێک دەهاتە بەرچاو بەتەمابێ فیل قووت بدا.

مانگی مارسی ١٩٦٣ کۆبونەوەی پیاوماقوڵان و سەرانی شۆڕشی کورد لە شاری کۆی پێک هات کە داوایان لە دەوڵەتی بەعس چبێت؟

لەو کۆڕەدا هەر دڵسۆزێک هەستی دەکرد کە برایم و هەواڵە گوێ لەمستەکانی تەنیا مەبەستیان ئەوەیە لە شۆڕش و لە بارزانی دوورکەونەوە و پلە و پایەیەک لە دەوڵەت وەربگرن و دەس هەڵگرن.

لە هەرەمەی کۆنگرەدا دەیانەویست لایەنگرانی بارزانی بە پوول بکڕن، دەگژ سەرۆکی رابکەن. پووڵیان لە کوێوە هێنابوو؟ دەرکەوت هەر لەمێژەوە، بەدزییەوە دەگەڵ دەزگای شای ئێراندا کەین و بەینێکیان کردووە، چەک و پووڵی لێ وەرگرن و دژی مستەفا بارزانی کە دوازدە ساڵ لەناو عرووسیاتی ژیاوە و کۆمۆنیستێکی خەتەرە خەبات بکەن.

لە هاوینی ١٩٦٣دا کە هەموو گرانایی شەڕ لەسەر مەڵبەندی بارزان بوو... برایم نەیهێشت پێشمەرگەی بەرفەرمانی لە کەرکووک و سولەیمانی و هەولێرەوە بچنە شەڕی حکوومەت و بارێک لەسەر بارزان سووک کەن. لە وەرامی پێشمەرگەی دڵسۆزا دەیگوت: با بارزانی لەناو بچێ، ئەوسا سەرکردەیی شۆڕش دەبێتە یەک، وێنەی بارزانیی شەهیدیش بە پوولێکی زۆر دەفرۆشین..

کۆمۆنیستی عەرەب و کورد، ئەوانەی لە قەتلوعامی بەعسییەکان رزگار ببوون و شۆڕشی کورد پەنای دابوون، ئامادە بوون بە چەک و ئازووقەی خۆیان بۆ پارێزگاری لە گیانیان هاوسەنگەری پێشمەرگە بن.. برایم لە چەکی کردن. بارزانی چەند نامەی بۆ نارد چەکەکانیان بداتەوە (هەشت نامەیان بە من نوسرا - هـ.) چەکەکان هەر نەدرانەوە.

گەلێ شتی تریش رووی دا - کە لەم لێدوانە کورتەدا مەودای درێژەدان نییە - کە بەجارێک دڵی بارزانی بێشێنێ و بڕیار بدا برایم لەسەر رێ لادات.

لە پایزی ساڵی ١٩٦٣ کە ئاگربەس راگەیەنرا و بارزانی بەرەو سۆران هات، من لە دۆڵەرەقەی ئاکۆ جەلالم دیت کە هاتبوو پێشوازیی بارزانی بکا و دەربارەی چالاکیی پارتی سەرۆک ببینێ و بیدوێنێ. باسی هەموو نافەرمانی و کردەوە نارەواکانی برایم بۆ شی کردە و لە کارەساتم تێ گەیاند، جەلال لای من بەڵێنی دا کە ئەو دلویە نەهێڵێ، واز لە برایم ئەحمەد بێنێ و بۆ خۆی ئەرکی سکرتێرایەتیی پارتی وەستۆ بگرێ. بارزانی بەوە رازی بوو.

بەڵام چونکە جەلال ئەودەم دڵی دابووە کیژە جوانەکەی برایم، بەرژەوەندی کوردستانی کردە قوربانی دڵداری، برایم لە خشتەی برد و خەیانەتی گەورەی پێ کرد.

لە بەهاری ١٩٦٤دا کە گوفتوگۆی خودموختاری دەگەڵ دەوڵەت دەس پێ کرابوو، برایم کردیە چاووڕاو کە بارزانی کوردستانی بە پارە و پرتەقاڵ فرۆشت.. لەسەر ئێزگەی رادیۆی شۆڕش کە دەبەردەستی خۆیدا بوو، بە بەیانێک بارزانیی لە سەرۆکایەتیی پارتی دەرکرد. بارزانی هێزی پێشمەرگەی نارده سەری. سەری برایم و جەلال و هەوالانی هاوبیر و بڕوایان شێوا، خۆیان نەگرت، هەرچی ئازووقەی هەیانبوو دە رووباری ماوەتیان کرد تا دەس پێشمەرگە نەکەوێ. گش لە گشتیان بە چەکەوە رەوینە دیوی ئێران و بوونە پەنابەری ساواک. ئێران لە چەکی کردن و بەرێیی کردن بۆ هەمەدان. کەم پایەکان بەبێ قەدری لە هەمەداندا مانەوە و زەلامەکان برانە شاری تاران و زۆر خۆش دەژیان.

(شیاوی باسە: مانگی جوونی ١٩٦٥ ئەو هەڵاتووانە لە شۆڕش بەغەیرەز برایم ئەحمەد بەقسەی ئێران گەڕانەوە لای بارزانی و عافوو کران. بەڵام جەلال تاڵەبانی کە بۆی نەلوا لەناو گەلدا جێگەی جاران بگرێتەوە و خۆشیان بوێ، خۆفرۆشتنیش فێر ببوو، زۆر لە شۆڕش ئۆقرەی نەگرت. یەکەم شەوی ساڵی ١٩٦٦، دەگەڵ هێندێک هاوبیرانی لە (دۆڵەڕەقە)ی ئاکۆوە خۆی دزیەوە و چووە ژێر ئالای دوژمنی قەستەسەری کورد نەژادان لە بەغدایە و ناوی جاشی شێست و شەشی کردە نازناو. ئەوسا برایم ئەحمەدی خەزوریشی لە تارانەوە بە فڕۆکە هاتە بەغدا و رۆژنامە و چەکیان وەرگرت و ماوەی چوار ساڵ چ بەنووسین، چ لە مەیدان، بوون بە گەورەترین دوژمن بۆ کوردستان و شۆڕشی. لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠ کە دیتیان دەوڵەت زەبوونە و دەیەوێ دەگەڵ کورد پێک بێت.. بە هەڵەداوان هاتنەوە لای بارزانی و هەر بە وتەی: پەشیمانین، عەفووی کردن، رێزی زۆریشی لێ گرتن...).

## دامەزرانەوەی پارتی

بەو دووبەرەکی نانەوە و خەیانەتەی جەلال و برایم ئەحمەد، زەبری زۆر زل وە قەوارەی شۆڕش کەوت. بەشی زۆری ئەو کەسانەی کە حیزبایەتییان دەزانی و کاروباریان هەڵدەسووڕاند، یان فریوی ئەوانیان خوارد، چوونە ئێران، یان دڵیان لەو دووبەرەکییە ساردەوە بوو ریزی شۆڕشیان بەجێ هێشت. ئەو کەسانەی هەم شارەزا بن لەکار و دڵسۆزیش بن بۆ کوردستان زۆر کەمیان مان.

دیسان پارتی دامەزراوە بەڵام زۆر بە پینە و پەڕۆ. جگە لە هەژنۆ کەس نەبێ کە لێزان و دڵسۆزیش بوون. ئەندامانی مەکتەبی سیاسی تازە و ئەوانەی بوونە کاربەدەست لە حیزبدا زۆربەی زۆریان هەلپەرست و لە کار سست و لە کادر پەروەردە کردن کوڵەوار بوون. تەنانەت ئامیر هێزەکان کە زۆر کەمیان لە سیاسەت سەریان دەردەچوو، لە مەکتەبی سیاسی و کارپێکهێنەردا جێگەی خۆیان خۆش کردبوو، هەر دەبوو هەڵبژێردرابان.. هی وا هەبوون ببوونە نیمچە دەرەبەگ، خۆیان لە رەشاییی خەڵک زۆر بە نەجیمتر دەزانی. جگە لە گیرفان پڕکردن ئاواتێکی تریان نەبوو.

هەرچەند پارتی لە زەمانانی پێشوو شدا هەرگیز وەک حیزبی نموونە تەکوز و رێک و پێک نەبووە. بەو خەیانەت تێکەوتنەی کە برایم و جەلال بوونە هۆی، لەوەندەی هەیبوو لەویش بوو... تەنیا ناو و خۆشەویستیی بارزانی بوو کە شۆڕشەکەی رادەگرت.

**٢- هەل لەدەس دان:**

زۆر دەرفەتی باش دەڕەخسا و لەدەس دەدرا. بۆ نموونە:

أ - لە جەنگەی کودەتای بەعس لەسەر قاسم کە دوو رۆژان مەعلووم نەبوو حوکمی بەغدا لەدەس کێدا؟ بە بڕوای من شۆڕش بۆی دەکرا زەبرێکی باش بوەشێنێ، هێزی چەکداری دەوڵەتی لە کوردستان تەواو سەری لێ شێوا بوو. بۆچ ئەو هەلەمان لەدەس دا؟ (کاک زەبیحی کە ئەودەمە لە کەرکووک و بەرپرسی حیزبی پارتی بوو.. لای من گوتی: فەرماندەی لەشکری کەرکووک وەڵامی نارد کە ئێمە بەعسیمان ناوێ، ئامادەین بۆ یارمەتیتان، بەڵام حیزب رازی نەبوو، لای وابوو بەڵێنێ بەعس کە لە زیندان دابوویان بە برادەرانمان کە هەرگا ئێمە سەرکەوین سەربەخۆیی دەدەین بە کورد، پێک دەهێنرێ).

ب - بە بڕوای خۆم لە جەنگی چیای (هەندرێن)، ئەگەر لەسەر داوای دەوڵەت ئاگربەسمان نەکردایە و پێوە چووباین.. مافی خۆمان هاسان بە دەوڵەت دەسەلماند.

ج - ساڵی ١٩٦٧ لە مانگی جوون کە عەرەب و جوو تێک بەربوون. چاکترین هەل هەڵکەوتبوو دەوڵەتی عێراق ناچارکەین بێتە بەربار، بەڵام هەستی ئیسلامەتی و برایەتیی کورد و عەرەب دەستی بەستین، کارێکی کرد کە راوەستین تا دوژمن خۆی دەگرێتەوە و هێرشمان بۆ دێنێتەوە و گوێش ناداتە ئیسلامەتی و برایەتی..

### ٣ - درێژەکێشان

بیستم جارێک مارشاڵ تیتۆ وێڕای سەلام گوتبووی عەرزی بارزانی کەن: (هەرگیز وا نەکا پێشمەرگە بێکار بن، ئەگەر لە شەڕیشدا نەبن، ڕۆژانە بە مەشق کردن، بە پەناگا و سەنگەر و ڕێ دروس کردن، بە یاریدەی وەرزێران لە کشتوکاڵدا مەشغوڵیان کات. لە بێکاری جگە لەوە کە لەشیان سارد دەبێتەوە فێری دزی و شەڕی یەکتر کردن دەبن) کە بۆ ئێمە دەستی نەدا...

شۆڕشی کورد لە ١٩٦١ را تا ١٩٧٥- ١٦٤ مانگ دوو سێ ڕۆژ کەم بەردەوام بوو. چوار جاران ئاگربەسی کرد، جاری وابوو بە ساڵ بە دوو ساڵ لە نێوان نە شەڕ نە ئاشتیدا دەژیاین لە ماوەی شەڕ وێستاندن و گوفتوگۆ دەگەڵ حوکوومەت پێشمەرگە بەرهەڵدا دەبوون، نە کار و نە بار، تەنبەڵ و تەوەزەل دەژیان، دەچوونە شار و بازاڕان، ئاواتی دەوڵەمەند بوون و ژیانی نەرم و نیانیان دەکەوتە دڵ. دڵیان لە سەنگەر دەبێزرا خواخوایان بوو هەرچۆنێک بێ شەڕ ڕاوەستێ.

### ٤- زرینگەی زێڕ

مێژوو دەڵێ کاتێ تالانی کیسرایان لەبەر چاوی عومەر ڕانا گریا، گوتی: زۆر لەوە دەترسم مالی دنیا تێکمان بدا؟! تا پێشمەرگەی کوردستانیش بەتایبەتی بارزانییەکان رووت و بێ ئەنوا و بێ نان بوون، جگە لە دوژمن کوشتن و کوردستان ئازادکردن و فیداکاری هیچ ئاواتی تریان نەبوو.. بەڵام وەختێ لە ناگوزووری دەرچووین و لە زۆر مەڵبەندی دنیاوە یارمەتی و کۆمەگمان بۆ هات و ئەو زاکون و رێک و پێکییەشمان نەمابوو کە نەهێڵین مالی شۆڕش حەیف و مەیلی تێدا بکرێ.. کاربەدەستانی هەلپەرست دەرفەتی خۆیان لێ هێنا و دەس کرا بە دزی کردن، دزی گەیشتە رادەیەک کە یارمەتیی نەمر نەژیی پێشمەرگەی سادەی ناوسەنگەر، مووچەی خێزانی شەهیدان، نیوەی پتر لێ دەدزرا. ئامیر هێز و بەرپرسیاری وای تێدا بوو ڕۆژێ بە سەتان دیناریان لە گومرگی سەرسنووران دەس کەوت، بەو حاڵەشڕا بەناوی ئازووقە و مووچەی پێشمەرگەوە و یاریدەی ماڵە شەهیدان، پووڵیان لە شۆڕش دەستاند و لە باخەڵیاندا گوم دەبوو.. تەنانەت ئەو بارزانییانەش کە سەتان ساڵ نموونەی دەس پاکی و چاکی هەموو خەڵکی کوردستان بوون و زۆربەیان هەر سکەی پولیان نەدەناسی. زۆر کەسیان فێرە دزی بوون و مافەتای پووڵ دایفەتاندن...

هەر لە سۆنگەی ئەوجۆرە ناجۆرانەوە شۆڕش و خۆشەویستیی گەلیش دایە کزی، گوندنشینانی کوردستان لەژێر باری پیتاکی بەسەر سەپاودا، بەناوی یارمەتیی شۆڕش، زەکات لە دەغل، لە مالآت، میوانی و نانی پێشمەرگە، بێگار و چەوسانەوەی تر، کەوتبوونە بۆڵە و پرتە و ئەو دڵگەرمیی کە دەپێشدا بۆ شۆڕشەکەیان هەبوو وەک خۆی نەما...

## هەل بۆ دوژمن

بەعسی هەر کە تێ گەیشتن هەستی نیشتمان پەرستیی کاربەدەستەکانی شۆڕش دەکرێ بە پوول بکڕدرێ، دەستی کرد بە ویژدان کڕین. گەلێ کەسیان تەنانەت هێندێک لە خزمی زۆر نزیکی بارزانیشیان بە پارە و بەڵێنی چەور کردە جاسووس لەسەر شۆڕش.

دەزگای ئێرانیش کە زانیی: تازە ئەو هێزە نەماوین بۆی بەگژ سەددام - دا بچین و بەربەستی کەین، نەخوازا کە خودموختاریش بۆ کورد راگەیەندراوە، نەوەکا کوردی ئێرانیش خۆبزێون، کەوتە سەری کە لە تێکدانی شۆڕشدا لە بەعس بەجێ نەمێنێ. زارکی کیسە و رێی شارانی ئاواڵە کرد، تئاتر و بارِ و مەیخانە و چی چی خانە لە تاران و شارەکانی تری ئێران لەبەر سەرانی شۆڕشی کوردی عێراق بەر کەسی تر نەدەکەوت. زۆر لە مامۆستاکانی حیزب بۆ تەماحی پلە و پارەیان ببوونە پیاوی عێراق، یان خۆیان دابوو بە ئێران، یان لە هەردوو بەریان دەخوارد..

بە کورتی: شۆڕشەکەمان لە سالآنی ١٩٧٠ وە تا ١٩٧٤ ببوو بە گەندەڵە دارێک باشی لێ نەدابا دەشکا.. کە گێژەڵووکەشی بۆ هات..

رووسیا کە وایدەزانی بە یاریدەدانی بەعس عێراق کە لەسەر خەلیجە دەبێتە پێگەیەک بۆ ئەو، کام چەکی هەرە گرینگی روخێنەر و سوتێنەر بوو دای بە سەددام.

ئەمریکاییش کە بۆ سنوور پاراستنی ئێرانی بەردەستی خۆیان کەم تا کورتێک یاریدەی شۆڕشیان دەکرد. لەو ترسەی نەوەک کێشەکە زلتر ببێ و عێراق دەربەست خۆی بخاتە باوەشی رووس و لە ئاکامدا خەلیجیشی لێ ئالۆزبێ، خۆی لەو کێشەیە کێشایەوە و ئێرانیشی کشاندەوە..

ئیتر شۆڕشی کوردستان نەک هەر هێزە چەکدارەکەی، بگرە هەموو کوردەکانی تریش کە لەبەر حوکمی شۆڕش بوون، هیچ دەرەتانیان بۆ نەما، تەنانەت ئاردی رۆژانەش ئەگەر

لەلاوە نەهاتبا، هیچ کەس حەوتەیەک نەدەژیا، چجای چەک و کەرستەی شەڕ..

بەداخەوە چاری ناچار راو بەتاڵ راگەیەندرا و زۆرمان بووینە پەناهندە لە ئێران و وڵاتانی ئوروپایی و زۆریش دەبەر دەستی بەعسا تووشی زیندان و کوشتن و دوورخران لە کوردستان بووین...

## قسەی خەڵک

ئەوانەی دوور لە شۆڕش و دڵسۆزی کوردایەتی بوون گوتیان: شۆڕش کە بەبێ یارمەتی لاوە و بێ نان و چەک دەستی پێ کرد و سەرکەوت، نەدەبوایە دەس هەڵگرێ، دەبو جەنگی پارتیزانیی بکردایە، جا یان گاڵ دەهات یان پەمبۆ..

ئەوانە ئەگەر بە وردی لەو چەند پەڕانەی نووسیومن وردبنەوە و تێ بگەن شۆڕشەکەمان لەم چوار ساڵانەی پاشیندا کام دەردی بوو، تێ دەگەن کە لە قڕبوونی چەند هەزاران لاوی ئازای کورد بەولاوە هیچمان بۆ بە هیچ نەدەکرا..

کەسانێکیش کە لە سیاسەت هەر خۆفرۆشتن دەزانن، گوتیان: بارزانی خۆی فرۆشت. بە کێ؟ بە ئەمریکا و شا و تورک و جوو. واتا، گوێزیان لە هەنبانەی خۆیان دەبژارد.

بەڵام هەر کەس وەک من بارزانیم ناسیوە، سەدیەکی منی ناسیبێ، دەزانێ ئەو تۆمەتانە وەک حەپە لە عاسمانە. مەلا مستەفا بارزانی بەدەمار و سەربەرزێک بوو کە وێنەی لەم جیهانەدا یان نەبووە یان کەم هەڵکەوتووە. زۆر پیاوی هەڵکەوتەی دنیا، زۆر قارەمانی خاوەن ناو وەک بارزانی نەگەیشتوونە ئامانج و تێ شکاون..

هۆی هەر زیانێک لە ژیانا بێ گومان بە هەڵەچوونە. دەبا بزانین بارزانی ئامانجی چبوو؟ سیاسەتزانیی تا کوێ بوو؟ رەفتار و ئاکاری چۆن بوو؟ کام هەڵەی بوو کە نەیهێشت بە ئاوات بگات؟

## بارزانی و ئامانجی لە ژیان

بۆ کوردستان خۆشەویستی نە من وێنەم دیوە نە کەس. ئەوپەڕی ئاواتی لە ژیان پێکهێنانی کوردستانی سەربەخۆ بوو. خودموختاریی بە پێپەیژەیەک دەزانی بەرەو سەرکەوتنی سەریان.

(رۆژێک کە هەر دوو بەدوو بووین گوتم: کورد دەوڵەتی هەبێ ناتوانێ ئیدارەی بکا،

چونکە بوواری کەناری دەریامان نییە.. فەرمووی قسەی سەیر دەکەی.. «شەرەفنامە»ت وەرگێڕاوە و ئەمەش دەڵێی؟ چۆن نازانی لەلایەک تەنگەی هورمز و لەلایەک ئەسکەندەروونە کوردستانە و لە دوو لاوە پاڵمان بە دەریاوە داوە؟؟)

دیباچەکەی مەم و زینی شێخی خانی بە سەرمەشقی خۆی دەزانی، لەبەری بوو، بەتایبەتی گەلێک جاران ئەو دوو بەیتەی دەخوێندەوە:

گەر دێ هەبوا مە ئیتتیحادەک وێکڕا بکرا مە ئین--قیادەک

تورک و عەرەب و عەجەم تمامی هەمیان ژ مەرا دکر غولامی

## بارزانی و سیاسەتی لاوە

نزیکەی شێست ساڵ تەمەنی لە خەباتی بێ وچان و کێشە و گیرە و بێنەو بەرەی سیاسەتدا گوزەرا بوو، لە بۆتەی ئەزمون قاڵ ببوو، فێڵ و تەڵەکەی ئینگلیس و دەهۆ و داوی ئێرانیان و درۆ و نامەردیی تورکانی باش دەناسی، چەند ساڵێکیش لە رووسیا دەگەڵ سەرانی کرملین رای بوارد بوو.

دەیزانی لە دنیای ئەمرۆ سیاسەت بێ دایک و بابە یان بەدەردی کورد گوتەنی: وەک نیسکی بێ بەروپشتە. هەر دەوڵەتەی وەک دوکانداری زۆر خەسیس لە قازانجی خۆی بەولاوە هیچ دۆز و مەرام شک نابا، هەرگیز پووڵە سوتاوێکیش بۆ پیاوەتی و مرۆخوازی بەخت ناکا. هەر یەک لەو سەوداگرانەش کە بە دەوڵەتیان دەناسین. زل یا پچووک، بە دوای کڕیاردا هەڵوەدان، بۆ فریودانی ساویلکان نازناوی نەزان خاپێنیان لەخۆ ناوە، دیموکراسی، لاگیری لە مافی مرۆ، دژایەتیی دیکتاتۆری، داژداری لە چینی هەژار و هەزاران چاوڕاوی تر، بۆ چاوبەستنی گەلانی بێ دەستەڵات داتاشراون و هەر ناوی بێ ناوەرۆکن.

خێرەومەند و خاوەن بەزە لەناو ئاپۆرەی گەلاندا دەس دەکەوێ.. بەڵام شەرەف و پیاوەتی و مرۆدۆستی بۆ دەوڵەتان ئەفسانەیە.

بۆ گەلی کوردی لێ قەوما و ئەگەر بە نیازبێ دەوڵەتان بینە دۆستی و رێگە بدەن مرۆدۆستی وڵاتەکانیان کۆمەگ بکەن. ئەبێ هەر بەتەمای هێزی بازووی خۆی تێ کەوێ و بەگژ داگیرکەردا بچێ و بتوانێ هێندە خۆبگرێ تا خۆی نیشان دنیا دەدات کە هێزێکە و ئەشێ حیسابی بۆ بکرێ و لەوانەیە لە دوا رۆژا ببێتە یاری تەنگانە و ئەگەر دۆستایەتیی

بکەن قازانجیانە، واتا بە قسەی ئەبولعەلا: نەبی بە بەچکەشێر دەتخۆن، کەس یاری بێ هێزان نییە.

ئەوساش ئەگەر بە نەترسی و قوربانیدان و نەبەزین خۆی وەک هێزێکی نرخدار بە خەڵکی دنیایە ناساند. پێویستە کارێ وانەکا دەوڵەتانی زەبەلاحی دژ بە یەکتر هیچیان لە خۆی دەردۆنگ بکا، رەنگی شین و سوور لە خۆی دا، چونکە هەرکامیان قوشقی کات، باسی سەرە.

گەلی کوردی خەباتکار و ئازادیخواز تەنیا دەبێ هاوار و داد لەدەس زوڵم و بێ عەداڵەتیی داگیرکەر راگەیەنێ و واپیشان دا کە تا ئازادی نەستێنێ و خۆی وەک بنیادەم نەناسێ..؟ رێگەی لێکدانەوەی نابێ و رێوشوێنی دوارۆژی خۆی ناتوانێ ئێستا دیاری کات. کەی رزگار بوو دەبێتە یاری ئەولایە کە زۆرتر یاریدەی داوە. بارزانی لەم بازارەدا زۆر کارامە و سەرکەوتوو بوو، تووانی لە هیچی نەبوورا، هەربەدەست و تفەنگی خۆی بگاتە ئەو هێز و رێزە کە لەبەرچاوی لاوەکییان زل بنوێنێ و لایان وابێ لە دۆستایەتی کردنی درەنگ یا زوو قازانج دەکەن.

ئەو (تەفرەشیان)ەی باسمان کرد دەربارەی بارزانی دەڵێ:

(بارزانی نە دەرەبەگ بوو نە کۆمۆنیست، نە سەر بە هیچ دەوڵەتێک بوو، دەیگوت من خۆم بەنۆکەری میللەتەکەی خۆم دەزانم، هەتا دەستم تفەنگ بگرێ بۆ ئازادی کورد دەکۆشم. من دەمەوێ ئاڵای کوردستان هەڵ بکەم، نەهێڵم کوردستان چیتر یەخسیر و داگیرکراو بێت. بۆ پێک هاتی ئەم ئاواتەش تەنیا رووس لە قازانجیانە لاگیرمان بن، تورکیا و ئێران و عێراق بە لەدەست چوونی کوردستان زۆر کز دەبن کە هەرسێکیش وەک نۆکەری ئاڵقە بەگوێی ئەمریکایی و ئینگلیسانن، بەڵام ئەم دەوڵەتی روسە زۆر (رەزیلە)، زۆر گرانە بکەونە سەر یاریدانمان).

## پەیوەندی دەگەڵ هەندەران

شۆڕشی کورد لە دنیادا دەنگی داوە، رۆژنامەنووس و پەیامنێر لە ئوروپا و ئەمریکاوە خۆیان گەیاندە ناوچەکە، دەنگوباسی ئازایەتی و ئازادیخوازی و بێ نازی و پەرێشانیی شەرکەرانی کوردستانیان بەگوێی خەڵکی دنیادا دا(١)، خێرەومەندان لەگەڵێک ولاتانەوە بۆ یارمەتیدانی شۆڕش وەخۆ کەوتن، بەڵام کاربەدەستی بەعسی هەموو سنووریان بەستن و

تەنانەت یارمەتی و باربووی خاچی سووری دەوڵەتانیش نەیدەتووانی بمانگاتێ، ئازووقەیان بەناوی ئێمەوە دەنارد. بەعسی دەیدا بە جاشە کوردەکانی خۆی. لەبەر ئابلووقەی ئابووری و لەبەر گەمارۆی نیزامی و لە سۆنگەی بۆمباباران و سوتمانەوە، بۆ نانێکی رۆژ ئاتاج بووین. تۆزێک دەرمان بۆ دەرمانیش دەس بریندار نەدەکەوت. رۆژی وامان بەچاوان دیت کە پیاو لە برسان دەمرد و هاومالان و هاوحالانی لە بێ هێزبوونی بێ نانی نەیاندەتوانی وەیشێرن. بە دەیان پێشمەرگەی ئازا لە کەم نانی و بێ پێخۆری سۆمای چاویان لەدەس ئەدا.

باسی کەساسی و تەنگانەی ئەو دەمانە لەم کتێبەدا ناگونجێ. پوختەی وتار: یان دەبوا هەمو شۆڕشگێڕ لە بێ نانی و بێ دەرمانی قڕان بکەن، یان دەرەتانێک پەیداکەن کە یارمەتیی خەڵکی لاوەیان پێ بگات..

## دۆستایەتی دەگەڵ ئێران

وەک باس کرا ساڵی ١٩٤٥ بارزانی هاتبووە ئێران، دەگەڵ ئەرتشی شاهەنشا لێکیان دابوو، بە سەتانی لێ کوشتبوون، جیا لەوەش سوور دەیزانی هەتا شا لە ئێران مابێ، چینگوڕکی لە داگیرکردنی خاکی کوردستان بەرنابێ و لەپاش تورکان دوژمنی ژمارە دووە. لێش بڕابوو هەر لە عێراق رزگار ببێ دەگژ ئەو دوژمنە راچێ.

(لە بەهاری ١٩٦٢ لەسەر ئەسپاردەی بارزانی لە بەغدا چاوم بە سەفیری میسر کەوت، پەیامی بارزانیم دایە: کە بەو مەرجەی عەبدوننا سر کارێک بکا عێراق لە شەڕ دەس هەڵگرێ، میسریش کەمێک چەکی دژی فڕۆکە و تانکمان بداتێ شۆڕش دەبەینە ناو ئێران کە هاوپەیمانی سەنتۆیە و ناسر گەرەکیە لاواز بێت. ناسر نەیکرد).

چەند ساڵێک بوو نەژادخوازەکانی عەرەب وەک سوریە و میسر و عێراق، عەرەبستانی ئێرانیان داوا دەکرد، خەلیجیان ناونا عەرەبی و گەڕیان دە ئێران دەهالاند کە شۆڕشی کورد هەڵگیرسا شا دەیزانی ئیتر لەبەر شەڕی ناوخۆ عێراق نایپەرژێ گێچەڵی بۆ بنێتەوە و داوای خوزستانی لێ بکات.

جا تا برایم و جەلالی لە عێراق دەبەر دەستا بوو، بە چەک و پارە و کەلوپەل یاریدەی ئەوانی دەدا ولە لایەک لە دژی عێراق و لەلایەک دژی بارزانی کە بە دوژمنی خوێنەخۆی و بە کۆمۆنیستی دەزانی، دنەی دەدان. بەلام کە ئەو هەوالانەی نەمان چاری ناچار، بۆ

مانەوەی ئەو بەربەستە لەبەر بەعس، پێشنیاری یارمەتیی بە بارزانی کرد.

لەم لایشەوە شۆڕشی کورد لە دەرەتانێک دەگەڕا کە بتوانێ کۆمەگی لاوەی پێ بگات. رەعیەتی شای ئێران نییە کە لای وابێ بە تەما دەبێ و دەوێرێ خاکەکەی لێ داگیربکا، ئەگەر ئێران لە رووی شۆڕش سنوورەکانی دانەخا و باربووی لاوەمان پێ بگا، یان هەر خۆیشی بۆ رزگاربوون لە خوزستان داواکەران، هاریکاریی شۆڕش بکا. لە قازانجی هەردووک لایە و کەس کەسی فریو نەداوە.

مەسەل دەڵێ: پیاوی ناچار سەر وەماڵ دوژمندا ئەکا. بارزانی و شاش کە هەردووک دوژمنی یەک بوون، هەردووک لە رووی ناچارییەوە بوونە هەواڵ.

ئیتر باربووی گەلانی ئازادیخواز و ئازا پەسند لە ئورووپای رۆژهەڵات و رۆژاواوە و ئەمریکاوە بە سنووری لای ئێراندا گەیشتە دەست شۆڕشگێڕان.

لەلایەکی تریشەوە دەوڵەتی رووس هەرچەند کەرستەی شەڕیشی بە دەوڵەتی عێراق دەفرۆشت، پەنامەکی جارۆبارە دەرمان و یارمەتیی دیکەی بۆ دەناردین و دۆستایەتیی بارزانی لەدەس نەدەدا. واتا ئەگەر بە تیری ئەوان دەپێکراین، هەر بە مەڵحەمی ئەوانیش دەرمان دەکراین.

شیاوی باسە: لە سەرەتای شۆڕشەوە هەتا دواییی ١٩٧٣ پەیوەندیی ئاشنایانەی رووس دەگەڵ بارزانی نەپچڕا، سەرەڕای یارمەتیدانمان بە کەلوپەل، رێ نموونیشیان دەکردین بۆ نموونە: ئاگربەس و گوفتوگۆمان دەگەڵ حوکومەتی (بەزاز) لەسەر راوێژی ئەوان بوو، ئێران هەوڵی زۆردا نەکرێ، بە قسەی نەکرا.

## بارزانی و رەوش و ئاکاری

لە بنەماڵەیەکی سۆفی و تەرکە دنیا هاتبووە سەر ئەم دنیایە، دەرسی عەرەبیی خوێندبوو ببووە و مەلا. زۆربەی قورئانی لەبەربوو. باوەڕی بە ئیسلامەتی و بە قەزا و قەدەری خودا زۆر پتەو بوو. زبر و بێ ناز بەخێو ببوو. لە دووی شتی چەور و نەرم هەڵوەدابوون فێر نەببوو. جلکی جوان دەبەرکردن و کەشوفش و دیمەنی دەوڵەمەندانەی پێ گەمە بوو. تەنانەت دەو دەمانەشدا کە سەرۆکی ئەم شۆڕشە گەورەیەش بوو لە هەژار و نەداران پۆشتەتر نەبوو. بەرگ و پێڵاوی هەمیشە کۆن و چەک بوو. گۆرەویە کون تێ بووەکەی خۆی بە دەستی خۆی دەچنییەوە. فیز و خۆبەزل زانینی پێ کفر بوو. خۆی لە هیچ

شوان و گاوانێک بە گەورەتر نەدەزانی. هەروەک خۆیشی لە هیچ کەسێک لە دنیا پێ کەمتر نەبوو. لە بەرانبەر بەفیز و دەعیە و خۆ بەزل زان، ئەوپەڕی سەرسەختیی دەنواند، رووی نەدەدایە نەیدەدواند . لە جەنگی پارتیزانیدا بلیمەت بوو. لە پیلان دانانی شەڕدا زانایەک بوو سەری دۆست و دوژمنانیشی سوڕدەما. بۆ ئازایەتی و بوێری و زیخی و نەبەردی و دلێری بە بڕوای من و هەر کەسێک، بارزانیی لە جەنگدا دیبێ، رەنگە تای ئەو لە جیهاندا هێشتا لەدایک نەبووبێ. من لە شەڕەکانی بارزان دەگەڵیا بووم، هاتبوومە سەر ئەو باوەڕە کە نازانێ مانای وشەی «ترسان» چییە...

لەوپەڕی هێمنایەتیدا و لەناو کۆڕی یارانی خۆشەویستیدا چۆنت دەدیت؟ لە مەیداناش کە دوژمن ئابلۆقەی دەدا و لە چوار دەورە و لە عاسمانڕا بەر دەسرێژی گوللە و موشەک و بۆمب ئەدرا و مەرگ دانی لێ چیڕ دەکرد. هەر ئەو پشوو لەسەرخۆیە و هەر ئەو گەش و رووخۆشە بوو، تۆسقاڵ چییە نەدەگۆڕا..

هەموو پێشمەرگەی هەواڵ و هاوسەنگەری و کوردی ساکار و بێ فێڵ و ئازادی خوا و ئازا پەسند بەتێکڕاییی پیر و لاوی، ژن و پیاوی، مناڵ و رووباڵ و کاڵی بەو سەرکردە رەشیدەی خۆیان دەنازین و وەک گیانی خۆیان و پتریش خۆشیان دەویست.

(تەفرەشیان.. لە بیرەوەریی ساڵی ١٩٤٥یدا نووسیویە: ژیانی ساکار و ئاکاری جوانی بارزانی تەرزێک بوو کە بارزانییەکان بەگشتی وەک ئۆمەتێک پێغەمبەری خۆی خۆش دەوێ، خۆشیان دەویست. دەگەڵ چەکدارەکانیدا لەسەر خوانێک نانی دەخوارد، وەختی شەڕ لە پێشەوە بوو. لەناو سەنگەریاندا دەنووست). هەر ئەو تەفرەشیانە دەڵێ: (رۆژێک سەرهەنگ غەفاری ناوێک لای شاوە بۆ وتووێژ هاتە (شنۆ)، بە ئێمە کە شەش ئەفسەری هەڵاتووی سوپای ئێران و لە پەنای بارزانیدا بووین گوتی: ئێوەش بڵێن نایەینەوە.. مەلا مستەفا بەڵێنی بە شا داوە ئێوەمان تەسمیل کاتەوە... بارزانی زۆر بە تووڕەیی تێی راخوڕی: شەرم ناکەی درۆ دەکەی؟. من بە شایەکەتانم گوت: بە دڵ ئامادەم لەجیاتی ئەو شەش ئەفسەرە هەژدە کوڕ و برازای خۆم بدەم بە ئێوە بیانکوژن، بەڵام هەرگیز ئەمانەتان نادەمەوە و ئابرووی ماڵە بارزان نابەم).

تەفرەشیان لە شوێنێکی تر نوسیوەتی: (بارزانییەکان زۆر ئازا بوون، بەڵام بیر و شارەزاییی مەلا مستەفا بارزانی ببووە مایەی سەرکەوتنیان.. لە پیلان دانانی شەڕدا زۆر زانا بوو. ئێمە ئەفسەری ئێرانی کە لە دانشگا دەرچووبووین و ئەزموونی جەنگیشمان

هەبوو، هەرگیز لە پیلان داناندا وەک ئەومان لێ نەدەزانی).

## پیاوەتیی لەڕادە بەدەر

ئەگەر (نیکولۆ ماکیاویل) لە سەرەتای چەرخی شازدەهەم گوتوویە: (تەنها گەیشتن بە ئامانج بۆ سیاسەتمەدار مەرجە، رامیار نابێ گوێ بداتە شەرم و شوورە و ئەمەگداری و بەڵێن و پەیمان پێک هێنان و پیاوەتی و لۆمەی ویژدان و بەزەیی و لەخوا ترسان و ئەو شتانەی کە رەشاییی ناویان ناوە ئاکاری باش. وەک دەشزانین ئەمڕۆ لە هەمو جیهاندا، لە خۆرهەلات، لە رۆژاوا، هەمو سیاسەت مەدارێک لەسەر فتوای ئەو ماکیاویلە دەژین و سەرزارەکیش خۆیان دەڵێن: نەیاری ماکیاویلیزمین.)

مەلا مستەفا بارزانی: موسڵمانی لەخواترس و بەویژدان و مەردی مەیدان... دوژمنی ئەو سیاسەتە بوو.. ئەگەر باسی سەریشی با درۆی لەدەم دەرنەدەهات. بێ ویژدانی و پەیمان شکێنی تەنانەت دەگەڵ دوژمنی بێ ویژدان و پەیمان شکێنیش نەدەکرد. دڵ بە ڕوحمی و بەزەییی ئەو، دوژمنە یەخسیرەکانیشی دەگرتەوە. نە ئازاردان بوو، نە بێگار، تا دەیناردنەوە شوێن خۆیان بۆیان لە باوک باشتر بوو.

زۆر جاشە کوردی وا هەبووە شیاوی کوشتن نەبێ نەبووە، کاتێ لە شەڕدا گیراوە هەر گوتوویە پەشیمانم و دێمە بەختت بەخشیوەتی.

لە وەفا و ئەمەگداریدا یەکە پیاو بوو. هەر کەس جارێک کارێکی وای بکردایە کە بەر دڵی بکەوتایە، ببڕای ببڕای هەرگیز لەبیری نەدەچوو. بەدەم و دەست باسی چاکەی دەکرد و پاداشی چاکەی دەداوە.. چاوتێر و دڵاوایەک بوو زێر و خۆڵ لای ئەو یەکسان بوو. هەر کەسێک ئیتر فەقیر با یان خوازەڵۆکی فێڵباز با، چەندی لێ داواکردایە، هەر شکی بربا دەیدایە..

لە تاریف و پێ هەڵگوتن زۆر قەڵس بوو.. هەر دوێنەرێک لە رووی خۆیا پێی بگوتبا مامۆستا یان سەرۆکی کورد، ترۆی دەکرد.. دەیگوت: من لە کەس زلتر نیم. بۆ هەر ناوەکەی خۆم ناڵێن؟..

ئاکاری دیکتاتۆرانە و فەرمان بەزۆر سەپاندنی لەناو حیزبا هەر لە خەیاڵیشدا نەبوو، لە کۆنگرە و کۆنفرانسان وەکو هەر تاکێک لە مەردم خاوەنی تاکە دەنگێک بوو. زۆربەی دەنگ بەکێ درابا هەرچەندە بە دڵیشی نەبوایە پێ رازی بوو.

ئیتر دەست و دڵی پیسانی ئاکارپەست و پارەپەرست کە لە سایەی دەستەبەندی و گەلەکۆمەکیی یەکتری زۆریان ببوونە کاربەدەست، لەو هەموو دڵنەرمی و بەزە و چاو لە خەتاکار پۆشینە و بە تۆبە گوناه بەخشینەی ترسیان لە سزادانی توند لەلا نەما و بوونە چەقەڵ لەناو چەما و کێسیان لە رەزی پڕ بەری شۆڕشی کوردستان هێنا و بە ئارەزوو دەمیان تێ نا. لە هەموو هەڵبژاردنێکا بە تەڵەکە فێرەکانیان دەنگی هەڵبژێرەکانیان بە دەستەوا دەدا بە یەک و کۆن هەر لە شوێن خۆیان دەمان. خۆفرۆشی و خەیانەت و دزیی یەکتریان دەپۆشی و نەیاندەهێشت نە بارزانی نە دوو کوڕە دڵسۆزەکەی: (ئیدریس و مەسعوود بارزانی) پێ بزانن. هەرگا لێرو لەوێ جارێک تاک و تەرا هەژارێکی راست و خەمخۆر هاوارێکی دەکرد: های دز. ئەو زنجیرە تێک خراوەی پیاوخراوان بەدەستی گەل پاکانەی یەکتریان دەکرد و گلی کاریان بە تاوانباریش دەردێنا...

بەتایبەتیش کە بارزانی لە چەند ساڵانی دواییدا پیری بڕستی بڕیبوو، ئەو هێز و گوردەی نەمابوو کە وەک پێشو بەناو مەردمدا بگەڕێ و لە کارەسات وەک روویدابوو، ئاگاداربێ.

(لەبیرمە: دوای راگەیانی خومختاری بۆ کوردستان، بارزانی لە کۆبوونەوەی سەرانی حیزبدا گوتی: بۆمبا و تۆپ و تانکی دوژمن نەیشکاندین، هۆشتان هەبێ بە ترومبێل، بە کۆشک و کورسی و پلە و پووڵ دوژمن کێستان لێ نەهێنێ و ئەوی بە خوێن دەسمان کەوت بە دینار لێتان نەستێنێ). کە داخەکەم زۆر دەمێک بوو ئەو هۆش و گۆشە نەمابوو..

کورت و کرمانجی: ئەو پیاوە لەمەڕ ئاکار و کردەوەی مەردانە و مێرخاسانەوە یەکێک بوو وەک (سەلاحەدین)، کە لە شەڕدا ئەسپ و شیری بۆ ریچاردی دوژمن دەنارد، برینیشی دەرمان دەکرد، مێژووی ئوروپا تا ئێستاش پەسنی ئەو جوامێرییەی ئەدا...

بەڵام نێوانی زەمانی سەلاحەدین و بارزانی هەشت سەدە بوو، دنیا هەزار جار گۆڕابوو.. لە دووهەم نیوەی سەدەی بیست کە دنیا بۆتە گورگستان، سەرکردەی شۆڕشێکی وا ئازادیخواز پێویستە زۆر توندوتیژ و حیسابگەر بێ و هەرگیز بەبێ تۆژینەوە و پرسینەوە و دەربەست بڕوا بە هیچ کاربەدەستانی خۆی نەکا. با دۆستی زۆر لەمێژینە، یان خزمی زۆر نزیکی بن.

بە بڕوای هەژارانەی خۆم: بارزانی وەک لە سیاسەتی دەرەکیدا کارامە بوو، نیو ئەوەندە

لە ئیدارەی ناوەخۆی شۆڕشەکەیدا وەک ئەم ڕۆژگارە هەڵدەگرێ کارا بوایە، هیچ نوشوستی نەدەهێنا. نەرم ونیانی و ڕەوشتی پاکی مەردانەی کوردانەی خواپەسند و قەدیمیانەی کە لەمرۆدا باوی نییە.. هەڵەیەک بوو کە بوو بەهۆی پەت پسانی زۆربەی کاربەدەستەکانی هەلپەرستی دەوروبەری، کە بوونە مایەی نەگبەتیی خۆشیان و شۆڕشەکەشمان. دیواری ئەنواکەی خۆیان وا بنکۆڵ کرد، بە سووکە پاڵ پێوەنانێکی سەدام و شا بەلادا هات..

بەداخەوە بارزانی دوای ئەم زیانە هێندە لەسەرزەمین نەما کە وەک چەند جاری ڕابردووی واز لە دوژمن هەر نەهێنێ و سەر لەنوێ ڕاپەڕێتەوە و پەژارەی هەژارانی کورد بە مژدە بگۆڕێتەوە.. لە یازدەی مانگی ڕەشەمەی (١٣٥٧-هەتاوی١/٣/١٩٧٩) بە ژانی سەرەتانی خوێن لە ئەمریکا، لە نەخۆشخانەی جۆرج تاون ئەو دڵە گەورەی کە نزیک بە هەشتا ساڵ هەر بۆ کوردستانی لێدا، لەکارکەوت. تەرمی پاکی هێنرایەوە کوردستان و ڕۆژی چاردەی ڕەشەمە مانگ وێرای ڕێژنەی زۆر بەتاوی فرمێسکی هەزاران هەزار پیر و لاوی کوردی تازە باوک مردووی هەناسە سارد، لە گۆڕخانەی (شنۆ) نێژرا.. هەرچەند بە ڕواڵەت بارزانی لەبەرچاوانمان نەماوە، بەڵام بەڵگەی هەرمانی لەناو دڵاندا لە کوردستان و جیهاندا هەر دەمێنێ و لەناو ناچێ. وەک لە یادیدا گوتوومە:

لە ڕۆژگارانی تازە و زوو
بە شایەتیدانی مێژوو
لە عاسمانی کوردەواری
لە گۆشەی ئاسۆی خوێنباری
زۆر ئەستێرە درەوشاون
دڵمان بەیادیان نەخشاون
قارەمانانی گەل پەرست
چاونەترسانی گیان لە مست
دژی لاساری خوێنمژ بوون
دۆس لاوێن، داگیرکەر کوژبوون
ترسێنەری بێگانە بوون
تاکە سوارەی زەمانە بوون
ئالای ئازادی لەسەر شان
بێ وچان بۆمان تێکۆشان

له دەردی گــــەل بوونە دەرمــــان
ئەمــەگــیــان زۆرە لەســەرمــان
بــا لــەبــەرچـاویـش نـەمــــابـن
لـــەچـاوی دڵ نـــەدیـــو نـــابـــن
بۆ ئێـمـــه جـێـگەی شـــانازین
مـــامــۆســـتـــای ئازادیخـــوازین
یـادگـــــاری زۆر بــە مـــــایـەن
بۆ مـــانی کـــوردســـتـــان پایەن
فـــریشـــتـــەی بەختن لەســەرمـان
هـەروان لـه هـەواری هـەرمـــــان
لەناوکـــۆی ئەو ئەســـتــێـــرانه
لەناوجــەرگـــەی ئەو شــێـــرانە
روناکـــتـــر و گـــەشـــەدارتر
هـەڵـکـەوتـه و ئـازا و بـەکـــارتـر
لـه ئاســـۆی بـارزان دەرکـــەوت
له عـــاســمـــانی کـــورد ســەرکـەوت
گـــــەلاوێژ و کـــاروان کـــوژه
له حـــــاند ئـەو دەورەیان مــــژه
کـــاکــه مـــســـتـــەفــا بارزانی
بەگـــەڕناسی و بـه مــــێـــرانی
لـه شـــەوی کـــورد خـــۆرەتاوه
هێـــزی هەناو، ســـۆمـــای چاوە
چـاوی دڵــی کـــــــــردینـەوه
ترسـی لـەبـیـــــــر بـردیـنـەوه
ئـەو شـــــۆڕشـگـێـــرە بێ وێـنـه
ئەو دۆســـتـــە دوژمـن شکێنه
پەڕاندی لـەمــــپــــەرو پەرژین
خـســـتـیـنیـه سـەر شـەقـامی ژین

بۆ هەژاران خۆی بەخت کرد
ڕێگەی خەباتی تەخت کرد
بە نەبەردی و بە کردەوە
لە دنیا گرۆی بردەوە
لەناو گش کۆمەڵ و چیندا
لە سەرانسەری زەمیندا
لە سایەی ئەو خەباتەوە
ناوی کورد دەنگ ئەداتەوە
تا هەستی ئازادیخوازی
تا خۆبەخشین و گیانبازی
تا نەترسان و بوێری
تا مەردایەتی و جوامێری
لە دنیادا قەدریان مابێ
ناوی بارزانی ون نابێ

بۆ ئەم دوانە لەمەڕ بارزان و (بارزانی).. جگە لە بیرەوەیی خۆم ڕوانیومەتە:

١- بارزان و کوردایەتی. گردەوەکۆی: پێ رەش (ایوب بارزانی). بەعارەبی.

٢- (اسرار بارزان). نوسراوی دکتر اسماعیلی ئەردەڵان. بە فارسی.

٣- سەفەرێک بۆ ناو ئازایان. نووسینی دانا ئادام شمیت. وەرگێڕانی جەرجیس فەتحوڵلا، بە عارەبی.

٤- قیام افسران خراسان. بە قەڵەمی: تەفرەشیان، بە فارسی.

هەروەها بۆ تاریخی مانگ و ساڵی چەند ڕووداوێک لە برایان: مەسعوود بارزانی، فەرانسۆ حەریری، یادداشتی جەرجیس فەتحوڵلا. بەهرەم وەرگرت.

هەژار

١٩٨١/٧/١٢ = ٦٠/٤/٢١

تاران

# هەندێ لە ڕواڵەتە سیاسییەکانی بارزانی

عەزیز محەمەد

مامۆستا عەزیز محەمەد ئەم وتارەی بە زمانی عەرەبی لەو کۆڕەدا خوێندەوە کە پارتی دیموکراتی کوردستان بەبۆنەی نۆهەت ساڵەی لەدایکبوونی بارزانیی نەمرەوە بەستی.

زەحمەتە قسە لەبارەی مستەفا بارزانییەوە بکرێ و بڕێک لە مافی خۆی پێ بدرێ ئەگەربێو بناوان و کاروانی تێکۆشانی ئەو نەناسرێ کە بەدەیان ساڵی خایاند. ئەرکێکی ئاوهاش بواری لێکۆڵەوەیەکی بەتوانایە کە دەستهاوێژ و کتێبخانەیەکی تێروتەسەلیشی لەو بارەیەوە لەپاڵدا بێ نەک بواری بابایەکی ڕێبوار کە پشت بەبیرێکی کول ببەستێ.

بارزانی لەناو سەختیدا لەدایک بوو، هێشتا منداڵ بوو گوێ بیستی چەوسانەوە و گرتووخانە بوو و تیایاندا ژیا. واتە، دەشێ بگوترێ قاڵبوونی شۆڕشگێڕانەی ئەو کەوتبووە پێش هۆشە سیاسی و نەتەوەییەکەی. لەسەر سنووری هەردوو سەدە و لەناو ئەو زوڵم و زۆرە خەستەدا لەدایک بوو کە بەرەوڕووی کەسوکار و گەلەکەی بووبوو، وەک ئەوەی بۆ ئەوە لەدایک بووبێ بەرەنگاری ئەم زۆردارییە ببێتەوە و پاشانیش لێی ڕاپەڕێ. لە هەلومەرجی بەرووداهاتنەوەی ئەو هەڵکەوتە کارەساتاوییەدا گەشەی کرد کە گەلی کورد تیایدا دەژیا. هەتاسەر لەو هەڵکەوتە بێزار بوو و هەتا دوا ڕۆژانی ژیانی لە دژی وەستا.

لە سفرەوە دەستی پێ نەکرد، بگرە ئاڵای خەباتی لە دەستی کەسانی پێشووی بنەماڵە و برا و شۆڕشگێڕانی گەلەکەی وەرگرت، بەڵام ئەو ئاڵایەی بەگوێرەی کات بەرەنگی ڕاستەقینەی خۆی نەخشاند و واتا و ڕواڵەتی تایبەتیی پێ بەخشی و بەرزتر و بەرزتری هەڵ دا. هەرچەندەش کە ڕێگە ئاسان و خۆش نەبوو بگرە سەخت و ئاڵۆز بوو وەک ڕێیەکانی کوردستان و هەڵگەڕان بەچیا دژوارەکانیدا. جگە لەمە نەیتوانی سوود لە هەموو وزە و توانای گەلی کورد وەربگرێ، گەل دابەش کراوە، هەروەها نەیتوانی سوود لە قووڵیی جوگرافیای کوردستان وەربگرێ، کوردستان لەت لەتە، بگرە «بارزانی»ش وەک سەرجەم بزووتنەوەی ڕزگاریی گەلەکەمان ئازاری بەدەست باری گرانی جوگرافیای سیاسی و هەڵکەوتی پارچەبوونی کوردستان بەسەر کۆمەڵێک دەوڵەتدا، کێشا. ئەم دۆخەش

نەتەنیا بووەتە کۆسپ لە پێش سوود وەرگرتن لە هەموو وزەی گەلی کورد یان قولاییی جوگرافیای هەموو کوردستان، بگرە دۆخەکە ئەوەیە کاتێ بزووتنەوە لە هەر بەشێکی کوردستان دەست پێ دەکات ئەوا ئەو ولاتانەی بەشەکانی تری کوردستانیان گرتووە، دەکەونە جوولە و خۆنوێنی و کاری دوژمنکارانە لە ترسی ئەوەی نەوەکا گڵپەی ئاگر بپەڕێتەوە و، بۆ ئەوەی رێگە لە گواستنەوەی پەتای سەرهەڵدانی شۆڕشگێری بۆ ئەو بەشانە ببەستن. واتە ئەو دەوڵەتانەی دەوری کوردستانیان گرتووە ئەوسا و ئێستەش، هەر هەموویان جا بەهەر شێوەیەک بێ، بەسەرکوتینەوەی بزووتنەوی رزگاریی گەلی کوردەوە خەریکن، بەمەش لەو ولاتانەدا هیچ نوایەکی راستەقینە بۆ شۆڕشگێرێکی کورد نەبووە.

هەر ئەمەش بوو هۆی ئەوەی بارزانی پاش هەرەسی کۆماری مەهاباد ناچاربوو ئەو بزووتنەوە پێچاوپێچە سەرسڕهێن و ئەفسانەییە چ بە شەڕ و چ بە خۆنوێنی(مناورە) لە بەرامبەر سوپاگەلی لێهاتوودا بگرێتەبەر و شان بەشانی سەتان لە چەکدارانی خۆی بەرەو چۆمی ئاراس پاشەکشێ بکات و پاشان بۆ سۆڤیەت بپەڕێتەوە. لەوانەبوو دۆخەکە تەواو جیاواز بێ ئەگەر گەلی کورد هەمووی سەر بەیەکێک لەو دەوڵەتانە بوایە یان لە یەکێک لەو بەشانەدا سەربەخۆییی هەبوایە یان ئەوەتا بەلایەنی کەمەوە دەوڵەتێک لەسەر سنووری کوردستان هەبوایە و گرفتاری کێشە و گرێی کورد نەبوایە. لە سایەی ئەو بارودۆخانەدا بارزانی کێشە و ململانەی لەگەڵ رژێمە عێراقییەکاندا دەکرد لەپێناو ئەوەی کەلەبەرێک بخاتە ئەو گەمارۆ تەنگ پێ هەڵچنەی خرابووە بینی گەلی کورد و بۆ ئەوەی بنکە و جێ پێیەک پەیدا بکات کە ببێ بەسەرشار بۆ بەردەوامبوونی داهاتوو بەرەو ئامانجی دوور. لەم هەوا و هەلومەرجە ئاڵۆزەدا بارزانی چ لە سییەکان و چلەکان یان لە شێستەکان خەباتی دەکرد، خەباتەکەشی جۆرێک بوو لە مەلەی دژ بەتەوژم، ئەمەش زۆربەی جاران دەیخستە بەردەم چەندرِیانێکەوە کە هەموویان تاڵ بوون. دەبوو ئەوەیان هەڵبژێری کە گرانایی و تاڵییەکەی لەوانیتر کەمتر بوو. ئەگەر دەوڵەتێکیش لەمانە وای پێشان بدایە کە پشتەوانی لە کێشەی کورد دەکات ئەوا لەراستیدا دەیویست گەمە بەکارتی کێشەی کورد، بۆ بەرژەوەندی خۆی نەک شتێکی تر بکات، وەک چۆن ئەمە ئێستە بۆ هەموو لایەک ئاشکرایە.

بارزانی دوور لە بازنەی بچووکی راستەوخۆ لە ئاڵۆزییەکانی کێشەی کورد و پەلوپۆیەکانی ئەو کێشەیەی دەڕوانی. ئەو دەوڵەتانەی کێشەی کوردیان گەمارۆ داوە و

دەوری کوردستانیان گرتووە زۆربەیان، ئەگەر نەڵێین هەموویان، بەوڵاتانی ڕۆژئاواوە بەستراون. ڕۆژئاواش ئامادەی ئەوە نەبوو بەرژەوەندیی خۆی و هاوەڵەکانی بۆ بەرژەوەندیی گەلێک بکات بەقوربانی کە هەر خۆی لە دابەشکردنی و، خواردنی مافەکانی و، نەهێشتنی دامەزرانی سەربەخۆیی ئەودا لایەن بووە. لەگەڵ ئەمەشدا دەبوو بارزانی بەهۆشیارییەوە مامڵەت لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی ڕۆژئاوا بکات نەک بەسەریاندا باز بدات. ململانەی هەردوو مۆڵگە (معسکر) و دڕدۆنگیی هەر یەکێک لەم دووە لە ئاست هەر بزووتنەوە یان هەر پەرەگرتنێک کە تەرازووی هێز بۆ بەرژەوەندی دژەکەی لاسەنگ بکات وایان لە بارزانی کرد بڕوای وابێ کە زەحمەتە، ئەگەر مەحاڵ نەبێ، هیچ سەرکەوتنێک بەبێ یەکێک لەم دووە یان هەردووکیان بێتە دی. ئەم هاوکێشەیە زۆر و بۆ ماوەیەکی درێژ بارزانیی خەریک کرد هەتا دواجار کەوتە هەڵبژاردنی بەکردەوە لەنێوان سۆڤیەت یان ئەمەریکادا. یەکەتیی سۆڤیەتی سۆزداری کێشەی کوردبوو و پشتەوانیی لێ کردبوو و دەستی یارمەتیی بۆ درێژ کردبوو وێڕای ئەو پێوەندییە تایبەتەی لەگەڵ کەسی بارزانیدا هەیبوو کە بەرهەمی ئەو دە ساڵە بوو لەوێدا بەسەری بردوو. بەڵام هەموو ئەمانە بەشی خواستی بارزانی و سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردستانیان نەدەکرد، بەتایبەتیش کە یەکەتیی سۆڤیەت کەناڵی کارتێکەریی بەسەر لایەنە ناوەکییەکانی ململانە لەگەڵ کورددا نەبوو مەگەر کەمێک نەبێ، هەندێ جاریش هیچ ڕێگە و ڕێبازگەیەکی ڕاستەوخۆ و ناراستەوخۆی نەبوو بەکوردستانی بگەینێ، ئەمە جگە لەوەی سۆڤیەت کەوتبووە کێشەی پێوەندیی دۆستایەتی و هاریکاری لەگەڵ ڕێژیمی عێراق لەلایەک و، تێکەڵاویی هاوکارییانەی لەگەڵ گەلی کورد بەتایبەتیش لە ساڵانیی دواییی شۆڕشی ئەیلوول و پاش یەکەم ماوەی بەیانی مێژوویی ئادار لەلایەکی ترەوە. بەڵام ئەمەریکا کە بنگە و بناوانی سیاسی و سەربازیی زۆروزەوەندی لە ناوچەکە هەبوو بەتایبەتی لە ئێرانی شادا، بۆ ئەو بارودۆخەکە جیاواز بوو. ئەمەریکا و، ئێرانیش لەگەڵیدا، شان بەشان و تەبای ئەو کۆسپانەی ڕێژیمی عێراق دەیخستە پێش جێبەجێ کردنی بەیانی ئادارەوە، ئەوانیش بەربەرەکانێیان دەکرد. ناوەندە ئەمەریکاییەکان تەنیا لە ڕوانگەی بەرژەوەندە خۆپەرستییەکانیانەوە هەڵسوکەوتیان دەکرد و، لە پێناو گەیشتن بەبەرژەوەندی خۆیان پاکانەی هەموو شتێکیان دەکرد. هەموو خەمی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی لەمانە لە ناوچەکەدا برێتی بوو لەوەی مەرجەکانیان بەسەر عێراقدا بسەپێنێن بەو بیانووەی هاوکاری و دۆستایەتیی یەکەتیی سۆڤیەت دەکات، هەروەها سەپاندنی مەرج و

داخوازەکانی ئێرانیش لە یەکاو «شط»ی عەرەبدا.

حیساباتی ئەوەی کامیان لەویتر چاکترە بوونە هۆی ئەوەی بارزانی دواجار ئەمەریکا هەڵبژێرێ، ئەمەش کۆتاییی بەسیاسەتی راگرتنی ئەو تەرازووە هێنا کە سەرکردایەتیی بارزانی ماوەیەکی درێژ پێڕەویی لێ دەکرد. ئەمە شۆڕشی خستە گۆشەیەکەوە هەتا ئەوەی کە لە دوای رێککەوتنی شووم و زاڵمانەی جەزائیردا دوچاری نووچدانی کرد. بەڵێ، ئاڵۆزیی بارودۆخی ناوولاتان و کۆنگەی پێک کەوتنی بەرژەوەندی و کۆت و بەندی جوگرافیای سیاسی و حوکمەکانی، زۆر لەوە گرانتر و ئاڵۆزتر بوون کە توانا و حیساباتی شۆڕش پێی هەڵبگیرێ. بارزانی لەسەر نوێنی نەخۆشی، هەر لە ئەمەریکا خۆیدا، «وەک رۆژنامەی خەبات نووسیبووی - ئەگەر هەڵەم نەکردبێ»، شتێکی گوت لە بابەتی ئەوەی «من لە هیچ شتێک پەشیمان نیم بەرادەی پشت بەستن بە ئەمەریکا و بڕواکردن بە بەڵێنەکانی». بەڵام هەرچییەک بێت، سەرەڕای ئەو هەڵوێستەی کە بووە هۆی زۆر پەشیمان بوونی بارزانی، ئەوا بارزانی لە هەموو چالاکی و رووەتە گشتییەکانی خۆیدا جگە لە بەرژەوەندیی گەلی کورد و ئاوات و خواستە رەوایەکانی و لەپێناو دوارۆژی گەشاوە و رووناکیدا، شتێکی تری رەچاو نەدەکرد.

ئەم دەسکەوت و سەرکەوتنانەی گەلی کوردیش بەدیی هێناون و تیایاندا دەژی کە هیوامان وایە و هەوڵیش دەدەین بۆ ئەوەی بچەسپێن و رەگ دابکوتن، ناشێ بەشێوەیەکی جیا لە راپەڕین و شۆڕشەکانی کورد سەرنجیان لێ بدرێ، بەتایبەتیش شۆڕشی ئەیلوول و دەرسەکانی؛ سەرکەوتن و نووچدانەکانی؛ ئەو مەشقە دژوارە بەرفراوان و هەمە جۆرەی تیایدا کرا؛ ئەو سەرهەڵدانەی هۆشیاریی نەتەوەیی و ئامادەییی سیاسی و پێگەیشتنی شارەزایی و هۆش و گۆشەی وەچەی نوێی سەرکردایەتی کە لەگەڵ ئەو شۆڕشەدا هاتنە کایەوە. بەڵێ، شۆڕشی ئەیلوول سەرەڕای ئەو شتانەی لەسەری نووسراون و گوتراون بەڵام هێشتایش وەک گەورەترین ئەڵقەیە لە زنجیرەی ئەو شۆڕشانەی کە گەلی کورد بۆ بەدیهێنانی مافە نەتەوایەتییە رەوایەکانی خۆی هەڵی گیرساندوون.

گوتمان کاروانی تێکۆشانی بارزانیی نەمر دەیانساڵی خایاند و بەگەلێک پێچ و وێستگەدا تێپەڕی کە سیما و رواڵەتی پێشکەوتنی بزووتنەوەکەیان هەڵگرتبوو. ناشێ هەروەها راستییش نییە ئەو هەڵکەوتە لەبیر بکرێ کە سەرەتا کاروانەکە کاروانێکی ناوچەیی و خۆماڵی بوو لەشێوە و رواڵەتدا بەڵام بەناوەرۆک کوردستانی بوو. واتە

کاروانەکە لە ناو ئەو پیاوە ئازا و هاوکارە یەکگرتووانەدا سەری هەڵدا کە دەوری بارزانییان دابوو و بووبوونە هێزی شەڕکەری ئەو، ئەوانیش بارزانییەکان بوون. ئەمە هەنگاوی زەحمەتی یەکەم بوو بەڕێگەدا. راستە خەڵکانی تریش لەو سەرەتایەدا هاوبەش بوون بەڵام نەک بەو شێوەیەی کە وێنەکە بگۆڕێ. ئاماژە بەمە دەدەین بۆ ئەوەی بەڕێز و نەوازییەوە ئەو سەرەتایە و ئەو هەنگاوانە و ئەو ناوانە تۆمار بکەین کە بەشێوەیەکی بێ وێنە قوربانییان دا و هەتاکو ئێستەش بەردەوامن لە قوربانیدان لەپێناو سەرخستنی کێشەی گەل و وڵاتەکەیان، لەپێناو پاشەڕۆژی کوردستانی خۆشەویستدا.

بارزانی درێژەی بەبزووتنەوەی خۆی دا و، وچانی نەدا. دەیتوانی وچان بدا بەڵام ئەو بەوە راهاتبوو «هەڵبەتە بەهۆی بارودۆخی کوردستانەوە» کە دانەنیشێ، درێژەی بەخەبات دا و لە سنووری ئێران ئاوابوو و خۆی و هێزەکەی چوونە پاڵ کۆماری مەهاباد و بوون بەهێزی بنەڕەتیی بەرگریکردن لە کۆمار. ئەو کاتەیش کە کۆماری ساوا لەناو چوو، ئەو ویستی ئەوەی پێی رزگار دەکرێ رزگاری بکات ئیتر ئەوەبوو بەو شێوە سەرسڕهێنە بەناوبانگە بەرەو یەکەتیی سۆڤیەت کشایەوە. وێڕای ئەو گرفتانەش کە دوچاریان بوو بەڵام رۆژانی سۆڤیەتی بەخۆڕایی نەبوون، بەتایبەتیش لەسەردەمی حوکمی «باقرۆف»دا. ئەمە ماوەی پشوودانێکی بەزۆری بوو بۆ شەڕوانێکی کۆڵنەدەر، هەرچەندەش ماوەکە دوور و درێژ بوو، ماوەی بیرکردنەوە و لیکۆڵینەوە بوو لەوەی بەسەرچوو و لەوەی دادێ هەتا ئەوەی خۆی و پێشمەرگەکانی لە پاش شۆڕشی تەمووزی نەمردا گەڕانەوە. ئەوەیشیان خۆپێشاندانێکی عێراقیی مەزن بوو بەعەرەب و کوردیەوە لەپێناو دیموکراسی و مافە نەتەوەیییەکانی گەلی کورد. گەلی عێراق بەهەستی زگماک و تاقیکردنەوەی تاڵ و درێژ و بەهۆشی خۆیەوە ئەم دووەی هەردووک بەیەکەوە گرێ دابوو، هەڵبەتە لەمەشدا زۆرباش راستیی پێکابوو.

هێندەی پێ نەچوو هەتا ئەوەی بارزانی جارێکی تر بەدەستێک چەک و بەدەستەکەی تر ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە، هەرچەندە سەرەتای ئەمە لە ناوچەیەکی دیاریکراو و لە نێوان سەتان شەڕواندا گیرسابووەوە بەڵام لە ئەیلوولدا بەبەرەوە چوو هەتا ئەوەی رووبەرێکی بەرهەڵدای کوردستانی عێراقی گرتەوە و بەدەیان هەزار پێشمەرگەی قارەمان لە هەموو شار و گوندانی کوردستان و لە هەموو توێژە کۆمەڵایەتی و رێبازە بیری و رێکخستنەکانەوە کەوتنە پشتەوانی لێ کردنی. بارزانی بازنەی پێوەندیی خۆی لەبەریەک

کێشایەوە بۆ ئەوەی شۆڕش هەموو ئەوانە بگرێتە خۆی کە لەوپەڕی ڕاستەوە هەتا ئەوپەڕی چەپ دەیانویست بچنە ناویەوە، بەراستیش بزووتنەوەکە دەوڵەمەند و فرەوان بوو، هەرچەندەش دواجار بەهۆی فاکتەری دەرەکییەوە نووچی دا بەڵام بۆ ئێمە و بۆ نەوەگەلی داهاتوو بەسەرهاتێکی پڕ لە دەرس و پەندی بەجێ هێشت کە وەکو چەک بۆ کاری هەمەجۆرەی ئێستەمان پەنای بۆ دەبەین و بەکاری دێنین.

ئەدی هەڵوێستی بارزانی بەدرێژاییی دە ساڵ زیاتری تەمەنی شۆڕشی ئەیلوول لەبارەی وتوویژ لەگەڵ حکوومەتە عێراقییە یەک لە دوای یەکەکاندا چی بوو؟ ئاخۆ ئەمە ئەوە ناهێنی هەرچەند بەکورتەبڕیش بێ سەرنجێک لەم لایەنە بدەین؟ بارزانی بۆچی وتوویژی دەکرد، لە چی سەرشارگە و بەچی ئامانجێک؟ ئێمە نازانین چۆنی نەخشە بۆ دەکێشا بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەو بارودۆخانەی باش دەناسی کە کێشەی کوردیان پێوە بەند بوو. ئەی چۆن بوو چارەسەری ئەو بۆ کێشەکە لەناو چوارچێوەی عێراقدا بوو لەکاتێکدا یەک ڕژێمی عێراقی نەبوو لەم کێشەیە تێ بگا، یان لە چارەسەر نێزیک ببێتەوە، مەگەر بەو ڕادەیەی کە نەیتوانیبێ بەچەک لەناوی ببات؟ هەر کاتێ ڕژێمێک نەتوانێ شۆڕشی کوردستان ببەزێنێ، وا خۆی دەنوێنێ کە دەیەوێ پەنا بۆ وتوویژ و چارەسەری بەئاشتی ببات بەڵام بەو هیوایەی دواتر لەهەر ڕێککەوتنێک با بداتەوە و لێی بکەوێتە پیلانگێڕی پاش ئەوەی هەست بە جێگیری و گیرسانەوەی بارودۆخی خۆی دەکات.

هەروەها شۆڕشی کوردستانیش هەرچەندە وزەی حکوومەتە ناوەندییەکانی لەبەر دەچواند، هەندێک جار بەپلەیەکی زۆریش، بەڵام نەیدەتوانی و بۆی نەدەلوا سەرکەوتنێکی یەکجارەکیی سەربازی بەدێ بێنێ و ڕژێم لە بەغدا برووخێنێ تەنیا ئەگەر بهاتایە و چالاکیی ئەو تەبای سەرهەڵدانی بزووتنەوەی جەماوەریی دیموکراتیی هاوپەیمان لە شوێنەکانی دەرەوەی کوردستاندا بوایە، بەپلەی یەکەمیش لە بەغدا، کە ئەمەش زۆر بەداخەوە هیچ جار ڕوی نەدا، بگرە خەمەکە ئەوەیە هێزگەلی کۆنەپەرست لاوازی و لەبەریەک هەڵوەشانی ڕژێمیان لە بەغدا لە ژێر پاڵەپەستۆی شۆڕشی کوردستاندا بەهەل دەزانی و بازیان دەدایە حوکم، بەڵام زوو بەزوو ڕابردووی ئەوەکەی پێشوویان دووبارە دەکردەوە. شۆڕشی کوردستانیش لەبەر ئەو هۆیانە، نەک هۆی تر، دەبوو پشوویێکی خەباتکارانەی درێژی هەبێ و سوود لە فاکتەری کات و تاکتیکی نەرم و گونجاو وەربگری و، بۆ پاراستنی هێزی شۆڕش هەل لەدەست نەدا، بگرە بەرە بەرە لە ڕێگەی پایە و

دەسکەوتی بووژێنەوە(منعش)وە گەشەی پێ بدا و ڕۆڵ و ڕێزی پتر بچەسپێنێ و، دەنگ و ئامانجی بگەیەنێتە گوێی رای گشتیی دنیا و هەر شوێنێکی کە متمانە بەخۆبوون دەچەسپێنێ.

من پێم وایە ئەو وتووێژانەی ناوبەناوێک دەکران بەشێوەیەکی گشتی خزمەتی ئەم بۆچوونەیان دەکرد. وتووێژ، بەکردەوە بووبوو بەشێوەیەک لە شێوەکانی تێکۆشان و چارەسەری کێشەی کوردی لە چواچێوەی عێراقی یەکگرتوودا دووپات دەکردەوە، لە هەمان کاتیشدا وەڵامێک بوو بۆ ئەو توانج و تۆمەتانەی بەناوی جیاوازیخوازییەوە دەخرانە پاڵ هەر بزووتنەوەیەکی کورد. هەروەها دۆخی واتایەکیی هێزەکانی شۆڕش و پێویست بوونی هەندێک کات بۆ پشوودان و خۆکۆکردنەوە و بووژاندنەوەی باری ئابووری لە ناوچەکانی شۆڕش و بەگەشەخستنی کشتوکاڵ و فرۆتنی بەرووبوومەکانی، رەچاو دەکرا، بەتایبەتیش کە ئاسۆ رووناک و مژدەدەر نەبوو، لەتەک هەموو ئەمانەشدا، بۆ ئەوەی نیزیک و دوور بزانن کە رێژێمە عێراقییەکان هەر هەموویان بەناچاری پاش ئەوەی لە بەدیهێنانی سەرکەوتنی سەربازی بێ هیوا دەبن دەکەونە وتووێژەوە لەگەڵ شۆڕشی کوردستاندا، ئەمەش کێشی شۆڕشی لەبەر چاوی کوڕانی خۆی و لەپێش چاوی دۆست و دوژمندا بەرز دەکردەوە. ئایە لەبارەی ئەم بۆچوونەوە هیچ بەڵگەیەک هەیە لەو پەرەگرتنە بەهێزتربێ کە شۆڕشی ئەیلوول لە هەموو رووێکیەوە لە سەرەتاوە هەتا ئاداری ١٩٧٠ بەخۆوەی بینی؟ ئەو هەمووەش رووی دا و بارزانی لە بارەگای خۆی دەرنەچوو، واتە وتووێژەکان لە بنەڕەتەوە لە بارەگای ئەودا دەکران.

ئیتر ئەمانە چەند ئیشارەتێکن، نەک زیاتر، لەبارەی هەڵوێستی بارزانی لەمەڕ وتووێژەوە، ئەمە کۆڵینەوە و شیکردنەوەی وردی پێویستە بۆ ئەوەی هەڵسەنگاندنێکی بابەتی بکرێ لەبارەی چاکی و خراپییەکانی هەر قۆناغێک لەو قۆناغانەی وتووێژ کە بارزانی دەیکردن لە سنووری ئەو بەرئەنجامەی لە پێشەوە ئاماژەمان پێی دا.

بارزانی بایەخێکی تەواوی بەپێوەندیی عەرەبی دەدا لەبەرئەوەی ئەو پێوەندییە گرینگییەکی تایبەتی هەبوو لە خەباتی گەلی کورد بۆ وەرگرتنی مافەکانی، سەرەتای ئەو بۆچوونەشی وا دەست پێ کرد کە لە رێگەی گەڕانەوەی خۆی بۆ نیشتمان پێوەندیی لەگەڵ سەرۆکی گەورەی عەرەب جەمال عەبدولناسردا دامەزراند ، چونکە بەدروستی دەیزانی کەوا عەبدولناسر دەتوانێ رۆڵێکی گەورەی لەبار لەسەر گۆڕەپانی عەرەبیدا بگێڕێ،

بەدرێژاییی مانی عەبدولناسریش لە ژیاندا، بارزانی سوور بوو لەسەر بەردەوام بوونی ئەو پێوەندییە. هەروەها هەنگاوێکی سیاسیی گرینگیشی بەوە هاوێشت کاتێ جاڕی ئامادەبوونی خۆی بۆ ئاگربڕ لەگەڵ ڕێژیمی عێراق لە سەروبەندی شەڕی عەرەب - ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٦٧دا ڕاگەیاند بۆ ئەوەی نەبادا عێراق بەبیانووی خەریک بوونی بەشەڕی ناوەخۆ لەگەڵ کورددا خۆی بدزێتەوە و سستی بنوێنێ. بارزانی هەوڵی دا ئەم هەڵوێستە بگەینێتە ژمارەیەک لە سەرۆکانی عەرەب، بەمەش پاکانەی بۆ گەلی کورد و بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکەی کرد لەوەی تۆمەتی بەهەل گرتنی گیروگرفتی عەرەب و شەڕ لەگەڵ ئیسرائیلدا بخرێتە پاڵی. ئەمە هەڵوێستێکی جوان و بەرپرسیارانە بوو، دووربینییەکی زۆریشی تێدابوو.

هەروەها دوای کودەتا ڕەشەکەی شوبات، لایەنی تر لە ڕەوشتە گەشاوەکانی بارزانی دەرکەوتن، دروست ئەو کاتەی بانگەواز بۆ سەربڕینی شیوعییەکان و تەفروتوناکردنیان هەموو بانگ و بانگەوازێکی تری کودەتاچییەکانی داپۆشیبوو و، سەرەڕای هەندێ لەو پێداهەڵگوتنەی کەسانێ لەگەڵ کودەتاچییەکان و لەگەڵ چوونە ناو وتووێژدا دەریانبڕی، بارزانی ئامێزی بۆ شیوعییەکان کردەوە و ڕایگەیاند کەوا لە باوەشیان دەگرێ و دەیانپارێزێ. ئەمە تەنیا بەهۆیەکی مرۆڤپەروەرییەوە نەبوو. لەوانەیە هەڵوێستی وەک ئەم هەڵوێستە مرۆڤپەروەرانەیە هەموو مرۆڤێکی سەربەرز لە ئاست خەڵکانێکی کە وەک شیوعییەکان کەوتبێتە بن باری چەوسانەوە، بیگرێتەبەر. لەگەڵ ئەوەشدا، کە ئەمە زۆر گرینگە، بارزانی بەو هەڵوێستەی خۆی، ویستی بەپاشەڕۆژی بزووتنەوی دیموکراتیی لە عێراق و پاشەڕۆژی شیوعییەکان و حزبەکەیان و درێژەی ئەوان لە دەرەوە و تەنانەت دژەکانیشیان بڵێ و تێیان بگەینێ کە ئەو خۆی لە شوێنکدایە خۆی هەڵی دەبژێرێ نەک کەسانی تر، هەندێک لە سەرکردەکانی شۆڕشی ئەیلوول هەڵوێستی باشیان هەبوو، دژی چەوساندنەوەی شیوعییەکان بوون و لەگەڵ هاوکاری کردنیاندا بوون، بەڵام هەندێکی تر بەداخەوە هەڵوێستێکی دوژمکارانەیان گرتەپێش بەجۆرێ کەس بەخیلییان پێ نەبا.

لەبارەی بۆچوونی بارزانی لە هەندێک کاروباری دەرەوەشدا، من ناتوانم ئەوە لەبیر بکەم کە ڕۆژی ١٨/١١/١٩٦٢ بۆ هەڵسەنگاندن و نرخاندنی هەڵوێستی سۆڤیەت لەبارەی تەنگژەی «زەریای کاریبی»یەوە دەری بڕی، گوتی مرۆڤایەتی قەرزداری ئەو هەڵوێستە ئازایانەی سۆڤیەتە کە بەشێوەیەکی گەورە بۆ پاراستنی تەناهی و ئاشتی لە

دنیا بەشدار بوو، سەرەڕای پاراستنی «کووبا»ش. ئەمە لەو کاتەی گاڵەگاڵێکی زۆر هەبوو تەنانەت لەلای هەندێ لایەنی پێشکەوتنخوازیشدا لەبارەی ترسنۆکیی سۆڤیەت و کشانەوەی لەپێش وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا.

بارزانی لەو جۆرانە نەبوو بۆچوونی خۆی نەگۆڕێ، یان بایەخ بەبۆچوونی کەسانی تر نەدا، راستە ئەمە ئاسان نەبوو بەڵام دەگونجا ئەگەر بهاتایە و بەڵگەی وردت لەبەر دەست بوایە و بابەتەکەت بەشێوەیەکی دوور لە خۆبەگەورە زانین و بانگەواشە (إدعاء) بخستایەتە پێش چاو و لەو چوار چێوەیەی ئەو تێیدایە نەک لە دەرەوەی. ئەو ماوە درێژەی کە بارزانی پلەی سەرۆکایەتی و سەرکردایەتیی لە بزووتنەوەی رزگاریی گەلی کورددا گرتبوو و ئەو هەمەجۆرییەی شۆڕش پێیدا تێپەڕی و، ناسرانی بزووتنەوەکە بەناوی ئەو و ناوی ئەو بەبزووتنەوەکە لە ناوەوە و پێناسینی بزووتنەوەکە لە دەرەوە و، بوونی بەهێمای بزووتنەوەکە و هێزی ئیلهامدەری، هەموو ئەمانە نەک تەنیا بارزانییان کرد بەیەکێک لە سەرکردە هەرە دیارەکانی گەلەکەی بگرە کردیان بەدیاردەیەکی مێژوویی کە شایەنی لێکۆڵینەوەی قووڵ بێ بۆ ئەوەی لەو تاقیکردنەوە دەوڵەمەندانەی ئەو چەسپاندنی سوود وەربگیرێ بەلایەنە لەبارە زۆرەکانی و لایەنە نالەبارەکانیەوە. بزووتنەوەی رزگاریی کوردستان زۆری پێویست بەم جۆرە تاقیکردنەوانە هەیە بۆ ئەوەی درێژە بەلایەنە لەبارەکان بدات و لایەنە نالەبارەکان بخاتە لاوە هەتا دەگاتە ئەوەی گەلی کورد هەموو مافە نەتەوەییەکانی دەهێنێتە دی.

نەمری بۆ بارزانی، سەرکەوتن، هەموو سەرکەوتن بۆ کێشەی رەوای گەلەکەی.

ئەیلوول ١٩٩٣

# له بیرەوەریی بارزانیدا

مارتن ڤان براوئێسن

ئەم وتەیەی مــارتن ڤــان براونێـسن ڕۆژی ١٤ی ئاداری ١٩٩٩ لە پەرلەمانی بەریتانی بەبۆنەی سالوەگەڕی لە دایکبوونی بارزانیی نەمر خـوێنرایەوە. لە راسـتـيـدا ئەم وتارە زۆر هەلسـەنگاندنی جوانی لە بارەی خەبات و بیر و تێڕوانینی بارزانیی نەمرەوە گرتووەتە خۆ، ئێمە ئەم بابەتەمان وەک بابەتێکی بەپێز وەرگرت و لەم پاشکۆیەدا بلاومان کردەوە.

ئامادەبووان،

لە سالی ١٩١٨دا ڕۆژنامەیەکی ڕۆشنبیری و سیاسی لە ئەستەنبۆل بلاو بووەتەوە و لە ژمارە سەرەتاییەکانیدا مەحموود سەلیم ناوێک باس لە پێویستیی هەبوونی سیمبۆلی نیشتمانی بۆ نەتەوەکان دەکات، هەروەها باسیش لە پێویستیی هەبوونی پشووی نیشتمانی ئەو نەتەوانە دەکات لە چوارچێوەی جەخت کردن لەسەر ناسنامەی نەتەوایەتیدا. ئەو قۆناغە قۆناغێک بوو هەستی نەتەوایەتی لە نێو کوردا بلاونەبووبووەوە تەنیا هەندێ کورد نەبێت کە لە شارەکان دەژیان و هەستی نەتەوایەتییان لا هەبوو بەئەرکی خۆیان دەزانی بوونی میللەتەکەیان ئیسپات بکەن. هەروەها ڕۆژنامەکە وای دەخستە ڕوو کەوا پێویستە سیمبۆلی نیشتمانی و ئاهەنگێرانی نەتەوەیی شان بەشانی ئەو پشووانەی لە جیهانی ئیسلامیدا ئاهەنگیان بۆ دەگێردرێت، هەبن. ڕۆژنامەکە باسی لە نەورۆز دەکرد وەک پشووی نەتەوەییی کوردان، هەروەها هەموو گەلانی ئێرانیش ئاهەنگ بەم بۆنەیەوە دەگێڕن، تەنانەت دەولەتی تورکیاش بەشێوەیەکی تایبەت بۆنەی نەورۆز یاد دەکاتەوە. ڕۆژنامەکە باس لە ڕۆژی لەدایکبوونی سەلاحەدینی ئەیوبی دەکات کە یەکەمین سەرکردەی بەناوبانگی کورد بووە شەڕی لەگەل خاچ پەرستەکاندا کردبێ. هەروەها لەو بۆنە نیشتمانییانەی ڕۆژنامەکە ئاماژەی بۆ دەکات سەربڕینی ئەژدەهاکی دیکتاتۆر بووە بەدەستی کاوەی ئاسنگەری ئێرانی. دوای تێپەڕ بوونی سالێک خەلک یادی ئەو ڕووداوەیان کردووەتەوە و لەو کاتەوە ئەو ئەفسانەیە لە نەورۆز جودا نەبووەتەوە. بەلام سەلاحەدین وەک سیمبولێکی نیشتمانی سیمبولێکی زۆر ناکۆک بووە. وەک

ئاگاداریشن سەڵاحەدین لەلایەن کەسێکی ترەوە کە هەر لە تکریت لەدایک بووە وەک سیمبولێک سوودی تایبەتیی لێ وەرگیراوە، سەدام حوسێن ئەمڕۆ بانگەشەی ئەوە دەکات سەڵاحەدینە.

بۆیە ئێوە دەبێ زۆر ئاگەداری سیمبۆلە نەتەوایەتییەکانتان بن. لەم سەدەیەدا کورد چەند کەسایەتییەکیان کرد بە سیمبۆلی نەتەوەییی خۆیان کە هێندەی سەڵاحەددین ناکۆک نین، لەوانە بەدرخان بەگ کە میرێکی کوردی کلاسیکی بووە و حوکمی ناوچەی جەزیرەی کردووە. ئەو کەسایەتییە لە ساڵانی سی و چلەکانی سەدەی رابردوودا فەرمانڕەواییی خۆی بەسەر چەند بەشێکی گەورەی کوردستاندا سەپاند. دواییش ڕۆڵەکانی ئەو فەرمانرەوایە دووبارە تەرجەمەی ئاواتەکانی بەدرخانیان کردەوە و کردیان بە ئاواتی نەتەوەییی هەموو کورد. هەروەها شێخ سەعیدی پیران کە سەرکردەیەکی ئایینی بووە وای لە هەستی ئایینی و نەتەوەییی کورد کرد شۆڕش دژی رێژیمی کەمالی لە تورکیا لە ساڵی ١٩٢٥دا بەرپا بکات، بەڵام ئەو سەرکردەیە لەسێدارە درا. پاش لەسێدارەدانی شێخ سەعید پرسیارێک لەناو کورددا دروست بوو، ئاخۆ ئەو سەرکردەیە سەرکردەیەکی نەتەوەیی بوو یان ئایینی یان دەرەبەگی؟ بۆیە دەڵێم هەموو سیمبۆلە نەتەوەییەکان ناکۆکییان لەسەر دروست بووە. تەنانەت بارزانیش کە ئەمڕۆ باسی دەکەین و یەکێکە لەو سیمبۆلانە، بێ ناکۆکی نەبووە. بەم دواییەش، پاش ئەوەی عەبدوڵڵا ئۆجەلان خۆی رێگەی بۆ دەوڵەتی تورک خۆش کرد بیگرن لەوانەیە لەناو زینداندا زیاتر بتوانێت کورد یەکبخات لەوەی کە ئازاد بوو. بەڵام لەنێوان هەموو ئەو کەسانەی بیریان لێ دەکەمەوە یەک کەس هەیە شایەنی ئەوەیە ببێت بە سیمبۆل، شایەنی ئەوەیە لەسەدەی بیستەمدا نوێنەرایەتیی ئاواتەکانی نەتەوایەتیی کورد و ناسنامەی کورد بکات، ئەو کەسەش مەلا مستەفای بارزانە.

مانگی ئادار مانگی چەندین یاد و ئاهەنگە، ئادار ئەو مانگەیە زۆربەی ڕووداوە خۆش و ناخۆشەکانی کورد دەگرێتە خۆی. لە ٢١ی ئادار ئاهەنگی نەورۆز واتە ئاهەنگی سەری ساڵ دەگێردرێ کە پشووی نەتەوەییی کوردە. لە ١١ی ئاداری ١٩٧٠، هەروەک پێشتر ئاماژەی بۆکرا (لە وتەکانی بەرێز تۆم کلارک) کورد باشترین رێککەوتننامەی سیاسییان لە مێژووی خۆیاندا وەدەست هێنا. ئەو رێککەوتننامەیە کە مۆرکردنی رێککەوتننامەی ئۆتۆنۆمی بوو لە نێوان بارزانی و حکومەتی بەعسدا باشترین چارەسەر بوو بۆ مەسەلەی کورد. هەر ئەو رێککەوتننامەیە بەرێکەوت، ئەو بەندەی تێدابوو کە دان بە نەورۆزدا

دەهێنێ وەک پشوویەکی نیشتمانی. بەڵام پاش چوار ساڵ لەو ڕێککەوتننامەیە، جارێکی تر شەڕ دەستی پێ کردەوە. هەروەها لە ٦ ئاداری ١٩٧٥شای ئێران و سەدام حوسێن ڕێککەوتننامەی جەزائیریان ئیمزا کرد و چارەنووسی کوردیان بەرەو هەڵدێر برد. لەو ڕیککەوتننامەیەدا کورد فرۆشران و شۆڕشەکەشیان نسکۆی هێنا. بارزانی لە پەناهەندەیی لە یەکی ئاداردا لە دووری وڵاتی خۆی و میللەتەکەیدا کۆچی دوایی کرد. بارزانی بەتەنیا بوو، هەروەها لەلایەن هەندێک کەسی سەر بە گەلەکەشیەوە ڕەخنەی لێ دەگیرا، چونکە دۆڕاندبووی. ڕۆژی ١٦ی ئاداریش بە ڕۆژی دەستپێکردنی جینۆساید دژی کوردی عێراق دادەنرێت، کاتێ شاری هەڵەبجە دووچاری هێرشی گازی کۆمەڵکوژ بووەوە.

لە ڕاستیدا مانگی ئادار پڕە لە هێما بۆ کورد. ئەگەر بیر بکەینەوە لەو ڕووداوانەی لە ساڵی ١٩٧٥ەوە تووشی کورد بوونە، تێبینیی چەندین سەرکەوتن دەکەین، بەڵام لە هەمان کاتدا دەبینین لەو ماوەیەدا کورد تووشی ناکۆکی و لەیەک جیاییش هاتوون، هەروەها تێبینیمان کرد کورد دژی کورد شەڕی کرد و لادێیەکانی کوردستانیش لە عێراق و تورکیا تێک دران.

هەروەها لە بیرەوەرییەکاندا، باس لە ناوبانگی مستەفا بارزانی دەکەین کە هەمیشە ناوبانگێکی بەهێزی هەبووە، تەنانەت ناحەزەکانی پێشووی مەلا مستەفاش لە مەزنیی کەسایەتی ئەو سەرکردەیە ئاگەدارن. لەراستیدا مەلا مستەفا ناکۆکیی لەگەڵ خۆی و ژیانیدا یەکجار کەم بووە. ئەو سەرکردەیە بەرچاوترین نوێنەری گەلی کورد و خەباتی کورد بووە.

لێرەدا زۆر پێویست نییە باسی هەموو ژیانی بکەین، بەڵام حەز دەکەم ئاماژە بە چەند کتێبێک بکەم کە زۆر سەرنج ڕاکێشن: بۆ نموونە دانا ئادام شمیدت کە ڕۆژنامەنووسێک بوو لە ڕۆژنامەی نیویورک تایمز، یەکەمین کەس بووە بە دوور و درێژی ڕاپۆرتی لەبارەی یاخیبوونی کورد لە ساڵی ١٩٦٢دا بڵاو کردووەتەوە. ئەو ڕاپۆرتانەش پاش ساڵێک کراون بە کتێب، من وای بۆ دەچم ئەو کتێبە تا ئێستە دەوڵەمەندترین سەرچاوەیە لەبارەی سەرەتای ژیانی بارزانی. هەروەها یەکەمین چاوپێکەوتنی دوور و درێژی تێدایە کە لەلایەن چاودێرێکی بیانییەوە ئەنجام درابێت. تێبینی دەکەین، بارزانی کاتێ لەدایک بووە سنوور لە نێوان عێراق و سوریا و تورکیادا نەبووە، ئەوانە هەمووی یەک وڵات بوون و بەشێک بوون لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، کوردیش ناوچەکەیان بە کوردستان

ناسرابوو. کاتێ بەریتانییەکان باشووری عێراق و پاشان کوردستانی عێراقیشیان داگیرکرد، شێخ ئەحمەدی برای مەلا مستەفا یەکێک بوو لەو سەرکردانەی بەرگریی کرد. شێخ ئەحمەد بوو بە سیمبۆلی ویست و داخوازی کوردی عێراق بۆ وەدیهێنانی ئۆتۆنۆمیی ناوەخۆ.

یەکێک لە یەکەمین سەرچاوەکانمان، راپۆرتەکانی بەریتانیایە، هەروەها یەکەمین رۆژنامەنووس کە لە سالآنی شەستدا سەردانی مەلا مستەفای بارزانی کرد هەموو ئەو سەرچاوانە تەئکیدیان لەسەر ئەوە کردەوە کە بزووتنەوە کوردییەکەی بارزان عەشایەری بووە، هەروەها بارزانی هەمیشە وەک سەرکردەیەکی عەشایەری لەو سەرچاوانەدا نیشان دراوە، ئەو سەرچاوانە وا نیشان دەدەن کە عەشیرەتی بارزان لەگەڵ عەشیرەتەکانی تردا شەڕ دەکات، وەک زێبارەکان و رەشید لۆلان و برادۆستییەکان. هەروەها ئەو سەرچاوانە وا ئاماژە بە عەشیرەتی بارزان دەکەن کە یەکێکە لەنێو چەند عەشیرەتێکی جۆراوجۆردا. بەڵام چەند رووداوێک هەیە کە لەوکاتەدا روویان داوە، واتە لە سالآنی ١٩٣٠دا، وا نیشان دەدەن کە بارزانییەکان لەو سەردەمەدا رێزێکی بەرچاویان هەبووە. گوندی بارزان بۆ ماوەیەکی درێژ بنکەیەک بوو بۆ ئەو کەسانەی لە جێگایەکی ترەوە بە هۆی دوژمنایەتی چەوسابوونەوە، یان ئەگەر یەکێک لە ترسی حکوومەت هەلآتبێت.

لە رووداوی ١٩٣٠دا کوردەکانی تورکیا لە ناوچەی چیایەکانی ئەرارات یاخی بوون. شێخ ئەحمەدی بارزان لە کوردستانی عێراقەوە کە وڵاتێکی ترە، پێنج سەد کەسی لە هێزەکانی بەمەبەستی سەرقاڵ کردنی سوپای تورکیا نارده ناو سنووری تورکیا بۆ ئەوەی بەرەو ئەرارات نەچێ. ئەوکاتە سنووری نێودەوڵەتی هەبوو بەڵام بەبۆچوونی شێخ ئەحمەدی بارزان کوردستان هەر یەک کوردستانە، ئەم هەنگاوەی شێخ ئەحمەدی بارزان بەگوێرەی هەڵسەنگاندنە ئەوروپییەکانی ئەمڕۆ یەکەمین کرداری نێو دەوڵەتییە کە بارزانییەکان کردیان. بەڵام بەبۆچوونی کورد ئەم هەنگاوە تەنیا یارمەتیدانی کوردی ترە لە بەشێکی تری کوردستاندا.

لەو سالآنەدا مەلا مستەفای بارزان سەرکردەی مەیدانیی هێزەکانی شێخ ئەحمەدی بارزان بوو. لە سالّی ١٩٣٢دا شێخ ئەحمەدی بارزان ناچار کرا پەنا بباتە بەر تورکیا، لەوێ دەسەلآتدارانی تورکیا دەستگیریان کرد و بەدەست دەسەلآتدارانی عێراقیانەوە دا، مەلا مستەفا بەردەوام بوو لە بەرخوەدان، هەتا دانوستاندن بۆ چارەسەری کێشەکە دەکات

و پاش چارەسەریشی، ناچار دەکرێت لە ناوچەی خۆی دوور بکەوێتەوە، یەکەمجار بۆ باشووریان ڕەوانە کرد و پاشانیش بۆ شاری سلێمانی کە شارێکی کوردیی سەرەکییە و پایەتەختی ئەو هەرێمەیە کە بە دایەلێکتی سۆرانی قسە دەکەن. لە سلێمانی دەڕوات بۆ قوتابخانە، لەوانەیشە هەر لە قوتابخانەکانی ئەو شارە نازناوی (مەلا)ی وەرگرتبێ. چەندین تەرجەمەی وشەی مەلا کراوە، هەندێک خەڵک دەڵێن ناوە و هەندێکی تریش دەڵێن بەبۆنەی مامیەوە یان کەسێکی نێزیکیەوە ئەو نازناوەی وەرگرتووە.

بەهەرحاڵ، مەلا مستەفا بەلایەنی کەمەوە لە قوتابخانەکانی سلێمانیدا خوێندوویەتی، لەوێش پێوەندیی خۆی لەگەڵ مەلاکانی ئەو شارەدا پتەو کردووە و ئەم پێوەندییەش جۆرە شێوازێکی سیاسەت بووە، بەشێوەیەک کە پاش چەند ساڵێک ئەو مەلایانە لەجیاتی ئەو شۆڕشیان لە دژی لایەنی ڕکابەریدا کرد. هەروەها مەلا مستەفا پێوەندیی لەگەڵ ڕۆشنبیرە نەتەوەییەکانی شاری سلێمانیدا هەبووە. لە ساڵی ١٩٤٣ مەلا مستەفا بڕیار دەدات بگەڕێتەوە بۆ ناوچەی خۆی لە بارزان. ئەو بڕیاری گەڕانەوەیە بۆ بارزان کە ڕووبەڕوو وەستانێکی ئاشکرابوو بۆ حکومەت کاریگەریشی بۆ جووڵانەوەی خەڵکی شاری سلێمانی هەبوو.

ساڵی ١٩٤٤ (ڕاستتر ساڵی ١٩٤٥ە)، بارزانی ناچار دەکرێ پەنا بباتە بە ئێران کە ئەوکاتە ئێران لە لایەن هێزەکانی روسیا و بەریتانیاوە داگیرکرابوو. بارزانی لە ناوچەی بێ لایەن لە کوردستانی ئێران نیشتەجێ دەبێ و لە ساڵی ١٩٤٦ کوردەکانی ئێران کۆمارێکی کوردی رادەگەیەنن کە مەهاباد پایەتەختەکەیەتی. مەلا مستەفا هێزێکی لەگەڵدابوو ژمارەیان بە گوێرەی سەرچاوەکان دەگۆڕێت بەڵام لە نێوان هەزار تا سێ هەزار کەس بوون، لەوێ مەلا مستەفا بوو بە ئەندامی سەرکردایەتیی سەربازیی هاوبەش کە کۆماری دەپاراست. نازناوی جەنەرال بارزانی-یش هەر بۆ ئەوکاتە دەگەڕێتەوە.

سەرنج ڕاکێشترین بەش لە ژیانی بارزانیدا پاش ڕووخانی کۆماری مەهابادە. بارزانی دیسان دەست بە دانوستاندن دەکاتەوە، سەردانی تاران دەکات و بۆ یەکەمین جاریش لە ژیانیدا سەردانی باڵیۆزخانەی ئەمریکا دەکات و دانوستاندنیان لەگەڵدا دەکات و داوای مافی پەنابەری دەکات لە ولاتە یەکگرتووەکاندا، ئەم داوایە تەنیا بۆ خۆی و خێزانەکەی نەبووە بگرە بۆ هەموو هەڤاڵەکانی بووە لەو بارزانییە کوردانەی لەو کاتە لە ئێران لەگەڵیدابوون. دیاربوو داواکەی پەسند نەکرا و بارزانی هەوڵی دا بڕواتە جێگەیەکی تر.

هەروەها هەوڵی دا دانوستاندن لەگەڵ عێراقدا بکات بەڵام حکوومەتی عێراق بڕیاری لەسێدارەدانی بارزانیی دابوو بۆیە نەیتوانی لە عێراق بمێنێتەوە. ئەوەبوو بڕیاری چوون بۆ یەکەتیی سۆڤیەتی دا. بارزانی بەرەو عێراق هاتەوە و پاشان بە پێنج سەت چەکدارەوە، لە کوردستانی عێراق شەڕی لەگەڵ سوپای عێراقدا کرد و خۆی گەیاندە کوردستانی تورکیا، لەوێش لەگەڵ سوپای تورکیا دووچاری شەڕ دەبێ و دیسانەوە دەچێتەوە کوردستانی ئێران و جارێکی تر تووشی شەڕ دەبێتەوە لەگەڵ سوپای ئێراندا، بەڵام لە کۆتاییدا و بەبێ قوربانیی گیانی توانیی خۆی و هەڤاڵەکانی لە ڕووباری ئاراس بەرەو یەکەتیی سۆڤیەت بپەڕنەوە. ئەوەی جێگەی خۆشحاڵی بوو ئەوەبوو لەگەڵ سوپای سۆڤیەت تووشی شەڕ نەهات، بەڵام بە باشییش پێشوازی نەکرا. ئەو کوردانەی لە ئازربایجان دەژین تا ئێستەش گەیشتنی بارزانی و هەڤاڵەکانییان لەیادە، ئەو گەیشتنە هاندەر و بزووێنەرێ بوو بۆ هەستی نەتەوایەتییان. واتا مێژووی ناسیونالیزمی (هەستی نەتەوایەتی)ی کوردی لە ئازربایجان لەگەڵ گەیشتنی بارزانییەکان دەستی پێ کرد. ئەو ڕووداوە ڕووداوێکی مەزن بوو بۆ ئەوان و تا ئێستەش لە یادیانە.

بارزانییەکان نەیانتوانی لەوێ بمێننەوە، بگرە بەسەر وڵاتەکانی یەکەتیی سۆڤیەتدا بڵاوکرانەوە، ئەوکاتە ستالین سەرکردایەتیی سۆڤیەتی دەکرد. لە قۆناغی شەڕی ساردا هەردوو کۆماری مەهاباد و ئازربایجان دوو ناوچەی سەرەکیی ڕووبەڕووبوونەوە بوون. لە سەردەمی شەڕی ساردا نەدەکرا بارزانی بێ لایەن بێت، دەبوایە سەر بە لایەنێکی شەڕی سارد بوایە. بۆیە بارزانی دوور لە کوردستان ویستی هەڵوێستی خۆی روون بکاتەوە و دیاربوو بڕیاری دا بچێتە پاڵ ئەو لایەنەی کە بارزانی بە بەهێزتر و کراوەتر و مرۆییتری دەزانی، بارزانی بڕیاری دا بچێتە پاڵ ئەمریکا، بەڵام ئەمریکا داواکارییەکەی بارزانیی ڕەت کردەوە، بۆیە ناچار بوو لە یەکەتی سۆڤیەت بمێنێتەوە. بارزانی لە ڕۆژئاوا ناوبانگی دەرکردبوو، بەتایبەتی لە ڕۆژنامەوانیی بەریتانیادا بە مەلای سوور ناسراوبوو.

لە سەرەتای ساڵانی پەنجادا پروپاگەندەیەک لە کوردستانی عێراق بڵاوبووەوە، رووسەکان کارتێکی براوەیان پێیە و هەڕەشە لە یەکەتیی دەوڵەتی عێراقی دەکەن. ئەو کارتەش مەلای سوور بوو واتە بارزانی. ڕووداوەکان وایان هێنا کە کودەتایەکی چەپی-یساری لە عێراق ڕوو بدات، ئەو کودەتایە عێراقی لە کامپێکی شەڕی ساردەوە خستە کامپێکی تر.

سەبارەت بە بارزانی کە لە یەکەتیی سۆڤیەت بوو پێویستی بە مۆڵەتێک بوو بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە عێراق. لەو کاتەدا عەبدولکەریم قاسمی سەرکردەی کودەتا کە باسی لە مافی یەکسانی دەکرد بۆ کورد، تەنانەت باسی مەسەلەی ئەگەری ئۆتۆنۆمیشی دەکرد. بەڵام پێوەندییەکانی نێوان بارزانی و قاسم زۆری پێ نەچوو روویان لە نالەباری کرد و ساڵی ١٩٦١ بارزانی چەکی دژی حکوومەتی عێراق هەڵگرتەوە. بارزانی ئەو کاتە سیاسەتی خۆی لە پێشکەوتنخوازییەوە دەگۆڕێت بۆ پارێزگاری چونکە ئەگەر لایەنێک دژایەتیی حکوومەتێکی پێشکەتوخواز بکات ئەوا بەدواکەوتووخواز لەقەڵەم دەدرێت. لە ساڵانی شێستدا بزووتنەوەی بارزانی لە ڕۆژئاوا هەوڵی تەواوی دەدا بۆ ئەوەی لەنێو وڵاتە ڕۆژئاواییە پێشکەوتوخوازەکاندا هاوسۆزی وەدەست بهێنێت، هەرچەندە ئەوکاتە ئاسانتر بوو ڕۆژنامەنووسی پارێزگار بۆ بەرژەوەندیی بزووتنەوەکە رابکێشی.

مستەفا بارزانی شەڕوانێکی شەڕی ساردبووکە پشتگیریی لە ڕۆژئاوا و ئیمپریالیزم دەکرد. ئەو دژی ئیمپریالیزم نەبوو بگرە زیاتر ئیمپریالیزمی دەویست. بارزانی ئەو کاتە بە چەندین ڕۆژنامەنووسی راگەیاندبوو کە نارازی نییە وڵاتەکەی ببێت بە ولایەتی پەنجا و یەکەمین یان پەنجا و حەوتەمینی ئەمریکا. لەو ڕۆژانە و بۆ ماوەیەکی زۆر، پاش ئەوەی ئەمریکا جارێکی تر وای نیشان دەدا کە بەرژەوەندییەکانی خۆی بەلاوە لەهەموو شتێک پێ گرینگترە، بە تایبەتی لە ساڵی ١٩٧٥دا، زۆر کەس رەخنەیان لە مستەفا بارزانی گرت چونکە پشتی بە ئەمریکا بەست. دەبێ دان بەوەدا بنێین کە بارزانی هەڵەیەکی گەورەی کرد چونکە لەوکاتەدا ڕێگەچارەی تر هەبوو. ئەگەر تێبینیش بکەین، زۆر لەو کەسانەی جاران رەخنەیان لە بارزانی دەگرت، ئێستە هەست بەوە دەکەن ئەو پاسەوانیەتییەی نێودەوڵەتییە بۆ باکوری عێراق دابین دەکرێت بۆ بواردانی جۆرێک لە هەبوونی کورد لەوێ، گرینگە.

پێمان وایە دووبارە هەڵسەنگاندنەوەی بڕیارەکانی ساڵانی شەستی مەلا مستەفا لە کاتی ئێستەدا، پێویستە. پێش ماوەیەک من وشەی عەشایریم بەکار هێنا، ئاخۆ بارزانی سەرکردەیەکی نەتەوەیی بووە یان سەرکردەیەکی ناوچەیی یان سەرکردەیەکی عەشایری؟ لەراستیدا جێگەی سەرسڕمانە چەندین ڕۆژنامەنووس لەوانەی سەردانی بارزانییان کردووە، تەنانەت ئەوانەی سۆزیشیان لەگەڵ ئەودا بووە، بارزانی وەک سەرکردەیەکی عەشایری نیشان دەدەن، هەروەها ئاماژە بەو شەڕانە دەکەن کە بارزانی لەگەڵ

عەشیرەتەکانی تری ناوچەکەدا کردوونی.

ئاخۆ راستە مستەفا بارزانی تەنیا بەرگریی لە بەرژەوەندییەکانی گروپەکەی خۆی کردووە؟ دەبا رای دەیڤید ئادەمسۆن وەربگرین کە رۆژنامەنووسێکە و سەردانی بارزانیی کردووە. بارزانی پێی گوتبوو هیوا و ئاواتی ئەوە نییە هەموو پارچەکانی کوردستان یەک بخات، بگرە هەوڵی ئۆتۆنۆمی دەدات بۆ کوردی عێراق و دیموکراتیش بۆ هەموو عێراق. ئەم دروشمەش دروشمی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە. بەڵام ئادەمسۆن دەڵێ گومان لە وتەکانی بارزانیدا نییە کە دەڵێ بایەخ بە کوردی دەرەوەی عێراق نادات بگرە زیاتر هەوڵ بۆ کوردی عێراق دەدات، چونکە بارزانی ئایدیالیستێکی مەزن نەبووە. ئادەمسۆن زیاتر دەڵێ: وەفاداریی مستەفا بارزانی بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ بارزانییەکان و خێزانەکەی بووە. لە کوردەواریدا وتەیەک هەیە دەڵێ "من و براکەم دژی ئامۆزاکەم، بەڵام من و ئامۆزاکانم دژی بێگانە" ئەم وتەیە شێوەیەکی قارەمانییەتیی گرتووەتە خۆ... وانییە؟

بەڵام مەلا مستەفا بەو شێوەیە نەبووە. لەسەرەتای ساڵی ١٩٤٤دا، کاتێ بارزانی سلێمانی بەجێ دەهێڵێت و دەگەڕێتەوە بارزان، دەست بەدانوستاندن لەگەڵ حکوومەتی ناوەندیدا دەکات. لەو کاتەدا بارزانی هێزی سەربازیی هەبووە بۆیە هێزی مانایی هەبووە بۆ دانوستاندن، ئاخۆ داوای هیچ شتێک دەکات بۆ بارزان؟ ئاخۆ داوای هیچ شتێک دەکات بۆ خێزانەکەی؟ هەموو داواکانی ئەوە بوون کە دەیویست قەزا کوردییەکان لە ویلایەتی موسڵ جودا بکرێنەوە، بارزانی داوای کرد هەموو گیراوە کوردەکان ئازاد بکرێن، هەروەها داوای کرد نوێنەرێکی کورد دابمەزرێت لەناو حکوومەتی ناوەندی لە بەغدا و دەسەڵاتی ئەوەی هەبێت مافی ڤیتۆ لەبارەی ئەو بڕیارانەی پێوەندییان بە ناوچە کوردییەکەی عێراقەوە هەیە، بەکار بهێنێت.

هەروەها مستەفا بارزانی لەو دانوستاندنانەدا داوای کرد بودجەیەکی دارایی بۆ کوردستان تەرخان بکرێت. ئەم داواکارییانە لە ساڵی ١٩٤٤دا خرانە ڕوو، بەڵام هەر دەڵێی پرۆژەکانی ئۆتۆنۆمییە کە لە ساڵی ١٩٧٠دا ئیمزا کران. هەر لەو کاتەوە بارزانی بیری لێ دەکردەوە. پێوەندییەکانی نێوان بارزانی و پارچەکانی تری کوردستان تۆزێک نادیاربوو، لەلایەکەوە بینیمان مستەفا بارزانی بەشداربووێکی چالاک بوو لە یەکەمین کۆماری کوردی لە کوردستانی ئێران، بەڵام لەلایەکی ترەوە و هەر لە گەڕانەوەی بۆ عێراق لە ساڵی ١٩٥٨دا، بارزانی هەموو هەوڵ و تەقەلاکانی بۆ کوردستانی عێراق تەرخان

کرد. یەکەتیی سۆڤیەت هەرگیز نەیتوانی مەلا مستەفا بکات بە ستالینیستێک.

ستالین سیاسەتێکی هەبوو، ئەویش ئەوەبوو یەکەتیی سۆڤیەت پشتگیری لە هیچ شۆرشێک لە هەر شوێنێکی ئەم جیهانە ناکات، بەڵام هەموو پارتە کۆمۆنیستەکان دەبێ لەسەرەتاوە پشتگیریی خۆیان بۆ دەوڵەتی سۆشیالیستی یەکەم دەربڕن کە ئەویش یەکەتیی سۆڤیەتە. مەلا مستەفاش لەلایەن خۆیەوە سیاسەتێکی پەیڕەو کرد زۆر لە سیاسەتەکەی ستالین دەچوو. لە سەرەتا داوای ئۆتۆنۆمی دەکات بۆ یەک پارچەی کوردستان و پاشان هەموو پارچەکانی تری کوردستان دەبێ پشتگیری لەو ئۆتۆنۆمییە بکەن. مستەفا بارزانی ڕۆڵێکی کاریگەری بینی لە دروست کردنی فرەلایەنی و دامەزراندنی ئەحزابی سیاسیی تر کە ئەرکی سەرەکییان پشتگیری کردنە لە بزووتنەوەی کوردی لە کوردستانی عێراق.

ئەوەی لە سیاسەتە نەخشە بۆکێشراوەکانی مەلا مستەفا گرینگتربوو، کاریگەریەتیی ئەو سیاسەتانە بوو لەسەر ڕووداوەکانی کورد و کوردستان، هەروەها وێڕای ڕوودانی هەندێ شەڕی عەشایری لەو کاتانەدا، هەر بارزانی بوو سەرپەرشتیی یەککگرتنی کوردی عێراقی دەکرد. هەروەها بارزانی سەرپەرشتیی پرۆسەی گۆڕانی کرد لە عەشیرەتەوە بۆ نەتەوە. ئەم پرۆسەیەش هەروەکو ئێستە دەیبینین وەک خۆی نەماوە، تێبینیی ئەوەمان کرد کوردستانی عێراق لە عەشیرەتەوە بووە بەنەتەوە، بەڵام دەتوانم بڵێم دیسانەوە بۆ عەشیرەت!! ئەم پێشهاتەش پاش وەفاتی بارزانی رووی دا.

بارزانی بزوێنەری هەستی نەتەوایەتیی کوردی تورکیا و ئێران بوو. دوکتۆر ئیسماعیل بێشکچی کە زانایەکی کۆمەلایەتیی تورکە دەیان کتێبی نووسیوە و بەهۆی هەر کتێبێک دوو ساڵ بەند کراوە و ئێستەش هەر لە بەندیخانەکانی تورکیایە و ماوەی بەندکردنی لەوانەیە بگاتە ۱۰۰ ساڵ. دوکتۆر ئیسماعیل بێشکچی لە ناوەڕاستی شەستەکاندا یەکەمین کتێبی بلاوکردەوە کە نامەی دوکتۆراکەی بوو و تیایدا باس لەوە دەکات کە عەشیرەتێکی رەوەند هەبوون لە کوردستانی تورکیا زۆربەی زۆریان نەخوێندەواربوون، ئەو عەشیرەتە بە عەلیکان ناسرابوون. بۆ ئەوەی دوکتۆر بێشکچی بزانێت ئەو عەشیرەتە لەناودارانی ناوچەکە کێ دەناسن و چۆنیان هەڵدەسەنگێنن، چەند پرسیارێکیان لێ دەکات و دەڵێ لە کەسایەتییەکان کێ دەناسن؟ ئاخۆ ئەتاتورک دەناسن؟ ئاخۆ سوڵتان عەبدولحەمیدی پاشای جاران دەناسن؟ ئاخۆ جەمال گوسال دەناسن؟ (کە لە ساڵانی

شەستەکان کودەتایەکیی سەربازیی لە تورکیا ئەنجام دا) دوکتۆر ئیسماعیل لە پرسیارەکانیدا بەردەوام دەبێت و لەو عەشیرەتە دەپرسێت و دەڵێ ئاخۆ ئێوە شێخ سەعیدی پیران دەناسن کە لە ساڵی ١٩٢٥دا سەرکردەی یاخیبوون بوو؟ ئاخۆ ئێوە سەعید نەورەسی دەناسن کە سەرکردەیەکی ئایینی و نەتەوەییی کورد بوو؟ دوکتۆر ئیسماعیل چەندین ناوی تر دەپرسێت یەکێک لەوانە کۆچێرۆ-یە کە چەتەیەکی ناسراو بووە لە تورکیا بەشێوەیەک چەندان شاعیری ناسراوی تورک شیعریان لەسەر نووسیوە. ئەوەی جێگەی سەرنج بووە لە ئەنجامی ئەوپرسیارانەدا هەموو عەشیرەتی عەلیکان ئەو کۆچێرۆیە دەناسن بەڵام دووەمین ناوی ناسراو لەلایان هیچ ناوێک نەبوو لەوانەی لەسەرەوە هاتن، بگرە بارزانی بوو، واتا بارزانی لە ئەتاتورک و جەمال گوسال بەناوبانگتر بوو لەلای ئەو عەشیرەتە. لەسەدا ٨٩ی ئەو عەشیرەتە بارزانییان دەناسی، جەمال گوسالی سەرۆکی تورکیا تەنیا لەسەدا ٦٠ی ئەو عەشیرەتە ناسییان. ئەتاتورک کەمتر لەسەدا ٥٤ی دەنگەکانی بەرکەوت. لە لایەکی ترەوە زۆر خەڵک لە تورکیا هەن کوردن، لە ناوچەیەکی ئەوپەڕی ڕۆژئاوای تورکیا لە ناوچەی سیواس حەفتەی رابردوو قسەم لەگەڵ ئافرەتێکی پیرکرد گوتی «بەڵێ لە ساڵانی شەستەکاندا رادیۆمان دەکردەوە و گوێمان لە (ئێرە دەنگی کوردستانی عێراقە) دەبوو، وێڕای ئەوەی رادیۆکە بە سۆرانی بەرنامەکانی بڵاودەکردەوە و ئێمە تێی نەدەگەیشتین بەڵام لەپڕ هەستم کرد کە پرسێکی کوردی هەیە دەبێ بیزانین».

لەسەرەتای ساڵانی حەفتادا، چەندان کوردم بینی لە تورکیا و باسی ئاینمان کرد. یەکێکیان گوتی «ئاینی من کوردستانە و پێغەمبەریشم بارزانییە». لە راستیدا هەستی نەتەوایەتی وەکو ئایین گرینگە، ناسیونالیزم ئایدیۆلۆجیایەکی سیاسی نییە وەک مارکسیزم و لیبرالیزم، بگرە زیاتر پێوەندیی بەهەست و سۆزەوە هەیە. بەهەرحاڵ تەنیا بارزانی نەبووە لەلایەن ئالیگرەکانیەوە بە مەزنی تەماشا دەکرێت و بە پیرۆز دەزانرێ، ئەو پیاوەی ئێستە لە بەندیخانەیەکە لەسەر دورگەیەکی نێزیک ئەستەنبۆل ئەویش زۆرجار خۆی بە جۆرە پێغەمبەرێک دەزانێت. لە مێژووی کورددا، ئەو بزووتنەوە کوردییەی لەم سەدەیەدا بینیمان هەر لە پەرتوبڵاویی عەشایری هەتا یەکبوون وەک نەتەوەیەک و دیسانەوە بۆ دابەشبوون، لەم پرۆسەیەی مێژوودا مەلا مستەفای بارزان بەسەرکەوتوویی سەرکردایەتیی بزووتنەوەی کوردی لە عێراق کرد بەتایبەتی لە ساڵای نێوان ١٩٦١ تا ١٩٧٠، کە ئەم ماوەیە بەماوەی هیوا و چاوەڕوانی لە قەڵەم دەدرێت.

لە سەرووی بەرژەوەندیی ناوخۆی خۆی و خێزانەکەی، بارزانی لە هەموو کاتێکدا نوێنەرایەتیی کوردی کردووە، ئەم خاڵەش وای لە بارزانی کردووە ببێت بە سیمبۆلێکی هەمیشەییی یەکگرتنی کورد، هەروەها سیمبۆلێکی هەمیشەییی هەبوونی کورد وەک نەتەوەیەک. نەوەکانی داهاتووش دەبێ بارزانی بکەن بە ئاوێنەیەک بۆ دروستکردنی دوارۆژ.

# فەرهەنگۆک

## ئـ

ئۆپەراسیۆن: کردەوە، عملیات
ئاگرهاویژی: إطلاق النار
- راگرتنی ئاگرهاویژی: وقف إطلاق النار
ئەوک: گەروو، قورقوڕاگە
ئاوەز: هۆش و بیر، عەقڵ
ئاتاج: پێویستی، حاجەت

## بـ

بستوو: بەرزایی
باڵەکی: تەنیشتی
باڵادەستی: تفوق
بیرەبیر: تردد
باندۆر: تأثیر
بوویەر: حدث
بەڕوومەت: محترم، وجیه
بارت: بەرامبەر
بانگەواشە: دعایة
بەدەردانەوە: انعکاس
بەندیواری: ارتباط
بەرزەڵان: شوێنی پڕ لە بەرزایی، مرتفعات
باز: قفزة
بێ ناوبڕ: بێ وچان، بدون فاصلة
بڕەک: ثاقب
بەژەکی: بري
بڵاوە: إنتشار
بریکار: وکیل
بەدەمار: تووڕە، متعصب
بەرسف: وەڵام
بەرکەوت: ئەنجام، بەرهەم
بەڵاوۆک: بڵاوکراوە، نشرة، منشور
بەڵاوۆکی دەنگوباس: نشرة الأخبار

بەهەر کڵۆەجێ: بەهەر شێوەیەک
بۆندژی: سوء تفاهم
بەکێش کردنی متمانە: کسب الثقة
بانگهێشتن: لێ گێڕانەوە، بانگ کردن، داوەت
بەرتەک: بەرپەرچ، وەڵام، رد
بیرەبیر: دوودڵی، تردد
بەخۆهێشت: بەڕەزامەندیی خۆ، طوعي
بەسەربازگری: تجنید
- بەڕێوەبەرایەتیی بەسەربازگری: مدیریة التجنید
بەکار: فعال
بیرەکی: ذهني
بەرچاو: موضوعي
- هۆکاری بەرچاو «بابەتی»: عامل عیني، عامل موضوعي
بەرگر: بەرهەڵست، کۆسپ، مانع
برەوستاندن: پەرەگرتن، پێشکەوتن
بنەجێ: نیشتەجێ
بێشەڵان: دارستانی چڕ
بەڵەد: شارەزا، رێ پێشاندەر، دلیل
بارهەڵگری: نقل
- بنکەی بارهەڵگری: نقلیات
بشێونە: هەراوهۆریا، کەس بەکەس نەبوون، فوضی
بەگیرهێنان: گرتن، القاء القبض
بەندیواری: پێوەندی، إرتباط
بێ تۆرە: بێ شەرم، بێ ئەدەب
بێ پەناوپەسیو: هەژار و بێکەس
بەرژدی: بەسووربوون لەسەری
برین پێچەوە: مضمد
بەکەیس کردن: جێگە بۆ کردنەوە

## پ

پێشنووس: عەرزوحاڵ، عریضة
پەسن: پێ هەڵگوتن، ستایش، مدح
پەیا کردن: إیجاد
پاشماوەگر: میراتگر، وارث

پشتەبەرە: بەشی پشتەوەی بەرە، خلفي
پێشەوان: پێشڕەو، طليعة
پرس: مسألة
پشتاوپشت: وراثي
پەسارگە: پەناگە، حەشارگە، شوێنی پەنا بۆ بردن، ملاذ
پاگون: «وشەیەکی رووسییە» کتافیة
پێگیری: لاملی، عینادی
پشک: بەش، حصة
پێسیر: یەخە، بەرۆک
پێناو: وسیط
پێتاو: پێڵاوی لەچەرم دروستکراوی کوردەواری
پێوە: بەولاوە «لە ئێوە پێوە: لە ئێوە بترازێ»
پێشبڕی: إعتراض
پاکار: نۆکەر و گوێ لەمست
پەرجوو: مۆجیزات
پێوەنان: زیادەوێژی، موبالەغە
پێ پێوەنان: هەڵاتن
پشک راکێشان: یانەسیب، إقتراع
پێداپێدا: بەرەبەرە
پێ بژێوی: ئازووخە
پشکنێری: استکشافي
پێوەندیداری: اتصالات
پێشبڕی: اعتراض
پێوەچوون: تعقیب
پێنگاو: پێنگاف، هەنگاو، خطوة
پاشناو: لقب
پاکار: خادم
پێشوەچوون: پێشڤەچوون، بەرەو پێش رۆیشتن
پەلهاوێشتن: تغلغل
پارێز: سەنگەر، پەنا
پەرگە: تەنیشت، لا
پاشەبەرە: خلفیة الجبهة
پەنادان: تأمین

پاکوەکەری: تطهیر، تمشیط

## تـ

تەناهی (تەنایی): نەبوونی کێشە و هەرا، ئاسایش، استقرار
تەنا: هێمن، ئەمین
تەنگژە: تەنگانە، أزمة
تێگەیشتە: مفهوم
تیشکە: أشعة
تژی: پڕ
تەتەر: پەیک، نامەبەر، نێردراو
تزار: قیصر
تەبا: لەگەڵ، پێکەوە
تەنکێش: تەنیشت، لا
تیرێژ: تیشک، یا هەر شتێکی باریک و درێژ
تەنیشتەکی: لایەکی، جانبي
تەنگەڵان: تەنگژە، تەنگەبەر، مضیق
تەنگاسی:تەنگوچەڵەمە

## جـ

جێگۆز:جێ گواستنەوە
جێگۆڕکە: تنقل
جێگۆڕکەر: متنقل
جێ نیشتە: مقیم
جووت: طبقاً، مطابق
جڤات: دانیشتن، جەمات، جلسة
جێگرەوە: ئەلتەرناتیف، بدیل
جێنیشتە: مقیم
جێڕاز: جێی هەڵگرتنی نهێنی، محرم

## چـ

چاوی پەتی: العین المجردة
چەکی ئاگری: الأسلحة الناریة
چاوناس: معروف
چێوە: اطار
چاودار: ناظر، مراقب، مشرف

چاوگە: سەرچاوە، مصدر
چێو: داری باریکەڵە

## خ

خۆبزوێن: ئۆتۆماتیک
خۆنوواندن یان خۆنوێنی: مانۆر، تظاهر، استعراض، مناورة
خۆبەکەمگری: لەخۆبوردوویی، تواضع
خۆبەزۆرگری: فیز، غرور
خۆ بەکەیس کردن: خۆ حەشاردان، خۆ چەسپاندن
خۆزایی: طبیعي
خۆبەپاشدەر: متخلف
خاپاندن: فێڵ و تەڵەکە
خاڵگە: خاڵ، نقطة
خۆشبژی: خۆشگوزەرانی، رفاهیة
خۆبوێری: خۆلادان، تجنب
خۆگورمیلە کردن: خۆ کرژ کردنەوە و دانیشتن بەچیچکانەوە
خۆنوێنی: خۆنوواندن

## د

دەستەبەر: زەمانەت
دەسبێن: شتێک دەستی پێ گرێ بدرێ، کەلەپچە
دەست هەڵێنان: بەرگری، دەسوەکەری
دەستهاوێژ: بەڵگە، مستمسک
دەستێوەردەری: تدخلات
دەستەوا: هاوکاری، تضامن
دەفر: ئامان، قاپ
دەسوەکەری: بەرپەرچدانەوە و بەرگری، دەست هەڵێنان
دەسپێک: سەرەتا، پێشەکی
دەسکیز: خەفیە، جاسووس
دەستاندە: خێروبێر، صدقة
دەسمایە: سەرمایە، پارە، رأسمال
دژبەر: معارض
دژبەری: معارضة
دوانە: مزدوج
دەرەکی: خارجي

دەمارگر: عصبي
دەسبار: یارمەتی
دیسپلیندار: بەزەبت و رەبت
دەلەیزین: یاری دەکەین
- ڕۆڵێک دەلەیزین: دەورێک دەبینین
دژەحەوایی: مضادات جویة
دوورەپارێزکردن: عزل
دادوەری: قضاوەت
دادوەر: قاضی، حاکم
دنەدان: هاندان، تحریک، تحریض
دەمڕاست: مختار، ممثل
دەساندە: خێروبێر
دەمارکرژ: متعصب
دەستەوا: هاوکاری، کاری پێکەوەیی
دارماڵ: پڕ، فوول
دەستپێشکەری: مبادرة
داپۆشین: تغطیة
دڵهێوری: ضبط النفس
دان بەخۆداگری: ضبط النفس

ڕ

راسپێر: مکلف
رەوانی: روحي
رەوشتەکی: اخلاقي
رێگەگر: کۆسپ، مانع
رێزداری: إحترام
راوێژکاریەتی: إستشارة
رازان: نووستن
راسپێر: ممثل
رووەت: رووالەت، شێوە، ئارایش، مظهر
رێزلەیەکترگری: الإحترام المتبادل
ڕکابەری: پێشبڕی
رابوێری: ترفیه
راسپاردە: ئامۆژگاری، توصیة

ڕووبەر گرتن: مساحة
رووبەرگر: مساح
رێ بەدێیی: ڕێنوێنی، توجیه
ڕووناکیدەر: تنویر
رایەڵە: هاتوچۆ
رووەت: خەسڵەت، صفة

## ز

زەنەک: مستنقع
زاگە: شوێنی لەدایک بوون، مسقط الرأس
زێد: زاگە، وڵات، نیشتمان
زارەکی: شفوي
زاڵ: مسلط، مسیطر
زۆرکاری: زۆرداری، زوڵم، چەوسینەوە

## ژ

ژینەوەری: حیوي
ژیانەکی: حیاتي

## س

سنووروان: پاسەوانی سنوور
سێکوان: شوێنی بەیەک گەیشتنی سێ سنوور «مثلث حدودي»
سۆزداری: تعاطف
سەرگەلە: مقدمة
سەرگەلەدار: پێشەوان، پێشەنگ، طلیعة
سەرانسۆکەر: رقیب
سەرپشک: مخول
سیمبۆل: نیشانە، رمز
سەرچاوگە: سەرچاوە، مصدر
سۆزبزوێنی: إثارة
سیکارد: چەقۆ
سەرپێهات: بەسەرهات، چیرۆک
سوود لەهەل وەرگری: إنتهاز الفرصة
سەرەتاتکە: چاوەدێری، مراقبة
سەرژمێر: تعداد

سەرگە: مبدأ، منطلق
سەرەتاتکەکردن: مراقبة
سەرانسۆ یا سەراسۆ: استطلاع، چاوەدێری، رقابة
سەرشار: منطلق

## ش

شوێنەکی: مكاني
شیمانە: إحتمال
شەڕوان: جەنگاوەر، مقاتل
شۆڕشوان: شۆڕشگێڕ، ثوري
شارەکی: سڤیل، شارنشین، مدني
شرۆڤە: لێکدانەوە، شرح
شەش ئاگر: دەمانچە، مسدس
شارۆکە: شاری بچووک، شارۆچکە
شیمانە: احتمال
شوون هەڵگرتن: تعقيب
فیۆداڵ: دەرەبەگ، اقطاعي

## ک

کریار: فاعل
کارا: بەکار، فعال، مؤثر
کاتەکی: مؤقت، وقتي
کاربەڕێوەبەری: إدارة الشؤون
کوتینەوەی کوێرانە: القصف العشوائي
کۆنگە: جەنگە، ناوەند
کێوەڵان: کەژ و چیای سەخت و دژوار
کۆن: چادر، رەشماڵ
کۆلەدار: کۆلۆنیالیست، ئیستیعمار
کامیۆن: لۆری
کژ: ئەتمۆسفیر، جو
کاردار: مأمور
کاروەر: مأمور
کێبەرکێ: ململانە، صراع، مواجهة
کلکەسووتێ: مەرایی
کووڕ: هەورازی رژد و تووش

کەتن: خروقات
کەتنکەر: مرتکب
کونکەرە: ثاقب
کۆجێ بوون: تمرکز
کەڵکەڵە: بیر و خەیاڵ
کەلوو: برج
کینەوەری: احقاد
کاروانگەلی کردەوەکان: فرق العملیات
کەیس: هەل، فرصة

## گ

گەف: إخطار
گاف: جار
گەوە: لووتکە، قمة
گۆنگەر: گیروگرفت و هەنگامە
گۆپکە: گوپیتک، سەر، لوتکە
گێژەنگە: گێژاو
گزنگ دان: سەرەتای دەرکەوتنی رووناکیی ڕۆژهەڵاتن
گیر کردن: وەستاندن، توقیف
گاووگەردوون: قوربانی، ضحية
گەلەکۆیی: ژمارەیەک خەڵک پێکەوە
گوریس کێشەکێ: ململانە، صراع
گەروو: هەواز، بەرزایی
گەلێر: میللی، شعبي
گارد «guard»: پاسەوان، حرس

## ل

لەمپەر: کۆسپ، مانع، حاجز
لابیان: ژووری گەورەی لاکێشە، سالۆن
لەنگەرگە: بەندەر، میناء
لاملی: رکابەری، سووربوون
لەیەکبینە: بەردەوام، بێ وچان، بێ پشوو
لەهەلگەڕ: هەلپەرست، إنتهازي
لاچەپ: لارێ، تەنیشت
لێرەوار: دارستانی سروشتی

لێوانلێو: پڕ
لەمپەر: کۆسپ، حاجز، مانع

## م

مان لە خواردن گرتن: الإضراب عن الطعام
مۆڵگە: معسکر
مامزە: مهماز
ماکە: بنەڕەت، هۆ، سبب
مایەکی: مادي
میرەدێ: گوندی گەورە
مۆنجەی دێ: پڕە لە خەڵک
مل دان: رازی بوون
مل پێوەنان: رۆیشتن بێ گوێ دانە شتێک
ملە: بەرزایی
میداڵیەی بوێری: نوط الشجاعة
مۆڵگە: معسکر
موتاڵا: بیرکردنەوە، وردبوونە، لێکۆڵینەوە
مەڵبەند: مرکز
مەکۆ: مرکز، مأمن

## ن

نفرِ: تووک، نەفرەت، لەعنەت
ناوکۆ: هاوبەش، پێکەوە، مشترک
نوێدەم: سەردەمی نوێ
نەرێ: پێچەوانەی «ئەرێ»یە، نفي، نەء
ناوپشتە: بڕبڕە، ناوەند
نۆین: کەناڵ، قناة
نواندن: تمثیل
نۆشدار: طبیب
نۆشداری پسپۆڕ: طبیب إختصاصي
ناوەکی: داخلی
نووسەکی: تحریري
ناپەڕژا: بێ سەروبەر. ناڕێکوپێک
ناورانەوە: پاڕانەوە
ناس: مألوف

نوواندن: إظهار
ناوکە: نواة
نەدیو: شاراوە، ئەو شوێنەی بەچاو نابینرێ
نەواڵ: دۆڵ و کەند و لەند
ناوبڕ: پشوو، وچان، فاصلة، حاجز
نێزیکەپەرێز: نێزیک
نووا: ملاذ

## و

وەکات: هاوکات، زوو
وردکە: دقیقة
وێنەگرتنەوەی پەنجە: طبع الأصابع
وڵسات: گاوگۆتاڵ

## ھ

هیم: بناخە، بنەڕەت
هۆک: پەڵپ و بیانوو
هۆک و بەرهۆک: علة ومعلول
هەموو لەهەموو: پێکەوە، پێکڕا
هەڵەت: بان، بەرزایی، گردوگۆڵی یەک لە تەنیشت یەکتر
هێرشبەری: پەلامار، تقدم
هنداف: موازاة
هەمبەر: دژ، بەرامبەر
هەموولایەنە: شامل
هەراوزەنا: ضجة
هاوێرکردن: لەیەکتر جیا کردنەوە، فرز، فصل
هەموو یەکبوون: یەکگرتن، إتحاد
هەموولایە: شامل
هەرزەوێژ: یەکێک قسەی کرچ و کاڵ بکات

## ی

یەکە: وحدة
یەکەگەل: وحدات
یەکجارەکی: قطعي
یونیفۆرم: جلوبەرگی یەکگرتوو، زي موحد

# هەڤاڵانی ڕێبازی ڕێڕۆیشتنە مێژووییەکەی بارزانیی نەمر بۆ یەکەتیی سۆڤیەت

(١) ئیبراهیم مەلا جەلال (شکاک): لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە گیراوە و چارەنووسی بزرە.
(٢) ئیبراهیم حەسەن (بێل - دۆڵەمەری): سەرەتای شۆرەشی ئەیلول لە ١٩٦١ شەهید بووە.
(٣) ئیبراهیم حوسێن ئەحمەد (خەردەن - دۆڵەمەری): لە شەڕی باعەدرێ لە بەهاری ١٩٦٣ شەهید بووە.
(٤) ئیبراهیم شێخۆ ئیبراهیم (شانەدەر - شێروانی): ساڵی ١٩٨٢ کۆچی دوایی کردووە.
(٥) ئیبراهیم قورتاس ئەحمەد (سەفتێ - نزاری): ساڵی ١٩٧٤ کۆچی دوایی کردووە.
(٦) ئیبراهیم میرالی (کورکێ - شێروانی): کۆچی دوایی کردووە.
(٧) ئیبراهیم خۆشەوی رەشید «ناڤخۆش» (پالانا - مزووری): لە ٣١ تەمووز ١٩٨٣ لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە گیراوە و چارەنووسی بزرە.
(٨) ئیبراهیم شێخۆ مفردی (لێرا - شێروانی): لە ١٩٨٦ کۆچی دوایی کردووە.
(٩) ئەحمەد برىندار چیچۆ (شیفکێ - مزووری): لە ٣١ تەمووز ١٩٨٣وە لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە گیراوە و چارەنووسی بزرە.
(١٠) ئەحمەد عەلی سابلاغی (سابلاغ)
(١١) ئەحمەد بێداوی (بێداو - مزووری): لە یەکەتیی سۆڤیەت کۆچی دوایی کردووە.
(١٢) ئەحمەد حەدۆ ئەحمەد (شانەدەر - شێروانی): کۆچی دوایی کردووە.
(١٣) ئەحمەد حەسەن لەشکری ( بێستریێ - شێروانی): ماوە.
(١٤) ئەحمەد جەسیم ئەحمەد ١٩٢٩ (پێندرۆ - مزووری): ماوە.
(١٥) ئەحمەد تەها یونس (ئیسۆمەر - نزاری): لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە گیراوە و چارەنووسی بزرە.
(١٦) ئەحمەد عەلی مەحموود( ئەرگووش - مزووری): ماوە.
(١٧) ئەحمەد عەلی جەم (ئەرگووش - مزووری): ماوە.
(١٨) ئەحمەد محەمەد سووت (هوستان - بەرۆژ): ساڵی ١٩٨٤ کۆچی دوایی کردووە.
(١٩) ئەحمەد میرۆ عەنتەر(بیرێ - دۆسکی ژووری): لە زاویتە دەژی.
(٢٠) ئەحمەد هەوار سەلیم (شانەدەر - شێروانی): لە ١٩٧٢ کۆچی دوایی کردووە.
(٢١) ئەحمەد یوسف عەبدوڕەحمان (سەفتێ - نزاری): ماوە.
(٢٢) ئەسعەد محەمەد خالید (بازێ - بەرۆژ): لە ١٩٨٣/٧/٣١وە لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە گیراوە و چارەنووسی بزرە.
(٢٣) ئەسعەد خۆشەوی عۆدیش (سێلکێ - مزووری ): ساڵی ١٩٧٧ لە ئێران کۆچی دوایی کردووە.
(٢٤) ئەسعەد رەشۆ مەلا ١٩٣٢ (مێرگەسۆر - شێروانی): ماوە.
(٢٥) ئەسعەد سلێمان قادر(دێزۆ - مزووری): لە هاوینی ١٩٦١ شەهید بووە.
(٢٦) ئەسکەندەر عەبدولسەلام (بیرێ - دۆسکی ژووری) لە یەکەتیی سۆڤیەت کۆچی دوایی کردووە.
(٢٧) ئیسماعیل مەلا ئەحمەد عەلی(بەبان - بەرۆژ): لە ١٩٨٣/٧/٣١وە لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە

گیراوه و چارەنووسی بزره.
(٢٨) ئیسماعیل مەلا ئەحیا محەمەد (لێرە - شێروانی): ماوه.
(٢٩) ئیسماعیل شێخۆمەر ئیسماعیل ١٩٢٩ (تێلێ - مزووری ): له ١٩٨٣/٧/٣١وه لەلایەن ڕێژیمی بەعسەوه گیراوه و چارەنووسی بزره.
(٣٠) ئیسماعیل عەبدوللا هەمیره (پێندرۆ - مزووری): له ١٩٨٥ کۆچی دوایی کردووه.
(٣١) سەید ئیسماعیل سەید غەفوور (ئیروان - نزاری): له زێوه کۆچی دوایی کردووه.
(٣٢) ئیسماعیل تەها عەلی (بازێ - بەرۆژ): له ١٩٨٣/٧/٣١وه لەلایەن ڕێژیمی بەعسەوه گیراوه و چارەنووسی بزره.
(٣٣) ئیسماعیل ئەحمەد محەمەد (هوستان - بەرۆژ): کۆچی دوایی کردووه.
(٣٤) ئاغا عەلی میرخان ( ناڤدارێ - نزاری): له ١٩٧٣ کۆچی دوایی کردووه.
(٣٥) ئاڤدەل مستەفا عەمەر ١٩٢٧ (باوێ - مێرگەسۆری): ماوه.
(٣٦) ئاڤدەل حاجی میکائیل (بژیان - مزووری) : له یەکەتیی سۆڤیەت کۆچی دوایی کردووه.
(٣٧) ئال عەلی ئال (هەڤنکا - بەرۆژ ): له ١٩٨٣/٧/٣١وه لەلایەن ڕێژیمی بەعسەوه گیراوه و چارەنووسی بزره.
(٣٨) ئالی شێخۆمەر (بێداروون - شێروانی):کۆچی دوایی کردووه.
(٣٩) ئەلیاس ئوسمان حاجی (ریشه - بەرۆژ): ماوه.
(٤٠) ئۆمەر حەدۆ عەمەر (شانەدەر - شێروانی): له ١٩٩٥کۆچی دوایی کردووه.
(٤١) ئینو شوکر عەلی (توبێ): له یەکەتیی سۆڤیەت کۆچی دوایی کردووه.
(٤٢) بابەکر شێخ یاسین (کرکەمو - شێروانی): ماوه.
(٤٣) بابەکر محەمەد زوبەیر (هەسنێ - بەرۆژ): ماوه.
(٤٤) بادین قادر بادین (دێزۆ - مزووری): هاوینی ١٩٦٣ کۆچی دوایی کردووه.
(٤٥) بەدرۆ لەشکەری حوسێن (بێستریێ - شێروانی): ماوه.
(٤٦) بەهجەت عەبدولخالیق ١٩١٧ (ئاکرێ): کۆچی دوایی کردووه.
(٤٧) بێجان جندۆ عەلی ١٩٢٦ - ١٩٨٠(شکاک): شەهید بووه.
(٤٨) پیرۆ چیچۆ عەزیز ١٩٢٢ (گویزێ - مزووری): ماوه.
(٤٩) پیرۆ حەمۆ ئیبراهیم ١٩٢٧ (کەلێتی - گەردی): لەلایەن ڕێژیمی بەعسەوه گیراوه و چارەنووسی بزره.
(٥٠) پیرۆ یوسف هرووری (هروور - بەرواری): کۆچی دوایی کردووه.
(٥١) تاژدین ئاغا تاژدین (کەلووکێ - شێروانی): ماوه.
(٥٢) تاژدین مەلا حەسەن تاژدین (بیێ - شێروانی): ماوه.
(٥٣) تەوفیق خواجەمیر پیر ١٩٢٢ (مێرووز - مزووری) له یەکەتیی سۆڤیەت مایەوه، پێش ڕاپەرین گەڕایەوه کوردستان له ١٩٩٩/٧/٢٤ . کۆچی دوایی کردووه.
(٥٤) تێلو باقی محەمەد «زۆرەگڤان» (شێروانی): له ١٩٨٣/٧/٣١وه لەلایەن ڕێژیمی بەعسەوه گیراوه و چارەنووسی بزره.
(٥٥) تێلی عەبدولکەریم ئیبراهیم (کەلێتی - گەردی): له گوندی زێت ساڵی ١٩٤٧ لەسەر سنووری نێوان عێراق و تورکیا شەهید بووه.

(٥٦) تەیمەز ئارەب قەتران (سێلکێ - مزووری): ماوە.
(٥٧) تەمر مستەفا حەسەن (بناڤ): شەهید بووە.
(٥٨) تیموور موسا جەعفەر (شکاک): ماوە.
(٥٩) جادر جانگیر جادر (مێرووز، مزووری): لە یەکەتیی سۆڤیەت لە ١٩٥٣ کۆچی دوایی کرد.
(٦٠) جادر عەزیز (ئەرگووش - مزووری): لە ١٩٨٣/٧/٣١وە لەلایەن ڕێژیمی بەعسەوە گیراوە و چارەنووسی بزرە.
(٦١) جەوەر محەمەد عەلی ١٩٢٠ (تێلێ): لە ١٩٨٨ کۆچی دوایی کردووە.
(٦٢) جوبرائیل یەحیا (بیرێ - دۆسکی ژووری): کۆچی دوایی کردووە.
(٦٣) جەم عەلی جەم (ئەرگووش - مزووری): کۆچی دوایی کردووە.« نەچووەتە سۆڤیەت و لە ڕێگە گەڕاوەتەوە ».
(٦٤) جومعە مستەفا یووسف (تێلێ - مزووری) : لە ٩٨٣/٧/٣١ لەلایەن ڕێژیمی بەعسەوە گیراوە و چارەنووسی بزرە.
(٦٥) جەمیل تەوفیق « سوور »(بامەرنی) : لە شەڕی چیای مەتین لە ١٩٦٣ شەهید بووە.
(٦٦) جەمیل عەبدوڵڵا حەسەن (ئاڤەدوور - مزووری): لە ١٩٨٣/٧/٣١ لەلایەن ڕێژیمی بەعسەوە گیراوە و چارەنووسی بزرە.
(٦٧) جەوەر حوسێن محەمەد (سێلکێ - مزووری): لە شەڕی چیای مەتین لە ١٩٦٣ شەهید بووە.
(٦٨) چەتۆ محەمەد عەبدولکەریم (بابسێڤ مزووری): لەلایەن ڕێژیمی بەعسەوە گیراوە و چارەنووسی بزرە.
(٦٩) چیچ حەتەم شەمدین ١٩١٠ (شنگێل - مزووری): لە ١٩٨٨ کۆچی دوایی کردووە.
(٧٠) چیچۆ ئەحمەد حاد (سەردەرێ - شێروانی): کۆچی دوایی کردووە.
(٧١) حاجی ئالی جوبرائیل (دووری - شێروانی) : لە ٩٨١ کۆچی دوایی کردووە.
(٧٢) حاجی شێخەمیر وەسمان (زرارا - شێروانی): ماوە.
(٧٣) حاجی عیسا گۆران مێرووزی ١٩١٤ (مێرووز - مزووری): لە بەرواری باڵا شەهید بووە.
(٧٤) حاجی مەلۆ چاوشین (لێرەبیر - شێروانی): ماوە.
(٧٥) حاچک محەمەد حاچک ١٩٣٠ (چامە - شێروانی): لە ١٩٩٩/٥/٣ . کۆچی دوایی کردووە.
(٧٦) حادی حەسکۆ کەک (واژێ - شێروانی): لە ١٩٦٦/٥/٦ شەهید بووە.
(٧٧) حالی ئەحمەد عەلی خیشکەلی (خیشکەلێ - دۆڵەمەری) : لە ١٩٦٥ لە هەولێر شەهید بووە لە پشت نەخۆشخانەی کۆماری.
(٧٨) حالی ئەحمەد حالی (بنێ بیا - شێروانی): کۆچی دوایی کردووە.
(٧٩) حالی ئاغا تاجەدین ١٩٢٧ (کەلوکێ - شێروانی): کۆچی دوایی کردووە.
(٨٠) حالی باپیر محەمەد (کەلوکێ - شێروانی): کۆچی دوایی کردووە.
(٨١) حالی محەمەد قادر خەلانی (خەلانێ - دۆڵەمەری): لە شەڕی ڕەواندز لە ١٩٩٥ شەهید بووە.
(٨٢) حالی مەم حەدۆ (سەردەرێ - شێروانی): لەلایەن ڕێژیمی بەعسەوە گیراوە و چارەنووسی بزرە.
(٨٣) حەجی ئەحمەد عەمەر ( ڕێزان - بەرۆژ ): شەهید بووە.
(٨٤) حەجی ئەحمەد ماشۆ (شێلادزێ): کۆچی دوایی کردووە.
(٨٥) حەجی ئەبوبەکر شێخ (پالانا - مزووری): کۆچی دوایی کردووە.

(٨٦) حەجی حەیدەر سلێمان (ئەرگووش - مزووری): کۆچی دوایی کردووە.
(٨٧) حەجی عەزیز میرزا (گویزێ - مزووری): لەگوندێ درێ لە ڕێی چوون بۆ سۆڤیەت شەهید بووە.
(٨٨) حەجی عەمەر عەبدوڵڵا (کەلێتێ - گەردی): شەهید بووە.
(٨٩) حەجی مەلا عەلی سلێمان (ئاڤەدوور - مزووری): لە ١٩٨٣/٧/٣١ لەلایەن ڕێژیمی بەعسەوە گیراوە و چارەنووسی بزرە.
(٩٠) حەجی ئەحمەد حەجی لڤرۆک (بانی): شەهید بووە.
(٩١) حەدۆ ئەحمەد حەدۆ (سەردەرێ - شێروانێ): ماوە.
(٩٢) حەدۆ حەسەن ئەحمەد (لێرا - شێروانی): لە سۆڤیەت لە ١٩٥٤ کۆچی دوایی کردووە.
(٩٣) حەدۆ فەتاح میرحەمەد (گۆرەتوو - شێروانی):سەرەتای شۆرەشی ئەیلوول لە هاوینی ١٩٦١ شەهید بووە.
(٩٤) حەدۆ قادر قادر (باوێ): ماوە.
(٩٥) حەدۆ حەمەد پەریا (ڕێزان - شێروانی): لە ١٩٨٣/٧/٢٣وە لەلایەن ڕێژیمی بەعسەوە گیراوە و چارەنووسی بزرە.
(٩٦) حەسکۆ ئیبراهیم عەبدوڵڵا ١٩٣٢ (خوشکان - شێروانی): ماوە.
(٩٧) حەسکۆ چیچۆ عەبدوڵڵا (بارزان - بەرۆژ): لە ١٩٥١ لە سۆڤیەت کۆچی دوایی کردووە.
(٩٨) حەسکۆ میرۆ (زرارا - شێروانی): لە هاوینی ١٩٦١ شەهید بووە.
(٩٩) حەسەن ئەحمەد خانەمیر (ژاژووک - شێروانی): کۆچی دوایی کردووە.
(١٠٠) حەسەن ئەحمەد ناز (شێتنێ - دۆڵەمەری): لە ١٩٧٣ کۆچی دوایی کردووە.
(١٠١) حەسەن خال هەمزە مەلا (مێرگەسۆر): لە ١٩٩٨/٧/١١ کۆچی دوایی کردووە.
(١٠٢) حەسەن سلێمان مەلا (ژاژووک - شێروانی): لەلایەن ڕێژیمی بەعسەوە گیراوە و چارەنووسی بزرە.
(١٠٣) حەسەن سمایل (شانەدەر - شێروانی): لە سۆڤیەت مایەوە.
(١٠٤) حەسەن سوار عەمەر (لێرا - شێروانی): کۆچی دوایی کردووە.
(١٠٥) حەسەن شەمدین حاتەم ١٩٢٠ (شنگێل - مزووری): لە سۆڤیەت ساڵی ١٩٥٦ کۆچی دوایی کرد.
(١٠٦) حەسەن عەبدوڵڵا ئەحمەد (سێلکێ - مزووری): لە ئێران کۆچی دوایی کردووە.
(١٠٧) حەسەن عەلی حەسەن (سپیندارێ - شێروانی): ماوە.
(١٠٨) حەسەن محەمەد (گران ـ گەردی): لە ١٩٧٣ کۆچی دوایی کردووە.
(١٠٩) حەسەن مەلا محەمەد تاجەدین (مێرگەسۆر): ماوە.
(١١٠) حەسەن مستەفا وەسمان (بنێ بیا - شێروان): کۆچی دوایی کردووە.
(١١١) حەسەن مەلا حەسەن (ڕێزان - شێروانی): کۆچی دوایی کردووە.
(١١٢) حەسەن مەلا یەحیا حەسەن (دێزۆ - مزووری): ماوە.
(١١٣) حەسۆ ساڵح نادر (سیدان - مزووری): شەهید بووە.
(١١٤) حەسۆ فەق ئەحمەد (بابکێ - شێروانی): دوای هاتنەوە لەرووسیا جارێکی تر گەڕایەوە و لەوێ مایەوە.
(١١٥) حەسۆ محەمەد کەکشار ١٩١٦ (مێرگەسۆر): ماوە.

